# تيسير الكريم الرحمن

## في تفسير كلام المنان

به كوردى

نووسينى: العلامة عبد الرحمن بن ناصر السعدي رحمه الله

وەرگێڕانى: عباس محمد امين

بەرگى پێنجەم

سوورەتى (الزُّخرُف) تا سوورەتى (النَّاس)

# تَيْسِيرُ الكَرِيْمُ الرَّحْمَن فِي تَفْسِيرِ كَلاَمِ المَنَّانِ
# بـه كـوردی

## بەرگی پێنجەم

## سوورەتی (الزخرف) تا سوورەتی (الناس)

ناوی کتێب: تَيْسِيرُ الكَرِيْمُ الرَّحْمَن فِي تَفْسِيرِ كَلَامِ المَنَّانِ بە کوردی (بەرگی پێنجەم)
بابەت: تەفسیری قورئانی پیرۆز
ناوی نووسەر: العلامة عبدالرحمن بن ناصر السعدي (رحمه الله)
وەرگێڕانی: عباس محمد امین
دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٩
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (٤٩)ــی ساڵی (٢٠١٩)ــی پێ دراوە.



ناوەندی ڕێنوێن
07701932749 - 07501269689
hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com
سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)


بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
حمٓ (١) وَالْكِتَابِ الْمُبِينِ (٢) إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ (٣) وَإِنَّهُ فِي أُمِّ الْكِتَابِ لَدَيْنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ (٤) أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ الذِّكْرَ صَفْحًا أَن كُنتُمْ قَوْمًا مُّسْرِفِينَ (٥) وَكَمْ أَرْسَلْنَا مِن نَّبِيٍّ فِي الْأَوَّلِينَ (٦) وَمَا يَأْتِيهِم مِّن نَّبِيٍّ إِلَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ (٧) فَأَهْلَكْنَا أَشَدَّ مِنْهُم بَطْشًا وَمَضَىٰ مَثَلُ الْأَوَّلِينَ (٨) وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ (٩) الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ (١٠)

## تەفسیری سوورەتی (الزخرف)

## مەککیە (٨٩) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٥): ﴿ حمٓ (١) وَالْكِتَابِ الْمُبِينِ (٢) إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ (٣) وَإِنَّهُ فِي أُمِّ الْكِتَابِ لَدَيْنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ (٤) أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ الذِّكْرَ صَفْحًا أَن كُنتُمْ قَوْمًا مُّسْرِفِينَ (٥) ﴾

﴿ حمٓ (١) وَالْكِتَابِ الْمُبِينِ ﴾ ئەمە سوێند خواردنێکە بە قورئان لەسەر قورئان، جا سوێندی خواردوە بەم کتێبە ڕوونکەرەوەیە، وە بە ڕەهایی هێناویەتی، وە باسی پەیوەستکراوی نەکردوە، تا ببێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئەو کتێبە ڕوونکەرەوەیە بۆ هەموو ئەوانەی بەندەکان پێویستیان پێیەتی، لە کاروباری دونیاو دینو دوارۆژ.

﴿ إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا ﴾ (واتە: بە ڕاستی ئێمە قورئانمان بە عەرەبی دابەزاندووە) ئەم سوێند لەسەر خوراوە کە قورئانە، بە پاراوترینو ڕەوانبێژترینو ڕوونو ڕەوانترین زمان دانراوە، ئەمەش لە ڕوونکردنەوەیەتی، وە باسی حیکمەتی کردوە لەمەدا، جا فەرموویەتی: ﴿ لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ (واتە: بۆ ئەوەی تێبگەن) لە فەرمایشتو ماناکانی، ئەویش بە هۆی ئاسان بوونو نزیک بوونی لەبیرو هۆشەکان.

﴿ وَإِنَّهُ ﴾ واتە: ئەم کتێبە ﴿ لَدَيْنَا ﴾ لە تابلۆی پارێزراودایە لە بەرزترین پلەوپایەو چاکترینیان، ﴿ لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴾ بەرزو بڵندە لە ڕێزو حورمەتو جێگایدا، پڕە لە دانایی لەوەی کە لە خۆی دەگرێ لە فەرمانو قەدەغەکراوەکانو هەواڵەکان، هیچ بڕیارێکی تێدا نیە پێچەوانەی حیکمەتو دادپەروەریو ڕازوو بێ.

پاشان خوا ﷻ هەواڵیداوە کە بەڕاستی حیکمەتو چاکەی وا دەخوازێ واز لە بەندەکانی

نەهێنی بە هەوەنتە، کە پێغەمبەریان بۆ نەنێرێو کتێبیان بۆ دانەبەزێنێ، ئەگەرچی زێدەڕۆو ستەمکار بن، جا فەرموویەتی: ﴿ أَفَنَضۡرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكۡرَ صَفۡحًا ﴾ واتە: ئایا ڕووتان لێوەربگێڕین، وە واز لە دابەزاندنی قورئان بهێنین بۆتان، وە کەنارگیرتان بخەین بە هۆی ڕوو وەرگێڕانتانو ملکەچ نەبوونتان بەو قورئانە؟ بەڵکو کتێبتان بۆ دادەبەزێنینو بۆتان ڕوون دەکەینەوە کە هەموو شتێکی تێدایە، ئەگەر بڕواتان پێی هێناو ڕێنماییتان وەرگرت ئەوە سەردەکەون، ئەگەرنا ئەوە بەڵگەو حوججەتان لەسەر پێویست دەبێو ئێوەش لەسەر ڕوونکردنەوە دەبن لە کاروبارەکانتاندا.

(٦-٨): ﴿ وَكَمۡ أَرۡسَلۡنَا مِن نَّبِيّٖ فِي ٱلۡأَوَّلِينَ ٦ وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن نَّبِيٍّ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ٧ فَأَهۡلَكۡنَآ أَشَدَّ مِنۡهُم بَطۡشٗا وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٨ ﴾

خوا ﷻ فەرموویەتی: ئەمە سونەتو نەریتی ئێمەیە لە دروستکراوەکاندا کە وازیان لێ نەهێنین هەرواو بە هاوەنتە، جا زۆر لە ﴿ أَرۡسَلۡنَا مِن نَّبِيّٖ فِي ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾ (پێغەمبەرانمان ناردوە لە گەلە پێشووەکان) فەرمانیان پێ دەکردن بە بەندایەتی خوای تاکو تەنهاو بێ شەریک، وە بە بەردەوام بەدرۆ دانان لەناویاندا بوونی هەبووە، ﴿ وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن نَّبِيٍّ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴾ نکوڵیو عینادیان کردوە لەوەی کە هێناویەتی، وە خۆیان بە گەورە داناوە لەسەر حەق، ﴿ فَأَهۡلَكۡنَآ أَشَدَّ ﴾ (جا کەسانێکمان لە ناوبرد بە تواناتر بوون) لە ئەوان، ﴿ بَطۡشٗا ﴾ واتە: بەهێزتر بوون بە کردارو شوێنەواریان زیاتر بوو لەسەر زەویدا، ﴿ وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾ واتە: سەرگوزەشتەو وێنەی ئەوان بەسەر چوو، وە بۆمان ڕوونکردنەوە ئەوەی تیایدایە لە پەندو ئامۆژگاریو سەرزەنشتکردنی بەدرۆدانەرانو نکوڵیکاران.

(٩-١٤): ﴿ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡعَلِيمُ ٩ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مَهۡدٗا وَجَعَلَ لَكُمۡ فِيهَا سُبُلٗا لَّعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ١٠ وَٱلَّذِي نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٖ فَأَنشَرۡنَا بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗاۚ كَذَٰلِكَ تُخۡرَجُونَ ١١ وَٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡفُلۡكِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ مَا تَرۡكَبُونَ ١٢ لِتَسۡتَوُۥاْ عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ثُمَّ تَذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ رَبِّكُمۡ إِذَا ٱسۡتَوَيۡتُمۡ عَلَيۡهِ وَتَقُولُواْ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِينَ ١٣ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ١٤ ﴾

﴿ وَلَئِن ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی هاوبەش دانەران، تۆ ئەگەر ﴿ سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ لَيَقُولُنَّ ﴾ (واتە: کێ ئاسمانەکانو زەوی بەدیهێناوە

بێگومـان دەڵێـن) خـوای تـاکو تەنهـای بـێ هاوبـەش، (العزیز) ئـەو زاتەی کـە هەموو بەدیهێنـراوەکان گـەردن کەچی عیزەتو دەسـەڵاتی ئـەون، زانایە بە ڕواڵـەتو ناوەڕۆکی کاروبـارەکانو سـەرەتاو کۆتاییـان، جـا ئەگـەر ئـەوان دانیـان نـا بـەوەدا، جا ئیتـر چۆن منـداڵو هـاوەڵو هاوبەشـی بـۆ دادەنێـن؟! چۆن هاوبەشـی بۆ دادەنێن کەسـێ نە دروسـت دەکاتو نـە ڕزقو ڕۆزی دەداتو نـە دەمرێنـیو نـە دەژێنـێ؟! هەروەها دوای ئەوە باسـی کـردوە، لـەو بەڵگانەی کە بەڵگەن لەسـەر تـەواوی نیعمەتەکانیو تواناو دەسـەڵاتی، بەوەی بەدیهێنـاوە بـۆ بەندەکانـی لـەو زەویـەی کـە کردوویەتـی بـە لانکـەو جێگای نیشـتەجێ بوونـی بەندەکانـی، چیـان بـوێ دەتوانن تیایـدا ئەنجامـی بدەن.

﴿ وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا ﴾ واتـە: لـە نـاو ئـەو زنجیـرە کێوانـەی بەسـتراون بەیەکـەوە چەنـد ڕێگایەکـی بـۆ دانـاون، پیایـدا تێدەپـەڕن بـۆ شـارو وڵاتەکانـی دیکە، ﴿ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾ (واتـە: بـۆ ئـەوەی بگـەن بـە مەبەسـتەکانتان) لـە ڕێکـردن لـە ڕێگاکاندا، بـۆ ئـەوەی لە دەسـتی نـەدەن، هەروەها لەبـەر ئـەوە ڕێنمایی وەربگـرن لە بایەخـدان بەوەو بیـری لێبکەنەوە.

وَٱلَّذِى نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَنشَرْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا
كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١١﴾ وَٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ
لَكُم مِّنَ ٱلْفُلْكِ وَٱلْأَنْعَٰمِ مَا تَرْكَبُونَ ﴿١٢﴾ لِتَسْتَوُۥا عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ
ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا ٱسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا سُبْحَٰنَ
ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا
لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾ وَجَعَلُوا لَهُۥ مِنْ عِبَادِهِۦ جُزْءًا إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ
لَكَفُورٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَىٰكُم
بِٱلْبَنِينَ ﴿١٦﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا
ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ أَوَمَن يُنَشَّؤُا فِى
ٱلْحِلْيَةِ وَهُوَ فِى ٱلْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ﴿١٨﴾ وَجَعَلُوا ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ
ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَٰدُ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنَٰثًا أَشَهِدُوا خَلْقَهُمْ سَتُكْتَبُ
شَهَٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُوا لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَٰهُم
مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ
كِتَٰبًا مِّن قَبْلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسْتَمْسِكُونَ ﴿٢١﴾ بَلْ قَالُوٓا إِنَّا
وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾

﴿ وَٱلَّذِى نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ ﴾ (واتــە: وە ئــەو خوایــەی کــە لە ئاســمانەوە بــە ئەنــدازە بارانــی بــۆ بارانــدووون) نــە زیــاد دەکاتو نــە کــەم، هەروەهــا بــە ئەنــدازەی پێویســت، ئەوەنــدە کــەم نیــە کــە هیــچ ســوودی نەبێــت، ئەوەنــدەش زۆر نیــە بــە جــۆرێ زیــان بــە بەنــدەکانو وڵات بگەیەنێــت، بەڵکــو بــە هۆیــەوە یارمەتــی بەنــدەکان دەداتو وڵاتــی پــێ رزگــار دەکات لــە ســەختی، لەبــەر ئەمەیە فەرموویەتــی: ﴿ فَأَنشَرْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا ﴾ واتــە: زینــدووی دەکەینــەوە دوای ئــەوەی کە مــردووە، ﴿ كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴾ واتە: جــا هەر وەک چــۆن زەوی مردوو وشــکی بــە ئــاو زینــدوو کــردەوە، بەهەمــان شــێوە زیندووتــان دەکاتــەوە دوای تــەواو بوونتان لە بــەرزەخ، بــۆ ئــەوەی پاداشــتان بداتــەوە بــە پێــی کردەوەکانتــان.

﴿ وَٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا ﴾ واتــە: (ئــەو خوایــەی) هەمــوو جووتەکانــی بــە گشــتی بەدیهێنــاوە، لــەوەی لــە زەویــەوە دەڕوێ، وە لــە نەفسو دەرونیانو لەوەیشــی کــە نایزانن، لــە شــەوو ڕۆژو گەرمــاو ســەرماو نێرو مــێو جگــە لەوانیــش ﴿ وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْفُلْكِ ﴾ واتــە: کەشــتی دەریایــی، ئەوەی بــێ ئاگرو ئەوەشــی بــە ئاگــر دەڕوات کە ســواری دەبن، ﴿ وَٱلْأَنْعَٰمِ مَا تَرْكَبُونَ ﴿١٢﴾ لِتَسْتَوُۥا عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ﴾ (واتــە: وە وڵاخیــش * بۆ ئەوەی ســواری پشــتیان بــن) ئــەم گشــتگیریە بۆ ســواربوونی پشــتی کەشــتیو ســواربوونی پشــتی ئاژەڵە، واتە: بۆ ئەوەی لەســەری پشــوو بــدەنو جێگیر بــن)، ﴿ ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا ٱسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ ﴾ (واتــە: پاشــان بیر لــە بەهــرەی پەروەردگارتان بکەنــەوە کاتێ ســواریان بوون) بە دانپێدانــان بــە نیعمــەت بــۆ ئەو زاتــەی رامیهێنــاوە، وە ســتایش کردنی بــەو شــێوەیە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتــی: ﴿ وَتَقُولُوا سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴾ واتە: ئەگــەر خــوا ڕامــی نەهێنایــەت بۆمان نە کەشــتیو نــە ئاژەڵــەکان ژێربار نەدەبــوون بۆمان،

بێگومـان ئـەوەش لە تواناو دەسـەڵاتی ئێمەدا نیـە، بەڵام بـە بەزەیی‌و میهرەبانـی‌و ڕێزداری خـۆی ﷻ ڕامیهێنـاوەو زەلیلـی کردوون‌و هۆکارەکانیشـی ئاسـان کردوە.
مەبەسـت لەمـەدا ڕوونکردنەوەیـە کـە بـە ڕاسـتی پەروەردگـار وەسـفکراوە بەوەی باسـی کـرد، لـە زۆری نیعمەتەکانـی بەسـەر بەندەکانەوە، ئـەو زاتە شایسـتەی ئەوەیە بپەرسـترێ، وە نوێـژی بـۆ بکرێ‌و سـوژدەی بـۆ ببرێ.
(١٥-٢٥): ﴿ وَجَعَلُواْ لَهُۥ مِنْ عِبَادِهِۦ جُزْءًاۚ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَكَفُورٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا
يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَىٰكُم بِٱلْبَنِينَ ﴿١٦﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ
وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ أَوَمَن يُنَشَّؤُاْ فِى ٱلْحِلْيَةِ وَهُوَ فِى ٱلْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ﴿١٨﴾
وَجَعَلُواْ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَٰدُ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنَٰثًاۚ أَشَهِدُواْ خَلْقَهُمْۚ سَتُكْتَبُ شَهَٰدَتُهُمْ
وَيُسْـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُواْ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَٰهُمۗ مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ
﴿٢٠﴾ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا مِّن قَبْلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسْتَمْسِكُونَ ﴿٢١﴾ بَلْ قَالُوٓاْ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا
عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾ وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ
مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾ ۞ قَٰلَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم
بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ ءَابَآءَكُمْۖ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٢٤﴾ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْۖ فَٱنظُرْ
كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾:
﴿ وَجَعَلُواْ لَهُۥ مِنْ عِبَادِهِۦ جُزْءًاۚ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَكَفُورٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ
بَنَاتٍ وَأَصْفَىٰكُم بِٱلْبَنِينَ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربارەی ناشـرینی‌و قیزەونی قسـەی هاوبـەش دانـەران، ئەوانـەی بـۆ خوای بـەرز منداڵیان دانـا، ئەو زاتە تـاک‌و تەنهـاو بێنیازە، نـە هـاوەڵ‌و نـە منداڵی بـۆ خۆی دانەنـاوە، وە هەرگیـز هیچ کـەس هاوشـێوەو هاوتای ئەو نیـە. بێگومان ئـەوە بەتـاڵ‌و پووچە لـە چەنـد ڕوویەکەوە:
یەکـەم: بە ڕاسـتی بەدیهێنـراوەکان هەموویان بەندەی خـوان، وە بەندایەتـی کردنیش بوونی منـداڵ ڕەت دەکاتەوە.
دووەم: منـداڵ بەشـێکە لـە باوکی خۆی، وە خوا ﷻ جیاوازە لە دروسـتکراوەکانی لە سـیفاتە بـەرزو مەزنەکانـی، وە منداڵ بەشـێکە لە باوکی، جا ئەسـتەمە کە خـوا منداڵی هەبێ.
سـێیەم: ئـەوان پێیـان وایـە فریشـتەکان کچانـی خـوان، بێگومـان ئـەوەی زانـراوە کچان نزمترینـی ئەو دوو بەشـەن، جـا چۆن دەبێ خـوا کچان بۆ خـۆی هەڵبژێـرێ‌و کوڕانیش بۆ ئـەوان دابنـێ‌و بەو هۆیـەوە فـەزڵ‌و چاکەیان بـدات؟! جا ئەو کاتـە ئەوان چاکتـر دەبن لە

خـوا، بـەرزیو مەزنی بـۆ ئەو خوایـە لەوەی ئـەوان دایانـە پاڵی.
چـوارەم: ئـەو بەشـەی کـە دایانە پـاڵ خـوا ئەویش کچـان بـوو نزمترینی ئەو دوو بەشـەو خراپترینـی بـە لایانـەوە، تەنانەت ئـەوان لـە ڕق لێبوونیان لە کچـان ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا ﴾ (واتـە: وە کاتـێ مـژدە بـە یەکـێ لـەوان بـدرێ بـەوەی بە نموونـە بۆ خـوای دادەنـا ڕووی ڕەش هەڵدەگـەڕێو پێـی دەخواتەوە) لە حـەز لێنەکردنـیو سـەختی توورەیـی، دەی چـۆن شـتێک بـۆ خـوا دادەنێن خۆیـان پێیان ناخۆشە.
پێنجـەم: بێگومـان ئافرەتـان ناتـەواون لـە وەسـفیانو لـە داکۆکـی کـردن لـە خۆیـانو ڕوونکردنەوەیـان، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ أَوَمَن يُنَشَّؤُاْ فِي ٱلْحِلْيَةِ ﴾ واتـە: (ئایا ئـەو کچـەی) جـوان کرابـێ لە نـاو زێـرو زیودا، بـە هـۆی ناتـەواوی جوانیەکـەی جوان بکـرێ بـە شـتێکی دەرەوەی خـۆی؟ ﴿ وَهُوَ فِي ٱلْخِصَامِ ﴾ واتـە: لـە کاتـی دەمەقاڵێدا کە پێویسـت بـکات دەریبخات ئەوەی لەلای کەسـەکەیە لە قسـەکردن ﴿ غَيْرُ مُبِينٍ ﴾ ناتوانێ بەڵگەکـەی خـۆی ڕوون بکاتـەوە، وە زمـان پـاراو نیـە لـەوەی لەناخیدایـە دەریببڕێت، جا ئیتـر چـۆن دەیاندەنە پـاڵ خوا؟
شەشـەم: بێگومـان ئەوان ئەو فریشـتانەی کە بەندەی خـوان بە مێینەیان دادەنـان، چاوقایمیو بوێریـان کـرد لەسـەر فریشـتەکان، ئـەو بەنـدە نزیکانـە وە پلەیـان دابەزانـدن لـە پلـەی بەندایەتـیو زەلیلـی بـۆ پلـەی هاوبـەش بوون لەگـەڵ خوا لـە شـتێ لـە تایبەتمەندیەکانی، پاشـان زیاتـر دایانبەزانـدن لـە پلـەو پایـەی نێرینـە بۆ پلـەو پایـەی مێینـە، پاکی بـۆ ئەو خوایـەی کـە دەریخسـتووە دژ یـەک بوونی قسـەی ئـەو کەسـەی درۆی لەسـەر دەکاتو عینـادی پێغەمبەرانـی دەکات.
حەوتـەم: خـوا ﷻ وەڵامـی داونەتەوە بـەوەی کە ئەوان ئامادەی دروسـتکردنی فریشـتەکان نەبـوون، جـا ئیتـر چـۆن قسـە لـە شـتێکدا دەکەن کـە لای هەمـوو کـەس زانـراوە ئەوان هیـچ زانیاریەکیـان دەربـارەی نیـە؟ بەڵام هەر دەبێ پرسـیاریان لـێ بکرێ لەم شـایەتیە، وە لەسـەریان دەنووسـرێو سـزا دەدرێن لەسەری.
وە کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَقَالُواْ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَٰهُم ﴾ (واتـە: وە دەڵێن ئەگەر خـوا بیویسـتایە ئێمە ئـەو فریشـتانەمان نەدەپەرسـت) بەڵگەیـان هێنایەوە لەسـەر بەندایەتی کردنیـان بـۆ فریشـتەکان بـە ویسـتو مەشـیئەتی خـوا، ئـەم بەڵگەیـەش هەر لـە کۆنەوە

هاوبەشـدانەران بەکاریـان هێنـاوە، ئەمـە بەڵگەیەکـی پووچـە لـە خـودی خۆیدا لـە ڕووی عەقـڵو شـەرعەوە، جـا مرۆڤـی عاقـڵ هەرگیـز بەڵگـە بـە قـەدەر ناهێنێتـەوە، وە ئەگـەر گرتبیەتیـە بـەر لـە حاڵەتێ لە حاڵەتەکانیدا ئەوە لەسـەری بـەردەوام نابـێو جێگیری ناکات. بـەڵام لـە ڕووی شـەرعەوە بێگومـان خـوا ﷻ بەڵگەهێنانـەوەی بـە قـەزاو قـەدەر پـووچ کردۆتەوە، وە باسـی نەکردوە لە غەیری ئەو کەسـانەی هاوبەشـیان بۆ دانـاوەو پێغەمبەرانیان بـەدرۆ داناوە، بەڕاسـتی خـوا بەڵگەو حوججەی پێویسـت کردوە لەسـەر بەنـدەکان، بەڵگەو حوججـە بۆ هیچ کەسـێک نەماوەتەوە، لەبـەر ئەمەیە لێـرەدا فەرموویەتی: ﴿ مَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴾ واتـە: (هیـچ زانیاریەکیـان نیە لەو بارەیەوە) ئـەوان هەر درۆ دەکـەن، بـە درۆکردنـێ هیچ بەڵگەیەکی لەسـەر نیـە، وە تێکەڵی دەکەن بـە تێکەڵکردنێکی هەڕەمەکی، پاشـان فەرموویەتی: ﴿ أَمْ آتَيْنَاهُمْ كِتَابًا مِّن قَبْلِهِ فَهُم بِهِ مُسْتَمْسِكُونَ ﴾ (واتـە: یـان لـە پێـش قورئـان پەرتووکێکمان پێـداون کە ئـەوان دەسـتیان پێـوە گرتبێ) هەواڵیـان پـێ دەدا بـە تـەواوی ڕەفتاریـانو ڕاسـتی قسـەکانیان؟ نەخێـر بەو شـێوەیە نیە، بێگومـان خوا ﷻ پێغەمبەرەکـەی ناردووە وەک ترسـێنەرێ بۆ لایان، ئەوانیش ترسـێنەریان بـۆ نەهاتـووە جگـە لەئـەو. واتـە: نە عەقـڵ نە نەقـڵ، جا ئەگـەر ئـەم دووانە لـە ناوچوونو نەمـان ئـەوە هیـچ نیە جگـە لە پـووچ نەبێ.

بەڵـێ، گومانیـان هەیە لە لاوازترینی گومانـەکان ئەویش پەیڕەوکردنی باپیـرە گومڕاکانیانە، ئەوانـەی بە بـەردەوام بیبڕوایان بە پەیڕەوکردنیان بانگـەوازی پێغەمبەرەکانیان ڕەتکردۆتەوە، ئـا لەبـەر ئەمەیـە لێـرەدا فەرموویەتـی: ﴿ بَلْ قَالُوا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَىٰ أُمَّةٍ ﴾ واتـە: لە سـەر ئاییـنو میللەتێـک، ﴿ وَإِنَّا عَلَىٰ آثَارِهِم مُّهْتَدُونَ ﴾ واتە: هەرگیز شـوێنی ئـەو پەیامە ناکەویـن کە موحەممـەد ﷺ هێناویەتی

وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ
إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ (٢٣)
۞ قَٰلَ أَوَلَوۡ جِئۡتُكُم بِأَهۡدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمۡ عَلَيۡهِ ءَابَآءَكُمۡۖ
قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ (٢٤) فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡۖ فَٱنظُرۡ
كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ (٢٥) وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦٓ
إِنَّنِي بَرَآءٞ مِّمَّا تَعۡبُدُونَ (٢٦) إِلَّا ٱلَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُۥ سَيَهۡدِينِ
(٢٧) وَجَعَلَهَا كَلِمَةَۢ بَاقِيَةٗ فِي عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ (٢٨) بَلۡ
مَتَّعۡتُ هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ وَرَسُولٞ مُّبِينٞ (٢٩)
وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ (٣٠) وَقَالُواْ
لَوۡلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنَ ٱلۡقَرۡيَتَيۡنِ عَظِيمٍ (٣١) أَهُمۡ
يَقۡسِمُونَ رَحۡمَتَ رَبِّكَۚ نَحۡنُ قَسَمۡنَا بَيۡنَهُم مَّعِيشَتَهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَاۚ وَرَفَعۡنَا بَعۡضَهُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ لِّيَتَّخِذَ بَعۡضُهُم
بَعۡضٗا سُخۡرِيّٗاۗ وَرَحۡمَتُ رَبِّكَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ (٣٢) وَلَوۡلَآ
أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ لَّجَعَلۡنَا لِمَن يَكۡفُرُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ
لِبُيُوتِهِمۡ سُقُفٗا مِّن فِضَّةٖ وَمَعَارِجَ عَلَيۡهَا يَظۡهَرُونَ (٣٣)

﴿ وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ ﴾ واته: ڕێگریان كرد ئه‌و ده‌سه‌ڵاتدارانه‌ی كه‌ دونیا گومرای كردنو ماڵو سامانه‌كانیان سه‌ری لێشێواندن، وه‌ لووت به‌رزیان كرد له‌سه‌ر حه‌ق ﴿ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ ﴾ واته: جا ئه‌وانه‌ شتێكی داهێنراو نین، وه‌ یه‌كه‌مین كه‌س نین ئه‌م قسانه‌یان كردبێ.

ئه‌م به‌ڵگه‌ هێنانه‌وه‌یه‌ له‌لایه‌ن ئه‌و هاوبه‌شدانه‌ره‌ گومرایانه‌ به‌ په‌یڕه‌وكردنی باپیره‌ گومڕاكانیان، مه‌به‌ست پێی شوێنكه‌وتنی حه‌قو هیدایه‌ت نه‌بوو، به‌ڵكو ده‌مارگیریه‌كی په‌تی بوو، مه‌به‌ست پێی سه‌رخستنی ئه‌و پووچو به‌تاڵه‌ بوو له‌لایان.

ئا له‌به‌ر ئه‌مه‌ هه‌موو پێغه‌مبه‌رێ له‌ به‌رانبه‌ر ئه‌و كه‌سه‌ی ڕووبه‌ڕووی ده‌بێته‌وه‌ به‌م بۆچوونه‌ ده‌فه‌رموێ: ﴿ أَوَلَوۡ جِئۡتُكُم بِأَهۡدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمۡ عَلَيۡهِ ءَابَآءَكُمۡ ﴾ واته: ئایا شوێنی من ده‌كه‌ون له‌ پێناو هیدایه‌تو ڕێنماییدا؟ ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾ (واته: وتیان بێگومان ئێمه‌ بێبڕواین به‌و ئاینه‌ی به‌ ئێوه‌دا نێردراوه‌) جا به‌مه‌ زانرا ئه‌وان مه‌به‌ستیان شوێنكه‌وتنی حه‌قو هیدایه‌ت نه‌بوو، به‌ڵكو مه‌به‌ستیان شوێنكه‌وتنی پووچو هه‌واو ئاره‌زوو بوو.

﴿ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ ﴾ (بۆیه‌ تۆڵه‌مان لێسه‌ندن) به‌ هۆی ئه‌وه‌ی حه‌قیان به‌درۆ ده‌زانی، وه‌ ڕه‌تیان كرده‌وه‌ به‌م گومانه‌ پووچه‌ ﴿ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴾ جا با ئه‌وانه‌ ئاگادار بن له‌سه‌ر به‌رده‌وامیان له‌ به‌درۆدانان، تووشیان ده‌بێ وه‌ك چۆن پێشی ئه‌وان تووشی سزا بوون.

(٢٦-٣٢): ﴿ وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦٓ إِنَّنِي بَرَآءٞ مِّمَّا تَعۡبُدُونَ (٢٦) إِلَّا ٱلَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُۥ سَيَهۡدِينِ (٢٧) وَجَعَلَهَا كَلِمَةَۢ بَاقِيَةٗ فِي عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ (٢٨) بَلۡ مَتَّعۡتُ هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمۡ

حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ وَرَسُولٞ مُّبِينٞ ﴿٢٩﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٠﴾ وَقَالُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنَ ٱلۡقَرۡيَتَيۡنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ أَهُمۡ يَقۡسِمُونَ رَحۡمَتَ رَبِّكَۚ نَحۡنُ قَسَمۡنَا بَيۡنَهُم مَّعِيشَتَهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَرَفَعۡنَا بَعۡضَهُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ لِّيَتَّخِذَ بَعۡضُهُم بَعۡضٗا سُخۡرِيّٗاۗ وَرَحۡمَتُ رَبِّكَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ﴿٣٢﴾﴾:

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی میللەتـی ئیبراهیمـی خەلیـل ﷺ کـە ئەهلـی کتێـبو هاوبەشـەکان دەدرێنـە پاڵـی، وە هەموویـان پێیـان وایـە کـە ئـەوان شـوێن ڕێگاکـەی کەوتـوون، جـا هەواڵیـداوە دەربـارەی ئاینەکـەی کـە بـە میـرات بەجێـی هێشـتووە بـۆ نەوەکانـی فەرموویەتـی: ﴿ وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦٓ ﴾ (واتـە: کاتـێ ئیبراهیـم بـە باوکـیو گەلەکـەی وت) ئەوانـەی لەگـەڵ خـوادا پەرسـتراویان دانابـوو، دەیانپەرسـتنو خۆیـان لێیـان نزیـک دەکـردەوە: ﴿ إِنَّنِي بَرَآءٞ مِّمَّا تَعۡبُدُونَ ﴾ واتە: مـن ڕقم لەوانەیـە لێیان دوورکەوتوومەتـەوەو دژایەتی شـوێنکەوتووانیان دەکـەم، ﴿ إِلَّا ٱلَّذِي فَطَرَنِي ﴾ (جگە لەو زاتـەی دروسـتی کردووم) من داوای پشـتیوانی ئەو دەکـەم، وە ئومێـدەوارم ڕێنماییم بکات بـە زانینـی حـەقو کارکردن بـە حەق، جا هـەروەک چۆن دروسـتی کـردوومو کاروباری بەڕێـوە بـردووم، بـەوەی دیـنو دونیـای چـاک کـردووم، ﴿ سَيَهۡدِينِ ﴾ (هـەر ئەویش ڕێنماییـم دەکات) لـەوەی گونجـاوە بۆ دیـنو دوارۆژم.

﴿ وَجَعَلَهَا ﴾ ئەم سـیفەتە ستایشـکراوە کە دایکی سـیفەتەکانو بنچینەیانە، ئەویش بریتیە لـە دڵسـۆزبوون بـۆ خوای تـاکو تەنهاو بـەری بوون لـە بەندایەتی کردنی جگـە لە خوا.

﴿ كَلِمَةَۢ بَاقِيَةٗ فِي عَقِبِهِۦ ﴾ لـە نـاو نەوەکانیـدا بەجێـی هێشـت، ﴿ لَعَلَّهُمۡ ﴾ بـۆ لای ﴿ يَرۡجِعُونَ ﴾ بگەڕێنـەوە، چونکـە بەوە بەناوبانگـەو ئامۆژگاری هەندێ لـە نەوەکانی وەک ئیسـحاقو یەعقـووب بە هەندێکی دیکـە، هەروەکو خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَرۡغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبۡرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفۡسَهُۥ ﴿١٣٠﴾ ﴾البقرة، (واتـە: کـێ ڕوو وەرئەگێـڕێ لـە ئاینـی ئیبراهیـم مەگـەر کەسـێک کە خۆی هـەرزە کردبێـت) تا کۆتایـی دەقەکان، بە بـەردەوام ئـەم یەکتاپەرسـتیە لەناو وەچەکانیـدا بوونی هەبوو، هەتا خۆشـگوزەرانیو سـتەمو زۆرداری کەوتـە ناویانـەوە، خوا ﷻ فەرمـووی: ﴿ بَلۡ مَتَّعۡتُ هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمۡ ﴾ واتـە: بەڵکو بەهرەم بـە ئـەوانو بـاوو باپیرانیاندا، بـە جۆرەها حەزوو ئـارەزوو، تا ئـەوە بوو بە ئامانـجو کۆتایی مەبەسـتەکانیان، بـەردەوام خۆشەویسـتی لـە دڵیانـدا زیادی دەکـرد، هەتا بوو بە سـیفەتێکی چەقیـوو بیـرو باوەڕێکی قـووڵ لایـان، ﴿ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ ﴾ (هەتـا قورئانیـان بۆ هات)

کـە هیـچ گومـانو دوو دڵیەکـی تێدانیـە، ﴿ وَرَسُولٌ مُّبِينٌ ﴾ واتـە: ڕوونکـەرەوەی قورئان، بەڵگـەی پێغەمبەرایەتـی بـە ڕوونو ڕەوانـی دەرکـەوت، بـە ڕەوشـتو موعجیزەکانـی، وە بـەوەی هێنابـووی، وە بەوەی پێغەمبەران بەڕاسـتیان دانابوو، وە بە خـودی بانگەوازەکەی ﷺ ﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ ﴾ واتـە: (جـا کاتـێ قورئانیـان بـۆ هات) کە پێویسـت دەکات لەسـەر ئـەو کەسـەی کـە کەمتریـن دیـن عەقڵـی پەسـندی هەیـە وەریبگـرێو ملکەچـی ببێـت ﴿ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾ (واتـە: وتیـان ئەمـە جادووە وە بە ڕاسـتی ئێمـە بڕوای پێناکەیـن) ئەمـە لـە مەزنترینـی عینـادیو دژایەتـی کردنـە، پاشـان ئـەوان تەنها بـە ڕوو وەرگێڕانـەوە نەوەسـتان، بەڵکـو بـە نکوڵیکردنیشـەوە جـا ڕازی نەبـوون هەتـا لەکەداریان کـرد بـە لەکـەدار کردنێکـی ناشـرین، وە خسـتیانە ئاسـتی جادوویەکی پووچـەوە کە پێی هەڵناسـێ جگـە لـە پیسـترینی نـاو خەڵکـیو درۆزنترینیـان لـە درۆزنترینـی نـاو خەڵکی، وە ئـەوەی پاڵنەریـان بـوو لەسـەر ئـەوە سـتەمو زۆرداریان بـوو، بـەو بەهرەیەی خـوا پێی دابـوون بـە خۆیـانو بـاو و باپیرانیان.

﴿ وَقَالُوا۟ ﴾ پێشـنیاریان کـرد لەسـەرخوا بە عەقڵـە تێکچووەکانیانو وتیـان: ﴿ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴾ واتـە: (بۆچـی ئەم قورئانـە نەنێردراوەتە خـوارەوە بۆ پیاوێـک) گـەورەو مـەزن بـێ بەلایانەوە لـە خەڵکی مەککە، یـان لە خەڵکـی تائیف وەک وەلیـدی کـوڕی موغیـرەو وێنـەی ئەو، کـە ئەو لـە لای ئەوان مـەزن بوو.

خـوا ﷻ پێشـنیارەکەیانی ڕەتکـردەوەو فەرمـووی: ﴿ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ﴾ واتـە: ئایـا ئـەوان لەسـەر گەنجینـەی ڕەحمەتـی پەروەردگارتـن، وە بەڕێوەبردنـی بـە دەسـتیانە، جـا پێغەمبەرایەتـیو نێردراوێتـی ببەخشـن بـە هەر کەسـێ بە ویسـتی خۆیـان، وە ڕێگری لێبکـەن لەوەی کـە دەیانـەوێ، ﴿ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ ﴾ واتـە: لـە ژیانی دونیـادا ﴿ وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴾ (واتە: بەزەیـی پەروەردگـارت بـۆ تۆ لـەوە چاکتـرە کە ئـەوان کـۆی دەکەنەوە) لـە دونیا.

جـا ئەگەر گوزەرانـی ژیانی بەنـدەکانو ڕزقو ڕۆزیان بەدەسـتی خوا بێ، ئەو زاتە دابەشـی بـکات لەنێـوان بەندەکانیـدا، ڕزقو ڕۆزی بەرفـراوان بـکات بـۆ هـەر کەسـێ کـە بیەوێ، وە تەنگـی بـکات لەسـەر هەرکەسـێ کـە بیەوێـت بەپێـی حیکمـەتو دانایـی خـۆی، جا ڕەحمەتـە ئاینیەکـەی کـە بەرزترینیـان پێغەمبەرایەتـیو نێردراوێتیە لە پێشـترە بە دەسـتی خـوا بـێ، بێگومان خـوا زاناتـرە پەیامەکەی لـە کوێـدا دادەنێ.

بۆیــە زانراوە بەڕاســتی پێشــنیارەکانیان پــووچو ناڕەوایــە، وە هەڵســوڕاندنی کاروبارەکان بە گشــتی دینــیو دونیایــی بە دەســتی خوای تــاکو تەنهایــە. ئەمــە قەناعــەت پێکردنیانە لەو ڕووەی هەڵــە بــوون لە پێشــنیار کــردن، ئەوە تەنهــا ســتەمکردنو ڕەتکردنــەوەی حەق بوو لەلایــەن ئەوانەوە.

وە قســەکانیان: ﴿لَوۡلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنَ ٱلۡقَرۡيَتَيۡنِ عَظِيمٍ﴾ ئەگــەر حەقیقەتــی پیاوەکانیــان بناســیایە، وە ئــەو ســیفاتانەی بــە هۆیانــەوە گەورەیــی ڕێــزی پیاو دەناســرێ، وە مەزنــی پلــەو پایــەی لــەلای خــواو لــەلای خەڵکــی ئــەوە دەیانزانــی کــە موحەممــەدی کــوڕی عەبدوڵــلای کــوڕی عەبدولموتەلیــب ﷺ ئــەو مەزنترینــی پیاوانــە، لــەڕووی قەدرو ڕێــزو فەخــرو شــانازیەوە، وە تەواوترینیانە لــە ڕووی عەقڵەوەو خاوەنی زۆرترین زانســتە لە ناویانــدا، وە گەورەترینیانــە لــە ڕووی بیــرو بۆچــوونو بــە جەرگیو خۆڕاگریو ڕەوشــت بــەرزیو لەســەرخۆییو میهرەبانــیو خۆپارێــزیو ڕێنمایــی کارترینیانە.

ئــەو جەمســەری بازنــەی کەماڵــە، وە لــە وەســفەکانی پیاوەتیدا گەیشــتۆتە ئەوپــەڕی، بێدار بــن ئــەوە پیاوێکــی زانایــە بــە ڕەهایــی، دۆســتو دوژمنان شــایەتی بــۆ دەدەن، ئنجــا ئیتر چــۆن هاوبەشــدانەران فەزڵــی کەســێک دەدەن بەســەریدا کە مســقاڵە زەرەیــەک کەماڵێتی ئــەوی تێــدا نیــە؟! وە لــە تاوانباریــیو ئەوپــەڕی گەمژەیــیو بێ عەقڵیــدا ئــەو خوایەی کە دەیپەرســتێو لێــی دەپاڕێتــەوەو هــاواری لێــدەکات، داینــاوە بــە بتێــک یــان بــەردێ یان درەختــێ، کــە نــە زیانو نە ســوودو نــە بەخشــینو نــە ڕێگریکردنی بە دەســتە، ئــەوە بارە بەســەر خاوەنەکەیەوە، پێویســتی بەوەیە کەســێ بــە بەرژەوەندیەکانی هەڵســێ، ئایــا ئەمە لە کاری گەمــژەو گێــلو شــێتەکان نیــە؟ جــا چۆن شــتێکی لــەم جۆرە بــە مــەزن دادەنرێ؟ یــان چــۆن فەزڵــی دەدرێ بەســەر کۆتایــی پێغەمبــەرانو گــەورەی نەوەکانی ئــادەم؟ بەڵام ئەوانــەی بێبــڕوان تێناگەن.

لــەم ئایەتــەدا ئاگــادار کردنەوەیــەک هەیە لەســەر حیکمەتی خوا، بــە فەزڵ دانــی هەندێ لە بەنــدەکان بەســەر هەندێکی دیکەدا لــە دونیــادا ﴿لِّيَتَّخِذَ بَعۡضُهُم بَعۡضٗا سُخۡرِيّٗا﴾ واتە: تا هەندێکیــان ڕام بهێنرێــن بۆ هەندێکــی دیکە لە کارکردنو پیشەســازیدا.

ئەگــەر خەڵکــی یەکســان بــن لــە دەوڵەمەندیدا ئــەوە هەندێکیــان پێویســتیان بــە هەندێکی دیکــە نەدەبــوو، بۆیــە زۆرێ لــە بەرژەوەنــدیو ســوودەکانیان لــە کار دەکەوت.

وە بەڵگــەی تێدایــە لەســەر ئــەوەی کــە نیعمەتــە ئاینیەکانــی خــوا چاکتــرن لــە نیعمەتــە

دونیاییەكانـی، هەروەكو خوا ﷻ لـە دەقێكی دیكـەدا فەرموویەتی: ﴿ قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ۝٥٨ ﴾يونـس، (واتـە: ئەی موحەممـەد ﷺ بڵێ: هەر بـە هـۆی چاكـەو میهرەبانی خواوەیـە، جا كەواتە بـا بەوە دڵخـۆش بن ئەوە چاكتـرە بۆیان لـەوەی كـۆی دەكەنەوە لە شـتی ئـەم دونیایە).

(٣٣-٣٥): ﴿ وَلَوۡلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ لَّجَعَلۡنَا لِمَن يَكۡفُرُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ لِبُيُوتِهِمۡ سُقُفٗا مِّن فِضَّةٖ وَمَعَارِجَ عَلَيۡهَا يَظۡهَرُونَ ۝٣٣ وَلِبُيُوتِهِمۡ أَبۡوَٰبٗا وَسُرُرًا عَلَيۡهَا يَتَّكِـُٔونَ ۝٣٤ وَزُخۡرُفٗاۚ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَٱلۡأٓخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلۡمُتَّقِينَ ۝٣٥ ﴾

﴿ وَلَوۡلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ لَّجَعَلۡنَا لِمَن يَكۡفُرُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ ﴾ خـوا ﷻ هەواڵ دەدات بـەوەی كـە دونیـا لـەلای ئەو یەكسـان نیـە بە هیـچ، بێگومـان ئەگـەر لوتـفو میهرەبانی ئـەو نەبووایـە بـە بەندەكانی كە هیچ شـتێ پێشـی ناكەوێ، ئـەوە ژیانی دونیـای دەكردەوە لەسـەر ئـەو كەسـانەی بێبـڕوان بـە كردنەوەیەكی مـەزن، وە دایدەنـێ: ﴿ لِبُيُوتِهِمۡ سُقُفٗا مِّن فِضَّةٖ وَمَعَارِجَ ﴾ واتـە: (سـەقفی خانووەكانیـان لـە زیو بووایـە هەروەهـا) پلەكان لە زیـوو، ﴿ عَلَيۡهَا يَظۡهَرُونَ ﴾ كـە پێی سـەردەكەون بۆ سـەربانەكانیان.

وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخْرُفًا وَإِن
كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ
لِلْمُتَّقِينَ ﴿٣٥﴾ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا
فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ
أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ
بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴿٣٨﴾ وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلْيَوْمَ
إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٩﴾ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ
ٱلصُّمَّ أَوْ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ وَمَن كَانَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٠﴾ فَإِمَّا
نَذْهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ ﴿٤١﴾ أَوْ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِى
وَعَدْنَٰهُمْ فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ ﴿٤٢﴾ فَٱسْتَمْسِكْ بِٱلَّذِىٓ أُوحِىَ
إِلَيْكَ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤٣﴾ وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ
وَسَوْفَ تُسْـَٔلُونَ ﴿٤٤﴾ وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ
أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا
مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ فَقَالَ إِنِّى رَسُولُ رَبِّ
ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٦﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ ﴿٤٧﴾

﴿ وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴾ (وە دەرگـای زۆرمـان بۆ خانوەکانیـان دادەنا وە کورسـیو قەنەفـەی زۆر تـا لەسـەری دانیشـنو پـاڵ بدەنـەوە) لـە زیـو، وە بـۆی دادەنـێ ﴿ وَزُخْرُفًا ﴾ واتـە: دنیـای بـۆ دەرازاندنەوە بە جۆرەهـا ڕازاندنەوە، وە پێیانی دەبەخشـی هەرچـی ئـارەزووی دەکـەن.

بـەڵام ڕێگـری کردنـی لـەوە میهرەبانیـە بۆ بەندەکانـی، لە مەترسـی ئەوەی پەلـە نەکەن لـە کوفـرو سـەرپێچی کردنـدا بـە هـۆی خۆشەویسـتی دونیـا.

ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی خـوا ﷻ ڕێگـری لـە بەندەکانـی دەکات هەنـدێ لـە کاروبارەکانـی دونیـا، ڕێگـری کردنێکـی گشـتی یـان تایبەتـی، بـە هـۆی بەرژەوەندیـەکان، بێگومـان دونیـا لـەلای خـوا بە قـەد باڵە مێشـوولەیەک کێـشو ڕێـزی نیە، وە هەمـوو ئەو باسـکراوانە چێـژو لەزەتی ژیانـی دونیان، لەنـاو دەچـنو دەفەوتێـن، بـەڵام ڕۆژی دوایـی لـەلای خـوا چاکتـرە بـۆ ئـەو کەسـانەی لە پەروەردگاریان دەترسـن، بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانـیو دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی، چونکـە نازونیعمەتەکانـی تـەواوە لە هەمـوو ڕوویەکەوە، وە لە بەهەشـتدا هەیە ئـەوەی نەفس ئـارەزووی دەکاو چاویـش لەزەتـی لێوەردەگـرێ، ئەوان تیایـدا دەمێننەوە بە هەمیشـەیی، ئای چەنـدە جیـاوازی لەنێوانـی ئـەو دوو ماڵـەدا هەیە!

(٣٦-٣٩): ﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴿٣٨﴾ وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾:

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات لـە سـزاو تۆڵـەی بە ئێشـی لـەو کەسـەی ڕوو وەردەگێری لـە یادی خـوای میهرەبـان، فەرموویەتـی: ﴿ وَمَن يَعْشُ ﴾ واتـە: پشـت هەڵبکاتو بەرهەڵسـتی بکات ﴿ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ ﴾ (واتـە: لـە یـادی خـوای میهرەبان) ئەویـش قورئانی مەزنـە، کە ئەویش

مەزنتریـن ڕەحمەتـە کـە خوا بە هۆیـەوە ڕەحمی بە بەندەکانـی کردوە، جا هەر کەسـێ وەری بگرێـت ئـەوە چاکترین بەخششـی وەرگرتووە، وە سـەرکەوتوو بووە بە مەزنتریـن داواکاری، وە هەرکەسـێک پشـتی تێبـکاتو ڕەتـی بکاتەوە، ئـەوە بێگومـان زەرەرمەندو خەسـارەتمەند بـووە هەرگیـز خۆشـبەخت نابـێ، خوا شـەیتانێکی بۆ ئامـادە دەکات هەمیشـە لەگەڵیـدا بێت، بەڵێنـی پێبـداتو ئـاواتو ئومێـدی پێبخاتە بـەر، وە هانی بدات بـۆ گوناهو سـەرپێچی کردن. ﴿ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ ﴾ واتـە: (شـەیتانەکان ڕێگریان دەکەن لە) ڕێگای ڕاسـتو ئاینـی پتـەو ﴿ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴾ (واتـە: واش دەزانن هـەر ئەوانن هیدایـەت دراون) بـە هـۆی جوانکـردنو ڕازاندنەوەی شـەیتان بۆ پووچو بەتـاڵو بەچاک دانانی لـە لای، وە ڕوو وەرگێڕانیـان لە حەق، ئەمـەو ئەمە پێکـەوە کۆبوونەتەوە.

ئەگـەر بوتـرێ: ئایـا ئەمـە بیانووی هەیـە لـەو ڕووەی کـە وا گومان دەبـا ئـەو هیدایەتدەرە، بـەو شـێوەیەش نیە؟ دەوتـرێ: ئەمەو وێنـەی ئەمانە بیانوویان نیـە، ئەوانە سـەرچاوەی نەفامیان ڕوو وەرگێڕانـە لـە یـادی خوا، لەگـەڵ ئـەوەی توانای هیدایـەت وەرگرتنیان هەبـووە. خۆیان گرتوەتـەوە لـە هیدایـەت لەگـەڵ توانایـان لەسـەری، وە ئارەزوویان لە پـووچو بەتـاڵ بووە، گونـاە گوناهـی خۆیانـەو تاوانیـش تاوانی خۆیانـە. ئەمە حاڵەتی ئـەم ڕوو وەرگێڕەیـە لە یادی خـوا لـە دونیـادا، لەگـەڵ شـەیتانەکەی، ئەویـش گومڕایـیو سەرلێشـێواویو هەڵگێڕانەوەی ڕاستیەکانە.

بـەڵام ئەگـەر گەیشـتە لای خـوا لـە دواڕۆژدا، ئـەوە خراپترین حاڵـی هەیە، ئەویش ئاشـکرا کردنـی پەشـیمانیو حەسـرەتە، وە خەمو خەفەتێک برینەکەی چارەسـەر نـاکاتو بەری بوون لە هاوڕێ شـەیتانەکەی، لەبـەر ئەمەیە فەرموویەتـی: ﴿ حَتَّىٰ إِذَا جَاءَنَا قَالَ يَا لَيْتَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بُعْدَ الْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ الْقَرِينُ ﴾ (واتـە: هەتـا کاتـێ دەمرێو دێتـە لامان دەڵـێ خۆزگە نێوانی مـنو تـۆ بە قەد نێوانـی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا بووایـە ئای چ هاوڕێیەکی خـراپ بووی)، وەک خوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَا وَيْلَتَىٰ لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلْإِنسَانِ خَذُولًا ﴿٢٩﴾ ﴾الفرقـان (واتـە: وە ڕۆژێکە کە سـتەمکار قـەپ دەکات بە هـەر دوو دەسـتی خۆیـداو دەڵێ خۆزگـە لەگەڵ پێغەمبـەردا ڕێگـای ڕاسـتم بگرتایەتە بەر * ئـای تیاچـوون بـۆ مـن خۆزگە فـڵان کەسـم نەکردایە بە هـاوەڵو خۆشەویسـتی خـۆم * بە ڕاسـتی ئـەو کەسـەی کە کردم بە هـاوەڵ منی لـە قورئان وێڵ کـرد دوای ئـەوەی قورئانم پێ

گەیشــت و بڕوام پێی نەهێنا، وە شــەیتان هەمیشــە پشــتێکەرو پشــت بەردەرە بــۆ ئادەمیزاد).
وە دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِي ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴾ واتــە:
بەشــداربوونتان لــە ســزا هیــچ ســوودتان پێناگەیەنێــت لــە ڕۆژی دوایيــدا، ئێــوەو هــاوڕێو
خۆشەویســتانتان، چونکە هەمووتان پێکەوە بەشــدار بوون لە ســتەم، بۆیە لە تۆڵەو سزاکەیشــیدا
بەشداربوون.

هەروەهــا ســوودتان پێناگەیەنێــت ڕووحــی دڵدانــەوە لەو موسیبەتە، چونکە موســیبەت ئەگەر
ڕووبــدات لــە دونیــادا، ســزادراوان بەشــداربن تیایدا پێکــەوە، هەنــدێ جار ســووک دەبێت بە
هــۆی ئــەوەی هەندێکیــان دڵی ئــەوی دیکەیان دەدەنــەوە، بــەڵام موســیبەتی دواڕۆژ، بێگومان
ئــەو هەموو ســزایەکی تێدا کۆبووەتــەوە کەمترین حەوانــەوەی تێدانیــە، داوات لێدەکەین ئەی
پەروەردگــار بمانپارێــزیو بەختەوەرمــان بکەی بــە ڕەحمەتی خۆت.

(٤٠-٤٥): ﴿ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ أَوْ تَهْدِي ٱلْعُمْيَ وَمَن كَانَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٠﴾ فَإِمَّا
نَذْهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ ﴿٤١﴾ أَوْ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِي وَعَدْنَٰهُمْ فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ ﴿٤٢﴾
فَٱسْتَمْسِكْ بِٱلَّذِيٓ أُوحِيَ إِلَيْكَ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤٣﴾ وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ وَسَوْفَ
تُسْـَٔلُونَ ﴿٤٤﴾ وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ
﴿٤٥﴾ ﴾:

خــوا ﷺ دڵــی پێغەمبەرە کــەی دەداتەوە لــە خۆگرتنــەوەی بەدرۆدانەران لە بەدەمــەوە هاتنی کە
ئــەوان خێریــان تێدانیــە، وە هیــچ پاکیەکیان تێدانیــە بانگیان بکات بــۆ هیدایــەت، دەفەرموێ:
﴿ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ﴾ واتــە: ئەوانــەی کە نابیســتن ﴿ أَوْ تَهْدِي ٱلْعُمْيَ ﴾ واتــە: ئەوانەی
کــە نابینــن، یاخود ڕێنمایــی دەکــەی ﴿ وَمَن كَانَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾ واتە: (ئەو کەســەی
کــە لــە گومڕاییەکی) ڕوونو ئاشــکرادا بێــت، بە زانینی بــە گومڕاییەکــەیو ڕازی بوونی پێی.
جــا هەر وەک چۆن کــەڕ دەنگەکان نابیســتێو کوێر نابینــێو گومڕاش ڕێنمایــی وەرناگرێ،
ئەوانــە سروشــتو عەقڵیــان تێک چــووە بە پشــت تێکردنیــان لە یادی خــوا، وە بیــرو باوەڕو
ســیفەتی خراپیــان هەبــوو، ڕێگری لێدەکــردن لە نێــوان ئــەوانو ڕێنمایی دا، وە لــە ناوچوونی
بۆیان پێویســت کرد.

جــا هیــچ نەمایــەوە بــۆ ئەوانــە تەنها ســزاو تۆڵە نەبــێ، یــان لە دونیــادا یــان لــە دواڕۆژ، بۆیە
خــوا فەرموویەتــی: ﴿ فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ ﴾ واتــە: بێگومــان ئەگــەر تۆمان
مرانــد پێــش ئــەوەی نیشــانت بدەیــن ئــەوەی بەڵێنمان پێــداون لە ســزا، ئــەوە بزانە بــە هەواڵە

راستەكەمان ئێمە تۆڵەیان لێدەكەینەوە.
﴿ أَوۡ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِي وَعَدۡنَٰهُمۡ ﴾ (واتە: یان نیشانت دەدەین ئەوەی بەڵێنمان پێداون) لە سزا ﴿ فَإِنَّا عَلَيۡهِم مُّقۡتَدِرُونَ ﴾ (واتە: چونكە ئێمە بە دەسەلاتین بەسەریاندا)، بەلام ئەوە وەستاوە لەسەر ویستنی حیكمەت بۆ پێشخستنی، یان دواخستنی، ئەمە حاڵی تۆو حاڵی ئەو بە درۆدانەرانەیە.
بەلام تۆ ﴿ فَٱسۡتَمۡسِكۡ بِٱلَّذِيٓ أُوحِيَ إِلَيۡكَ ﴾ (واتە: دەست بگرە بەو قورئانەی بۆت نێردراوە) بە كردارو شوێنكەوتن، بەوەی فەرمانكراوە بە شوێنكەتنیو بانگەوازكردن بۆ لای، وە سووربوون لەسەر جێبەجێ كردنی لەنەفسی خۆتو غەیری خۆتدا، ﴿ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾ (واتە: بەڕاستی تۆ لەسەر ڕێگای ڕاستیت) كە دەتگەیەنێتە لای خواو ماڵی ڕێزداری، ئەمەش ئەوەت لەسەر پێویست دەكات زیاتر دەستی پێوە بگریو ڕێنمایی لێ وەربگری، مادام زانیت ئەوە حەقو دادپەروەریانەیە، ئەوە تۆ لەسەر بنچینەیەكی تەواویت، ئەگەر جگە لە تۆ بونیادی بنێ لەسەر گومانو دوو دڵیو ستەمو تاوان.
﴿ وَإِنَّهُۥ ﴾ ئەم قورئانە پیرۆزە، ﴿ لَذِكۡرٞ لَّكَ وَلِقَوۡمِكَۖ ﴾ واتە: جێی شانازیە بۆتانو چاكەو ستایشێكی مەزنە، وە نیعمەتێكە كە هەرگیز ئەندازە ناكرێو ناتوانرێ وەسف بكرێ، هەروەها یادتان دەخاتەوە لەوەی خێری دونیاو دوارۆژی تێدایەو هانتان دەدا لەسەری، وە شەڕو خراپەتان یاد دەخاتەوەو دەتانترسێنێ لێی. ﴿ وَسَوۡفَ تُسۡـَٔلُونَ ﴾ (لە داهاتووشدا پرسیارتان لێدەكرێ) دەربارەی ئەو قورئانە، ئایا پێی هەستان تا بەرز ببنەوەو سوود وەربگرن، یان پێی هەڵنەسان ئەو كات دەبێتە بەڵگەو حوججە بەسەرتانەوە، وە دەبێتە كوفرو بێبڕواییتان بەم نیعمەتە؟
﴿ وَسۡـَٔلۡ مَنۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلۡنَا مِن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ءَالِهَةٗ يُعۡبَدُونَ ﴾ (واتە: تۆ پرسیار بكە لەو پێغەمبەرانەی پێش تۆ ناردوومانن ئایا بێجگە لە خوای میهرەبان بڕیارمان داوە پەرستراوانێک كە بپەرسترێن)، هەتاوەكو بتپەرستان جۆرە بەڵگەیەكیان بە دەستەوە بێ، تیایدا شوێنی یەكێک لە پێغەمبەران بكەون.
بێگومان ئەگەر تۆ پرسیاریان لێ بكەی، وە داوای زانیاری بكەی دەربارەی بارودۆخیان، نابینی یەكێ لە ئەوان بانگەشە بۆ پەرستراوێكی دیكە بكات لەگەڵ خوادا، لەگەڵ ئەوەی هەموو پێغەمبەران لەسەرەتاوە بۆ كۆتایان بانگەشە بۆ بەندایەتی خوای تاكو تەنهای بێ هاوبەش دەكەن، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ

﴿وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ ۝٣٦﴾النحل، (واتە: سوێند بە خوا لە ناو هەموو گەلو ئۆممەتێکمان ناردوە بە مەی تەنها خوا بپەرستن و دوور کەونەوە لە پەرستنی هەر پەرستراوێکی تر)، وە هەموو پێغەمبەرێ خوا ناردوویەتی بە گەلەکەی فەرمووە: ﴿ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ ۝٥٩﴾الأعراف (واتە: تەنها خوا بپەرستن ئێوە هیچ پەرستراوێکتان نیە بێجگە لە خوا) ئەمە بەڵگەیە، کە هاوبەشدانەران هیچ شتێکیان بە دەستەوە نیە پشتی پێ ببەستن لە هاوبەشدانانیان، نە عەقڵێکی تەواو، نە وەرگرتنێ لە پێغەمبەرەکانیانەوە.

(٤٦-٥٦): ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَقَالَ إِنِّي رَسُولُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٤٦ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنۡهَا يَضۡحَكُونَ ۝٤٧ وَمَا نُرِيهِم مِّنۡ ءَايَةٍ إِلَّا هِيَ أَكۡبَرُ مِنۡ أُخۡتِهَاۖ وَأَخَذۡنَٰهُم بِٱلۡعَذَابِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ۝٤٨ وَقَالُواْ يَٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ إِنَّنَا لَمُهۡتَدُونَ ۝٤٩ فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابَ إِذَا هُمۡ يَنكُثُونَ ۝٥٠ وَنَادَىٰ فِرۡعَوۡنُ فِي قَوۡمِهِۦ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَيۡسَ لِي مُلۡكُ مِصۡرَ وَهَٰذِهِ ٱلۡأَنۡهَٰرُ تَجۡرِي مِن تَحۡتِيٓۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ۝٥١ أَمۡ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ مَهِينٞ وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ۝٥٢ فَلَوۡلَآ أُلۡقِيَ عَلَيۡهِ أَسۡوِرَةٞ مِّن ذَهَبٍ أَوۡ جَآءَ مَعَهُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ مُقۡتَرِنِينَ ۝٥٣ فَٱسۡتَخَفَّ قَوۡمَهُۥ فَأَطَاعُوهُۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ۝٥٤ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ أَجۡمَعِينَ ۝٥٥ فَجَعَلۡنَٰهُمۡ سَلَفٗا وَمَثَلٗا لِّلۡأٓخِرِينَ ۝٥٦﴾

کاتێ خوا ﷻ فەرمووی: ﴿وَسۡـَٔلۡ مَنۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلۡنَا مِن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ءَالِهَةٗ يُعۡبَدُونَ﴾ خوا ﷻ حاڵی مووسا عليه السلام و بانگەوازەکەی روون کردۆتەوە، کە ئەوە دیارترینی بانگەوازی ناو پێغەمبەرانە، وە لەبەر ئەوەی خوا زۆر لە کتێبەکەیدا ناوی هێناوە، جا باسی حاڵی ئەوی کردوە لەگەڵ فیرعەون، وەک فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ (واتە: بەڕاستی مووسامان بە بەڵگەکانمانەوە نارد)، کە بەڵگەی یەکلاکەرەوەن لەسەر ڕاستی ئەو پەیامەی هێناویەتی، وەک گۆچانو مارو ناردنی کوللەو ئەسپێ، تا کۆتایی دەقەکان، ﴿إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَقَالَ إِنِّي رَسُولُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ واتە: بانگی کردن بۆ دان پێدانان بە پەروەردگاریانو ڕێگری لێکردن لە بەندایەتی کردنی جگە لەو.

(٤٧-٤٨): ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنۡهَا يَضۡحَكُونَ﴾ واتە: ڕەتیان کردەوەو نکوڵیان لێکردوو گاڵتەیان پێکرد بە ستەمو خۆبەزلزانینەوە، ئەمەش بە هۆی کەمتەرخەمی نیشانەکانو نەبوونی ڕوونکردنەوەیان نەبوو، بۆیە فەرموویەتی:

وَمَا نُرِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ إِلَّا هِىَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا وَأَخَذْنَٰهُم
بِٱلْعَذَابِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤٨﴾ وَقَالُواْ يَٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ٱدْعُ لَنَا
رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا
عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴿٥٠﴾ وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِى قَوْمِهِۦ
قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِى مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِى مِن
تَحْتِىٓ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٥١﴾ أَمْ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ مَهِينٌ
وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ﴿٥٢﴾ فَلَوْلَآ أُلْقِىَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَآءَ
مَعَهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ ﴿٥٣﴾ فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ
فَأَطَاعُوهُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٥٤﴾ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا
ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُمْ
سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْءَاخِرِينَ ﴿٥٦﴾ ۞ وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا
إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓاْ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ
هُوَ ۚ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًۢا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ إِنْ هُوَ
إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَٰهُ مَثَلًا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾
وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴿٦٠﴾

﴿ وَمَا نُرِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ إِلَّا هِىَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا ﴾ واته‌: به‌ڵگه‌ دواخراوه‌كه‌ به‌هێزتر بووه‌ له‌ به‌ڵگه‌ی پێشوو، ﴿ وَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ ﴾ (وه‌ تووشی به‌ڵاو سزامان كردن) وه‌ك كولله‌و ئه‌سپێو بۆقو خوێنو ئایه‌تو نیشانه‌ تیرو ته‌سه‌له‌كان ﴿ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ (بۆ ئه‌وه‌ی بگه‌ڕێنه‌وه‌ بۆ لای ئیسلام) و ملكه‌چی ببن، بۆ ئه‌وه‌ی هاوبه‌شدانانو شه‌رو خراپه‌یان نه‌مێنێ.

(٤٩): ﴿ وَقَالُواْ ﴾ كاتێ كه‌ سزایان بۆ دابه‌زی (گوتیان:) ﴿ يَٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ﴾ مه‌به‌ستیان پێی عیسا عليه السلام بوو، وه‌ ئه‌مه‌ یان گاڵته‌ پێكردنی بوو، یان ئه‌م دواندنه‌ له‌لایه‌ن ئه‌وانه‌وه‌ ستایشێك بوو بۆی، گه‌ردن كه‌چ بوون بۆی به‌وه‌ی له‌گه‌ڵیدا دوانو له‌گه‌ڵیاندا ده‌دوێ، ئه‌وانه‌ی پێیان وابوو زاناو شاره‌زاكانیانن، كه‌ بریتی بوو له‌ جادوو گه‌ره‌كان، جا وتیان: ﴿ يَٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ ﴾ به‌وه‌ی خوا تایبه‌تی كردووی پێی، وه‌ به‌و په‌یمانه‌ی كه‌ به‌ تۆی داوه‌ له‌ فه‌زڵو چاكه‌كان، ئه‌م سزایه‌مان له‌سه‌ر لابه‌ ﴿ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ ﴾ (ئه‌وسا به‌ڕاستی ئێمه‌ بڕوا دێنین) ئه‌گه‌ر خوا ﷻ ئه‌و سزایه‌مان له‌سه‌ر لابات.

(٥٠): ﴿ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴾ واته‌: (جا كاتێ سزاكه‌مان له‌سه‌ریان لابرد كتوپڕ په‌یمانه‌كه‌یان هه‌ڵده‌وه‌شانه‌وه‌) به‌وه‌فا نه‌بوون به‌وه‌ی كه‌ وتیان، به‌ڵكو ناپاكیان كردو به‌رده‌وام بوون له‌سه‌ر كوفر كردنیان، ئه‌مه‌ ئه‌و ئایه‌ته‌یه‌ كه‌ ده‌فه‌رموێ: ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٍ مُّفَصَّلَٰتٍ فَٱسْتَكْبَرُواْ وَكَانُواْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ ٱلرِّجْزُ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ ۖ لَئِن كَشَفْتَ عَنَّا ٱلرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٣٤﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلرِّجْزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴿١٣٥﴾ ﴾ الأعراف.

(واتــە: ئەوسـا ئێمــە ناردمانــە سـەریان لافـاوو کوللــەو ئەسـپێو جۆرەها بـۆقو خوێن کە چەنـد بەڵگـەو موعجیزەیەکـی ڕوون بـوون کەچـی خۆیـان بە گـەورە زانی (لـەوەی بڕوا بهێنـن) بێگومـان ئەوانــە گەلێکی تاوانبـار بوون * کاتێکیش ئەو سـزاو بەڵایەیان بەسـەردا هـات وتیـان: ئـەی مووسـا لـە پەروەردگـارت بپاڕێـرەوە بۆمـان وەک بەڵێنی بە تـۆ داوە سـوێند بـێ گەر ئەم بەڵاو سـزایەمان لەسـەر لابـەرێ بێگومان بـڕوات پێدێنیـن، وە نەوەی ئیسـرائیلت لەگەڵـدا دەنێریـن * بـەڵام کاتێـک سـزاکەمان لەسـەریان لابـرد تا گەیشـتنە مـاوەی دیاریکـراو (بـۆ تیاچوون) دەسـت بەجـێ پەیمانەکەیان هەڵوەشـاندەوە).

(٥١): ﴿وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِي قَوْمِهِۦ قَالَ﴾ (واتــە: فیرعــەون جاڕیـدا بــە نـاو گەلەکەیـداو وتـی) بە شـانازی کردن بــە پووچەکەیــەوە، موڵکو پاشـایەتیەکەی یاخی کردبـوو، ماڵو سـامانەکەیو سـەربازەکانی گومڕایان کردبـوو: ﴿يَٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ﴾ واتە: ئایا مـن خـاوەن ئەمانــە نیـم، بەڕێوەیـان دەبـەم ﴿وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِي مِن تَحْتِيٓ﴾ واتە: ئەو جۆگـەو ڕووبارانــەی نیـل، کە بەردەم کۆشـکو بە ناوەڕاسـتی باخەکانمـدا دەچن ﴿أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ (واتــە: دە ئایـا نابینـن) ئەم دەسـەڵاتە بەرفراوانە؟ ئەمـەش لە نافامـی قووڵیەوە بـوو، کاتـێ شـانازی کـرد بـە شـتێکەوە لـە دەرەوەی زاتـی خۆیەتی، شـانازی نەکـرد بە وەسـفە سـتایش کـراوەکان، وە نە بـە کـردەوە چاکەکان.

(٥٢): ﴿أَمْ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ مَهِينٌ﴾ مانـای ئەوەیـە -خـوا ڕووی ڕەش بـکات- مەبەسـت لـە بە بێڕێزی، مووسـای کـوڕی عیمران، کەلیمی خـوای میهرەبـان، بەڕێز لە لای خـوا، واتــە: مــن عەزیزو بــە دەسـەڵاتم، ئەویـش زەلیلو بـێ چارەو هـەژارە، جـا کاممان چاکتریـن؟ ﴿وَلَا يَكَادُ يُبِينُ﴾ (واتــە: ناتوانـێ بە چاکی قسـە بـکات) ئەوەی لــە ناخیدایە دەربڕێـت، چونکـە زمانـی پـاراو نیـە، ئەمــەش بــە هیچ جـۆری بــە عەیـب ناژمێردرێت، ئەگـەر بتوانـێ ڕوونـی بکاتــەوە ئـەوەی لــە ناخیدایـە، ئەگەر چی قسـەکردنیش لەسـەری گـران بێت.

(٥٣): پاشـان فیرعـەون وتـی: ﴿فَلَوْلَآ أُلْقِيَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ﴾ واتــە: ئایـا بۆچـی مووسـا ﵇ بـەم شـێوەیە نیـە، کـە ڕازابێتەوە بـە دەسـتبەندی زێڕو زیـو؟ ﴿أَوْ جَآءَ مَعَهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ﴾ (واتــە: یـان فریشـتەی لەگەڵـدا نەهاتـووە) یارمەتـی بـدەن لەسـەر بانگەوازەکـەیو پشـتیوانی لێبکەن لەسـەر قسـەکانی؟!

(٥٤): ﴿فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ﴾ واتــە: جـا بــەم جـۆرە عەقڵیانـی خروشـاندو

هەڵیخەڵەتانـدن، بـەوەی بـۆی دەرخسـتن لـەم گومانانە کـە نەقڵـەوی دەکات نە برسـێتی لادەبـات، هیـچ حەقیقەتێکیـش لـە ژێریـدا نیـە، بەڵگـەش نیـە نە لەسـەر حەقو نە لەسـەر پووچیـش، لای کـەس بایـەخو ڕەواجـی نیـە مەگـەر لـە لای ئەوانـەی عەقڵیـان لاوازە.

جـا چـی بەڵگەیەک دەیسـەلمێنێ کـە فیرعەون لەسـەر حەقە؟ لەبـەر ئەوەی موڵکی میسـر هـی ئـەوەو دەریاکانـی بـە ژێـر کۆشـکەکانیدا دەڕۆن؟! وە چ بەڵگەیـەک هەیـە لەسـەر پووچـی ئـەوەی مووسـا ﷺ هێناویەتـی؟ لەبـەر ئـەوەی شـوێنکەوتووی کەمـەو زمانـی قورسـەو خـوا نەیڕازاندوەتەوە بە خشـڵو زێڕ، بەڵام گەیشـتە دارودەسـتەیەک هیچ عەقڵو ژیریەکیـان نیـە، جـا هەرچـی بڵێ شـوێنی دەکەون لـە حەقو ناحـەق ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ﴾ (واتـە: بەڕاسـتی ئەوان گەلێکی لەسـنوور دەرچـوو بوون) جا بە هـۆی گوناهو خراپەکاریـان خـوا فیرعەونـی کردە هـاوڕێو هاودەمیان، هاوبەشـدانانو خراپـەی لە لایان جـوان دەکرد.

(٥٥-٥٦): ﴿فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا﴾ واتـە: تووڕەیـان کردیـن بـە هـۆی کردەوەکانیانـەوە، ﴿ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَـٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٥﴾ فَجَعَلْنَـٰهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْـَٔاخِرِينَ﴾ بـۆ ئـەوەی پەندوەرگـران پەندیـان لێوەربگـرن، وە ئامۆژگـاری وەربگرن بـە بارودۆخیان ئەوانـەی ئامۆژگـاری وەردەگرن.

(٥٧-٦٥): ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓا۟ ءَأَـٰلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ هُوَ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًۢا بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَـٰهُ مَثَلًا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَـٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴿٦٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِ هَـٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٢﴾ وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلْبَيِّنَـٰتِ قَالَ قَدْ جِئْتُكُم بِٱلْحِكْمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى تَخْتَلِفُونَ فِيهِ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ هَـٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦٤﴾ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٦٥﴾﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا﴾ واتە: (کاتێ عیسـای کـوڕی مەریەم بـە نموونـە هێنرایـەوە) ڕێگـری کـرا لە پەرسـتنی، وە پەرسـتنی هێنرایە ئاسـتی پەرسـتنی بتەکان ﴿إِذَا قَوْمُكَ﴾ (دەسـت بەجـێ گەلەکەت) ئەوانەی بـە درۆت دادەنێن ﴿مِنْهُ﴾ واتـە: لەبـەر ئەم نموونەی کـە هێنراوەتـەوە ﴿يَصِدُّونَ﴾ واتە: کردیانە گاڵتـەو هەرا لە

دژایەتیت، وە پێیان وابوو ئەوان سەرکەوتوون لە بەڵگەکانیاندا، وە شپرزەبوون.
﴿ وَقَالُوٓاْ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيۡرٌ أَمۡ هُوَۚ ﴾ (واتە: ئایا پەرستراوەکانی ئێمە باشترە یان) عیسا، کاتێ قەدەغەکرا لە بەندایەتی کردنی هەموویان، وە بەشدار کرا لە نێوانیاندا بە هەڕەشە لەسەر ئەو کەسەی دەیانپەرستێت، هەروەها ئەم ئایەتەش دابەزی، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ ٩٨ ﴾ الأنبياء (واتە: بەڕاستی ئێوەو ئەوانەش دەیپەرستن جگە لە خوا دەبنە سوتەمەنی دۆزەخ ئێوە دەچنە ناویەوە).
وە ڕووی بەڵگە پڕ لە ستەمکاریەکانیان، ئەوان وتیان: بێگومان جێگیر بووە لە لای ئێمەو لەلای تۆ ئەی موحەممەد ﷺ، عیسا ﵇ بەندە نزیکەکانی خوایە، ئەوانەی سەرەنجامی چاکیان بۆ هەیە، بۆچی یەکسانت کرد لە نێوان ئەوو ئەواندا لە قەدەغەکردنی پەرستی هەموویان؟ جا ئەگەر بەڵگەکەت پووچ نەبوایە هەڵنەدەوەشایەوە. وە بۆچی وتت: ﴿ إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ ٩٨ ﴾ الأنبياء. ئەمە قسەیەکە بە بۆچوونی ئەوان بتەکانو عیساش دەگرێتەوە، ئایا ئەمە دژیەک نیە؟ وە دژیەک بوونی بەڵگە، بەڵگەیە لەسەر پووچی بەتاڵی ئەو بەڵگەیە.
ئەمە ئەوپەڕی دانپێدانانە دەربارەی ئەم گومانەیان کە دڵیان پێی خۆش بووەو مژدەیان پێداوە، وە دژایەتیان پێکردوە، سوپاس بۆ خوا ئەویش لە لاوازترینو پووچترینی گومانەکانە، بێگومان یەکسان کردنی خوا لە نێوان قەدەغەکردندا لە بەندایەتی پەرستنی عیسا ﵇و نێوان قەدەغەکردنی پەرستنی بتەکان، چونکە بەندایەتی حەقی خوا ﷻ، شایستەی هیچ کەس نیە لە بەدیهێنراوەکان، نە فریشتە نزیکەکان، نە پێغەمبەران، نە جگە لەوان لە بەدیهێنراوان، ئیتر چی گومانێک هەیە لە یەکسان کردنی قەدەغەکردن لە پەرستنی عیسا ﵇و غەیری ئەو؟
وە لە فەزڵو بە چاکدانانی عیساو نزیک بوونی لە پەروەردگاری نابێتە بەڵگە لەسەر جیاوازی لە نێوان ئەوو ئەواندا لەم جێگایەدا، بەڵکو ئەوە هەروەک ئەوەیە کە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنۡ هُوَ إِلَّا عَبۡدٌ أَنۡعَمۡنَا عَلَيۡهِ ﴾ (واتە: عیسا هیچ نیە جگە لە بەندەیەک کە بەهرەمان ڕشتووە بەسەریدا) بە پێغەمبەرایەتیو حیکمەتو زانستو کردەوە ﴿ وَجَعَلۡنَٰهُ مَثَلٗا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴾ (واتە: وە کردومانە بە نموونەیەک بۆ نەوەی ئیسرائیل) تواناو دەسەڵاتی خوای پێ بناسنەوە لەسەر بەدیهێنانی بەبێ باوک.

بەڵام فەرمـوودەی خـوا ﷻ: ﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ ﴾ الأنبیاء. وەڵامدانـەوەی لـە سـێ ڕووەوە تێدایە:
یەکەمینیـان: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ بێگومان (ما) نـاوە بۆ غەیـری عاقڵ، مەسـیحو وێنـەی ئەویش ناچنـە نێویەوە.
دووەمینیـان: دوانـدن لەگـەڵ هاوبەشـدانەرانە، ئەوانـەی لـە شـاری مەککـەو دەورووبەری دەژیـان، وە ئـەوان بتیـان دەپەرسـت نەک عیسـا ﷺ.
سـێیەمینیان: خـوا ﷻ پاش ئەم دەقـە فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا ٱلْحُسْنَىٰٓ أُو۟لَٰٓئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ ﴿١٠١﴾ ﴾ الأنبیاء، (واتـە: بێگومـان ئەوانـەی لـە لایـەن ئێمەوە پێشـتر بڕیـار دراوە بۆیـان بەختـەوەری چاکەهێنانـە ڕێیـان ئەوانـە لـە دۆزەخ دوور دەخرێنـەوە) گومانـی تێدانیـە کـە عیسـاو جگـە لەویش لـە پێغەمبـەرانو پیاو چـاکان لـە چوارچێوەی ئـەم دەقەدان.
پاشـان خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴾ واتـە: (ئەگـەر بمانویسـتایە) لـە بری ئێوە فریشـتەمان دادەنا بەجێنشـینتان لە زەویـدا، وە لە زەویدا دەبـوون هەتـا نێردراومـان بـۆ دەنـاردن چەندین فریشـتە لـە ڕەگـەزی خۆیان، بـەڵام ئێوە ئـەی ئادەمیـزاد لـە تواناتانـدا نیـە فریشـتە بـێ بـۆ نێوتـان، جا لـە ڕەحمەتـی خوا بـۆ ئێوە ئەوەیـە نێردراومـان نـاردووە بۆتان لـە ڕەگـەزی خۆتان، دەتوانـن شـتیان لێوەربگرن.

وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِ هَٰذَا صِرَٰطٌ
مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ
﴿٦٢﴾ وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالَ قَدْ جِئْتُكُم بِٱلْحِكْمَةِ
وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى تَخْتَلِفُونَ فِيهِ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ
﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ
﴿٦٤﴾ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُوا۟
مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٦٥﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن
تَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٦٦﴾ ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ
بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ يَٰعِبَادِ لَا خَوْفٌ
عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴿٦٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا
وَكَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ﴿٦٩﴾ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ أَنتُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ
تُحْبَرُونَ ﴿٧٠﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ
وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ وَأَنتُمْ فِيهَا
خَٰلِدُونَ ﴿٧١﴾ وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِىٓ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ
تَعْمَلُونَ ﴿٧٢﴾ لَكُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِّنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٣﴾

﴿ وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ ﴾ واتـە: عیسـا ﷺ یەکێکـە لـە نیشـانەکانی قیامـەت، جـا ئەو زاتـەی بـە دەسـەڵاتە لـە هێنانـە بوونـی لە دایکێکـی بـێ باوک، بە دەسـەڵاتە لەسـەر زیندووکردنـەوەی مردوو لـە گۆڕەکانیان، یـان: عیسـا ﷺ لـە کۆتایـی دونیـادا دادەبـەزێ، وە دابەزینـی دەبێتە نیشـانەیەک لـە نیشـانەکانی قیامـەت ﴿ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا ﴾ واتـە: گومانتـان نەبـێ لـە هاتنـی ڕۆژی دوایـی، چونکـە بـە گومـان بـوون تیایـدا کوفـرە، ﴿ وَٱتَّبِعُونِ ﴾ (شـوێنی مـن بکـەون) بـە جێبەجـێ کردنـی ئەوەی فەرمانـم پێکـردوون، وە دوور کەوتنـەوە لـەوەی قەدەغەم لێکـردوون ﴿ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾ دەیگەیەنـێ بـۆ لای خـوای گـەورە.

﴿ وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ ﴾ لـەوەی خـوا فەرمانـی پێکردوون، چونکە بە ڕاسـتی شـەیتان ﴿ لَكُمْ عَدُوٌّ ﴾ (دوژمنـی ئێوەیـە) سـوورە لەسـەر گومراکردنتـان، هەمـوو تواناکانـی لەو بـوارەدا بەکاردێنـێ ﴿ وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ ﴾ (وە کاتێ عیسـا ﷺ بەڵگـە ڕوونەکانی هێنـان) کـە بەڵگـەن لەسـەر ڕاسـتی پێغەمبەرایەتـیو ڕاسـتی ئـەو پەیامـەی هێناویەتی، لە زینـدوو کردنەوەی مـردوو، چاکردنەوەی کوێـری زگماکو بەڵـەک، وە وێنەی ئەوانەش لـە ئایەتو نیشـانەکان، ﴿ قَالَ ﴾ بە نەوەکانی ئیسـرائیلی وت: ﴿ قَدْ جِئْتُكُم بِٱلْحِكْمَةِ ﴾ بـە پێغەمبەرایەتـیو زانسـت، بەو جـۆرەی کە پێویسـت بوون، فەرمـووی: ﴿ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى تَخْتَلِفُونَ فِيهِ ﴾ واتـە: ڕوونـی بکەمـەوە بۆتـان ڕاسـتی وەڵامەکـەی، تـا بـە هۆیـەوە ئاڵۆزیتـان لە نێـو لابچێ.

جـا عیسـا ﷺ هـات وەک تەواوکەری شـەریعەتی مووسـا ﷺ، وە بڕیارەکانـی تەورات، هەنـدێ ئاسـانکاری هێنـا کـە پێویسـت بـوو ملکەچـی ببـن، وە ئـەوەی بۆیانـی هێنـاوە وەریبگرن.

﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾ واتــە: خــوا بپەرســتن بــە تــاکو تەنهاو بــێ هاوبەشــدانان بۆی، وە فەرمانەکانــی جێبەجــێ بکــەنو دووربکەونەوە لــە قەدەغەکراوەکانــی، وە بڕوام پــێ بێننو بە ڕاســتم بزانــن ﴿ وَأَطِيعُونِ ﴾ (گوێڕایەڵــم بکەن).

﴿ إِنَّ اللَّهَ هُوَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ هَذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ ﴾ (واتە: بەڕاســتی خوا پەروەردگاری منو پەروەردگاری ئێوەیشــە تەنها ئەو بپەرســتن هــەر ئەمە ڕێگای ڕاســتە) دانپێدانانی تێدایە بــە یەکتاپەرســتی پەروەردگارێتی، بەوەی خــوا پەروەردەکەری هەموو دروســتکراوەکانێتی بــە جۆرەهــا نازونیعمەتی ئاشــکراو نهێنــی، وە دانپێدانــان بــە یەکتاپەرســتی بەندایەتیکردن بــە فەرمانکــردن بــە بەندایەتــی خــوای تــاکو تەنهــاو بــێ هاوبــەش، وە هەواڵــدان بەوەی کــە عیســا ﷺ بەندەیەکــە لــە بەندەکانــی خوا، نــەک وەک ئــەوەی گــاورەکان دەربارەی دەڵێــن: (ئــەو کــوڕی خوایە یــان یەکێکە لەو ســێ خوایــە). وە هەواڵدان بــەوەی ئەمانە کە باســکراون ڕێگــای ڕاســتن دەیگەیەنێتە لای خواو بەهەشــتەکەی.

کاتــێ عیســا ﷺ بەمــە هــات بــۆ نێویــان ﴿ فَاخْتَلَفَ الْأَحْزَابُ ﴾ واتــە: (کۆمەڵــەکان جیاوازبــوون لــە نێــوان خۆیانــدا) کۆبوونــەوە لەســەر بــە درۆدانــان ﴿ مِنْ بَيْنِهِمْ ﴾ هــەر یەکــەو دەربــارەی عیســا ﷺ قســەیەکی پووچــی دەکــرد، وە ڕەتکردنەوەی ئــەو پەیامەی هێناویەتــی، جگــە لــەوەی خــوا ڕێنمایی کــردوە لە بــڕواداران ئەوانــەی شــایەتیان بۆ داوە بــە پێغەمبەرایەتــی، وە هەمــوو ئــەوەی هێناویەتــی بەڕاســتیان دانــاوەو وتوویانــە: بەڕاســتی ئــەو بەنــدەو پێغەمبــەری خوایــە، ﴿ فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴾ واتە: ئای چەنــدە ســەختە پــەژارەو خەمــی ســتەمکاران، ئای چەنــد زەرەرمەنــدن لــەو ڕۆژەدا!!

(٦٦-٧٣): ﴿ هَلْ يَنْظُرُونَ إِلَّا السَّاعَةَ أَنْ تَأْتِيَهُمْ بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ (٦٦) الْأَخِلَّاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ (٦٧) يَا عِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ وَلَا أَنْتُمْ تَحْزَنُونَ (٦٨) الَّذِينَ آمَنُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا مُسْلِمِينَ (٦٩) ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنْتُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ تُحْبَرُونَ (٧٠) يُطَافُ عَلَيْهِمْ بِصِحَافٍ مِنْ ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنْفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ وَأَنْتُمْ فِيهَا خَالِدُونَ (٧١) وَتِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ (٧٢) لَكُمْ فِيهَا فَاكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِنْهَا تَأْكُلُونَ (٧٣) ﴾

خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ هَلْ يَنْظُرُونَ ﴾ بــە درۆدانــەران چاوەڕوانی چــی دەکەن، وە بــە تەمــای چیــن؟ ﴿ إِلَّا السَّاعَةَ أَنْ تَأْتِيَهُمْ بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾ واتــە: جــا ئەگەر ڕۆژی دوایــی هــات پرســیار ناکــرێ دەربــارەی حاڵی ئــەو کەســەی بــە درۆی دەزانێ، وە

گاڵتـەی کردوە بـەوەی کـە هێناویەتی.
بێگومان ﴿ ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۭ ﴾ واتە: (دۆسـتو خۆشەویسـتان لـە) ڕۆژی دواییدا، ئەوانەی یەکتریـان خۆشـدەوێ لە سـەر بێبڕوایی‌و بـە درۆدانانو سـەرپێچی کردنی خوا ﴿ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ ﴾ (واتـە: هەندێکیـان دوژمنـی هەندێکـی دیکـەن) چونکـە دۆسـتایەتی‌و خۆشەویسـتیان لـە دونیـادا بـۆ جگە لە خـوا بووە، بۆیـە لـە ڕۆژی قیامەتـدا هەڵگەڕاوەتەوە بـە دوژمنایەتـی ﴿ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾ (جگـە لـە خۆپارێـزان) لە هاوبەشـدانانو سـەرپێچی کـردن، چونکە خۆشەویسـتی ئـەوان بەردەوام دەبـێ، بە بـەردەوام بوونی خۆشەویسـتی لەو پێنـاوەدا. پاشـان باسـی پاداشـتی خۆپارێزانـی کردوە، خـوا ﷻ لـە ڕۆژی دواییـدا بانگیان دەکات بـەوەی دڵیـان خـۆش دەبـێ، هەمـوو بـەلاو ناخۆشـیەکیان لەسـەر لادەبـاو پێیـان دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰعِبَادِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴾ واتـە: هیـچ ترسـێک دووچارتـان نابێتـەوە لەو کاروبارانـەی ڕووبەڕووتـان دەبێتەوە، وە هیچ خـەمو پەژارەیەک تووشـتان نابـێ لـەوەی کە ڕوویـداوە، جـا ئەگـەر نارەحەتی نەماو لـە هەمـوو ڕوویەکەوە ڕەتکرایـەوە، ئـەوە خۆشویسـتراو و داواکـراو دەچەسـپێ ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ مُسۡلِمِينَ ﴾ واتـە: وەسـفیان بڕوابوونـە بـە ئایـەتو نیشـانەکانی خـوا، ئەویش بـۆ ئەوەی بەڕاسـتدانان بـە گشـتی بگرێتـەوە، وە بـەوەی بەڕاسـتدانان تەواو نابـێ تەنها بـەوە نەبێ، لە زانسـت بـە ماناکانـی‌و کـردەوە بـە ناوەڕۆکەکانـی ﴿ وَكَانُواْ مُسۡلِمِينَ ﴾ ملکەچن بۆ خـوا لە هەمـوو کاتەکانیانـدا، جا کۆیـان کردۆتەوە لە نێـوان گەردن کەچی بـە کردەوەی ئاشـکراو نهێنـی. (پێیـان دەگوتـرێ) ﴿ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ ﴾ کـە ماڵی هەمیشـەییە ﴿ أَنتُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ ﴾ ئـەو کەسـەی کردەوەی وەکـو ئێوەیە، لـە گشـت هـاوڕێو هاودەمێکتان، لە خێـزانو منداڵو دۆسـتو غەیـری وانیش.
﴿ تُحۡبَرُونَ ﴾ واتـە: ڕێزدەگیرێـن‌و دڵخۆش دەکرێن، وە فـەزڵو چاکەی پەروەردگارتان بـۆ دێ، لـە خێـرو دڵخۆشـی‌و هەمـوو لەززەتـەکان، کـە زمـان ناتوانـێ دەریـان ببـڕێ لە وەسـفکردندا، ﴿ يُطَافُ عَلَيۡهِم بِصِحَافٖ مِّن ذَهَبٖ وَأَكۡوَابٖ ﴾ واتـە: خزمەتکارەکانیـان بـە دەوریانـدا دەسـوڕێنەوە لـەو منداڵانـەی کـە هەمیشـە زینـدوون بـە خواردنەکانیـان، بـە چاکترینـی قـاپو قاچـاخو ڕازاوەترینیـان، ئەویـش بریتیـە لـە سـینی ئاڵتـون، وە خواردنەوەکانیـان بـە چاکترینی قـاپو قاچاخەکانـە، کە بریتیـە لەو پەرداخانـەی کە هیچ گرێیەکـی تێدانیـە، لـە پاکتریـن‌و پاڵفتەترینـی پەرداخـەکانو لەزیـوە، پاکتـرە لـە پاکی

شووشــه ﴿ وَفِيهَا ﴾ واتــه: لــه بەهەشــتدا، ﴿ مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ ﴾ (واتــه: ئــەوەی دڵ حــەزی لێبــکات، وە چــاو لەزەت لــه بینینی بــکات)، ئەمــه دەربڕینێکی کۆکەرەوەیــه، بــاس دەکات له هەمــوو نازونیعمەتو خۆشــیو بیلبیلەی چاو و خۆشــی دڵ، جا هەرشــتێ نەفــس ئارەزووی بــکات له خــواردنو خواردنەوەکانو جلو بــەرگو جیماع، وە لەزەتــی چــاوەکان لــه دیمەنه جوانــەکانو دارودرەخته چــڕو پــڕەکان، وە نازونیعمەتو کۆشــکو تــەلارە ڕازاوەکان، بێگومــان ئەمانــه لەوێــدا دەســتەبەر دەبــن، ئامــادە کــراوە بۆ خەڵکەکــەی، لەســەر تەواوتریــن شــێوەو چاکترینیــان، هــەروەک خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ لَهُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾یس، (واتــه: لــەو بەهەشــتەدا بۆیــان ئامادەیــه میوەهــاتو هەرچــی داوا بکــەن) ﴿ وَأَنتُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ ئەمــه تــەواوی نیعەتەکانــی خەڵکانــی بەهەشــته، ئەویش مانەوەی هەمیشــەییانه تیایــدا، که بەردەوامــی نازونیعمەتەکانو زیــاد بوونیــان لــه خــۆ دەگــرێو لێــان ناپچــڕێ، ﴿ وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ﴾ کــه وەســفکراوە بە تەواوتریــنی وەســفەکان، ئەویــش ﴿ ٱلَّتِىٓ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ واته: خوا ﷻ کردوویەتیــه میــرات بــۆ ئێــوە بــە هــۆی کردەوەکانتــان، وە بە فەزڵــی خــۆی کردوویەتی بــه پاداشــتیان، وە ئــەوەی دانــاوە تێیدا لــه بەزەیی خــۆی که دانــاوە، ﴿ لَكُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ كَثِيرَةٌ ﴾ (واتــه: بــۆ ئێــوە هەیــه تیایــدا میوەهاتــی زۆر) وەک لــه دەقێکــی دیکــەدا هاتوە: ﴿ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٍ زَوْجَانِ ﴿٥٢﴾ ﴾الرحمن، (واتــه: هەیــه لــه ناویدا له هــەر میوەیەک دوو جــوت)، ﴿ مِّنْهَا تَأْكُلُونَ ﴾ لــەوەی هەڵیاندەبژێرن لەو میــوە بە لەززەتانــەو دەیانخۆن. کاتێ باســی نازونیعمەتــی بەهەشــتی کــرد، بە دوایدا باســی ســزای دۆزەخــی کــردوەو فەرمووی:


إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ
فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٥﴾ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٦﴾
وَنَادَوْا۟ يَٰمَٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ ۖ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ﴿٧٧﴾ لَقَدْ
جِئْنَٰكُم بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٨﴾ أَمْ أَبْرَمُوٓا۟ أَمْرًا
فَإِنَّا مُبْرِمُونَ ﴿٧٩﴾ أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُم ۚ بَلَىٰ
وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ﴿٨٠﴾ قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا۠ أَوَّلُ
ٱلْعَٰبِدِينَ ﴿٨١﴾ سُبْحَٰنَ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ
عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٨٢﴾ فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا۟ وَيَلْعَبُوا۟ حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ
ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٨٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٌ وَفِى ٱلْأَرْضِ
إِلَٰهٌ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨٤﴾ وَتَبَارَكَ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ
﴿٨٥﴾ وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا
مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ
لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ وَقِيلِهِۦ يَٰرَبِّ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ
لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَٰمٌ ۚ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾

(٧٤-٧٨): ﴿ إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٥﴾ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٦﴾ وَنَادَوْا۟ يَٰمَٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ ۖ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ﴿٧٧﴾ لَقَدْ جِئْنَٰكُم بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾:

﴿ إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾ (بە ڕاستی تاوانباران) ئەوانەی تاوانیان کردوە بە هۆی کوفرو بە درۆدانانیان، ﴿ فِى عَذَابِ جَهَنَّمَ ﴾ واتە: تیایدا نقووم بوون، سزا دەوریانی داوە لە هەموو لایەکەوە، ﴿ خَٰلِدُونَ ﴾ تیایدا، هەرگیز لێی دەرناکرێن.

وە ﴿ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ ﴾ واتە: سزایان لەسەر سووک ناکرێ بۆ ساتێکیش بێت، ﴿ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴾ واتە: بێئومێدن لە هەموو خێرێ، ئومێدی خۆشیان نیە، وە کاتێ داوا لە پەروەردگاریان دەکەنو دەڵێن: ﴿ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ ٱخْسَـُٔوا۟ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ ﴾المؤمنون، (واتە: ئەی پەروەردگارمان! لەم دۆزەخە دەرمان بێنە جا ئەگەر جارێکی تر گەڕاینەوە ئەوە بەڕاستی ئێمە ستەمکارین * وە خوا دەفەرموێ: بە ڕیسوایی بمێننەوە لە دۆزەخدا هیچ قسەیەکم لەگەڵدا مەکەن) ئەم سزا مەزنە بە هۆی ئەوەوەیە کە پێشیان خستبوو، وە ستەمیان لە نەفسی خۆیان کردبوو، خوا ﷻ ستەمیان لێناکاتو سزایان نادات بەبێ گوناهو تاوان.

﴿ وَنَادَوْا۟ ﴾ (هاوار دەکەن) وە ئەوان لە ناو ئاگردان، بەڵکو حەوانەوەیەک بەدەست بێنن ﴿ يَٰمَٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ ﴾ واتە: (با پەروەردگارت) بمانمرێنێت، تا ڕزگارمان بێت، بەڕاستی ئێمە لە خەمو پەژارەیەکی سەختو سزایەکی قورسداین، نە ئاراممان هەیە تیایدا وە نە تاقەتمان ماوە، ﴿ قَالَ ﴾ مالکی دۆزەخ پێیان دەڵێ -کاتێ داوایان کرد داوا لە خوا بکات کۆتاییان پێ بهێنێ-: ﴿ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ﴾ واتە: تیایدا دەمێننەوەو دەرناچن لێی، ئەوەی ویستیان بە دەستیان نەهێنا، بەڵکو وەڵامی دانەوە بە پێچەوانەی

مەبەستەکانیان، وە خەمو پەژارەی بۆ زیاد کردن، پاشان سەرزەنشتی کردن بەوەی کردوویانە، جا فەرمووی: ﴿ لَقَدْ جِئْنَاكُم بِالْحَقِّ ﴾ (واتە: بەڕاستی ئاینی حەقمان بۆ هێناون) کە پێویست بوو لەسەرتان شوێنی بکەون، ئەگەر شوێنی بکەوتایەن، ئەوە رزگارو بەختەوەر دەبوون، ﴿ وَلَكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ ﴾ (واتە: بەڵام زۆربەتان ڕاستیتان پێ ناخۆشە) تا لەبەر ئەوە بەدبەخت بوون بە جۆرێ کە جارێکی تر دوای ئەوە بەختەوەری نابینن.

(٧٩-٨٠): ﴿ أَمْ أَبْرَمُوا أَمْرًا فَإِنَّا مُبْرِمُونَ ﴿٧٩﴾ أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُم ۚ بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ أَمْ أَبْرَمُوا ﴾ واتە: بە درۆدانەران بە حەقو کەللەڕەقان پیلانیان دانا ﴿ أَمْرًا ﴾ واتە: فێڵیان کرد بە فێڵ کردن، وە فێڵو پیلانیان دانا بۆ حەق، وە بۆ ئەو کەسەیشی هێناویەتی، بۆ ئەوەی بەتاڵی بکەنەوە، بەوەی پووچو بەتاڵیان ڕازاندەوەو جوانیان کرد ﴿ فَإِنَّا مُبْرِمُونَ ﴾ واتە: بڕیارێکی پتەو دەدەین، پیلانێکیان بۆ دادەنێین لە سەرووی پیلانەکانی ئەوانەوە، وە بەرپەرچی بداتەوەو پووچی بکاتەوە، ئەویش ئەوەیە کە خوا دایناوە لەو هۆکارو بەڵگانە بۆ چەسپاندنی حەقو بەتاڵ کردنەوەی پووچ، هەروەک فەرموویەتی: ﴿ بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ ﴿١٨﴾ ﴾الأنبياء (واتە: بەڵکو حەق دەدەین بەسەر بەتاڵو ناحەقدا بە هۆیەوە بەتاڵ تێک دەشکێ)، ﴿ أَمْ يَحْسَبُونَ ﴾ (ئاخۆ وا دەزانن) بە نەفامیو ستەمکردنیانەوە، ﴿ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ ﴾ واتە: (ئێمە نهێنیان نابیستین) کە بە زمان دەریان نەبڕیوە، بەڵکو بەنهێنی ماوەتەوە لەناو دڵیان، ﴿ وَنَجْوَاهُم ﴾ واتە: ئەو قسانەی بە شاراوەیی چپەی پێ دەکەن، ئا لەبەر ئەوە سەرپێچیان پێشخست، وە گومانیان وابوو تۆڵەیان لێناکرێتەوەو سزا نادرێن لەسەر ئەوەی شاردوویانەتەوە.

خوا وەڵامی دانەوە بەوەی کە فەرمووی: ﴿ بَلَىٰ ﴾ واتە: ئێمە نهێنیو چپەکانیان دەزانین، ﴿ وَرُسُلُنَا ﴾ فریشتە بەڕێزەکان ﴿ لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ﴾ هەرچی کە کردوویانە، وە هەموو ئەوانە دەپارێزێ تا دەگەڕێنەوە بۆ ڕۆژی دوایی، ئنجا دەبینن ئەوەی کردوویانە ئامادەیە، وە خوا ستەم لە هیچ کەس ناکات.

(٨١-٨٣): ﴿ قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا أَوَّلُ الْعَابِدِينَ ﴿٨١﴾ سُبْحَانَ رَبِّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٨٢﴾ فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا وَيَلْعَبُوا حَتَّىٰ يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي يُوعَدُونَ ﴿٨٣﴾ ﴾:

﴿ قُلۡ ﴾ ئـەی پێغەمبـەری بەخشـندە بڵێ بەوانـەی منداڵیان بۆ خـوا داناوە، ئـەو زاتە تاكو تەنهـای بێنیـازە، نـە هاوەڵو نـە منداڵی بۆ خۆی دانەنـاوە، وە هەرگیز هیچ كەس هاوشـێوەو هاوتـای ئـەو نیـە، ﴿ إِن كَانَ لِلرَّحۡمَٰنِ وَلَدٞ فَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡعَٰبِدِينَ ﴾ (واتـە: ئەگـەر پەروەردگـار كـوڕی ببووایـە ئەوە مـن یەكەم كـەس بووم دەمپەرسـت)، ئـەو منداڵـە، چونكە بەشـێكە لـە باوكـی، وە مـن یەكەمین كەسـم دەبووم ملكەچـی ئەو كارانـە دەبووم كە خۆشەویستە لـە لای خـوا، بەڵام مـن یەكەمیـن نكوڵیكارم لـەوەی كـە دەڵێن خـوا منداڵی هەیـە، وە بە توونـدی ڕەتـی دەكەمەوە، بـەو جـۆرە بەتاڵیو پووچـی دەركەوت.

جـا ئەمـە بەڵگەهێنانەوەیەكی مەزنە، دەربارەی كەسـێ دۆخی پێغەمبەران بزانـێ، وە بێگومان ئەگـەر بزانـێ كە ئـەوان تەواوترینـی خەڵكن، هەمـوو خێـرو چاكەیەك ئـەوان یەكەمین كەسـن دەستپێشـخەری تیـا بكـەنو تەواوكەری بـن، وە هەموو شـەڕو خراپەیـەك ئەوان یەكەمیـن كەسـن وازی لێبهێنـنو نكوڵـی بكـەنو لێـی دوور بـن، جـا ئەگەر لەسـەر ئەمە خـوا منداڵـی ببووایە، ئەوە موحەممـەدی كوڕی عەبدوڵـلا چاكترینی پێغەمبـەران، یەكەمین كـەس دەبوو بیپەرسـتێ، هاوبەشـدانەران لەوەدا پێشـی نەدەكەوتن.

وە دەگونجـێ مانـای ئـەم دەقـە: ئەگـەر خـوا منداڵی بووایـە ئەوە مـن یەكەمین پەرسـتراو دەبـووم بـۆ خـوا، لـە بەندایەتـیو پەرسـتنم بـۆ خوا، ئـەوەی ئـەو جێگیـری كردبـێ دانم پێـدا دەنـاو دەمچەسـپاند، وە ئـەوەی ئـەو ڕەتـی كردبێتـەوە ڕەتـم دەكـردەوە، ئەمەش لە پەرسـتنی گوفتـاریو بیـرو بڕواییـە، لەمەشـدا ئـەوە پێویسـت دەكات ئەگەر ئەمە ڕاسـت بووایـە ئـەوە یەكەم كـەس جێگیـرم دەكردو دانـم پێدادەنا، بەم شـێوەیە بەتاڵـیو پووچیو خراپـی عەقـڵو نەقڵـی هاوبەشـدانەران دەركـەوت، ﴿ سُبۡحَٰنَ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ رَبِّ ٱلۡعَرۡشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾ لـە هاوبـەشو پشـتیوانو یارمەتیـدەرو منـداڵو جگە لەوانـەش، لەو قسـە نارێكانـەی هاوبەشـدانەران دەیدەنە پـاڵ خوا.

﴿ فَذَرۡهُمۡ يَخُوضُواْ وَيَلۡعَبُواْ ﴾ واتـە: (جـا لێیـان گـەڕێ) با سـەرگەرمی پووچو بەتـاڵ بنو گاڵتـە بـە شـتی ئەسـتەم بكـەن، بێگومـان زانسـتەكەیان زیانبەخشو بـێ سـوودە، ئەویش ڕۆچـوونو لێكۆڵینەوەیـە لـەو زانسـتانەی كـە دژایەتـی حەقـی پێدەكـەن، وە ئەوەیەشـی پێغەمبـەران هێناویانـە، وە كردەوەكانیـان گاڵتـەو گـەپو گێلیـە، نەفـسو دەروون پـاك ناكاتـەوە، زانسـتو زانیـاری بەرهەم ناهێنـێ، ئا لەبەر ئەمەیە هەڕەشـەی لێكـردوون بەوەی لـە پێشـیانە لـە ڕۆژی دوایـی، جـا فەرموویەتـی: ﴿ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي يُوعَدُونَ ﴾ لـە

داهاتــوودا دەزانــن چیان چنیوەتــەوە، وە چیان بەدەســتهێناوە، لە بەدبەختی بەردەوامو ســزای نەبڕاوە.

(٨٤-٨٩): ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَـٰهٌ وَفِى ٱلْأَرْضِ إِلَـٰهٌ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨٤﴾ وَتَبَارَكَ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٥﴾ وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَـٰعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ وَقِيلِهِۦ يَـٰرَبِّ إِنَّ هَـٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَـٰمٌ ۚ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾.

خــوا هــەواڵ دەدات کــە بێگومان ئــەو بەتاکو تەنها پەرســتراوە لــە ئاســمانەکانو زەویدا، خەڵکــی ئاســمانەکان هەموویــان، بڕوادارانیــش لــە خەڵکــی ســەر زەوی دەیپەرســتنو بــە مەزنــی دادەنێــنو ملکەچــی گەورەیی دەبنو هــەژارن بەرانبــەر بە تەواوی ئــەو، ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ ﴿٤٤﴾ ﴾الإسراء (واتە: ستایشــی خــوا دەکــەن هــەر حــەوت ئاســمانەکانو زەویو هەرچــی لــە ناویدایــە، وە هیــچ شــتێک نیــە کە بــە سوپاســی ئــەو ستایشــی نــەکات)، ﴿ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا ﴿١٥﴾ ﴾الرعد (واتــە: ســوژدە بــۆ خــوا دەبــات هەرچــی لــە ئاســمانەکانو زەویدایە بیانــەوێ یــان نەیانەوێ)، ئــەو زاتە پەرســتراوە کــە بەدیهێنــراوەکان بە گشــتی گوێڕایەڵی ئــەون پییــان خــۆش بێــت یــان نــا، ئەمــەش وەک ئــەم ئایەتەیــە: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَـٰهٌ وَفِى ٱلْأَرْضِ إِلَـٰهٌ ﴾، واتــە: ﴿ وَهُوَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَفِى ٱلْأَرْضِ ﴿٣﴾ ﴾الأنعام، واتــە: پەرســتراوێتیو خۆشەویســتی تیایانــدا، بــەڵام ئــەو لــە ســەرووی عەرشــەوەیە، جیایــە لــە دروســتکراوەکانی، تــاکو تەنهایــە بــە گەورەیی.

﴿ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ﴾ (ئــەو زاتــە کاردروســتە) ئەوەی دروســتی کــردوە پڕە لە کاردروســتیو دانایــی، ئەوەشــی بڕیــاری لەســەر داوەو دایناوە پــڕە لــە وردبینی، هیچ شــتێکی دروســت نەکــردوە مەگــەر بــە هــۆی حیکمەتێکــەوە، وە هیــچ شــتێکی دانەنــاوە مەگــەر بــە هــۆی حیکمەتێکــەوە، وە بڕیــاری قــەدەریو شــەرعیو پاداشــتی گشــتگیرن لەســەر حیکمــەت، ﴿ ٱلْعَلِيمُ ﴾ زانایــە بــە هەموو شــتێک، بــە نهێنــیو شــاراوە، تۆزقاڵــە زەرەیەکی لــێ گوم نابــێ لــە جیهانــی ســەروو خــوارەوە، وە نــە بچووکتــر لە ئــەوو نــە گەورەتریش.

﴿ وَتَبَارَكَ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ﴾ (تبــارک): بــە مانای بــەرزیو مەزنی، زۆری خێــرو چاکەکانــیو فراوانــی ســیفاتەکانیو مەزنــی دەســەڵاتی، ئــا لەبەر ئەمە باســی

فراوانـی موڵکـی کـردوە لـە ئاسـمانەکانو زەویو ئەوەیشـی لـە نێوانیانداییـە، وە فراوانـی زانسـتی، بێگومـان ئـەو زاتـە زانایـە بە هەمـوو شـتێک، تەنانەت ئـەو زاتە زانایە بە گشـت نهێنیـەکان کـە هیچ یەکێک لە دروسـتکراوەکان پـەی پێ نابـات، نە پێغەمبـەری نێردراو، نە فریشـتەی نزیـک، لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾ (واتـە: زانینی هاتنـی ڕۆژی دوایـی تەنهـا لـە لای ئـەوە) (ظرف)ی پێشخسـتووە، بـۆ ئەوەی بەسـتنەوە لە خـۆ بگرێـت، واتە: کـەس نازانـی کـەی ڕۆژی دوایـی دێت جگە لـە خوا.

وە لـە تـەواوی موڵـکو فراوانـی، ئـەو زاتـە خاوەنـی دونیـاو دوارۆژە، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ واتـە: (هـەر بـۆ لای ئـەو دەگەڕێنەوە) لـە دوارۆژدا، بڕیـار لـە نێوانتانـدا دەدات بـە بڕیـاری دادپەروەرانـەی.

وە لـە تـەواوی موڵکـی ئەوەیـە کە بێگومـان هیـچ یەکێک لـە دروسـتکراوەکانی هیچیان بەدەسـت نیـە لـە کاروبـارەکان، هیـچ کـەس ناتوانێ پێـش بکەوێت بـۆ تکا کـردن تەنها بـە مۆڵەتی خـوا نەبێ.

﴿ وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ ﴾ واتـە: هەریـەک لەوانـەی هاواریـان لێدەکـرێ جگـە لـە خوا لـە پێغەمبـەرانو فریشـتەکانو جگە لەوانیـش، تکایان بە دەسـت نیـە، وە تـکاو شـەفاعەت ناکـەن تەنهـا بـە مۆڵەتـی خـوا نەبـێ، وە تـکا ناکـەن تەنهـا بۆ ئـەو کەسـە نەبێ کە خـوا پێی ڕازیـە، لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ ﴾ واتـە: بـە زمانی شـایەتی دابێ، بـە دڵی دانپێـدا نابـێ، زانابێ بەوەی شـایەتی پێـداوە، وە بە مـەرج گیـراوە شـایەتیەکەی بە حەق بێـت، ئەویش شـایەتی دانە بـە تـاکو تەنهایی خوا، وە بـۆ پێغەمبەرەکانـی بـە نێردراوێتـیو پێغەمبەرایەتیو ڕاسـتی ئـەو پەیامـەی هێناویانە، لە بنەماکانـی ئایـنو لـقو پۆکانـیو حەقیقـەتو شـەریعەتەکانی، ئـا ئەوانە تکای تـکاکاران سـوودیان پێدەگەیەنـێ، ئەوانـە ڕزگـار بـوون لـە سـزای خـوا، پاداشـتی ئەویان بەدەسـت هێناوە.

پاشـان خوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ﴾ واتە: ئەگەر پرسـیار لـە هاوبـەش دانەران بکەیت دەربـارەی یەکتاپەرسـتی پەروەردگارێتی، وە کـێ بەدیهێنەرە، دانـی پێـدا دەنێـن کە بێگومـان خوای تـاکو بـێ هاوبـەش. ﴿ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾ واتە: چۆن لادەدرێـن لـە بەندایەتـی خـواو دڵسـۆزبون بـۆی بە تـاکو تەنهایـی؟ جـا دانپێدانیـان بە یەکتاپەرسـتی پەروەردگارێتـی، پەیوەسـت ناچاریـان دەکات بە دانپێدانان بە یەکتاپەرسـتی

پەرستراوێتی، ئەوەش لە گەورەترین بەڵگەکانە لەسەر پووچی هاوبەش دانان.
﴿ وَقِيلِهِۦ يَٰرَبِّ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمٞ لَّا يُؤۡمِنُونَ ﴾ ئەمە (عطف) کراوە لەسەر ئایەتی: ﴿ وَعِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾ واتە: خوا زانیاری هەیە بە قسەی ئەو، واتە: پێغەمبەر ﷺ، سکاڵای لای پەروەدگاری کرد دەربارەی بە درۆدانانی گەلەکەی، خەمبار بووە لەسەر ئەوە، حەسرەتی خواردوە بە هۆی بڕوا نەهێنانیان، خوا زانایە بەم حاڵە، بە توانایە لەسەر سزادانیان.

بەلاّم خوای بەرز لەسەرخۆیە مۆڵەت بە بەندەکان دەدات بەڵکو داوای لێخۆشبوون بکەنو بگەڕێنەوە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ فَٱصۡفَحۡ عَنۡهُمۡ وَقُلۡ سَلَٰمٞۚ ﴾ واتە: وازیان لێ بێنەو چاوپۆشیان لێ بکە لەوەی ئازارت دەدەن بە قسە کردنو بە ڕەفتار، وە لێیان ببورە، وەلاّمیان مەدەرەوە تەنها بە سڵاو نەبێت، کە کەسانی خاوەن ژیریو بەرچاو ڕوونی وەلاّمی نەفامانی پێدەدەنەوە، وەک خوا دەربارەی بەندە چاکەکانی فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ ﴾الفرقان، (واتە: وە ئەگەر نەفامان بیاندوێنن) واتە: دواندنێکە بە پێی نەفامیان ﴿ قَالُواْ سَلَٰمٗا ٦٣ ﴾ (وتەیەک دەڵێن گوناه نەبێت).

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پەروەردگاری جێبەجێ کرد، وە لە لایەن گەلەکەیو جگە لەوانیش تووشی ئازارو نارەحەتی بوو، لە بەرانبەردا لێبوردەو لەسەرخۆ بوو لەگەڵیانو چاوپۆشی لێکردن، هیچی لەگەڵدا نەکردن جگە لە چاکەو دواندنی جوان، دروودو سەلام لەسەر ئەو پێغەمبەرەی خوا تایبەتی کرد بە ڕەوشتی مەزن، کە بە هۆیەوە فەزڵو چاکەی درا بەسەر هەموو ئەوانەی لە نێو ئاسمانەکانو زەویدایە، وە بەرز کرایەوە بەسەر بەرزترینی ئەستێرەکاندا.

وە کە دەفەرموێ: ﴿ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴾ (واتە: لەمەو دوا دەزانن) دەرەنجامی گوناهو تاوانەکانیان.

تەفسیری سووڕەتی (الزخرف) تەواو بوو


بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
حمٓ ﴿١﴾ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ ۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴿٣﴾ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ ﴿٤﴾ أَمْرًا مِّنْ عِندِنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴿٥﴾ رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦﴾ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٧﴾ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨﴾ بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ يَلْعَبُونَ ﴿٩﴾ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ يَغْشَى ٱلنَّاسَ ۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ رَّبَّنَا ٱكْشِفْ عَنَّا ٱلْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكْرَىٰ وَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ﴿١٤﴾ إِنَّا كَاشِفُوا۟ ٱلْعَذَابِ قَلِيلًا ۚ إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾ ۞ وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ وَجَآءَهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ ﴿١٧﴾ أَنْ أَدُّوٓا۟ إِلَىَّ عِبَادَ ٱللَّهِ ۖ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٨﴾

## تەفسیری سوورەتی (الدخان)

**مەککیە (٥٩) ئایەتە**

**بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە**

(١-١٦): ﴿ حمٓ ﴿١﴾ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ ۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴿٣﴾ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ ﴿٤﴾ أَمْرًا مِّنْ عِندِنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴿٥﴾ رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦﴾ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٧﴾ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨﴾ بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ يَلْعَبُونَ ﴿٩﴾ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ يَغْشَى ٱلنَّاسَ ۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ رَّبَّنَا ٱكْشِفْ عَنَّا ٱلْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكْرَىٰ وَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ﴿١٤﴾ إِنَّا كَاشِفُوا۟ ٱلْعَذَابِ قَلِيلًا ۚ إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾ ﴾:

﴿ حمٓ ﴿١﴾ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى ﴾ ئەمە سوێند خواردنێکە بە قورئان لەسەر قورئان، خوا ﷻ سوێندی بە کتێب خواردووە کە ڕوونکەرەوەیە، بۆ هەموو ئەوانەی کە پێویستن ڕوون بکرێنەوە، ئەو زاتە (الله) دایبەزاندووە: ﴿ لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ ﴾ واتە: شەوێکی پڕ لە خێرو بەرەکەت ئەویش (ليلة القدر)ە کە چاکترە لە هەزار مانگ، جا چاکترین فەرمایشتی دابەزاندووە لە چاکترینی شەوو ڕۆژەکاندا، لەسەر چاکترینی ئادەمیزاد، بە زمانی عەرەبی بەڕێز بۆ ئەوەی گەلێکی پێ بیترسێنێ کە نقووم بوون لە نەفامیداو بەدبەختی زاڵ بووە بەسەریاندا، تا ڕووناک ببنەوە بە نوری ئەوو شتێ لە ڕێنمایی ئەو وەربگرن‌و بە شوێن پێیدا بڕۆن، جا خێری دونیایان بۆ دەستەبەر دەبێ لەگەڵ خێری دوارۆژدا، ئا لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴿٣﴾ فِيهَا ﴾ واتە: لەو شەوە پیرۆزەدا کە قورئانی تێدا دابەزیوە، ﴿ يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ ﴾ واتە: (هەموو

کاروبارێکـی بەجـێ) لـە یـەک جیادەکرێتـەوە، وە هەمـوو بڕیارێکـی قەدەریو شـەرعی دەنوسـرێ کە خـوا بڕیـاری پێداوە.
جـا ئـەم نووسـینو جیاکردنـەوە کە لەشـەوی (لیلـة القـدر) دایـە یەکێکـە لـەو کتێبانەی کـە دەنووسـرێو جیادەکرێتـەوە، لەگـەڵ کتێبـی یەکەمـدا وەکـو یەکـە، کـە خـوا ﷻ قـەدەری هەمـوو بەدیهێنراوەکانی پـێ نووسـیوە، وە چارەنـووسو ڕزقو ڕۆزیو کردەوەو بارودۆخەکانیـان.
پاشـان خـوا ﷻ چەندین فریشـتەی دانـاوە کە هەرچی بەسـەر بەنـدەدا بێت دەینووسـن، لە کاتێکـدا ئـەو لە ناو سـکی دایکیدایـە، پاشـان دوای هاتنە دونیایـان فەرمانیان پێـدەکات بە نووسـین، لە فریشـتە بەڕێزەکان کـە کردەوەکانی دەنووسـنو پارێزگاری لێدەکەن، پاشـان خـوا ﷻ لە شـەوی (لیلة القـدر)دا ئەندازەی دەکات ئـەوەی لە سـاڵەکەدایە، وە هەموو ئەمانە لـە تەواوی زانسـتیو تەواوی کاردروسـتیو ووردبینـی پارێزگاری کردنـی، وە گرنگیدانی بـە بەدیهێنراوەکانی.
﴿ أَمۡرٗا مِّنۡ عِندِنَآۚ ﴾ ئـەم فەرمانە کاردروسـتە فەرمانێکە لەلایەن ئێمـەوە دەرچووە ﴿ إِنَّا كُنَّا مُرۡسِلِينَ ﴾ (بە ڕاسـتی ئێمە نێرەری) پێغەمبەرانینو دابەزێنـەری کتێبەکانین، وە نێردراویش پەیـامو فەرمانـی نێـرەر دەگەیەنـێو هـەواڵ دەدات بە قـەزاو قەدەرەکانـی، ﴿ رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ ﴾ واتـە: بەڕاسـتی ناردنـی پێغەمبەرانو دابەزاندنـی کتێبەکان، کـە چاکترینیان قورئانە میهرەبانیەکـە لەلایـەن پەروەردگاری بەنـدەکان بۆ بەندەکانی، جا هیـچ ڕەحمەتێکی خوا ﷻ گەورەتـر نیـە لە ڕێنمایـی کردنیان بـە کتێبـەکانو نێـراوان، وە هەر خێـرو چاکەیەک لە دونیـادا بە دەسـت بێـن، ئـەوە بێگومان لەبـەر ئەوەو ئـەوە هۆکارێتـی، ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾ هەمـوو دەنگەکان دەبیسـتێ، وە دەزانێ بـە هەموو کاروبارە ئاشـکراو نهێنیەکان، وە بێگومـان خـوا ﷻ زانیویەتـی گرنگی بەنـدەکان بە پێغەمبـەرانو کتێبەکانیـان، بۆیە بەو هۆیـەوە ڕەحمـی پـێ کـردوونو منەتی خـۆی کـردوە بەسـەریاندا، جا سـتایشو منەتو چاکـە هەر بـۆ خوایە.
﴿ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَآۖ ﴾ واتـە: بەدیهێنەری هەموو شـتێکو بەڕێوەبەرێتی، وە هەڵسـوڕێنەری هەموو شـتێکە تیایدا بەوەی کە دەیـەوێ، ﴿ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴾ واتە: زانـان بـەوە، زانسـتێکی دڵنیاکـەرەوە، جـا بزانن بەڕاسـتی پەروەردگـاری بەدیهێنـراوەکان پەرسـتراوی حەقـە، لەبـەر ئەمەیە فەرموویەتـی: ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ هیچ پەرسـتراوێک نیە

جگـە لـەو (الله)، ﴿ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ ﴾ واتـە: ئـەو زاتە بە تـاکـو تەنهـا دەژیێنـیّو دەمریّنیّ، وە دوای مردنتـان کۆتـان دەکاتـەوە، پاشـان پاداشـتان دەداتـەوە بـە پێـی کردەوەکانتان، ئەگـەر خێـرو چـاک بـوو بە چاکـە، وە ئەگـەر خـراپ بوو بە (سـزای) خـراپ، ﴿ رَبُّكُمۡ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾ واتـە: پەروەردگاری پێشـینو پاشـینە، پەروەردەیان دەکات بە نازونیعمەتـەکانو بەلاّو ناخۆشـیان لـیّ دوور دەخاتەوە.

جـا کاتـیّ خـوا ﷻ پەروەردگارێتـیو پەرسـتراوێتی خۆی سـەلماند، بە جۆریّ کە زانسـتی تـەواو پێویسـت دەکاتو گومـانو دوو دڵی ڕەت دەکاتـەوە، هەواڵیدا کـە بێبڕوایان لەگەڵ ئـەم ڕوونکردنەوەیـەدا، ﴿ فِي شَكّٖ يَلۡعَبُونَ ﴾ واتـە: نقووم بـوون لە گومـانو دوو دڵیدا، بێئاگـان لـەوەی بۆچـی دروسـتکراون، خۆیان سـەرقاڵ کردوە بـە گەمەی پـووچ، کە هیچ شـتێکیان بـۆ دەسـتەبەر نـاکات جگـە لـە زیـان نەبـیّ ﴿ فَٱرۡتَقِبۡ ﴾ چاوەڕوانی سـزایان لـیّ بکە، بەڕاسـتی نزیـک بووەتـەوەو کاتی هاتـوە، ﴿ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ﴿١٠﴾ يَغۡشَى ٱلنَّاسَۖ ﴾ واتـە: ئـەو دووکەڵـە دایـان بپۆشـیّو بیانگرێتـەوە، وە پێیـان دەوتـریّ: ﴿ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾ ئەمە سـزایەکی سـەختو بە ئێشـە.

زانایانـی ڕاڤەزانانـی قورئـان بۆچوونـی جیاوازیـان هەیـە دەربارەی ئـەم دووکەڵـە: وتراوە: مەبەسـت پێـی ئـەو دووکەڵەیـە کـە خەڵکـی دادەپۆشـیّو دەیانگرێتـەوە، کاتـیّ ئاگـر لە تاوانبـاران نزیـک دەبێتەوە لـە ڕۆژی دواییدا، بێگومان خوا هەڕەشـەی لێکردوون بە سـزای ڕۆژی دوایـی، وە فەرمانـی بـە پێغەمبەرەکـەی کـردوە چاوەڕوانیان بکات لـەو ڕۆژەدا، وە پشـتیوانی لـەم واتایـە دەکات، بێگومـان ئـەم ڕێگایـە ڕێگـای قورئانـە لە هەڕەشـە کردن لـە بێبڕوایـانو مۆڵـەت پێـدانو چاوەڕوانی کردنیان، وە ترسـاندنیان بە سـزای ئـەو ڕۆژە، وە دڵدانـەوەی پێغەمبـەرو بـڕواداران بـە چاوەڕوانـی کردنـی سـزاو تۆڵـە بـۆ ئەوانەی کە ئازاریان دەدەن.

وە هەروەهـا پشـتیوانی لەمـە دەکات بێگومان خوا ﷻ لـەم دەقـەدا فەرموویەتی: ﴿ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكۡرَىٰ وَقَدۡ جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مُّبِينٞ ﴾ (واتـە: چـۆن تەمـیّ خوار دەبـنو ئامۆژگـاری وەردەگرن کـە بەڕاسـتی پێغەمبەرێکی ڕوونو ئاشـکرایان بۆ هاتـوە)، وە ئەمە بە بێبڕوایـان دەوتریّ لە ڕۆژی دواییـدا، کاتـیّ دەیانـەویّ بگەڕێنەوە بۆ دونیا، پێیـان دەوتریّ: کاتـی گەڕانەوە نەما. وە دەوتـریّ: مەبەسـت لەمـەدا: ئـەوە بـوو کـە تووشـی بێبڕوایانـی قوڕەیـش بـوو، کاتیّ ڕێگریـان کـرد لـە بڕواهێنانو لـووت بەرزیان کـرد بەرانبەر بە حـەق، پێغەمبـەر ﷺ نزای

لێکـردنو فەرمـووی: (اللهم أعني عليهم، بسنين كسني يوسف) واتـە: خوایە بەسـەریاندا بێنـە سـاڵانێ وەک سـاڵانی یوسـف. خـوا برسـێتیەکی مەزنـی بۆ نـاردن، تا وایـان لێهات ئێسـکەکانی مردارەوەبوویـان دەخـوارد، کاتـێ تەماشـای نێـوان ئاسـمانو زەویـان دەکرد وەکـو دووکـەڵ دەهاتـە پێش چاویـان، لە کاتێکـدا کە دووکـەڵ بوونی نەبـوو، ئەویش بە هـۆی سـەختی برسـێتیەوە بوو.

جـا دەبێ -لەسـەر ئەمە- فەرمایشـتی خوا ﷻ کە دەفەرمـوێ: ﴿ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ ﴾ ئـەوە لە چـاوی ئەواندا وابـووە، کە بینیویانـە، بەڵام لە حەقیقەتـدا دووکەڵ بوونـی نەبووە. بـەردەوام لـەم دۆخـەدا بـوون هەتـا داوایـان لـە پێغەمبـەری خـوا کـرد بەزەیـیان پێـدا بێتـەوەو لـە خـوا بپاڕێتـەوە، بەڵکـو ئەو قـاتو قڕیەیان لەسـەر لاببـات، ئەویـش داوای لە پەروەردگـاری کـرد، خواش لەسـەری لابردن، وە لەسـەر ئەمـە مانای فەرمـوودەی خوا ﷻ: ﴿ إِنَّا كَاشِفُوا۟ ٱلْعَذَابِ قَلِيلًا ۚ إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ ﴾ (بێگومـان بـۆ ماوەیەکی کەم ئـەم بەڵایە لادەبەین ئێـوە دەگەڕێنـەوە بـۆ بێبڕوایی) دەبێتـە هەواڵێک بەوەی خـوا ﷻ لـە داهاتوویەکی نزیکدا لەسـەرتان لایدەبـات، وە هەڕەشـە کردنـێ لێیـان کـە بگەڕێنـەوە بـۆ لـووت بـەرزیو بەدرۆدانـان، وە هەواڵـدان بـە ڕوودانـیو ڕوویـدا، بـە ڕاسـتی خـوا تۆڵەیـان لێدەکاتـەوە بـە پەلامارێکـی بەهێـزو هـەرە گـەورە، وتیـان: ئەویش جەنگـی بـەدرە. جا لەم قسـەیەدا سـەرنجدانێکی ئاشـکرا هەیە.

وە دەوتـرێ: مەبەسـت لـەوەدا ئەوەیە: کـە ئەمە لـە نیشـانەکانی ڕۆژی دواییە، لـە کۆتایی دونیـادا دووکەڵێـک پەیدادەبێـت هەموو نەفسـی دەبات، وە تووشـی بـڕواداران دەبێ وەکو دووکەڵـێ، وە بۆچوونی یەکەم ڕاسـتە.

وە لـەو دەقـەدا ڕێ تێچوونێـک هەیـە کە مەبەسـت لە فەرمایشـتی خوا ﷻ کـە دەفەرموێ: ﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ يَغْشَى ٱلنَّاسَ ۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ رَّبَّنَا ٱكْشِفْ عَنَّا ٱلْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكْرَىٰ وَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ﴿١٤﴾ ﴾، ئەمانـە هەمـووی لە ڕۆژی دواییـدا دەبێت.

وە بێگومـان وتـەی خـوای بـەرز: ﴿ إِنَّا كَاشِفُوا۟ ٱلْعَذَابِ قَلِيلًا ۚ إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴾ ئەمـە بەسـەر قوڕەیشـدا هـات هەروەک لە پێشـدا باسـکرا.

ئەگـەر ئـەم ئایەتانـە دابەزێنـرا بـۆ سـەر ئـەم دوو واتایـە، ئـەوە لـە فەرمایشـتەکەدا هیچ ڕێگریـەک بـە دیناکەیـت، بەڵکـو دەبینی ڕێـکاو ڕێکە بۆ هـەردوو مانـای ڕۆژی دوایيو

ئـەوەی تووشـی قورەیشـیەکان بـووە، ئـا ئەمە بـە بـڕوای من پەسـندە، خـوا زاناترە.
(١٧-٣٣): ﴿ وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ وَجَآءَهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ ﴿١٧﴾ أَنْ أَدُّوٓا۟ إِلَىَّ عِبَادَ
ٱللَّهِ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٨﴾ وَأَن لَّا تَعْلُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ إِنِّىٓ ءَاتِيكُم بِسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٩﴾ وَإِنِّى عُذْتُ
بِرَبِّى وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ ﴿٢٠﴾ وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ لِى فَٱعْتَزِلُونِ ﴿٢١﴾ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنَّ هَـٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ
﴿٢٢﴾ فَأَسْرِ بِعِبَادِى لَيْلًا إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَٱتْرُكِ ٱلْبَحْرَ رَهْوًا إِنَّهُمْ جُندٌ مُّغْرَقُونَ ﴿٢٤﴾ كَمْ
تَرَكُوا۟ مِن جَنَّـٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ وَنَعْمَةٍ كَانُوا۟ فِيهَا فَـٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَ
وَأَوْرَثْنَـٰهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿٢٨﴾ فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَقَدْ نَجَّيْنَا
بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿٣٠﴾ مِن فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ كَانَ عَالِيًا مِّنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾ وَلَقَدِ
ٱخْتَرْنَـٰهُمْ عَلَىٰ عِلْمٍ عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٣٢﴾ وَءَاتَيْنَـٰهُم مِّنَ ٱلْـَٔايَـٰتِ مَا فِيهِ بَلَـٰٓؤٌا۟ مُّبِينٌ ﴿٣٣﴾ ﴾:

﴿ وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ ﴾ تـا کۆتایـی چیرۆکەکـە. کاتـێ خـوا ﷻ باسـی بەدرۆخسـتنەوەی ئـەو کەسـەی کـە پێغەمبـەر موحەممـەدی ﷺ بـە درۆ دادەنا، ئنجا باسـی ئـەوەی کـرد کە ئەوان پێشـینیان هەیە لـە بە درۆدانان، باسـی چیرۆکو سەرگوزەشـتەیانی کـرد لەگـەڵ مووسـادا ﷺ، ئـەوەی بەسـەریاندا هـات، تـا ئـەو بـە درۆدانـەرو بێبڕوایانە دابچەڵەکێـن لەسـەر ئەوەی کـە لەسـەری دەڕۆن، فەرموویەتـی: ﴿ وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ ﴾ واتـە: گەلـی فیرعەونمـان تاقیکـردەوەو بـە ناردنـی پێغەمبەرمـان مووسـای کـوڕی عیمـران ﷺ بـۆ ناویـان، پێغەمبـەری بەڕێـز، کـە تێیدایـە لـە ڕێـزو ڕەوشـت بـەرزی کە لەکەسـانی دیکـەدا بەدیناکـرێ. ﴿ أَنْ أَدُّوٓا۟ إِلَىَّ عِبَادَ ٱللَّهِ ﴾ واتە: بـە فیرعەونو دارودەسـتەکەی وت: نەوەکانـی ئیسـرائیل بە مـن بسـپێرنو ئازادیان بکەن، لە سـزاتان بە ناشـرینترین شـێوە، چونکـە ئەوانـە هۆزی منـن، وە چاکترینـی دروسـتکراوەکان بوون لە سـەردەمی خۆیاندا.

بێگومـان ئێـوە سـتەمتان لەنەوەکانـی ئیسـرائیل کـردووەو کردوتانـن بـە کۆیلـە بـە ناحـەق، دەی بیانئێـرن بـا بەندایەتـی پەروەردگاریـان بکـەن ﴿ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴾ واتـە: نێردراوێکـم لەلایـەن پەروەردگـاری جیهانیـان، بـڕوا پێکـراوو ئەمینـم لەسـەر ئـەو پەیامـەی خـوا ناردوومـی، نـە هیـچ شـتێکی لێدەشـارمەوە، نـە هیچـی لـێ زیـاد دەکـەم، نـە لێـی کـەم دەکەمـەوە، ئەمـەش تـەواوی ملکەچبـوون بـۆی پێویسـت دەکات.

وَأَن لَّا تَعْلُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ۖ إِنِّىٓ ءَاتِيكُم بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٩﴾ وَإِنِّى عُذْتُ
بِرَبِّى وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ ﴿٢٠﴾ وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ لِى فَٱعْتَزِلُونِ ﴿٢١﴾
فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ ﴿٢٢﴾ فَأَسْرِ بِعِبَادِى لَيْلًا إِنَّكُم
مُّتَّبَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَٱتْرُكِ ٱلْبَحْرَ رَهْوًا ۖ إِنَّهُمْ جُندٌ مُّغْرَقُونَ ﴿٢٤﴾ كَمْ
تَرَكُوا۟ مِن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ وَنَعْمَةٍ
كَانُوا۟ فِيهَا فَٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَ ۖ وَأَوْرَثْنَٰهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿٢٨﴾ فَمَا
بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَقَدْ
نَجَّيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿٣٠﴾ مِن فِرْعَوْنَ ۚ إِنَّهُۥ
كَانَ عَالِيًا مِّنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾ وَلَقَدِ ٱخْتَرْنَٰهُمْ عَلَىٰ عِلْمٍ عَلَى
ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٢﴾ وَءَاتَيْنَٰهُم مِّنَ ٱلْءَايَٰتِ مَا فِيهِ بَلَٰٓؤٌا۟ مُّبِينٌ ﴿٣٣﴾
إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَيَقُولُونَ ﴿٣٤﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا مَوْتَتُنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ
بِمُنشَرِينَ ﴿٣٥﴾ فَأْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٦﴾ أَهُمْ
خَيْرٌ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ أَهْلَكْنَٰهُمْ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟
مُجْرِمِينَ ﴿٣٧﴾ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ
﴿٣٨﴾ مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾

﴿ وَأَن لَّا تَعْلُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ﴾ (واتە: خۆتان بەبەرز مەزانن لەسەر خوا) بە هۆی لووت بەرزی لە پەرستنی، ﴿ إِنِّىٓ ءَاتِيكُم بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴾ واتە: (بێگومان من) بەڵگەیەکی ئاشکرام بۆ ئێوە، ئەویش ئەوەیە کە هێناویەتی لەو موعجیزە روونو درەوشاوانەو بەڵگە زاڵانە، بەڵام ئەوان بەدرۆیان زانیو ویستیان بیکوژن، ئەویش پەنای بردە بەر خوا ﷻ لە شەڕو خراپەکاریان، جا فەرمووی: ﴿ وَإِنِّى عُذْتُ بِرَبِّى وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ ﴾ واتە: (من پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خۆمو پەروەردگاری ئێوە) وە بمکوژن بە خراپترین کوشتن، بە بەرد باران کردن.

﴿ وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ لِى فَٱعْتَزِلُونِ ﴾ واتە: (وە ئەگەر بڕوام پێناهێنن ئەوە وازم لێبێنن) سێ شتتان بۆ هەیە: بڕوا هێنان پێم کە ئەوە مەبەستی منە لە ئێوە، ئەگەر ئەوە دەستەبەر نەبوو بۆتان، جا وازم لێ بێنن، نەهیچتان لەسەرمەو نەهیچم لە لاتانە، شەڕی خۆتان لەمن دوور بخەنەوە.

پلەی یەکەمو دووەمیان بۆ بەدەست نەهات، بەڵکو بە بەردەوام سەرکەشو لادەر بوون لەڕێی خوا، دژایەتی پێغەمبەرەکەیان مووسا (عليه السلام) دەکرد، نەیانهێشت لە ناو گەلەکەی بەنی ئیسرائیل بمێنێتەوە، ﴿ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ ﴾ واتە: بێگومان تاوانێکیان ئەنجامداوە پێویستە سزایان بۆ پێش بخرێ.

مووسا (عليه السلام) هەواڵیدا بە حاڵی ئەوان، ئەمەش پاڕانەوەیە بە حاڵ کە بەهێزترە لە پاڕانەوە بە قسەکردن، وەک چۆن مووسا (عليه السلام) دەربارەی خۆی فەرمووی: ﴿ رَبِّ إِنِّى لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَىَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾ القصص، (واتە: وتی ئەی پەروەردگارم! بە ڕاستی من هەژارم پێویستم هەیە بەهەر خێرو ڕۆزییەک بۆم بنێری) خوا ﷻ

فەرمانــی پێکــرد، شــەورۆیی بــە بەندەکانــی بــکات بــە شــەو، وە هەواڵــی پێــدا کــە بێگومــان فیرعــەونو گەلەکــەی شــوێنی دەکــەون.
﴿ وَٱتۡرُكِ ٱلۡبَحۡرَ رَهۡوًا ﴾ واتــە: (دەریاکــە بــە ئارامــی) بــە حاڵــی خــۆی بەجێبێڵــە، ئەویــش کاتــێ کــە مووســا ﷺ شــەورۆیی بــە نەوەکانــی ئیســرائیل کــرد، وەک خــوا فەرمانــی پێکردبــوو، پاشــان فیرعــەون شــوێنیان کــەوت، خــوا ﷻ فەرمانیکــرد بــە مووســا ﷺ بــدات لــە دەریاکــە بــە لێدانــێ، دەریاکــەش دوانــزە ڕێگــای لــێ بوویــەوە، وە ئــاوی دەریاکــەش لــە نێــوان ڕێگاکانــدا وەک کێــو بــەرز بووبوویــەوە، جــا مووســاو گەلەکــەی ڕێگایــان گرتەبــەر، کاتــێ لــە دەریاکــە دەرچــوون، خــوا فەرمانــی کــرد بــە مووســا دەریاکــە بــە ئاوەڵایــی بەجێبێــڵێ، بــۆ ئــەوەی فیرعــەونو ســەربازەکانی ڕێگــا بگرنــە بــەر، ﴿ إِنَّهُمۡ جُندٞ مُّغۡرَقُونَ ﴾ (بێگومــان ئــەوان ســەربازانێکی خنکێنــراون)، کاتــێ مووســا ﷺو گەلەکــەی بــە تەواوەتــی لــە دەریاکــە دەرچــوون، گەلــی فیرعەونیــش چوونــە ناویــەوە، خــوا فەرمانــی کــرد دەریاکــە یــەک بگرێتــەوە، بۆیــە هەموویــان خنــکان، وە ئــەوەی ســەروەتو ســامانو مایــەی چێــژ وەرگرتــن بــێ لــە دونیــادا بەجێیانهێشــت، خــوا ﷻ بەخشــی بــە نەوەکانــی ئیســرائیل، ئەوانــەی کــە پێشــتر کرابوونــە کۆیلــە لــە لایــان، ئــا لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ كَمۡ تَرَكُواْ مِن جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٖ وَمَقَامٖ كَرِيمٖ ﴿٢٦﴾ وَنَعۡمَةٖ كَانُواْ فِيهَا فَٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَۖ وَأَوۡرَثۡنَٰهَا ﴾ (واتــە: چەندەهایــان بەجێهێشــت لــە باخــاتو کانیــاو * وە کشــتوکاڵو جێــیو شــوێنی خــۆش * وە نــازو نیعمەتــی زۆر کــە ئــەوان تیایــدا دەژیــانو ڕایــان دەبــوارد * ئــا بــەو جــۆرە کردمــان بــە میــرات)، واتــە: ئــەم نازونیعمەتــەی کــە باســکرا ﴿ قَوۡمًا ءَاخَرِينَ ﴾ (گەلێکــی دیکــە) وە لــە ئایەتێکــی دیکــەدا فەرموویەتــی: ﴿ كَذَٰلِكَ وَأَوۡرَثۡنَٰهَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ ﴾الشعراء، (واتــە: ئــا بــەو جــۆرە لەناومــان بــردن نەوەکانــی یەعقــووب (جوولەکە)مــان لــە جێگایــان دانــا)، ﴿ فَمَا بَكَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلۡأَرۡضُ ﴾، واتــە: کاتــێ خــوا لــە نــاوی بــردن نــە ئاســمان بۆیــان گریــا نــە زەوی، واتــە: خەمبــار نەبــوون بۆیــانو ئــاخو حەســرەتیان لــە جیابوونەوەیــان نەکێشــا، بەڵکــو هەمــوو مژدەیــان دەدا بــە لەناوچوونیــان، تەنانــەت ئاســمانو زەویــش، چونکــە هیچیــان لــە دوای خۆیــان بەجێنەهێشــت تەنهــا ڕوو ڕەشــیو پێویســت بوونــی نەفرینــی خــوا لەســەریانو ڕقو تــووڕەی خەڵکــی، ﴿ وَمَا كَانُواْ مُنظَرِينَ ﴾، واتــە: مۆڵەتیــان پێنــەدرا لــە

سزادان، بەڵکو ڕاستەوخۆ سزادران. پاشان خوا ﷻ منەتی کرد بەسەر نەوەکانی ئیسرائیلداو فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ نَجَّيْنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ﴾ کە تیایدا بوون ﴿مِن فِرْعَوْنَ﴾ کاتێ منداڵەکانیانی سەردەبڕیو ژنەکانیانی دەهێشتەوە بۆ خزمەتکاری.

﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَالِيًا﴾ واتە: لووت بەرز بوو لەسەر زەویدا بە ناحەقی، ﴿مِّنَ ٱلْمُسْرِفِينَ﴾ واتە: ئەوانەی سنووری خوایان تێپەڕاندووە، کە چاوقایمیو بوێری دەکەن لە بەرانبەر قەدەغەکراوەکانی.

﴿وَلَقَدِ ٱخْتَرْنَٰهُمْ﴾ واتە: هەڵمانبژاردنو پاڵفتەمان کردن، ﴿عَلَىٰ عِلْمٍ﴾ بە پێی زانیاری ئێمە بە ئەوان، وە بەوەی شایستەی ئەو فەزڵو چاکەیە بوو، ﴿عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ واتە: دوو جیهانی سەردەمی خۆیان، لە پێشو دوای خۆیان، تا خوا ﷻ ئوممەتی موحەممەدی ﷺ هێنا، جا فەزڵ دران بەسەر هەموو جیهاندا بە گشتی، وە خوا کردنی بە چاکترین ئوممەتێ دەرهێنرابن لەناو خەڵکی، وە منەتیکرد بە سەریاندا بە شێوەیەک منەتی نەکردبوو بەسەر غەیری وان، ﴿وَءَاتَيْنَٰهُم﴾ واتە: نەوەکانی ئیسرائیل، ﴿مِّنَ ٱلْءَايَٰتِ﴾ نیشانە ڕوونو موعجیزە ئاشکراکان، ﴿مَا فِيهِ بَلَٰٓؤٌا۟ مُّبِينٌ﴾ واتە: چاکەیەکی زۆر لە لایەن ئێمەوە بە سەر ئەواندا، وە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەرەکەیان مووسا ﷺ هێناویەتی.

(٣٤-٣٧): ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَيَقُولُونَ ﴿٣٤﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا مَوْتَتُنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُنشَرِينَ ﴿٣٥﴾ فَأْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٦﴾ أَهُمْ خَيْرٌ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ أَهْلَكْنَٰهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿٣٧﴾﴾:

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَيَقُولُونَ﴾ ئەو بەدرۆ دانەرانەی کە زیندووکردنەوەیان بە دوور دەزانی دەیانوت: ﴿إِنْ هِىَ إِلَّا مَوْتَتُنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُنشَرِينَ﴾ واتە: ئەمە هیچ نیە جگە لە ژیانی دونیا نەبێ، نە زیندووکردنەوە هەیە، نە بەهەشتو نە دۆزەخ. پاشان وتیان- بوێریان کرد لەسەر خواو بە دەستەوسانیان دانا-: ﴿فَأْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ (واتە: دەی باوباپیرانمان زیندوو بکەنەوەو بیانهێننەوە بۆ دونیا) ئەمە لە پێشنیاری نەفامە عینادەکان بوو لە جێگایەکی دوور، جا چ پەیوەندیەک هەیە لە نێوان ڕاستی پێغەمبەر ﷺ زیندوو کردنەوەی باوباپیرانیان؟ بێگومان ئایەتو نیشانەکان دەیسەلمێنن ڕاستی

ئـەو پەیامـەی ئـەوان هێناویانـە، لـە هەمـوو ڕوویەکـەوە بـە تەواتـوور بـە دوای یەکـدا هاتـووە.

خـوای بـەرز فەرمویەتـی: ﴿ أَهُمْ خَيْرٌ ﴾ ئـەو دوێنراوانـە چاکتـرن، ﴿ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ أَهْلَكْنَاهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ﴾ (واتـە: یـان گەلـی توبـەع پاشـای یەمەنو ئەوانـەی لـە پێشـیانەوە بـوون هەموویانمـان لـە نـاو بـرد، چونکـە بێگومـان گشـتیان تاوانبـار بـوون)، بێگومـان ئەمانیـش لـەوان باشـتر نەبـوون، هەموویـان بەشـدار بـوون لـە تاوانـدا، دەی بـا چاوەڕوانـی لەناوچـوون بکـەن ئـەوەی تووشـیان بـووە لـە لایـەن براکانیانـەوە.

(٣٨-٤٢): ﴿ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ (٣٨) مَا خَلَقْنَاهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ (٣٩) إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ مِيقَاتُهُمْ أَجْمَعِينَ (٤٠) يَوْمَ لَا يُغْنِي مَوْلًى عَن مَّوْلًى شَيْئًا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ (٤١) إِلَّا مَن رَّحِمَ اللَّهُ إِنَّهُ هُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ (٤٢) ﴾:

﴿ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ (٣٨) مَا خَلَقْنَاهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی تـەواوی دەسـەڵاتو حیکمـەتو دانایـی خـۆی، بێگومـان ئـەو زاتـە ئاسـمانو زەوی بـە بێهـوودەو گاڵتـەو بـێ سـوود بەدینەهێنـاوە، وە هەردوو کیانـی بەدینەهێنـاوە مەگـەر بەڕاسـتی، وە بەدیهێنانیـان حـەقو ڕاسـتی لەخـۆ دەگـرێ، ئـەو زاتـە ئاسـمانو زەوی بەدیهێنـاوە بـۆ ئـەوەی بەنـدەکان بەتـاکو تەنهایـی بیپەرسـتنو هاوبەشـی بـۆ دانەنێـن، وە بـۆ ئـەوەی فەرمانیـان پـێ بـکاتو ڕێگریـان لێبـکاتو پاداشـتو سـزایان بداتـەوە ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ ئـا لەبـەر ئەوەیـە بیریـان نەکردۆتـەوە لـە بەدیهێنانـی ئاسـمانو زەوی،


إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ مِيقَاتُهُمْ أَجْمَعِينَ ٤٠ يَوْمَ لَا يُغْنِي مَوْلًى
عَن مَّوْلًى شَيْئًا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ٤١ إِلَّا مَن رَّحِمَ اللَّهُ
إِنَّهُ هُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ٤٢ إِنَّ شَجَرَتَ الزَّقُّومِ ٤٣ طَعَامُ
الْأَثِيمِ ٤٤ كَالْمُهْلِ يَغْلِي فِي الْبُطُونِ ٤٥ كَغَلْيِ
الْحَمِيمِ ٤٦ خُذُوهُ فَاعْتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَاءِ الْجَحِيمِ ٤٧ ثُمَّ
صُبُّوا فَوْقَ رَأْسِهِ مِنْ عَذَابِ الْحَمِيمِ ٤٨ ذُقْ إِنَّكَ
أَنتَ الْعَزِيزُ الْكَرِيمُ ٤٩ إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِ تَمْتَرُونَ
٥٠ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٍ ٥١ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ
٥٢ يَلْبَسُونَ مِن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَقَابِلِينَ ٥٣
كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَاهُم بِحُورٍ عِينٍ ٥٤ يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ
فَاكِهَةٍ آمِنِينَ ٥٥ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا الْمَوْتَ إِلَّا
الْمَوْتَةَ الْأُولَىٰ وَوَقَاهُمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ ٥٦ فَضْلًا مِّن
رَّبِّكَ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ٥٧ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَاهُ بِلِسَانِكَ
لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ٥٨ فَارْتَقِبْ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ ٥٩
سُورَةُ الجَاثِيَة

﴿ إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ ﴾ بریتیە لە ڕۆژی دوایی کە خوا ﷻ جیای دەکاتەوە لە نێوان یەکەمینو دواییین، وە لە نێوان هەموو جیاوازەکان، ﴿ مِيقَـٰتُهُمْ ﴾ واتە: بەدیهێنراوەکان ﴿ أَجْمَعِينَ ﴾ بە گشتی.

هەموویان خوا لەو ڕۆژەدا کۆیان دەکاتەوە، وە خۆیانو کردەوەکانیان ئامادە دەکات، وە پاداشتیان دەداتەوە، هیچ دۆستێ ناتوانێ کەمترین سوود بگەیەنێ بە دۆستی خۆی، نە نزیک بۆ نزیکەکەی، نە هاوڕێ بۆ هاوڕێکەی، ﴿ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴾ واتە: ڕێگری بکەن لە سزای خوای گەورە، چونکە هیچ کەس لە بەدیهێنراوەکان هیچ شتێکی بە دەست نیە.

﴿ إِلَّا مَن رَّحِمَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ بێگومان تەنها ئەو زاتە سوود دەگەیەنێ، وە بە ڕەحمەتی خۆی خەڵکی بەرز دەکاتەوە، کە کەسەکە خۆی بیێتە هۆکار بۆ ئەوە، وە کۆششی بۆی کردبێت لە دونیادا.

(٤٣-٥٠): ﴿ إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِى فِى ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْىِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾ خُذُوهُ فَٱعْتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ صُبُّوا۟ فَوْقَ رَأْسِهِۦ مِنْ عَذَابِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ ﴿٤٩﴾ إِنَّ هَـٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمْتَرُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾:

کاتێ باسی ڕۆژی دوایی کرد کە بێگومان نێوانی بەندەکانی یەکلا دەکاتەوە، باسی دابەش بوونی کردن بۆ لای دوو دەستە: دەستەیەک لە بەهەشت، دەستەیەک لە دۆزەخ، ئەوانەش تاوانبارانن بە کردەوەی بێبڕوایی‌و سەرپێچی، وە ﴿ إِنَّ ﴾ خۆراکەکانیان، ﴿ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴾ (واتە: داری زەقنەبوتە) خراپترینی دارەکانو ناشرینترینیانە، بێگومان خۆراکی تاوانبارانە، ﴿ كَٱلْمُهْلِ ﴾ واتە: کێمو زوخاوی پیس، بۆنو تامی

ناخـۆش، زۆر گـەرم لـە نـاو سـکیاندا دەکـوڵا، ﴿ كَغَلْيِ ٱلْحَمِيمِ ﴾ (واتـە: هەروەک
کوڵانـی ئـاوی زۆر گـەرم) بە سـزادراو دەوترێ: ﴿ ذُقْ ﴾ (بیچێژە ئەم سـزا سـەختو
زیـان بەخشـە ﴿ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ ﴾ واتـە: (خوا بـە بێبڕوا دەفەرمـوێ:) بە
گومانـی خۆت بـە دەسـەڵاتو بەڕێزیت، سـزای خوا دەچێـژی، بێگومان تۆ بەخشـندەی
تووشـی سـزا نابی، ئەمڕۆ بـۆت روون بوویەوە بە ڕاسـتی تۆ زەلیلو سەرشـۆڕو بێنرخیت.
﴿ إِنَّ هَٰذَا ﴾ سـزای مـەزن ﴿ مَا كُنتُم بِهِۦ تَمْتَرُونَ ﴾ واتـە: (بێگومـان ئەمە ئەو سـزایەیە
کـە ئێـوە لێی بـە) گومان بـوون، ئێسـتە بووە بـە حەقـی دڵنیاکەرەوە.
(٥١-٥٩): ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٍ ﴿٥١﴾ فِي جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٢﴾ يَلْبَسُونَ مِن
سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٥٣﴾ كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٥٤﴾ يَدْعُونَ فِيهَا
بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴿٥٥﴾ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَوَقَىٰهُمْ
عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٦﴾ فَضْلًا مِّن رَّبِّكَ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٥٧﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لَعَلَّهُمْ
يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾ فَٱرْتَقِبْ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾
﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٍ ﴿٥١﴾ فِي جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٢﴾ يَلْبَسُونَ مِن سُندُسٍ
وَإِسْتَبْرَقٍ ﴾ ئەمـە پاداشـتی خۆپارێـزانو لە خوا ترسـانە ئەوانە لە خەشـمو قینو سـزای
خـوا دەترسـن، بـە وازهێنانیـان لـە سـەرپێچیو ئەنجامدانـی فەرمانـەکان، کاتێ خەشـمو
قیـنو سـزایان لەسـەر لابـرا، ڕەزامەنـدی خوایـان بـۆ جێگیـر بـوو، لەگـەڵ پاداشـتی
مەزنـدا لـە سـێبەرە فێنکەکانـدا لە زۆری بـاخو باخاتو میـوەکان، وە کانیـاوە هەڵقوڵاوە
ڕۆیشـتووەکان لـە بەهەشـتانی پـڕ لـە نـازو نیعمەتدا.
بەهەشـتەکانی پاڵیداوەتـە لای نـازو نیعمەتـەکان، چونکە ئـەوەی لە بەهەشـتدایە هەمووی
نـازو نیعمـەتو خۆشـیەو تەواوە لـە هەمـوو ڕووەیەکەوە، هیـچ کەمو کـوڕیو فەوتانو
لەناوچوونێکـی تێدانیـە بـە جـۆرێ لە جـۆرەکان، وە پۆشـاکیان لە حەریری سـەوز کە لە
(سـوندسو إسـتبرق) پێکهاتـووە: کە حەریری ئەسـتورو تەنـک لەخۆ دەگرێـت، ئەوەی
دڵەکان بـۆ لای خۆی ڕادەکێشـێت.
﴿ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴾ (ڕووبـەڕووی یەکتـر دادەنیشـن) لـە دڵەکانیـانو ڕوخسـاریان لـە
تـەواوی حەوانـەوەو دڵنیایـیو خۆشەویسـتیو هاوژینـیو ئـەدەبو مامەڵـەی جوانـدان.
﴿ كَذَٰلِكَ ﴾ (هەروەهـا) ئەو نیعمەتو دڵخۆشـیە تـەواوە، ﴿ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴾
واتـە: کیژانـی جـوان لـە جوانیـان ئادەمیزاد ناچـار دەکـەن لایان لـێ بکاتـەوە، عەقڵ بە

جوانیــان سەرســام دەبــێ، دڵ ڕاو دەکەن بە هــۆی تەواویان ﴿ عِينٍ ﴾واتــە: چاو گەورەو جوان.

﴿ يَدْعُونَ فِيهَا ﴾واتــە: لە بەهەشــتدا (داوا دەکــەن)، ﴿ بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ﴾(هەموو جۆرە میوەیــەک) لــەوەی نــاوی هەیــە لە دونیــادا، ئەوەشــی نــاوی نیە، ئەوەشــی وێنــەی نیە لە دونیــادا، جــا هەرچۆنــی داوای بکــەن بۆیــان ئامادە دەبــێ، بەبێ مانــدوو بــوونو تێچوون، ﴿ ءَامِنِينَ ﴾(ئاســوودەن) لــە پچڕانــی ئەوانــە، ئاســوودەن لــە زیانــی، ئاســوودەن لە فەوتانــی، ئاســوودەن تیایــدا لە دەرچــوون، لەبــەر ئەمەیە فەرموویەتــی: ﴿ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ ﴾واتــە: لــە بەهەشــتدا بــە هیچ شــێوەیەک مــردن نیە. ئەگــەر مردنــی تێــدا بووایــە، مردنــی یەکەمــی جیــا نەدە کــردەوە، کــە بریتیــە لــە مردن لــە دونیــادا، هەمــوو خۆشویســتراوو داواکراوێکیــان بۆ تــەواو دەبێت، ﴿ وَوَقَىٰهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٦﴾ فَضْلًا مِّن رَّبِّكَ ﴾واتــە: بەدەســتهێنانی نیعمەتەکانو دوورخســتنەوەی ســزا لێیــان لــە فــەزڵو بەخشــندەیی خوایــە لەســەریان، بێگومــان تەنهــا خــوا ســەرکەوتووی کــردوون بــۆ کــردەوەی چــاک کــە بــە هۆیــەوە خێــری دوارۆژیــان بەدەســت هێناوە، هەروەهــا ئەوەنــدەی پێــی بەخشــیون کــە کردەوەکانیــان پێی ناگــات، ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾(واتــە: ئــا ئەوەیە ســەرکەوتنی زۆر گەورە) جــا چ ســەرکەوتنێک مەزنترە لە بەدەســتهێنانی ڕەزامەنــدی خــواو بەهەشــتەکەیو ڕزگار بوون لە ســزایو خەشــمو قینی؟

﴿ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ ﴾واتــە: قورئــان ﴿ بِلِسَانِكَ ﴾واتــە: ئاســانمان کــردوە لەســەر زمانت کە پاراوتریــن زمانــە بــە ڕەهایــیو گەورەترینیانــە، جا بــەو هۆیــەوە فەرمایشــتو ماناکانی، ﴿ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾ (واتــە: بــۆ ئــەوەی بیربکەنەوە).

ئەوەی سوودی هەیە بۆیان ئەنجامی بدەن، ئەوەشی زیانی هەیە بۆیان وازی لێبهێنن.

﴿ فَٱرْتَقِبْ ﴾واتــە: چاوەڕوانــی پەیمانــی پەروەردگــارت بکــە کــە پێی داوی لــە خێرو ســەرکەوتن ﴿ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ ﴾ (واتــە: بێگومــان ئەوانیــش چاوەڕوانــن)، کــە بۆیــان پێویســت دەبێت لە ســزا، وە جیــاوازی کردوە لە نێــوان ئەو دوو چاوەڕوانیــەدا: پێغەمبەری خــواو شــوێنکەوتوانی چاوەڕوانــی خێــر دەکــەن لــە دونیــاو دوارۆژدا، وە دژەکانیــان چاوەڕوانــی شــەڕ دەکەن لــە دونیــاو دوارۆژدا.

تەفسیری سووڕەتی (الدخان) تەواو بوو.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ① تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ② إِنَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ ③ وَفِى خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ ءَايَٰتٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ④ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن رِّزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ ءَايَٰتٌ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ⑤ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَ ٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ يُؤْمِنُونَ ⑥ وَيْلٌ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ⑦ يَسْمَعُ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ⑧ وَإِذَا عَلِمَ مِنْ ءَايَٰتِنَا شَيْـًٔا ٱتَّخَذَهَا هُزُوًا أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ⑨ مِّن وَرَآئِهِمْ جَهَنَّمُ وَلَا يُغْنِى عَنْهُم مَّا كَسَبُوا۟ شَيْـًٔا وَلَا مَا ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ⑩ هَٰذَا هُدًى وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ⑪ ۞ ٱللَّهُ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَكُمُ ٱلْبَحْرَ لِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ⑫ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ⑬

# تەفسیری سوورەتی (الجاثیة)

## مەککیە (٣٧) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی و بەخشندە

(١-١١): ﴿ حمٓ ① تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ② إِنَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ ③ وَفِى خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ ءَايَٰتٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ④ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن رِّزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ ءَايَٰتٌ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ⑤ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَ ٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ يُؤْمِنُونَ ⑥ وَيْلٌ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ⑦ يَسْمَعُ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ⑧ وَإِذَا عَلِمَ مِنْ ءَايَٰتِنَا شَيْـًٔا ٱتَّخَذَهَا هُزُوًا أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ⑨ مِّن وَرَآئِهِمْ جَهَنَّمُ وَلَا يُغْنِى عَنْهُم مَّا كَسَبُوا۟ شَيْـًٔا وَلَا مَا ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ⑩ هَٰذَا هُدًى وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ⑪ ﴾:

﴿ حمٓ ① تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ② إِنَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ ③ وَفِى خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ ءَايَٰتٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ④ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن رِّزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ ءَايَٰتٌ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ⑤ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَ ٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات بـە هەواڵێـک فەرمـان کـردن لـە خـۆ دەگـرێ بـە بەمـەزن دانانـی قورئـانو گرنگیـدان پێـی، کـە ئـەو قورئانـە دابەزێنـراوە لـە لایـەن خـوای پەرسـتراوەوە، لـەوەی کـە پێـی وەسـفکراوە لـە سـیفاتە تـەواوەکان، وە تـاکو تەنهایـە پێـی لـەو نازونیعمەتانـەی کـە تایبەتـە بـە دەسـەڵاتو حیکمەتـی تـەواوەوە، پاشـان پشـتیوانی لـەوە کـردوە بـەوەی باسـی کـردوە، لـە بەڵگـەو نیشـانە ئاسـۆیی و گەردوونـیو نەفسـیەکاندا، لـە دروسـتکردنی ئاسـمانو زەوی، وە ئـەوەی بـڵاو بووەتـەوە لـە ناویانـدا لـە گیانلەبـەران، وە ئـەوەی تیایانـدا دانـاوە لـە

ســوودو بەرژەوەندیــەکان، وە لــەو ئــاوەی دایبەزانــدووە، کــە وڵاتو بەندەکانــی پــێ زینــدوو دەبنــەوە.
ئەمانــە هەموویــان ئایــەتو بەڵگــەی ڕوونکــراوەن لــە ســەر ڕاســتی ئــەم قورئانــە مەزنــە، وە ڕاســتی ئــەوەی کــە لەخــۆی گرتــووە لــە حیکمــەتو بڕیــارەکان، هەروەهــا بەڵگــەن لەســەر ئــەوەی تایبــەت بــە خــوا لــە کەمــاڵو تەواوێتــی، وە لەســەر زیندووکردنــەوە.
پاشــان خــوا ﷻ خەڵکــی دابــەش کــردوە، بــەو جــۆرەی ســوود لــە ئایــەتو بەڵگــەکان وەردەگــرنو وەرینــاگــرن بــۆ دوو بــەش: بەشــێکیان: دەیکــەن بــە بەڵگــەو بیــری لێدەکەنــەوەو ســوودی لێــوەر دەگــرنو پێــی بــەرز دەبنــەوە، ئەوانیــش بڕوادارانــن بــە خــواو فریشــتەکانو کتێبــەکانو پێغەمبــەرانو ڕۆژی دوایــی، بــڕوا بوونێکــی ڕاســتەقینە کــە بیانگەیەنــێ بــە پلــەی دڵنیایــی، عەقڵیــان پــاک بکاتــەوەو ژیــریو زانیاریــان زیــاد بــکات.
وە بەشــێکی تــر گوێیــان لــە بەڵگــەو نیشــانەکانی خــوا دەبــێ، بــە بیســتنێ ببێتــە بەڵگــەو حوججــە لەســەریان، پاشــان پشــتی تێــدەکاو لــووت بــەرز دەبــێ لــە بەرانبــەری وەک ئــەوەی هــەر نەیبیســتبێ، چونکــە دڵــی پــاک خاوێــن نەکردۆتــەوە، بەڵکــو بــە هــۆی لــووت بەرزیــەوە لەســەری ســتەمو زۆرداری زیــادی کــردوە.
بێگومــان ئــەو ئەگــەر شــتێ لــە ئایــەتو بەڵگەکانــی خــوا بزانــێ، بــە گاڵتــەی دادەنــا، جــا خــوا ﷻ هەڕەشــەی لێکــردوە بــە ســزاو لــە ناوچــوون فەرموویەتــی: ﴿ وَيۡلٞ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٖ ﴾ واتــە: درۆزن لــە قســەکانیدا، تاوانبــار لــە ڕەفتارەکانیــدا. وە هەواڵیــداوە ئــەو کەســە ســزایەکی بــە ئێشــی بــۆ هەیــە، وە بێگومــان ﴿ مِّن وَرَآئِهِمۡ جَهَنَّمُ ﴾ ســزای دۆزەخ بەســە بــۆ تۆڵەکردنەوەیــان، ﴿ وَلَا يُغۡنِي عَنۡهُم مَّا كَسَبُواْ ﴾ لــە مــاڵو ســامانەکان ﴿ وَلَا مَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡلِيَآءَ ﴾ (واتــە: وە ئــەو پشــتیوانانەی جگــە لــە خــوا هەڵیانبژاردبــوو، داوای یارمەتیــان لــێ دەکــردن، ڕیســوایان کــردن کاتــێ پێویســتیان پێبــوو.
جــا کاتــێ بەڵگــەو نیشــانە قورئانیــەکانو ئــەوەی بەچــاو دەبینــرێ ڕوونکــردوە، کــە خەڵکــی تیایــدا دەبــن بــە دووبەشــەوە، هەواڵیــدا ئــەو قورئانــەی کــە ئــەم داواکاریــە بەرزانــە دەگرێتــەوە بریتیــە لــە ڕێنمایــیو هیدایــەت، بۆیــە فەرموویەتــی: ﴿ هَٰذَا هُدٗى ﴾ ئەمــە وەســفێکی گشــتگیرە بــۆ هەمــوو قورئــان، بێگومــان ئــەو قورئانــە ڕێنمایــی دەکات بــۆ ناســینی خــوا بــە ســیفاتە بەرزەکانــیو کــردەوە ستایشــکراوەکانی، وە ڕێنمایــی

دەكات بـۆ ناسـینی پێغەمبەرانـیو دۆسـتو دوژمنانـی، وە وەسـفەكانیان، وە ڕێنمایـی دەكات بـۆ كـردەوە چاكـەكانو بانگـەواز دەكات بـۆ لایـان، كـردەوە خراپـەكان ڕوون دەكاتـەوەو قەدەغـەی لێـدەكات، وە ڕێنمایـی دەكات بـۆ ڕوونكردنـەوە پاداشـت لەسـەر كـردەوەكانو پاداشـتی دونیـاو دوا ڕۆژ ڕوون دەكاتـەوە، جـا هیدایـەت دراوان هیدایەتی پـێ وەردەگـرن، سـەرفرازو سـەركەوتوو بەختـەوەر دەبـن.

﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ ﴾ (واتـە: ئەوانـەی بێبـڕوان بـە ئایـەتو بەڵگەكانـی پەروەردگاریـان) بەڵگـە ڕوونو یەكلاكـەرەوەكان، كـە پێـی بێبـڕوا نابـێ مەگـەر كەسـێ زۆر سـتەمكارو زێـدەڕەو ﴿ لَهُمۡ عَذَابٞ مِّن رِّجۡزٍ أَلِيمٌ ﴾ (واتـە: بـۆ ئەوانـە هەیـە سـزایەكی پـڕ ئـازاری سـەخت).

(١٢-١٣): ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ ٱلۡبَحۡرَ لِتَجۡرِيَ ٱلۡفُلۡكُ فِيهِ بِأَمۡرِهِۦ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ١٢ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ١٣ ﴾:

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ ٱلۡبَحۡرَ لِتَجۡرِيَ ٱلۡفُلۡكُ فِيهِ بِأَمۡرِهِۦ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات بـە فـەزڵو چاكـەی لەسـەر بەندەكانـی، بـە ڕامهێنانـی دەریـا تـا كەشـتیەكان تێیـدا بگەڕێـن بـە فەرمـانو ئاسـانكاری ئـەو زاتـە ﴿ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾ (وە تـا هەنـدێ لـە بەخششـی خـوا بەهرەمەنـد بـن) بەجۆرەهـا بازرگانـیو كارو كەسـابەت ﴿ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴾ خوای بـەرزو مـەزن، بێگومـان ئێـوە ئەگـەر سوپاسـگوزاری بكـەن نازونیعمەتەكانیتـان بـۆ زیـاد دەكاو پاداشـتان دەداتـەوە لەسـەر سـوپاس گوزاریتـان بـە پاداشـتێكی بـێ پایـان.

﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ ﴾ واتـە: لـە فـەزڵو چاكەكانـی، ئەمـە گشـتگیرە بـۆ هەمـوو ئەوانـەی لـە ئاسـمانەكانو زەویـدان، لـە خـۆرو مانـگو ئەسـتێرەكانو ئەوانـەی جێگیـرنو ئەوانەیشـی ڕێ دەكـەن، وە هەمـوو گیانلەبـەران، وە جۆرەهـا دارودرەخـتو بـەروو بوومـەكانو ڕەگـەزی كانـزاكان، وە جگـە لەوانەیـش لـەوەی كـە دانـراوە بـۆ بەرژەوەنـدی نەوەكانـی ئـادەم، وە بەرژەوەنـدی ئـەوەی لـە پێویسـتیەكانێتی.

ئـا لەبـەر ئەمەیـە پێویسـتە لەسـەریان بـە ئـەو پـەڕی تواناكانیـان كۆشـش بكـەن لـە سوپاسـگوزاری نیعمەتەكانـی، وە بیـرو هۆشـیان بخەنـە كار لـە سـەرنجدانو بیركردنـەوە لـە ئایـەتو بەڵگـەو بڕیارەكانـی، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ

يَتَفَكَّرُونَ ﴾ (واتـە: بێگومـان لـەو شـتانەدا چەندیـن بەڵگـە هەیـە بـۆ کەسـانێ بیـر بکەنـەوە).

کـۆی ئەوانـە: بێگومـان دروسـتکردنی ئاسـمانەکانو زەویو بەڕێوەبردنیـانو ڕامهێنانیـان بەڵگەیـە لەسـەر جێبەجـێ کردنـی ویسـتی خـواو تـەواوی دەسـەڵاتی.

وە ئـەوەی تێیدایـە لـە پتـەوی وردەکاریو داهێنـان لـە دروسـتکردنداو جوانـیو چاکـی دروسـتکردن، بەڵگـەن لەسـەر تـەواوی حیکمـەتو زانسـتی خـوا، وە ئـەوەی تیایدایـە لـە فراوانـیو مەزنـیو زۆری، بەڵگەیـە لەسـەر فراوانـی موڵـکو دەسـەڵاتی خـوا ﷻ.

وە ئـەوەی تیایدایـە لـە تایبەتمەنـدیو شـتە دژ بـە یەکـەکان بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی ئـەو زاتـە هـەر شـتێکی بـوێ دەیـکات، وە ئـەوەی تیایدایـە لـە سـوودو بەرژەوەنـدی دینـیو دونیایـی بەڵگـەن لەسـەر بەرفراوانـی میهرەبانـی خـواو گشـتگیری فـەزڵو چاکەکانـی، وە سـەیرو سـەمەرەیی بەزەیـیو چاکـەی خـوا.

هەمـوو ئەوانـە بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی کـە ئـەو زاتـە بەتـاکو تەنهـا پەرسـتراوە، کـە نابـێ بەندایەتـیو زەلیلـیو خۆشەویسـتی ئەنجـام بـدرێ تەنهـا بـۆ ئـەو نەبـێ، بێگومـان پێغەمبەرانـی ڕاسـتگۆن لـەوەی هێناویانـە، ئـا ئەمانـە بەڵگـەی عەقڵـی ڕوونو ئاشـکران، هیـچ گومـانو دوو دڵیـەک هەڵناگـرن.

قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ لِيَجْزِىَ
قَوْمًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ
وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۖ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١٥﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا
بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ
وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ وَءَاتَيْنَٰهُم بَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ ۖ
فَمَا ٱخْتَلَفُوٓا۟ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ رَبَّكَ
يَقْضِى بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ
﴿١٧﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ
أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا۟ عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ
شَيْـًٔا ۚ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۖ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُتَّقِينَ
﴿١٩﴾ هَٰذَا بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٢٠﴾
أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ
مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ
وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾

(١٤-١٥): ﴿ قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ لِيَجْزِىَ قَوْمًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۖ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١٥﴾ ﴾

﴿ قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ لِيَجْزِىَ قَوْمًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾ خـوا ﷻ فەرمـان بـە بەنـدە بڕوادارەکانـی دەکات بـە ڕەوشـتی جـوانو ئارامگرتـن لەسـەر ئـازاری هاوبـەش دانـەران، ئەوانەی هیوایـان بـە پاداشـتو سـزای خوا نیـە، وە ناترسـن لـە تۆڵـەو سـزاکانی لە سـەرپێچی کردنیانـدا، بێگومـان ئـەو خوایـە پاداشـتی هەمـوو گەلـێ دەداتەوە بە گوێـرەی ئەوەی کردوویانـە. جـا ئێوەش ئەی بـڕواداران پاداشـتان دەداتەوە لەسـەر بڕواهێنانو چاوپۆشـیو ئارامگرتنتـان بـە پاداشـتێکی بـێ پایان.

جـا ئەوان -ئەگـەر بەردەوام بن لەسـەر بێبڕوایـیو بەدرۆدانانیـان- ئەوە ئێوە تووشـتان نابێ لـەوەی ئەوان تووشـیان دەبێ لە سـزای سـەختو ڕیسـوایی، ئا لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتی: ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۖ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴾ (واتـە: هەرکەسـێ چاکـەی کـرد ئـەوە قازانجە کـەی بۆ خۆیەتـی، وە هەر کەسـێ خراپـەی کرد ئـەوە زیانە کـەی بـۆ خۆیەتی لـە پاشـان بـۆلای پەروەردگارتـان دەگەڕێنەوە).

(١٦-١٧): ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ وَءَاتَيْنَٰهُم بَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ ۖ فَمَا ٱخْتَلَفُوٓا۟ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٧﴾ ﴾

پاشـان خوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾ واتە: بێگومان نـازو نیعمەتماندا بەسـەر نەوەکانـی ئیسـرائیل، نازونیعمەتێ کـە بۆ جگە لەئەوان دەسـتەبەر نەبوو لـە خەڵکی، وە پێمـان بەخشـین ﴿ ٱلْكِتَٰبَ ﴾ واتە: تـەوراتو ئینجیـل، وە ﴿ وَٱلْحُكْمَ ﴾ حوکمڕانی لە

نێـوان خەڵکـدا، وە ﴿ وَٱلنُّبُوَّةَ ﴾ پێغەمبەرایەتـی کە پێـی جیاکرانـەوە، وە پێغەمبەرایەتی لە نـەوەی ئیبراهیـم ﷺ زۆرینەیـان لـە نەوەکانی ئیسـرائیل بـوون، ﴿ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴾ (ڕۆزیمانـدان لـە شـتە حەڵاڵـە پاکـەکان) لـە خـواردنو خواردنـەوەو جـلو بـەرگ، وە دابەزاندنی گەزۆو شـەلاقە بۆیـان، ﴿ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ واتە: بەسـەر هەموو خەڵکی بـەم بەخششـە، دەردەچـێ لـەم گشـتاندنە ئـەم ئوممەتە، چونکـە بەڕاسـتی ئەمـە چاکترین ئوممەتێکـە لە نـاو خەڵکیـدا هەڵبژێردرابێ.

سـیاقی دەقەکـە بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی مەبەسـت ئـەم ئوممەتە نیـە، چونکە خـوا ﷻ بۆمان دەگێڕێتـەوە ئـەو منەتـەی کردوویەتی بەسـەر نەوەکانی ئیسـرائیل، وە جیـای کردونەتەوە لـە غەیـری خۆیـان، هەروەها ئەو فەزیلـەتو چاکانـەی کە نەوەکانی ئیسـرائیلی پـێ بەرز بوویـەوە، لـە کتێـبو حوکمڕانـیو پێغەمبەرایەتیو، جگـە لەوانیش لە سـیفاتەکان، هەموو ئـەوان لەم ئوممەتـەدا بەدەسـتهاتوون، ئەم ئوممەتـە فەزیڵەتـی زیاتری هەیە بەسـەر ئەواندا، شـەریعەتی نەوەکانـی ئیسـرائیل بەشـێکن لـەم شـەریعەتە، بێگومـان ئـەم کتێبـە چاودێرە بەسـەر هەمـوو کتێبـە پێشـوەکاندا، وە موحەممـەد ﷺ بەڕاسـتدانەری هەمـوو پێغەمبەرانـە، ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُم ﴾ واتـە: دامـان بـە نەوەکانـی ئیسـرائیل ﴿ بَيِّنَٰتٍ ﴾ واتە: چەندیـن بەڵگە، حەقـی لـە پـووچ جیادەکـردەوە ﴿ مِّنَ ٱلْأَمْرِ ﴾ (لە فەرمانی) قـەدەری، کە خـوا گەیاندی پێیـان، ئـەو ئایەتانەش بریتی بوون لەو موعجیزانەی کە لەسـەر دەسـتی مووسـا ﷺ بینیان، جـا ئـەم نیعمەتەی کـە خوا ﷻ بەخشـیویەتی بـە نەوەکانی ئیسـرائیل، وا پێویسـت دەکات پێـی هەڵبسـتنو بەجێـی بێنن بە تەواوترین شـێوە، وە کۆببنەوە لەسـەر ئەو حەقو ڕاسـتیەی خـوا بـۆی ڕوون کردونەتـەوە، بـەڵام کارەکـە پێچەوانـە بوویەوە، بـە پێچەوانـەی ئەوەوە مامەڵەیـان لەگەڵـدا کـرد، وە جیاوازیـان کرد کاتـێ فەرمانیـان پێکرا بـە یەکدەنگ بوون پێـی، لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ فَمَا ٱخْتَلَفُوٓا۟ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ ﴾ واتە: (جا جیـاواز نەبـوون لـە نێوان خۆیانـدا دوای ئەوە نەبێت زانسـتیان بـۆ هات) کە پێویسـتکەری نەبوونـی جیـاوازی بـوو، ئـەوەی بـوو بە هـۆی جیاوازیان حەسـودیو سـتەم بـوو لەلایەن هەندێکیـان بەرانبـەر بە هەندێکـی دیکەیان.

﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾ شـوێنکەوتووی حـەق جیادەکاتـەوە لـە شـوێنکوتووی باتـڵ، وە ئـەوەی هانیدا لەسـەر جیـاوازی هـەواو ئارەزوو بـوو یـان جگـە لەوە.

(١٨-١٩): ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ (١٨) إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا عَنكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا ۚ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۖ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ (١٩) ﴾:

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ ﴾ واتــە: پاشــان شــەریعەتێکی تەواومــان بــۆ دانــای، بانــگ دەکات بــۆ هەموو خێــرو چاکەیەک، رێگــری دەکات لە هەموو شــەڕو خراپەیەک، لــە کاروبــارە شــەرعیەکانمان ﴿ فَاتَّبِعْهَا ﴾ بێگومــان لــە شــوێنکەوتنیدا بەختــەوەری هەمیشەیی‌و ســەرفرازی‌و ســەرکەوتن بەدەســت دێ ﴿ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ واتــە: ئەوانــەی هــەواو ئارەزوویــان شــوێنی زانســت نەکەوتــووە، ئەوانــەش هەر کەســێکە پێچەوانــەی شــەریعەتی پێغەمبــەر ﷺ بجوڵێتــەوە بــە پێــی هەواو ئــارەزووی، بێگومــان ئەوە لــە هــەواو ئــارەزووی ئەوانەیــە کــە نازانــن، ﴿ إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا عَنكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا ﴾ واتە: ئەوانــە هیــچ ســوودێکت پــێ ناگەیەنن لە لای خــوا ﷻ، تا خێــرو چاکەت بۆ ئامــادە بکەن‌و شــەڕو خراپەت لــێ دوور بخەنەوە، ئەگەر شــوێنیان بکەوی لەســەر هــەواو ئارەزووەکانیان، وە گونجــاو نیــە رێــک بــی لەگەڵیانــداو پشــتیوانیان لێبکەی، چونکــە تۆو ئــەوان جیاوازن، وە ئــەوان هەندێکیــان دۆســتی هەندێکــی دیکــەن ﴿ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ ﴾ ( خوا دۆســتو پشــتیوانی خۆپارێزانــە) لــە تاریکــی دەریــان دێنــێ بــۆ ڕووناکــی، بــە هــۆی خۆپارێزی‌و کــردەوەو گوێرایەڵیان.

(٢٠): ﴿ هَٰذَا بَصَائِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ (٢٠) ﴾:

﴿ هَٰذَا ﴾ واتــە: ئــەم قورئانــە دروســتەو زیکرو یادی پــڕ حیکمەتــە، ﴿ بَصَائِرُ لِلنَّاسِ ﴾ واتــە: بــە هۆیەوە بەرچــاو ڕوونی‌و بینایی بەدەســت دێ لە هەمــوو کاروبارەکانــی خەڵکیدا، جــا بــە هۆیــەوە ســوود دەگەیەنــێ بــە بــڕواداران‌و دەبێتــە مایــەی هیدایــەت‌و میهرەبانــی ﴿ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾ ڕێنمایــی پــێ وەردەگــرن بــۆ ڕێگای ڕاســت، لــە بنەماکانــی ئاین‌و لــق‌و پۆکانــی، وە خێــرو دڵخۆشــی‌و بەختــەوەری پــێ بەدەســت دێ لــە دونیــاو دوارۆژدا، نەفــس‌و دەروونیانــی پێ پاک دەبێتــەوە، عەقڵ‌و ژیریانی پــێ زیاد دەبێ، دڵنیایــی‌و ئیمانیان پێــی گەشــە دەکات، وە دەبێتــە بەڵگە لەســەر ئــەو کەســەی کەللەڕەقی‌و عینــادی دەکات.

(٢١): ﴿ أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ (٢١) ﴾:

﴿ أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ ﴾ ئایــا وا گومــان دەبــەن خراپــەکاران‌و ئەوانــەی

گوناهـی زۆریـان ئەنجامـداوەو کەمتەرخەمن لـە مافەکانی پەروەردگاریـان، ﴿ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ﴾ (واتـە: ئێمـە ئەوانـە وەک کەسـانێ دانێیـن کـە بروایـان هێنـاوەو چاکەکانیـان کـردوە) بـەوەی هەسـتاون بـە مافەکانـی پەروەردگاریان، دوورکەوتوونەتـەوە لـەوەی دەبێتـە مایـەی توڕەیی خـوا، وە بـەردەوام ڕەزامەنـدی خوایان داوە بەسـەر ڕەزامەنـدی نەفـس‌و دەروونیـان؟ واتـە: ئایـا پێیـان وایـە ﴿ سَوَآءً ﴾ وەک یـەک بـن لە دونیـاو دواڕۆژدا، بە ڕاسـتی گومانێکـی خراپیان بـردوەو بڕیارێکـی خراپیان داوە، چونکـە ئـەوە بڕیارێکـە پێچەوانـەی بڕیـاری دادپەروەرترینی دادپەروەرانـە، وە دژی عەقڵـە سـاغ‌و سروشـتە ڕاسـتەکانە، وە پێچەوانـەی ئەوەیـە کـە کتێبەکانـی پـێ دابەزیوەو پێغەمبـەران هەواڵیـان پێـداوە، بەڵکـو بڕیـاری یەکلاکـەرەوە، بێگومـان بـڕوادارە خـاوەن کـردەوە چاکەکان سـەرکەوتن‌و سـەرفرازی‌و بەختـەوەری‌و پاداشـتیان بۆ هەیە لە ئێسـتاو لـە داهاتـوو، هەریەکـەو بـە ئەنـدازەی چاکەکانـی خـۆی، وە خراپەکارانیـش تووڕەیـی‌و سەرزەنشـت‌و سـزاو بەدبەختیـان بـۆ هەیە لـە دونیـاو دواڕۆژ.

(٢٢): ﴿ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾:

واتـە: خـوا ﷻ ئاسـمانەکان‌و زەوی بەدیهێنـاوە بـە حیکمـەت‌و دانایـی، وە بـۆ ئـەوەی بەتـاک‌و تەنهـاو بێ هـاوەڵ بپەرسـترێ، پاشـان دوای ئـەوە پاداشـتی ئەوانـە دەداتەوە کە فەرمانـی پێکـردوون بە پەرسـتنی، وە نازونیعمەتی پێ بەخشـیون بـە ئاشـکراو بەنهێنی، ئایا سوپاسـگوزاری خوایـان کـردوەو فەرمانەکانیـان جێبەجێ کـردوە؟ یان بێبڕوایـان کردوە کـە شایسـتەی سـزای بێبڕوایـی بوون؟


أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ
وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا
تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ
إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ
عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن
كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ
يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٢٧﴾
وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً ۚ كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰٓ إِلَىٰ كِتَٰبِهَا ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ
تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ
مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٠﴾ وَأَمَّا
ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَفَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱسْتَكْبَرْتُمْ وَكُنتُمْ قَوْمًا
مُّجْرِمِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا
قُلْتُم مَّا نَدْرِى مَا ٱلسَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ ﴿٣٢﴾

(٢٣-٢٦): ﴿ أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ أَفَرَءَيْتَ ﴾ (ئایا بینیوتە) ئەو پیاوە گومڕایەی کە ﴿ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ﴾، (هەواو ئارەزووی خۆی کردۆتە پەرستراوی خۆی) ئەوەی ئارەزووی حەزی لێبکات شوێنی کەوتووە، یەکسانە خوا ڕازیبکات، یان تووڕەی بکات ﴿ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ ﴾ (وە خوا گومڕای کردوە لەسەر زانستێک) لە لایەن خۆیەوە، کە بێگومان ئەو کەسە شایستەی ڕێنمایی نیەو، خۆی پاکو خاوێن ناکاتەوە لە سەری.

﴿ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ ﴾ ئەوەی سوودی هەیە بۆی نایبیستێ، ﴿ وَقَلْبِهِۦ ﴾ چاکەش وەرناگرێ ﴿ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً ﴾ ڕێگری دەکات لە بینینی حەق ﴿ فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ﴾ واتە: هیچ کەسێک نیە ڕێنمایی بکات، کاتێ خوا ﷻ دەرگاکانی هیدایەتی لەسەر داخستوەو دەرگای گومڕایی بۆ کردۆتەوە، وە خوا ستەمی لێناکات، بەڵکو خۆی ستەم لە نەفسی خۆی دەکات، وە دەبێتە ڕێگر لەپێش میهرەبانی خوا بۆی ﴿ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾ ئەوەی سوودی هەیە بۆتان بیگرنە بەر، ئەوەیشی زیانی هەیە دوور بکەونەوە لێی؟ ﴿ وَقَالُوا۟ ﴾ واتە: نکوڵیکارانی ڕۆژی زیندووکردنەوە، وتیان: ﴿ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ﴾ (واتە: هیچ نیە جگە لە ژیانی دونیامان دەمرینو دەژین، وە جگە لە ڕۆژگار

هیــچ شــتیٚ ئیٚمــه لــه نــاو نابــات)، ئــەوە تەنهــا داب‌و نەریتــه، یاســای شــەوو ڕۆژ هــەر وایــه، کۆمەڵــیٚ خەڵــک دەمــریٚ‌و کۆمەڵیٚکیــش دیٚنــه دونیــاوە، هــەر کەسیٚکیش مــرد هەرگیــز ناگەڕیٚتــەوە بــۆ دونیــاو پاداشــت نادریٚتــەوەو ســزا نــادریٚ بــه هــۆی کردەوە کــەی.

وە قســەکانیان لەبــیٚ زانیاریــەوە ســەرچاوەی گرتــووە، ﴿إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾ (تەنهــا گومــان دەبــەن) نکوڵــی ڕۆژی گەڕانەوەیــان کــردووەو پێغەمبــەرە ڕاســتگۆکانیان بــەدرۆ دانــاوە، بەبــیٚ ئــەوەی هیــچ بەڵگەیــەک ئاماژەیــان پیٚبــکات بــۆ ئــەوە، ئــەوە تەنهــا کۆمەڵــه گومانیٚکــی، وە بــه دووردانانــی خەیاڵیــه لــه حەقیقــەت، لەبــەر ئەمەیــه فەرموویەتــی: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾، (واتــه: وە کاتــیٚ بخویٚنریٚتــەوە بەســەریاندا بەڵگــه ڕوونەکانمــان هیــچ بەڵگەیەکیــان نیــه جگــه لــەوە کــه دەڵیٚــن بــاوو باپیرانمــان زینــدوو بکەنــەوە ئەگــەر ئیٚــوە ڕاســت دەکــەن)، ئەمــه بوێریەکــه لــه لایــەن ئەوانــەوە بەرانبــەر بــه خــوا، کاتــیٚ ئــەم پیٚشــنیارەیان کــردوە، وە پیٚیــان وابــووە ڕاســتی پیٚغەمبەرانــی خــوا وەســتاوە لەســەر زیندووکردنــەوەی باووباپیرانیــان، ئــەوان درۆیــان کــردوە لــەوەی وتیــان، بەڵکــو مەبەســتیان ڕەتکردنــەوەی بانگــەوازی پیٚغەمبــەران بــووە، نــەک ڕوونکردنــەوەی حــەق، خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿قُلِ ٱللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾، (واتــه: خــوا زیندووتــان دەکاتــەوە پاشــان دەتانمریٚنــیٚ پاشــان کۆتــان دەکاتــەوە لــه ڕۆژی دواییــدا هیــچ گومانــی تیٚدانیــه، بــەڵام زۆربــەی خەڵکــی نازانــن)، ئەگەرنــا ئەگــەر زانســت بــه ڕۆژی دوایــی بگەیشــتایەته دڵەکانیــان ئــەوە کاریــان بــۆی دەکــردو خۆیــان بــۆی ئامــادە دەکــرد.

(٢٧-٣٨): ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٢٧﴾ وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً ۚ كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰٓ إِلَىٰ كِتَٰبِهَا ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٠﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَفَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱسْتَكْبَرْتُمْ وَكُنتُمْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا قُلْتُم مَّا نَدْرِى مَا ٱلسَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ ﴿٣٢﴾ وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٣﴾ وَقِيلَ ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٣٤﴾ ذَٰلِكُم

﴿بِأَنَّكُمُ اتَّخَذْتُمْ ءَايَٰتِ اللَّهِ هُزُوًا وَغَرَّتْكُمُ الْحَيَوٰةُ الدُّنْيَا فَالْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٣٥﴾ فَلِلَّهِ الْحَمْدُ رَبِّ السَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ الْأَرْضِ رَبِّ الْعَٰلَمِينَ ﴿٣٦﴾ وَلَهُ الْكِبْرِيَآءُ فِي السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٣٧﴾﴾:

﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضِ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی فراوانـی موڵكـیو تـاكو تەنهایـی لـە بەڕێوەبردنـدا لـە هەمـوو كاتـەكان، وە بێگومـان ئـەو زاتـە ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ﴾ (ئـەو ڕۆژەی قیامـەت هەڵدەسـێ)، وە خەڵكـی كۆدەكاتـەوە لـە ڕۆژی دواییـدا، بەتاڵخـوازان خەسـارەتیان بـۆ دەبـێ، ئەوانـەی بەتاڵیـان هێنـاوە بـۆ ئـەوەی حەقـی پـێ لەنـاو ببـەن، وە كردەوەكانیـان پـووچو بەتـاڵ بـووە، چونكـە پەیوەسـتە بـە پووچـەوە، جـا پـووچ بووەتـەوە لـە ڕۆژی دواییـدا ئـەو ڕۆژەی حەقیقەتەكانـی تێـدا دەردەكـەوێ، وە پاداشـتەكانیان لـە دەسـت دەدەنو سـزای بـە ئێشـیان بـۆ دەسـتەبەر دەبێـت.

پاشـان خـوا ﷻ وەسـفی سـەختی ڕۆژی دوایـی كـردوە بـۆ ئـەوەی بەنـدەكان ئاگـادار بكاتـەوەو خۆیـان بـۆی ئامـادە بكـەن، ﴿وَتَرَىٰ﴾ ئـەی بینـەری ئـەو ڕۆژە، ﴿كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً﴾ (هەمـوو ئۆممەتـێ) كەوتـوون بەسـەر ئەژنـۆدا، بـە هـۆی تـرسو ناخۆشـیو چـاوەڕوان كردنـی حوكـمو بڕیـاری خـوای بەبەزەیـی.

﴿كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰ إِلَىٰ كِتَٰبِهَا﴾ واتـە: (هەمـوو گەلـێ بانـگ دەكـرێ) بـۆ لای شـەریعەتی پێغەمبەرانیـان كـە لەلایـەن خـواوە بـۆ ناویـان هاتـووە، ئایـا پێـی هەسـتاون تـا پاداشـتو ڕزگـار بوونیـان دەسـت بكـەوێ، یان لـە بیریـان كردوە تـا خەسـارەتمەندی بەدەسـت بهێنـن.

جـا ئۆممەتـی مووسـا ﷺ بانـگ دەكرێـن بـۆ لای شـەریعەتی مووسـا، ئۆممەتـی عیسـاش بـە هەمـان شـێوە، ئۆممەتـی موحەممەدیـش ﷺ بـە هەمـان شـێوە، جگـە لەوانیـش بـەو شـێوەیە، هەمـوو گەلـێ بانـگ دەكـرێ بـۆ لای ئـەو شـەریعەتەی كـە پێـی سـپێردراوە، ئەمـە یەكێكـە لـە گریمانـەكان لـەم دەقـەدا، ئەویـش مانایەكـی تـەواوە لـە خـودی خۆیـداو هیـچ گومانێكـی تێدانیـە، وە دەگونجـێ مەبەسـت لـە فەرمـوودەی خـوا ﷻ: ﴿كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰ إِلَىٰ كِتَٰبِهَا﴾ واتـە: بـۆ لای كتێبـی كردەوەكانـی، وە ئەوەیشـی نووسـراوە لـە خێـرو شـەڕ، وە بێگومـان هەمـوو كەسـێ پاداشـت دەدرێتـەوە بەپێـی ئـەو كـردەوەی كردوویەتـی، وەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿مَنْ عَمِلَ

صَٰلِحًا فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ أَسَآءَ فَعَلَيۡهَاۚ ﴿١٥﴾ ﴾الجاثية، (واتە: هەر کەس چاکەی کرد ئەوە قازانجەکەی بۆ خۆیەتی، وە هەر کەس خراپەی کرد ئەوە زیانەکەی بۆ خۆیەتی) هەر کەس کردەوەی چاک بکات ئەوە بۆ خۆیەتی، وە هەر کەس کردەوەی خراپ بکات ئەوە لەسەریەتی).

پێدەچێ ئەم دوو واتایە هەردووکیان لە دەقەکەدا مەبەست بن، بەڵگە لەسەر ئەم واتایە فەرموودەی خوایە: ﴿ هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيۡكُم بِٱلۡحَقِّ ﴾ واتە: ئەمە کتێبەکانە کە بۆمان دابەزاندوون حەق‌و ڕاستی لە نێوانتاندا یەکلادەکاتەوە، کە بریتیە لە دادپەروەری، ﴿ إِنَّا كُنَّا نَسۡتَنسِخُ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾ (واتە: بە ڕاستی ئێمە وەک خۆی نووسیومانەتەوە ئەوەی کە ئێوە دەتانکرد) ئەمەش نامەی کردەوەکانە.

ئا لەبەر ئەمەیە درێژەی داوە ئەوەی خوا بەسەر ئەو دوو دەستەیەدا دەیهێنێ، فەرموویەتی: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ واتە: ئیمانێکی ڕاستەقینە، وە ئیمانەکەیان سەلماندبێ بە کردەوە چاکەکان لە پێویست‌و پەسندەکان ﴿ فَيُدۡخِلُهُمۡ رَبُّهُمۡ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ ﴾ کە شوێنەکەی بەهەشتە، وە ئەوەی تیایدایە لە نازونیعمەتی بەردەوام‌و ژیانی خۆش، ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡمُبِينُ ﴾ (واتە: ئا ئەوەیە) سەرکەوتن‌و ڕزگاربوون‌و قازانجی ڕوون‌و ئاشکرا، کە بێگومان ئەگەر بەندە بەدەستبهێنێ، ئەوە هەموو خێرو چاکەیەکی بەدەستهێناوەو شەڕو خراپەیەکی لێ دوور کەوتۆتەوە.

﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ ﴾ بە خوا، بە سەرزەنشت کردن‌و توانج لێدانەوە پێیان دەوترێ: ﴿ أَفَلَمۡ تَكُنۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ﴾ (ئایا بەڵگەکانی ئێمەتان بەسەردا نەدەخوێنرایەوە) بێگومان ڕێنیشاندەرتان بوو لەوەی بەرژەوەندیتانی تێدایەو ڕێگری لێکردن لەوەی زیانتانی تێدایە، ئەویش گەورەترین بەخششە پێتان گەیشتبێ، ئەگەر سەرکەوتوو ببن بۆی، بەڵام لووت بەرزیتان کرد لە بەرانبەری‌و پشتان تێکردو بێبڕوا بوون پێی، گەورەترین تاوانتان ئەنجامدا، ئا ئەمڕۆ پاداشت دەدرێنەوە بەوەی کە ئەنجامتان داوە، هەروەها سەرزەنشت دەکرێن، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيۡبَ فِيهَا قُلۡتُم ﴾ واتە: نکووڵی ئەوەتان کرد، ﴿ مَّا نَدۡرِي مَا ٱلسَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنّٗا وَمَا نَحۡنُ بِمُسۡتَيۡقِنِينَ ﴾ ئەمە حاڵیانە لە دونیا، وە حاڵی زیندووبوونەوەش نکوڵیکردن بوو، وە ڕەتکردنەوەی قسەی ئەو کەسەی هێناویەتی،

وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا عَمِلُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِءُونَ
٣٣ وَقِيلَ الْيَوْمَ نَنسَاكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ
وَمَا لَكُم مِّن نَّاصِرِينَ ٣٤ ذَٰلِكُم بِأَنَّكُمُ اتَّخَذْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا
وَغَرَّتْكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا ۚ فَالْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ
٣٥ فَلِلَّهِ الْحَمْدُ رَبِّ السَّمَاوَاتِ وَرَبِّ الْأَرْضِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ٣٦
وَلَهُ الْكِبْرِيَاءُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ٣٧

خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا عَمِلُوا ﴾ واتـە: لـە ڕۆژی دوایـیـدا سـزای کردەوەکانیـان بـۆ دەردەکـەوێ، ﴿ وَحَاقَ بِهِم ﴾ واتــە: دابــەزی (بۆیــان)، ﴿ مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾ واتــە: ئــەو ســزایەیان بـۆ دابـەزی کـە لـە دونیـادا گاڵتەیـان پـێ دەکـرد، وە بـە ڕوودانـیو بەوەشـی هێناویەتـی.

﴿ وَقِيلَ الْيَوْمَ نَنسَاكُمْ ﴾ واتـــە: وازتـــان لێدێنیـــن لـــە نـــاو ســـزادا، ﴿ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا ﴾ (واتــە: وەک چــۆن ئێــوە ئــەم ڕۆژەتــان لەبیــر چــوو) بێگومــان پاداشـــت لـــە ڕەگـــەزی کردەوەیـــە ﴿ وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ ﴾ واتــە: ئاگــر جێگــاو دەرەنجامتانــە ﴿ وَمَا لَكُم مِّن نَّاصِرِينَ ﴾ (واتــە: هیــچ یارمەتیدەرێکتــان نیــە) ڕزگارتــان بــکات لــە ســزای خــوا، وە ڕێگــری تۆڵــەی ئەوتــان لــێ بــکات.

﴿ ذَٰلِكُم ﴾ کـە سـزاتان بـە دەسـت هاتـووە، بـە هـۆی ئـەوەی ئێـوە ﴿ اتَّخَذْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا ﴾ (واتـە: بەڵگەکانـی خواتـان بـە گاڵتـە دانابـوو) لەگـەڵ ئـەوەی وا پێویسـت بـوو کۆششـی بـۆ بکـەنو بـە دڵخۆشـیو مـژدەوە وەری بگـرن، ﴿ وَغَرَّتْكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا ﴾ (واتـە: وە ژیانـی دونیـا فریـوی دان) بـە ڕازاوەیـیو لەزەتـیو جوانیەکانـی، دڵ ئـارام بـوون پێـیو کارتـان بـۆ کـرد، وە وازتـان هێنـا کار بکـەن بـۆ ماڵـی مانـەوە.

﴿ فَالْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴾ واتـــە: (جـــا ئەمـــڕۆ لـــەو دۆزەخـــە دەرناهێنرێـن)، وە مۆڵەتیشـتان پێنـادرێو ناگەڕێنرێنـەوە بـۆ دونیـا تـا کـردەوەی چـاک بکـەن.

﴿ فَلِلَّهِ الْحَمْدُ ﴾ وەک چـۆن پێویسـت بـوو بـە گەورەیـیو مەزنـی دەسـەڵاتی، ﴿ رَبِّ السَّمَاوَاتِ وَرَبِّ الْأَرْضِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ واتـە: سـتایش بـۆ ئـەو زاتـە لەسـەر پەروەردگاریتی هەمـوو بەدیهێنـراوەکان، بـە هـۆی ئـەوەی دروسـتی کـردوونو پـەروەردەی کـردوون،

وە نـازو نیعمەتـی پێبەخشـیون بـە نیعمەتـە ئاشـکراو نهێنیـەکان.
﴿ وَلَهُ ٱلْكِبْرِيَآءُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ واتـە: گەورەیـیو مەزنـی تەنهـا بـۆ ئـەوە (لـە ئاسـمانەکانو زەوی)، سـوپاس کردنـی خـوا لـە ئاسـمانەکانو زەوی سـتایش کردنێتـی بـە سـیفاتە تـەواوەکان، وە خۆشەویسـتنیو ڕێـز گرتنـی، وە گەورەیـی تیایـدا مەزنیەتی، وە پەرسـتن بونیـاد نـراوە لەسـەر دوو پایـە: خۆشویسـتنی خـوا، زەلیـل بـوون بـۆی، ئـەو دوانـەش لـە زانسـتەوە سـەرچاوە دەگـرن بـە سـتایش کردنەکانـی خـواو دەسـەڵاتو گەورەیـی.
﴿ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ﴾ بـە دەسـەڵاتە بەسـەر هەمـوو شـتێک ﴿ ٱلْحَكِيمُ ﴾ ئـەو زاتـەی شـتەکان لـە جێگـای خۆیانـدا دادەنێـت، هیـچ شـەریعەتێک دانانێـت مەگـەر بـە حیکمـەتو بەرژەوەندیـەک، وە هیـچ شـتێکی دروسـتی کـردوە مەگـەر بـە هـۆی سـوودو بەرژەوەندیـەک بێـت.

تەفسیری سووڕەتی (الجاثیة) تەواو بوو


سُورَةُ الأَحْقَافِ
بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
حمٓ ① تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ② مَا خَلَقْنَا
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى وَٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ عَمَّآ أُنذِرُواْ مُعْرِضُونَ ③ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن
دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُواْ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي
ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱئْتُونِي بِكِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَآ أَوْ أَثَٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ
صَٰدِقِينَ ④ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن
لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ⑤

## تەفسیری سوورەتی (الأحقاف)

## مەککیە (٣٥) ئایەتە

## بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿ حمٓ ① تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ② مَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَمَّآ أُنذِرُواْ مُعْرِضُونَ ③ ﴾

﴿ حمٓ ① تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ② مَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ ﴾ ئەمە ستایش کردنێکە لە لایەن خواوە لەسەر کتێبە بەهێزەکەی‌و بە مەزن داناییتی، وە لەو چوارچێوەشدا ڕێنیشاندانی بەندەکانە بۆ ڕێنمایی وەرگرتن لە ڕووناکیەکەی، لە سەرنجدانی ئایەتەکانی‌و دەرهێنانی گەنجینەکانی.

﴿ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ٥٤ ﴾الأعراف (واتە: بێداربن کە بەدیهێنان‌و فەرماندان هەر بۆ خوایە) وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ ١٢ ﴾الطلاق، (واتە: خوا زاتێکە ئاسمانەکانی دروستکردوە، وە بە وێنەی ئەوان زەویشی دروستکردوە فەرمانی خوا لە نێوانیاندا دادەبەزێت)، وە وەک چۆن خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ يُنَزِّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ أَنْ أَنذِرُوٓاْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ ② خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ تَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ③ ﴾النحل، (واتە: فریشتە دەنێرێتە خوارەوە بە وەحی بە فەرمانی خۆی بۆ هەر کەسێ لە بەندەکانی کە خۆی بیەوێ بەوەی خەڵکی بترسێنن کە بەڕاستی بێجگە لە من هیچ پەرستراوێکی تر نیە، کەواتە هەر من بپەرستن * خوا ئاسمانەکان‌و زەوی بە حەق دروستکرد بەرزو بڵندە لە هەرچی ئەوانە دەیکەنە هاوبەشی).

جـا خـوای گـەورە تەنهـا خـۆی ئـەرک پێـسـپێردراوانی دروسـت کـردوە، وە جێگـاو شـوێنی نیشـتەجێ بوونیانی دروسـتکردوەو ئەوەیشـی لەنـاو زەویدایـە، پاشـان پێغەمبەرانی بـۆ نـاردوونو کتێبەکانـی بـۆ دابەزانـدوون، فەرمانـی پێکـردوونو قەدەغـەی لێکردوون، وە هەواڵـی پێـداون کـە بێگومـان ئـەم ماڵـە ماڵـی کردەوەیـە، وە ڕێـرەوە بـۆ ئەوانـەی کار دەکـەن، ماڵـی مانـەوە نیـە کـە خەڵکەکـەی کـۆچ نەکـەن تیایـدا، بێگومـان ئـەوان لــە داهاتوویەکــی نزیکــدا دەگوازرێنـــەوە بـــۆ ماڵـــی مانـــەوەو جێگـــای هەمیشـــەیی‌و بـەردەوام، بەڵکــو ئــەو کارانــەی کــە لــەم ژیانــەدا ئەنجامــی دەدەن پاداشــتەکەی لــە ماڵـی دوارۆژدا بـە تەواوەتـی دەبیننـەوە.

خـوا ﷻ بەڵگـەی یەکلاکـەرەوەی هێناوەتـەوە دەربـارەی ژیانـی ئـەو ماڵـە هەمیشـەییە، وە بـە بەندەکانـی چەشـتوە نموونەیـەک لـە پاداشـتو سـزای بـە پەلـە، بـۆ ئـەوەی کاریگەرتـر بێـت، بۆیـان بـۆ بەدەسـتهێنانی خۆشویسـتراو، وە دوورکەوتنـەوە لـە نەویسـتراو، ئـا لەبـەر ئەمەیـە لێـرەدا فەرموویەتـی: ﴿ مَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴾ واتـە: (ئاسـمانەکانو زەوی‌و ئـەوەی لـە نێوانیاندایـە دروسـتمان نەکـردوە مەگـەر بـە حـەقو ڕاسـتی)، نـە بـە گاڵتـەو گـەپو نـە بـە هەوەنتـە، بەڵکـو بـۆ ئەوەیە بەنـدەکان مەزنـی بەدیهێنەرەکەیـان بزانـن، وە بەڵگـە بهێننـەوە لەسـەر تەواوێتـی ئـەو زاتـە، وە بزانـن ئـەو زاتـەی کـە ئاسـمانەکانو زەوی دروسـتکردوە بـەو مەزنیانـەوە، بـە دەسـەڵاتە لەسـەر دووبـارە دروسـتکردنەوەی بەنـدەکان دوای مردنیـان بـۆ پاداشـت دانـەوە، بێگومـان دروسـتکردنیانو مانەوەیـان ئەندازەگیـراوە تـا ﴿ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ (کاتێکـی دیاریکـراو).

جـا کاتـێ هەواڵـی بەوەدا -کـە بێگومـان ئـەو زاتـە ڕاسـتگۆترینی بێژەرانـە- وە بەڵگەی هێنایـەوەو ڕێگـای ڕوونـاک کـردەوە، هەواڵیـدا کـە دەسـتەیەک لـە خەڵکـی تەنهـا ڕوو وەرگێرانیـان هەڵبـژاردووە لـە ئاسـتی حـەقو ڕاسـتیدا، وە لایانـداوە لـە بانگـەوازی پێغەمبـەران، جـا فەرموویەتـی: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَمَّآ أُنذِرُواْ مُعْرِضُونَ ﴾ (واتـە: کەچـی ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون لـەوەی پێـی ترسـێنرا بـوون ڕوو وەردەگێـڕن).

بـەڵام ئەوانـەی بـڕوادار بـوون کاتـێ حەقیقەتـی بارودۆخەکەیـان زانـی ئامۆژگـاری پەروەردگاریـان وەرگـرتو ملکەچـی بـوونو بـە مەزنیـان دانـا، بۆیـە سـەرکەوتن بـە بەدەسـتهێنانی هەمـوو خێرێـکو دوورکەوتنـەوە لـە هەمـوو شـەڕو خراپەیـەک.

(٤-٦): ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ ۖ ٱئْتُونِى بِكِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَآ أَوْ أَثَٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤﴾ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ﴿٥﴾ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿٦﴾ ﴾:

﴿ قُلْ ﴾ واتــە: بڵــێ بەوانــەی هاوبەشــیان بــۆ خــوا دانــاوە لــە بتــەکان نــە ســوودیان هەیــەو نــە زیــان، نە مــردنو نەژیــان، نــە زیندووکردنــەوە، پێیــان بڵــێ -ڕوونــی بکەرەوە بۆیــان دەستەوســانی پەرســتراوەکانیان کــە بێگومــان ئەوانــە شایســتەی هیــچ جــۆرێ لــە بەندایەتیکــردن نیــن-: ﴿ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ ﴾ (واتە: پیشــانم بــدەن لــە زەویــدا چیــان دروســتکردوە یــان لــە دروســتکردنی ئاســمانەکاندا بەشــداریان کــردوە)، ئایــا شــتێکیان لــە نــاو ئاســمانەکانو زەویــدا دروســتکردوە؟ ئایــا کێوەکانیــان دروســتکردوە؟ ئایــا دەریایــان بەرێخســتووە؟ ئایــا ئاژەڵەکانیــان بــڵاوە پێکــردوە؟ ئایــا دارودرەختەکانیــان ســەوز کــردوە؟ ئایــا یارمەتــی دەرێکیــان هەیــە لــە دروســتکردنی شــتێ لەوانــە؟ نەخێــر هیــچ شــتێک لەوانــە نیــە، بــەوەی کــە خۆیــان دانــی پێــدا دەنێــن، ســەرەڕای جگــە لــە خۆیــان، ئەمــە بەڵگەیەکــی عەقڵــی یەکلاکەرەوەیــە لەســەر ئــەوەی بێگومــان بەندایەتــی کــردن بــۆ غەیــری خــوا شــتێکی پووچــە.

پاشــان باســی نەبوونــی بەڵگــەی عەقڵــی کــردوە، فەرموویەتــی: ﴿ ٱئْتُونِى بِكِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَآ ﴾ (واتــە: دەی پەڕاوێکــم بــۆ بهێنــن لــە پێــش ئــەم قورئانــە هاتبــێ)، کتێبــێ بانگەشــە بــکات بــۆ هاوبــەش دانــان، ﴿ أَوْ أَثَٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ ﴾ یــان زانیاریــەک بەجێمابــێ لــە پێغەمبەرانــەوە فەرمــان بــەوە بــکات.

بێگومــان ئــەوەی زانــراوە ئــەوان دەستەوســانن کــە لــە یەکێــک لــە پێغەمبەرانــەوە بەڵگەیــەک بهێنــن لەســەر هاوبــەش دانانیــان، بەڵکــو دڵنیاییــن هەمــوو پێغەمبــەران بانگەشــەیان کــردوە بــۆ لای یەکتاپەرســتی پەروەردگاریــانو ڕێگریــان کــردوە لــە هاوبــەش دانــان، ئــەوەش مەزنتریــن میراتــە لەوانــەوە بەجێمابــێ لــە زانســتو زانیــاری، خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ﴿٣٦﴾ ﴾النحل، (واتــە: ســوێند بــە خــوا لــە نــاو هەمــوو گــەلو ئۆممەتێکــدا پێغەمبەرێکمــان نــاردوە بەمــەی تەنهــا خــوا بپەرســتنو دوور کەونــەوە لــە پەرســتنی هــەر پەرســتراوێکی دیکــە)، وە هەمــوو پێغەمبــەرێ بــە گەلەکــەی فەرمــووە: ﴿ ٱعْبُدُوا۟

ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ﴿٥٩﴾ ﴾الأعـراف، (واتـــە: تەنهـــا خـــوا بپەرســـتن ئێـــوە هیـــچ پەرســـتراوێکتان نیـــە بێجگـــە لـــە خـــوا).

بێگومـــان زانـــرا دەمـــە دەمێـــی هاوبەشـــدانەران لـــە هاوبـــەش دانانیانـــدا پشـــت بەســـت نیـــە بـــە بەڵگـــەو ســـەلماندن، بەڵکـــو پشـــتیان بەســـتووە بـــە کۆمەڵـــە گومانێکـــی درۆینـــەو بۆچوونێکـــی خـــراپو عەقڵێکـــی فاســـیدو تێکچـــوو.

بارودۆخیـــان دەبێتـــە بەڵگـــە لەســـەر خراپـــیو پووچـــی پەرســـتراوەکانیان، وە بەدواداچوونی زانســـتو کردەوەکانیـــانو ســـەرنجدان لـــە بارودۆخیـــان لەوانـــەی تەمەنیـــان لـــە بەندایەتـــی کردنیـــدا بەســـەر بـــردوە، ئایـــا هیـــچ ســـوودێکیان پێگەیانـــدوون لـــە دونیـــادا، یـــان دوارۆژ؟ ئـــا لەبـــەر ئەمەیـــە خـــوا ﷻ فەرموویەتـــی: ﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾ واتـــە: (کـــێ لـــەو کەســـە گومڕاتـــرە کـــە هـــاوار لـــە غەیـــری خـــوا بـــکات کـــە وەڵامـــی نەداتـــەوە)، مـــاوەی مانـــەوەی لـــە ژیانـــی دونیـــا بـــە قـــەد تۆزقاڵـــە زەرەیـــەک ســـوودی بـــۆی نەبێـــت، ﴿ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ﴾ (واتـــە: وە ئـــەو هـــاوار لێکراوانـــە لـــە هـــاواری ئـــەوان بێئاگـــان) هیـــچ پاڕانەوەیەکیـــان لـــێ نابیســـتن، وەڵامـــی هاواریـــان نادەنـــەوە، ئەمـــە حاڵیانـــە لـــە دونیـــادا، لـــە ڕۆژی دواییشـــدا بێبڕوایـــی دەکـــەن بەوانـــەی هاوبەشـــیان بـــۆ دانـــاون.


وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿٦﴾ وَإِذَا
تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا
سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَلَا تَمْلِكُونَ
لِى مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ كَفَىٰ بِهِۦ شَهِيدًۢا بَيْنِى
وَبَيْنَكُمْ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٨﴾ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ
وَمَآ أَدْرِى مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ وَمَآ أَنَا۠
إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ
وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ
إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُوا۟ بِهِۦ
فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ ﴿١١﴾ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ
إِمَامًا وَرَحْمَةً وَهَٰذَا كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا لِّيُنذِرَ
ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا
ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٣﴾
أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾

﴿وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً﴾ (كاتێكیش خەڵك كۆدەكرێنەوە لە قیامەت پەرستراوەكان دەبنە دوژمنیان) هەندێكیان نەفرین لە هەندێكی دیكە دەكەن، وە هەندێكیان خۆیان لە هەندێكی دیكە بەریدەكەن، ﴿وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ﴾ (وە پەرستراوەكان بە پەرستنەكەیان بڕوا ناكەن).

(٧-١٠): ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ
قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا سِحْرٌ
مُّبِينٌ ﴿٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَلَا
تَمْلِكُونَ لِى مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ
فِيهِ كَفَىٰ بِهِۦ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ
ٱلرَّحِيمُ ﴿٨﴾ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ
أَدْرِى مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ
إِلَىَّ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ
إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾﴾:

﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ﴾ واتە: كاتێ بخوێنرێتەوە بەسەر بێبڕوایانو بە درۆدانەراندا ﴿ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ﴾ (ئایەتە ڕوونەكانی ئێمە) بە جۆرێ بێ هیچ گومانو دوو دڵیەكی تێدا نەبێ، هیچ سوودێكی نیە بۆ ئەوان، بەڵكو بەوە بەڵگەو حوجەیان لەسەر پێویست دەبێ، وە لە بوختانو درۆهەڵبەستنیان ئەوەیە كە وتوویانە: ﴿لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ واتە: (بەو قورئانەی بۆیان هاتووە ئەمە جادوویەكە) ڕوونو ئاشكرایەو هیچ گومانی تێدانیە، ئەمەش لە بابەتی هەڵگەڕانەوەی حەقیقەتەكانە، كە كەسی پێ هەڵناخەڵەتێ جگە لە كەم عەقڵو لاوازەكان نەبێ، ئەگەرنا لە نێوان ئەو حەقو ڕاستیەی كە پێغەمبەر هێناویەتی، وە لە نێوان سیحرو جادوودا جیاوازیەكی ئەوەندە گەورە هەیە، مەزنترە لە نێوان ئاسمانو زەوی.

چۆن حەق دەپێورێ -كە بەرزبوەتەوە بە جۆرێ بەسەر هەموو گەردووندا ڕووناكی پێشی ڕووناكی خۆر كەوتووە، وە بەڵگەی گەردوونیو نەفسی لەسەریەتی، وە دانی

پێدانـاوەو ملکەچـی بـووە خـاوەن عەقڵـە ژیـرەکان- بـەو پووچەی کـە بریتیە لە سـیحرو جـادوو، دەرناچـێ مەگەر لە کەسـێکی گومـڕاو وێڵو سـتەمکارو دەروون پیـسو کردەوە خـراپ نەبـێ؟! ئـەوە گونجاوە لەگەڵیـداو بەپێـی بارودۆخێتی، ئایـا ئەمە درۆو سـاختە نیە؟ ﴿ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۚ ﴾ واتــە: موحەممــەد ﷺ ئـەم قورئانەی لەلایەن خۆیەوە هەڵبەسـتووە، ئەوە لەلایـەن خواوە نەهاتـوە، ﴿ قُلۡ ﴾ پێیان بڵـێ: ﴿ إِنِ ٱفۡتَرَيۡتُهُۥ ﴾ (ئەگەر خۆم هەڵم بەسـتبێ) ئـەوە خـوا ﷻ بە دەسـەڵاتە بەسـەرمەوە، وە بەو توانجانەیشـی کـە دەیدەن زانایـە، جا چۆن سـزام نادا لەسـەر هەڵبەسـتنم کـە ئێوە پێتـان وایە؟

جـا ئایـا ﴿ تَمۡلِكُونَ لِي مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۖ ﴾ ئەگـەر خـوا بیـەوێ زیانـم لێبـدات، یـان بیـەوێ ڕەحمـم پـێ بکات؟ ﴿ كَفَىٰ بِهِۦ شَهِيدَۢا بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۖ ﴾ (ئەوە خوا بەسـە شـایەت بێـت لەنێوان مـنو ئێـوەدا) جـا ئەگەر من قسـەم هەڵبەسـتایە ئەوە بە دەسـتی خـۆی تۆڵەی لێدەسـەندم، وە بـە جـۆرێ سـزامی دەدا هیـچ کـەس نەیبینیبـێ، چونکـە ئەمە لـە مەزنتریـن جۆرەکانی بوختـان هەڵبەسـتنە، ئەگەر من قسـەیەکم هەڵبەسـتایە.

پاشـان بانگی کـردوون بۆ داوای تەوبەو لێخۆشـبوون لەسـەر ئـەو کەللەڕەقـیو عینادیەیان کـە کردوویانـە، جا فەرموویەتـی: ﴿ وَهُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ واتـە: بگەڕێنەوە بـۆ لای وە لە خۆتانـی دابڕنـن ئەوەی ئێوە لەسـەرین، لە گوناهەکانتـان خۆش دەبێو ڕەحمتـان پێدەکات، پاشـان سـەرکەوتووتان دەکات بۆ خێرو پاداشـتی بێپایانتـان دەداتەوە.

﴿ قُلۡ مَا كُنتُ بِدۡعٗا مِّنَ ٱلرُّسُلِ ﴾ واتـە: مـن یەکـەم پێغەمبـەر نیـم نێردرابـم بـۆ ناوتـان، تا سەرسـام بـن بـە پەیامەکـەم نکوڵـی لـە بانگەوازەکەم بکـەن، بێگومان پێشـم کەوتـووە لە پێغەمبـەرانو نێـردراوان، کـە بانگەوازەکـەی مـن وەکو بانگـەوازی ئەوانە، جـا ئیتر بۆچی نکوولـی پەیامەکـەم دەکـەن ﴿ وَمَآ أَدۡرِي مَا يُفۡعَلُ بِي وَلَا بِكُمۡۖ ﴾ واتـە: مـن هیـچ نیـم تەنها مـرۆڤ نەبـێ، لـە کاروبـاردا هیچم بە دەسـت نیـە، وە خوا ﷻ خـۆی هەڵسـوڕێنەری منو ئێوەیشـە، دادپـەروەرە لەسـەر مـنو ئێوەیـش، مـن ناتوانـم لەلایـەن خۆمەوە هیچ شـتێک بهێنـم ﴿ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴾ (واتـە: مـن تەنها ترسـێنەرێکی ئاشـکرامو بـەس) ئەگەر پەیامەکـەی منتـان وەرگـرتو وەڵامـی بانگەوازەکەمتـان دایـەوە ئـەوە بەشـتان دەبـێ لە دونیـاو دوارۆژدا، وە ئەگـەر ئەوەتـان ڕەتکـردەوە بەسـەرمدا، ئـەوە لێپرسـینەوەتان لـەلای خوایـە، بێگومـان مـن ئێـوەم ترسـاند، وە هەر کەسـێک بترسـێنرێ ئـەوە بیانـووی نامێنێ ﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كَانَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرۡتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثۡلِهِۦ فَـَٔامَنَ

﴿وَٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ﴾ واتــە: هەواڵــم بدەنــێ ئەگــەر ئــەم قورئانــە لەلایــەن خواوەیــە، وە شــایەتی لەســەر ڕاســتێتیدا، ســەرکەوتووان لــە خاوەنانــی کتێب ئەوانــەی حەقیان لەلا هەیــە، کە بەو هۆیــەوە دەزانــن ئەو پەیامــە حەقەو بــڕوای پێدێنــن‌و ڕێنمایی پــێ وەردەگرن، جــا هەواڵی پێغەمبــەرانو شــوێنکەوتووە پاڵفەتەکانیــان ڕێــک‌و ڕاســت وەک یەک دەبــێ، وە ئێوەیش ئــەی نەفامو بــێ عەقڵەکان لــووت بەرزیتان کــرد لە بەرانبــەری، ئایا ئەمە مەزنترین ســتەم‌و ســەختترین بێبڕوایــی نیە.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (واتــە: بێگومــان خــوا ڕێنمایــی گەلــی ســتەمکار نــاکات)، وە لە ســتەم‌و خۆ بــە گەورە زانین بەســەر حەقــدا دوای بە توانا بوونێتی لەســەری.

(١١-١٢): ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوۡ كَانَ خَيۡرٗا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيۡهِۚ وَإِذۡ لَمۡ يَهۡتَدُواْ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفۡكٞ قَدِيمٞ ﴿١١﴾ وَمِن قَبۡلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامٗا وَرَحۡمَةٗۚ وَهَٰذَا كِتَٰبٞ مُّصَدِّقٞ لِّسَانًا عَرَبِيّٗا لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٢﴾﴾.

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ واتــە: ئەوانــەی بێبڕوان بەرانبەر بــە حەق‌و عینادیو نکوولــی لێدەکەن، بانگەوازەکەی پێغەمبەریــان ڕەتکردووەتەوە وتیان: ﴿لَوۡ كَانَ خَيۡرٗا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيۡهِ﴾ واتــە: (ئەگــەر ئیســلام چــاک بووایە) ئەوە ئــەم بڕوادارانــە پێش ئێمــە نەدەکەوتن، ئێمــە دەبووین بــە یەکەم بڕواهێنــەر، ئەمە تەنهــا ڕازاندەوەو جوانکردنی قســەکانیانە.

جــا چــی بەڵگەیــەک هەیــە بەڵگەبێ لەســەر ئــەوەی نیشــانەی حەق‌و ڕاســتی پێشــکەوتنی بێبڕوایــان بــێ لــە ئیمانــداران؟ ئایــا ئەوانــە نەفــس‌و دەروونیــان پاکتــرە؟ یــان عەقڵیــان تەواوتــرە؟ یــان هیدایــەت‌و ڕێنمایــی بــە دەســتی ئەوانە؟

بــەڵام ئەم قســەیەی کــە لێیانــەوە دەرچووە نەفــس‌و دەروونــی خۆیانی پێ گــەورە دەکەن، وەکو کەســێ توانای نەبێ بەســەر شــتێکدا پاشــان لۆمــەو سەرزەنشــتی ئەنجامدەرانی بکات، ئــا لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿وَإِذۡ لَمۡ يَهۡتَدُواْ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفۡكٞ قَدِيمٞ﴾ (واتە: خۆیــان بــەو قورئانە ڕێنماییــان وەرنەگرتووە جا دواتــر دەڵێن ئەمە دەستهەڵبەســتێکی کۆنە) ئــەم هــۆکارەی کە وای لێکردن ئەم قســەیە بکــەن ئەوە بوو کــە بێگومان ئــەوان ڕێنماییان بــەم قورئانــە وەرنەگــرت‌و مەزنتریــن بەخشــش‌و بەهــرەو گەورەتریــن دەســتکەوتیان لــە دەســتدا، جــا هەســتان لەکەداریــان کــرد بــەوەی کــە درۆیە، ئــەو قورئانــە حــەق‌و ڕەوایە هیــچ گومانێکــی تێدانیــەو هیــچ دوو دڵیــەک هەڵناگــرێ، گونجــاوەو ڕێکە لەگــەڵ کتێبە ئاســمانیەکاندا، بــە تایبــەت تەواوتریــن‌و چاکترینیــان دوای قورئــان، ئەویــش تەوراتە خوا

دایبەزانـدوە بـۆ مووسـا ﵇ ﴿إِمَامًا وَرَحْمَةً﴾ واتـە: نەوەکانـی ئیسـرائیل پەیـڕەوی دەکـەنو ڕێنمایـی لێوەردەگـرن، بۆیـە خێری دونیـاو دوارۆژیـان بۆ دەسـتەبەر دەبێ.
﴿وَهَٰذَا﴾ قورئـان ﴿كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ﴾ (بەڕاسـتدانەری) کتێبەکانـی پێـش خۆیەتـی، شـایەتی داوە بەڕاسـتیان بـەوەی لەگەڵیانـدا ڕێکـەو گونجـاوە، وە خـوا ﷻ کردوویەتـی ﴿لِّسَانًا عَرَبِيًّا﴾ (بـە زمانـی عەرەبـی) بۆ ئەوەی بـە ئاسـانی وەربگیرێو یـادی پێبکرێ ﴿لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ (تـا سـتەمکاران بترسـێنێ) ئەوانـەی سـتەمیان لە خۆیـان کردوە بـە کوفـرو خراپەو سـەرپێچی، ئەگەر بەردەوام بن لەسـەر سـتەمکردنیان سـزای بە ئێشـیان تـووش دەبێ.
وە مـژدە دەدات بـە چاکەخـوازان لـە بەندایەتی کردنـی بەدیهێنـەرو لە سـوود گەیاندن بە بەدیهێنـراوەکان، بە پاداشـتی بـێ پایان لە دونیاو دوارۆژدا، وە باسـی ئـەو کردەوانە دەکات کـە ترسـاندوونی، وە ئـەو کردەوانەش کە مـژدەی پێداوە.
(١٣-١٤): ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾﴾:
﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ﴾ بێگومـان ئەوانـەی دانیانـاوە بە پەروەردگاریانو شـایەتیان بـۆی داوە بە تـاکو تەنهاییو پابەنـدی گوێڕایەڵی کردنی بـوون، ﴿ٱسْتَقَٰمُواْ﴾ بەردەوام بـوون لەسـەری لـە مـاوەی ژیانیانـدا، ﴿فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ لـە هـەر شـەڕو خراپەیەک لـە پێشـیان ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ لەسـەر ئـەوەی بەجێیـان هێشـتووە، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ﴾ واتـە: خەڵکـی بەهەشـتنو بـە بـەردەوام تیایـدان، ئەوانە تیایـدا ناگوازرێنـەوە، وە نایانـەوێ جێگۆڕکێیـان پـێ بکـرێ. ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ لـە بڕواهێنان بە خـوا، بڕواهێنانێـک کـردەوە چاکـەکانو بەردەوام بـوون لەسـەریان بخوازێ.

وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ
كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ
أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ
عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ ۖ
إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ
عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ فِىٓ أَصْحَٰبِ
ٱلْجَنَّةِ ۖ وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِى قَالَ
لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتِ ٱلْقُرُونُ مِن
قَبْلِى وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيْلَكَ ءَامِنْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ
مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ
فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ خَٰسِرِينَ
﴿١٨﴾ وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟ ۖ وَلِيُوَفِّيَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ
﴿١٩﴾ وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَٰتِكُمْ فِى حَيَاتِكُمُ
ٱلدُّنْيَا وَٱسْتَمْتَعْتُم بِهَا فَٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ
تَسْتَكْبِرُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ ﴿٢٠﴾

**(١٥-١٦):** ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ ۖ إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلْجَنَّةِ ۖ وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿١٦﴾ ﴾:

﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ﴾ ئەمــە لــە بەزەیــی خوایــە بــە بەندەکانــی، وە سوپاسـگوزاری ئـەو زاتەیە بۆ دایـکو باوک کــە ئامۆژگــاری منداڵەکانی کــردوەو پەیمانی لێوەرگرتوون چــاک بن لەگەڵ دایـکو باوکیاندا، بــە قسـەی جوانو نــەرمو نیــانو لەســەرخۆ، وە خەرجکردنی مــاڵو ســامانو نەفەقە بۆیــانو جگە لەوانــەش لــە جۆرەکانــی دیکەی چاکەخــوازی.

پاشــان ئاگــاداری کردوونەتــەوە لەســەر هــۆکاری پێویســتکەری چاکە کــردن لەگەڵیانــدا، باســی ئــەوەی کــردوە کە دایــک منداڵە کــەی هەڵدەگرێ بە ئەوپــەڕی نارەحەتــی لە کاتــی هەڵگرتنیدا، پاشــان ناخۆشــیو دەردەســەری لە دایک بوونی کە پــڕە لە نارەحەتی گەورە، پاشــان دەردەســەری قۆناغــی شــیرپێدانو خزمەتکردنــی، ئەوانــەی کــە باســکران ماوەیەکی کەم نین ســاتێ یــان چەند ســاتێ، بەڵکــو ماوەیەکــی دوورو درێــژە ﴿ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ﴾ بــۆ دووگیــان بــوون نۆ مانــگ هەیە، ئــەوەی دەمێنێتــەوە بــۆ شــیرپێدان ئەمــە بــە زۆری، ئــەم دەقــە دەبێتــە بەڵگــە لەگــەڵ فەرموودەی خــوا ﷻ: ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ﴿٢٣٣﴾ ﴾ البقـرة، (واتــە: دایــکان شــیر دەدەن بــە منداڵەکانیــان دوو ســاڵی تــەواو)، کەمتریــن مــاوەی دوو گیانی شــەش مانگە، چونکــە ماوەی شــیرپێدان بریتیــە لــە دووســاڵ، ئەگــەر لە ســی مانــگ دەربکــرێ تەنها شــەش مانگــی دەمێنێ بۆ مــاوەی دووگیانی.

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ ﴾ واتـە: ئەوپەڕی هێزو توانـاو گەنجێتیو تەواوی عەقڵی ﴿ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ ﴾ واتـە: (وە دەگاتـە چل سـاڵ دەڵێ ئـەی پەروەردگارم) ڕامبێنەو سـەر کەوتووم بکـە، ﴿ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ ﴾ واتـە: (تـا شـوکرانە بژێری ئـەو بەهرە چاکـە بکـەم کـە ڕشـتووتە بەسـەر منو دایـکو باوکمـدا) نیعمەتـی ئایـنو نیعمەتـی دونیا، وە سوپاسـگوزاری کردنـی بـە بەکارهێنانی نازونیعمەتـەکان لە گوێڕایەڵـی ئەو زاتـەدا، وە لە بەرانبەر منەتکردنیـدا، وە لـە بەرانبـەر منەتەکانیـدا دانبنـێ بـە بێتوانایـیو دەستەوسـانی خۆیـدا، کۆشـش بـکات بـە سـتایش کردنـی پەروەردگـاری لەسـەر ئـەو نازونیعمەتانـە، وە ئـەو نازونیعمەتەی کە ڕشـتوویەتی بەسـەر دایکو بـاوکو وەچەکانیدا، بێگومـان ئەوانیش ئەو بەهرانەیـان بەردەکەوێ، چونکـە هـەر دەبـێ ئـەو بەهرانە بەدەسـت بهێنن، بـە تایبـەت نیعمەتی ئایـن، چونکـە چاکبوونی دایـکو بـاوک بە زانسـتو کـردەوە لـە گەورەتریـن هۆکارەکانە بـۆ چاکبوونـی منداڵەکانیان، ﴿ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ ﴾ (واتـە: ڕامبێنـە کـردەوەی چـاک بکەم کە تۆ پێـی ڕازیبی) بەوەی گشـتگیر بـێ لـەوەی چاکـی دەکات، سـەلامەت بـێ لـەوەی تێکـی دەدات، جـا ئـەم کردەوەیە خـوا ﷻ پێی ڕازیەو وەریدەگرێو پاداشـتی لەسـەر دەداتـەوە، ﴿ وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ ﴾ (واتە: نەوەکانیشـم چـاکو صالـح بکە) کاتـێ دوعای کرد بۆ خـۆی بە چاک بـوون، ئنجـا پاڕایەوە بۆ نەوەکانـی کـە بارودۆخیان چاک بکات، وە باسـی ئەوەیکـرد چاک بوونیان سـوودو قازانجەکەی دەگەڕێتـەوە بۆ دایکو باوکیـان، وەک فەرموویەتـی: ﴿ وَأَصْلِحْ لِى ﴾.

﴿ إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ ﴾ لـە گوناهـو سـەرپێچیەکانو گەڕاومەتەوە بۆ بەندایەتـی کردنی تۆ ﴿ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾ (بێگومان من لە مسـوڵمانانم)، ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ ﴾ ئەوانەی وەسـفەکانیان باسـکرا، ﴿ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ ﴾ (واتـە: کەسـانێکن کـە ئێمە کـردەوە چاکەکانیـان لێوەردەگرین) ئەویـش گوێڕایەڵـیو بەندایەتـی کردنەکانـە، چونکـە جگـە لـەو کردەوانـەش ئەنجـام دەدەن لە چاکـە ﴿ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ ﴾ (واتـە: چاوپۆشـی دەکەین لە خراپەکانیـان) بە کۆی، ﴿ أَصْحَٰبِ ٱلْجَنَّةِ ﴾ خێـرو چاکەو خۆشویسـتراو بەدەسـت دێنن، شـەڕو خراپەیشـیان لێ بـە دوور دەبێ.

﴿ فِى وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴾ واتـە: ئـەم بەڵێنـەی پێمانـدان بەڵێنێکـی ڕاسـتگۆیانەیە، لەلایـەن ڕاسـتگۆترینی ڕاسـتگۆیانەوە دەرچـووە کە هەرگیـز پێچەوانـەی بەڵێنـی ناجوڵێتەوە.

(١٧-١٩): ﴿ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتِ ٱلْقُرُونُ مِن قَبْلِى وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيْلَكَ ءَامِنْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴿١٨﴾ وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا

عَمِلُواْ وَلِيُوَفِّيَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٩﴾ ﴾:
کاتێ خوا ﷻ باسی حاڵی چاکەخوازی کرد لەگەڵ دایکو باوکیدا، ئنجا باسی سەرپێچی کردنی باوکو دایکی کرد، کە بێگومان ئەوە خراپترین حاڵەتەکانە، جا فەرمووی: ﴿ وَٱلَّذِي قَالَ لِوَٰلِدَيۡهِ ﴾ (ئەو کەسەش کە بە باوکو دایکی دەڵێت) کاتێ بانگی دەکەن بۆ بڕواهێنان بە خواو ڕۆژی دوایی، وە دەیترسێنن بە سزای ئەو ڕۆژە.
ئەمە مەزنترین چاکەیە لەلایەن دایکو باوکەوە بۆ منداڵەکەیان، ئەوەیە کە بانگی دەکەن بۆ بەختەوەری هەمیشەییو سەرفرازی هەتا هەتایی، بەلام ئەو بەخراپترین شێوە وەلامیان دەداتەوە دەڵێت: ﴿ أُفّٖ لَّكُمَآ ﴾ واتە: ئۆفو تووڕەیی بۆ ئێوەو لەوەیشی هێناوتانە.
پاشان باسی ڕووی دووربوونیو نکوولێکردنی لە ڕۆژی دوایی کردوو فەرموویەتی: ﴿ أَتَعِدَانِنِيٓ أَنۡ أُخۡرَجَ ﴾ (ئایا هەڕەشەم لێدەکەن کە زیندوو دەکرێمەوە) لە گۆڕەکەم لە ڕۆژی دواییدا ﴿ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلۡقُرُونُ مِن قَبۡلِي ﴾ (واتە: لە کاتێکدا چەند چین پێش من ڕۆیشتوون) لەسەر بێبڕواییو بە درۆدانان، ئەوانیش پێشەوایانی پەیڕەو پێکراو بوون بۆ هەموو نەفامو بێبڕواو کەللەرەقو عینادێک؟
﴿ وَهُمَا ﴾ واتە: دایکو باوکی، ﴿ يَسۡتَغِيثَانِ ٱللَّهَ ﴾ هانا بۆ لای خوا دەبەنو پێی دەڵێن: ﴿ وَيۡلَكَ ءَامِنۡ ﴾ واتە: (هاوار بۆ تۆ بڕوا بێنە) هەموو تواناکانیان دەخەنە گەڕو کۆشش دەکەن لە هیدایەتدانیدا، بەوپەڕی کۆشش کردن، تەنانەت لە سووربوونیان لەسەری هاوار دەبەنە لای خوا، وەک کەسێ کە لە ناو دەریادا نقووم بێ، وە داوای لێدەکەن بە داواکردنی ئەو کەسەی ئاو لە قوڕگیدا بێ لە ناو دەریا، وە سەرزەنشتی منداڵەکەیان دەکەنو خەمی لێدەخۆنو حەقو ڕاستی بۆ ڕوون دەکەنەوەو، دەڵێن: ﴿ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ ﴾ پاشان بەڵگەی بۆ دەهێننەوە ئەوەی لە تواناياندا بێت، وە منداڵەکەیان هیچی بۆ زیاد نابێ تەنها کەللەرەقیو دوورکەوتنەوەو لووت بەرزی لە بەرانبەر حەقو ناشرین کردنی ﴿ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾ واتە: (ئەمە بەس ئەفسانەی پێشینەو هیچی تر) تەنها لە کتێبە پێشووەکان وەرگیراوە، لەلایەن خواوە نەهاتووە، وە خوا وەحی پێ نەکردوە بۆ پێغەمبەرەکەی.
هەموو کەس دەزانێ کە موحەممەد ﷺ نەخوێندەوارە، نە دەزانێ بنووسێو نەدەزانێ بخوێنێتەوەو لە کەسیشەوە فێر نەبووە، جا ئیتر لە کوێوە فێر بووە؟ وە ئادەمیزادیش ناتوانن شتێ وەک ئەم قورئانە بێنن ئەگەر هەموویان پشتگیری یەکتر بکەن لەسەری.
﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ﴾ بەم حاڵە سەرزەنشت کراوە، ﴿ حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ ﴾ واتە: سزایان بەسەردا

چەسپاوە، ﴿ فِيٓ ﴾ لـە کـوێ ﴿ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ ﴾ (ئـەو ئۆممەتانـەدا کـە پێـش ئەمـان ڕابـوردون لـە جنۆکـەو ئادەمـی) لەسـەر کوفـرو سـەرپێچی کـردن، ئـا ئەوانـە لە داهاتـوودا نقـووم دەبـن لە نـاو تـاوانو گوناهـی خۆیاندا.

﴿ إِنَّهُمۡ كَانُواْ خَٰسِرِينَ ﴾ (الخسـران): بریتیـە لـە لەدەسـتدانی سـەرمایەی سـەروەتو سـامانی مـرۆڤ، جـا ئەگـەر سـەرمایەی ماڵەکـەی لە دەسـتدا ئـەوە قازانج لـە پێشـترە، ئـەوان ئیمانیان لە دەسـتدا، هیـچ شـتێکیان لـە نـازو نیعمەتـەکان بەدەسـت نەهێنـاو سـەلامەتیش نەبوون لە سـزای ئاگـری دۆزەخ، ﴿ وَلِكُلّٖ ﴾ لـە خەڵکانـی چـاکو خەڵکانـی خـراپ ﴿ دَرَجَٰتٞ مِّمَّا عَمِلُواْۖ ﴾ واتە: هـەر کەسـەو بەپێـی پلەو پایـەی خۆی لـە خێرو چاکـە، وە پلـەو پایەی لـەماڵـی دواڕۆژ بەپێی کردەوەکانیـان، وە لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَلِيُوَفِّيَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴾ (واتە: تا خوا پاداشـتو سـزای کردەوەکانیـان بە تەواوی بداتـەوە، وە ئەوان هیچ سـتەمیان لێناکـرێ) بەوەی نە لـە تاوانەکانیـان زیـاد دەکرێ، نە لـە چاکەکانیـان کـەم دەکرێتەوە.

(٢٠): ﴿ وَيَوۡمَ يُعۡرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَلَى ٱلنَّارِ أَذۡهَبۡتُمۡ طَيِّبَٰتِكُمۡ فِي حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنۡيَا وَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهَا فَٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ بِمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ تَفۡسُقُونَ ٢٠ ﴾:

﴿ وَيَوۡمَ يُعۡرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَلَى ٱلنَّارِ ﴾ خـوا ﷻ باسـی حاڵـی بێبڕوایـان دەکات لـە کاتـێ ڕادەگیرێن بەرانبـەر دۆزەخ، کاتـێ سەرزەنشـت دەکرێـنو توانجیـان لێـدەدرێ، پێیـان دەوتـرێ: ﴿ أَذۡهَبۡتُمۡ طَيِّبَٰتِكُمۡ فِي حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنۡيَا ﴾ (واتـە: هەرچـی خۆشـیتان بـوو بەسـەرتان بـرد لـە ژیانـی دونیاتاندا) کاتـێ دڵنیابـوون بە ژیانی دونیاو بوغـرا بوون بە لەزەتەکانـیو ڕازیبون بە حـەزوو ئارەزووەکانی، وە خۆشـیەکانی ئـەو دونیایـە دواڕۆژی لەبیـر بردنـەوە، وەکـو ئـاژەڵو مـاڵات چێـژو لەزەتتان لێوەردەگـرت، ئـەوە بەشـی ئێوە بـوو لـە دواڕۆژتاندا.

﴿ فَٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ ﴾ واتـە: (بۆیـە ئەمـڕۆ تۆڵەتان لێدەسـەنرێ) بە سـزایەکی سـەخت، کـە ڕیسـواو سەرشـۆڕتان دەکات، بـەوەی کـە ئێوە قسـەتان بە نـاوی خـواوە دەکرد، واتـە: ئەو ڕێگـا خـراپو گومراییـەی ئێوە لەسـەری بوون دەتانـداوە پاڵ خواو پـاڵ حیکمەتەکانـی، ئێوەش درۆزن بـوون لـەوەدا ﴿ وَبِمَا كُنتُمۡ تَفۡسُقُونَ ﴾ واتـە: لـووت بەرزیتان دەنوانـد لە بەرانبـەر گوێڕایەڵی کردنیـدا، کۆیـان کـردەوە لـە نێوان قسـەی پـووچو کـردەوەی پـووچ، وە درۆکردن بـە ناوەی خـواوە، بـە دانەپاڵی بـۆ لای ڕەزامەندی ئـەو، وە لەکەدار کردنی حـەقو لووت بەرزی لە ئاسـتیدا، بە توونـدترین سـزا.

(٢١-٢٦): ﴿وَٱذۡكُرۡ أَخَا عَادٍ إِذۡ أَنذَرَ قَوۡمَهُۥ
بِٱلۡأَحۡقَافِ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ
وَمِنۡ خَلۡفِهِۦٓ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ إِنِّيٓ أَخَافُ
عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ (٢١) قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا
لِتَأۡفِكَنَا عَنۡ ءَالِهَتِنَا فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ
مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ (٢٢) قَالَ إِنَّمَا ٱلۡعِلۡمُ عِندَ ٱللَّهِ
وَأُبَلِّغُكُم مَّآ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا
تَجۡهَلُونَ (٢٣) فَلَمَّا رَأَوۡهُ عَارِضٗا مُّسۡتَقۡبِلَ
أَوۡدِيَتِهِمۡ قَالُواْ هَٰذَا عَارِضٞ مُّمۡطِرُنَاۚ بَلۡ هُوَ مَا
ٱسۡتَعۡجَلۡتُم بِهِۦۖ رِيحٞ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٞ (٢٤)
تُدَمِّرُ كُلَّ شَيۡءِۭ بِأَمۡرِ رَبِّهَا فَأَصۡبَحُواْ لَا يُرَىٰٓ
إِلَّا مَسَٰكِنُهُمۡۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ
(٢٥) وَلَقَدۡ مَكَّنَّٰهُمۡ فِيمَآ إِن مَّكَّنَّٰكُمۡ فِيهِ
وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ سَمۡعٗا وَأَبۡصَٰرٗا وَأَفۡـِٔدَةٗ فَمَآ أَغۡنَىٰ
عَنۡهُمۡ سَمۡعُهُمۡ وَلَآ أَبۡصَٰرُهُمۡ وَلَآ أَفۡـِٔدَتُهُم مِّن شَيۡءٍ إِذۡ كَانُواْ يَجۡحَدُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَحَاقَ بِهِم
مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ (٢٦)﴾

وَٱذۡكُرۡ أَخَا عَادٍ إِذۡ أَنذَرَ قَوۡمَهُۥ بِٱلۡأَحۡقَافِ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ
مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦٓ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ
عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ٢١ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِتَأۡفِكَنَا عَنۡ ءَالِهَتِنَا فَأۡتِنَا
بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٢٢ قَالَ إِنَّمَا ٱلۡعِلۡمُ عِندَ ٱللَّهِ
وَأُبَلِّغُكُم مَّآ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ ٢٣ فَلَمَّا
رَأَوۡهُ عَارِضٗا مُّسۡتَقۡبِلَ أَوۡدِيَتِهِمۡ قَالُواْ هَٰذَا عَارِضٞ مُّمۡطِرُنَاۚ
بَلۡ هُوَ مَا ٱسۡتَعۡجَلۡتُم بِهِۦۖ رِيحٞ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ٢٤ تُدَمِّرُ كُلَّ
شَيۡءِۭ بِأَمۡرِ رَبِّهَا فَأَصۡبَحُواْ لَا يُرَىٰٓ إِلَّا مَسَٰكِنُهُمۡۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي
ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ٢٥ وَلَقَدۡ مَكَّنَّٰهُمۡ فِيمَآ إِن مَّكَّنَّٰكُمۡ فِيهِ
وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ سَمۡعٗا وَأَبۡصَٰرٗا وَأَفۡـِٔدَةٗ فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُمۡ سَمۡعُهُمۡ
وَلَآ أَبۡصَٰرُهُمۡ وَلَآ أَفۡـِٔدَتُهُم مِّن شَيۡءٍ إِذۡ كَانُواْ يَجۡحَدُونَ بِـَٔايَٰتِ
ٱللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ٢٦ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَا
مَا حَوۡلَكُم مِّنَ ٱلۡقُرَىٰ وَصَرَّفۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ٢٧
فَلَوۡلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرۡبَانًا ءَالِهَةَۢۖ
بَلۡ ضَلُّواْ عَنۡهُمۡۚ وَذَٰلِكَ إِفۡكُهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ٢٨

﴿وَٱذۡكُرۡ أَخَا عَادٍ إِذۡ أَنذَرَ قَوۡمَهُۥ بِٱلۡأَحۡقَافِ﴾ تا کۆتایی چیرۆکەکە ﴿وَٱذۡكُرۡ﴾ واتە: باسی بکە بە ستایشکردنێکی جوان، ﴿أَخَا عَادٍ﴾ ئەویش هوودە (عليه السلام)، کە یەکێک بوو لە پێغەمبەرە بەڕێزەکان، کە خوا ﷻ فەزڵو چاکەی دابوو بە بانگەواز کردن بۆ لای ئاینەکەیو ڕێنیشاندانی خەڵکی بۆ لای.

﴿إِذۡ أَنذَرَ قَوۡمَهُۥ﴾ ئەوانیش عاد بوون، ﴿بِٱلۡأَحۡقَافِ﴾ واتە: لە وڵاتەکەیان کە ناسرابوو بە ئەحقاف، ئەویش بریتیە لە لمێکی زۆر لە زەوی یەمەن.

﴿وَقَدۡ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦٓ﴾ (بێگومان پێغەمبەرانی زۆر ڕابردون لە پێشو دوای ئەویشەوە) جا ئەو پێغەمبەرە داهێنەرێکی تازە نەبوو لەناویاندا، وە پێچەوانەی ئەوانیش نەبوو، پێی فەرموون: ﴿أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ﴾ (واتە: جگە لە خوا هیچی تر نەپەرستن بێگومان من دەترسم لە سزای ڕۆژێکی گەورە بۆ ئێوە).

فەرمانــی پێکــردن بــە بەندایەتــی خــوا ﷻ کــە کۆکــەرەوەی هەمــوو قســەیەکی پێکــراو کردەوەیەکی ستایشــکراوە، وە ڕێگری لێکردوون لە هاوبەشــدانان، وە ترســاندوونی -ئەگەر گوێڕایەڵــی نەکەن- لە ســزایەکی ســەخت، ئــەو بانگەوازە هیچ ســوودێکی نەبــوو بۆ ئەوان.
﴿ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِتَأۡفِكَنَا عَنۡ ءَالِهَتِنَا ﴾ واتــە: تــۆ هیــچ مەبەســتێکت نیەو حەقو ڕاســتیت لەلا نیــە جگــە لەزە نەبــێ حەســوودیت بە پەرســتراوەکانمان بــردوە، ویســتووتە ئێمە لــە ئەوان دوور بخەیتەوە.
﴿ فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ (واتــە: دەی بۆمــان بێنــە ئــەو ســزای بەڵێنــت پێداویــن ئەگــەر لە ڕاســتگۆیانی) ئەمــە ئەوپــەڕی نەفامــیو عینــادیو کەللەڕەقیانە ﴿ قَالَ إِنَّمَا ٱلۡعِلۡمُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾ بــە تەنهــا کاروبــارەکان بــە دەســتی ئــەو زاتەیــە، ئــەو زاتە ســزاتان بۆ دێنــێ ئەگــەر بیەوێ.
﴿ وَأُبَلِّغُكُم مَّآ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ ﴾ واتــە: هیــچ لەســەر مــن نیــە تەنهــا ڕاگەیاندنــی ڕوون نەبێت، ﴿ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ ﴾ (بــەڵام مــن دەبینــم ئێــوە گەلێکــی نــەزانو نەفامــن) ئا لەبــەر ئەوەیــە ئــەوەی دەرچــووە لێتانەوە کــە دەرچــووە، لەو بوێــریو کەللەڕەقیە ســەختە، جــا خــوا ﷻ ســزای مەزنــی بۆ نــاردن، ئەویــش بایــەک بوو کە لــە نــاوی بردن.
لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ فَلَمَّا رَأَوۡهُ ﴾ واتە: ســزا ﴿ عَارِضٗا مُّسۡتَقۡبِلَ أَوۡدِيَتِهِمۡ ﴾ ڕوو بەڕوویــان بوویــەوە وەک پەڵــە هــەورێ ڕووی کردۆتــە شــێوەکانیان، کــە لەوێــوە ئــاوی بەرووبومەکانیــان بداتو لێی بخۆنەوە، ﴿ قَالُواْ ﴾ مژدەیانــداو وتیان: ﴿ هَٰذَا عَارِضٞ مُّمۡطِرُنَا ﴾ واتــە: ئەمــە هەورێکــە بارانی پێیــە بۆمان. خــوا ﷻ فەرمــووی: ﴿ بَلۡ هُوَ مَا ٱسۡتَعۡجَلۡتُم بِهِۦ ﴾ واتــە: ئەمــە ئەو ســزایەیە کــە داواتــان دەکرد کاتــێ وتتــان: ﴿ فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾.
﴿ رِيحٞ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ٢٤ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيۡءِۭ ﴾ (واتــە: بایەکــی بەهێــزە ســزای ســەختی پێیــە * بــە فەرمانــی پەروەردگــاری هەموو شــتێ دەڕوخێنــێ) تێدەپەڕێ بەســەریدا بــە توونديو ســەختی، ﴿ سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗاۖ فَتَرَى ٱلۡقَوۡمَ فِيهَا صَرۡعَىٰ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ ٧ ﴾ الحاقة، (واتــە: حــەوت شــەوو هەشــت ڕۆژ بەبێ وچــان لەناوی بــردن ئەو گەلــەت دەبینــی لەو ماوەیــەدا بێ گیــان کەوتبوون وەک قــەدی دارخورمای گەنــدەڵو ناو ڕزیــو)، ﴿ بِأَمۡرِ رَبِّهَا ﴾ واتــە: بــە مۆڵەتو ویســتی ئەو.
﴿ فَأَصۡبَحُواْ لَا يُرَىٰٓ إِلَّا مَسَٰكِنُهُمۡ ﴾ (واتــە: ئیتــر وایــان بەســەرهات تەنهــا شــوێنی

خانووەکانیـان دەبینـرا) ئـاژەڵو مـاڵو سـەروەتو سـامانو نەفسـیان هەمـووی تیاچـوو، ﴿كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ بـە هـۆی تـاوانو سـتەمیانەوە، ئەمـە لەگەڵ ئـەوەدا، خوا بەخششـی مەزنـی خـۆی دابارانـد بەسـەریاندا، بـەڵام ئـەوان نەسوپاسـگوزاریان کـردو نە یادیـان کـردەوە، ئا لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّٰهُمْ فِيمَآ إِن مَّكَّنَّٰكُمْ فِيهِ﴾ واتـە: جێگیرمـان کـردن لەسـەر زەویدا، سـوودیان لـە پـاکو خاوێنـەکان وەردەگرتو چێژیـان لـە ئارەزووەکانیـان دەکـرد، وە تەمەنێکمـان پێـدان کـە مرۆڤـی ژیر تیایـدا بیر بکاتـەوەو هیدایەتـدراو ئامۆژگـاری تێـدا وەربگرێ، واتـە: بێگومان دابوومان بـە گەلی عاد وەک چـۆن بـە ئێوەمانـدا ئەی دوێنـراوان، وا مەزانـن ئەوەی بـە ئێوەمانداوە تایبەتـە پێتانو بەرگریتـان لێـدەکات شـتێ لـە سـزای خواتان بۆ کـەم دەکاتـەوە، بەڵکو کەسـانی جگە لە ئێـوە گەورەتـر لەوەمـان پێدابـوو، هیـچ سـوودێکی پێنەگەیانـدن، نە مـاڵو نە منـداڵو نە سـەربازەکانیان لـە لای خوا.

﴿وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَٰرًا وَأَفْـِٔدَةً﴾ واتـە: ناتـەواوی نەبـوو لـە بیسـتنیاندا، وە نـە لـە بینینیـانو نـە لـە بیـرو هۆشـیان، تـا بوتـرێ: ئـەوان وازیـان لـە حـەق هێنـاوە بـە هۆی نەفامیـەوە، یـان نەبوونی توانای زانسـتی پێـی، یان ناتەواوی لـە عەقڵیاندا، بەڵام سـەرکەوتن بـە دەسـتی خوایـە. ﴿فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُهُمْ وَلَآ أَفْـِٔدَتُهُم مِّن شَىْءٍ﴾ (واتە: بـەڵام سـوودو کەڵکـی پێنەگەیانـدن نـە گـوێو نەچاوو نـە دڵیان بـە هیچ شـێوەیەک) نە زۆر نـە کەم.

ئەویـش بەهـۆی ئـەوەی ئـەوان ﴿كَانُوا۟ يَجْحَدُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ (واتـە: بڕوایـان بـە نیشـانەکانی خـوا نەبـوو) کـە بەڵگەن لەسـەر یەکتاپەرسـتیو تـاکو تەنهایی بە پەرسـتن.

﴿وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ واتـە: سـزایان بـۆ دابـەزی کـە بەدرۆیـان دەزانیو گاڵتەیـان بـەو پێغەمبەرانـە دەکرد کە دەیانترسـاندن.

(٢٧-٢٨): ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْقُرَىٰ وَصَرَّفْنَا ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٧﴾ فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرْبَانًا ءَالِهَةًۢ ۖ بَلْ ضَلُّوا۟ عَنْهُمْ ۚ وَذَٰلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢٨﴾﴾:

﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْقُرَىٰ وَصَرَّفْنَا ٱلْـَٔايَٰتِ﴾ خـوا ﷻ هاوبەش دانەرانی عەرەبو جگـە لەوانیـش دەترسـێنێ، بـە لەناوبردنـی ئوممەتـە بێبـڕواو بەدرۆدانـەرەکان، ئەو شـارو شـارۆچکانەی لـە دەوروبەریان بـوون، بەڵکو زۆربەیـان لە دوورگەی عـەرەب بوون، وەک

عــادو ثمــوودو وێنــەی ئــەوان، بێگومــان خــوا بەڵگەی جــۆراو جــۆری زۆری نیشــاندان لە هەمــوو ڕوویە کــەوە ﴿ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ (واتە: تا لــە بێبڕوایی بگەڕێنەوە) لەوەی لەســەرین لــە بێبڕوایی‌و بــە درۆدانان.

جــا کاتــێ بڕوایــان نەهێنا خــوا تۆڵەی لێســەندن بــە تۆڵەســەندنی کەسێکی زاڵی بــە توانا، پەرســتراوە کانیان ســوودیان پێنە گەیانــدن کــە جگــە لــە خــوا دەیانپەرســتن، لەبــەر ئەمەیە لێــرەدا فەرموویەتــی: ﴿ فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ قُرْبَانًا آلِهَةً ﴾ واتــە: (دەی بۆچــی یارمەتــی نــەدان ئەوانــەی جگــە لــە خــوا بۆ نزیــک بوونــەوە لــە خــوا کردبوویانە پەرســتراو) لێیــان نزیک دەبوونــەوەو دەیانپەرســتن بە ئومێــدی ســوود پێگەیاندنیان. ﴿ بَلْ ضَلُّوا عَنْهُمْ ﴾ (واتــە: بەڵکو لێیان گــوم بوون) وەلاَمیان نەدانەوە، بەرگریشــیان لێنە کردن. ﴿ وَذَٰلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴾ (واتــە: ئــەوە بوو بەرهەمی پەرســتراوە درۆ کەیانو ئــەوەی هەڵیــان دەبەســتن) لــە درۆ کردن، ئــەوەی کــە منەتیان پێدە کــرد، کە بــەو هۆیەوە پێیان وابوو ئەوان لەســەر حەقو ڕاســتین، وە بێگومان کردەوە کانیان ســوودی پێدە گەیاندن، گــوم بوون پــووچ بوونەوە.


وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا
حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ
٢٩ قَالُوا۟ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ
مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ
٣٠ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُوا۟ دَاعِىَ ٱللَّهِ وَءَامِنُوا۟ بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن
ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ٣١ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِىَ ٱللَّهِ
فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ أُو۟لَٰٓئِكَ
فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ٣٢ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضَ وَلَمْ يَعْىَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْۦِىَ ٱلْمَوْتَىٰ بَلَىٰٓ
إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ٣٣ وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ
أَلَيْسَ هَٰذَا بِٱلْحَقِّ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَرَبِّنَا قَالَ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا
كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ٣٤ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ
وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا
سَاعَةً مِّن نَّهَارٍۭ بَلَٰغٌ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ٣٥
سورة محمد

(٢٩-٣٢): ﴿ وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُوا۟ دَاعِىَ ٱللَّهِ وَءَامِنُوا۟ بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِىَ ٱللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾ ﴾:

﴿ وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ ﴾ خوا ﷻ پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺی نارد بۆ نێو خەڵکی، ئادەمیزادو جنۆکەیان، هەردەبوو هەمووان ئاگادار بکرێنەوە بە بانگەوازی پێغەمبەرایەتی.

ئادەمیزاد لە توانایدا بوو بانگەوازیان بکاتو بیانترسێنێت، بەڵام جنۆکە خوا بە توانای خۆی ناردنی بۆ لای ﴿ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ ﴾ (واتە: چەند جنۆکەیەک تا گوێ لە قورئان بگرن جا کاتێ ئامادەی گوێگرتن بوون وتیان بەیەکتری بێدەنگ بن) هەندێکیان ئامۆژگاری هەندێکی دیکەی دەکرد بە گوێگرتن.

﴿ فَلَمَّا قُضِىَ ﴾ (کاتێ قورئان خوێندنەکە تەواو بوو) جوان گوێیان بۆ گرتو کاریگەری دروست کرد تیایاندا ﴿ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴾ (واتە: گەڕانەوە بۆ لای گەلەکەیان بە ترسێنەر) وەکو ئامۆژگاری کردنێک بۆیان، وە پێویست بوونی بەڵگە لەسەریان، وە کردنی بە یارمەتیدەری پێغەمبەرەکەی ﷺ لە بڵاو کردنەوەی بانگەوازەکەیدا لە ناو جنۆکە.

﴿ قَالُوا۟ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ ﴾ (وتیان: ئەی هۆزو گەلەکەمان بە ڕاستی ئێمە گوێبیستی کتێبێک بووین لە دوای مووسا ؑ نێردراوەتە خوارەوە) چونکە

پەرتووکـی مووسـا ﷺ بنچینــەو بنەمایە بۆ ئینجیـل، وە کۆڵەکەی نەوەکانی ئیسـرائیل بووە لە بڕیاری شـەرعی، بێگومـان ئینجیل تەواوکـەرو بگۆڕی هەندێ لـە بڕیارەکانە.

﴿ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِيٓ ﴾ (واتـە: بەڕاسـتدانەری پەڕاوەکانی پێـش خۆیەتی ڕێنمایی دەکات) ئـەم کتێبـەی کە بیسـتوومانە ﴿ إِلَى ٱلْحَقِّ ﴾ بۆ لای ڕاسـتی لە هەمـوو داواکراوو هەواڵێکـدا ﴿ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ (بـۆ ڕێبـازی ڕاسـت) کـە دەیگەیەنێتـە لای خـواو بەهەشـتەکەی، لـە زانسـتو زانیاری دەربارەی خـواو بڕیـارە ئاینیەکانیو بڕیاری پاداشـتی. کاتـێ کـە وەسـفی قورئانیـان کـردو پلـەو پێگەیـان ڕوونکـردەوە، بانگیـان کـردن بـۆ بڕواهێنـان پێـی، جـا وتیـان: ﴿ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِيَ ٱللَّهِ ﴾ ئـەوە بانگـەواز نـاکات بۆ لای پەروەردگـاری نەبـێ، بانگتـان ناکات بۆ مەبەسـتێ لـە مەبەسـتەکانی، وە نە بـۆ لای هەواو ئـارەزوو، بەڵکـو بانگتـان دەکات بـۆ لای پەروەردگارتـان بـۆ ئـەوەی پاداشـتان بداتەوەو هەمـوو گوناهـو خراپەیەکتان لـێ دابڕنێ، لەبـەر ئەمەیە فەرموویەتـی: ﴿ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ (واتـە: خـوا لـە تاوانەکانتان خـۆش دەبێو دەیسـڕێتەوە، وە لـە سـزای سـەخت دەتانپارێـزێ) ئەگـەر بتانپارێـزێ لە سـزای بـە ئێش لـە دوای ئەوە چـی هەیـە جگە لەنـازو نیعمـەت، ئەمەش پاداشـتی ئەو کەسـەیە کـە وەڵامـی بانگخوازی خـوا دەداتەوە.

﴿ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِيَ ٱللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾ بێگومـان خـوا ﷻ بە دەسـەڵاتە بەسـەر هەمـوو شـتێکدا، هیچ هەڵهاتوویـە لە دەسـتی دەرناچێو هیچ شـتێکیش زاڵ نابێ بەسـەریدا ﴿ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾ چ گومراییـەک قوڵتـرە لـە گومـڕا بوونـی ئـەو کەسـەی پێغەمبـەران بانگـی بکـەنو ترسـێنەر بگاتە لای، بـە بەڵگەو نیشـانە یـەک لـە دوایەکـەکان، ئەو پشـتی تێبـکاو لـووت بەرزبـێ بەرانبەری؟!

(٣٣): ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧيَ ٱلْمَوْتَىٰۚ بَلَىٰٓۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ٣٣ ﴾

ئەمـە بەڵگەهێنانەوەیـە لەلایـەن خواوە لەسـەر دروسـتکردنەوە لـە دوای مردن، ئـەو زاتەی ئاسـمانەکانو زەوی بەدیهێنـاوە بە مەزنـیو فراوانیانو وردبینی لە بەدیهێنانیـان، بەبێ ئەوەی مانـدوو ببـێ بـەوەوە ﴿ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ ﴾ وە لە دروسـت کردنیانـدا ناتواناو دەسـتەپاچە نەبـووە، جـا چۆن دەستەوسـان دەبێ لـە دووبـارە دروسـتکردنتان دوای مردن، لـە کاتێکدا ئـەو زاتە بە دەسـەڵاتە بەسـەر هەموو شـتێکەوە؟!

(٣٤-٣٥): ﴿ وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ أَلَيْسَ هَٰذَا بِٱلْحَقِّ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَرَبِّنَا ۚ قَالَ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٤﴾ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ ۚ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍۭ ۚ بَلَٰغٌ ۚ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾:

﴿ وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی خراپـی دۆخـی بێبڕوایـان، كاتـێ لەسـەر دۆزەخ ڕادەگیرێـن، كـە لـە دونیـادا بەدرۆیـان دەزانـی، ئـەوان سەرزەنشـت دەكرێـن‌و پێیـان دەوتـرێ: ﴿ أَلَيْسَ هَٰذَا بِٱلْحَقِّ ﴾ (واتـە: ئایـا ئەمـە ڕاسـت نیـە) كـە بێگومـان ئامادەی بـوون‌و بەچـاوی خۆتـان بینیوتـان؟ ﴿ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَرَبِّنَا ﴾ دان بـە گوناهەكانیانـدا دەنێـن‌و درۆكانیـان ئاشـكرا دەبێـت، ﴿ قَالَ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾ واتـە: سـزایەكی پەیوەسـت‌و بـەردەوام، وەک چـۆن بێبڕوایتـان سـیفەتێكی پەیوەسـت بـوو پێتانەوە.

پاشـان خـوا ﷻ فەرمانی بـە پێغەمبەرەكـەی كـردوە خۆڕاگر بێ لەسـەر سـزای بێبڕوایان‌و عینـادو كەللەڕەقـەكان، وە بـەردەوام بانگیان بكات بـۆ لای خوا، وە پەیـڕەوەی ئارامگرتنی پێغەمبەرانـی خۆڕاگـرو خـاوەن عەزم بـكات، پێشـەوایانی خەڵكـی، ئەوانەی خـاوەن ورەو هیممەتـی بـەرز بـوون، ئەوانـەی خۆڕاگریـان مەزن بـوو دڵنیاییشـیان تـەواو بـوو، ئەوانە لـە پێشـترینی خەڵكین بـە پەیڕەوكردنیـان‌و شـوێن پێهەڵگرتنیـان، وە ڕێنمایـی وەرگرتن لێیانەوە.

پێغەمبـەر ﷺ فەرمانـی پەروەردگـاری بەجێهێنـا، ئارامیگـرت بـە ئەوپـەڕی ئارامگرتن، كە هیـچ پێغەمبەرێـک پێش ئـەو وەكو ئـەو ئارامیان نەگرتبـوو، تا دوژمنان لەیـەک كەوانەوە تیـر بارانیـان دەكرد، هەموویان پێكەوە هەسـتان بـە بەرهەڵسـتیكردنی بانگەوازەكەی بۆلای خـوا ﷻ، وە ئـەوەی لەتوانایانـدا بوو لـە دژایەتـی كەمتەرخەمیان نەكرد، بـەڵام پێغەمبەر ﷺ بـەردەوام فەرمانـی خـوای دەدا بە گوێیانـدا، خۆڕاگر بوو لـە جیهاد كردنـی دوژمنانی خواو ئـەو نارەحەتیانـەی كە تووشـی بـوو، تا خـوا ﷻ جێگیریكرد لەسـەر زەویـدا، وە ئاینەكەی ئاشـكرا كرد بەسـەر سـەرجەم ئاینەكانەوە، وە ئوممەتەكەیشـی لەسـەر هەموو ئوممەتەكان، درودو سـەلامی لەسەر بێ.

وە كـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ ﴾ واتـە: ئـەو بەدرۆدانەرانەی كـە پەلەی سـزادان دەكـەن، بێگومـان ئەمـە لـە نەفامـی‌و گێلیانەوەیـە، بـا بە هۆی بـە كـەم زانینیان‌و

پەلەکردنیان لە هاتنی سزا بۆیان داوا لە خوا نەکەی سزایان بدات، چونکە هەرشتێ کە بڕیاربێ ڕووبدات ئەوە نزیکە، ﴿ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوٓاْ ﴾ لە دونیادا، ﴿ إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ ﴾ بە خەمبارت نەکات چێژ وەرگرتنێکی کەمیان لەم ژیانەدا، دڵنیابە ئەوان دەگەن بە سزایەکی سەخت، ﴿ بَلَٰغٌ ﴾ واتە: ئەم دونیایە لەزەتو خۆشیو چێژ وەرگرتنی کاتیەو نامێنێ.

یان ئەم قورئانە مەزنە کە ڕوونمان کردەوە بۆتان بە ڕوونکردنەوەیەکی تەواو ئاگاداریە بۆتان، وە زەخیرەیەکە بۆ ماڵی دوارۆژ، چاکترین زەخیرەو توێشوو ئەوەیە بیگەیەنێ بە ماڵی پڕ لە نازونیعمەت، وە بیپارێزێ لە سزای بە ئێش، ئەوە چاکترین توێشووە بەدیهێنراوەکان بە دەستی بهێنن، وە گەورەترین نیعمەتە خوا پێی بەخشیبێتن، ﴿ فَهَلْ يُهْلَكُ ﴾ بە سزاکان ﴿ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾ ئەوانەی هیچ خێرێکیان تێدانیە، بێگومان دەرچوون لە گوێڕایەڵی پەروەردگاریان، وە حەقو ڕاستیان وەرنەگرت کە پێغەمبەران بۆیانیان هێنابوو، وە خوا بیانووی بڕینو ئاگاداری کردنەوە، بەردەوام بوون لەسەر بەدرۆدانانو بێبڕواییان، داوای پارێزگاری لە خوا دەکەین.

تەفسیری سووڕەتی (الأحقاف) تەواو بوو.


بسم الله الرحمن الرحيم
الذين كفروا وصدوا عن سبيل الله أضل أعمالهم ﴿١﴾ والذين
ءامنوا وعملوا الصالحات وءامنوا بما نزل على محمد وهو الحق من
ربهم كفر عنهم سيئاتهم وأصلح بالهم ﴿٢﴾ ذلك بأن الذين كفروا
اتبعوا الباطل وأن الذين ءامنوا اتبعوا الحق من ربهم كذلك يضرب
الله للناس أمثالهم ﴿٣﴾ فإذا لقيتم الذين كفروا فضرب الرقاب حتى
إذا أثخنتموهم فشدوا الوثاق فإما منا بعد وإما فداء حتى تضع الحرب
أوزارها ذلك ولو يشاء الله لانتصر منهم ولكن ليبلوا بعضكم
ببعض والذين قتلوا في سبيل الله فلن يضل أعمالهم ﴿٤﴾ سيهديهم
ويصلح بالهم ﴿٥﴾ ويدخلهم الجنة عرفها لهم ﴿٦﴾ يا أيها الذين
ءامنوا إن تنصروا الله ينصركم ويثبت أقدامكم ﴿٧﴾ والذين كفروا
فتعسا لهم وأضل أعمالهم ﴿٨﴾ ذلك بأنهم كرهوا ما أنزل الله
فأحبط أعمالهم ﴿٩﴾ أفلم يسيروا في الأرض فينظروا كيف كان
عاقبة الذين من قبلهم دمر الله عليهم وللكافرين أمثالها ﴿١٠﴾ ذلك
بأن الله مولى الذين ءامنوا وأن الكافرين لا مولى لهم ﴿١١﴾

## تەفسیری سوورەتی (محمد)
## مەککیە (٣٨) ئایەتە
## بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَءَامَنُواْ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ ﴿٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱتَّبَعُواْ ٱلْبَٰطِلَ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّبَعُواْ ٱلْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَٰلَهُمْ ﴿٣﴾ ﴾:

ئەم دەقانە گشتگیرن لەسەر باسکردنی پاداشتی بڕواداران و سزای سەرپێچیکاران، هۆکاری ئەو باسکردنەش بانگەواز کردنی خەڵکی بۆ بایەخدان بەو پاداشت و سزایە، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ ئەوانیش دەسەڵاتدارانی بێبڕوایانن، وە پێشەوایانی گومڕا، ئەوانەی کۆیان کردۆتەوە لە نێوان بێبڕوابوون بە خواو ئایەتەکانی، وە ڕێگریکردن لە نەفسی خۆیان و غەیری خۆیان لە ڕێبازی خوا، کە ئەویش بڕواهێنانە بەوەی پێغەمبەران بانگەشەیان بۆ کردووە و شوێنکەوتنێتی.

جا ئەوان ﴿ أَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾ واتە: خوا کردەوەکانیان پووچ دەکاتەوە بە هۆی ڕێگریکردنیان لە ڕێبازی خوا، ئەمیش ئەو کردەوانەیان دەگرێتەوە کە کردوویانە بۆ ئەوەی حەق و شوێنکەوتووانی پێ فریو بدەن، خوا ﷻ فرت و فێڵەکانی بەسەر خۆیاندا هێنایەوە، ئەوەی ئامانجیان بوو بە دەستیان نەهێنا، وە ئەو کردەوانەیشیان کە ئومێدیان هەبوو پاداشت بدرێنەوە لەسەری، خوا ﷻ پووچی کردەوە، بە هۆی ئەوەی شوێنی ناڕەوا کەوتبوون، ئەویش بریتییە لە هەموو ئامانجێ مەبەست پێی ڕەزامەندی خوا ﷻ نەبێ لە بەندایەتی کردنی بتەکان، وە ئەو کردەوانەی بۆ سەرخستنی بەتاڵ و ناڕەوایە، چونکە بەتاڵ و پووچن هەموو کردەوەکانیش لەو پێناوەدا پووچ دەبنەوە.

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ بـەوەی خـوا دایبەزانـدووە بەسـەر پێغەمبەرانی بە گشـتی، وە بۆ سـەر موحەممـەد ﷺ بـە تایبەتـی ﴿ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ بەوەی مافەکانـی خوایـان بەجێهێناوە، وە مافـی بەنـدەکان ئـەوەی کـە پێویسـتو ڕەوایـە، ﴿ كَفَّرَ ﴾ خـوا ﴿ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ ﴾ (لـە گوناهەکانیـان خـۆش دەبـێ) بچوکـو گەورەیـان، جا ئەگەر لـە گوناهەکانیـان خۆش بوو ئـەوە ڕزگاریـان دەبـێ لـە سـزای دونیـاو دواڕۆژ ﴿ وَأَصۡلَحَ بَالَهُمۡ ﴾ واتـە: ئایـنو دونیـاو دڵو کردەوەیانـی چـاک کـرد، وە کردەوەکانیانیشـی چـاک کرد بـە زیاد کـردنو پاڵفتە کردنـی، وە سـەرجەم بارودۆخەکانیانـی چـاک کـرد، هـۆکاری ئـەوەش بێگومـان ئەوان: ﴿ ٱتَّبَعُواْ ٱلۡحَقَّ ﴾ کـە بریتیە لە ڕاسـتیو دڵنیایی، وە ئەوەیشـی ئـەم قورئانـە دەیگرێتەوە کە دەرچـووە، ﴿ مِن رَّبِّهِمۡ ﴾ (لەلایـەن پەروەردگاریانـەوە) ئەو زاتەی پـەروەردەی کردوون بە نیعمەتەکانـیو بـە بەزەیی خۆی کاروبـاری ڕێکخسـتوون، پەروەردەی کـردوون بە حەقو ڕەوا، ئنجـا شـوێنی کەوتـوون، بۆیـە کاروبارەکانیان چـاک بووە.

جـا کاتـێ ئامانـجو مەبەسـتیان بەسـتراوەتەوە بەو ڕاسـتیەی کـە دراوەتە پاڵ خـوای مەزن ئـەوە هۆکارەکـەش چاکـەو دەمێنێتەوە، بە هەمـان شـێوە پاداشـتەکەش دەمێنێتەوە.

﴿ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمۡثَٰلَهُمۡ ﴾(واتـە: ئـا بەو شـێوە خـوا نموونەی کـردەوەی خۆیانیان بـۆ دێنێتـەوە) کاتـێ خوا بـۆی ڕوون کردنـەوە خەڵکانی چـاکو خەڵکانی خـراپ، وە بۆ هەموویان سـیفەتێکی باسکرد پێی دەناسـرێنەوەو جیادەکرێنەوە، ﴿ لِّيَهۡلِكَ مَنۡ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٖ وَيَحۡيَىٰ مَنۡ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٍ ﴿٤٢﴾ ﴾الأنفـال، (واتـە: بـۆ ئـەوەی لەناوبچێ ئەو کەسـەی بـەلای خـواوە لەناوچووە لـە ڕووی بەڵگەوە وە بۆ ئـەوەی بژی ئەوەی بـەلای خواوە دەژی لەسـەر بەڵگەوە).

(٤-٦): ﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرۡبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثۡخَنتُمُوهُمۡ فَشُدُّواْ ٱلۡوَثَاقَ فَإِمَّا مَنَّۢا بَعۡدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلۡحَرۡبُ أَوۡزَارَهَاۚ ذَٰلِكَ وَلَوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنۡهُمۡ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَاْ بَعۡضَكُم بِبَعۡضٖۗ وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٤﴾ سَيَهۡدِيهِمۡ وَيُصۡلِحُ بَالَهُمۡ ﴿٥﴾ وَيُدۡخِلُهُمُ ٱلۡجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمۡ ﴿٦﴾ ﴾:

خـوا ﷻ ڕێنمایـی بەندەکانـی دەکات بۆ لای ئـەوەی بەرژەوەنـدی ئەوانی تێدایەو سـەریان دەخـات بەسـەر دوژمنەکانیـان، دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ (واتـە: ئنجـا ئەگەر گەشـتن بەوانـەی بێبـڕوان) لـە جەنگـو کوشـتاردا بەڕاسـتی شـەڕیان لەگەڵ بکـەن، بدەن لـە گەردنیان تـا ڕێژەیەکی زۆریـان لێدەکوژنو ورەیـان دەڕوخێننو سەرشـۆڕیان دەکەن، جـا ئەگـەر ئەوەتان کـرد وە بینیتـان بـە دیلگرتن چاکتـرو لە پێشـترە ﴿ فَشُدُّواْ ٱلۡوَثَاقَ ﴾

واتــە: بــە توونديى بيانبەســنەوە بۆ ئــەوەی ڕانەکەن، جــا ئەگەر بــە توونديى بەســرانەوە ئەوە بــڕواداران دڵنيــا دەبن لــە هەڵهاتنيــانو لە شــەڕو زيانيان.
ئەگــەر ئــەوان بــە ديلــی مانــەوە لــە لاتان ئــەوە ئێــوە سەرپشــکن لە نێــوان منــەتو چاکە بەســەرياندا بەرەڵاکردنيــان بەبــێ وەرگرتنــی مــاڵو فديە، يــان ئەوەيە فديەيــان لێوەربگرن بــەوەی کــە ئازاديــان نەکەن تا (قەرەبــوو دەدەن) خۆيــان دەکڕنەوە، يــان خەڵکانێکی تر بە پــارە بيانکڕنــەوە، يان بەرانبــەر بەديلێکی مســوڵمان لــەلای ئەوان.
ئــەم کارە بەردەوامــە تا ﴿ حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلۡحَرۡبُ أَوۡزَارَهَا ﴾ تا جەنگ کۆتايی دێو دەکەونە ئاشــتیو ئاگربەســتەوە، بێگومان بۆ هەموو شــوێنێ قســەی خــۆی هەيە، وە بۆ هــەر کاتێکيش بڕياری خــۆی هەيە، جا حاڵی پێشــوو بۆ کاتی شــەڕو کوشــتارە.
جــا ئەگــەر لــە هەندێ کاتەکان شــەڕ نەبــوو تيايــدا لەبەر هۆيەک لــە هــۆکارەکان ئەوە نە کوشــتن هەيــە نە بەديــل گرتــن، ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ بڕياری پێشــوو لــە تاقيکردنەوەی بــڕوادارانو بێبڕوايانــدا، وە گۆڕينــی ڕۆژگــار لــە نێوانيانــداو سەرخســتنی هەندێکيان بەســەر هەندێکی ديکــە ﴿ وَلَوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنۡهُمۡ ﴾ (واتــە: فەرمانــی خــوا ئەوەيــە ئەگەر بيويســتايە خۆی تۆڵەی لێدەســەندن) بێگومان خوا بە دەســەڵاتە بەســەر هەموو شــتێکدا، وە بە توانايە لەســەر ئــەوەی کــە هەرگيــز لــە يــەک جێگــەدا بێبڕوايــان ســەرنەخات، تا ســەوزايی مســوڵمانان بــەردەوام بێــت ﴿ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَاْ بَعۡضَكُم بِبَعۡضٍ ﴾ (واتــە: بــەڵام تــا بــە يەکتــری تاقيتــان بکاتــەوە) بــۆ ئــەوەی جيهاد بــەردەوام بێ، وە لــەو ڕێگەيــەوە دۆخی بەنــدەکان دەربکەوێ ڕاســتگۆ لــە درۆزن، وە بــۆ ئەوەی بــڕوا بێنێ ئەو کەســەی کە بــڕوا دێنێ، بــە بڕواهێنانێکی ڕاســتەقينە لەســەر بينايــیو بەرچــاو ڕوونــی، نــەک بڕواهێنانــێ بوونيــات نرابــێ لەســەر شــوێنکەوتنی زۆرينــە، بێگومــان ئــەوە ئيمانێکــی زۆر لاوازە، لــە کاتــی بــەڵاو ناڕەحەتيدا بــەردەوام نابــێ لەگــەڵ خاوەنەکەيدا.
﴿ وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ ئەوانــە پاداشــتێکی بێپايــانو پاداشــتێکی جوانيــان بــۆ هەيــە، ئەوانيــش ئەوانــەن کوشــتاری ئەوانەيــان کــردوە کــە فەرمــان کــراوە بــە کوشــتنيان، بــۆ ئــەوەی وشــەی خوا بــەرزو بڵند بێت، ئــا ئەوانــە هەرگيز کردەوەکانيــان پووچــەڵ نابێتەوە، بەڵکــو لێيــان وەردەگــرێو گەشــەی پێدەکات بۆيــان، وە دەردەکــەوێ لــە کردەوەکانياندا ئەنجامەکــەی لە دونيــاو دوارۆژ.
﴿ سَيَهۡدِيهِمۡ ﴾ (ڕێنمايــان دەکات) بــۆ گرتنەبەری ئەو ڕێگايەی دەيانگەيەنێ بە بەهەشــت

﴿ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴾ واتـە: بـارودۆخو کاروباریـان، وە پاداشـتیان چاک دەکات بـە تەواوەتی، نـە دەفەوتـێو نە لـە ناودەچێ بـە جۆرێ لە جـۆرەکان.

﴿ وَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ ﴾ واتـە: سـەرەتا بەهەشـتیان پـێ دەناسـێنێ، پاشـان هانیـان دەداتو وەسـفی دەکا بۆیان، وە باسـی ئـەو کردەوانەش دەکات بۆیان کـە دەیانگەیەنێ بەو بەهەشـتە، لـە کۆی ئـەو کردەوانە کوشـتنە لـە پێنـاو خـوا، وە سـەرکەوتوویان دەکات لە بەجێهێنانـی ئـەوەی فەرمانـی پێکردوونو هانـی بۆ داون، پاشـان ئەگەر چوونە بەهەشـتەوە شـوێنەکانی خۆیـان دەناسـنەوە، وە ئەوەیشـی لەخـۆی گرتووە لـە نازونیعمەتی بـەردەوامو ژیانێکـی پڕ لە ئاشـتی.

(٧-٩): ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ﴿٧﴾ وَالَّذِينَ كَفَرُوا فَتَعْسًا لَّهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ ﴿٨﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ ﴿٩﴾ ﴾.

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ﴿٧﴾ وَالَّذِينَ كَفَرُوا فَتَعْسًا لَّهُمْ ﴾ ئەمـە فەرمانێکـە لەلایـەن خـوا ﷻ بـۆ بـڕواداران کە خوا سـەربخەن، بـە بەجێهێنانـی ئاینەکەیو بانگـەواز کـردن بـۆ لایو جیهـادو تێکۆشـانی دوژمنانـی، وە مەبەسـت لـەوەدا تەنهـا لـە پێنـاو خـوادا بـێ، بێگومـان ئەگەر ئـەوان ئەوەیـان کرد، خـوا سـەریان دەخـاو پێیەکانیان جێگیـر دەکات، واتـە: دڵەکانیان دەبەسـتێتەوە بـە ئارامگرتـنو دڵنیاییو جێگیـر بوون، وە جەسـتەیانیش لەسـەر ئەوە جێگیـر دەکاتو پشـتیوانیان دەکات لەسـەر دوژمنەکانیان، ئەمە پەیمانێکـە لەلایـەن خـوای بەخشـندەی خـاوەن پەیمـان، کە هەر کەسـێک سـەریبخات بە قسـەو کـردار، بێگومـان پەروەردگـاری ئـەو سـەردەخاتو هۆکارەکانی سـەرکەوتنی بۆ ئاسـان دەکات لـە جێگیـر بوونو جگـە لەوانیش. بـەڵام بێبڕوا بـوون بـە پەروەردگاریانو بەتـاڵو پووچیـان سەرخسـت، ئـەوە بێگومـان ئـەوان نەگبەتـیو سەرشـۆڕی بەشـیانە لـە کاروبارەکانیان.

﴿ وَأَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ ﴾ واتـە: کردەوەکانیـان پـووچ دەکاتـەوە کـە فروفێڵیـان پـێ کـردوە بەرانبـەر بـە حـەق، فێڵەکانیـان دەگەڕێنێتـەوە بۆسـەر خۆیـان، وە کردەوەکانیـان پـووچ دەکاتـەوە کـە پێیـان وابـوو ئـەوان مەبەسـتیان پێـی ڕەزامەنـدی خوایە.

ئـەو گومـڕا بـوونو نەگبەتیو سەرشـۆڕییە بۆ ئەوانەیـە بێبڕوا بـوون، بە هۆی ئـەوەوە بوو کـە ئـەوان: ﴿ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ ﴾ (ڕقیـان) لـەو قورئانـە بـوو کە خـوا دایبەزاندبـوو، بۆ بەختـەوەریو سـەرکەوتنی بەندەکان، ئـەوان بە دەمیـەوە نەهاتانو وەریان نەگـرت، بەڵکو

ڕقیـان لێی بـوو پێیـان ناخۆش بـوو، ﴿ فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴾ (بۆیـە خـوا ﷻ کردەوەکانیانی پووچ کـردەوە).

(١٠-١١): ﴿ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۖ وَلِلۡكَٰفِرِينَ أَمۡثَٰلُهَا ١٠ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَأَنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ لَا مَوۡلَىٰ لَهُمۡ ١١ ﴾:

﴿ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ واتـە: ئایـا ئـەو بێبـڕواو بەدرۆدانەرانـەی پێغەمبـەر ﷺ بەسـەر زەویـدا نەگـەڕاون ﴿ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾ (واتە: تا ببینـن ئەوانەی پێش خۆیـان سـەرەنجامیان چـۆن بـووە؟) بێگومـان ئـەوان دەرەنجامی خۆیـان نابینـن، جگە لە خراپتریـن دەرەنجـام، ئـەوان لاناکەنـەوە بـە لای ڕاسـت یـان بـە لای چەپـدا، بێگومان لە دەوروبەریـان کەسـانی لـە ناوچـوو دەبینن، بـە هـۆی بەدرۆدانـانو بێبڕواییانـەوە، خوا ﷻ ڕیشەکێشـی کـردوونو جوڵەیـان نەمـاو مـردن، مـاڵو وڵاتیانی لەنـاو بـردو کاولی کرد، تەنانـەت کـردەوەو فـڕو فێڵەکانیشـیان. وە لـە هەمـوو سـەردەمو شـوێنێکدا وێنـەی ئـەو دەرەنجامـە خـراپو سەرزەنشـتکراوانە بۆ بێبڕوایـان هەیە. بـەڵام بڕواداران خـوا ڕزگاریان دەکات لـە سـزا، وە پاداشـتی بـێ پایانیـان دەداتەوە.

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ (واتـە: چونکـە بێگومـان خوا پشـتیوانی ئەوانەیە بڕوایان هێنـاوە) پشـتیوانیان لێـدەکات بـە میهرەبانـی خـۆی، جـا دەریـان دێنـی لـە تاریکـی بـۆ ڕووناکـی، وە پشـتیوانی لـە پاداشـتو سەرخسـتنیان دەکات ﴿ وَأَنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ (بێگومان بێبڕوایانیـش) بـە خـوای بـەرز، بـە هۆی ئـەوەی پشـتیوانی خوایان لـێ پچـڕاوەو دەرگای میهرەبانـی خوایـان بەسـەر خۆیانـدا داخسـتووە، ﴿ لَا مَوۡلَىٰ لَهُمۡ ﴾ (هیچ پشـتیوانێکیان نیە) ڕێنماییـان بـکات بـۆ ڕێگاکانـی ئارامـیو ئاشـتی، وە ڕزگاریـان بـکات لـە سـزای خواو تۆڵەکانـی، بەڵکـو شـەیتان دۆسـتیانە دەریـان دێنـێ لـە ڕووناکی بیرو بـڕوا بـۆ تاریکایی، ئەوانـە هاوڕێـی دۆزەخـن تیایدا دەمێننـەوە بـۆ هەتاهەتایی.

إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأۡكُلُونَ كَمَا تَأۡكُلُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثۡوٗى لَّهُمۡ ﴿١٢﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةٗ مِّن قَرۡيَتِكَ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَتۡكَ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡ فَلَا نَاصِرَ لَهُمۡ ﴿١٣﴾ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُم ﴿١٤﴾ مَّثَلُ ٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلۡمُتَّقُونَۖ فِيهَآ أَنۡهَٰرٞ مِّن مَّآءٍ غَيۡرِ ءَاسِنٖ وَأَنۡهَٰرٞ مِّن لَّبَنٖ لَّمۡ يَتَغَيَّرۡ طَعۡمُهُۥ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ خَمۡرٖ لَّذَّةٖ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ عَسَلٖ مُّصَفّٗىۖ وَلَهُمۡ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡۖ كَمَنۡ هُوَ خَٰلِدٞ فِي ٱلنَّارِ وَسُقُواْ مَآءً حَمِيمٗا فَقَطَّعَ أَمۡعَآءَهُمۡ ﴿١٥﴾ وَمِنۡهُم مَّن يَسۡتَمِعُ إِلَيۡكَ حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُواْ مِنۡ عِندِكَ قَالُواْ لِلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ ﴿١٧﴾ فَهَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأۡتِيَهُم بَغۡتَةٗۖ فَقَدۡ جَآءَ أَشۡرَاطُهَاۚ فَأَنَّىٰ لَهُمۡ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ ذِكۡرَىٰهُمۡ ﴿١٨﴾ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ ﴿١٩﴾

(١٢): ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأۡكُلُونَ كَمَا تَأۡكُلُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثۡوٗى لَّهُمۡ ﴿١٢﴾ ﴾:

کاتـێ خوا ﷻ باسـی کرد کـە بێگومان ئەو پشـتیوانی بڕوادارانـە، وە باسـی ئەوەی کرد کە چیـان پێدەبەخشـێ لە ژیانـی دواڕۆژدا لـە چوونـە نـاو بەهەشـتەکان، کـە ڕووبار بـە ژێریانـدا دەڕوات، ئـاوی ئـەو باخچـە گوڵزارانـەو باخاتـە گەشـاوانە دەدات، کـە بەرهەمهێنـن بۆ هەمـوو جووتێکـی جوانو میوەیەکـی بە لـەزەت.

وە کاتێ باسی ئەوەی کرد کە بێبڕوایان پشتیوانیان نیە، باسی ئەوەی کردوە ئەوان دەدرێنە دەستی هەواو ئارەزوویانەوە، وەسف نەکراون نە بە سیفەتی پیاوەتیو جوامێری، نە بە سیفەتی مرۆڤایەتی، بەڵکو بە چەندین پلە دابەزیون، وەک ئەو ئاژەڵانەیان لێهاتووە کە نەعەقڵیان هەیەو نە فەزڵ، بەڵکو هەموو خەمێکیان لەزەت وەرگرتنە بە لەزەتەکانی دونیاو ئارەزووەکانی، دەبینی کۆششی جوڵە ئاشکراو نهێنیەکانیان لە دەوری هەواو ئارەزووەکاندا دەجوڵێتەوە، تێناپەڕێ بۆ شتێک کە خێرو خۆشبەختی تێدابێت، ئا لەبەر ئەمەیە دۆزەخ شوێنو جێگای ئەوانەیەو ئامادە کراوە بۆیانو هەرگیز لێی دەرناچنو سزایان لەسەر لانابرێ.

(١٣): ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةٗ مِّن قَرۡيَتِكَ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَتۡكَ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡ فَلَا نَاصِرَ لَهُمۡ ﴿١٣﴾ ﴾:

﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةٗ مِّن قَرۡيَتِكَ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَتۡكَ ﴾ وە خەڵکـی زۆر شـار هەبـوو لـە شـاری بێبڕوایـانو بەدرۆدانـەران کـە بەهێزتـر بـوون لـە خەڵکی شـارەکەی تۆ، لـە ماڵو منداڵو پشـتیوانو یارمەتیدەرو باڵەخانەو کەرەسـتەکان، ﴿ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡ ﴾ کاتـێ پێغەمبەرانی ئێمەیـان بـەدرۆ زانـی لەناومـان بـردن، ئامۆژگاری هیـچ سـوودێکی نەبوو بۆیـان، وە هیچ پشـتیوانو یارمەتیدەرمـان نەبینـی پشـتیوانیان لێبـکات، وە هێـزو توانای خۆیشـیان بێنیازی نەکـردن لە سـزای خوا.

جـا ئیتـر حاڵـی ئـەو لاوازانـەی شـارەکەی تـۆ کـە (مەککەیـە) دەبـێ چـۆن بـێ، کاتێ دەریـان کـردی لـە شـارەکەی خـۆتو بەدرۆیـان دانایـتو دوژمنایەتیـان کـردی، وە تۆ چاکترینـی پێغەمبـەرانو باشـترینی یەکەمیـنو دواینیـت؟! ئایا شایسـتەتر نین بـە جگە لە خۆیـان بە لەناوبردنو سـزادان، ئەگەر خـوا ﷻ پێغەمبەرەکـەی بەمیهرەبانیو لە سـەرخۆیی نەناردایە بـۆ هەمـوو بێبڕوایەکـی نکوڵیکار؟

(١٤): ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهْوَآءَهُم ﴿١٤﴾ ﴾:

واتـە: یەکسـان نیە ئەو کەسـەی لەسـەر بەرچـاوو ڕوونیە لـە کاروبـاری ئاینیدا لـە ڕووی زانسـتو کردەوەوە، وە حەقی ناسـیوەو شـوێنی کەوتـووە، ئومێدی هەیە بـەوەی خوا بەڵێنی داوە بـۆ خاوەنانـی حـەق، وەک ئەو کەسـەی دڵی مـردوو بێـت، حەقـی ڕەت کردبێتەوەو وێـڵ بـوو بێ، وە شـوێنی هەواو هەوەسـی کەوتبـێ جگە لە خـوا، لەگەڵ ئەوەشـدا وا بزانێ ئـەوەی ئـەو لەسـەریەتی حـەقو ڕاسـتە، ئـای چەنـدە جیـاوازە نێوانی ئـەو دوو دەسـتەیە، شـوێنکەوتووانی حەقو شـوێنکەوتووانی گومرایی.

(١٥): ﴿ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ۖ وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ۖ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ وَسُقُواْ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴿١٥﴾ ﴾:

﴿ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾ واتـە: شـێوەی نایابـی ئەو بەهەشـتەی کە خـوا ﷻ ئامادەی کـردوە بـۆ بەندەکانـی، ئەوانـەی لێـی دەترسـن شـوێنی ڕەزامەندی ئـەو کەوتـوون، واتە: وەسـفو سـیفەتە جوانەکانـی بەهەشـت، ﴿ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ ﴾ واتـە: (چەندەهـا ڕووبـاری تێدایـە کـە ئاوی سـازگاری تامو) بـۆن نەگۆڕاو، نە قورسـە نە بۆنی ناخۆشـە، نە تامـی گۆڕاوە، بەڵکـو لە خۆشـترینو پاڵفتەترینی ئاوەکانەو خۆشـترینو بـۆنو بەلەزەترین تامـی هەیە.

﴿ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ ﴾ (واتـە: وە چەندەهـا ڕووبـار لەشـیر کە تامـی نەگۆڕارە) نەبـە تورشـی نە بە جگە لـەوەش ﴿ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴾ (واتـە: وە چەندەها ڕووبار لـە شـەرابی نایـاب) خاوەنەکـەی لەزەتـی لێدەبینێ بـە لەزەتێکی مـەزن، نە وەکو شـەرابی دنیا کە تامی ناخۆشـەو سەردەئێشـێنێو عەقـڵ تێکـدەدات ﴿ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ﴾ (واتە: وە چەندەهـا ڕووبـاری تێدایـە لـە هەنگوینـێ) کـە پاڵفتەکـراوە لە شـانەکەیو سـەرجەم پیسیەکانی.

﴿ وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾ (واتــە: وە لــەوێ هەمــوو جــۆرە میوەهاتێکیــان بــۆ ئامادەیــە) لــە خورمــاو تــرێو ســێوو هەنــارو برتەقــاڵو هەنجیــرو جگــە لەوانیش کــە لــەم دونیایەدا وێنەیــان نیــە، جــا ئــەوەی خۆشویســتراو داواکــراوە بۆ ئــەوان دەســتەبەر کراوە.

پاشــان خوا ﷻ فەرمــووی: ﴿ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ﴾ بە هۆی میهرەبانی خواوە ترســیان لەســەر نامێنــێ، ئایــا ئــەو بەهەشــتیانە چاکتــرن یان کەســێ لەناو ئاگــردا بــە هەمیشــەیی بمێنێتەوە ســزای ســەختی بۆ دووهێندە ببێتەوە ﴿ وَسُقُوا۟ ﴾ لەناو ئاگــردا (دەرخواردیان دەدرێ) ﴿ مَآءً حَمِيمًا ﴾ واتــە: ئاوێکــی کوڵاوی زۆر گــەرم ﴿ فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴾ (واتە: کــە ڕیخۆڵەکانیان پارچــە پارچــە دەکات)، پاکــی بۆ ئــەو خوایەی جیــاوازی کردوە لــە نێوان ئــەو دووماڵەو ئەوانەیشــی کاری بۆ دەکەن.

(١٦-١٧): ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُوا۟ مِنْ عِندِكَ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ ﴾:

خــوا ﷻ دەفەرمــوێ هەنــدێ لــە دووڕووەکان ﴿ مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ ﴾ گــوێ بــۆ قســەکانت دەگــرن نە بــۆ وەرگرتنو ملکــەچ بوون، بەڵکــو بۆ پشــتتێکردن لەبەر ئەمەیــە فەرموویەتی: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُوا۟ مِنْ عِندِكَ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ﴾ (واتــە: بــەڵام کاتــێ لای تــۆ دەردەچن دەڵێــن بەوانــەی زانیاریــان پێدراوە لە هــاوەڵان) وەک تێگەیشــتنێ لەوەی کە تــۆ وتووتەو ئــەوان بیســتوویانە، لــەوەی حــەزوو ئارەزوویــان بــۆ لای ناجوڵــێ: ﴿ مَاذَا قَالَ ءَانِفًا ﴾ واتە: (ئــەوە موحەممــەد ﷺ وتــی چی) بــەم نزیکانە.

ئەمــە ئەوپــەڕی سەرزەنشــت کردنیانــە، بێگومان ئــەوان ئەگەر ســوور بوونایە لەســەر خێرو چاکــە، ئــەوە گوێیان بۆ ڕادەخســتو دڵیان بــۆ دەکردەوەو بــە ئەندامانی جەســتەیان ملکەچ دەبــوون پێــی، بەڵام ئــەوان بــە پێچەوانــەی ئەمە جوڵانــەوە، ئا لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتی: ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ﴾ واتــە: (ئەوانە ئەو کەســانەن کە خوا) مۆریداوە بەســەر دڵەکانیانــدا، وە دەرگاکانــی خێــری لێ داخســتوون کە پێــی دەگات، بە هۆی شــوێنکەوتنی ئارەزووەکانیــان، کــە شــوێنی هیچ ناکــەون جگە لە پــووچ نەبێت.

پاشــان حاڵــی هیدایەتدراوانــی ڕوونکردۆتــەوەو فەرموویەتــی: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ ﴾ بــە بڕواهێنــانو ملکەچبــوون، وە شــوێنکەوتنی ئــەوەی خــوا پێــی ڕازیــە، ﴿ زَادَهُمْ هُدًى ﴾ سوپاســگوزاریەک لەلایــەن خــوا ﷻ بــۆ ئــەوان لەســەر ئــەوە ﴿ وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴾ واتە:

سـەرکەوتوویان دەکات بـۆ خێـرو دەیانپارێزێـت لە شـەڕو خراپە، جا باسـی دوو پاداشـتی کـردوە بـۆ هیدایەتـدراوان: زانسـتی بـە سـودو کـردەوەی چاک.
(١٨): ﴿ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا السَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً فَقَدْ جَاءَ أَشْرَاطُهَا فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَاءَتْهُمْ ذِكْرَاهُمْ ﴿١٨﴾ ﴾
﴿ فَهَلْ يَنظُرُونَ ﴾ ئایـا تەماشـا ناکەن ئـەو بەدرۆدانەرانە یـان چاوەڕوانـی چیدەکەن ﴿ إِلَّا السَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً ﴾ واتـە: (جگـە لـە قیامـەت کـە) کتووپـڕ یەخەیـان بگـرێ، لـە کاتێکـدا ئەوان هەسـتی پێنەکـەن، ﴿ فَقَدْ جَاءَ أَشْرَاطُهَا ﴾ واتە: نیشـانەکانی هاتۆتە دی کە بەڵگەن لەسـەر نزیـک بوونەوەی.
﴿ فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَاءَتْهُمْ ذِكْرَاهُمْ ﴾ واتـە: ئـەوان لـە کوێـن ئەگـەر ڕۆژی دوایـی هـات، وە ئەجـەلو ماوەیـان پچـڕا کـە بیـر بکەنـەوەو داوای لێخۆشـبوون بکـەن، بێگومـان ئـەوە ڕۆیشـت، کاتـی بیرکردنـەوە نەماو ترسـێنەریان بۆ هات. لەم دەقـەدا هاندانی تێدایە لەسـەر خۆئامادەکـردن پێـش مردنـی کتوپـڕ، چونکـە مردنی مـرۆڤ هاتنـی ڕۆژی دوایـی ئەوە.
(١٩): ﴿ فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَاكُمْ ﴿١٩﴾ ﴾
﴿ فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ ﴾ زانسـت پێویسـتە دان پێدانانـی دڵـی تێدابێـت، وە بـەو جۆرە بیناسـێ کـە علم دەیخـوازێ، وە تەواوی ئـەوەش ئەوەیە کار بـە ناوەڕۆکـی (لا إله إلا الله) بکات.

وە ئـەم زانسـتەی کـە خـوا ﷻ فەرمانی پێکـردوە بریتیە لـە زانسـتی یەکتاپەرسـتی، فەرزە لەسـەر هەمـوو ئادەمیزادێ، لەسـەر هیـچ کـەس هەڵناگیرێ، بەڵکـو هەمـوو ناچارکراوە بە فێربوونـی ئەو زانسـتە. وە ڕێگای گەیشـتن بە زانسـت بـەوەی هیچ پەرسـتراوێک نیە جگە لـە خوا نەبـێ، چەنـد کاروبارێکە:
یەکـەم: بەڵکـو مەزنترینیان: سـەرنجدانو بیرکردنەوەیە لە ناوو سـیفاتەکانی خوا ﷻ، وە ئەو کردەوانـەی بەڵگـەن لەسـەر تـەواویو مەزنـیو گەورەیی ئەو زاتـە، جا ئـەوەش ئەوپەڕی هـەوڵو کۆشـش پێویسـت دەکات لە پەرسـتنی پەروەردگاری تەواو، کە شایسـتەی هەموو سـتایشو گەورەییو مەزنـیو جوانیەکە.
دووەم: زانیـاری بـەوەی کە خوا تـاکو تەنهایە بە دروسـتکردنو بەڕێوەبردن، بەو شـێوەیە دەزانـێ ئەو زاتە تـاکو تەنهایە لە پەرسـتراوێتیدا.
سـێیەم: زانیـاری بـەوەی کـە خـوا تـاکو تەنهایـە بـە نیعمەتـە ئاشـکراو نهێنیـە دینـیو

دونیاییــەکان، بێگومــان ئــەوە پەیوەســت بوونی دڵو خۆشەویســتی بــۆ خــواو بەندایەتی بۆ کردنــی بە تــاکو تەنهــاو بەبــێ هــاوەڵ پێویســت دەکات.

چــوارەم: ئــەوەی دەیبینیــنو دەیبیســتین لە پاداشــت بــۆ دۆســتو خۆشەویســتانی ئەوانەی یەکتاپەرســتیان بەجێهێنــاوە، لــە ســەرکەوتنو نازونیعمەتــی بە پەلــە، وە لە ســزادانی بۆ ئەو دوژمنانــەی هاوبەشــی بــۆ دادەنێــن، بێگومــان ئەمــە پاڵنەرە بۆ لای زانســتێ بــەوەی کە خوا بە تــاکو تەنهــا شایســتەی بەندایەتی بــۆ کردنە.

پێنجەم: ناســینی ســیفەتی بتو پەرســتراوەکان، ئەوانەی لەگەڵ خوادا دەپەرســترێنو کراون بــە پەرســتراو، بێگومــان ئەوانە ناتــەواون لە هەمــوو ڕووەکانــەوە، هەژارن بە زاتــی خۆیان، نــە دەتوانــن ســوود بە خۆیــان بگەیەنــن، وە نە بــە ئەوانەیشــی دەیانپەرســتن، نە زیــانو نە مردنو نە زیندووکردنەوە، وە ناتوانن ئەو کەســە ســەربخەن کە دەیانپەرســتێ، وە ســوودیان پێناگەیەنــن بــە قــەد تۆزقاڵــە زەڕەیەکیش، لــە بە دەســتهێنانی خێــر، یان دوورخســتنەوەی شــەڕ، بێگومــان زانســتو زانیــاری بەمــە ئــەوە زانســتە پێویســت دەکات کــە خــوا تاکو تەنهایــەو هاوبەشــی نیــە، وە پووچی پەرســتراوێتی جگــە لە خوا.

شەشەم: یەکدەنگی کتێبەکانی خوا لەسەر یەکتاپەرستی.

حەوتــەم: بێگومــان هەڵبژێردراوانــی نــاو بەدیهێنــراوەکان، ئەوانــەی کــە تەواوترینــی دروســتکراوەکانن لــە ڕووی ڕەوشــتو عەقــڵو بیــرو بۆچــوونو زانســتەوە، ئەوانیــش پێغەمبــەرانو زانــا خواناســەکانن، کــە بێگومــان شــایەتیان بــۆ خــوا داوە بە یەکتاپەرســتی.

هەشــتەم: ئــەوەی خــوا ﷻ دایناــوە لە بەڵگــە گەردوونــیو نەفســیەکان، کە بەڵگەن لەســەر یەکتاپەرســتیو مەزنتریــن ســەلماندنن، وە بــە زمانــی حاڵیان بانــگ دەکەن بــەوەی داویناوە تیایــدا لەجوانی دروســتکردنو ڕەوانــی حیکمەتی وە سەرســوڕهێنەری دروســتکراوەکانی.

ئــەم ڕێگایانــە کــە خــوا ﷻ بــە زۆری هێناویەتــی لــە بانگــەواز کردنــی خەڵــک بــۆ لای، بــەوەی خــوا تــاکو تەنهایــەو هیــچ پەرســتراوێک نیــە بەڕاســتی جگــە لــەو، وە چەندین جــار لــە کتێبەکــەی دووبــارەی کردۆتــەوە، کاتێ کە بەنــدە ســەرنجی هەندێکــی دەدات، بێگومــان هەردەبــێ دڵنیاییو زانســتی هەبێ بەو یەکتاپەرســتیە، جا چۆن ئەگــەر کۆببێتەوەو یەکدەنــگ بــێ، وە بەڵگــەی یەکتاپەرســتی لــە هەمــوو لایەکــەوە بەجــێ بێت، جــا لەوێدا ئیمــانو زانســت ڕۆدەچــێو دەچەســپێ بە یەکتاپەرســتی لەناو دڵــی بەندە، بە جــۆرێ وەک کێــوە داکوتراوەکانــی لێــدێ، خەیــاڵو گومانــەکان نایهێننە لــەرزە، وە دووبــارە بوونەوەی

بەتاڵو پووچو گومانەکان کاریگەری لەسەر دروست ناکەن، جگە لەزیاد بوونو تەواوەتی ئیمان نەبێ.
ئەمە ئەگەر تەماشای بەڵگەی مەزنو فەرمانی گەورە بکەیت -ئەویش سەرنجدانو بیرکردنەوەیە لەم قورئانە مەزنەو بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی- بێگومان ئەوە دەرگای مەزنە بۆ زانست بە یەکتاپەرستی، وە دەستەبەر دەبێ بە بیرکردنەوە لە وردەکاریەکانیو رستەکانی کە لە غەیری ئەودا دەستەبەر نابێت.
وە کە دەفەرموێ: ﴿وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ﴾ واتە: داوای لێبووردن لە خوا بکە لە گوناهەکانت، بەوەی هۆکاری لێخۆشبوون بەدەست بێنی، لە تەوبەکردنو پاڕانەوە بە لێخۆشبوون، وە ئەو چاکانەی دەبنە مایەی سڕینەوە گوناهەکان، وە وازهێنان لە گوناهو لێبووردن لە تاوانو ستەمەکان. ﴿وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ﴾ هەروەها داوای لێخۆشبوون بکە (بۆ پیاوانو ئافرەتانی ئیماندار) چونکە ئەوان -بە هۆی بڕواهێنانیانەوە- مافی ئەوەیان هەیە لەسەر هەموو پیاوو ئافرەتێکی مسوڵمان.
وە لە کۆی مافەکانیان ئەوەیە بۆیان بپاڕێتەوەو داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکات. وە ئەگەر فەرمانیان پێکرابێ بە داوای لێخۆشبوون بۆیان، کە لابردنی تاوانەکانو سزاکانیان لەسەر لادەبات، بێگومان لە پێویستیەکانی ئەوە ئامۆژگاری کردنیانە، وە بۆ خۆی چی پێخۆشە بۆ ئەوانیش ئەوەی پێ خۆش بێ، وە بۆ خۆی چی پێناخۆشە بۆ ئەوانیش ئەوەی پێناخۆش بێ، فەرمانیان پێ بکات بەوەی خێری تێدایە بۆیان، وە قەدەغەیان لێبکات لەوەی زیانی هەیە بۆیان، لە کەمو کوڕیو هەڵەکانیان خۆش ببێ، سووربێ لەسەر یەکدەنگیو پەیوەست بوونی دڵەکانیان، وە نەهێشتنی ئەوەی لە نێوانیاندایە لەو ڕقو کینانەی دەبنە مایەی دوژمنایەتیو دووبەرەکی، کە بە هۆیانەوە تاوانو گوناهەکانیان زیاد دەکات.
﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ﴾ واتە: (خوا دەزانێ) بە هەڵسوکەوتو جمووجووڵتان، وە هاتنو ڕۆیشتنتان ﴿وَمَثۡوَىٰكُمۡ﴾ واتە: ئەو جێگای کە ئارامی تێدا دەگرن، ئەو پێتان دەزانێ لە جووڵەو وەستانتاندا، پاداشتتان دەداتەوە لەسەر ئەوە بە تەواوترینو چاکترین پاداشت.

وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ
مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُ رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ
يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ ٱلْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ فَأَوْلَىٰ لَهُمْ
(٢٠) طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ فَإِذَا عَزَمَ ٱلْأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُواْ ٱللَّهَ
لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ (٢١) فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُواْ
فِي ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرْحَامَكُمْ (٢٢) أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ
ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰٓ أَبْصَٰرَهُمْ (٢٣) أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ
أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ (٢٤) إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِم
مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ٱلشَّيْطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ
لَهُمْ (٢٥) ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ لِلَّذِينَ كَرِهُواْ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ
سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ ٱلْأَمْرِ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ (٢٦)
فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ
وَأَدْبَٰرَهُمْ (٢٧) ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُواْ مَآ أَسْخَطَ ٱللَّهَ
وَكَرِهُواْ رِضْوَٰنَهُۥ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ (٢٨) أَمْ حَسِبَ
ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ ٱللَّهُ أَضْغَٰنَهُمْ (٢٩)

(٢٠-٢٣): ﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُ رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ ٱلْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ فَأَوْلَىٰ لَهُمْ (٢٠) طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ فَإِذَا عَزَمَ ٱلْأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُواْ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ (٢١) فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُواْ فِي ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرْحَامَكُمْ (٢٢) أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰٓ أَبْصَٰرَهُمْ (٢٣) ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ بـە پەلە کـردنو دەستپێشـخەری کـردن بـۆ کاروبـارە قورسـەکان ﴿ لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ ﴾ واتـە: (بۆچـی سـوورەتێک لـە قورئـان نانێردرێتـە خـوارەوە) فەرمانکردنـی جەنـگو کوشـتاری تێدابێـت.

﴿ فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ ﴾ واتـە: پێویسـت بێـت کاری پـێ بکـرێ، ﴿ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُ ﴾ (تیایـدا باسـی جەنـگ کرابـێ) کـە ئـەوە گرانتریـن شـتە لەسـەر نەفـسو دەروونـەکان، ئەوانـەی کـە ئیمانیـان لاوازە، خۆڕاگـر نەدەبـوون لەسـەر جێبەجـێ کردنـی ئـەم فەرمانانـە، لەبـەر ئەمەیـە فەرمویەتـی: ﴿ رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ ٱلْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ﴾ واتـە: (دەبینـی ئـەو کەسـانەی کـە لـە دڵیانـدا نەخۆشـی دوو ڕوویـی هەیـە تەماشـای تـۆ دەکـەن وەک تەماشـا کردنـی کەسـێک کـە لـە ترسـی مـردن لـە هۆشـی خـۆی چـوو بـێ) لـە سـەختیو نارەحەتیـان دەربـارەی ئـەوە، وە قورسـیو گرانـی لەسـەریان.

ئەمـە وەک ئـەو ئایەتەیـە کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓاْ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً (٧٧) ﴾ النسـاء.، (واتـە: ئایـا سـەیری ئـەو کەسـانەت نەکـردوە کـە پێیـان وتـرا دەسـتان بگێڕنـەوە لـە جەنـگو کوشـتارو نوێـژ بکـەنو زەکات بـدەن؟

کەچـی کاتێـک جەنگیـان لەسـەر پێویسـت کـرا یەکسـەر دەستەیەکیان لـە خەڵکـی دەترسـان وەک ترسـان لـە خـودا، بگـرە زیاتریـش دەترسـان).
پاشـان خـوا ﷻ هانیـداون بـۆ لای ئـەوەی کـە شـیاوترە بـە بارودۆخیـان، فەرموویەتی: ﴿ فَأَوۡلَىٰ لَهُمۡ ۝٢٠ طَاعَةٞ وَقَوۡلٞ مَّعۡرُوفٞ ﴾ واتـە: چاکتـر وایـە بـۆ ئـەوان فەرمانـی ئێسـتا جێبەجـێ بکـەن کـە پێویسـتە لەسـەریان، وە توانـاو کۆششـیان لەسـەری کۆبکەنـەوە، وە بـا داوای شـتێ نەکـەن کـە ببـێ بـە شـەریعەت بۆیـانو قـورسو گرانـە لـە سـەریان، وە بـا دڵخـۆش بـن بـە لێبوردەیـی خـوا، ﴿ فَإِذَا عَزَمَ ٱلۡأَمۡرُ ﴾ واتـە: فەرمانیـان بـە ڕاسـتەقینە بـۆ هـات، ئـا لـەم حاڵەتـەدا ئەگـەر لەگـەڵ خـوا ڕاسـتیان بکردایـە بـە پشـت بەسـتن پێـیو بەکارهێنانـی کۆشـشو تواناکانیـان لـە جێبەجێکردنـی فەرمانەکانیـدا، ﴿ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ ﴾ (ئـەوە باشـتر بـوو بۆیـان) لـە حاڵـی یەکەمیـان ئەویـش لـە چەنـد ڕوویەکـەوە:
یەکـەم: بێگومـان مـرۆڤ ناتـەواوە لـە هەمـوو ڕوویەکـەوە، هیـچ توانایەکـی نیـە ئەگـەر خـوا یارمەتـی نـەدات، بـا داوای زیاتـر نـەکات لـەوەی لـە بەردەسـتیدایە.
دووەم: ئەگـەر نەفـسو دەروونـی هەڵبواسـێ بەداهاتـوو، ئـەوە لاواز دەبێ لـە کارکردن لـە کاتـی خۆیـدا، وە لـە داهاتـوودا. بـەڵام ئێسـتا چونکـە وورەی گواسـتراوەتەوە لێیـەوە بـۆ لای جگـە لـەو کاتـە، وە کارکردنیـش شـوێنی ورەو هیمـەت کەوتـووە، بـەڵام داهاتـوو بێگومـان نایـەت هەتـا ورەی سـارد دەبێتـەوە لـە چالاکـی، بۆیـە نابێتـە یارمەتیـدەر بـۆی.
سـێیەم: بێگومـان بەنـدەی خـاوەن هیـواو ئومێـد بـە داهاتـوو لەگـەڵ تەمبەڵـیو تەوەزەلـی لـە ئێسـتادا، دەشـوبهێتە ئـەو کەسـەی زۆر خـاوو لەسـەرخۆیە، کـە سـوورە لەسـەر ئـەوەی توانـای هەیـە لـە داهاتـوودا کارەکـەی ئەنجـام بـدات، جـا لەپێشـترە کـە ئـەو کەسـە ئـەو هیممـەتو ورەیـەی هەیەتـی نەتوانـێ لـە داهاتـوودا جێبەجێـی بـکات، ئـەوەی پێویسـتە لەسـەر بەنـدە ئەوەیـە ورەو چالاکـیو تواناکانـی کۆبکاتـەوە لـە ئێسـتادا، وە ئەرکـی سەرشـانی جێبەجـێ بـکات بـە پێـی توانـای خـۆی.
پاشـان ئەگـەر کاتێـک هاتـە پێشـی بـە چالاکـیو ورەیەکـی بـەرزەوە پشـت بەسـتن بـە پەروەردگـاری ڕووبـەڕووی ببێتـەوە، ئەمـە نزیکتـرە لـە سـەرکەوتنو پێـکان لـە هەمـوو کارەکانـی.

پاشـان باسـی حاڵـی ئـەو کەسـە دەکات کـە پشـت هەڵـدەکات لـە گوێڕایەڵـی پەروەردگـاری، وە ئـەو کەسـە کـە ڕووناکاتـە خێـر، بەڵکـو ڕوو لـە شـەڕو خراپـە، دەفەرمـوێ: ﴿ فَهَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن تَوَلَّيۡتُمۡ أَن تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ﴾ واتـە: (جـا ئایـا ئێـوە بـە تەمـان ئەگـەر پشـت هەڵبکـەن لـە ئیسـلامو جیهـادو لـە زەویـدا ئـاژاوەو خراپـە بەرپـا بکـەن، وە هەرچـی پەیوەنـدی خزمایەتـی هەیـە بیپچڕێنـن) ئـەوە دوو کارە: یـان پابەنـد بوونـە بـە گوێڕایەڵـی کردنـی خـواو جێبەجـێ کردنـی فەرمانەکانـی، بێگومـان ئـەوەش خێـرو ژیـریو سـەرکەوتنە، یـان ڕوو وەرگێڕانـە لـەوەو پشـتکردنە لـە گوێڕایەڵـی خـوا، بێگومـان ئـەوەش فەسـادو خراپـەکاری دەنێتـەوە لەسـەر زەوی، بـە سـەرپێچی کـردنو پچڕاندنـی پەیوەنـدی خزمایەتـی.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ﴾ کـە خراپەکاڕیـان کـردوە لەسـەر زەویـداو پەیوەنـدی خزمایەتیـان پچڕانـدوە، ﴿ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ﴾ بـەوەی دووریـان دەخاتـەوە لـە میهرەبانـی خـوێو نزیکیـان دەکاتـەوە لـە توورەیـیو خەشـمو قینـی.

﴿ فَأَصَمَّهُمۡ وَأَعۡمَىٰٓ أَبۡصَٰرَهُمۡ ﴾ واتـە: وای لێکـردوون ئـەوەی سـوودی هەیـە بۆیـان نابیسـتنو نایبینـن، ئەوانـە گوێیـان هەیـە، بـەڵام نابیسـتێ بیسـتنی گوێڕایەڵـیو وەرگرتـن، بەڵکـو بیسـتنێ دەبیسـتێ بیانـووی بـبڕێو حوججـەی لەسـەر پێویسـت بـکات، چاویشـیان هەیـە تەماشـای پەنـدو نیشـانەکانی پـێ ناکـەن، وە لاناکەنـەوە بـۆ لای بەڵگـە ڕوونـەکان.

(٢٤): ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ ٢٤ ﴾

ئـەو ڕوو وەرگێـڕو پشـتێکەرانە لـە کتێبـی خـوا، بۆچـی بیـر لـە قورئـان ناکەنـەوەو بـە جوانـی سـەرنجی نـادەن، بێگومـان ئەگـەر ئـەوان بیریـان لـێ بکردایەتـەوە ئـەوە ڕێنیشـاندەریان بـوو بـۆ هەمـوو خێـرێ، وە ئاگـاداری دەکردنـەوە لـە هەمـوو شـەڕو خراپەیـەکو دڵەکانیانـی پـڕ دەکـرد لـە ئیمـانو دڵنیایـی، وە دەیگەیانـدن بـە داواکاریـە بـەرزو بـە نرخـەکان، وە بـۆی ڕوون دەکردنـەوە ئـەو ڕێگـای کـە دەیانگەیەنێتـە لای خـواو بەهەشـتەکەی، وە ئـەو ڕێگایـەی کـە دەیانگەیەنـێ بـە سـزای دۆزەخ، وە پەروەردگـاری پـێ دەناسـاندن بـە ناوەکانـیو سـیفاتەکانیو فـەزڵو چاکەکانـی، وە هانیـدەدان بـۆ پاداشـتی بـێ پایـانو دەیانترسـاندن بـۆ سـزای لەناوبـەر، ﴿ أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ ﴾ واتـە: دڵەکانیـان داخـراوە لـەوەی کـە تێیدایـە لـە شـەڕو

خراپـەو قفـڵ دراوە، چاکـە ناچێتـە نێویـەوە؟ ئەمـە حەقیقـەتو ڕاسـتیە.

(٢٥-٢٨): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَـٰرِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ۙ ٱلشَّيْطَـٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ كَرِهُوا۟ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِى بَعْضِ ٱلْأَمْرِ ۖ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ ﴿٢٦﴾ فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَـٰرَهُمْ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُوا۟ مَآ أَسْخَطَ ٱللَّهَ وَكَرِهُوا۟ رِضْوَٰنَهُۥ فَأَحْبَطَ أَعْمَـٰلَهُمْ ﴿٢٨﴾ ﴾:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَـٰرِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ۙ ٱلشَّيْطَـٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ﴾، خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی حاڵـی ئەوانـەی هەڵگەڕاونەتـەوە لـە هیدایـەتو ئیمـان، بـۆ لای گومڕایـیو بێبڕوابـوون، ئەویـش نـە بە هـۆی بەڵگەیەکەوەیـە ڕێـی نیشـاندابن، نـە سـەلماندن، بەڵکـو ڕازاندنـەوەو جوانکردنـە لەلایـەن دوژمنەکەیانـەوە کـە شـەیتانە، وە داویەتـی بـە گوێیانـدا ﴿ يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ ۖ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾ ﴾النسـاء (واتـە: شـەیتان بەڵێنیـان پێـدەداتو ئـاواتو ئومێدیـان دەخاتـە بـەر دڵیابـن شـەیتان هیـچ بەڵێنێکیـان پێنـادات جگـە لـە خەڵەتانـدن نەبێـت)، چونکـە ئـەوان هیدایـەتو ڕێنماییـان بـۆ ڕوون بوەتـەوە، خۆیـان لـێ پاراسـتوەو ڕەتیـان کردۆتـەوە، وە﴿ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ كَرِهُوا۟ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ ﴾ (واتـە: دەیانـوت بـەو کەسـانەی کـە ڕقیـان بـوو لـەو قورئانـەی خـوا ناردبـووی) ئـەوەش لـە وتـەی ئـەو دوژمنـە ڕکابەرانـەی دژایەتـی خـواو پێغەمبەرەکەیـان دەکـرد، ﴿ سَنُطِيعُكُمْ فِى بَعْضِ ٱلْأَمْرِ ﴾ واتـە: (ئێمـە لـە مـەولا لـە هەنـدێ کاردا گوێڕایەڵیتـان دەکەیـن) ئـەوەی دەگونجـێ لەگـەڵ هـەواو ئارەزووەیانـدا، ئـا لەبـەر ئەوەیـە خـوا سـزایدان بـە گومڕایـی، وە بـەردەوام بـوون لەسـەر ئـەوەی دەیانگەیەنـێ بـە بەدبەختـی بـەردەوامو سـزای هەمیشـەیی ﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ ﴾ (واتـە: خـوا بـە نهێنیەکانیـان دەزانێـت) جـا لەبـەر ئـەوە ڕیسـوای کـردن، وە بـۆ بەنـدە بڕوادارەکانـی ڕوون کـردەوە تـا پێـی یاخـی نەبـن.

﴿ فَكَيْفَ ﴾ ئاخـۆ چـۆن خراپـی حاڵیـان دەبینـی، ﴿ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ ﴾ (واتـە: کاتـێ فریشـتەکان) ئەوانـەی وەکیلـی گیـان کێشـانن ﴿ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَـٰرَهُمْ ﴾ (لـە ڕوخسـارو پشـتەوەیان دەدەن) بـە قەمچیـە توونـدەکان؟!

﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئـەو سـزایەی کـە شایسـتەنو چەشـتوویانە ﴿ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُوا۟ مَآ أَسْخَطَ

ٱللَّهَ ﴾ بــە هــۆی ئــەوەی (ئەوانــە شــوێنی شــتانێک کەوتبــوون کــە خــوای تــوورە کردبــوو) لــە هەمــوو بێبڕوایــیو گوناهــو ســەرپێچیەک، ﴿ وَكَرِهُواْ رِضْوَٰنَهُۥ ﴾ (ڕەزامەنـدی خواشـیان پـێ ناخـۆش بـوو) هیـچ حەزێکیـان نەبـوو لـە خـوا نزیکیـان بکاتــەوە ﴿ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾ واتــە: (بۆیــە خــوا کردەوەکانیانــی) پووچــەڵ کــردەوەو لــە نــاوی بــرد، ئەمــە بــە پێچەوانــەی ئــەو کەســەی شــوێنی ڕەزامەنـدی خوا دەکــەوێو خــۆی دوور دەگــرێ لــە تووڕەیــی خــوا، ئــەوە بێگومــان لــە تاوانەکانــی خــۆش دەبــێو پاداشــتی بــە چەنــد قــات بــۆ زیــاد دەکات.

(٢٩-٣١): ﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ ٱللَّهُ أَضْغَٰنَهُمْ ﴿٢٩﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَأَرَيْنَٰكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَٰهُمْ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى لَحْنِ ٱلْقَوْلِ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٠﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ ٱلْمُجَٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبْلُوَاْ أَخْبَارَكُمْ ﴿٣١﴾ ﴾

خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴾ (واتــە: ئایــا وادەزانــن ئەوانــەی کــە نەخۆشــی ناپاکــی لــە دڵیاندایــە) لــە گومــان، یــان شــەهوەتو ئــارەزوو، کــە بــەو هۆیــەوە دڵ لــە ڕێــڕەوی ڕاســتەقینەی خــۆی دەردەچــێ، کــە خــوا ﷻ ڕقو کینەیــان دەرناخــاتو دژایەتیــان بــۆ ئیســلامو خەڵکەکــەی ئاشــکرا نــاکات؟ ئەمــە گومانێکــە شــیاو نیــە بــە حیکمەتــی خــوا، بێگومــان هــەر دەبــێ ڕاســتگۆ لــە درۆزن جیابکرێتــەوە، ئەویــش بــە تاقیکردنــەوەو بــەلاو نارەحەتــی، کــە هــەر کــەس چەســپاوبێ لەســەریو ئیمانەکــەی بــەردەوام بــێ، ئــەوە بــە ڕاســتی بــڕواداره.

وە هــەر کــەس پشــتی تێکــردو خۆڕاگــر نەبــوو لەســەری، وە کاتــێ تاقیکرایــەوە تۆقــیو ئیمانــی لاواز بــوو، وە ئــەوەی لــە دڵیایەتــی لــە ڕقو کینــە دەرچــوو، وە دوو ڕوویــی ڕوون بوویــەوە، ئەمــە داخــوازی حیکمەتــی خواییــە، لەگــەڵ ئــەوەدا خــوا ﷻ فەرموویەتــی:

وَلَوْ نَشَاءُ لَأَرَيْنَاكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَاهُمْ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِي
لَحْنِ الْقَوْلِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَالَكُمْ (٣٠) وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ
الْمُجَاهِدِينَ مِنكُمْ وَالصَّابِرِينَ وَنَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ (٣١) إِنَّ الَّذِينَ
كَفَرُوا وَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَشَاقُّوا الرَّسُولَ مِن بَعْدِ
مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَىٰ لَن يَضُرُّوا اللَّهَ شَيْئًا وَسَيُحْبِطُ أَعْمَالَهُمْ
(٣٢) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ
وَلَا تُبْطِلُوا أَعْمَالَكُمْ (٣٣) إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَن سَبِيلِ
اللَّهِ ثُمَّ مَاتُوا وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ (٣٤) فَلَا تَهِنُوا
وَتَدْعُوا إِلَى السَّلْمِ وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ وَاللَّهُ مَعَكُمْ وَلَن يَتِرَكُمْ
أَعْمَالَكُمْ (٣٥) إِنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَإِن تُؤْمِنُوا وَتَتَّقُوا
يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ وَلَا يَسْأَلْكُمْ أَمْوَالَكُمْ (٣٦) إِن يَسْأَلْكُمُوهَا
فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا وَيُخْرِجْ أَضْغَانَكُمْ (٣٧) هَا أَنتُمْ هَٰؤُلَاءِ
تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ وَمَن يَبْخَلْ
فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِ وَاللَّهُ الْغَنِيُّ وَأَنتُمُ الْفُقَرَاءُ وَإِن
تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُمْ (٣٨)

﴿ وَلَوْ نَشَاءُ لَأَرَيْنَاكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَاهُمْ ﴾ (واتە: ئەگەر بمانویستایە ئەوانەمان نیشان دەدایت کە دوو ڕوون ئەوسا هەر بەو شێوەو دیمەنەیاندا دەتناسینەوە) واتە: بە نیشانەکانیان کە وەکو خاڵێک وایە لە نێو چاوانیاندایە، ﴿ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِي لَحْنِ الْقَوْلِ ﴾ واتە: هەر دەبێت ئەوەی لە دڵیاندایە ئاشکرا ببێت، وە بە قسەی سەرزاریان ڕوون ببێتەوە، چونکە زمانەکان کەوگیری دڵەکانن، هەرچی لەناو دڵدابێ دەریدێنن لە چاکو خراپە، ﴿ وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَالَكُمْ ﴾ پاداشتان دەداتەوە لەسەری.

پاشان باسی مەزنترین تاقیکردنەوە دەکات کە بەندەکانی پێ تاقیدەکاتەوە، ئەویش جیهاد کردنە لە پێناوی خوا، جا فەرموویەتی: ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ ﴾ واتە: ئیمانو خۆڕاگریتان تاقی دەکەینەوە، ﴿ حَتَّىٰ نَعْلَمَ الْمُجَاهِدِينَ مِنكُمْ وَالصَّابِرِينَ وَنَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ ﴾ (واتە: تا دەریبخەینو دیار بێت موجاهیدانو خۆڕاگران وە تا هەواڵتان چیە ئاشکرای کەین) جا هەر کەس فەرمانی خوا جێبەجێ بکات بۆ سەرخستنی ئاینەکەیو بەرز ڕاگرتنی وشەکەی، ئەوە بڕواداری ڕاستەقینەیە، وە هەر کەس کەمتەرخەمیو تەنبەڵی لەوەدا بکات ئەوە ناتەواوی لە ئیمانەکەیدا هەیە.

(٣٢): ﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَشَاقُّوا الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَىٰ لَن يَضُرُّوا اللَّهَ شَيْئًا وَسَيُحْبِطُ أَعْمَالَهُمْ (٣٢) ﴾

﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ ﴾ ئەمە هەڕەشەیەکی توونددە بۆ کەسێ هەموو جۆرەکانی شەڕو خراپەی کۆکردبێتەوە، لە بێبڕوایی بە خواو ڕێگری کردنی خەڵکی لە ڕێگای خوا کە داینـاوە بە گەیشتن پێی.

﴿ وَشَاقُّوا الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَىٰ ﴾ واتە: دژایەتیو عینادیو پێچەوانەی پێغەمبەر ﷺ دەجوڵانەوە بە ئەنقەست، نە بە نەفامیو سەرلێشێواویو گومڕایی، بێگومان ئەوان ﴿ لَن

﴿يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا﴾ (هیــچ زیانــێ بە خــوا ناگەیەنن) موڵکی دەســەڵاتی خوا بــە دژایەتی ئەوان کــەم ناکات ﴿وَسَيُحْبِطُ أَعْمَـٰلَهُمْ﴾ واتە: ئەو کۆششــانەی کە کردوویانە لە سەرخســتنی پووچــدا، هیچیــان بۆ بەرهــەم ناهێنێ جگە لە پەشــیمانیو خەســارەتو زەرەرمەنــدی نەبێ، وە کردەوەکانیشــیان کــە ئومێدی پاداشــتیان پێی هەیــە وەرناگیرێ، لەبەر نەبوونــی مەرجەکەی.

(٣٣): ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓا۟ أَعْمَـٰلَكُمْ ﴿٣٣﴾﴾:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓا۟ أَعْمَـٰلَكُمْ﴾ خــوا ﷻ فەرمــان بــە بــڕواداران دەکات بــە فەرمانکردنــێ کــە پێــی کارەکانیان تــەواو دەبێو خۆشــبەختی ئاینیو دونیایــی بەدەســت دێنــن، ئەویــش گوێڕایەڵــی خــواو گوێڕایەڵــی پێغەمبەرەکەیەتــی، لــە بنەماکانــی ئایــنو لــقو پۆکانــی، وە گوێڕایەڵی کــردن بریتیە لــە جێبەجێ کردنــی فەرمانو دوورکەوتنــەوە لــە قەدەغە کــراو، بەو شــێوەی فەرمانی پێکراوە بە دڵســۆزیو شــوێنکەوتنی تەواو.

وە کــە دەفەرمــوێ: ﴿وَلَا تُبْطِلُوٓا۟ أَعْمَـٰلَكُمْ﴾ قەدەغــە کــردن دەگرێتــەوە لە هەڵوەشــاندنەوەی کردەوەکانیــان دوای ئەنجامدانیــان بــەوەی کــە تێکــی دەدات، لــە منــەت کــردن پێــیو سەرســوورمانو فەخرو شــانازیو ناوبانگ، وە ســەرپێچیکردن کە کردەوەکانی دیکە پەرشو بــڵاو دەکاتو پاداشــتیان هەڵدەوەشــێنێتەوە، وە قەدەغە کــردن دەگرێتــەوە لــە تێکدانیــان لــە کاتــی ئەنجامدانیانــدا بە پچڕاندنیــان، یان هێنانــی خراپە کردنــێ ببێتە مایــەی پووچکردنەوەو تێکدانیــان، جــا پــووچ کردنەوەی نوێــژو ڕۆژو حــەجو وێنەی ئەوانــە، هەموویــان دەچنە نێو ئەمــەوە، وە قەدەغــەی لێکــراوە، وە شــارەزایانی فیقهــی بەڵگــە دەهێننــەوە بــەم دەقە لەســەر قەدەغەکردنــی پچڕاندنی فەرز، وە ناپەســندی بڕینی ســوننەت بەبێ هیچ هۆکارێکی پێویســت بۆ ئــەوە.

جــا ئەگــەر خــوا قەدەغەی کردبــێ لــە پووچکردنەوەی کــردەوەکان، ئــەوە خۆی لــە خۆیدا فەرمــان پێکردنــە بە چــاکو تــەواو ئەنجامدانیــان، وە بەجێهێنانیان لەو ڕووەی کە دروســتو گونجــاوە بە زانســتو کردەوە.

(٣٤-٣٥): ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ مَاتُوا۟ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴿٣٤﴾ فَلَا تَهِنُوا۟ وَتَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّلْمِ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمْ وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ ﴿٣٥﴾﴾:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ مَاتُوا۟ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴿٣٤﴾ فَلَا تَهِنُوا۟ وَتَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّلْمِ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمْ وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ﴾ ئــەم دەقــەو ئەوەیشــی لــە بەقــەرەدا

هاتــووە، کــە فەرموویەتــی: ﴿ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾ ﴾البقرة. (واتــە: وە هەر کەســێ لــە ئێوە لە دینــی خــۆی هەڵبگەڕێتەوە، وە بــە بێڕوایی بمــرێ ئــا ئەوانە هەموو کردەوەیەکیــان پووچ ئەبێتەوە لە هــەردوو جیهانــدا، وە ئەوانە هاوەڵی ئاگــرن، تێیــدا دەمێننەوە بە هەمیشــەیی).

ئــەم دوو دەقــە هەمــوو دەقێکــی ڕەهایــان (مطلق) بەنــد کــردوە، کــە هەڵوەشــاندنەوەی کــردەوە لــە خۆ بگرێــت بە هــۆی بێبڕوایــی، بێگومان ئــەوە بەندکــراوە بە مردن لە ســەری. لێــرەدا فەرموویەتــی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ (واتــە: بێگومــان ئەوانــەی بێبــڕوا بــوون) بە خواو فریشــتەکانی‌و کتێبەکانــی‌و پێغەمبەرانی‌و ڕۆژی دوایــی ﴿ وَصَدُّواْ ﴾ (ڕێ بگرن لە) خەڵکی ﴿ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ بــە کەمزانیان بەرانبەر بە حەق‌و بانگەشــەکردنیان بۆ پــووچ‌و ڕازاندنەوەی. ﴿ ثُمَّ مَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ ﴾ (واتــە: پاشــان بــە بێبڕوایــی مــردن) وە تەوبەیان نەکــرد لێی، ﴿ فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴾ (واتــە: ئــەوە خــوا قــەت لێیــان خــۆش نابێت) نە بــە تکاکردن نە بــە غەیری ئەوە، چونکە ســزای بەســەریاندا ســەپاندووەو پاداشــتیانیش لە دەســت داوە، وە پێویســت بوو لەســەریان مانەوەیــان لەنــاو ئاگــرو دەرگای میهرەبانــی خوای بــە بەزەییان لەســەر داخراوە.

مەفهــوم‌و تێگەیشــتن لە دەقە پیرۆزەکە ئــەوە دەگەیەنێت، ئــەوان ئەگەر پێــش مردنیان تەوبە بکــەن، ئــەوە بێگومان خوا لێیــان خۆش دەبێــت‌و دەیانخاتە بەهەشــتەوە، ئەگەرچی تەمەنیانیش لــە بێبڕوایــی بە خــواو ڕێگری کردن لە ڕێبازەکەی‌و ســەرپێچیەوە بەســەر بردبێــت، پاکی بۆ ئــەو زاتــەی دەرگای میهرەبانــی بۆ بەندەکانــی کردوەتەوەو داینەخســتووە لە هیچ کەسێک، مــادام زینــدووەو توانای تەوبــە کردنی هەیە.

وە پاکی‌و بێگەردی بۆ ئەو زاتە لەســەرخۆیەی کە ســزاو تۆڵە پێش ناخات بۆ ســەرپێچیکاران، بەڵکــو لێیــان دەبــوورێ‌و ڕزق‌و ڕۆزیــان دەدات، وەکو ئەوەی ســەرپێچی خوایــان نەکردبێ، لەگەڵ تواناو دەســەڵاتی بەسەریانەوە.

پاشــان خــوا فەرموویەتــی: ﴿ فَلَا تَهِنُواْ ﴾ واتــە: لاواز مەبــن لــە جەنــگ‌و کوشــتاری دوژمنەکانتــان‌و تــرس بــاڵ بکێشــێت بەســەرتاندا، بەڵکــو خۆڕاگرو چەســپاو بن‌و نەفســتان جێگیــر بکــەن لەســەر جەنــگ‌و کوشــتار بــە مەبەســتی ڕەزامەنــدی خــواو ئامۆژگــاری بــۆ ئیســلام‌و تووڕەبوونــی شــەیتان.

وە داوای ئاشــتی‌و شــەڕ وەســتان مەکــەن لــە نێــوان ئێــوەو دوژمنەکانتــان لەبــەر پشــوودان،

﴿وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمۡ وَلَن يَتِرَكُمۡ﴾ واتــە: لەکاتێکــدا (ئێــوە زاڵو بەهێزتــرن خــواش لەگــەڵ ئێوەدایــە وە هەرگیــز) کەمــی ناکاتــەوە، ﴿أَعۡمَٰلَكُمۡ﴾ (کردەوەکانتــان).

ئا ئەم سێ کاروبارە، هەریەک لەوانە ئارام گرتنو لاواز نەبوون دەخوازێ:

یەکەمیــان: زاڵیو بەهێزیان، واتە: هۆکارەکانی ســەرکەوتنیان بۆ دەســتەبەر بووە، وە پەیمانیان پێــدراوە لەلایــەن خواوە بــە پەیمانی ڕاســتەقینە، بێگومان ئادەمیــزاد لاواز نابێ مەگــەر زەلیلتر بــێ لــە بەرانبەری، وە کەمتریــن ژمارەو ئامــادەکاریو هێزی ناوخۆیــیو دەرەکی هەبێ.

دووەم: بێگومــان خــوا ﷻ لەگەڵیاندایە، چونکــە ئەوان بــڕوادارن، خواش لەگــەڵ بڕواداراندایە بــە یارمەتــیو پشــتیوانیو سەرخســتن، ئــەوەش پێویســتکەری بەهێــز بوونــی دڵەکانیانــە، وە دەستپێشــخەریان لەســەر دڵەکانیان.

ســێیەم: بێگومــان خوا لــە کردەوەکانیان کــەم ناکاتەوە، بەڵکو شمشــێرەکانیان پاداشــتیانە، وە خــوا ﷻ بۆیــان زیاد دەکات لــە فەزڵو چاکــەی خۆی، بە تایبــەت بەندایەتــی کردنی جیهاد، چونکــە خێــرو نەفەقــەی حەود ســەد بەرانبەر بــۆ چەندین ئەوەنــدەی زیاتر دەبێتــەوە، خوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ لَا يُصِيبُهُمۡ ظَمَأٞ وَلَا نَصَبٞ وَلَا مَخۡمَصَةٞ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوۡطِئٗا يَغِيظُ ٱلۡكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنۡ عَدُوّٖ نَّيۡلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٞ صَٰلِحٌۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٢٠ وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةٗ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةٗ وَلَا يَقۡطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمۡ لِيَجۡزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحۡسَنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٢١﴾ التوبة، (واتــە: ئــەوە لەبــەر ئەوەیــە کــە بێگومان ئــەوان دووچاریــان نابێ هیــچ تینوویەتــیو ماندوو بــوونو برســێتیەک لــە ڕێــی خــوادا، هەروەها پــێ ناخەنــە هیچ شــوێنێک لە خاکــی کافران کــە ڕقــی کافرانــی پــێ هەڵســێو تووڕەیــان بــکات، وە هیــچ زیانێــک لــە دوژمن نــادەن، دیــل گرتــنو کوشــتنیان یان گرتنــی ماڵو ســامانیان ئیلا بــەم کردەوانــە بۆیان دەنووســرێ کردەوەیەکــی چــاک، بێگومــان خوای گەورە پاداشــتی چاکــەکاران زایە نــاکات * وە هیچ شــتێ لــە ڕێگەی خــوادا نابەخشــن بچوک بێــت، یان گــەورە، کەم بێــت، یــان زۆر، وە هیچ دۆڵو شــیوێک نابــڕن ئیللا بۆیان دەنووســرێت بۆ ئەوەی خوا پاداشــتیان بداتــەوە بە چاکترین پاداشــتی ئەوەی کــە دەیانکرد).

جــا ئەگــەر ئادەمیــزاد ئــەوەی زانــی کە خــوا کــردەوەو جیهادەکــەی بە زایــە نــادات، ئەوە چالاکــی لەســەر پێویســت دەکات، وە بەکارهێنانــی تواناکانی بۆ بەدەســتهێنانی پاداشــت، جا چــۆن ئەگــەر ئەم ســێ کارە کــۆ ببێتــەوە؟ بێگومان ئــەوە چالاکی تــەواو پێویســت دەکات،

ئەمــەش لــە هاندانی خوایە بــۆ بەندەکانی، وە چالاکردنیــانو بەهێز کردنی نەفــسو دەروونیان لەســەر ئــەوەی چاکی ئــەوانو ســەرکەوتنیانی تێدایە.

(٣٦-٣٨): ﴿ إِنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَإِن تُؤْمِنُوا وَتَتَّقُوا يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ وَلَا يَسْأَلْكُمْ
أَمْوَالَكُمْ ﴿٣٦﴾ إِن يَسْأَلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا وَيُخْرِجْ أَضْغَانَكُمْ ﴿٣٧﴾ هَا أَنتُمْ هَٰؤُلَاءِ
تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِ
وَاللَّهُ الْغَنِيُّ وَأَنتُمُ الْفُقَرَاءُ وَإِن تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُم ﴿٣٨﴾ ﴾:

﴿ إِنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ﴾ ئەمــە ئاگــادار کردنەوەیەکە لە لایــەن خوایە بۆ بەندەکانی کــە لــە حەقیقەتــدا ژیانــی دونیایان یــاریو ڕابواردنــە، یاریە لــە جەســتەدا، ڕابواردنــە لە دڵ، بــەردەوام بەنــدە ڕادەبوێــرێ لە مــاڵو منــداڵو زینــەتو لەزەتی لــە خێزانەکانــیو خواردنو خواردنــەوەکانو حەوانەوەو کۆڕو مشــتومڕو دەســەڵاتەکان، یاریە لە هەمــوو کردەوەیەکدا دەکات کــە هیــچ ســوودێکی نیــە، بەڵکــو ئــەو لــە بازنــەی بەتاڵــیو بێئاگاییو ســەرپێچیدا دەســوڕێتەوە، تــا دونیای تــەواو دەبێو مــردن یەخــەی پێدەگرێ.

جــا ئەگــەر ئــەم کارانە پشــتیان هەڵکــردوو جیابوونــەوە، وە بەنــدەش هیچی بەدەســت نەهێنا تیایانــدا، بەڵکــو زەرەرمەنــدیو بێبەش بوونــی بۆ ڕوون بویــەوەو ئامادەی ســزاکەی بوو، ئەمە پێویســت دەکا لەســەر کەســی عاقــڵ زوهــدی تێــدا بــکات، وە حەزوو ویســتی نەبــێ بۆیو گرنگــی پێ نــەدا، بەڵکو ئەوەی پێویســتە گرنگی پێبــدا ئەوەیە خــوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَإِن تُؤْمِنُوا وَتَتَّقُوا ﴾ بــەوەی بــڕوا بێنن بــە خــواو فریشــتەکانیو پێغەمبەرانــیو ڕۆژی دوایی، وە خۆپارێــزی بەجێبهێنــن، کــە بریتیــە لــە پێویســتیو داخــوازی بڕواهێنــان، ئەویــش بریتیە لە کردەوەکــردن بــە ڕەزامەنــدی خوا بــە بەردەوامی لەگــەڵ وازهێنان لــە ســەرپێچی کردنی، ئا ئەمــە ســوود بــە بەندە دەگەیەنــێو پێویســتە کێبڕکێی لــە پێنــاودا بــکات، وە وەرەو تواناکانی بخاتە گــەڕ بۆ بەدەســتهێنانی.

ئــەوە مەبەســتی خوایە لە بەندەکانــی وەک میهرەبانیو بەزەییەک پێیان، بۆ ئەوەی پاداشــتی بێ پایانیــان بداتەوە، لەبــەر ئەمەیە فەرموویەتــی: ﴿ وَإِن تُؤْمِنُوا وَتَتَّقُوا يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ وَلَا يَسْأَلْكُمْ أَمْوَالَكُمْ ﴾ واتــە: خوا نایــەوێ ئەرکی سەرشــانتان قورس بــکات، وە لەســەرتان تووند بکات لــە وەرگرتنــی ماڵەکانتانو دوای بەبێ ســەروەتو ســامان بمێننــەوە، یان مــاڵو داراییەکانتان بــە جۆرێ کەم بــکات زیانتان پــێ بگەیەنێ، لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتی: ﴿ إِن يَسْأَلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا وَيُخْرِجْ أَضْغَانَكُمْ ﴾ (واتــە: ئەگەر خوا داوای بەخشــینی هەموو ســامانتان

لـێ بـکاتو زۆریـش داکۆکی بـکات لێتان، ئێـوە چروکیو ڕەزیلـی دەکـەن)، وە ئەوەی لە نـاو دڵتاندایـە لـە ڕقو کینـە دەردەخـات، ئەگەر داوای شـتێکتان لێـکات پێتـان ناخۆش بێ بیبەخشن.

﴿هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ وە بەڵگـە لەسـەر ئـەوەی ئەگـەر خـوا ﷻ داوای بەخشـینی ماڵەکانتـان لـێ بـکاتو زۆر داکۆکی لەسـەر بـکات، ئێوە ڕێگـری لە بەخشـینی دەکەن، بێگومـان ئێوە ﴿تُدۡعَوۡنَ لِتُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ (واتـە: بانـگ دەکرێـن تا لـە پێناوی خوا مـاڵ بەخت بکـەن) لـەو ڕووەی بەرژەوەندی ئایینـیو دونیایتانی تێدایـە، ﴿فَمِنكُم مَّن يَبۡخَلُ﴾ واتە: (کەچـی هەندێکتـان ڕەزیلی دەکـەن) جا چۆن ئەگەر داوای بەخشـینی ماڵەکانتـان لێ بکات، بەبـێ ئـەوەی ئێـوە ببینـن بەرژەوەندیەکـی بەپەلـەی تێدابـێ، ئایا لە پێشـتر نیە کـە ڕێگری بکـەن لەوە؟

پاشـان فەرموویەتـی: ﴿وَمَن يَبۡخَلۡ فَإِنَّمَا يَبۡخَلُ عَن نَّفۡسِهِۦ﴾ (واتـە: هەرکەسـیش ڕژدیو ڕەزیلـی بـکات ئـەوە بێگومان تەنهـا ڕەزیلی لە دژی خـۆی دەکات)، چونکە پاداشـتی خوای لـە خـۆی قەدەغـە کـردوە، وە چاکەیەکی زۆری لـە دەسـتداوە، وە هەرگیز خوا بـە وازهێنان لە بەخشـین زیانـی پێناگات.

بێگومـان خـوا ﴿ٱلۡغَنِيُّ وَأَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ﴾ (دەوڵەمەنـدو بێنیـازە ئێـوەش هەژارو بـێ نەوان) پێویسـتیتان پێیەتـی لـە هەمـوو کاتەکانتاندا بۆ هەمـوو کاروبارەکانتـان ﴿وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ﴾ لە بڕواهێنـان بـە خـواو جێبەجێ کردنـی ئـەوەی فەرمانتان پێـدەکات، ﴿يَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمۡثَٰلَكُم﴾ (واتـە: ئێـوە دەگـۆڕێ بە کەسـانێکی تر پاشـان وەکو ئێـوە نابن) لە پشـت تێکـردن. بەڵکـو گوێڕایەڵی خـواو پێغەمبەرەکەی دەکـەنو خـواو پێغەمبەرەکەیان خۆشـدەوێ، هـەروەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ ﴿٥٤﴾﴾ المائدة، (واتـە: ئـەی ئەوانـەی کـە بڕواتـان هێنـاوە هـەر کـەس لـە ئێـوە هەڵگەڕێتەوە لـە ئاینەکـەی ئـەوە بەزوویی خـوا لەباتی ئـەوان گەلو کۆمەڵێکـی تـر ئەهێنێ خـوا ئەوانی خۆشـدەوێو ئەوانیـش خوایان خۆشـدەوێ)

تەفسیری سووڕەتی (محمد) تەواو.


سورة الفتح
بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ١ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ
وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ٢
وَيَنصُرَكَ ٱللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ٣ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ
ٱلْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَٰنًا مَّعَ إِيمَٰنِهِمْ ۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ٤ لِّيُدْخِلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ
جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ
سَيِّـَٔاتِهِمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ ٱللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا ٥ وَيُعَذِّبَ
ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ ٱلظَّآنِّينَ
بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ ۚ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ۖ وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ
وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ٦ وَلِلَّهِ جُنُودُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ٧ إِنَّآ
أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ٨ لِّتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ
وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ٩

## تەفسیری سوورەتی (الفتح)

## مەدەنییە (٢٩) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿ إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢﴾ وَيَنصُرَكَ ٱللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ﴿٣﴾ ﴾:

﴿ إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴾ ئەم سەرکەوتنەی باسکرا بریتیە لە ڕێکەوتنی حودەیبیە، کاتێ هاوبەشدانەران بەرهەڵستیان کرد لە پێغەمبەر ﷺ کە ویستی عەمرە بکات وەک لە چیرۆکێکی دوورو درێژدا باسکراوە، جا لە کۆتاییدا ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ ڕێکەوتنی لەگەڵدا کردن لەسەر وەستانی جەنگ لە نێوان خۆیو ئەواندا بۆ ماوەی دە ساڵ، وە لەسەر ئەوەی ساڵی داهاتوو عەمرە بکەن، وە لەسەر ئەوەی هەر کەسێ بیەوێ بچێتە نێو هاوپەیمانی قوڕەیشەوە بچێتە نێویەوە، وە هەر کەسێکیش بیەوێ بچێتە ناو هاوپەیمانی پێغەمبەرەوە بچێتە نێویەوە.

بـە هـۆی ئـەوەوە کاتـێ کـە خەڵکـی هەندێکیـان لـە هەندێکـی تریـان ئەمین بـوون، وە بازنـەی بانگـەواز کـردن بـۆ لای ئاینـی خوا فـراوان بـوو، بـڕواداران لە هـەر جێگەیەک بیانویـستایە بانگـەوازی خۆیـان دەکـرد، وە ئـەو کەسەیشـی سـوور بـوو دەیتوانی لەسـەر حەقیقەتـی ئیسـلام بوەسـتێ، لـەو ماوەیـەدا خەڵکێکـی بێ شـومار هاتنـە ناو ئاینـی خواوە دەسـتە دەسـتە، ئـا لەبـەر ئەمەیـە خـوا ﷻ ناوینـا سـەرکەوتنی ڕوونو ئاشـکرا، چونکـە مەبەسـت لە ڕزگار کردنی وڵاتی هاوبەشـدانەران سـەربەرز بوونی ئاینی خواو سـەرکەوتنی مسـوڵمانانە، ئەمـەش بـەو سـەرکەوتنە دەسـتەبەر بـوو، وە خوا ﷻ لەسـەر ئەو سـەرکەوتنە کۆمەڵـە فەرمانێکـی ڕێکخسـت، فەرمـووی: ﴿ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ﴾ (واتـە: تـا خوا خـۆش ببێت لـە گوناهەکانی ڕابـردوو داهاتـووت) ئەویش خـوا زاناترە، بە

هـۆی ئـەوەی دەسـتەبەر بووە بـە هۆیـەوە لـە گوێڕایەڵیـە زۆرەکان، وە چوونە نـاو ئاینەوە بـە زۆری، وە لـەوەی ﷺ بەرگـەی گرتووە لەو مەرجانـەی کە جگە لە خۆڕاگـرانو خاوەن عەزمـەکان لـە پێغەمبەران نەبێ، کـەس خۆی ڕاناگـرێ، ئەمەش لە مەزنتریـنو گەورەترین ڕێزەکانـی پێغەمبـەرە ﷺ کـە خـوا لێـی خۆش بـووە لە تاوانـی رابردو داهاتوویشـی.

﴿ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ ﴾ (واتـە: نیعمەتـی خـۆی بـە تـەواوی برێـژێ بـە سـەرتدا) بـە سەرخسـتنی ئاینەکـەتو سەرخسـتنی خـۆت بەسـەر دوژمنەکانـت ﴿ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴾ (واتە: وە ڕێگای ڕاسـتت نیشـان بدات) خۆشـبەختی هەمیشـەیی‌و سەرکەوتنی هەتـا هەتایـی پـێ بەدەسـت بهێنـی ﴿ وَيَنصُرَكَ اللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ﴾ سـەرکەوتنێکی بەهێـز کە هەرگیـز ئیسـلامی پـێ لاواز نابێ، بەڵکـو سـەرکەوتنی تـەواو بەدەسـت دێو بێبڕوایانیش لەنـاو دەبـاو زەلیـلو سەرشـۆڕیان دەکات، لەگەڵ بەدەسـتهاتنی هێـزو توانای مسـوڵمانانو زیادکـردنو گەشـەکردنیماڵو سـامانیان.

(٤-٦): ﴿ هُوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ ۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٤﴾ لِّيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ اللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٥﴾ وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَاتِ الظَّانِّينَ بِاللَّهِ ظَنَّ السَّوْءِ ۚ عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ ۖ وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا ﴿٦﴾ ﴾:

﴿ هُوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربـارەی منەتـی لەسـەر بـڕواداران بـە دابەزاندنی ئارامـی‌و دڵنیایـی‌و جێگیر بـوون بۆ ناو دڵەکانیـان، لـە کاتـی دابەزاندنی ناخۆشـی‌و نارەحەتـی‌و کاروبـارە گرانەکان، کـە دڵەکان پێی دەشـڵەژێنو نەفسـەکان پێـی لاواز دەبن.

جا لە نیعمەتەکانی خوا ﷻ بۆ بەندەکەی لەم کاتەدا، ئەوەیە جێگیری بکاتو دڵی ببەستێتەوەو ئارامی بۆ سەر دابەزێنێ، بۆ ئەوەی ڕوو بەڕووی ئەم نارەحەتیانە ببێتەوە بە دڵێکی جێگیرو نەفسو دەروونێکی دڵنیا، تا بەختەوەر بێ بەو خۆڕاگریە لە بەجێهێنانی فەرمانی خوا لەم حاڵەتەدا، وە بۆ ئەوەی بە هۆی ئەوەوە ئیمانی زیاد بکاتو دڵنیایی تەواو بێت.

جـا هـاوەڵان -خوایان لـێ ڕازیبێ- کاتێ لـە نێوان پێغەمبەرو هاوبەشـدانەراندا ئـەو مەرجانە ڕوویـدا، کـە بـە ڕواڵـەت جـۆرێ لە زبـری تێدایـە لەسـەریان، وە لە شـانو شـەوکەتیانی دابەزانـدوە، دیـارە ئەوەش نەفـسو دەروون ئارامی لەسـەر ناگـرێ. کاتـێ خۆڕاگر بوونو

نەفس‌و دەروونیان لەسەری ڕاهێنا، بەو هۆیەوە ئیمان‌و بڕوایان زیادی کرد لەگەڵ ئەو ئیمانەی هەیانبوو.

کە دەفەرمویێ: ﴿ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: هەموو ئاسمانەکان‌و زەوی لە موڵکی خواو لە ژێر بەڕێوەبردنی ئەودان.

جا با هاوبەشدانەران وا گومان نەبەن خوا ئاین‌و پێغەمبەرەکەی سەرناخات، بەڵام ئەوەندە هەیە کە خوا زاناو کار لەجێیە، حیکمەتی وا دەخوازێ ڕۆژگارەکان لە نێوان خەڵکیدا بگۆڕێ‌و سەرکەوتنی بڕواداران دوا بخات بۆ کاتێکی تر (کە حیکمەتی خوا دەیخوازێ).

﴿ لِّيُدْخِلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ ﴾ ئەمە مەزنترین شتە کە بۆ بڕواداران دەستەبەر بێت، ئەوەی حەزپێکراوو داواکراوە بەدەستی بێنن، لە چوونە ناو بەهەشتەکان‌و نارەحەتیان لەسەر لابچێ، بە پاک بوونەوەیان لە گوناهەکان.

﴿ وَكَانَ ذَٰلِكَ ﴾ ئەو پاداشتەی کە باسکراوە بۆ بڕواداران ﴿ عِندَ ٱللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾ (لای خوا سەرکەوتنێکی گەورەیە) ئەمەیە خوا ﷻ لەگەڵ بڕواداراندا کردی لە سەرکەوتنی ڕوون‌و ئاشکرا.

بەڵام دوو ڕووەکان لە پیاوان‌و ژنان‌و هاوبەشدانەرانی پیاوان‌و ژنان، ئەوە بێگومان خوا سزایان دەدات بە هۆی ئەوەوە، وە نیشانیان دەدات ئەوەی زیانی هەیە بۆیان، بە هۆی ئەوەی مەبەستیان زەلیل کردنی بڕوادارانە، وە گومانی خراپیان بردوە دەربارەی خوا کە ئاینەکەی سەرناخات‌و شەی خۆی بەرز ناکاتەوە، وە خاوەنانی پووچ‌و بەتاڵ سەردەکەون بەسەر خاوەنانی حەقدا، خوا ﷻ گومانەکەی بەسەر خۆیاندا هێنایەوە، خراپەو سەرشۆڕی لە دونیادا بەسەر خۆیاندا هاتەوە ﴿ وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ﴾ (واتە: وە خوا خەشمی لێ گرتوون) بەوەی ئەنجامیانداوە لە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی، ﴿ وَلَعَنَهُمْ ﴾ (واتە: دووری خستنەوە لە میهرەبانی خۆی) ﴿ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴾ (دۆزەخی بۆ ئامادە کردوون ئای چ سەرەنجامێکی خراپە).

(٧): ﴿ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ۝٧ ﴾:

خوا ﷻ هەواڵەکەی دووبارە کردەوە بەوەی تەنها هی ئەوە ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ئەوەی لە ناویاندایە لە سەربازەکان، تا بەندەکان بزانن ئەو زاتە دەسەڵات دەبەخشێ‌و زەلیل دەکات، وە بێگومان لە داهاتووی نزیکدا سەربازەکانی سەردەخات کە دراونەتە

پاڵـی ﴿ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴿١٧٣﴾ ﴾الصافـات، (واتــە: دیاریشــە هــەر ســەربازانی ئێمــە ســەردەکەون)، ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا ﴾واتــە: بێگومــان خوا بەهێزو زاڵو دەســەڵاتدارە بەســەر هەموو شــتێکدا. وە لەگــەڵ بەهێزیو دەســەڵاتیدا کاربەجێیە لە دروســتکردنو بەڕێوەبردندا، بەڕێــوە دەچــێ لەســەر ئــەوەی حیکمــەتو ووردبینی ئــەو زاتە دەیخــوازێ.

(٨-٩): ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٨﴾ لِّتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ﴿٩﴾ ﴾

﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ ﴾واتــە: ئــەی پێغەمبەری بەڕێز ﴿ شَٰهِدٗا ﴾بە شــایەت بــۆ ئۆممەتەکەت، بــەوەی ئەنجامیانــداوە لــە چاکەو خراپە، وە بەشــایەتیدەر لەســەر وتــارو بابەتــەکان، ئەوەی حەقو ڕاســتەو ئەوەیشــی کە پووچە، وە شــایەتیدان بۆ خوا بە یەکتاناســیو تــاکو تەنهایی بە کەماڵــی لە هەمــوو ڕوویەکەوە.

﴿ وَمُبَشِّرٗا ﴾مــژدەدەر ئــەوەی گوێڕایەڵی تــۆو خوا دەکات، بە پاداشــتی دونیاییو دینیو دواڕۆژ، وە ترســێنەرە بــۆ کەســێ ســەرپێچی خــوا بــکات بە ســزای بــە پەلەو لــە داهاتوو، وە لــە تــەواوی مــژدەدانو ترســاندن ڕوون کردنەوەی کــردەوەو ڕەوشــتەکان، کە مژدەی پێــدەداتو دەیانترســێنێ، جا ئــەو پێغەمبــەرە ﷺ ڕوونکــەرەوەی خێرو شــەڕو بەختەوەریو بەدبەختــیو حەقە لــە پووچە.

ئا لەبەر ئەمە ڕێکیخســتووە لەســەر ئەوە فەرمایشــتی خــوا ﷻ: ﴿ لِّتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾ واتــە: بــە هــۆی بانگــەوازی پێغەمبــەری خــوا بۆتــان، وە فێربوونــی ئــەوەی ســوودی هەیە بۆتــان، تۆمــان نــاردووە بــۆ ئــەوەی ئەوان بــڕوا بــە خــواو پێغەمبــەر ﷺ بهێنــن، بڕواهێنانێ پێویســتکاری گوێڕایەڵــی کردنیــان بــێ لــە هەمــوو کاروبارەکانــدا ﴿ وَتُعَزِّرُوهُ ﴾واتە: پشــتیوانی لــە پێغەمبەر ﷺ بکــەن، ﴿ وَتُوَقِّرُوهُ ﴾واتە: بە مەزنو گــەورەی بزانن، بە حەقو مافەکانــی هەڵبســن، هــەروەک چۆن منەتی گــەورەی هەیە بەســەرتانەوە، ﴿ وَتُسَبِّحُوهُ ﴾ واتــە: تەســبیحاتی خوا بکــەن، ﴿ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ﴾واتە: ســەرەتای ڕۆژو کۆتاییەکەی، خــوا ﷻ لــەم دەقەدا باســی مافی هاوبەشــی کردوە لــە نێوان خواو لــە نێــوان پێغەمبەرەکەی، ئەویــش بڕواهێنانــە پێیان ئــەوەی تایبەتە بــە پێغەمبەر ﷺ بریتیە لە پشــتیوانی لێکــردنو ڕێز گرتــن، وە ئەوەیشــی تایبەتــە بــە خوا تەســبیحات کــردنو بە پــاک ڕاگرتنی لــە نوێژ یان جگــە لەوانە.

إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ
أَيْدِيهِمْ ۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَوْفَىٰ
بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٠﴾ سَيَقُولُ
لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا
فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا ۚ يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ ۚ قُلْ
فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ
نَفْعًۢا ۚ بَلْ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًۢا ﴿١١﴾ بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن
يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِى
قُلُوبِكُمْ وَظَنَنتُمْ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٢﴾ وَمَن لَّمْ يُؤْمِنۢ
بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ فَإِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَعِيرًا ﴿١٣﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ
وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٤﴾ سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا
ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ ۖ يُرِيدُونَ
أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ۚ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ ۖ
فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا ۚ بَلْ كَانُوا۟ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥﴾

(١٠): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٠﴾ ﴾:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا ﴾ ئەم بەیعەتو پەیماندانەی کە خوا ﷻ ئاماژەی پێدەکات بریتیە لە (بیعة الرضوان) کە هاوەڵان تیایدا پەیمانیاندا بە پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەوەی لێی رانەکەن، بێگومان ئەوە پەیمانو گرێبەستێکی تایبەت بوو، لە پێویستیەکانی ئەوە بوو کە رانەکەن، ئەگەر تەنها رێژەیەکی کەمیش نەبێ لێیان، وە ئەگەر لە بارودۆخێکیشدا راکردن تیایدا دروست بێ.

جا خوا ﷻ هەواڵیدا ئەوانەی کە بەیعەتو پەیمانیان پێداوی لە راستیدا، بێگومان ئەوانە ﴿ يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ ﴾ پەیمان بە خوا دەدەن، تەنانەت لە زۆر جەخت کردنەوەیدا ئەو زاتە فەرموویەتی: ﴿ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ﴾ (واتە: دەستی خوا لەسەر دەستی ئەوانەوەیە) وەکو ئەوە وایە پەیمانیان دابێ بە خواو دەستیان خستبێتە ناو دەستی خوا لەو پەیمانە، هەموو ئەمانە بۆ زیاتر جەختکردنەوەو گرنگیدانە، وە هاندانیان لەسەر وەفابوون بەو پەیمانە، لەبەر ئەمەیە فەرمویەتی: ﴿ فَمَن نَّكَثَ ﴾ (جا هەرکەس پەیمانەکەی شکاند) بە وەفا نەبوو لەگەڵ ئەو پەیمانەی بە خوای دابوو، ﴿ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ﴾ واتە: (بێگومان ئەو پەیمان شکاندنە تەنها زیانی بۆ خۆیەتی)، چونکە ئۆباڵی ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ خۆی، وە سزاکەیشی پێی دەگات.

﴿ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ ﴾ (واتە: هەرکەسیش وەفا بکات بەو پەیمانەی کە داویەتی بە خوا) واتە: بە تەواوی ئەنجامی دابێ ﴿ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ (ئەوە بەراستی خوا پاداشتی گەورەی دەداتەوە) هیچ کەس مەزنیو رێزی نازانێ تەنها ئەو کەسە نەبێ کە خوا پێی بەخشیوە.

(١١-١٣): ﴿ سَيَقُولُ لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا ۚ يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ ۚ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًۢا ۚ بَلْ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًۢا ﴿١١﴾ بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ

ﺫَٰﻟِﻚَ ﻓِﻲ ﻗُﻠُﻮﺑِﻜُﻢْ ﻭَﻇَﻨَﻨﺘُﻢْ ﻇَﻦَّ ﭐﻟﺴَّﻮْﺀِ ﻭَﻛُﻨﺘُﻢْ ﻗَﻮْﻣًۢﺎ ﺑُﻮﺭًﺍ ﴿١٢﴾ ﻭَﻣَﻦ ﻟَّﻢْ ﻳُﺆْﻣِﻦۢ ﺑِﭑﻟﻠَّﻪِ ﻭَﺭَﺳُﻮﻟِﻪِۦ ﻓَﺈِﻧَّﺂ ﺃَﻋْﺘَﺪْﻧَﺎ ﻟِﻠْﻜَٰﻔِﺮِﻳﻦَ ﺳَﻌِﻴﺮًﺍ ﴿١٣﴾ ﴾

﴿ سَيَقُولُ لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا ﴾ خوا ﷻ سەرزەنشتی ئەوانە دەکات کە بەجێمابوون لە پێغەمبەری خوا لە غەزاو جیهاد کردن لە پێناو خوادا، لە عەرەبە دەشتەکیەکان ئەوانەی ئیمانیان لاواز بوو، نەخۆشیو گومانی خراپیان هەبوو بە خوا لە دڵەکانیاندا، بێگومان ئەوان بیانوو دێننەوە بەوەی کە سامانو خاوو خێزانیان سەرقاڵیان کردن لە دەرچوون بۆ جیهاد کردن لە پێناوی خوادا.

ئەوان داوایانکرد لە پێغەمبەر ﷺ کە داوای لێبوردنیان بۆ بکات، خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ ﴾ (واتە: ئەوەی بە زمانیان دەیڵێن لە دڵیاندا نیە) جا داواکردنی لێبوردنیان لە پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیە لەسەر پەشیمان بوونەوەو دانپێدانیان لەسەر نەفسیان بە گوناە، وە ئەوان بە جۆرێ بەجێمانو دواکەوتن پێویست بە داوای لێخۆشبوونو تەوبە بکات. جا ئەگەر ئەوەی لەسەر زمانیان بوو لەناو دڵیشیان بووایە، ئەوە داوای لێبوردنی پێغەمبەر ﷺ سوودمەند دەبوو بۆیان، چونکە داوای لێخۆشبوونیان کردو گەڕانەوە، بەڵام ئەوەی لە دڵی ئەواندا بوو بێگومان ئەوان لەبەر ئەوە دواکەوتن گومانی خراپیان بە خوا ﷻ دەبرد.

جا گومانیان برد ﴿ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا ﴾ واتە: (کە پێغەمبەرو ئیمانداران) دەکوژرێنو لە بنجو بنەوانە دەردەهێنرێن، بەردەوام ئەم گومانە لە دڵیاندا دەرازایەوەو دڵنیا بوون پێیو دامەزرا، وە هۆکاری ئەوەش دوو شت بوو:

یەکەم: بێگومان ئەوان ﴿ قَوْمًۢا بُورًا ﴾ واتە: گەلێکی لەناو چوو بوون، هیچ خێرێکیان تێدا نەبوو، جا ئەگەر خێریان تێدا بووایە ئەوە لە دڵەکانیاندا نەدەبوو.

دووەم: لاوازی ئیمانو دڵنیاییان بە پەیمانی خواو سەرخستنی ئاینەکەیو بەرزکردنی وشەکەی، لە بەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَمَن لَّمْ يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾ (واتە: هەر کەس بڕوای نەهێنا بە خواو پێغەمبەرەکەی) بێگومان ئەوە بێباوەڕێکە شایستەیە بە سزا، ﴿ فَإِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَعِيرًا ﴾ (واتە: ئەوە بە ڕاستی ئێمە ئامادەمان کردوە بۆ ئەو بێبڕوایانە ئاگرێکی هەڵگیرساو).

(١٤): ﴿ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٤﴾ ﴾

﴿ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: خوا تاکو تەنهایە بە موڵکی ئاسمانەکانو زەوی، هەڵسوکەوتیان تێدا دەکات چۆنی بوێ، لە بڕیارە قەدەریو بڕیاری شەرعیو بڕیارە پاداشتیەکان،

لەبەر ئەمەیە باسی بڕیاری پاداشتی کردوە کە ڕێکخراوە لە سەر بڕیارە شەرعیەکان، جا فەرموویەتی: ﴿يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ﴾ ئەویش ئەو کەسەیە فەرمانەکانی خوای جێبەجێ کردبێ ﴿وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ﴾لەو کەسەی کەمتەرخەمی کردبێ لە فەرمانەکانی خوا، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ سیفەتی پەیوەست کە لێی دانابڕێ ئەویش لێبوردنو میهرەبانیە.

جا خوا بەردەوام لە هەموو کاتەکاندا لە گوناهباران دەبورێو چاوپۆشی دەکات لە هەڵەکاران، وە تەوبەی تەوبەکارانیش وەردەگرێو چاکەی بەردەوامی دادەبارێنێ بەدرێژایی شەوو ڕۆژ.

(١٥): ﴿سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا بَلْ كَانُوا۟ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥﴾﴾

﴿سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا﴾ کاتێ خوا ﷻ باسی بەجێماوانو دواکەوتووانی کرد، وە سەرزەنشتو سەرکۆنەی کردن، ئنجا باسی یەکێک لە سزا دونیاییەکانیانی کرد، بێگومان پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی ئەگەر دەرچووبایەن بۆ دەستکەوتو غەنیمەتەکان کە کوشتارو جەنگیان تێدانیە، بۆ ئەوەی بیانهێنن، دوو ڕووەکان داوای هاوڕێیەتیو بەشدار بوونیان دەکردو دەیانوت: ﴿ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ يُرِيدُونَ﴾(واتە: لێمان گەڕێن با شوێنتان بکەوین دەیانەوێ) بەو شوێنکەوتنو بەشدار بوونە ﴿أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ﴾(وتەی خوا بگۆڕن) کاتێ بڕیاریدا بە سزادانیانو تایبەت کردنی هاوەڵە بڕوادارەکان بەوماڵو دەستکەوتانە بە پێی شەرعو قەزاو قەدەر.

﴿قُل﴾پێیان بڵێ: ﴿لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ﴾(واتە: هەرگیز نابێ شوێنمان بکەون چونکە خوا دەربارەتان هەروای فەرمووە) بێگومان ئێوە بێبەشن لەو دەستکەوتانە، بە هۆی ئەو تاوانەی بەسەر خۆتان هێناتانو بە هۆی ئەوەی یەکەمجار وازتان لە جەنگو کوشتار هێنا.

﴿فَسَيَقُولُونَ﴾ لە وەڵامی ئەم قسەیەدا، کە ڕێگریان لێکردن لە دەرچوون، وتیان: ﴿بَلْ تَحْسُدُونَنَا﴾ (بەڵکو حەسودیو ئێرەییمان پێ دەبەن) لەسەر دەستکەوتو غەنیمەتەکان، ئەمە ئەوپەڕی زانستیان بوو لەو جێگایەدا، جا ئەگەر ژیرو تێگەیشتوو بوونایە، دەیانزانی بێبەشبوونیان بە هۆی سەرپێچی کردنیانەوەیە، وە بێگومان سەرپێچیەکان سزای دونیاییو دواڕۆژییان بۆ هەیە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿بَلْ كَانُوا۟ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾(واتە: وانیە بەڵکو ئەوان زۆر کەم تێدەگەن).

قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ
تُقَٰتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ ۖ فَإِن تُطِيعُوا۟ يُؤْتِكُمُ ٱللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا ۖ
وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦﴾ لَّيْسَ
عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ ۗ
وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا
ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٧﴾ ۞ لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ
عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِى
قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ
كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٩﴾ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ
مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيْدِىَ
ٱلنَّاسِ عَنكُمْ وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَٰطًا
مُّسْتَقِيمًا ﴿٢٠﴾ وَأُخْرَىٰ لَمْ تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهَا قَدْ أَحَاطَ ٱللَّهُ بِهَا ۚ
وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَوْ قَٰتَلَكُمُ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ لَوَلَّوُا۟ ٱلْأَدْبَٰرَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٢٢﴾ سُنَّةَ
ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾

**(١٦-١٧):** ﴿ قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ
سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَٰتِلُونَهُمْ أَوْ
يُسْلِمُونَ ۖ فَإِن تُطِيعُوا۟ يُؤْتِكُمُ ٱللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا ۖ
وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا
أَلِيمًا ﴿١٦﴾ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى
ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ ۗ وَمَن يُطِعِ
ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا
ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٧﴾ ﴾

**دوای ئـەوەی خوا ﷻ باسـی دواکەوتووانو بەجێماوانی کرد لە دەشـتەکیەکان، ئەوانەی خۆیـان دواخسـت لە جیهاد کرد لـە پێناوی خـوا، وە بیانـووی نارەوایـان دەهێنایـەوە، ئەوانـە داوای دەرچوونیـان دەکـرد ئەگـەر جەنـگو جیهـادو نارەحەتی تێـدا نەبووایە، بەڵکـو تەنهـا بـۆ بەدەسـتهێنانی غەنیمـەتو دەسـتکەوت، خـوا ﷻ وەک تاقیکردنەوەیەک پێیانـی فەرمـوو: ﴿ قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ ﴾ (بڵـێ: بـە جێمـاوان لـە غـەزا لە عەرەبـە دەشـتەکیەکان) لە مـەولا پێغەمبـەر ﷺ بانگتـان دەکات، وە ئەوەیشـی لـە جێگای ئەو دادەنیشـێ لە خەلیفـەکانو پێشـەوا کار بەدەسـتەکان (بۆ جەنگ لـە دژی گەلێکـی بـە هێزی جەنگـاوەر) ئەوانیش گەلی فـارسو ڕوومەکانن، وە ئەوەیشـی هاوشـێوەی ئەوانـە ﴿ تُقَٰتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ ﴾ (واتـە: دەبـێ جەنگیـان لەگـەڵ بکـەن، یان خۆیـان مسـوڵمان بـن) یان ئەمـە، وە یان ئـەوە. ئەمـەش حەقیقـەتو ڕاسـتیەکەیە، ئەوان لـە کاتی کوشـتاریانو جەنگ کـردن لەگەڵ ئـەو گەلانە، ئەگـەر بەهێـزیو جەنگاوەریان لەگەڵـدا بـێ، ئەوە ئـەوان لەو حاڵەتـەدا قبووڵی ئـەوە ناکەن سـەرانە بدەن، بەڵکو یـان دێنە نـاو ئیسـلامەوە، یـان جەنـگ دەکەن لەسـەر ئـەو بەرنامەیەی کە لەسـەرین.**

**کاتـێ مسـوڵمانان کوشـتاریان کـردنو لاوازو زەلیـل بـوون، هێـزو توانایـان نەمـا، ئنجـا وایـان لێهات یان مسـوڵمان دەبوون، یان سـەرانە بـدەن ﴿ فَإِن تُطِيعُوا۟ ﴾ ئـەو بانگخوازەی بانگتـان دەکات بـۆ جەنگ لە دژی ئـەوان ﴿ يُؤْتِكُمُ ٱللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا ﴾ واتـە: ئەویش ئەو**

پاداشتەیە خـواو پێغەمبەرەکـەی دایانناوە لەسـەر جیهـاد کردن لـە پێناویدا.
﴿ وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ كَمَا تَوَلَّيۡتُم مِّن قَبۡلُ ﴾ (واتـە: ئەگـەر سـەرپێچی بکـەن هەر وەک چـۆن لەوەو پێـش سـەرپێچیتان کـرد) لـە کوشـتار کردنـی ئەوانـەی پێغەمبـەر ﷺ بانگی کـردوون بۆ کوشـتار کـردن لە دژیان ﴿ يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾ (واتە: خوا سـزایەکی سـەختتان دەدات). ئـەم دەقـە دەبێتە بەڵگە لەسـەر فەزڵو چاکەی خەلیفە ڕاشـدیەکان، ئەوانەی کـە بانگەوازیان کـرد بـۆ جیهاد کردنـی خەڵکانی بـە توانـاو بەهێز، بێگومـان پێویسـتە گوێڕایەڵـی بکرێن لـەو بانگەوازەدا.

پاشـان خـوا ﷻ باسـی ئەو عـوزرو بیانووانە دەکات کە دەبنـە مایەی ئەوەی بەنـدە دەرنەچێ بۆ جیهاد کـردن، فەرموویەتـی: ﴿ لَّيۡسَ عَلَى ٱلۡأَعۡمَىٰ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡأَعۡرَجِ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞۗ ﴾ واتـە: لـە دواکەوتن لـە جیهاد کـردن بە هۆی ئـەو بیانووەیان کـە ڕێگرە.
﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾ لـە جێبەجـێ کردنـی فەرمانەکانیـانو دوورکەوتنـەوە لـە قەدەغەکراوەکانیـان، ﴿ يُدۡخِلۡهُ جَنَّـٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَـٰرُۖ ﴾ بەهەشـتانێ تیایـدا هەیـە ئـەوەی نەفـس ئـارەزووی دەکاتو چـاو لەزەتی لـێ ئەبینـێ، ﴿ وَمَن يَتَوَلَّ ﴾ (هەر کەس پشـت هەڵبکات) لـە گوێڕایەڵـی خـواو پێغەمبەرەکـەی، ﴿ يُعَذِّبۡهُ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴾ جا هەموو بەختەوەریـەک لـە گوێڕایەڵـی خوادایـە، وە هەموو بەدبەختیـەک لە سـەرپێچی کردنی ئەو دایە.

(١٨-٢١): ﴿ لَّقَدۡ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ يُبَايِعُونَكَ تَحۡتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيۡهِمۡ وَأَثَـٰبَهُمۡ فَتۡحٗا قَرِيبٗا ١٨ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةٗ يَأۡخُذُونَهَاۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ١٩ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةٗ تَأۡخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمۡ هَـٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيۡدِيَ ٱلنَّاسِ عَنكُمۡ وَلِتَكُونَ ءَايَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ وَيَهۡدِيَكُمۡ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا ٢٠ وَأُخۡرَىٰ لَمۡ تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهَا قَدۡ أَحَاطَ ٱللَّهُ بِهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٗا ٢١ ﴾:
﴿ لَّقَدۡ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ يُبَايِعُونَكَ تَحۡتَ ٱلشَّجَرَةِ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات بـە چاکـەو میهرەبانـی خـۆی، بـە ڕازیبوونـی لـەو بڕوادارانـەی کـە پەیمـانو بەڵێنیاندا بە پێغەمبـەر ﷺ، ئـەو پەیمانـەی کـە ڕوویانی سـپیکردو بەختـەوەری دونیاو دواڕۆژیـان پێی بەدەستهێنا.

جـا هـۆکاری ئـەو پەیماننامەیە -کـە پێی دەوتـرا: (بیعة الرضوان) لـە بـەر ڕەزامەندی خوا بـوو تیایـدا لە بـڕواداران، وە پێـی دەوترا: (بیعة أهل الشجرة)- بێگومـان پێغەمبەر ﷺ کاتێ

قسـە کەوتـە نێوانی ئـەو و نێـوان هاوبەشـدانەران لـە ڕۆژی حودەیبیـە، دەربـارەی هاتنی، بێگومـان ئـەو بـۆ کوشـتاری هیچ کەسـێک نەهاتبـوو، بەڵکـو بۆ زیارەتـی ئەوماڵـە مەزنە (کەعبـە) هاتبوو.

جـا پێغەمبـەر ﷺ عوسـمانی کـوڕی عەففانـی نـارد بـۆ مەککـە دەربـارەی ئـەو زیارەتـە، هەواڵێکی ناڕاسـتی بۆ هات، کە هاوبەشـدانەران عوسـمانیان کوشـتووە، پاشـان پێغەمبەر ﷺ ئـەو بڕوادارانـەی کۆکـردەوە کـە لەگەڵیـدا بـوون، ڕێژەیان دەگەیشـتە نزیکـەی هەزارو پێنـج سـەد کـەس، لە ژێـر ئـەو دارەدا پەیمـانو بەڵێنیـان پێدا لەسـەر جەنگو کوشـتاری هاوبەشـدانەران، وە بـە هیـچ شـێوەیەک ڕانەکەن تـا دەمرن.

جـا خـوا ﷻ هەواڵیـدا کـە بێگومان ئـەو ڕازیبـوە لـەو بڕوادارانە لـەو حاڵەتەدا کـە بریتیە لـە گەورەتریـن گوێڕایەڵـیو نزیک بوونەوە لێـی ﴿ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ ﴾(جا خـوا ئاگادار بـوو بـەوەی لـە دڵیاندایە) لە ئیمـان ﴿ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ ﴾(بۆیـە دڵنیایـیو ئارامی بۆ نـاردن) وەکو سـوپاس کردنێ بۆیان لەسـەر ئەوەی لە نـاو دڵیاندایە، وە زیاتـر هیدایەتیدان. وە ئاگـادار بـوو بـەوەی لەنـاو دڵەکانیاندایـە لـە نائارامـیو پەسـتی، لـەو مەرجانـەی کـە هاوبەشـدانەران دایاننابـوو لەسـەر پێغەمبـەری خـوا، ئارامیەکـی بـۆ نـاردن کـە جێگیـری کـردن، وە دڵیانـی پـێ ئـارام بوویـەوە، ﴿ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴾ئەویش فەتحـی خەیبەر بـوو، کـەس ئامـادەی نەبـوو جگـە لـە خاوەنانـی حودەیبیە.

جـا تایبەت کران بە خەیبەرو دەسـتکەوتەکانی وەک پاداشـتێک بۆیانو سوپاسـگوزاریەک لەسـەر ئەوەی کردوویانە، لـە گوێڕایەڵی خواو بەجێهێنانـی ڕەزامەندیەکانی.

﴿ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾خاوەنـی ئەو هێـزو توانایەیە کە زاڵە بەسـەر هەمـوو شـتەکاندا، جا ئەگـەر بیـەوێ بێبڕوایـان سـەردەخات لە هەمـوو جەنگێکی نێـوان ئـەوانو ئیمانـداران. بـەڵام کاربەجـێو دانایـە، هەندێکیان بـە هەندێکـی دیکە تاقی دەکاتـەوە، وە بڕواداریـش بـە بێبڕوا تاقـی دەکاتەوە.

﴿ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا ﴾ ئەمـە هەمـوو دەسـتکەوتێک دەگرێتـەوە بـڕواداران بەدەسـتی بهێنـن تـا ڕۆژی دوایـی، ﴿ فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ ﴾واتـە: غەنیمـەتو دەسـتکەوتی خەیبـەر، تەنهـا ئـەوە مەژمێـرن، بەڵکـو دەسـتکەوتێکی زۆر بەدوایـدا دێ.

﴿ وَكَفَّ أَيْدِيَ ٱلنَّاسِ ﴾ستایشـی خـوا بکـەن، کاتـێ کـە (دەسـتی خەڵکی مەککـەی لێتان کۆتـا کـرد) ئەوانـەی بە توانا بـوون لە جەنگو کوشـتارکردنتانو سـوور بوون لەسـەری،

﴿ عَنكُمْ ﴾جا ئەوە نیعمەتە، وە ئاسانکاریە بۆتان.
﴿ وَلِتَكُونَ ﴾ئەم دەستکەوتە ﴿ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾(ببێتە بەڵگەیەک بۆ بڕواداران) بیکەن بە بەڵگە لەسەر ڕاستی هەواڵو پەیمانی ڕاستەقینەی خواو پاداشتی بۆ بڕواداران، جا ئەو زاتەی کە داینـاوە بێگومان جگە لەوەش دادەنێت.
﴿ وَيَهْدِيَكُمْ ﴾ تا ڕێنماییتان بکات بەوەی بۆی داناون لە هۆکارەکان ﴿ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴾لە زانستو ئیمانو کردەوە ﴿ وَأُخْرَىٰ ﴾هەروەها پەیمانی پێداون بە دەستکەوتی دیکە ﴿ لَمْ تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهَا ﴾(کە هێشتا دەسەڵاتتان نیە بەسەریەوە) لە کاتی ئەم دواندنەدا.
﴿ قَدْ أَحَاطَ ٱللَّهُ بِهَا ﴾واتە: ئەو زاتە بە دەسەڵاتە بەسەریەوەو لە ژێر موڵکو بەڕێوەبردنی ئەو دایە، بێگومان پەیمانی پێداون، هەر دەبێ پەیمانی خوا بێتەجێ، بە هۆی تەواوی دەسەڵاتی ئەو زاتە، لە بەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴾(واتە: خوا هەمیشە بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە).
(٢٢-٢٣): ﴿ وَلَوْ قَٰتَلَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوَلَّوُا۟ ٱلْأَدْبَٰرَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٢٢﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ ﴾
﴿ وَلَوْ قَٰتَلَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾ئەمە موژدەیەکە لەلایەن خواوە بۆ بەندە بڕوادارەکانی، بە سەرخستنیان لەسەر دوژمنە بێبڕواکانیان، وە بێگومان ئەوان ئەگەر ڕووبەڕوویان ببنەوەو بیانکوژن ﴿ لَوَلَّوُا۟ ٱلْأَدْبَٰرَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا ﴾(بێگومان تێدەشکانو هەڵدەهاتن پاشان دەستیان نەدەکەوت هیچ پشتیوانێک) پشتیوانیان لێ بکات ﴿ وَلَا نَصِيرًا ﴾سەریان بخاتو یارمەتیان بدات لەسەر کوشتار کردنیان، بەڵکو ئەوان سەرشۆڕو دۆڕاون، ئەمەش سوننەتی خوایە لە ئوممەتەکانی پێشوودا، کە بێگومان سەربازانی خوا هەردەم سەرکەوتوون ﴿ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴾ (واتە: هەرگیز باوو سوننەتی خوا گۆڕانی بۆ نیە).

وَهُوَ ٱلَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ
بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٢٤﴾
هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ
وَٱلْهَدْىَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ ۚ وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَآءٌ
مُّؤْمِنَٰتٌ لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَـُٔوهُمْ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌۢ
بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ لِّيُدْخِلَ ٱللَّهُ فِي رَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ لَوْ تَزَيَّلُوا۟ لَعَذَّبْنَا
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٢٥﴾ إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
فِي قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ
عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ
وَكَانُوٓا۟ أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٢٦﴾
لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ
ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ
لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ
فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ
ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾

(٢٤-٢٥): ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٢٤﴾ هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْهَدْىَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ ۚ وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَآءٌ مُّؤْمِنَٰتٌ لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَـُٔوهُمْ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌۢ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ لِّيُدْخِلَ ٱللَّهُ فِي رَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ لَوْ تَزَيَّلُوا۟ لَعَذَّبْنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٢٥﴾ ﴾:

خوا ﷻ منەت دەكات بەسەر بڕواداران بە سەلامەتیان لە شەڕو خراپەی بێبڕوایانو كوشتار كردنیان، فەرموویەتی: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ ﴾، واتە: خەڵكی مەككە، ﴿ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ﴾ واتە: دوای ئەوەی ئێوە دەسەڵاتتان بوو بەسەریدا، وە هاتنە ژێر دەسەڵاتی ئێوە بێ پەیمانو بەڵێنێ، ئەوانیش بریتی بوون لە هەشتا پیاو لێژ بوونەوە بۆ سەر مسوڵمانان، تا لە ناكاوێكدا بیان پێكن، بینیان بڕواداران بە ئاگان، مسوڵمانان ئەوانیان گرتو پاشان وازیان لێیان هێناو نەیانیان كوشت، بە هۆی ڕەحمەتێ لە لایەن خواوە بۆ بڕواداران كاتێ نەیانیان كوشت. ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴾ پاداشتی هەر كەسێك دەداتەوە بە پێی كردەوەكەی خۆی، ئێوەش بەڕێوەدەبات ئەی بڕواداران بە بەڕێوەبردنێكی جوان.

﴿ هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ﴾ پاشان خوا ﷻ باسی هۆكاری وروژێنەر دەكات لەسەر كوشتاری هاوبەشدانەران، ئەویش بێبڕواییانە بە خواو پێغەمبەرەكەی‌و بەرهەڵستی كردنیانە لە دژی پێغەمبەر ﷺو ئەوانەی لەگەڵیدان لە بڕواداران، كە بچنە ناوماڵی پیرۆزەوە بە زیارەت كردنو بە گەورەدانانی بە حەجو عومرە كردن.

هەروەها ئەوانە بەرهەڵستیان كرد لە ﴿ وَٱلْهَدْىَ مَعْكُوفًا ﴾ واتە: (قوربانیە) بەندكراوەكان

﴿ أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ ﴾ واتــە: بگاتــە شــوێنی ســەربڕینی خۆی كــە مەككەیە، ڕێگریــان كرد لە گەیشــتنی پێــی بە هــۆی ســتەمو دژایەتیەوە، هەمــوو ئــەم كاروبارانــە پێویســتكەرو پاڵنەر بوون بــۆ كوشــتار كردنیان.

بــەڵام ڕێگریــەك هەیــە ئەویــش بوونــی پیــاوانو ئافرەتانی بــڕوادارە لــە نێــوان هاوبەش دانەرانــدا، جیانەكرانەتــەوە لە شــوێنی خۆیــان، یان لە جێگەیــەك كە زیانیــان پێنەگات. جا ئەگــەر پیــاوانو ئافرەتانی ئیمانــدار نەبووایە كە مســوڵمانان نەیاندەناســین، ﴿ أَن تَطَـُٔوهُمْ ﴾ واتــە: لــە ترســی ئــەوەی نەیانكــوژن، ﴿ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌۢ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾ (جــا بــە هۆیانــەوە تووشــی تــاوان دەبــوون)، (المعرة): بریتیە لــەوەی دەچێتە نــاو كوشــتارتانەوە، لە تووشــبوونیان بــە زیــانو نارەحەتی.

وە ســوودێكی دوارۆژیــش، ئەویــش ئەوەیــە دەیخاتە نــاو میهرەبانی خۆیەوە كێــی بوێ، جا منــەت دەكات بەســەریاندا بــە بڕواهێنان دوای بێبڕوایــی، وە بە هیدایــەت دوای گومڕابوون، جــا ڕێگریتان لێــدەكات لە كوشــتاركردنیان لەبەر ئــەم هۆكارە.

﴿ لَوْ تَزَيَّلُوا۟ ﴾ واتــە: بەڵام ئەگەر لــە بێبڕوایان جیــا بوونایەتەوە، ﴿ لَعَذَّبْنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾ (واتــە: بێگومــان كافرەكانیانمــان ســزا دەدا بــە ســزادانێكی بە ئێش) بەوەی ڕەوامان دەكرد بۆتان كوشــتاریانو مۆڵەتمان پێدەداو ســەرمان دەخســتن بەســەریاندا.

(٢٦): ﴿ إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ وَكَانُوٓا۟ أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٢٦﴾ ﴾

خوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ ﴾ (واتە: كاتــێ ئەوانــەی بێبڕوان دەمارگیریان خســتە دڵیانەوە كــە دەمارگیری نەفامیــە) كاتێ ڕەتیان كــردەوە نووســینی ((بســم الله الرحمــن الرحیــم)) وە ڕێگریــان كــرد لــەوەی پێغەمبەر ﷺ و بــڕواداران بچنــە مەككە لەو ســاڵەدا، تــا خەڵكی نەڵێــت: چوونە مەككەوە زاڵبوون بەســەر قوڕەیشدا.

ئــەم كارەو وێنــەی ئەوانــە لــە كاری نەفــامو جاهیلەكانــە، بــەردەوام لــە دڵیانــدا بــوو تــا پێویســتی كــرد بۆیان زۆرێك لــە ســەرپێچیەكان ﴿ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ (واتــە: جا خــواش ئارامیو دڵنیایی خــۆی ناردە خوارەوە بــۆ پێغەمبەرەكەیو ئیمانــداران) تووڕەیــی وای لێنەكــردن لــە ڕووبەڕوو بوونــەوەی هاوبەشــدانەران وەك چۆن

ئـەوان ڕووو بەڕوویـان بوونـەوە، بەڵکـو ئارامیان گرت لە بڕیـاری خوا، وە پابەنـد بوون بەو مەرجانـەی کـە مەزنـی قەدەغەکراوەکانی خوای تێدایـە، ئەگەر هەرچی بووایـە، وە گوێیان نـەدا نـە بـە قسـەی قسـەکاران، وە نـە بـە لۆمـەو سەرزەنشـتی لۆمـەکاران، ﴿وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ﴾ (وە بڕوادارانـی پابەنـد کرد بە وشـەی خۆپارێزی) ئەویـش بریتی بوو لـە (لا إلـه إلا الله) وە مافەکانـی، وە پابەنـدی کـردن بە هەسـتان پێی، جا ئەوانیـش پابەند بوونو پێی هەسـتان.

﴿وَكَانُوٓاْ أَحَقَّ بِهَا﴾ (ئـەوان بەو وشـەیە شـیاوتر بـوون) لە جگە لـە خۆیان، ﴿وَأَهْلَهَا﴾ وە ئـەوان شایسـتە بـوون لـەوەی خـوا ﷻ خێـرو چاکەی لـە دڵیانـدا دانابوو، لەبـەر ئەمەیە فەرموویەتـی: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾ (واتـە: خـوا بـە هەمـوو شـتێک ئاگادارو زانایە).

(٢٧-٢٨): ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُواْ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ﴾ (واتـە: بێگومـان خـوا ئـەو خـەوەی پێغەمبەرەکـەی دیبـووی بـە ڕاسـتی گێـڕاو هێنایـە دی) ئەویـش ئـەوە بوو کـە پێغەمبـەر ﷺ لـە مەدینـە خەوێکـی بینـی هەواڵیـدا پێـدا بـە هاوەڵانـی، کە ئـەوان لە داهاتوویەکـی نزیکـدا دەچنـە نـاو مەککـەو تەوافـی ماڵی پیـرۆز دەکـەن، کاتـێ ئەوەی حودەیبیـە ڕوویـدا کـە ڕوویـدا، وە گەڕانەوە بەبێ ئـەوەی بچنە ناو مەککـە، دەنگە دەنگو قسـەکردن لەناویانـدا بـڵاو بوویـەوە، تا بە پێغەمبـەری خوایـان وت: ئایا هەواڵـت پێنەداین کـە ئێمـە دەچینـە ماڵی پیـرۆزو تەوافـی تێـدا دەکەین، ئەویـش فەرمـووی: (أخبرتكم أنه العـام) هەواڵـم پێـدان کە ئەمسـاڵە؟ وتیـان: نەخێر، فەرمـووی: ((فإنكـم ستأتونهم وتطوفون بـه)) واتـە: بێگومـان ئێوە بـەم نزیکانە دەچنـە ماڵی پیرۆزو تـەواف دەکەن. خـوا ﷻ لێرەدا فەرمـووی: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ﴾ واتـە: هـەر دەبـێ ڕووبداو ڕاسـتی خەونەکـەی ئاشـکرابێت، درەنـگ هاتنـە دی خەوەکـە ئـەو بەڵێنە ناشـرین ناکات.

﴿لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ﴾ واتـە: لـەم حاڵـەی کـە مەزنـی ئـەم ماڵـە پیـرۆزە دەخـوازێ، وە جێبەجـێ کردنـی قوربانیەکانتـانو

تەواوکردنی بە سەرتاشینو کورت کردنەوە بەبێ ترس.
﴿ فَعَلِمَ ﴾ لە سوودو بەرژەوەندیەکان، ﴿ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ ﴾ واتە: چوونە نێو ماڵی پیرۆزەوە بەو سیفەتە ﴿ فَتْحًا قَرِيبًا ﴾ (سەرکەوتنێکی نزیک).
کاتێ کە ئەم ڕووداوە دڵی هەندێ لە بڕوادارانی شپرزەو ئاڵۆز کرد، وە حیکمەتەکەیشی لە لایان شاردەوە، خوا ﷻ حیکمەتو سوودەکەی ڕوون کردەوە، بە هەمان شێوە سەرجەم بڕیارە شەرعیەکانیشی، بێگومان هەموویان ڕێنمایی‌و میهرەبانین، هەواڵیدا بە بڕیارێکی گشتی‌و، پاشان فەرمووی: ﴿ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ ﴾ (واتە: خوا ئەو زاتەیە کە پێغەمبەرەکەی ناردوە بە ڕێنمایی) بریتیە لە زانستی بە سوود کە ڕێنمایی کەسی گومڕا دەکات، وە ڕێگاکانی خێرو شەڕ ڕوون دەکاتەوە، ﴿ وَدِينِ الْحَقِّ ﴾ واتە: ئەو ئاینەی وەسفکراوە بە حەقو ڕاستی، ئەویش دادپەروەری‌و چاکەو میهرەبانیە، کە بریتیە لە هەموو کردەوەیەکی چاک، پاککەرەوەیە بۆ کردەوەکانو پاڵفتەکاری نەفس‌و دەروونەکانو پەروەردەکەری ڕەوشتەکانە.
﴿ لِيُظْهِرَهُ ﴾ (تا ئاشکرای بکات) بەوەی خوا ناردوویەتی پێی، ﴿ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ ﴾ (بەسەر هەموو ڕێبازەکاندا) بە بەڵگەو سەلماندن، وە ببێتە پاڵنەرێک بۆ ملکەچبوونیان بە شمشێری تیژ کراو.

(٢٩): ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا ﴿٢٩﴾ ﴾:

مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا ﴿٢٩﴾

﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی پێغەمبەرەکەی‌و هاوەڵانی لە کۆچکەران‌و دانیشتوان، کە بێگومان ئەوان خاوەنی تەواوترینی سیفاتەکان‌و گەورەترینی بارودۆخەکانن، وە بێگومان ئەوان ﴿ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ ﴾ واتە: توندوتیژن لە دژایەتی کردنیاندا، ئەوەی لە توانایاندا بێ بۆ ئەو مەبەستە دەیخەنە گەڕ، هیچیان لێ نابینرێ جگە لە توندوتیژی‌و ڕەقی نەبێ. ئا لەبەر ئەمەیە دوژمنەکانیان بۆیان سەرشۆڕ بوون‌و تێکشکاون، وە مسوڵمانان زاڵ بوون بەسەریاندا، ﴿ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡ ﴾ یەکیان خۆشدەوێ‌و بە بەزەیی‌و بە سۆزن لەگەڵ یەکتردا، وەکو یەک جەستە وان، هەتا یەکێکیان ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەیشی پێی خۆشە، ئەمە مامەڵەکردنیانە لەگەڵ خەڵکیدا.

بەڵام مامەڵە کردنیان لەگەڵ بەدیهێنەردا بێگومان تۆ، ﴿ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا ﴾ واتە: وەسفیان زۆری نوێژ کردنە کە گەورەترین پایەکانی ناو نوێژ بریتیە لە کڕنۆش‌و سوژدە بردن.

﴿ يَبۡتَغُونَ ﴾ بەو پەرستشەیان داوا دەکەن، ﴿ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗا ﴾ واتە: ئەمە مەبەستیانە بگەن بە ڕەزامەندی خواو پاداشتی ئەو زاتە. ﴿ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ﴾ واتە: بەندایەتی کاریگەری دروستکردوە لە ڕووخساریاندا تا ڕووناکی کردۆتەوە.

کاتێ کە ناخیان بە نوێژ کردن ڕووناک بووەتەوە ڕواڵەتیشیان بە گەورە دانان

ڕوونـاک بوویـەوە، ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئـەوەی کـە باسـکرا ﴿مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ﴾ واتـە: ئەمـە وەسـفیانە کـە خـوا وەسـفی پـێ کـردوون لـە تەوراتدا.
بـەڵام نموونەیـان لـە ئینجیلـدا، بێگومـان ئـەوان وەسـفکراون بە وەسـفێکی دیکـە، ئەوان لـە تەواویـانو یارمەتیدانی یەکتریـان، ﴿كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ﴾ واتـە: ڕووەکەکەی دەرهێنـاو چەکـەرەی کـردووەو ئنجـا چەکەرەکـەی بەهێـز کـردوە لـە گەنجێتـی، ﴿فَٱسۡتَغۡلَظَ﴾ ئـەو کشـتوکاڵە، واتـە: بەهێـز بـووە، ﴿فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ﴾ (واتە: جا لەسـەر قـەدی خـۆی ڕێـک وەسـتا بێـت) کـۆی قـەد، ﴿يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ﴾ (جوتیارەکانی سەرسـام کردبێـت) لـە تـەواویو ڕێکـیو جوانیدا.
بـە هەمـان شـێوە هـاوەڵان -خـوا لێیـان ڕازی بێـت- وەکـو کشـتوکاڵ وان لـە سـوودو قازانجیـان بـۆ خەڵکی، وە پێویسـتی خەڵکی بۆیان، جـا هێزی ئیمـانو کردەوەکانیان وەکو هێـزی ڕەگو ڕیشـەی دار وایـە، وە ئەو کەسـەی منداڵەو درەنگ مسـوڵمان بـووە بێگومان گەیشـتووە بـە گـەورەی پێشـوو، یارمەتیو هـاوکاری کردوە لەسـەر ئەوەی کە لەسـەری دەرِوات لـە بەجێهێنانـی ئاینـی خـواو بانگـەواز کـردن بـۆ لای، وەک ئـەو کشـتوکاڵەی چەکـەرەی کردوەو سـەوز بـووە، ئنجـا چەکەرەکـەی قایمو بەهێـز بووە.
لەبـەر ئەمەیە فەرموویەتـی: ﴿لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَ﴾ (واتە: تا بە زۆر بوونـی هاوەڵانی داخو مـەراق بدات بـە کافران) کاتـێ یەک دەنگـیو کۆبوونەوەیـان دەبینن لەسـەر ئاینەکەیان، وە کاتـێ ڕووبـەڕووی یـەک دەبنـەوە هەردوولایـان لـە کاتـی جەنـگو شمشـێر بازیو دەنگـە دەنگی کوشـتار کردن.
﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةً وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا﴾ جـا هـاوەڵان خـوا لێیـان ڕازی بێـت ئەوانـەی کۆیان کـردەوە لە نێـوان بڕواهێنانو کـردەوەی چاک، خوا ﷻ بـۆی کۆکردنـەوە لـە نێوان لێ خۆشـبوون کە لـە پێویسـتیەکانێتی، وە پاراسـتن لە شـەڕو خراپـەی دونیـاو دواڕۆژ، وە پاداشـتی مەزن لە دونیـاو دواڕۆژدا.
لێـرەدا بـاس لـە چیرۆکـی (الحديبيـة) دەکەیـن، هەروەکو چـۆن (إبن القيـم الجـوزي) لە کتێبـی (الهـدي النبـوي)دا هێناویەتـی، بێگومان لەوەدا یارمەتیدان هەیە لەسـەر تێگەیشـتن لەم سـوورەتە، قسـەی لەسـەر واتـاو نهێنیەکانی کـردوە. وتوویەتـی (ڕەحمەتی خـوای لێ بێت ):

## بەشێك لە بەسەرهاتی حودەیبیە

(نافـع) وتوویەتی: لە سـاڵی شەشـەمی کۆچی لە مانگـی (ذي القعدة) دا بـوو، ئەمە بۆچوونی ڕاسـتە، کـە بریتیـە لە قسـەی زوهـریو قەتـادەو مووسـای کـوڕی عوقبـەو موحەممەدی کـوڕی ئیسـحاقو جگـە لەوانیـش، هیشـامی کـوڕی عـوڕوە لـە باوکیـوە دەیگێڕێتـەوە: پێغەمبـەر ﷺ دەرچـوو بـۆ حودەیبیە لە مانگـی ڕەمـەزان، وە غەزاکە لە مانگی شـەوالدا بوو، ئەمـەش تـەواو نیـە بەڵکو غـەزای ڕزگار کـردن لە مانگـی ڕەمەزانـدا بوو، ئەبو ئەسـوەد لە عـوڕوەوە دەڵـێ: ئـەوە لە مانگـە (ذو القعدة) بوو.

وە لـە صەحیحەینـدا هاتـووە لـە ئەنەسـەوە: بێگومـان پێغەمبـەر ﷺ چـوار عەمـرەی کـرد هەموویـان لـە (ذي القعدة)دا بـوون، لـە نێوانیانـدا باسـی عەمـرەی حودەیبیـەی کـردوە، وە هـەزارو پێنـج سـەد کەسـی لەگەڵـدا بـوو، ئا بـەم شـێوەیە لـە صەحیحەیندا هاتـووە لە جابـرەوە، وە هـەر لـە جابـرەوە لـە صەحیحەیندا هاتـووە: هەزارو چوار سـەد کـەس بوون. وە لـە صەحیحەینـدا هاتـووە لە عەبدوڵـلای کوڕی ئەبی ئەوفـا کە وتوویەتـی: ئێمە هەزارو سـێ سـەد کەس بووین.

قەتـادە وتویەتـی: بە سـەعیدی کوڕی موسـەیەبم وت: ئەوانـەی ئامادەی بەیعەتـی (رضوان) بـوون چەنـد کەس بـوون؟ وتی: هـەزارو پێنج سـەد، دەڵا: وتـم: جابری کـوڕی عەبدوڵڵا دەڵا: هـەزارو چـوار سـەد کەس بـوون، وتـی: ڕەحمەتی خوای لـێ بێت بە خەیـاڵا چووە، ئـەو پێـی ڕاگەیانـدم، ئـەوان هـەزارو پێنج سـەد کەس بـوون، وتم: لـە جابرەوە دوو قسـە هاتـووە: وە لێیـەوە ڕیوایەتکـراوە کـە ئـەوان لـە ڕۆژی حودەیبیـەدا حەفتـا حوشـتریان سـەربڕی، حوشـترێ لـە بـری حەوت کەسـە، پێـی وتـرا: ئێوە چەنـد کەس بـوون؟ وتی: هـەزارو چوار سـەد، بە ئەسـپەکانو بە پێـی خۆمان، واتە: سـوارچاکو ئەوانـەی ڕێدەکەن. دڵ بـۆ لای ئەمـە زیاتر مەیلی هەیـە، ئەویش قسـەی بەڕائی کوڕی عـازبو مەعقلی کوڕی یەسـارو سـەلەمەی کوڕی ئەکوەعو لە تەواوترینی ئەو دوو ڕیوایەتە، وە قسـەی موسـەیەبی کـوڕی حوزنیـش، شـوعبە وتوویەتـی: لـە قەتـادەوە لـە سـەعیدی کـوڕی موسـەیبەوە لە باوکیـەوە: ئێمـە لەگـەڵ پێغەمبـەردا بوویـن هەزارو چوارسـەد کـەس لەژێر دارەکـەدا، وە ئـەو کەسـەی وتوویەتی حەوت سـەد کـەس بوونـە هەڵەیەکی ڕوونـی کردوە.

وە بیانـووی بۆیـان هێناوەتـەوە بێگومان ئـەوان لەو ڕۆژەدا حەفتا حوشـتریان سـەربڕی، وە

حوشـتـرێک لـە بـری حەوت، یـان دە کەس بـوو، ئەمە بەڵگە نیە لەسـەر ئەوەی ئـەو بێژەرە وتوویەتـی، چونکـە بێگومـان ئەو بە ڕوونی باسـی کـردوە بەوەی حوشـترێ لـەو غەزایەدا لـە بـری حـەوت کەس بـووە، جـا ئەگـەر حەفتا حوشـتر بـێ لەبـری هەموویان، ئـەوە بە چوارسـەدو نـەوەد کـەس دەژمێـر دران، بێگومـان ئەو لـە تـەواوی قسـەکانیدا وتوویەتی: ئەوان هـەزارو چوار سـەد کـەس بوون.

## بەشێك

کاتـێ کـە لـە (ذي الحليفية) بـوون پێغەمبـەر ﷺ ئاژەڵی دیاری کـرد بۆ قوربانـی کردنو ئیحرامـی عەمـرەی بەسـت، کەسـانێکی لـە خوزاعـە نـارد بـۆ ئـەوەی هەواڵـی بـۆ بهێنن دەربـارەی قورەیش، تـا نزیک بوونەوە لە عوسـمان هەواڵگرەکەی هات بـۆ لایو پێی وت: مـن کەعبـی کـوڕی لوئەیم جێهێـڵا خەڵکانێکی لـە حەبەشـیەکان لە دژ تـان کۆکردۆتەوە، دەیانـەوێ جەنگـت لەگەڵـدا بکـەنو ڕێگریت لێبکـەن لە ماڵـی پیرۆز.

پێغەمبـەر ﷺ ڕاوێـژی بـە هاوەڵانـی کـردو فەرمـووی: ((أَشِـيرُوا عَـلَيَّ أَتَـرَوْنَ أَنْ نَمِيـلَ إِلَى ذَرَارِيِّ هَـؤُلاَءِ الَّذِيـنَ أَعَانُوهُـمْ فَنُصِيبَهُـمْ، فَـإِنْ قَعَـدُوا قَعَـدُوا مَوْتُورِيـنَ مَحْزُونِـينَ، وَإِنْ نَجَـوْا تَكُنْ عُنُقًـا قَطَعَهَـا اللَّـهُ، أَوْ تَـرَوْنَ أَنْ نَـؤُمَّ الْبَيْـتَ فَمَـنْ صَدَّنَـا عَنْـهُ قَاتَلْنَـاهُ)) واتە: ئایا پێتـان وایە بچنە سـەر مـاڵو خێزانی ئەو حەبەشـیانەی کـە لەگەڵ قورەیـش دەرچوو بوون بـۆ یارمەتیدانیان، ئـەو کات ئەگـەر دابنیشـن بـە خـەمو خەفەتـەوە دادەنیشـن، وە ئەگـەر ڕزگاریـان بـێ گەردنیـان دەبڕێتـەوە، یـان پێتـان وایـە ڕوو بکەینـە ماڵـی پیـرۆزو هـەر کەسـێ ڕێگری لـێ کردیـن کوشـتاری لەگەڵـدا بکەیـن؟ ئەبـو بەکـر فەرمـووی: خـواو پێغەمبەرەکـەی زاناتـرن، بەڵکـو ئێمـە بۆ ئـەوە هاتووین عەمـرە بکەیـن، نەهاتووین کوشـتاری هیچ کەس بکەیـن، بـەڵام هـەر کەسـێ ڕێگریمان لـێ بکات لـە ماڵی پیـرۆز جەنگی لـە دژ دەکەین.

پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: (فروحـوا إذن) واتـە: کەواتە بڕۆن، ڕۆیشـتن تا هەندێ لـە ڕێگایان بـڕی، پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: ((إِنَّ خَالِـدَ بْـنَ الْوَلِيـدِ بِالْغَمِيـمِ فِي خَيْـلٍ لِقُرَيْـشٍ طَلِيعَـةً فَخُذُوا ذَاتَ الْيَمِـينِ)) واتـە: خالـدی کـوڕی وەلیـد لـە ڕێگـە بۆسـەی دانەوە بـە کۆمەڵێ ئەسـپی قورەیشـەوە، بـڕۆن بە لای ڕاسـتدا.

سـوێند بـە خـوا خالـد هەسـتی پێنەکـردن، خالدی کـوڕی وەلیـد ئەوەنـدەی زانـی تۆزی سـوپاکە بەرز بوویـەوە، بۆیە بە پەلـە گەڕایەوە مەککـە، ئاگاداریانی کردەوە لـەم ڕووداوە.

کاتێـک پێغەمبــەر ﷺ تێپــەڕی هەتـا گەیشــت بــە لاڕێیەکـی خــوارووی مەککــە کــە بەسـەریاندا دەڕوانــێ، حوشـترەکەی هاتە ســەرچۆکـو دانیشــت، خەڵکی وتیــان: کەوت بە چۆکـدا کـەوت بە چۆکـدا، پاشـان وتیان بەبێ هـۆ وایکرد، بــەڵام پێغەمبــەر ﷺ فەرمووی: ((مَـا خَـلأَتِ الْقَصْـوَاءُ وَمَـا ذَاكَ لَهـَا بِخُلُـقٍ وَلَكِـنْ حَبَسَـهَا حَابِـسُ الْفِيلِ)) واتە: لـە خۆیەوە وای نەکـرد، نــە ڕەوشتیشـی وایــە لــە خۆیــەوە ڕاوەسـتێت، بەڵکـو ڕێگـری فیـل بـوو بەڕێگر لــە پێــش ئەمیشــدا، ئنجـا فەرمـووی: ((وَالَّـذِي نَفْسِي بِيَـدِهِ لاَ يَسْـأَلُونِي خُطَّـةً يُعَظِّمُـونَ فِيهَـا حُرُمَـاتِ اللهِ إِلاَّ أَعْطَيْتُهُـمْ إِيَّاهَـا)) واتــە: ســوێند بــە خــوا داوای هــەر پلانێکم لێبکـەن بۆ بە مــەزن ڕاگرتنــی قەدەغەکراوەکانــی خــوا ﷻ دەیاندەمێ، پاشــان تێیخوڕیو هەڵســا، پاشــان چوونــە ئەوســەری حودەیبیە لــەلای بیرێک ئـاوی کەم بوو، بــەڵام پێغەمبــەر ﷺ تیرێکی لە تیردانەکـەی دەرهێنــاو فەرمانــی پێکردن بخرێتە نــاوی، ئیتر ئاوی زۆر بوویــەوەو هەموویان تێــر بــوونو تینوێتیان نەما، قورەیشــیەکان ترسـیان لێکــەوت بە هۆی دابەزینی بۆ ســەریان، پێغەمبــەر ﷺ حەزیکــرد کەسـێک لــە هاوەڵانی بنێــرێ بۆ ناویان، پێشــەوا عومــەری کوڕی خەتتابــی بانــگ کــرد بۆ ئــەوەی بینێرێ بــۆ ناویان، عومــەر وتی: ئــەی پێغەمبــەری خوا لە نــاو مەککــەدا کەسـێک نیە لــە نەوەکانی کەعب کــە ئەگەر ئــازارم بدەن لەبەر مــن توورە بــێو هەڵوێســت بنوێنــێ، عوســمانی کــوڕی عەففــان بنێــری باشــترە، چونکــە هۆزەکەی لەوێیــە، وە چــۆن بتــەوێ ئەو دەتوانــێ پەیامەکــە بگەیەنێ.

پێغەمبــەری خــوا عوســمانی کوڕی عەففانــی بانگ کرد، ئنجا نــاردی بۆ نــاو قورەیشو پێی فەرمــوو: ((أخبرهـم: أنـا لم نـأتِ لقتـالٍ، وإنمـا جئنا عـماراً، وادعهـم إلى الإسلام)) واتە: بڕۆ لای قورەیــشو پێیــان بڵــێ: ئێمــە بــۆ شــەڕ نەهاتووین، بەڵکـو بۆ ســەردانی ماڵی خــوا هاتووین عەمــرە بکەیــن، وە بانگیشــیان بکە بۆ ئیســلام.

وە فەرمانــی پێکــرد کــە گەیشــتە پیاوانێکی بــڕوادار لە مەککــەو ئافرەتانی بــڕوادار مژدەی ســەرکەوتنیان پــێ بــدات، وە هەواڵیــان پــێ بــدات کــە خــوا ﷻ لــە مەککــەدا ئاینەکەی خــۆی زاڵ دەکات، تــا کەســێ لــە ئیمانەکــەی خــۆی نەترســێ، ئنجـا عوســمان دەرچوو تا گەیشــتە بەلــدەح (جێگایەکـە لە نزیکــی مەککە) قورەیشــیەکان وتیان: بۆ کــوێ دەچیت؟ فەرمــووی: پێغەمبــەری خــوا ناردوومــی بۆ لاتــان هەمووتــان بێنە نــاو ئاینی ئیســلامەوە، وە هەواڵتــان دەدەمــێ ئێمــە بــۆ جەنــگو کوشــتار نەهاتوویــن، بەڵکــو بــۆ عەمــرە هاتووین، وتیــان: گوێمــان لێ بــوو چیــت وت: خــۆت کۆکــەرەوەو بگەڕێرەوە.

ئنجـا ئەبانـی کـوڕی سـەعدی کـوڕی عـاص ڕێـزی لە عوسـمان گـرتو خسـتیە پەنای خۆیـەوە، وتیشـی درێغـی مەککـە لە هەر قسـەیەک دەتـەوێ بیکـەی، ئنجا لە ئەسـپەکەی دابەزیو عوسـمانی لەسـەر سـوار کردوو خۆیشی سـوار بوو، عوسـمان چووە نێو مەککەوەو چـووە لای سـەرانیان یەک لـە دوای یەک، مسـوڵمانانیش پێش ئەوەی عوسـمان بگەڕێتەوە وتیـان: عوسـمان پێش ئێمە گەیشـتە ماڵـی پیـرۆزو تەوافی کرد.

پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: ((مـا أظنـه طـاف بالبيـت ونحـن محصـورون)) واتـە: گومـان نابـەم تەوافـی ماڵـی پیرۆز بـکاتو ئێمـەش لێـرەدا دەور دراویـن، وتیان: ئـەی پێغەمبـەری خوا چـی ڕێگری لێـدەکات؟ ئەویش فەرمـووی: ((ذاك ظني بـه أن لا يطـوف بالكعبـة حتى نطوف معـه)) واتـە: ئـەوە گومانـی منـە بـە ئەو کـە تەوافـی کەعبە نـاکات تـا ئێمـەش لەگەڵیدا تـەواف نەکەین.

ئنجـا مسـوڵمانانو بتپەرسـتان تێکـەڵ بـوون لـە مەسـەلەی صولحـداو یەکێـک تیرێکـی هاوێشـتە یەکێـک لـەو کۆمەڵەکـەی تـر، بـوو بە شـەڕە تیـرو بـەردو هـەردوولا هەندێ بارمتەیـان گلدایـەوە لـەلای خۆیان، هـەواڵ گەیشـتە پێغەمبەر ﷺ کە عوسـمان کـوژراوە، بۆیـە پێغەمبـەر هاوەڵانـی کۆکـردەوە داوای کـرد بەیعەتی بدەنـێ، مسـوڵمانانیش ڕوویان کـردە پێغەمبـەری خـوا ئەویـش لـە ژێـر دارەکـەدا بـوو، بەیعەتیـان پێیـدا کـە ڕانەکەن، پێغەمبـەری خـوا دەسـتێکی خۆی گـرتو فەرمـووی: (هذه عـن عثـمان) واتە: ئەمـە لە بری عوسـمان، کاتـێ بەیعەتەکە تـەواو بوو عوسـمان گەڕایەوە، مسـوڵمانان پێیان وت: شـیفات وەرگـرت ئـەی باوکـی عەبدوڵـلا لـە تـەواف کردن بـەم ماڵـە، جا فەرمـووی: بە ڕاسـتی گومانێکـی خراپتـان پـێ بـردم سـوێند بـەو خوایـەی گیانـی منـی بەدەسـتە ئەگەر سـاڵێ بمامایەتـەوە تـا پێغەمبـەر ﷺ تەوافـی نەکردایە تەوافـم نەدەکرد، بە ڕاسـتی قورەیشـیەکان بانگیـان کـردم لـە ماڵـی پیـرۆز، بەڵام مـن نەمکـرد، جـا مسـوڵمانان وتیـان، پێغەمبەر ﷺ زاناترمانـە بـە خـوا، وە چاکترینمانـە بـە گومان بردنـی باش.

عومـەر خـوا لێـی ڕازی بێت دەسـتی پێغەمبەری گـرت بۆ بەیعەتـدان لە ژێری ئـەو دارەدا، ئنجـا هەمـوو مسـوڵمانان بەیعەتیـان پێـدا جگـە لـە جـدی کـوڕی قەیـس نەبـێ. مەعقیلی کـوڕی یەسـار پەلـی دارەکەی بـەرز کردبـووەوە لەبەر ئـەوەی ئـازاری پێغەمبـەر ﷺ نەدا، یەکـەم کەسـیش بەیعەتیـدا ئەبـو سـینانی عەبدوڵـلای کـوڕی وەهەبی ئەسـەدی بـوو، وە سـەلەمەی کـوڕی ئەکـوەع سـێجار بەیعەتـی پێدا، لـە سـەرەتاو ناوەڕاسـتو دواییندا.

لـه کاتێکـدا ئـه‌وان بـه‌و شـێوه‌یه بـوون به‌دیلی کـوڕی وه‌رقائـی خوزاعـی له‌گـه‌ڵ چه‌ند که‌سـێکی خوزاعیـدا هاتـن، وتـی: مـن که‌عبـی کـوڕی لوئـه‌ی‌و عامـری کـوڕی لوئه‌یم جێهێشـتووه دابه‌زینه‌تـه سـه‌ر ئـاوی حوده‌یبیه، هێـزو چه‌کدارێکـی زۆریان له‌گه‌ڵـه، ئه‌وان شـه‌ڕت له‌گـه‌ڵ ده‌کـه‌ن‌و ڕێگریت لێده‌کـه‌ن، پێغه‌مبـه‌ر ﷺ فه‌رمووی: ((إِنَّـا لَـمْ نَجِـئْ لِقِتَالِ أَحَـدٍ وَلَكِنَّـا جِئْنَـا مُعْتَمِرِيـنَ وَإِنَّ قُرَيْشًـا قَـدْ نَهِكَتْهُمُ الْحَـرْبُ وَأَضَرَّتْ بِهِمْ فَـإِنْ شَـاءُوا مَادَدْتُهُمْ مُدَّةً وَيُخَلُّـوا بَيْنِـي وَبَـيْنَ النَّـاسِ فَـإِنْ أَظْهَرْ فَإِنْ شَـاءُوا أَنْ يَدْخُلُـوا فِيمَا دَخَلَ فِيـهِ النَّاسُ فَعَلُـوا وَإِلاَّ فَقَدْ جَمُّـوا وَإِنْ أَبَـوْا فَوَالَّـذِي نَفْسِـي بِيَـدِهِ لأُقَاتِلَنَّهُمْ عَلَى أَمْرِي هَـذَا حَتَّى تَنْفَـرِدَ سَـالِفَتِي أَوْ لَيُنَفِّذَنَّ اللهُ أَمْرَهُ)) واتـه: ئێمـه نه‌هاتوویـن بۆ کوشـتاری هیچ که‌سـێ، به‌ڵکـو هاتووین عه‌مـره بکه‌ین، بێگومـان قوڕه‌یـش جه‌نگ زیانـی لێداون‌و په‌کی خسـتوون، ئه‌گه‌ر ده‌یانـه‌وێ زیاتر زیانیان لێده‌دیـن، وه بـا واز لـه نێوانـی مـن‌و خه‌ڵکـی بێنـن، وه ئه‌گه‌ر ویسـتیان بچنه نـاو ئه‌وه‌ی کـه خه‌ڵکـی چووه‌ته ناویـه‌وه ئه‌وه بـه‌رز ده‌بنـه‌وه، ئه‌گه‌رنا بێگومـان داده‌بـه‌زن، وه ئه‌گه‌ر یاخـی بـوون‌و شـه‌ڕیان هه‌ڵبـژارد سـوێند بـه‌و زاتـه‌ی گیانـی منـی به ده‌سـته له‌سـه‌ر ئه‌م کاره شـه‌ڕیان له‌گـه‌ڵ ده‌کـه‌م هه‌تـا کۆتایـم پێ دێ، یان له‌سـه‌ر ده‌سـتی من خـوا فه‌رمانی خـۆی جێبه‌جـێ ده‌کات. به‌دیـل وتی: ئه‌وه‌ی تـۆ ده‌یڵێی پێیـان ڕاده‌گه‌یه‌نـم. گه‌ڕایه‌وه هه‌تا گه‌یشـته نـاو قوڕه‌یـش وتـی: من لـه‌لای ئه‌و پیـاوه‌وه هاتـووم، وه گوێـم لێبوو قسـه‌یه‌کی ده‌کـرد ئه‌گـه‌ر حـه‌ز ده‌کـه‌ن ده‌یخه‌مـه ڕوو، گه‌مژه‌کانیـان وتیان: هیـچ پێویسـتیمان به‌وه نیـه قسـه‌ی ئه‌ومان بـۆ بکه‌یت، بـه‌ڵام خه‌ڵکێکی ژیـر تیایاندا وتیـان چیت بیسـتووه پێمان بڵـێ، وتـی: گوێـم لێبـوو ئاواو ئـاوای ده‌وت، عـورو‌ه‌ی کوڕی مه‌سـعوودی سـه‌قه‌فی وتی: بـه ڕاسـتی ئه‌م پیـاوه پلانێکی ژیرانـه‌ی بۆ دانـاون وه‌ریبگـرن، ڕێگه‌م بده‌ن بابچـم بۆ لای، ئه‌وانیـش وتیان: بـڕۆ بۆ لای.

پاشـان ڕۆیشـت بـۆ لای‌و قسـه‌ی له‌گه‌ڵ ده‌کـرد، پێغه‌مبـه‌ر ﷺ ئـه‌وه‌ی به به‌دیلـی فه‌رموو هه‌مـان قسـه‌ی بـۆ ئـه‌و دووباره کـرده‌وه، عـوروه لـه‌و کاتـه‌دا بـه پێغه‌مبـه‌ری وت: ئه‌ی موحه‌ممـه‌د ﷺ: ئایـا ده‌بینـی ئه‌گـه‌ر گه‌له‌کـه‌ت لـه ناو ببـه‌ی ئایا بیسـتووته لـه یه‌کێک له عه‌ره‌بـه‌وه پێـش تـۆ گه‌له‌کـه‌ی خـۆی له‌ناو ببـات؟ وه ئه‌گـه‌ر ئه‌وی دیکـه بێ، سـوێند به خـوا مـن ڕووخسـارانێک ده‌بینم له ناو ئـه‌م خه‌ڵکه‌دا بۆ ئـه‌وه دروسـتکراون ڕابکه‌ن‌و جێت بهێڵـن، ئه‌بـو به‌کـر پێـی فه‌رمـوو: ((أُمصـص بَظْـر الـلات)) واته: قیتکـه‌ی لات بمـژه. ئایا ئێمـه لێـی ڕاده‌که‌یـن‌و وازی لێدێنیـن؟ وتـی: ئه‌مـه کێیه؟ وتی: ئه‌بـو به‌کره، وتی: سـوێند

بــەو خوایەی نەفســی منی بەدەســتە ئەگەر چاکــەت بەســەرمەوە نەبووایە وەڵامــم دەدایتەوە. وە هەروەهــا قســەی لەگــەڵ پێغەمبەر ﷺ دەکــرد، هەر کاتێک قســەیەکی لەگەڵــدا بکردایە ریشــی دەگــرت، موغیرەی کوڕی شــوعبەش قەڵغانێکی ســەربازی لەســەر بوو لەســەرووی پێغەمبــەرەوە وەســتا بــوو شمشــێرێکی بە دەســتەوە بــوو، هەرکاتێ عــوروە دەســتی ببردایە بــۆ ریشــی پێغەمبــەر ﷺ بە کلکی شمشــێرەکە دەیدا بەســەر دەســتیداو دەیفەرموو: دەســتت دوور خــەرەوە لــە پێغەمبــەر ﷺ، عورووەش ســەری بــەرز کردەوەو وتــی: ئەمە کێیــە؟ وتی: موغیــرەی کــوڕی شــوعبەیە، ئەویــش وتــی: ئــەی ناپــاک ئایا مــن هەوڵــم نەدا لــە ناپاکی تۆدا؟

موغیرەی کوڕی شــوعبە لە ســەردەمی نەفامیدا هاورێتی خەڵکێکی کرد، پاشــان کوشــتیانیو ماڵەکەیانــی برد، پاشــان هاتو مســوڵمان بــوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمــووی: ((إما الإسـلام فأقبل، وإمـا المـال فلسـت منـه في شـيئ)) واتە: بەڵام ئیســلام قبووڵــت دەکات، بەڵام ئــەو ماڵەی کە بردوەتــە پەیوەندی بە تــۆوە نیە.

پاشــان عــوروە وورد دەبوویــەوە لــە هاوەڵانــی پێغەمبــەر ﷺ، ســوێند بــە خــوا پێغەمبەر ﷺ تفێکــی فــڕێ نــەدەدا مەگــەر دەکەوتــە نــاو دەســتی یەکێــک لــە ئــەوان، ئنجــا دەیهێنــا بەســەر ڕووخســارو پێســتیدا. وە ئەگــەر فەرمانــی پــێ بکردنایــە بــە پەلــە دەچــوون بە دەم فەرمانەکەیــەوە، وە ئەگــەر دەســتنوێژی بگرتایــە خەریک بوو دەهاتنە شــەڕ کردن لەســەر ئــاوی دەســتنوێژەکەی، وە ئەگــەر قســەی بکردایــە دەنگیان نزم دەکــردەوە لــە خزمەتیدا، ڕوو بــەڕوو تەماشــایان نەدەکــرد، چونکــە بــە مەزنیــان دادەنا.

عــوروە گەڕایــەوە بۆ نــاو هاوەڵەکانیو وتــی: ئەی گەلەکەم! ســوێند بە خوا بــە نوێنەرایەتی ڕۆشــتووم بۆ لای پاشــاکان: لە ســەر قەیســەرو کیســراو نەجاشــی، ســوێند بە خوا پاشایەکم نەبینیــوە هاوەڵەکانــی بــە مەزنی دابنێــن وەک چۆن هاوەڵانــی موحەممــەد، موحەممەد ﷺ بە مــەزن دادەنێــن، ســوێند بــە خوا تفێ فــڕێ نــادات بێگومــان دەکەوێتــە ناو لەپــی یەکێ لە هاوەڵانــی ئەویــش دەیهێنــێ بە ڕووخســارو جەســتەیدا، وە ئەگــەر فەرمانیان پــێ بکات بە پەلــە جێبەجێی دەکــەن، وە ئەگەر دەســتنوێژ بگرێ خەریکە لەســەر ئاوی دەســتنوێژەکەی بەشــەڕ بێــن، وە ئەگەر قســە بکات قســەکانی لەبــەر دەکەن، هەرگیز ڕاســتەوخۆ تەماشــای ناکــەن، چونکــە بــە مەزنــی دادەنێــن، بــە ڕاســتی پلانێکــی ژیرانــەی بــۆ داناون بــە گوێی بکــەن، جــا پیاوێــک لــە نەوەکانــی کینانــە وتــی: ڕێگەم بــدەن بچم بــۆ لای، وتیــان: بڕۆ،

کاتێ گەیشتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هذا فلان، وهو من قوم یعظمون البدن، فابعثوا لها)) واتە: ئەمە فلان کەسە، لەو گەلەیە کە ڕێز لەو حوشترە قەڵەوانە دەگرن کە دەبرێن بۆ ماڵی حەرام و سەر دەبردرێن، جا ئێوەش بۆی ئامادە بکەن.

ئامادەیان کرد بۆی، خەڵکەکەش پێشوازیان لێکردو بە دەمیەوە چوون، کاتێک کە ئەوەی بینی وتی: (سبحان الله) واتە: پاک و بێگەردی بۆ خوا، ناگونجێ ئەمانە ڕێگری بکرێن لە ماڵی خوا.

میکرەزی کوڕی حەفص هەستاو وتی: ڕێگەم بدەن بڕۆم بۆ لای، وتیان: بڕۆ بۆ لای. کاتێ ڕۆیشت بۆ لایان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هذا مکرز بن حفص وهو رجل فاجر)) واتە: ئەمە میکرەزی کوڕی حەفصە ئەو کەسێکی خراپەکارە.

جا ئەو قسەی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەکرد، لە ناکاو سوهیلی کوڕی عەمر هات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((قد سهل لکم من أمرکم)) واتە: بێگومان بۆی ئاسان کردن لە کاروبارتان. جا وتی: بمەدەرێ، بنووسە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا ڕێککەوتنێک، بانگی نووسەرێکی کرد، فەرمووی: ((أکتب: بسم الله الرحمن الرحیم)) بنووسە: بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە. سوهەیل وتی: بەڵام (الرحمن) سوێند بە خوا ئێمە نازانین کێیە، بەڵام بنووسە: ((باسمك اللهم)) واتە: بە ناوی تۆ خوایە.

وەکو چۆن دەنووسی. مسوڵمانان دەنگیان بەرز بوویەوەو وتیان: سوێند بە خوا ناینووسین تەنها بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە نەبێت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بنووسە: ((باسمك اللهم)).

پاشان فەرمووی: ((اکتب: هذا ما قاضي علیه محمد رسول الله)) واتە: ئەمە بوو کە پێغەمبەر ﷺ لەسەری ڕێککەوت. سوهەیل وتی: سوێند بە خوا ئەگەر نمانزانایە تۆ پێغەمبەری خوای ڕێگریمان لێت نەدەکرد لە ماڵی پیرۆزو، شەڕمان لە دژت نەدەکرد، بەڵام بنووسە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا، پێغەمبەر فەرمووی: ((إني رسول الله وإن کذبتموني، اکتب: محمد بن عبدالله)) واتە: من پێغەمبەری خوام ئەگەرچی ئێوە بە درۆم دەزانن، بنووسە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((علی أن تخلوا بیننا وبین البیت فنطوف به)) واتە: لەسەر ئەوەی نێوانی ئێمەو ماڵی پیرۆز چۆڵ بکەن تەوافی بکەین.

جـا سـوهەیل وتی: سـوێند بـە خوا لەبـەر ئەوەیە عـەرەب نەڵێـن ناچاریان کـردوون، بەڵام بـۆت هەیە لە سـاڵی داهاتوودا، نووسـی.
جـا سـوهەیل وتـی: هـەر کـەس لـە لای ئێمـەوە هـات بـۆ لای تـۆ ئەگـەر چـی لەسـەر ئاینەکەتیـش بـوو ئـەوە دەیگەڕێنیتـەوە بۆمـان.
مسـوڵمانان وتیـان: پاکـو بێگـەردی بۆ خوا، چـۆن ڕەت دەکرێتەوە بۆ هاوبەشـدانەران، کە ئـەو بە مسـوڵمانی هاتبێ؟
کاتێـک ئـەوان خەریکـی دانووسـتان بـوون لـە نـاکاودا ئەبـو جەندەلـی کوڕی سـوهەیل بـە کـۆتو زنجیـرەوە لـە خـوارووی مەککـەوە هاتبـوو خۆی کـرد بە نـاو مسـوڵماناندا، جـا سـوهەیل وتی: ئـەی موحەممـەد ﷺ یەکـەم شـتێ پەیمانـم لەگەڵتـدا بەسـتووە ئەوەیە بیگەڕێنیتـەوە بـۆم، پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: ((إنـا لم نقـض الکتـاب بعـد)) واتە: ئێمە هێشـتا نووسـراوەکەمان تـەواو نەکـردوە، سـوهەیل وتی: سـوێند بە خوا دانوسـتانت لەگـەڵ ناکەم لەسـەر هیچـی تر.
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فأجزه لي)) واتە: ڕێگەی پێبدە لە لام بێت.
ئەویـش وتـی: من ڕێگـەی پێنـادەم، فەرمووی: ((بـلی فافعل)) بـا، ئەو کارە بکـە، وتی: من ئـەو کارە ناکـەم، میکرەز وتـی: بێگومان ڕێگەمـان پێدابوو.
ئەبـو جەنـدەل وتـی: ئـەی بـرواداران دەمگەڕێننەوە بـۆ لای هاوبـەش دانەران لـە کاتێکدا مـن بە مسـوڵمانی هاتـووم بۆ نێـو ئێوە، ئایـا نەتانبینیـوە چیان لێکـرووم؟ لە پێنـاوی خوادا سـزایەکی سـەخت درابـوو. عومەری کـوڕی خەتتـاب خـوا لێـی ڕازی بێت دەڵێ: سـوێند بـە خـوا گومـانو دوو دڵیم نەبـووە کاتێ کە مسـوڵمان بـووم تەنها ئـەو ڕۆژە نەبـێ، هاتم بـۆ لای پێغەمبـەری خـواو پێـم وت: ئـەی پێغەمبـەر ﷺ ئایا تۆ نێـردراوی خوا نیـت؟ وتی: بەڵـێ، وتـم: ئایـا ئێمە لەسـەر حەق نیـنو دوژمنمان لەسـەر ناهەق نیـن؟ وتی: بەڵـێ، وتم: ئـەی ئیتـر بۆچی سـووکی پیشـان بدەین لـە ئاینەکەماندا، ئـەی بۆچی خـوا بڕیار لـە نێوان ئێمـەو ئەوانـدا نـادات؟ فەرمـوی: ((إني رسـول الله، وهـو نـاصري، ولسـت أعصيـه)) واتە: من پێغەمبـەری خـوام، ئـەو سـەرم دەخاو لـە قسـەی دەرناچم. وتـم: ئایا تـۆ بە ئێمـەت نەوت ئێمـە دەچیـن بـۆ ماڵی پیرۆزو تـەواف دەکەین؟ وتـی: ((بـلى، أفأخبرتك أنـك تأتيـه العام؟)) واتـە: بەڵـێ، ئایـا هەواڵـم پێنـەدای کـە بێگومان ئەمسـاڵ تـەواف دەکـەی؟ وتـم: نەخێر، فەرمـووی: ((فأنـك آتيـه ومطـوف بـه)) واتـە: بێگومـان تۆ پێـی دەگەیتو تەوافـی دەکەی.

دەڵێ: ڕۆیشتم بۆ لای ئەبو بەکر هەمان ئەو قسانەم بۆ دووبارە کردەوە کە بە پێغەمبەری خوام وتبوو، ئەبو بەکریش هەمان وەڵامی دامەوە، وە ئەوەی زیاد کرد: دەست بگرە بە پەیامی ئەوەوەو ملکەچیبە تا دەمریت، سوێند بە خوا پێغەمبەر ﷺ لەسەر حەقە، عومەر وتی: کارم کرد بۆ ئەوە کارێکی زۆر.

کاتێ لە بابەتی نووسراوەکە تەواو بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((قوموا وانحروا، ثم احلقوا)) واتە: هەڵسن قوربانیەکانتان سەربڕن وە سەرتان بتاشن. سوێند بە خوا یەک دانەیان هەڵنەساوە پێ تا سێ جار فەرمووی، کاتێ بینی کەس هەڵناسێ چووە لای ئوم سەلەمەو باسی ئەوەی بۆ کرد، باسی ئەوەی کرد کە ئەو خەڵکە چی بەسەر هاتووە، ئوم سەلەمە فەرمووی: ئەی پێغەمبەر ﷺ حەز دەکەی ئەو کارە بکەن؟ دەرچۆ بێ ئەوەی قسە لەگەڵ کەس بکەیتو قوربانیەکەت سەر ببڕەو بانگی سەرتاشەکەت بکە سەرت بتاشێت، پێغەمبەر ﷺ هەستا قسەی لەگەڵ کەس نەکردوو هەتا قوربانیەکەی سەربڕیو بانگی سەرتاشی کردو ئەویش سەریتاشی.

کاتێ خەڵکەکە ئەمەیان بینی، هەڵسانو قوربانیەکانیان سەربڕیو سەری یەکتریان تاشی، تەنانەت خەریک بوو یەکتر بکوژن لە توورەییدا.

پاشان کۆمەڵە ئافرەتێکی بڕوادار هاتن، خوا ﷻ ئەم دەقەی دابەزاندە خوارەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ ١٠﴾ الممتحنة، (واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ئەگەر ئافرەتی ئیماندار هاتن بۆ لاتان بە کۆچ کەری) تا گەیشتە ﴿بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ ١٠﴾ الممتحنة، (واتە: ژنە کافرە بێ نامەکان لای خۆتان ڕامەگرن) پێشەوا عومەر لەو ڕۆژەدا دوو ژنی تەڵاقدا لە کاتی هاوبەشداناندا خێزانی ئەو بوو، دانەیەکیان مەعاویە خواستیو ئەوی دیکەیان صەفوانی کوڕی ئومەیە، پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە. وە لە گەڕانەوەیدا خوا ﷻ دایبەزاند بۆ سەری: ﴿إِنَّا فَتَحۡنَا لَكَ فَتۡحٗا مُّبِينٗا ١﴾ تا کۆتاییەکەی، پێشەوا عومەر، وتی: ئایا ئەمە سەرکەوتنە ئەی پێغەمبەری خوا؟! فەرمووی: (بەڵێ) هاوەڵان وتیان: پیرۆز بێ ئەی پێغەمبەری خوا، ئەی چی بۆ ئێمەیە؟ خوا ﷻ دایبەزاند: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٤﴾

تەفسیری سوورەتی (الفتح) تەواو بوو.


سورة الحجرات
بسم الله الرحمن الرحيم
يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا
اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا
أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ
لِبَعْضٍ أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنْتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٢﴾ إِنَّ الَّذِينَ
يَغُضُّونَ أَصْوَاتَهُمْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ امْتَحَنَ
اللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَىٰ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٣﴾ إِنَّ الَّذِينَ
يُنَادُونَكَ مِنْ وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾

## تەفسیری سووڕەتی (الحجرات)

## مەدەنییە (١٨) ئایەتە

## بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ﴿٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصۡوَٰتَهُمۡ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمۡتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ لِلتَّقۡوَىٰۚ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٌ ﴿٣﴾ ﴾

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾ ئەمە ئەدەبو ڕەوشت لە خۆ دەگرێ لەگەڵ خواو لەگەڵ پێغەمبەرەکەی، وە بە گەورە دانانیو حورمەتو ڕێز لێگرتنی، خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە بڕواداران بەوەی بڕواهێنان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی پێویست دەکات لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خواو دوور کەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی، وە دەبێ بە شوێنی فەرمانەکانی ئەودا بڕۆن، وە دەبێ شوێنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بکەون لە هەموو کاروبارەکانیاندا، وە پێش نەکەون لە خواو پێغەمبەرەکەی، وە نەڵێن هەتا دەفەرموێ، وە فەرمان نەکەن تا فەرمان دەدات.

بێگومان ئەمە حەقیقەتی خوڕەوشتی پێویستە لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی، ئەوە ناونیشانی بەختەوەریو سەرکەوتنی بەندەیە، وە بە لە دەستدانی خۆشبەختی هەمیشەییو نازونیعمەتی هەتا هەتایی لە دەست دەدات، هەروەها لەمەدا، قەدەغەکردنێکی توند هەیە لە پێش خستنی قسەی جگە لە پێغەمبەر بەسەر قسەی ئەودا، بە ڕاستی هەر کاتێ سوننەتی پێغەمبەری خوای بۆ ڕوون بوویەوە، پێویستە شوێنی بکەوێو پێشی بخات بەسەر هەر شتێکی دیکەدا، جا ئەو شتە هەرچی بێت.

پاشــان خــوا ﷻ فەرمانــی کــردوە بــە خۆپارێــزیو ترســان لێــی بــە شــێوەیەکی گشــتی، ئەویــش وەک طلقي کــوڕی حبیــب وتوویەتــی: کار بکــەی بــە گوێڕایەڵــی کردنــی خوا لەســەر ڕووناکــی لەلایــەن ئــەوەوە، ئومێــدی پاداشــتی خــوا بکــەی، وە واز لــە ســەرپێچی خــوا بێنــیّ لەســەر نــوورو ڕووناکیــەک لەلایەن ئــەوەوە، بترســی لە ســزاو تۆڵــەی. وە کە دەفەرمــویّ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ ﴾ واتــە: بیســەری هەمــوو دەنگەکانــە لــە هەمــوو کاتەکاندا، لە هەمــوو شــوێنو ڕووەکانــدا. ﴿ عَلِيمٌ ﴾ زانایــە بە ئاشــکراو نهێنیــەکانو پێشو پاشــەکان، وە ئەوەیشــی پێویســتەو ئەســتەمەو دەگونجــیّ، وە لــە باس کردنی ئــەو دوو نــاوە پیرۆزەدا -دوای قەدەغەکردنــی پێشــکەوتن لە خــواو پێغەمبەرەکەیو فەرمانکردن بە لە خوا ترســان- هانیــداوە لەســەر جێبەجــیّ کردنــی ئــەو فەرمانو ئــادابو ڕەوشــتە چاکانە، وە مەترســی لە فەرمــان بــەرداری نەکردن.

(٢): پاشــان خــوای بــەرز فەرموویەتــی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُواْ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ ﴾ ئەمــە ئــەدەبو ڕەوشــتە لەگــەڵ پێغەمبــەر ﷺ لــە کاتــی دواندنیــدا، واتــە: بــا دوێنــەر دەنگی بــەرز نەکاتەوە بەســەر دەنگــی پێغەمبەردا لــەو کاتەی کــە لەگەڵــی دایــە، وە بــا بــە دەنگی بەرز قســە نــەکات، بەڵکــو دەنگی نــزم بکاتــەوەو بە ئــەدەبو نــەرمو نیانــیو ڕێــزو بە گــەورە دانــان بــدویّ لەگەڵیدا.

چونکــە پێغەمبــەر ﷺ وەکــو کەســێک نیە لــەوان، بەڵکــو دەبــیّ لەکاتی گفتوگــۆ کردندا جیــای بکەنــەوە، هەروەکــو چۆن جیاکراوەتــەوە لە جگە لە خــۆی لە پێویســت بوونی مافی بەســەر ئۆممەتەوە، وە پێویســت بوونــی بڕواپێهێنانی، وە ئەو خۆشەویســتیەی کــە بڕواهێنان تــەواو نابــیّ بــەوە نەبــیّ، بێگومــان لە جێبەجــیّ نەکردنــی ئەوانەدا مەترســی هەیــە، نەوەکو کاری بەنــدە بەتــاڵو پــووچ بێتــەوە خۆیشــی هەســتی پێنــەکات، وەک چــۆن بە ڕەوشــت بــوون لەگەڵیدا یەکێکــە لە هۆکارەکانی بەدەســتهێنانی پاداشــتو وەرگرتنی کــردەوەکان.

(٣): پاشــان خــوا ﷻ ستایشــی ئەو کەســەی کردوە کــە دەنگی نــزم دەکاتەوە لــە خزمەتی پێغەمبــەر ﷺ، بــەوەی دڵیــان تاقی دەکاتــەوەو پاک دەکاتەوە بــە هۆی خۆپارێزیــەوە، واتە: تووشــی بەڵایــان دەکاتو تاقیــان دەکاتەوە، دەرەنجامی ئــەوەش دەردەکەویّ بــەوەی دڵیان چــاک دەبیّ بە هــۆی خۆپارێــزیو لە خوا ترســانەوە.

پاشــان بەڵێنــی پێداون بە لێخۆشــبوون لــە گوناهەکانیان کــە لابردنی شــەڕو نارەحەتی لەخۆ دەگــریّ، وە بەدەســتهێنانی پاداشــتی مــەزن، کــە کەس وەســفی نازانــیّ جگە لە خــوا، وە لە

پاداشتی مەزنـدا ئـەوەی خۆشویسـتراوە بە دەسـت دێ، ئـەم ئایەتـە بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی خـوا دڵـەکان تاقـی دەکاتەوە بـە فەرمان کـردنو قەدەغە کـردنو میحنـەتو ناڕەحەتی.

هـەر کەسـێک پەیوەسـت بێ بـە فەرمانی خواو شـوێنی ڕەزامەنـدی ئەو بکـەوێو پەلە بکا لـەوەدا، وە پێشـی بخـات بەسـەر هـەواو ئارەزوویدا، ئـەوە یـەکلا دەبێتەوە بـۆ خۆپارێزی، ئـەوە دڵـی گونجـاو دەبـێ بـۆ جێبەجێ کردنـی فەرمانەکانـی، وە هەر کەسـێ بەو شـێوەیە نەبـێ، بێگومـان زانراوە کـە ناگونجێ بـۆ خۆپارێزی.

(٤-٥): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا۟ حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ ﴾

ئـەم دەقـە پیرۆزانە دابەزیـن دەربـارەی خەڵکانێ لـە دەشـتەکیەکان، ئەوانەی خوا وەسـفی کـردوە بـە دڵڕەقـی، وە بێگومـان ئـەوان شایسـتەترن کـە نەزانـن ئـەو سـنوورانەی خـوا ناردوویەتیـە خوارەوە بۆ سـەر پێغەمبەرەکەی ﷺ، بە نوێنەرایەتـی هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، بینیـان لـە ماڵدایە لـە ژووری خێزانەکانـی، ئارامیان نەگرتو ڕەوشـتو ئاکاریـان نەبوو تا بێتـە دەرەوە بـۆ ناویـان، بەڵکو هاواریان کـرد ئەی موحەممـەد، ئەی موحەممـەد، واتە: بێرە (وەرە) دەرەوە.

خـوا ﷻ سەرزەنشـتی کـردن بە نەبوونـی عەقڵ، بە هـۆی ئـەوەی ئەوەندە عەقڵیـان نەبوو لە خـواوە کـە ڕێـز لـە پێغەمبەرەکەی بگـرن، وەک لە نیشـانەی عەقـڵ بەکارهێنانـی ئاکارو ڕەوشـتی جوانە.

وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ
رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓا أَن
تُصِيبُوا قَوْمًۢا بِجَهَٰلَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَٰدِمِينَ ﴿٦﴾
وَٱعْلَمُوٓا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ ۚ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِى كَثِيرٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ
وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِى قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ
إِلَيْكُمُ ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ ۚ أُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ﴿٧﴾
فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعْمَةً ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٨﴾ وَإِن طَآئِفَتَانِ
مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا
عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَٰتِلُوا ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ
فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ
﴿٩﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا ٱللَّهَ
لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ
عَسَىٰٓ أَن يَكُونُوا خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَآءٌ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيْرًا
مِّنْهُنَّ ۖ وَلَا تَلْمِزُوٓا أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا بِٱلْأَلْقَٰبِ ۖ بِئْسَ ٱلِٱسْمُ
ٱلْفُسُوقُ بَعْدَ ٱلْإِيمَٰنِ ۚ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١١﴾

جا ئاكارو ڕەوشتی بەندە ناونیشانی عەقلیەتی، وە خوا ﷻ خێری بۆ ئەو كەسە دەوێ، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ واتە: (خۆ ئەگەر چاوەڕوانیان بكردایە تا دەرۆیشتە دەرەوە بۆ لایان ئەوە چاكتر بوو بۆیان وە خوا)، لێبوردەیە لەوەی دەرچووە لە بەندەكانیەوە لە گوناهو بەدڕەوشتی، بە بەزەییە پێیان كاتێ سزای بۆ پێش نەخستوون، بە هۆی تاوانیانەوە بە سزادانو تۆڵە كردنەوە.

(٦): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓا أَن تُصِيبُوا قَوْمًۢا بِجَهَٰلَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَٰدِمِينَ ﴿٦﴾ ﴾:

هەروەها ئەمە یەكێكە لەو ئەدەبو ڕەوشتانەی كە پێویستە كەسانی ژیر بە ئاكارێكی جوان بەكاریان بێنن، ئەویش ئەوەیە ئەگەر كەسێكی گوناهكار هەواڵێكی هێنا بۆیان، ئەوە لە هەواڵەكەی بكۆڵنەوە تا ڕوون دەبێتەوە، با ڕاستەوخۆ وەرینەگرن، چونكە لەوەدا مەترسیەكی گەورە هەیەو دەكەونە ناو گوناهەوە، چونكە هەواڵەكەی ئەگەر وەك هەواڵی كەسێكی ڕاستگۆی دادپەروەر دابنرێ كار بە ناوەڕۆكی دەكرێ، جا ئەو كاتە لەدەستدانی نەفسو ماڵ بە ناحەق ڕوودەدات، بە هۆی ئەو هەواڵەوە كە سەرەنجام دەبێتە مایەی پەشیمانی، بەڵكو پێویست ئەوەیە لە كاتی هەواڵدانی كەسی گوناهباردا لێكۆڵینەوە بكرێ تا ڕوون دەبێتەوە.

جا ئەگەر بەڵگەكان ئاماژە بوون لەسەر ڕاستێتی ئەو هەواڵە كاری پێدەكرێو بەڕاست دادەنرێ، وە ئەگەر ئاماژە بوون لەسەر بەدرۆدانانی ئەوە بەدرۆ دەخرێتەوەو كاری پێناكرێ. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەواڵی ڕاستگۆ وەرگیراوە، وە هەواڵی درۆزن ڕەتكراوەیە، وە هەواڵی گوناهبار لەسەری دەوەستێ وەك باسمان كرد، ئا لەبەر ئەمەیە پێشین ڕیوایەتێكی زۆریان وەرگرتووە لەو خەواریجانەی ناسراوبوون بە ڕاستگۆیەتی، ئەگەرچی گوناهباریش بوویێتن.

(٧-٨): ﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمۡ رَسُولَ ٱللَّهِۚ لَوۡ يُطِيعُكُمۡ فِي كَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ لَعَنِتُّمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ٧ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعۡمَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٨ ﴾:

﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمۡ رَسُولَ ٱللَّهِۚ لَوۡ يُطِيعُكُمۡ فِي كَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ لَعَنِتُّمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَ ﴾ واتـە: بـا لەلاتـان زانـراو بـێ کـە بێگومـان پێغەمبـەر ﷺ لـە ناوتاندایە، ئەویـش پێغەمبەرێکـی بەرێزو چاکەخـوازو ژیرە، کە تەنهـا خێـرو چاکەی بـۆ ئێـوە دەوێو ئامۆژگاریتـان دەکات، ئێـوەش شـەڕو خراپەتان بۆ نەفسـی خۆتـان دەوێ، کـە پێغەمبەر ﷺ بەو هۆیـەوە ڕێک نایەتـەوە لەگەڵتانـدا، خۆ ئەگەر بـە گوێـی ئێـوەی بکردایـە لـە زۆرێ لە کاروبـارەکان ئـەوە تووشـی نارەحەتـی دەبوون، بـەڵام پێغەمبـەر ﷺ ڕێنماییتان دەکات.

وە خـوای بـەرزو مەزن ئیمانـی لەلاتان خۆشەویسـت کردوەو لـە دڵتاندا شـیرینو ڕازاوەی کـردوە، بـەوەی کـە داینـاوە لـە دڵەکانتـان لـە خۆشویسـتنی حـەقو گرنگیـدان پێی، وە بـەوەی داینـاوە لەسـەر حـەق لـەو شـایەتو بەڵگانەی کـە بەڵگـەن لەسـەر ڕاسـتێتی، وە دڵـەکان وەریدەگرنو سروشـتی مرۆڤیش حەزی لێیەتـی، وە بەوەی خـوا یارمەتیتان دەدات بـۆ گەڕانەوەتـان بۆ لای.

وە ناشـرینی کـردوە لە پێش چاوتـان بێبڕواییو گوناهە گـەورەکان، وە ئەو گوناهانەیشـی کـە لـە خـواری ئەوانەوەن، بـەوەی خوا ﷻ لـە دڵی ئێـوەدا داینـاوە حـەز نەکردن لە شـەڕو خراپـەو نەبوونـی ویسـتی ئەنجامدانی، وە بـەوەی کە دایناوە لەو بەڵگەو شـایەتیانەی لەسـەر خراپـیو لەسـەر ئەوەی سروشـتی ئادەمیزاد حەزی لێنـاکات، وە بەوەی کە خـوا ﷻ دایناوە لەنـاو دڵەکانـدا جۆرێ لـە ڕقلێبوونەوە لـەو کارانـە﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ واتە: ئەوانەی خـوا ئیمانی لـە دڵیانـدا ڕازاندۆتـەوەو خۆشەویسـتی کـردوە لەلایـان، وە بێبڕوایـیو گوناهو سـەرپێچی لەلایـان ناشـرین کـردوە،﴿ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ﴾ واتـە: ئەوانـەی زانسـتو کردەوەکانیان چاکـە، وە بـەردەوام بوون لەسـەر ئاینـی پتەوو ڕێگای ڕاسـت.

وە دژی ئـەوان گومڕاکانـە ئەوانـەی لـە پێـش چاویـان جوانکـراوە بێبڕوایـیو گوناهـو سـەرپێچیەکان، وە ناشـرین کـراوە لە لایـەن بڕواهێنـان، جا تـاوان تاوانی خۆیانـە، چونکە ئـەوان کاتـێ کـە گوناهیـان کرد خـوا مۆریدا بەسـەر دڵەکانیانـدا، وە کاتـێ کە﴿ زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ ٥ ﴾ الصف، (واتـە: لایانـدا لـە حەق خواش دڵـی وەرگێـڕان)، وە کاتێ

کـە یەکەمجـار بڕوایـان نەهێنا خـوا ﷻ دڵیانـی وەرگێڕا.
(٨): وە خـوا ﷻ کە دەفەرمـوێ: ﴿فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعْمَةً﴾ واتە: ئەو خێرەی کە دەسـتەبەر بـووە بۆیـان، ئـەوە بەخشـش‌و بەهەرەیەکـە لەلایەن خـواوە بەسـەریانەوە، نەک بـە تواناو بەهێـزی خۆیـان، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ واتـە: زانایـە بـەوەی سوپاسـگوزاری نیعمەتەکان دەکات، ئەویـش سـەرکەوتووی دەکات بـۆ ئـەو کارە، لـەوەی سوپاسـگوزاری نـاکات‌و شایسـتەی ئـەوە نیـە، جا فـەزڵ‌و چاکەی خۆی لـە جێگای شایسـتەدا دادەنێ بـە پێی ئەوەی حیکمەتـی دەیخوازێ.
(٩-١٠): ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَـٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٩﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾﴾:
﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ﴾ ئەمـە قەدەغەکردنی بڕواداران لـە خـۆ دەگـرێ لـەوەی هەندێکیـان دەسـتدرێژی نەکەنـە سـەر هەندێکـی دیکەیـان، وە کوشـتار لەگـەڵ یەکتریـدا نەکەن، بێگومان ئەگەر دوو دەسـتە لـە ئیمانـداران دژ بە یەکتر جەنگیـان کـرد، ئـەوە پێویسـتە لەسـەر کەسـانی دیکـە ئـەو شـەڕە گەورەیـە لاببـەن، بە ئاشـتەوایی کـردن لەنێوانیانـداو نێوەندگیری بـە تەواوترین شـێوە، بۆئەوەی ئاشـتەوایی بێتە بەرهـەم، وە ئـەو ڕێگایـە بگرنە بەر کـە دەیانگەیەنێتە ئەو مەبەسـتە، جا ئەگەر ئاشـتەواییان کـرد ئەوە زۆر چاکـە، وە ئەگـەر ﴿بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَـٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ﴾ واتـە: (ئنجـا ئەگـەر کۆمەڵێکیـان دەسـتدرێژی کرد بۆ سـەر کۆمەڵێکـی تریان ئـەوە ئێـوە لەگـەڵ ئەوەیـان بجەنگن کە دەسـتدرێژی دەکات) تـا دەگەڕێتەوە بـۆ فەرمانی خـوا لـە ئەنجامدانی خێـرو چاکـەو وازهێنان لـە خراپەکاریی، کـە مەزنترینیان کوشـتارە.
﴿فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ﴾ (واتـە: ئنجـا ئەگـەر گەڕایـەوە ئەوسـا لـە نێوانیاندا ئاشـتەوایی بکـەن) ئەمە فەرمـان کردنە بە ئاشـتەوایی‌و دادپـەروەری لە ئاشـتەوایی کردندا، چونکـە هەنـدێ جار ئاشـتەوایی دەبێ، بـەڵام بەبـێ دادپـەروەری، بەڵکو بە سـتەم‌و مەیل‌و لادان بـۆ لای یەکێـک لـەو دوو دژە، جـا ئەمـە ئەو ئاشـتەواییە نیە کـە فەرمانـی پێکراوە، نابـێ یەکێکیـان لەبـەر چاو بگیرێ یـان وڵات‌و نەتـەوە، یان جگـە لەوانە، لەو مەبەسـت‌و ئامانجانـەی کـە لادان پێویسـت دەکەن لـە دادپەروەری.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴾ واتــە: ئەوانــەی دادپــەروەری دەکــەن لە حوکــمو بڕیاریاندا، لــە نێوانــی خەڵکــیو لــە هەمــوو جێگــاو شــوێنەکان، تەنانــەت دەچێتــە نێــو ئــەم دەقــەوە دادپــەروەری پیــاو لەگــەڵ مــاڵو خێزانەکانیــان لــە پێدانــی مافەکانیان.

لــە فەرمــوودەی صەحیــح دا هاتــووە: {إِنَّ الْمُقْسِطِينَ عِنْدَ اللَّهِ عَلَى مَنَابِرَ مِنْ نُورٍ عَنْ يَمِينِ الرَّحْمَنِ عَزَّ وَجَلَّ وَكِلْتَا يَدَيْهِ يَمِينٌ الَّذِينَ يَعْدِلُونَ فِي حُكْمِهِمْ وَأَهْلِيهِمْ وَمَا وَلُوا} (رواه مسلم: ٤٨٢٥) واتــە: دادپــەروەران لــە لای خوا لەســەر مینبەرن لــە نوورینن، ئەوانــەی دادپەروەری دەکــەن لــە بڕیارەکانیانو مــاڵو منداڵەکانیانو جگــە لەوانیش.

﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ ﴾ ئەمــە پەیمانێکــی خوایە لە نێــوان بڕواداران، بێگومــان ئەگەر بینرا لــە هــەر کەســێ ئەگــەر لــە خۆرهەڵاتــی زەوی بێ یــان خۆرئــاوا، بــڕوای هەبوو بــە خواو فریشــتەکانیو کتێبەکانــیو پێغەمبەرانــیو ڕۆژی دوایــی، ئــەوە بێگومــان بــرای بڕوادارانە، برایەتیــەک ئــەوە پێویســت دەکات لەســەر بــڕواداران، ئــەوەی بۆ خۆیــان پێیان خۆشــە بۆ ئەویــش پێیــان خــۆش بێ، وە ئەوەیشــی بۆ خۆیــان پێیان ناخۆشــە بۆ ئەویش پێیــان ناخۆش بــێ، لەبــەر ئەمەیــە پێغەمبــەر ﷺ فەرمانیکــردوە بــە پێدانــی مافــی برایەتــی ئیمانــی، وەک فەرموویەتــی: {لاَ تَحَاسَدُوا وَلاَ تَنَاجَشُوا وَلاَ تَبَاغَضُوا وَلاَ تَدَابَرُوا وَلاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا، الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لاَ يَظْلِمُهُ وَلاَ يَخْذُلُهُ وَلاَ يَحْقِرُهُ} (رواه مسلم: ٦٧٠٦، واللفظ لە)، واتــە: ئێرەیــی بەیەک مەبــەنو فێڵ لــە یەکتر مەکەنو ڕقتــان لەیەکتر نەبــێ، بــا یەکێکتان کڕینو فرۆشــتن بەســەر یەکێکی دیکەتانــەوە نــەکات، هەمووتان ببنە بەنــدەی خــواو برای یەکتــری، بڕوادار بــرای بڕوادارە، نە ســتەمی لێدەکاو نە ســەر شــۆڕی دەکاتو نــە بە کەمــی دەزانێ.

هەروەهــا ﷺ فەرموویەتــی: {إِنَّ الْمُؤْمِنَ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا} (رواه البخاري: ٤٦٧، مسلم: ٦٧٥٠)، واتــە: بــڕوادار بۆ بڕوادار وەکو خانوویەک وایــە هەندێکی تەواوکەری هەندێکــی دیکەیــە) پەنجەکانی خســتە نێوانی یەکتر.

بێگومــان خــواو پێغەمبەرەکــەی فەرمانیان کردوە بــە بەجێهێنانی مافی بــڕواداران هەندێکیان بــۆ هەندێکــی دیکەیــان، وە بەوەی کــە خۆشەویســتیو پەیوەنــدی نێوانیان بەهێــز دەکات، هــەر یــەک لەمانە پشــتگیریە بۆ مافەکانــی هەندێکیــان بەســەر هەندێکی دیکە، جــا لەوانە: ئەگــەر کوشــتار کەوتــە نێوانیــان کــە ببێتــە مایــەی جیابوونــەوەی دڵــەکانو ڕقو قینــەو پشــتکردنیان لــە یەکتــر، ئــەوە پێویســتە بــڕواداران ئاشــتەوایی لە نێــوان یەکدا بکــەن، وە

کۆشـش بکـەن بـەوەی دەبێتـە مایـەی لابردنـی ئـەو زبریە.
پاشـان بـە گشـتی فەرمانـی کـردوە بـە خۆپارێزیو لـە خـوا ترسـان، هەسـتان بەجێبەجێ کردنـی مافـی بـرواداران‌و خۆپارێـزی ڕێکخسـتووە لـە سـەر ڕەحمـەت‌و میهرەبانـی، فەرموویەتـی:﴿ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴾ جـا ئەگـەر ڕەحمەت بە دەسـت هات ئـەوە خێری دونیاو دوارۆژ دەسـتەبەر دەبێـت، ئـەوە دەبێتـە بەڵگە لەسـەر ئـەوەی کە هەڵنەسـان بـە مافەکانی بـرواداران لـە گەورەتریـن بەربەسـتەکانی بـەردەم ڕەحمەتە.
لـەم دوو دەقـەدا چەندیـن سـوود هەیە جگـە لەوانەی پێشـووە: بێگومـان کوشـتاری نێوان بـرواداران ڕتکـەرەوەی برایەتـی ئیمانیـە، ئـا لەبـەر ئەمەیـە لـە گەورەترینـی تاوانـە هەرە گەورەکانـە، وە ئیمـان‌و برایەتـی ئیمانـی لا ناچێـت لەگەڵ بوونـی کوشـتاردا، وەک تاوانە گەورەکانـی تـر، کـە لـە خـواری هاوبـەش دانانـەوەن، مەزهەبی ئەهلـی سـوننەو جەماعە لەسـەر ئەمەیە.
وە لەسـەر پێویسـت بوونـی چاکسـازی لـە نێـوان برواداراندا بە دادپـەروەری، وە لەسـەر پێویسـت بوونـی کوشـتاری ئەوانـەی دەسـتدرێژی دەکـەن، تـا ملکەچی فەرمانـی خوا ﷻ دەبن، وە لەسـەر ئـەوەی ئەگەر ئـەوان گەڕانەوە بۆ جگە لـە فەرمانی خوا، بـەوەی گەڕانەوە بـە جۆرێ دروسـت نیـە دانی پێـدا بنـرێو کاری پێبکرێ، بێگومـان ئەوە دروسـت نیە، وە بێگومـان ماڵەکانیـان پارێـزراوە، چونکە خـوا خوێنی حەڵاڵ کـردوە لەو کاتـەی بەردەوام بوون لەسـەر دەسـتدرێژی کردنیـان، جگە لـە ماڵەکانیان.
(١١): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ ٱلۡفُسُوقُ بَعۡدَ ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ١١ ﴾ :
﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ ، هەروەهـا ئەمـەش یەکێکـە لـە مافەکانـی بـرواداران، هەندێکیـان بەسـەر هەندێکـی دیکـە، کـە﴿ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ ﴾ (با هیـچ کۆمەڵێـک گاڵتە نەکەن بـە کۆمەڵێکـی تریـان) بە هیـچ گوفتارو قسـەو کردەوەیەک، کـە بەڵگەبێ لەسـەر بە کەم دانانـی بـرا بڕوادارەکـەی، چونکـە بێگومان ئەوە دروسـت نیـە، وە ئەوەش بەڵگەیە لەسـەر سەرسـامبوونی گاڵتـە پێکـەر بە نەفسـی خۆی.
ڕەنگـە گاڵتـە پێکـراو چاکتـر بـێ لـە گاڵتەپێکەر لـەلای خوا، وەکـو چۆن بـە زۆری بەو جۆرەیـە، چونکـە گاڵتە کـردن دەرناچێ مەگەر لە دڵێکەوە پڕبێ لە ڕەوشـتی ناشـرین، خۆی

رازاندبێتــەوە بە هەموو ڕەوشــتێکی سەرزەنشــتکراو، لەبــەر ئەمەیە پێغەمبــەر ﷺ فەرموویەتی: {بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ}، (واتــە: بــە پێــی خراپــی کەســەکە بــرا بڕواداره‌کــەی بە کــەم دەزانێ).
پاشــان فەرمــووی: ﴿ وَلَا تَلْمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمْ ﴾ واتــە: بــا هەندێکتان تانەو تەشــەر لــەوی دیکە نــەدات، وە (اللمز) بە قســەکردنە، و(الهمز) بــە کردەوەیە، هەردووکیــان ڕێگریان لێکراوەو قەدەغــەن، هەرەشــە کــراوە لەســەری بــە دۆزەخ، هــەروەک خــوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ﴿١﴾ ﴾ الهمزة. (واتــە: ســزاو لەناوچــوون بــۆ هەمــوو نەنــگ گرێکی بەدگۆ عەیــب گرێکــی تانەدەر).
وە بــرای بــڕواداری بــە نەفــس داناوە بــۆ براکەی، چونکــە بــڕواداران دەبێ بەو شــێوەیە بن وەکــو یــەک جەســتە، وە لەبەر ئــەوەی بــە ڕەفتارتانە لە کەســی بەرانبەری بدات، پێویســت دەبــێ کەســی بەرانبەریــش وەکو ئــەو وەڵامــی بداتەوە، ئەمــە دەبێتــە هۆکار بۆ ئــەو کارە خراپە.
﴿ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلْأَلْقَٰبِ ﴾ واتــە: با هیــچ کەس تانەو تەشــەر لە براکەی نــەدات، نازناوێکی ناشــرینی لــێ نەنــێ کــە پێــی ناخــۆش بــێ، ئــا ئەمــە پێــی دەوتــرێ نــاوو ناتــۆرە، بــەڵام ئــەو نازناوانــەی کــە سەرزەنشــت نەکــراوە ناچنە نــاو ئەمــەوە، ﴿ بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ٱلْفُسُوقُ بَعْدَ ٱلْإِيمَٰنِ ﴾ واتــە: خراپتریــن شــتێکتان گۆڕیبێتەوە لە ئیمانــەوە کردەوە بە شــەریعەتەکانیو ئەوەیشــی کــە پێویســتە بە پشــت تێکــردن، لــە فەرمــانو قەدەغەکراوەکانی، بــە ناوبردنی گوناهــو ســەرپێچی کــە بریتیــە لە نــاوو ناتۆرەی نەشــیاو.
﴿ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ (واتــە: جــا ئەوەی پەشــیمان نەبێتەوە ئــەوە ئەوانە هەر خۆیــان ســتەمکارن) جا ئەمە پێویســتە لەســەر بەنــدە بگەڕێتەوە بۆ لای خــوا ﷻ، وە دەربچێ لــە مافــی برا مســوڵمانەکەی بــە حــەڵاڵ کردنــیو داوای لێخۆشــبوون، وە ستایشــکردنی لە ســەر ئەوەی سەرزەنشــتی کردوە.
﴿ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ خەڵکــی دوو بەشــن: بەشــێکیان ســتەمی لــە نەفســی خــۆی کــردوە بەبــێ تەوبە کــردن، وە بەشــێکی دیکەیان تەوبــەی کردووەو ســەرفراز بووە، وە بەشــی ســێیەم نیــە جگە لــەو دووانە.


يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ
إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن
يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ
تَوَّابٞ رَّحِيمٞ ١٢ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ
شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ
عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣ ۞ قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن
قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ
وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٤
إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ
وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ
ٱلصَّٰدِقُونَ ١٥ قُلۡ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمۡ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا فِي
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ١٦ يَمُنُّونَ
عَلَيۡكَ أَنۡ أَسۡلَمُواْۖ قُل لَّا تَمُنُّواْ عَلَيَّ إِسۡلَٰمَكُمۖ بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ
عَلَيۡكُمۡ أَنۡ هَدَىٰكُمۡ لِلۡإِيمَٰنِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١٧ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ
غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٨

(١٢): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢﴾ ﴾

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ ﴾ خوا ﷻ ڕێگری کردوە لە زۆرێ لە گومانە خراپەکان بە بڕواداران، ﴿ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ ﴾(واتە: چونکە بەڕاستی هەندێ لە گومانەکان تاوانن) ئەویش وەکو گومانێکی بەتاڵ لە ڕاستیو بەڵگە، وە وەک گومانی خراپ کە زۆرێ لە قسەو ڕەفتارە خراپەکان پەیوەست دەبن پێیەوە، بێگومان مانەوەی گومانی خراپ لە دڵدا تەنها بەوەوە ناوەستێ لەسەر خاوەنەکەی، بەڵکو لەگەڵیدا دەمێنێتەوە تا خاوەنەکەی شتێ دەڵێو شتێ دەکات کە شیاو نیە.

هەروەها لەوەدا گومان بردنی خراپە بە مسوڵمانو ڕق لێبوونەوەو دژایەتی کردنی، ئەوەی فەرمانی پێکراوە پێچەوانەی ئەوەیە.

﴿ وَلَا تَجَسَّسُواْ ﴾واتە: مەگەڕێن بە دوای عەورەتو ناتەواوی مسوڵماناندا، واز لە مسوڵمان بێنن بە حاڵی خۆیەوە، وە بێئاگایی لە ناتەواوی‌و دۆخی ئەو بەکار بهێنن، چونکە ئەگەر بڵاو ببێتەوە شتانێکی خراپ ڕوودەدەن.

﴿ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ ﴾(واتە: لە پاشملە بە خراپە باسی یەکتر مەکەن) وە غەیبەت کردن وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: باسکردنی براکەتە بەوەی پێی ناخۆشە ئەگەرچی تیایدا بێ.

پاشان باسی نموونەیەکی ترسێنەری کردوە دەربارەی غەیبەت کردن، فەرموویەتی:
﴿ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ ﴾(واتە: ئایا کام لە ئێوە پێی خۆشە کە گۆشتی براکەی بخوات بە مردوویی کە قێزتان لێدەبێتەوەو پێتان ناخۆشە)،

گۆشــت خواردنــی بــە مردوویەتی شــوبهاندووە کــە بەلای نەفــسو دەروونــەوە زۆر قورسو گرانــە بــە غەیبەت کردنــی، جا وەک چۆن پێتان ناخۆشــە گۆشــتەکەی بخــۆن، وە بە تایبەت ئەگــەر مــردوو بــێو رووحــی تێــدا نەبــێ، ئــا بــەو شــێوەیە با پێتــان ناخــۆش بــێ غەیبەت کردنــی، وە خواردنی گۆشــتی بــە زیندوویّتــی! ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٞ رَّحِيمٞ ﴾ (التواب) ئەو زاتەیــە مۆڵــەت دەدات بــە تەوبــە کردنــی بەندەکــەیو ســەرکەوتووی دەکات بۆی، پاشــان لێــی خــۆش دەبــێ بە قبــووڵ کردنــی تەوبەکــەی، بــە بەزەییە بــە بەندەکانــی، کاتــێ بانگی کــردوون بــۆ لای ئــەوەی ســوودی هەیە بۆیــانو تەوبــەی لێوەرگرتــوون، ئەم دەقــە بەڵگەیە لەســەر ترســاندنێکی قورسو ســەخت لە غەیبەت کــردن، وە بێگومان قســەکردن لە پاشــملە لــە تاوانــە گەورەکانــە، چونکە خــوا ﷻ لــە یەکی چووانــدووە بــە خواردنی گۆشــتی مردوو ئەویش لــە تاوانــە گەورەکانە.

(١٣): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣ ﴾:

خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات کــە بێگومــان ئەو نەوەکانــی ئادەمی دروســتکردوە لە یــەک بنچینەو یــەک رەگــەز، وە هەموویــان لە نێرو مێیە کــن، دەگەڕێنەوە بــۆ ئادەمو حــەووا، بەڵام خوا ﷻ بــڵاوی کردۆتــەوە لێیانەوە کۆمەڵە پیــاو ئافرەتانێکی زۆر، وە بەش بەشــی کــردوون بە چەند گــەلو هۆزێکــی گەورەو بچــووک، ئەویش لــە پێناو ئەوەی یەکتر بناســن، بێگومــان ئەگەر هــەر یەکێــک لــە ئــەوان ســەربەخۆ بووایە بە خــودی خۆی، ئــەوە بەو شــێوەیە یەکتر ناســی دەســتەبەر نەدەبــوو، کە بــە دوایدا سەرخســتنو یارمەتیو وەچــەو رەچەڵەک رێــک دەخرێ، لەگــەڵ بەجێهێنانــی مافــی خزمایەتــی، بــەلام خــوا کردوونــی بە چەنــد گــەلو هۆزێک، لە پێنــاو ئــەوەی ئــەم کارانــە دەســتەبەر بن، وە جگــە لەمانــەش ئەوەی وەســتاوە لەســەر یەکتر ناســیو گەیشــتنی رەچەڵەکــەکان، بــەلام بەرێــز بــوون پەیوەســتە بــە پارێــزکاریو لــە خواترســان، جــا بەرێزترینیان لــە لای خــوا خۆپارێزترینیانە، ئەویش ئەو کەســەیە زۆرترینیان بــێ لــە گوێڕایەڵی کردنــداو لە هەموویــان زیاتــر دوور بکەوێتــەوە لە ســەرپێچیەکان، نەک نزیکترینیــان بــە خزمایەتیو نەتــەوەو هۆزایەتــی، و نە بەرێزترینیــان لــە رووی رەچەڵەکەوە. بــەلام خــوا زۆر زاناو ئاگــادارە، دەزانــێ کێ لەوان هەڵدەســتێ بە ترســان لە خوا بە ئاشــکراو بەنهێنــی، لــەوە پێــی هەڵدەســتێ بــە ئاشــکرا نــەک بــە نهێنــی، جــا پاداشــتی هــەر یەکەیان دەداتــەوە بەوەی شایســتەیەتی. ئــەم دەقە بەڵگەیە لەســەر ئەوەی زانینی رەچەڵــەک داواکراوەو

ڕێگەپێـدراوە، چونکـە خـوا ﷻ کردوونـی بـە چەند گەلو هـۆزەوە لە پێنـاو ئەوە.

(١٤-١٨): ﴿ قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾ قُلۡ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمۡ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١٦﴾ يَمُنُّونَ عَلَيۡكَ أَنۡ أَسۡلَمُواْۖ قُل لَّا تَمُنُّواْ عَلَيَّ إِسۡلَٰمَكُمۖ بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيۡكُمۡ أَنۡ هَدَىٰكُمۡ لِلۡإِيمَٰنِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٨﴾ ﴾

﴿ قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّا ﴾ خـوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی قسـەی دەشـتەکیەکان، ئەوانەی لە سـەردەمی پێغەمبـەر ﷺ هاتنـە ناو ئیسـلامەوە بەبێ بەرچاو ڕوونـی، وە بەبـێ جێبەجێ کردنی ئەوانـەی کە ئیسـلام پێویسـتی کـردوەو دەیخـوازێ، ئـەوان لەگەڵ ئەمـەدا ئەگـەر بانگەواز بکرانایـە دەیانـوت بڕوامان هێنـاوە، واتـە: بڕواهێنانێکی تـەواو کە هەمـوو مەرجەکانی لەخۆ گرتبـێ، خـوا ﷻ فەرمانـی بـە پێغەمبەرەکـەی کـرد ڕەتـی بکاتـەوە بەسـەریاندا، فەرمووی:

﴿ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ ﴾ واتـە: (پێیـان بڵـێ) بانگەشـەی پلـەو پایەی ئیمـان بۆ خۆتـان مەکەن، بە ئاشـکراو نهێنـیو تەواوەتی.

﴿ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا ﴾ واتـە: (بەڵکـو بڵێـن) هاتینە ناو ئیسـلامەوە، کورتی بکەنەوە لەسـەر ئـەوە، ﴿ وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡ ﴾ وە هـۆکاری ئەوەش بێگومان ئەوان (هێشـتا ئیمان نەچوەتـە نـاو دڵەکانتانـەوە) بەڵکـو بڕواتـان هێنـاوە بـە هـۆی ترس یـان ئومێد، یـان جگە لـەوە، لـەوەی کە هـۆکارە بـۆ بڕواهێنانتان، ئـا لەبـەر ئەمەیە ڕۆشـنایی ئیمـان نەچووەتە ناو دڵەکانتانەوە.

وە خـوا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡ ﴾ واتـە: لـە کاتـی ئەم قسـەیەی لێتانـەوە دەرچـوو، وەکـو ئـەوە وایـە ئاماژەیەکـی تێدابێت بـۆ بارودۆختـان لـە دوای ئەوە، بێگومـان زۆرێ لـەوان خوا منەتی کرد بەسـەریاندا بـە بڕواهێنانێکی ڕاسـتەقینەو جیهاد کردن لـە پێناویدا.

﴿ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾ بـە ئەنجامدانـی چاکـە، یـان وازهێنـان لـە خراپـە، ﴿ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔا ﴾ واتـە: هیـچ لـە پاداشـتی کردەوەکانتـان کـەم نـاکات، بە قـەد تۆزقاڵە زەڕەیەکیـش، بەڵکـو بـە تەواوترین شـێوە پێتـان دەدات، هیچی لێ لە دەسـت نـادەن، نە کەم

نـە زۆر ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾واتـە: لێبوردەیـە بۆ ئەو كەسـەی تەوبـە دەكاتو دەگەڕێتەوە بـۆ لای، میهرەبانـە بۆی كاتـێ تەوبە كـەی وەرگرت.

(١٥): ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾واتـە: (بێگومـان ئیماندارانـی) ڕاسـتەقینە ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾واتـە: ئەوانـەی كۆیـان كردۆتـەوە لـە نێـوان بڕواهێنـانو جیهادكـردن لە پێنـاوی خـوادا، بێگومان ئـەوەی جیهادی بێبڕوایـان بـكات، ئـەوە بەڵگەیە لەسـەر بڕواهێنانی تـەواو لەنـاو دڵدا، چونكە هەر كەسـێك جیهـادی دوژمنـان بكات لـە پێنـاو ئیسـلامو بەجێهێنانی یاسـاو ڕێسـاكانی، ئەوە لە پێشـترە جیهـاد كردنی نەفسـی خـۆی ئەنجام دابێ، وە هەر كەسـێك توانـای جیهادكردنـی نەبێ ئەوە بەڵگەیـە لەسـەر لاوازی ئیمانەكەی.

مەرجـی خـوا لە بڕواهێنانـدا بریتیە لە نەبوونی گومـان، چونكە بڕواهێنانی سـوودبەخش بریتیە لـە دڵنیایـی تـەواو، بەوەی خـوا فەرمانـی پێكـردوە بـە بڕواهێنان پێـی، كە هیـچ گومانێكی بەسـەردا نایە بـە جۆرێ لە جـۆرەكان.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴾ واتە: ئەوانەی بە كردەوە جوانەكانیان سەلماندوویانە بڕواهێنانەكەیان ڕاستەقینەیە، چونكە ڕاستی بانگەشەیەكی گەورەیە لە هەموو شتێكدا بانگەوازی بۆ بكرێ، خاوەنەكەی پێویستی بە بەڵگەو سەلماندن هەیە، وە مەزنترینی ئەوانە بانگەشەكردنی بڕواهێنانە، كە چەقی بەختەوەریو سەركەوتنو سەرفرازی هەمیشەییە، جا هەر كەسێ بانگەشەی بكاتو بەپێویستیەكانی هەڵبسێ، ئەوە بڕوادارێكی ڕاستەقینەیە، وە هەر كەسێ بەو شێوەیە نەبێ، ئەوە بێگومان زانراوە ڕاستگۆ نیە لە بانگەشەكەیدا، وە بانگەشەكەیشی هیچ سوودێكی نیە، چونكە بڕواهێنان لە دڵدایە، كەس پێی نازانێ جگە لە خوا.

(١٦): جا چەسپاندنو ڕەتكردنەوەی لە بابەتی زانستو زانیاری خوایە، بەوەی لە ناو دڵدایە، ئەمەش خراپی ڕەوشتو گومانە بە خوا، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ قُلْ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾(واتە: ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ: ئایا ئێوە خوا ئاگادار دەكەن لە ئاینەكەتان لە كاتێكدا خوا ئاگادارەو دەزانێ بە هەرچی لە ئاسمانەكانو زەویدایە، وە خوا بە هەموو شتێ زانایە)، ئەمە گشتگیرە بۆ هەموو شتەكان بە گشتی، كە لە چوارچێوەی ئەوانەشدا ئەوەی لە ناو دڵەكاندایە لە بڕواهێنانو بێبڕواییو چاكەو خراپە، بێگومان خوا ﷻ هەموو ئەوانە دەزانێو پاداشتی لەسەر دەداتەوە، ئەگەر چاك بێ بە چاكە، وە ئەگەر خراپیش بێ بە خراپە.

ئەمـە حاڵەتێکـە لە حاڵەتەکانی ئەو کەسـەی بانگەوازی بڕواهێنان دەکاتو بەو شـێوەیەش نیە، بێگومـان یان ئەوەیـە ئەو بڕواهێنانـە فێرکردنی خوای تێدایـە، وە بێگومان زانـراوە خوا زانایە بـە هەموو شـتێ، یـان ئەوەیە مەبەسـتیان لەم قسـەیەدا منـەت کردنـە لەسـەر پێغەمبەرەکەی، بێگومـان ئـەوان لـەو پێنـاوەدا ڕەنجێکـی زۆریـان داوە بـەوەی کـە لـە بەرژەوەندیـان نیـە، بەڵکـو ئـەوە لـە بەشـەکانی دونیایانـە، وە ئەمـەش خۆڕازاندنەوەیە کـە بـەوەی ناڕازێنرێتەوە، وە شـانازیە کە بـەوەی نابێ شـانازی پـێ بکەن لەسـەر پێغەمبەرەکـەی، بێگومان منـەت تەنها تایبەتـە بە خـوای گەورە لەسـەریان.

(١٧): جـا هـەر وەک چـۆن خـوا منـەت دەکات بەسـەریاندا، بـە دروسـت کـردنو ڕزقو ڕۆزیو منەتـە ئاشـکراو نهێنیـەکان، جا منەت کردنـی بەسـەریانەوە بە ڕێنمایـی کردنیان بۆ ئیسـلامو بڕواهێنـان مەزنتـرە لـە هەموو شـتێ، لەبەر ئەمەیـە خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ (واتـە: ئەو کەسـانە منـەت دەکەن بەسـەر تۆدا ئـەی موحەممـەد ﷺ، چونکە مسـوڵمان بوون تـۆش بڵـێ: منەتـی مسـوڵمان بوونی خۆتان بەسـەر منـدا مەکـەن، بەڵکو خوا منـەت دەکات بەسـەر ئێـوەدا، چونکە ڕێنمایـی کردوون بـۆ بڕواهێنـان ئەگەر ئێوە ڕاسـتگۆن).

﴿ إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾ واتـە: (خـوا دەزانێ بـە) کاروبارە شـاراوەکان لە ناو ئاسـمانەکانو زەویـدان، کـە بە لای خەڵکیـەوە نادیـارە، وەک ئەوەی لە قوڵایـی دەریاکانو لـە چۆڵەوانیەکانـدا هەیە، ئەوەی شـەو دەیشـارێتەوە، یان ئـەوەی ڕۆژ دەیشـارێتەوە، ئاگادارە بـە تکـی بارانـەکانو دانـە دانەی لمـەکان، وە ئەوانەیشـی لە نـاو دڵەکاندا شـاراوەن، ﴿ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿٥٩﴾ ﴾الأنعام (واتـە: وە هـەر گەڵایـەک بکەوێتە خوارەوە خـوا پێی دەزانـێ، وە هەر دانەوێڵەیـەک لـە تاریکیەکانـی زەویـدا بێت، وە هـەر تەڕو وشـکێک هەبێ هـەر هەموویان لـە کتێبـی ئاشـکرا دان (لـوح المحفوظ)، ﴿ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾ (خـوای پەروەردگار) کردەوەکانتـان بـۆ دەژمێـرێو پاداشـتان دەداتەوە لەسـەری، بە پێـی میهرەبانـی بەرفراوانیو کار دروسـتی تەواوی.

تەفسیری سووڕەتی (الحجرات) تەواو بوو.



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
قٓ وَالْقُرْءَانِ الْمَجِيدِ ١ بَلْ عَجِبُوٓا أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ
فَقَالَ الْكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَىْءٌ عَجِيبٌ ٢ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا ذَٰلِكَ
رَجْعٌۢ بَعِيدٌ ٣ قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ الْأَرْضُ مِنْهُمْ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ
حَفِيظٌۢ ٤ بَلْ كَذَّبُوا بِالْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ فَهُمْ فِىٓ أَمْرٍ مَّرِيجٍ ٥
أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا إِلَى السَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا
وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ٦ وَالْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ
وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ٧ تَبْصِرَةً وَذِكْرَىٰ لِكُلِّ عَبْدٍ
مُّنِيبٍ ٨ وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَآءِ مَآءً مُّبَٰرَكًا فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ جَنَّٰتٍ
وَحَبَّ الْحَصِيدِ ٩ وَالنَّخْلَ بَاسِقَٰتٍ لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ ١٠ رِّزْقًا
لِّلْعِبَادِ وَأَحْيَيْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا كَذَٰلِكَ الْخُرُوجُ ١١ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ
قَوْمُ نُوحٍ وَأَصْحَٰبُ الرَّسِّ وَثَمُودُ ١٢ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ وَإِخْوَٰنُ
لُوطٍ ١٣ وَأَصْحَٰبُ الْأَيْكَةِ وَقَوْمُ تُبَّعٍ كُلٌّ كَذَّبَ الرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ
١٤ أَفَعَيِينَا بِالْخَلْقِ الْأَوَّلِ بَلْ هُمْ فِى لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ ١٥

## تەفسیری سوورەتی (ق)
## مەككیە (٤٥) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٤): ﴿ قٓ وَالْقُرْءَانِ الْمَجِيدِ ١ بَلْ عَجِبُوٓا أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ فَقَالَ الْكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَىْءٌ عَجِيبٌ ٢ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا ذَٰلِكَ رَجْعٌۢ بَعِيدٌ ٣ قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ الْأَرْضُ مِنْهُمْ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظٌۢ ٤ ﴾:

﴿ قٓ وَالْقُرْءَانِ الْمَجِيدِ ﴾ خوا ﷻ سوێند دەخوات بە قورئانی بەرزو بەرێز، واتە: ماناکانی بەرفراوانو مەزنە، وە ڕووەکانی زۆرە، فەرو بەرەکەتی زۆرو بێپایانە، وە (المجد) فراوانی وەسفەکانو مەزنیان.

وە چاکترین فەرمایشتێ وەسف بکرێ بەم سیفەتە ئەم قورئانەیە، کە زانستی یەکەمینو دوایینی لەخۆ گرتووە، کە کۆی کردوەتەوە لە ڕەوانبێژی تەواوترینیان، وە لە فەرمایشتەکان چاکترینیان، وە لە ماناکان گشتگیر ترو جوانترینیان، ئەمەش تەواوی ئەو قورئانە پێویست دەکات، کە پێویستە شوێنی بکەوێو خێرا ملکەچی ببێ، وە سوپاسی خوا بکات لەسەر ئەم قورئانە کە خوا منەتی کردوە لەسەر بەندەکانی بە ناردنی، بەلام زۆربەی خەلکی وەک پێویست قەدری نیعمەتەکانی خوا نازانن، ئا لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی:

(٢): ﴿ بَلْ عَجِبُوٓا ﴾ واتە: (بەلام سەریان سوورما) بە درۆدانەرانی پێغەمبەر ﷺ ﴿ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ ﴾ واتە: دەیانترسێنێ لەوەی زیانی هەیە بۆیان، وە فەرمانیان پێدەکات بەوەی بە سوودە بۆیان، ئەو پێغەمبەرە ﷺ لە ڕەگەزی خۆیانە، دەتوانن شتی لێوەربگرنو بارودۆخو ڕاستگۆیی بزانن.

جا ئەوان سەریان سوورما لە کارێ نەدەبوو سەریان سوور بمایە لێی، بەلکو سەرسوور

دەمێنــێ لە عەقڵێ کە ســەری ســووڕماوە لــەو پێغەمبەرە ﷺ.
﴿فَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ ئەوانــەی بێبڕوایــیو بە درۆدانانیــان وای لێکردن نــەک بە هۆی کەمی زیرەکــیو بیــرو هۆشــیان، دەیانــوت: ﴿هَٰذَا شَيۡءٌ عَجِيبٌ﴾ واتــە: (ئەمە شــتێکی) ســەیرە، ئــەوان لەم سەرســووڕمانەدا لــە نێــوان دوو کاردا بوون:
یــان ڕاســتگۆن لەوەی ســەریان لێ ســووڕماوە، ئەمــەش بەڵگەیە لەســەر ئەوپــەڕی نەفامیو لاوازی عەقڵیــان، وەکــو شــێتێ وایــە کــە ســەری ســووڕ بمێنــێ لــە قســەی مرۆڤــی ژیرو عاقــڵ، وە وەکــو ترســنۆکێ وایــە کە ســەری ســووڕ بمێنــێ لــە ڕووبەڕووبوونــەوەی دوو ســوار چــاک، وە وەکــو ڕەزیلێ وایە کە ســەری ســووڕ بمێنێ لە بەخشــندەییو ســەخاوەتی ئەوانــەی بەخشــندەن، جــا چ زیانێ تــووش دەبێ لەو کەســەی ســەری ســووڕدەمێنێ لەوەی ئەمــە حاڵیەتــی؟ ئایــا سەرســووڕمانی بەڵگە نیــە لەســەر زوڵمو ســتەمو نەفامی؟
وە یان ئەوەیە ســەریان ســووڕماوە بە شــتێ کە دەزانــن هەڵەن تیایدا، ئەمــەش لە گەورەترین زوڵمو ستەمو ناشرینترینیانە.
(٣-٤): پاشــان باســی شــێوەی سەرســووڕمانەکەیانی کردوە، فەرموویەتــی: ﴿أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗاۖ ذَٰلِكَ رَجۡعُۢ بَعِيدٞ﴾ (واتــە: ئایــا کاتــێ مردیــنو بوویــن بــە خــۆڵ ئــەوە گەڕانەوەیەکی دوورەو نابــێ) توانــای دەســەڵاتی ئــەو زاتــەی بەســەر هەمــوو شــتێکدا زاڵــەو لــە هەمــوو ڕوویەکــەوە تــەواوە ئەندازەیــان کــردوە بەتوانــای بەنــدەی هــەژاری بــێ توانــا لــە هەموو ڕووەکانــەوە، وە کەســێکی نەفــام کە هیچ زانســتێکی نیــە ئەندازەیان کردوە بــەو زاتەی کە زانایــە بەســەر هەموو شــتێکدا، ئــەو زاتەی کە دەزانــێ زەوی چەنــدە لە لاشــەیان دەخوات، لــە مــاوەی مانەوەیانــدا لــە ژیانــی بــەرزەخ، بێگومــان لــە کتێبەکەیــدا ژماردوویەتــی، ئەو کتێبــەی پارێــزراوە لــە هەمــوو گۆڕانــکاریو دەســتکاری کردنێک، هەر شــتێ بەســەریان دابــێ لــە ژیانیــانو مردنیان، ئەمــەش بەڵگەهێنانەوەیــە بە تــەواوی زانســتی بەرفراوانی خوا، کــە هیــچ کــەس دەوری نــادات جگە لەو زاتــە نەبێ، بــە توانایــە لەســەر زیندوو کردنەوەی مردووەکان.
(٥): ﴿بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ فَهُمۡ فِيٓ أَمۡرٖ مَّرِيجٍ ٥﴾
﴿بَلۡ﴾ واتــە: بەڵکــو ئــەو قســەیەی لێیانــەوە دەرچــوو تەنهــا لــە عینــادیو بەدرۆدانانــی حەقــەوە ســەرچاوەی گرتووە، ئەو حەقو ڕاســتیەی کە بەرزترین جۆرەکانی ڕاســتیە، ﴿لَمَّا جَآءَهُمۡ فَهُمۡ فِيٓ أَمۡرٖ مَّرِيجٍ﴾ واتــە: (کاتــێ قورئانیــان بۆ هــات بۆیە ئەوان لە نــاو کارێکی)

تێکـەڵو پێکـەڵو گوماناویدا بوون، لەسـەر شـتێ جێگیـر نەدەبوونو دانەدەمـەزران، جارێ پێیـان دەوتـی: جادووگـەری، وە جارێکـی تر شـێت، وە جارێکی تر شـاعیر.
بـە هەمان شـێوە ئـەو قورئانەیـان کرد بە چەنـد بەشـەوە هەریەکەو بۆچوونـی خراپی خۆی دەربـارەی دەردەبـڕی، ئا بەم شـێوەیە هەرکەسـێ حـەق بـە درۆ دابنێ، ئـەوە کاروبارەکانی تێکـەڵ دەکات، نـە ڕووی ڕاسـتەقینەیان دەزانـێو نە دامـەزراو دەبێ، دەبینـی کارەکانی دژ بە یـەکو تێکەڵە.
وەک چـۆن کەسـێ شـوێنی حـەق بکـەوێو بەڕاسـتی بزانـێ (کـە بریتیـە لـە قورئـان) کاروبـاری ڕێکدەبـێو دەکەوێتـە سـەر ڕێگـای ڕاسـت، کردەوەکانـی ڕاسـتی قسـەکانی دەسـەلمێنن.
(٦-١١): ﴿ أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَـٰهَا وَزَيَّنَّـٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴿٦﴾ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَـٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴿٧﴾ تَبْصِرَةً وَذِكْرَىٰ لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴿٨﴾ وَنَزَّلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً مُّبَـٰرَكًا فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ جَنَّـٰتٍ وَحَبَّ ٱلْحَصِيدِ ﴿٩﴾ وَٱلنَّخْلَ بَاسِقَـٰتٍ لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ ﴿١٠﴾ رِّزْقًا لِّلْعِبَادِ ۖ وَأَحْيَيْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا ۚ كَذَٰلِكَ ٱلْخُرُوجُ ﴿١١﴾ ﴾
کاتـێ خـوا ﷻ باسـی حاڵی بەدرۆدانەرانی کردو، وە ئەوەیشـی سەرزەنشـتی کـردوون پێی، ئنجـا بانگـی کردن بۆ تەماشـا کردنو سـەرنجدان لە نیشـانە گەردوونیەکانـی، بەڵکو پەندی لێـوەر بگـرنو بیکـەن بە بەڵگە، لەسـەر ئـەوەی کراوەتە بەڵگە لەسـەری، جـا فەرموویەتی: ﴿ أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ ﴾ واتە: سـەرنجدانو تەماشـا کردنی ئاسـمانەکانو زەوی پێویسـت بـە ئەرکو ماندووبوونو گەشـت کـردن ناکات، بەڵکـو لەوپەڕی ئاسـانی دایە.
بـا سـەرنج بـدەن ﴿ كَيْفَ بَنَيْنَـٰهَا ﴾ (چۆن دروسـتمان کـردوە) وەک گومەزێکـی ڕێکـو چەسـپاو بـە هەمـوو لایەکـدا، ڕازێنراوەتـەوە بەو ئەسـتێرە گەڕۆکانـە، وە ئەو ئەسـتێرانەی لەگـەڵ خـۆردا دەڕۆنو بەڕۆژ خۆیان دەشـارنەوە، کە لە جوانیـدا نمونەیـان پێدەهێنرێتەوە، هیـچ کـەمو کـوریو ناتەواویەکیـان تێـدا نابینـی، بێگومـان خوا ئاسـمانەکانی کـردوە بە سـەقفێک بـۆ خەڵکـی سـەر زەوی، وە بەرژەوەندیە پێویسـتەکانیانی تیایـدا داناوە.
(٧): ﴿ وَٱلْأَرْضَ ﴾ وە سـەرنجی زەوی بـدە کە چۆن ﴿ مَدَدْنَـٰهَا ﴾ (ڕامان خسـتووە)، وە بەرفراوانمـان کـردوە، هەتـا هەمـوو گیانلەبەرێ تیایـدا بحەوێتـەوەو جێگیر ببـێ، وە ئامادە کـراوە بـۆ هەمـوو بەرژەوەندیـەکان، وە چەندین کێـوی دامـەزراوی تێدا دانـاوە بۆ ئەوەی لەرەو جوڵـە نەکات.

﴿ وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ﴾ واتــە: (تیاشــمانا ڕوانــدوە) لە هەموو جــۆرێ لە جۆرەکانی ڕووەک، کــە بینــەر دڵخــۆش‌و سەرســام دەکات، وە ســەرنجدەرانی ئۆقــرە دەگــرێ، بــۆ خواردنــی مــرۆڤ‌و خواردنــی ئاژەڵەکانیــان‌و ســوودو بەرژەوەندیەکانــی دیکەیان.

وە تایبەتــی کــردوە لەو ســوودو بەرژەوەندیانــە، بە باســکردنی ئەو بەهەشــتانەی کە میوەی خــۆش‌و بەتــام لەخــۆ دەگــرن، لــە تــرێ‌و هەنــارو پرتەقــاڵ‌و ســێو و جگــە لەوانــەش لــە جۆرەکانــی میوە.

(٨): هەروەهــا دار خورمــای بــەرزو بڵنــد کە بــەرز دەبێتەوە بۆ ئاســمان، بە جــۆرێ زۆرێک لەدارەکانــی دیکــە پێــی ناگــەن، دەریدەهێنێ بە هێشــووی تێک بەســتراو لە لــق‌و پۆکانی، کــە دەبێتــە ڕزق‌و ڕۆزی‌و بژێــوی‌و میــوە بــۆ بەنــدەکان، لێــی دەخــۆن‌و لێــی هەڵدەگــرن خۆیــان‌و ئاژەڵەکانیان.

(٩): وە بەهەمــان شــێوە ئــەوەی خوا ﷻ لــە زەوی دەریدێنــێ بە هۆی بارانەوە، وە ئەوەیشــی شــوێنەوارێتی لــەو ڕووبارانــەی کە لەســەر ڕووی زەوین، وە ئەوانەیشــی کــە لەژێریدان، لە ﴿ وَحَبَّ ٱلۡحَصِيدِ ﴾ واتــە: لــەو دانەوێڵانەی کــە دروێنــە دەکرێن، لە گەنم‌و جــۆو زوڕات (گەنمەشــامی) برنج‌و غەیــری وانیش.

(١٠-١١): بێگومــان لــە ســەرنجدانی هەموو ئەمانــەدا ﴿ تَبۡصِرَةٗ ﴾ بەرچاو ڕوونــی تێدایە، لە کوێــری نەفامــی، ﴿ وَذِكۡرَىٰ ﴾، وە پەندی تێدایە بۆ ئەو کەســەی بیــری لێدەکاتەوە، ئەوەی کــە ســوودی هەیە بــۆ ئاین‌و دونیــا، وە بیــری لێ دەکاتــەوە ئــەوەی خــواو پێغەمبەرەکەی هەواڵیــان پێــداوە، ئەمــەش بۆ هەمــوو کەســێک نیــە، بەڵکــو ﴿ لِكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ﴾ (واتە: بــۆ هەمــوو بەندەیەکــی گــەڕاوە) بــۆ لای خــوا، واتــە: ڕووی تێبــکات بــە خۆشەویســتی‌و تــرس‌و ئومێــدو وەڵامدانــەوەی بانگەوازەکــەی. بــەڵام بەدرۆدانــەر یــان ڕوو وەرگێــڕ، بە هیچ شــێوەیەک ترســێنەرو نیشــانەکان هیــچ ســوود ناگەیەنن، بە کەســانێک بــڕوا نەهێنن.

جــا پوختــەی ئەمە، بێگومــان ئــەوەی تیایدایە لــە دروســتکراوی سەرســوڕهێنەرو توندی بەهێــزی، بەڵگەیە لەســەر تــەواوی دەســەڵاتی خوا.

وە ئــەوەی تیایدایــە لــە جوانی‌و وردبینی‌و ســەیرو ســەمەرەیی دیمــەن‌و سروشــت، بەڵگەیە لەســەر ئــەوەی خــوا دادوەرترینــی هەمــوو فەرمانڕەواکانــە، بێگومــان ئــەو زاتە بــە هەموو شــتێک زانایە.

وە ئــەوەی تیایدایــە لە ســوودو بەرژەوەنــدی بۆ بەنــدەکان، بەڵگەیــە لەســەر میهرەبانی خوا

کـە دەوری هەمـوو شـتێکی داوە، وە بەخشـندەیی کە هەمـوو زیندەوەرێکـی گرتووەتەوە. وە ئـەوەی تیایدایـە لـە مەزنی سروشـتو سـەیرو سـەمەرەیی رێکخسـتن، بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی خـوا تـاکو تەنهایـەو بێنیازە، ئـەو زاتەی نـە هاوەڵی بۆ خـۆی داناوە نە منـداڵ، وە هەرگیـز هیـچ کەس هاوشـێوەو هاوتـای نیە، وە ئـەو زاتەی کە نابـێ بەندایەتـیو زەلیلیو خۆشەویسـتی دەربـبـردرێ تەنهـا بۆ ئـەو ﷻ نەبێت.

وە ئـەوەی تیایدایـە لـە زیندوو کردنـەوەی زەوی دوای مردنـی، بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی خوا مـردوو زینـدوو دەکاتـەوە، بـۆ ئـەوەی پاداشـتیان بداتەوە بـە پێـی کردەوەکانیـان، لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَأَحۡيَيۡنَا بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗاۚ كَذَٰلِكَ ٱلۡخُرُوجُ ﴾ (واتە: هەر بـەو بارانە زەوی مـردوو وشـک دەبوژێتـەوە، زیندوو کردنـەوەی مردووانیـش هەر بەو شـێوەیەیە.

کاتێ یادی خسـتنەوە بەم ئایەتە ئاسـمانیانە ترسـاندوونی بەوەی بەسـەر گەلەکانی پێشـوودا هێناویەتـی، بـۆ ئـەوەی بـەردەوام نەبـن لەسـەر ئـەوەی لەسـەری دەڕۆن لـە بەدرۆدانـانو بێبڕوایـی، تووشـیان ببـێ ئـەوەی براکانیان لـە بەدرۆدانەران تووشـی بوون، جـا فەرمووی: (١٢-١٥): ﴿ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَأَصۡحَٰبُ ٱلرَّسِّ وَثَمُودُ ١٢ وَعَادٞ وَفِرۡعَوۡنُ وَإِخۡوَٰنُ لُوطٖ ١٣ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ وَقَوۡمُ تُبَّعٖۚ كُلّٞ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ ١٤ أَفَعَيِينَا بِٱلۡخَلۡقِ ٱلۡأَوَّلِۚ بَلۡ هُمۡ فِي لَبۡسٖ مِّنۡ خَلۡقٖ جَدِيدٖ ١٥ ﴾

﴿ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَأَصۡحَٰبُ ٱلرَّسِّ وَثَمُودُ ١٢ وَعَادٞ وَفِرۡعَوۡنُ وَإِخۡوَٰنُ لُوطٖ ١٣ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ وَقَوۡمُ تُبَّعٖۚ كُلّٞ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ ﴾ واتـە: گەلەکانـی پێـش ئەوان پێغەمبـەرە بەڕێزو گەورەکانیـان بـە درۆ دادەنا، وەک: نووح ﷺ گەلەکەی بـە درۆیان دانا، وە ثمود پێغەمبەر صاڵحیـان بەدرۆدانـا، وە گەلـی عـاد هوودیان بـەدرۆ دانـا، وە گەلی لـوط لووطیـان بەدرۆ دانـا، هەروەهـا خـاوەن باخە چڕو پڕەکان شـوعەیبیان بـە درۆ دانا، وە گەلی توببـەع -(تُبَّع) هەمـوو پاشـایەکە لـە پێشـوودا پاشـایەتی یەمەنی کردبـێ پێش ئیسـلام- جا گەلـی توبەع ئـەو پێغەمبەرەیـان بـەدرۆ دانـا کـە خوا ناردی بـۆ ناویـان، وە خـوا هەواڵـی پێنەداوین ئەو پێغەمبـەرە کێیـە، وە کام شـوێنکەوتووە لـە شـوێنکەوتووەکان، بـە ناوبانـگ بـووە لە لای عـەرەب، چونکـە لـە عەرەبـە بە عـەرەب کـراوەکان بـوو، ئەوانەی کـە لایان شـاراوە نیە چـی بەسـەر عەرەبـدا هاتووە، بـە تایبەتی وەکـو ئـەم ڕووداوە مەزنـە، ئا ئەوانـە هەموویان پێغەمبەرانیـان بـەدرۆ دانـا، ئـەو پێغەمبەرانـەی کـە خـوا ناردنـی بۆ ناویـان، سـزاو تۆڵەی خوایان لەسـەر پێویسـت بوو.

ئێــوەش ئــەی ئەو کەســانەی بڕواتان بــە موحەممەد نەهێنــاوەو بەدرۆی دادەنێــن، هیچ کات لــە پێشــینتان چاکتــر نیــن، وە پێغەمبەرانــی ئەوانیــش بەرێزتر نین لــە پێغەمبەرەکــەی ئێوە، ئاگــاداری تــاوانو ســتەمتان بن، تاکــو ئەوەی تووشــی ئەوان هات تووشــی ئێــوە نەبێت.

(١٥): پاشــان خــوا ﷻ بەڵگــەی هێناوەتەوە بە دروســتکردنی یەکەم، لەســەر دروســتکردنی ســەر لە نوێ.

هەروەکــو چــۆن ئــەو زاتە لــە نەبوونەوە هێناونیــە بوون، بە هەمان شــێوە جارێکــی تر دوای مردنیــانو دوای ئەوەی بوون بە ئێســکو پروســکێکی ڕزیو دەیانهێنێتە بــوون، فەرموویەتی: ﴿ أَفَعَيِينَا ﴾ واتــە: ئایــا ئێمــە دەستەوســان بوویــنو تواناکان لاواز بــوو ﴿ بِٱلْخَلْقِ ٱلْأَوَّلِ ﴾ (واتــە: لــە دروســتکردنی یەکەمجــاردا؟) کارەکــە بــەو شــێوەیە نیــە، نەخێــر نــە بــێ توانا بوویــن نــە دەستەوســان لە دروســتکردنی یەکــەم، وە ئەوانیش هیــچ گومانێکیان لەمــەدا نیە. بەڵکــو ﴿ هُمْ فِى لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴾ (واتــە: لــە گومانــدان لــە دروســتکردنەوەیەکی ســەرلەنوێ) ئــا ئەمەیە کــە گومانیان تێدا بــوو، وە بەلایانــەوە ئاڵۆز بوو، لەگــەڵ ئەوەدا هیچ ئاڵۆزییەکــی تێدانیــە، چونکــە دووبــارە دروســتکردنەوە ئاســانترە لە ســەرەتا، وەک خوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ ﴿٢٧﴾ ﴾ الـروم (واتە: ئــەو خــوا زاتێکــە بەدیهێنانــی دەســتپێکردوە لــە پاشــان دوای مردنــی دووبــارە دروســتی دەکاتــەوە وە ئــەم دروســتکردنەوەی دووەمــە لای خوا ئاســانترە).

وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ وَنَعۡلَمُ مَا تُوَسۡوِسُ بِهِۦ نَفۡسُهُۥۖ وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ
مِنۡ حَبۡلِ ٱلۡوَرِيدِ ﴿١٦﴾ إِذۡ يَتَلَقَّى ٱلۡمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ
قَعِيدٞ ﴿١٧﴾ مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ ﴿١٨﴾ وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ
ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ ﴿١٩﴾ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِۚ ذَٰلِكَ
يَوۡمُ ٱلۡوَعِيدِ ﴿٢٠﴾ وَجَآءَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّعَهَا سَآئِقٞ وَشَهِيدٞ ﴿٢١﴾ لَّقَدۡ
كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ
﴿٢٢﴾ وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ﴿٢٣﴾ أَلۡقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ
عَنِيدٖ ﴿٢٤﴾ مَّنَّاعٖ لِّلۡخَيۡرِ مُعۡتَدٖ مُّرِيبٍ ﴿٢٥﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا
ءَاخَرَ فَأَلۡقِيَاهُ فِي ٱلۡعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ ﴿٢٦﴾ قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطۡغَيۡتُهُۥ
وَلَٰكِن كَانَ فِي ضَلَٰلِۢ بَعِيدٖ ﴿٢٧﴾ قَالَ لَا تَخۡتَصِمُواْ لَدَيَّ وَقَدۡ قَدَّمۡتُ
إِلَيۡكُم بِٱلۡوَعِيدِ ﴿٢٨﴾ مَا يُبَدَّلُ ٱلۡقَوۡلُ لَدَيَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿٢٩﴾
يَوۡمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمۡتَلَأۡتِ وَتَقُولُ هَلۡ مِن مَّزِيدٖ ﴿٣٠﴾ وَأُزۡلِفَتِ
ٱلۡجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِينَ غَيۡرَ بَعِيدٍ ﴿٣١﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٖ
﴿٣٢﴾ مَّنۡ خَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِ وَجَآءَ بِقَلۡبٖ مُّنِيبٍ ﴿٣٣﴾ ٱدۡخُلُوهَا
بِسَلَٰمٖۖ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡخُلُودِ ﴿٣٤﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيۡنَا مَزِيدٞ ﴿٣٥﴾

(١٦-١٨): ﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ وَنَعۡلَمُ مَا تُوَسۡوِسُ بِهِۦ نَفۡسُهُۥۖ وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنۡ حَبۡلِ ٱلۡوَرِيدِ ﴿١٦﴾ إِذۡ يَتَلَقَّى ٱلۡمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٞ ﴿١٧﴾ مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ ﴿١٨﴾﴾:

﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ وَنَعۡلَمُ مَا تُوَسۡوِسُ بِهِۦ نَفۡسُهُۥۖ وَنَحۡنُ﴾ خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات کــە تەنها ئــەو رەگەزی ئادەمیــزادی بەدیهێناوە، نێرو مێیــان، وە تەنها ئەو دەزانــێو ئاگادارە بــە بارودۆخەکانــی، ئەوەشــی دڵخۆشــی دەکاتو ئــەو خەیــاڵو خەتەرانــەی بە دڵیدا دێن.

وە ئــەو زاتــە ﴿أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنۡ حَبۡلِ ٱلۡوَرِيدِ﴾ (واتــە: نزیکتــرە لــەوەوە لــە)، (الوریــد): بریتیــە لــەو شــادەمارەی کە لە تەنیشــت رەگی خوێنبــەری قوربانیەوەیە، ئەمــەش وا دەکات لــە ئادەمیــزاد چاودێــری بەدیهێنەرەکەی بکات، ئــەو بەدیهێنــەرەی کە ئاگادارە بــە نهێنیو شــاراوەکانیو زۆر نزیکــە لێیــەوە لە هەمــوو بارودۆخەکانیدا، شــەرمی لێ بکات کــە بیبینێ کاتــێ رێگــری لێکــردوە، یــان پشــتگوێی بخات کاتــێ فەرمانــی پێکردوە.

بــە هەمان شــێوە پێویســتە فریشــتە بەرێزەکانی لــە بیر بێت، بــە گەورەیان دابنێــتو رێزیان لێبگــرێ، ئاگــاداری ئەوە بێت شــتێ نەکات یان شــتێ نەڵێت کە لەســەری بنوســرێ، لەوەی خــوا پێــی نارازیــە، لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿إِذۡ يَتَلَقَّى ٱلۡمُتَلَقِّيَانِ﴾ واتــە: کردارەکانــی بەنــدە تۆمــار دەکــەن بــە گشــتی، یەکێکیــان ﴿عَنِ ٱلۡيَمِينِ﴾ (بــەلای راســتدا) چاکەکانی دەنووســێ، وە ئــەوی دیکەیــان ﴿وَعَنِ ٱلشِّمَالِ﴾ (لــەلای چەپــی ئێــوە) کــردەوە خراپەکانی ئێــوە دەنووســێ، هەر یــەک لــەو دووانە ﴿قَعِيدٞ﴾ (دانیشــتوون) بــەو شــێوەیە، ئامادەیە بۆ ئــەو کارەی پێی ســپێردراوەو پەیوەســتە پێیەوە.

(١٨): ﴿مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ﴾ چاکــە بــێ، یــان خراپــە، ﴿إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ﴾ واتــە: چاودێرێکــی بــە ســەرەوەیەو ئامادەیە بــۆ بارودۆخــی، وەک خــوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ

عَلَيْكُمْ لَحَـٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَـٰتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾ ﴾الانفطار، (واتـە: بێگومـان چەنـد چاودێرێکتـان بەسـەرەوەیە * کـە بەڕێـزو نوسـەرن * هەرچـی بکـەن دەیزانـن).

(١٩-٢٢): ﴿ وَجَاءَتْ سَكْرَةُ ٱلْمَوْتِ بِٱلْحَقِّ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ ﴿١٩﴾ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْوَعِيدِ ﴿٢٠﴾ وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ ﴿٢١﴾ لَّقَدْ كُنتَ فِى غَفْلَةٍ مِّنْ هَـٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴿٢٢﴾ ﴾:

﴿ وَجَاءَتْ ﴾ ئـەم بێئاگـای بێبڕوایـە بـە ئایەتەکانـی خـوا، ﴿ سَكْرَةُ ٱلْمَوْتِ بِٱلْحَقِّ ﴾ واتە: نارەحەتـیو بێهۆشـی مـردن دێت لەگەڵ ڕاسـتیەکاندا، کـە گەڕانەوەو ڕزگار بـوون نەماوە، ﴿ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ ﴾ واتـە: (ئەمـە ئـەو مردنەیە) کـە خۆت لێی دوادەخسـت)و خۆت دەپاراست.

(٢٠): ﴿ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْوَعِيدِ ﴾ واتـە: ئـەو ڕۆژەی کـە خـوا بەڵێنی سـزای داوە بـە سـتەمکاران لە سـزادان، وە بـرواداران بە پاداشـت.

(٢١): ﴿ وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَآئِقٌ ﴾ (لەگـەڵ هەمـوو کەسـێکدا لێخوڕێـک دێـت بـۆ مەحشـەر) کـە لێی دەخوڕێ بۆ شـوێنی وەسـتانی ڕۆژی دوایـی، بە هیچ شـێوەیەک ناتوانێ خۆی دوابخات لێی، ﴿ وَشَهِيدٌ ﴾ شـایەتێک شـایەتی لەسـەر دەدات بـە کردەوەکانی چاک بـن، یـان خـراپ، ئەمـەش بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی خـوا ﷻ گرنگـی دەدات بـە بەندەکانیو کردەوەکانیـان دەپارێـزێو پاداشـتیان دەداتـەوە بە دادپـەروەری، جا ئـەم کارە لەوانەیە کە پێویسـتە لەسـەر بەندە گرنگـی پێبدات.

(٢٢): بـەڵام زۆربـەی خەڵـک بێئاگـان، لە بەرئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ لَّقَدْ كُنتَ فِى غَفْلَةٍ مِّنْ هَـٰذَا ﴾ واتـە: ئـەم قسـەیە دەوتـرێ بـە کەسـی ڕوو وەرگێـڕی بەدرۆدانـەر لـە ڕۆژی دواییـدا، وەکـو سەرزەنشـتو لۆمـە کردنێـک، واتە: بەڕاسـتی تـۆ ڕۆژی دواییـت بە درۆ دادەنـاو کارت بـۆ نەدەکـرد، ئـا ئێسـتا ﴿ فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ ﴾ (واتە: جا ئێمـە پەردەی ڕۆژی دواییمـان لەسـەر لادای) کـە دڵـی داپۆشـیبووی، بەو هۆیـەوە زۆر خەوتیـتو ڕوو وەرگێـڕانو پشـتتێکردنت بـەردەوام بـوو ﴿ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴾ (واتە: ئنجـا ئەمڕۆ چاوت تیـژەو دەبینـێ) ئەوە دەبینێ کە بێـزاری دەکاو دەیترسـێنێ لە جۆرەها سـزاو تۆڵە کردنەوە. یـان ئەمـە دواندنـی خوایە لەگـەڵ بەنـدەدا، چونکە ئـەو لـە دونیـادا بێئاگا بووە لـەوەی لە پێناویـدا دروسـت کراوە، بـەڵام لـە ڕۆژی دواییـدا ئاگـادار دەبێتەوەو خـەوە نوچکەکەی نامێنـێ، بـەڵام لـە کاتێکـدا کـە هەمـوو شـت کۆتایـی هاتـوەو بەسـەرچووە، ئەمـەش

ترساندنێكە لەلایەن خواوە بۆ بەندەكان، وە تۆقاندنێكە بەوەی چی بەسەر بەدرۆدانەراندا دێت لەو ڕۆژە مەزنەدا.

(٢٣-٢٩): ﴿ وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ﴿٢٣﴾ أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٢٤﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ ﴿٢٥﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِي ٱلْعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ ﴿٢٦﴾ قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطْغَيْتُهُۥ وَلَٰكِن كَانَ فِي ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٢٧﴾ قَالَ لَا تَخْتَصِمُواْ لَدَيَّ وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُم بِٱلْوَعِيدِ ﴿٢٨﴾ مَا يُبَدَّلُ ٱلْقَوْلُ لَدَيَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٢٩﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَقَالَ قَرِينُهُۥ ﴾ واتە: ئەو فریشتەیەی چاودێری ئەم بێبڕوا بەدرۆدانەرانەیە، لەو فریشتانەی كە خوا ڕایسپاردوون بە پاراستنی، وە پاراستنی كردەوەكانی، جا ئامادەی دەكات لە ڕۆژی دواییدا، وە كردەوەكانیشی ئامادە دەكاتو دەڵێت: ﴿ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ﴾ واتە: نامەی كردەوەكانیم ئامادە كردووە كە لەسەری دانراوم، لە پاراستنیو پاراستنی كردەوەكانی، جا پاداشت دەدرێتەوە بەپێی كردەوەكەی.

(٢٤): وە ئەو كەسەی شایستەی ئاگرە پێی دەوترێ: ﴿ أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ ﴾ واتە: (فڕێی دەنە ناو دۆزەخەوە هەموو كافرێكی سەركەش) كە زۆر بێبڕواییو عینادی ئایەتەكانی خوای كردبێ، وە سەرپێچی زۆری كردبێ، بوێرو چاو قایم بێ لەسەر قەدەغە كراوەكان.

(٢٥-٢٦): ﴿ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ ﴾ واتە: ڕێگری لەو چاكەیە دەكات لەلایەتیو وەریگرتووە، كە مەزنترینیان بڕواهێنانە بە خواو فریشتەكانیو كتێبەكانیو پێغەمبەرانی، ڕێگرە لە سوود وەرگرتنی ماڵەكەیو سوود وەرگرتنی جەستەی.

﴿ مُعْتَدٍ ﴾ واتە: (دەستدرێژیكارە) لەسەر بەندەكانی خوا، وە لەسەر سنوورەكانی ﴿ مُّرِيبٍ ﴾ واتە: بە گومانە لە پەیمانو هەڕەشەی خوا، نە بڕوای هەیەو نە چاكە، بەڵكو وەسفكراوە بە بێبڕواییو دژایەتیو گومانو دوو دڵیو چرووكی، وە جگە لە خوای بە بەزەیی چەند پەرستراوێكی دیكەی بۆ خۆی داناوە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِي جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴾ واتە: پەرستراوێكی دیكەی لەگەڵ خوادا پەرستووە كە نە هیچ سوودێكی بۆ خۆی بە دەستە، نە هیچ زیانو نە مردنو نە ژیانو نە زیندوو كردنەوە.

﴿ فَأَلْقِيَاهُ ﴾ واتە: ئەی هەردوو فریشتەكە؟ (فڕێی بدەنە) ﴿ فِي ٱلْعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ ﴾ (ناو سزای سەختەوە) كە ئەوە مەزنترینیانو سەخترینیانو ناخۆشترینیانە.

(٢٧):﴿ قَالَ قَرِينُهُۥ ﴾ ئـەو شـەیتانەی (لـە دونیـا لەگەڵیـدا بوو) خـۆی لێی بـەری دەکات، تاوانەکـەی دەخاتـە سـەر ئـەو﴿ رَبَّنَا مَآ أَطۡغَيۡتُهُۥ ﴾ (واتـە: ئـەی پەروەردگـارم مـن ئـەوم سـەرکەش نەکـرد)، چونکـە مـن هیـچ دەسـەڵاتو بەڵگەیەکـم بەسـەریەوە نەبـوو، بەڵکـو خـۆی لـە گومڕاییەکـی دوور لـە ڕاسـتی بـوو، جـا تەنهـا خـۆی گومـڕا بـوو، لە حـەقو ڕاسـتی دوور کەوتـەوە بـە ویسـتو ئارەزووی خـۆی، وەک لـە دەقێکـی دیکەدا فەرموویەتـی: ﴿ وَقَالَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمۡ وَعۡدَ ٱلۡحَقِّ وَوَعَدتُّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُكُمۡۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ فَٱسۡتَجَبۡتُمۡ لِيۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُم ﴿٢٢﴾ ﴾ إبراهیم، (واتـە: جا شـەیتان دەڵـێ: کاتێ کە کار تـەواو دەبێ بێگومـان خـوا بەڵێنـی پێـداون بـە بەڵێنێکـی حەقو ڕاسـت، وە منیـش بەڵێنم پێـدان، بەڵام درۆم کـرد لەگەڵتـان، وە مـن بەسـەرتاندا هیـچ دەسـەڵاتێکم نەبـوو، تەنهـا ئـەوە نەبێ کە بانگـم کـردن «بـۆ گومڕایی» ئیتـر ئێوەش بـە دەنگمەوە هاتنو بـە گوێتان کـردم کەواتە: لۆمـەی مـن مەکـەن، بەڵکو لۆمـەی خۆتـان بکەن).

(٢٨): خـوا ﷻ وەڵامـی دەمەقاڵێکەیـان دەداتـەوەو دەفەرمـوێ:﴿ لَا تَخۡتَصِمُواْ لَدَيَّ ﴾ واتە: هیـچ سـوودێکی نیـە دەمـە قاڵێکردنتـان لـە لای منـدا،﴿ وَقَدۡ قَدَّمۡتُ إِلَيۡكُم بِٱلۡوَعِيدِ ﴾ واتە: (چونکـە بێگومان پێشـتر هەڕەشـەم لـەم بارەیـەوە نـاردووە بۆتـان) پێغەمبەرانـی منتان بۆ هاتـووە، بە بەڵگـەی ڕوونو یەکلاکـەرەوە، بەڵگەو حوججەی من لەسـەرتان پێویسـت بوو هیـچ بیانوویەکتـان نەمـاوە، هاتوون بۆ لام بـە چەندین کـردەوە کە لە پێشـدا ئەنجامتانداوە، کـە پێویسـتە لەسـەری تۆڵەتان لـێ بکرێتەوە.

﴿ مَا يُبَدَّلُ ٱلۡقَوۡلُ لَدَيَّ ﴾ واتـە: ناگونجـێ ئـەوەی خـوا وتوویەتـیو هەواڵی پێـداوە گۆڕانی بەسـەردا بـێ، چونکـە هیـچ کەس لـە خوا ڕاسـتگۆتر نیـە، لە فەرمایشـتو قسـە کردندا.

﴿ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴾ بەڵکـو پاداشـتیان دەدەمـەوە بـەوەی کردوویانە لە چاکـەو خراپە، نـە لـە خراپەکانیان زیـاد دەکرێ، نـە لە چاکەکانیـان کـەم دەکرێتەوە.

(٣٠-٣٥): ﴿ يَوۡمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمۡتَلَأۡتِ وَتَقُولُ هَلۡ مِن مَّزِيدٖ ﴿٣٠﴾ وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِينَ غَيۡرَ بَعِيدٍ ﴿٣١﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٖ ﴿٣٢﴾ مَّنۡ خَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِ وَجَآءَ بِقَلۡبٖ مُّنِيبٍ ﴿٣٣﴾ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٖۖ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡخُلُودِ ﴿٣٤﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيۡنَا مَزِيدٞ ﴿٣٥﴾ ﴾:

خـوا ﷻ بەندەکانـی دەترسـێنێو دەفەرمـوێ:﴿ يَوۡمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمۡتَلَأۡتِ ﴾ ئەویـش بـە هـۆی زۆری ئـەوەی کـە تێـی فڕێـدراوە،﴿ وَتَقُولُ هَلۡ مِن مَّزِيدٖ ﴾ واتـە: بـەردەوام داوای

زیاتـر دەکات لـە تاوانبـارانو سـەرپێچیکاران، بە هـۆی توورەبوونی لەبـەر پەروەردگاری، وە خەشـمو قینـی لەسـەر بێبڕوایان.

بێگومـان خـوا پەیمانـی دابـوو دۆزەخ پـڕ بـکات، هـەر وەک فەرموویەتـی: ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾﴾هود، (واتـە: سـوێند بە خـوا دۆزەخ پـڕ دەکەم لە جنۆکـەو لـە ئادەمیـزاد هەموو پێکـەوە) هەتا خوا ﷻ قاچـی پیرۆزی دەخاتە نێـو دۆزەخەوە کـە پـاکو پاڵفتەیـە لـە لێکچوانـدن، هەندێکیـان لـە هەندێکی دیکـە نزیک دەبنـەوە، وە دەڵـێ: بەسـە بەسـە، بێگومان بـەس دەبیو پـڕ دەبێت.

(٣١): ﴿وَأُزْلِفَتِ الْجَنَّةُ﴾ واتـە: بەهەشـت نزیـک کراوەتـەوە بە جـۆرێ ئـەوەی تیایدایە دەبینـرێ، لـە نازونیعمـەتو خۆشـبەختیەکان، بۆیـە نزیـک کراوەتەوە لـە پێنـاو ئەوانەی لـە پەروەردگاریـان دەترسـن، وازیـان هێنـاوە لە هاوبـەش دانـان، فەرمانبـەردارو ملکەچی فەرمانەکانـی پەروەردگاریـان بوون.

(٣٢): بـە پیرۆزباییـەوە پێیـان دەوتـرێ: ﴿هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ﴾ واتـە: ئـەم بەهەشـتەو ئـەوەی تیایدایە لـەوەی نەفس حـەزی لێدەکاتو چـاو لەززەتی لێـوەر دەگرێ، بریتیـە لـەوەی خـوا ﷻ پەیمانیـداوە بەو کەسـانەی لـە هەمـوو کاتەکانـدا گەڕاونەتەوە بۆ لای، بـە یادکردنـیو خۆشویسـتنیو پشـت پێبەسـتنیو پاڕانەوەو ترسـان لێیو هیـوا بوون پێی.

﴿حَفِيظٍ﴾ واتـە: ئـەوەی خوا فەرمانیکـردوە دەیپارێزێ، بە جێبەجـێ کردنی فەرمانەکانی لەسـەر شـێوەی دڵسـۆزی، وە بە تەواویو بە چاکترین شێوە، سـنوورەکانی ئەوی پاراستووە.

(٣٣): ﴿مَّنْ خَشِيَ الرَّحْمَٰنَ﴾ واتـە: لێی ترسـابێ لە ڕووی ناسـینی پەروەردگـاری، وە ئومێدی بـە میهرەبانـی هەبـێ، وە بەردەوام بووبێ لەسـەر ترسـان لێی لـە حاڵەتی پەنهانـی، واتە: لەو کاتـەی لە بەرچـاوی خەڵکی نادیـارە، ئەمە پێی دەوترێ ترسـی ڕاسـتەقینە.

بـەڵام ترسـان لێی لـە کاتی ئامـادە بوونـی خەڵکیو لـە پێش چاویـان، هەندێ جـار دەبێتە ڕووپامایـیو ناوبانـگ، ئەوە بەڵگە نیە لەسـەر ترسـان، بەڵکو ترسـانی بە سـوود ترسـانە لە خوا لـە پەنهانیو ئاشـکرادا.

وە دەگونجـێ مەبەسـت لە ترسـان لە خـوا بە پەنهانی بێ، وەک مەبەسـت لـە بڕواهێنان بێت بـە پەنهـان، بێگومـان ئەمەش لـە بەرانبەر ئاشـکراییە، کاتـێ بڕواهێنانو ترسـان پێویسـت دەبێـت نـەک بە ویسـتو ئارەزوو، کاتێ سـزا بـە چاو دەبینێو نیشـانەکانی خـواش دێت،

ئەمــەش ئاشــکراو دیــارە. ﴿ وَجَآءَ بِقَلۡبٖ مُّنِيبٍ ﴾واتە: وەســف کرابــێ بە گەڕانــەوە بۆ لای پەروەردگــاری، وە ڕاکێشــانی پاڵنەرەکانی بــۆ لای ڕەزامەندی ئەو.

(٣٤): بەو کەســە لە خــوا ترس‌و چاکەخوازانــە دەوتــرێ: ﴿ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٖۖ ﴾واتە: چوونە ناوەوەیــەک گرێدرابێ بە ئاشــتی‌و ســەلامەتی لە ناڕەحەتی‌و بــەڵاکان، تیایــدا پارێزراون لە هەمــوو ناخۆشــیەکان، نازونیعمەتەکانیــان لێ ناپچــڕێ‌و کەم نابێتەوەو تــەواو نابێت، ﴿ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡخُلُودِ ﴾(واتــە: ئــەو ڕۆژە ڕۆژی نەمرییــە) کــە نــە نەمــان‌و مردنــی بەســەردا دێت، نە هیچ جۆرە شــتێ لــە ناڕەحەتیەکان.

﴿ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا ﴾هەر شــتێ وابەســتە بــێ بە ویســـت‌و داواکاریەکانیان ئامادەیــە تیایدا، وە بۆیشــیان هەیە لە ســەرووی ویســتەکانیانەوە، ﴿ مَزِيدٞ ﴾پاداشــتێ کە خــوای بە بەزەیی بۆیــان درێــژ دەکاتــەوەو زیــادی دەکات، لــەوەی چــاو نەیبینیــوە، گــوێ نەیبیســـتووەو بە خەتــەرەش بەســەر دڵی ئادەمیــزاددا نەهاتــووە، وە مەزنتــرو گەورەترو چاکتــر لەوانە بینینی ڕووخســاری خــوای بەخشــندەیە، وە چێــژ وەرگرتــن لــە بیســتنی قســەکانی، وە لــەززەت وەرگرتــن لــە نزیکی ئــەو زاتــە، داوادەکەین لە خــوا بمانگێڕێ بــە یەکێک لەوانــە (آمین).


وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَشَدُّ مِنْهُم بَطْشًا فَنَقَّبُوا
فِي الْبِلَادِ هَلْ مِن مَّحِيصٍ ﴿٣٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن
كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا
السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا
مِن لُّغُوبٍ ﴿٣٨﴾ فَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ
قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾ وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ
وَأَدْبَارَ السُّجُودِ ﴿٤٠﴾ وَاسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ الْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ
﴿٤١﴾ يَوْمَ يَسْمَعُونَ الصَّيْحَةَ بِالْحَقِّ ذَٰلِكَ يَوْمُ الْخُرُوجِ ﴿٤٢﴾ إِنَّا
نَحْنُ نُحْيِي وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا الْمَصِيرُ ﴿٤٣﴾ يَوْمَ تَشَقَّقُ الْأَرْضُ
عَنْهُمْ سِرَاعًا ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ ﴿٤٤﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ
وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾

(٣٦-٣٧): ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَشَدُّ مِنْهُم بَطْشًا فَنَقَّبُوا فِي الْبِلَادِ هَلْ مِن مَّحِيصٍ ﴿٣٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾ ﴾:

خـوا ﷻ هاوبەشـدانەرانو بەدرۆدانەرانـی پێغەمبـەر ﷺ دەترسـێنێو دەفەرمـوێ: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ ﴾ واتـە: گـەلو چینێکی زۆرمـان لە ناو بـرد (پێش ئەمـان) ﴿ هُمْ أَشَدُّ بَطْشًا ﴾ واتـە: بەهێزتر بوون لـەوان، وە شوێنەواریشـیان زیاتر بوو لـە زەویدا.

لەبـەر ئەمەیـە فەرمویەتـی: ﴿ فَنَقَّبُوا فِي الْبِلَادِ ﴾ (واتـە: خـۆ شـارو ولاٚتانیـان پشـکنیو گـەڕاون) قەلاٚو سـەنگەری بەرگریـکارو خانووی بەرزیـان بوونیاد نا، وە دارودرەختیـان چانـد، وە بەنداویان دروسـت کـردو کشـتووکاڵیان کـرد، وە ئاوەدانیان کـردەوەو تێکیانـدا، کاتـێ پێغەمبەرانیـان بـەدرۆ دانـاو نکوڵـی ئایەتەکانی خوایـان کرد، خـوا ﷻ گرتنـی بـە سـزایەکی سـەختو بـە ئێـش.

جـا ﴿ هَلْ مِن مَّحِيصٍ ﴾ واتـە: هیـچ پەناگەیەکیـان بۆ نەبوو لە سـزای خوا کاتێ سـزایان بـۆ دابـەزی، وە هیـچ ڕزگارکەرێکیـان نەبـوو، هێـزو توانـاو دەسـەلاٚتو مـاڵو منداڵیان سـوودی پێنەگەیاندن.

(٣٧): ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ ﴾ واتـە: (بێگومـان لـەم باسـەدا پەنـدو ئامۆژگـاری هەیـە بـۆ کەسـێک خـاوەن) دڵێکـی مەزنـی زیندوو بێـت، زیـرەکو پاک بێـت، ئەمـە ئەگەر شـتێک لـە ئایەتەکانی خـوای بەسـەردا بێ بیریـان لێدەکاتەوەو سـوود وەردەگـرێو بـەرز دەبێتەوە.

بـە هەمان شـێوە هەر کەسـێ گوێ بـۆ ئایەتەکانی خـوا بگرێو بیریشـی لێبکاتـەوەو دڵی، ﴿ شَهِيدٌ ﴾ واتـە: ئامـادە بێـت، بە هەمان شـێوە بـۆ ئەمـەش دەبێتە پەنـدو ئامۆژگاریو

شـیفاو ڕێنمایـی، بـەڵام کەسـێکی ڕوو وەرگێـڕ گـوێ نەگـرێ بـۆ ئایەتەکانی خـوا، ئەمە هیـچ سـوودێکی نابێـت بـۆی، چونکە هیچ بە دەمـەوە چوونێکـی بۆ نیـە، حیکمەتی خواش واناخـوازێ ڕێنمایـی کەسـێک بکات ئەمە وەسـفی بێ.

(٣٨-٤٠): ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ﴿٣٨﴾ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَـٰرَ ٱلسُّجُودِ ﴿٤٠﴾ ﴾.

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ﴾ ئەمـە ڕاگەیاندنێکـە لەلایـەن خـواوە دەربـارەی دەسـەڵاتی مەزنـیو ویسـتی جێبەجێکـەری، کـە مەزنترینـی بەدیهێنراوەکانـی پـێ بەدیهێنـاوە، ﴿ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ﴾ یەکەمینـی لـە ڕۆژی یەکشـەممە، وە دواییـنـی لـە ڕۆژی هەینـی، بەبـێ ماندووبـوونو ڕەنجـدانو شـەکەتیو بێتاقەتـی.

جـا ئەو زاتـەی ئاسـمانو زەوی بەدیهێناوە -لەسـەر گەورەیـیو مەزنیان- بە توانایە لەسـەر دروسـتکردنەوەی مـردووەکان، ﴿ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ ﴾ (واتـە: خۆگربـە بەرانبەر ئەو قسـە نابەجێیانـەی کـە دەیڵێن) لەسـەر سەزەنشـت کردنـتو بەدرۆدانانی ئـەوەی هێناوتە، وە خـۆت سـەرقاڵ بکـە بـە ستایشـی پەروەردگـارتو تەسـبیحاتی بکـە سـەرەتای ڕۆژو کۆتاییەکـەی، وە لـە کاتەکانـی شـەوو لـە دوای نوێـژەکان، بێگومـان زیکرو یـادی خوا دڵدانـەوەی دەروونـەو مایەی خۆشـیەتیو ئاسـانیە بـۆ خۆڕاگرتن.

(٤١-٤٥): ﴿ وَٱسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ ٱلْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يَسْمَعُونَ ٱلصَّيْحَةَ بِٱلْحَقِّ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ ﴿٤٢﴾ إِنَّا نَحْنُ نُحْىِۦ وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٣﴾ يَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلْأَرْضُ عَنْهُمْ سِرَاعًا ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ ﴿٤٤﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾ ﴾.

﴿ وَٱسْتَمِعْ ﴾ واتـە: بـە دڵـت گوێ بگـرە بۆ جـاڕی جاڕدەرێـک، ئەویش ئیسـرافیلە ﷺ کاتـێ فـوو دەکات بـە صـوڕدا ﴿ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴾ (لـە شـوێنێکی نزیک) لـە خەڵکی، ﴿ يَوْمَ يَسْمَعُونَ ٱلصَّيْحَةَ ﴾ واتـە: هەموو دروسـتکراوەکان دەنگێکی بێزارکەری ترسـناک دەبیسـتن ﴿ بِٱلْحَقِّ ﴾ بە ڕاسـتی، کـە هیچ گومـانو دوو دڵیەکـی تێدانیە.

﴿ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ ﴾ (واتـە: ئـەو ڕۆژە ڕۆژی هاتنـە دەرەوەیە) لە گـۆڕەکان، کە ئەو زاتە تـاکو تەنهایـە بەو هێنانە دەرەوەیە، زاڵە بەسـەر هەموو شـتێکدا، لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نُحْىِۦ وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٣﴾ يَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلْأَرْضُ عَنْهُمْ ﴾ (واتـە: بێگومـان

هــەر ئێمە دەژیێنیــنو دەمرێنین گەڕانەوەش هــەر بۆ لای ئێمەیــە * ڕۆژێ دێ زەوی قڵیش دەبـا) لە ئاسـتی ئەوانەی مــردوون ﴿ سِرَاعًا ﴾واتە: پەلــە دەکەن بۆ وەڵامدانــەوەی ئەوەی بانگیــان دەکات بــۆ جێگــای وەســتانی ڕۆژی دوایــی، ﴿ ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ ﴾واتــە: (ئــەو کۆکردنەوە) ئاســانە بــە لای خواوە، هیــچ نارەحەتیەکــی تێدانیەو هیچی تــێ ناچێ.

(٤٥): ﴿ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ ﴾(بێگومــان ئێمــە ئاگاداریــن بــەوەی کــە دەیڵێــن) بــە تــۆ، لــەوەی بێتاقەتــت دەکات لــە ئازاردان، جا ئەگــەر ئێمە زاناتریــن بەوەی کە ئــەوان دەیڵێن، ئــەوە بێگومــان زانیوتە چــۆن گرنگیمان پێــداویو کارمان بۆ ئاســان کردوویتو ســەرمان خســتووی بەســەر دوژمنەکانتــدا، دەی بــا دڵت خــۆش بێو نەفــسو دەروونــت دڵنیابێ، وە بــۆ ئــەوەی بزانــی ئێمە لــە تــۆ بەڕەحمترو بــە بەزەییترین لــە نەفــسو دەروونت.

هیچــت بــۆ نەماوەتــەوە تەنهــا چــاوەڕوان کردنــی بەڵێنــی خــواو شــوێنکەوتنی خــاوەن عەزمــەکان لــە پێغەمبەرانــی خــوا، ﴿ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ ﴾ واتــە: دەســەڵاتدار نیــت بەســەریانەوە، ﴿ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرٌ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ﴿٧﴾ ﴾الرعد، (واتــە: ئــەی موحەممــەد تۆ هــەر ترســێنەریو بــۆ هەمــوو گەلێــک ڕێنیشــاندەرێ هەیــە).

وە لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴾(واتــە: کەوایــە تــۆ بــەم قورئانــە ئامۆژگاری ئەو کەســە بکە لە هەڕەشــەی مــن دەترســێ)، (التذکیر) بریتیە لە یادهێنانــەوەی ئــەوەی لــە عەقڵو سروشــتدا جێگیــر بووە، لە خۆشویســتنی چاکــەو گرنگی پێدانــیو ئەنجامدانــی، وە لــە ڕق لێبوونــەوەی خراپــەو دوور کەوتنــەوە لێــی، بێگومان تەنها ئــەو کەســە ئامۆژگــاری وەردەگــرێ کە لە هەڕەشــەی خوا دەترســێ.

بــەڵام هەر کەســێ لە هەڕەشــەی خوا نەترســێو بــڕوای پێی نەبــێ، بێگومان ئەمە ســوودی بیرخســتنەوەو یادهێنانــەوەی پێویســت کردنی بەڵگەو حوججەیە لەســەریو بیانــوو بڕینێتی، لەبــەر ئــەوەی نەڵــێ: ﴿ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٍ وَلَا نَذِيرٍ ﴿١٩﴾ ﴾المائدة، (واتــە: هیچ مــژدەدەرو ترســێنەرێکمان بۆ نەهات).

تەفسیری سوورەتی (ق) تەواو بوو.



## تەفسیری سووڕەتی (الذاریات)

## مەککیە (٦٠) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٦): ﴿ وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا ١ فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا ٢ فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا ٣ فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا ٤ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٞ ٥ وَإِنَّ ٱلدِّينَ لَوَٰقِعٞ ٦ ﴾

ئەمە سوێندێکە لە لایەن خوای ڕاستگۆ لە قسەکانیدا بەم بەدیهێنراوە مەزنانە کە خوا تیایاندا جۆرەها بەرژەوەندیو سوودی داناوە، کە لەوانی دیکەدا بەو شێوەیە داینەناوە، لەسەر ئەوەی بەڵێنەکانی ڕاستن، وە بێگومان ڕۆژی پاداشت دانەوەو لێپرسینەوە لەسەر کردەوەکان ڕاستەو هەر دەبێ ڕووبدات، هیچ بەرگری کەرێک نیە بەرگری بکات.

جا ئەگەر خوای ڕاستگۆی مەزن هەواڵی پێداو سوێندی لەسەر خوارد، بەڵگەو سەلماندنی لەسەر هێنایەوە ئیتر بۆچی بە درۆدانەران بە درۆی دەزانن، وە پشت تێکەران ڕووی لێوەردەگێڕنو کاری پێناکەن؟! مەبەست لە ﴿ وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ﴾ بریتیە لەو بایانەی زۆر شت پەرشو بڵاو دەکەنەوە ﴿ ذَرۡوٗا ﴾ (بڵاوکردنەوەیەکی) لەسەرخۆو نەرمو نیان، وە بەهێزو وەڕسکەر.

(٢): ﴿ فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا ﴾ واتە: ئەو هەورانەی ئاوێکی زۆر هەڵدەگرن، کە سوودی هەیە بۆ وڵاتو بەندەکان.

(٣): ﴿ فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا ﴾ واتە: ئەو ئەستێرانەی بە شێوەیەکی ئاسانو لەسەرخۆ ڕێدەکەن، ئاسمانەکانی پێ دەڕازێتەوە، وە ڕێنماییان پێ وەردەگیرێ لە تاریکستانی دەشتو دەریا، وە لە بایەخ پێدانیان سوود وەردەگیرێ.

(٤): ﴿ فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا ﴾ ئەو فریشتانەی کاروبارەکان دابەش دەکەنو بەڕێوەیان دەبەن بە مۆڵەتی خوا، هەر یەک لەوانە خوا دایناوە بۆ ڕێکخستنی کارێ لە کارەکانی دونیاو کارەکانی دواڕۆژ، زێدەڕۆیی ناکات لەوەی بۆی دانراوەو بۆی دیاریکراوەو ڕێکخراوە، وە کەمتەرخەمی ناکاتو لێی کەم ناکاتەوە.

وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْحُبُكِ ﴿٧﴾ إِنَّكُمْ لَفِى قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ ﴿٨﴾ يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ ﴿٩﴾ قُتِلَ ٱلْخَرَّٰصُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى غَمْرَةٍ سَاهُونَ ﴿١١﴾ يَسْـَٔلُونَ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿١٢﴾ يَوْمَ هُمْ عَلَى ٱلنَّارِ يُفْتَنُونَ ﴿١٣﴾ ذُوقُوا۟ فِتْنَتَكُمْ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٤﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ وَفِى ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ وَفِى ٱلسَّمَآءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَآ أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ ﴿٢٣﴾ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٤﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَٰمًا ۖ قَالَ سَلَٰمٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٢٥﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴿٢٦﴾ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٢٧﴾ فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ فَأَقْبَلَتِ ٱمْرَأَتُهُۥ فِى صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٠﴾

**(٧-٩):** ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْحُبُكِ ﴿٧﴾ إِنَّكُمْ لَفِى قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ ﴿٨﴾ يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ ﴿٩﴾﴾:

﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْحُبُكِ﴾ واتە: سوێند بە ئاسمانی خاوەن ڕێگا چاکەکان، کە بە ڕێگاکانی ناو لم دەچێ، وە ئاوی دەریاکان کاتێک کە سروە دەیانجولێنێ.

**(٨)** ﴿إِنَّكُمْ﴾ ئەی بەدرۆدانەرانی پێغەمبەر ﷺ (بێگومان ئێوە)، ﴿لَفِى قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ﴾ (لە قسەی جیاوازدان) تیاتاندایە دەڵێ: جادووکەرە، وە تیاتاندایە دەڵێ: فاڵچیە، وە تیاتاندایە دەڵێ: شێتە، جگە لەوانەش لەو قسە جیاوازانەی کە بەڵگەن لەسەر دەستەوسانیو گومانیان، بێگومان ئەوەی ئەوان لەسەری دەڕۆن پووچو بەتاڵە.

**(٩):** ﴿يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ﴾ واتە: ئەو کەسە لادەدرێ کە لە ئیمان لادراوە، وە دڵە لایداوە لە بەڵگەکانی خوا کە دڵنیاکەرەوەن.

وە جیاوازی قسەکانیان بەڵگەیە لەسەر خراپیو پووچی بەڵگەکانیان، وەک چۆن کە بێگومان ئەو حەقو ڕاستیەی موحەممەد ﷺ پێی هاتووە یەکدەنگە لەسەری (هەندێکی هەندێکی دیکەی بەڕاست دادەنێ) نە دژیەکو نە جیاوازی تێدایە، ئەویش بەڵگەیە لەسەر ڕاستێتی، وە بێگومان ئەوە لەلای خواوە هاتووە، ﴿وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾﴾ النساء، (واتە: خۆ ئەگەر لەلایەن کەسێکی ترەوە بووایە، جگە لە خوا بێگومان جیاوازیەکی زۆریان تیادا دەبینی).

**(١٠-١٤):** ﴿قُتِلَ ٱلْخَرَّٰصُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى غَمْرَةٍ سَاهُونَ ﴿١١﴾ يَسْـَٔلُونَ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿١٢﴾ يَوْمَ هُمْ عَلَى ٱلنَّارِ يُفْتَنُونَ ﴿١٣﴾ ذُوقُوا۟ فِتْنَتَكُمْ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٤﴾﴾:

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿قُتِلَ ٱلْخَرَّٰصُونَ﴾ واتە: خوا ئەوانە بکوژێ درۆیان لەسەر خوا کردو نکوڵی ئایەتەکانیان کرد، وە لە پووچو بەتاڵدا ڕۆچوون بۆ ئەوەی

بەرپەرچی حەقی پێ بدەنەوە، ئەوانەی شتانێک لەسەر خوا دەڵێن بەبێ زانستو زانیاری.

(١١): ﴿ ٱلَّذِينَ هُمْ فِي غَمْرَةٍ ﴾ واتە: ئەوانەی لە گێژاوی بێبڕوایی‌و نەفامی‌و گومڕاییدان ﴿ سَاهُونَ ﴾ (بێئاگان).

(١٢): ﴿ يَسْـَٔلُونَ ﴾ (پرسیار دەکەن) بە گومانو گاڵتەجاڕی‌و بەدرۆدانانەوە، کەی ڕۆژی دوایی دێ؟ واتە: کەی زیندوو دەکرێنەوە، ئەوە بە دوور دادەنێن، پرسیار لە حاڵو خراپی دەرەنجامیان مەکە.

(١٣): ﴿ يَوْمَ هُمْ عَلَى ٱلنَّارِ يُفْتَنُونَ ﴾ واتە: ڕۆژێک سزا دەدرێن بە هۆی ئەوەی پیسی ناخو ڕواڵەتیان دەستی بەسەردا گرتبوون، وە پێیان دەوترێ:

(١٤): ﴿ ذُوقُواْ فِتْنَتَكُمْ ﴾ واتە: (بچێژن) ئەو سزاو ئاگرەی کە شوێنەواری ئەوەیە تووشی فیتنەیەک بوون، لەو تاقی کردنەوانەی کە بردیانی بۆ لای بێبڕوایی‌و گومڕایی.

﴿ هَٰذَا ﴾ ئەم سزایەی کە پێی گەیشتوون، بریتیە لەوەی: ﴿ ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴾ (کە بە گاڵتەو بە پەلە داواتان دەکرد)، ئا ئێستا بچەژن لە جۆرەها سزاو خەشمو قینو توڕەیی‌و کۆتو زنجیرو ناخۆشی.

(١٥-١٩): ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُواْ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِيٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ ﴾:

خوا ﷻ لە باسی پاداشتی پارێزکاران، وە گەیشتنیان بە پاداشتی کردەوەکانیان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ ئەوانەی پارێزکاری دروشمیان بوو، وە گوێڕایەڵی خوا پۆشاکیان بوو، ﴿ فِي جَنَّٰتٍ ﴾ (لە بەهەشتانێکدان) هەموو جۆرە دارو میوەکانی لەخۆ گرتووە کە لە دونیادا هاوشێوەیان هەیە، وە ئەوەیشی هاوشێوەی نیە، لەوانەی چاوەکان هاوشێوەیانی نەبینیوە، وە گوێیەکانیش نەیانبیستووە، وە بە خەتەرەش بەسەر دڵی بەندەکاندا نەهاتووە، ﴿ وَعُيُونٍ ﴾ کانیاوی هەڵقوڵاو باخچەکانیش تێر ئاو دەبن، وە بەندەکانی خواش لێی دەخۆنەوە، لە هەر شوێنێک بیانەوێ بەریدەدەنەوە، چۆن بەردانەوەیەک.

(١٦): ﴿ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ﴾ (ئەوەی خوا پێیداون وەریدەگرن) دەگونجێ

مانـای ئەوەبـێ کـە خەڵکانـی بەهەشـت خـوا ﷻ هەمـوو ئاواتەکانیـان پـێ دەبەخشـێ، لـە هەمـوو جۆرەکانـی نازونیعمـەت، جـا ئەوانیـش ڕازی دەبـن پێـیو چاویـان پـێ دەگەشـێتەوەو نەفـسو دەروونیـان پـێ دڵخـۆش دەبێ، وە داوای گـۆڕان ناکـەنو حـەز ناکـەن جێگۆڕکێیـان پـێ بکـرێ، هـەر یەکـەو ئەوەنـدە نازونیعمەتـی پێـدراوە کـە داوای زیاتـر نـەکات.

وە دەگونجـێ ئەمـە وەسـفێک بێـت بـۆ پارێـزاکارن لـە دونیـادا، کـە بێگومـان ئـەوان ئـەوەی خـوا پێـی داون وەریدەگـرن، لـە فەرمـانو قەدەغەکـراوەکان، وە پێشـوازی لێدەکـەن بـە سـنگ فراوانیـەوە، ملکەچـی ئـەوەن خـوا فەرمانـی پێکـردووە، بـە جێبەجێ کردنـی بـە تەواوتریـن شـێوەکان، وە کاتـێ قەدەغـەی لێکـرد بـە دوور کەوتنـەوە لێـی لەبـەر خـوا بـە تەواوتریـن شـێوە، بێگومـان ئـەوەی خـوا پێیانـی بەخشـیوە لـە فەرمـانو قەدەغەکـراوەکان ئـەوە گەورەتریـن بەخشـینە کـە حەقـی خۆیەتـی سوپاسـگوزاری خـوای لەسـەر بکـرێ، وە ملکـەچ بـوون.

وە مانـای یەکـەم گونجاوتـرە بـە سـیاقی فەرمایشـتەکە، چونکـە باسـی وەسـفیانی کـردوە لـە دونیـا، وە کردەوەکانیـان بـە فەرمـوودەی خـۆی: ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَبۡلَ ذَٰلِكَ﴾ (واتـە: بێگومـان ئـەوان پێـش ئـەو) کاتـەی کـە پێـی گەیشـتن بـەو نـازو نیعمەتانـە ﴿مُحۡسِنِينَ﴾ (چاکـەکار بـوون).

ئەمـەش گشـتگیرە بـە چاکەکردنیـان لـە پەرسـتنی پەروەردگاریـان، بـەوەی بیپەرسـتن وەکـو ئـەوەی تەماشـای بکـەن، جـا ئەگـەر نەیبینـن، ئـەوە بێگومـان ئـەو دەیانبینـێ، وە چاکەکـردن بـۆ بەندەکانـی خـوا بـە سـوود گەیانـدنو چاکـە لەگەڵیانـدا، لـە مـاڵ یـان زانسـت یـان ناوبانـگ یـان ئامۆژگـاری یـان فەرمـان بـە چاکـە یـان ڕێگـری لـە خراپـە، یـان جگـە لەوانـە لـە بوارەکانـی چاکـەو ڕێگاکانـی خێـر.

تەنانـەت دەچێتـە نـاو ئـەو چاکەیـەوە چاکـە کـردن بـە وتـەو قسـەی نـەرمو نیـان، وە چاکەکـردن لەگـەڵ خزمەتـکار، وە ئـەو ئاژەڵانـەی موڵـکوماڵـنو ئەوانەشـی موڵـک نین .

(١٧): وە لـە چاکتریـن جۆرەکانـی چاکـە لـە پەرسـتنی بەدیهێنـەردا، شـەو نوێـژە کـە بەڵگەیـە لەسـەر دڵسـۆزی، وە بەشـداری کـردن بـە دڵو زمـان، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿كَانُواْ﴾ واتـە: چاکەخـوازان، ﴿قَلِيلٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ﴾ واتـە: شـەوان

کەمێـک دەخەوتـن، بـەڵام زۆربـەی کاتەکانـی شـەو دەپاڕانـەوە لـە پەروەردگاریـان بـە نوێـژ کـردنو قورئـان خوێنـدنو زیکـرو پاڕانـەوەو گەردنکەچـی.

(١٨): ﴿ وَبِٱلۡأَسۡحَارِ ﴾ بریتیـە لـە تۆزێـک پێـش بەرەبەیـان، ﴿ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ ﴾ (واتـە: داوای لێخۆشـبوونیان دەکـرد) لـە خـوای بـەرز.

جـا نوێژەکانیـان درێـژ دەکـردەوە تـا تـۆزێ پێـش بەرەبەیـان، پاشـان دادەنیشـتن لـە کۆتایـی شـەونوێژەکەیاندا لـە خـوا دەپاڕانـەوە، بـە پاڕانـەوەی گوناهبـار لـە گوناهەکـەی، داوای لێخـۆش بـوون لـە پێـش بەرەبەیـان بەهـرەو تایبەتمەندیەکـە بـۆ جگـە لـەو نیـە، هەروەکـو خـوا ﷻ لـە وەسـفی خـاوەن بـڕواو چاکـەدا فەرموویەتـی: ﴿ وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ ١٧ ﴾آل عمـران، (واتـە: ئەوانـەی داوای لێخـۆش بـوون دەکـەن لـە پێـش بەرەبەیانـدا).

(١٩): ﴿ وَفِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ ﴾ (لـە مـاڵو دارایيانـدا حـەقو مافـی) پێویسـتو پەسـند هەیـە، ﴿ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ ﴾ واتـە: ئەوانـەی کـە پێویسـتیان پێیەتـی داوا لـە خەڵکـی دەکـەن، وە ئەوانـەی کـە داوایـان لـێ ناکـەن.

(٢٠-٢٣): ﴿ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ ءَايَٰتٞ لِّلۡمُوقِنِينَ ٢٠ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ٢١ وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزۡقُكُمۡ وَمَا تُوعَدُونَ ٢٢ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِنَّهُۥ لَحَقّٞ مِّثۡلَ مَآ أَنَّكُمۡ تَنطِقُونَ ٢٣ ﴾:

خـوا ﷻ بەندەکانـی بانـگ دەکات بـۆ بیرکردنـەوەو بایـەخ دان، دەفەرمـوێ: ﴿ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ ءَايَٰتٞ لِّلۡمُوقِنِينَ ﴾ (واتـە: وە لـە زەوی دا بەڵگـەو نیشـانە هەیـە بـۆ بـڕواداران) ئەویـش گشـتگیرە بـۆ خـودی زەویو ئەوەشـی تیایدایـە لـە شـاخەکانو ڕووبـارو دەریـاکانو دارودرەختـەکانو ڕووەکـەکان، دەبێتـە بەڵگـە بـۆ ئـەو کەسـەی بیـری لێدەکاتـەوەو سـەرنجی ماناکانـی دەداتو ورد دەبێتـەوە لێیـان، لەسـەر گەورەیـی بەدیهێنەرەکـەیو فراوانـی دەسـەڵاتیو گشـتگیریو چاکەکانـیو دەوردانـی زانسـتی بـە ئاشـکراو نهێنیـەکان. بـە هەمـان شـێوە لـە خـودی بەنـدە خۆیشـیدا پەنـدو حیکمـەتو میهرەبانـی زۆر هەیـە کـە بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی خـوا تـاکو تەنهـای بێنیـازە، بـە ڕاسـتی ئـەو زاتـە خەڵکـی بـە هاوەڵتـە دروسـت نەکـردوە.

(٢٢): وە فەرمـوودەی خـوا ﷻ ﴿ وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزۡقُكُمۡ ﴾ واتـە: توخمـی ڕزقو ڕۆزیتـان لـە بارانـەکانو لـە جـۆری قـەزاو قەدەرەکانـە، ڕزقو ڕۆزی ئاینـیو دونیایـی. ﴿ وَمَا تُوعَدُونَ ﴾ (واتـە: ئـەو بەڵێنانـەی پێتـان دراوە) لـە پاداشـت لـە دونیـاو دواڕۆژدا،

بێگومـــان ئەویـــش لـــە لایـــەن خـــواوە دادەبـــەزێ وەکـــو ســـەرجەم قـــەزاو قـــەدەرەکان.

(٢٣): کاتـــێ کـــە ئایەتەکانـــی ڕوون کـــردەوە، وە ئاگـــاداری کـــردەوە لەســـەری بـــە ئاگـــادار کردنـــەوە، کەســـی زیـــرەکو ژیـــر لێـــی تێدەگـــات، خـــوا ﷻ ســـوێندی خـــوارد کـــە بەڵێـــنو پاداشـــتی ڕاســـتە، وە ئەوەیشـــی لێکچوانـــد بـــە ئاشـــکراترین شـــتەکان لـــە لامـــان ئەویـــش بریتیـــە لـــە دەربڕیـــن، جـــا فەرمـــووی: ﴿ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِنَّهُۥ لَحَقٞ مِّثۡلَ مَآ أَنَّكُمۡ تَنطِقُونَ ﴾ (واتـــە: جـــا ســـوێند بـــە پەروەردگـــاری ئاســـمانەکانو زەوی بێگومـــان ئـــەوەی باســـکرا حـــەقو ڕاســـتە بـــە وێنـــەی ئـــەو قســـانەی خۆتـــان دەیکـــەن)، جـــا هـــەروەک چـــۆن گومانتـــان نیـــە لـــە دەربڕینتـــان، بـــە هەمـــان شـــێوە نابـــێ گومانتـــان هەبـــێ لـــە زیندووبونـــەوە دوای مـــردن.

(٢٤-٣٧): ﴿ هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيۡفِ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ (٢٤) إِذۡ دَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَقَالُواْ سَلَٰمٗاۖ قَالَ سَلَٰمٞ قَوۡمٞ مُّنكَرُونَ (٢٥) فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجۡلٖ سَمِينٖ (٢٦) فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيۡهِمۡ قَالَ أَلَا تَأۡكُلُونَ (٢٧) فَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةٗۖ قَالُواْ لَا تَخَفۡۖ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٖ (٢٨) فَأَقۡبَلَتِ ٱمۡرَأَتُهُۥ فِي صَرَّةٖ فَصَكَّتۡ وَجۡهَهَا وَقَالَتۡ عَجُوزٌ عَقِيمٞ (٢٩) قَالُواْ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡعَلِيمُ (٣٠) قَالَ فَمَا خَطۡبُكُمۡ أَيُّهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ (٣١) قَالُوٓاْ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمٖ مُّجۡرِمِينَ (٣٢) لِنُرۡسِلَ عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن طِينٖ (٣٣) مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ لِلۡمُسۡرِفِينَ (٣٤) فَأَخۡرَجۡنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (٣٥) فَمَا وَجَدۡنَا فِيهَا غَيۡرَ بَيۡتٖ مِّنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ (٣٦) وَتَرَكۡنَا فِيهَآ ءَايَةٗ لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ (٣٧) ﴾

خـــوا ﷻ دەفەرمـــوێ: ﴿ هَلۡ أَتَىٰكَ ﴾ واتـــە: ئایـــا بـــۆت هاتـــوە؟ ﴿ حَدِيثُ ضَيۡفِ إِبۡرَٰهِيمَ ﴾ (واتـــە: بەســـەرهاتی میوانـــە ڕێزدارەکانی ئیبراهیـــم) وە هەواڵە نامۆو سەرسوورهێنەرەکەیان، ئەوانیـــش ئـــەو فریشـــتانە بـــوون کـــە خـــوا ناردبوونـــی بـــۆ لەناوبردنـــی گەلـــی لـــوط، وە فەرمانـــی پێکـــردن تێپـــەڕن بەســـەر ئیبراهیمـــدا، ئەوانیـــش لـــە شـــێوەی میـــوان هاتـــن بـــۆ لای.

(٢٥): ﴿ إِذۡ دَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَقَالُواْ سَلَٰمٗاۖ قَالَ ﴾ لـــە وەڵامـــی ئەوانـــدا (گوتـــی:) ﴿ سَلَٰمٞ ﴾ واتـــە: ســـڵاو لـــە ئێـــوەش، ﴿ قَوۡمٞ مُّنكَرُونَ ﴾ واتـــە: ئێـــوە خەڵکێکـــی نەناســـراون، حەزدەکـــەم خۆتانـــم پـــێ بناســـێنن، نەیانـــی ناســـی دوای ئـــەوە نەبـــێ، لەبـــەر ئەمـــە ڕۆیشـــت بـــۆ لای خێزانەکـــەی بـــە پەلـــەو بـــە نهێنـــی تـــا میوانداریـــان بـــۆ ئامـــادە بـــکات.

(٢٦): ﴿ فَجَآءَ بِعِجۡلٖ سَمِينٖ (٢٦) فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيۡهِمۡ ﴾ (واتـــە: ئنجـــا گوێرەکەیەکـــی قەڵـــەوی بـــە بـــرژاوی بۆیـــان هێنـــا) خواردنەکـــەی لـــە پێشـــیان دانـــا، جـــا ﴿ قَالَ أَلَا تَأۡكُلُونَ (٢٧)

﴿فَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةٗۖ﴾ (واتــە: وتــی ئایــا ناخــۆن * ئەوســا لێیــان ترســا) كاتــێ كــە تەماشــای كــردن دەســت بــۆ خواردنەكــە نابــەن، ﴿قَالُواْ لَا تَخَفۡۖ﴾ (وتیــان: مەترســە) هەواڵیــان پێــدا كــە ئــەوان بۆچــی هاتــوون؟ ﴿وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٖ﴾ ئەویــش ئیســحاق بــوو ؑ.

(٢٩): كاتــێ كــە ئافرەتەكــە ئــەم مزگێنیــەی بیســت ﴿فَأَقۡبَلَتِ﴾ بــە دڵێكــی خــۆش‌و مژدەپێدانــەوە هــات ﴿فِي صَرَّةٖ﴾ واتــە: بــە قیــژە ﴿فَصَكَّتۡ وَجۡهَهَا﴾ (دای بــە ڕوومەتــی خۆیــدا) ئەمــەش لەوانەیــە كــە ئافرەتــان لــە كاتــی خۆشــیدا ئەنجامــی دەدەن، لــەو قســەو ڕەفتارانــەی پێچەوانــەی سروشــت‌و نەریتــن، ﴿وَقَالَتۡ عَجُوزٌ عَقِيمٞ﴾ واتــە: چــۆن منداڵــم دەبــێ، مــن پیرەژنێكــم گەیشــتومەتە تەمەنــێ كــە ئافرەتــان لــەو تەمەنــەدا منداڵیــان نابــێ، لەگــەڵ ئــەوەدا مــن نەزۆكــم، ڕەحــم‌و داوێنــم گونجــاو نیــە بــۆ منــداڵ، ئەمــە دوو بەربەســتە، هەریەكــێ لــەو دووانــە ڕێگــرن لــە منــداڵ بــوون.

وە لــە ســووڕەتی (هــود)دا باســی بەربەســتی ســێیەمی كــردوە، بــەوەی ئافرەتەكــە وتوویەتــی: ﴿وَهَٰذَا بَعۡلِي شَيۡخًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عَجِيبٞ ٧٢﴾هــود. (واتــە: ئەمــەش مێردەكەمــە كــە پیــرە بــە ڕاســتی ئەمــە شــتێكی ســەیرە).

(٣٠): ﴿قَالُواْ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِۖ﴾ واتــە: ئــەو زاتــەی كــە لــە قــەدەری خــۆی بڕیــاری لەســەر ئــەوە داوە، هیــچ سەرســووڕمانێك لــە توانــای خــوادا نیــە.

﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ ئــەو زاتــەی كــە شــتەكان لــە جێگــای خۆیانــدا دادەنــێ، بــە زانســتی فراوانــی دەوری هەمــوو شــتێكی داوە، كەواتــە ملكەچــی بڕیارەكانــی ببــن‌و سوپاســگوزاری بكــەن لەســەر نیعمەتەكانــی.

قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا الْمُرْسَلُونَ ﴿٣١﴾ قَالُوا إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَىٰ قَوْمٍ مُجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِنْ طِينٍ ﴿٣٣﴾ مُسَوَّمَةً عِنْدَ رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ ﴿٣٤﴾ فَأَخْرَجْنَا مَنْ كَانَ فِيهَا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٣٥﴾ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴿٣٦﴾ وَتَرَكْنَا فِيهَا آيَةً لِلَّذِينَ يَخَافُونَ الْعَذَابَ الْأَلِيمَ ﴿٣٧﴾ وَفِي مُوسَىٰ إِذْ أَرْسَلْنَاهُ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ ﴿٣٨﴾ فَتَوَلَّىٰ بِرُكْنِهِ وَقَالَ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذْنَاهُ وَجُنُودَهُ فَنَبَذْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿٤٠﴾ وَفِي عَادٍ إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الرِّيحَ الْعَقِيمَ ﴿٤١﴾ مَا تَذَرُ مِنْ شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ ﴿٤٢﴾ وَفِي ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٤٣﴾ فَعَتَوْا عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ فَأَخَذَتْهُمُ الصَّاعِقَةُ وَهُمْ يَنْظُرُونَ ﴿٤٤﴾ فَمَا اسْتَطَاعُوا مِنْ قِيَامٍ وَمَا كَانُوا مُنْتَصِرِينَ ﴿٤٥﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ مِنْ قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ ﴿٤٦﴾ وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ وَالْأَرْضَ فَرَشْنَاهَا فَنِعْمَ الْمَاهِدُونَ ﴿٤٨﴾ وَمِنْ كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ فَفِرُّوا إِلَى اللَّهِ إِنِّي لَكُمْ مِنْهُ نَذِيرٌ مُبِينٌ ﴿٥٠﴾ وَلَا تَجْعَلُوا مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ إِنِّي لَكُمْ مِنْهُ نَذِيرٌ مُبِينٌ ﴿٥١﴾

(٣١): ﴿ قَالَ ﴾ ئیبراهیم ﷺ پێیانی فەرموو: ﴿ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا الْمُرْسَلُونَ ﴾ واتە: ئێشتان چیەو چیتان دەوێ ئەی نێردراوەکان، چونکە هەستی کرد کە ئەوان نێردراون، خوا ناردوونی بۆ هەندێ شتی گرنگ.

(٣٢): ﴿ قَالُوا إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَىٰ قَوْمٍ مُجْرِمِينَ ﴾ ئەوانیش گەلی لووط بوون، بێگومان تاوانیان کردبوو، هاوەڵیان بۆ خوا دانابوو، وە پێغەمبەرەکەیان بە درۆ دانابوو، وە هەستان بە ئەنجامدانی تاوانێکی ناشرین‌و قێزەون، کە هیچ یەکێک لە جیهاندا پێش ئەوان ئەنجامی نەدابوو.

(٣٣-٣٤): ﴿ لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِنْ طِينٍ ﴿٣٣﴾ مُسَوَّمَةً عِنْدَ رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ ﴾ واتە: (بۆ ئەوەی بیارێنین بەسەریاندا بەرد لە گڵی سوورەوە کراو) لەسەر هەموو بەردێ ناوی خاوەنەکەی لێ نووسراوە، چونکە ئەوان زێدەڕۆ لە سنوور دەرچوو بوون.

جا ئیبراهیم ﷺ مشتوومڕی لەگەڵدا دەکردن دەربارەی گەلی لووط بەڵکو خوا سزایان نەدات، جا خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ يَا إِبْرَاهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا ۖ إِنَّهُ قَدْ جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَإِنَّهُمْ آتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ﴿٧٦﴾ ﴾هود (واتە: ئەی ئیبراهیم ﷺ وازبهێنە لەم کارە بێگومان بۆ ئەو کارە فەرمانی پەروەردگارت دەرچووە، وە بە ڕاستی بۆ ئەوان دێت سزایەکی نەگۆڕاو).

(٣٥): ﴿ فَأَخْرَجْنَا مَنْ كَانَ فِيهَا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٣٥﴾ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴾ ئەوانیش ماڵی لووط بوو ﷺ، جگە لە خێزانەکەی، چونکە ئەو لەگەڵ تیاچووواندا بوو، ﴿ وَتَرَكْنَا فِيهَا آيَةً لِلَّذِينَ يَخَافُونَ الْعَذَابَ الْأَلِيمَ ﴾ (واتە: وە پەندو نیشانەیەکمان تیایدا بەجێهێشت بۆ ئەوانەی کە لە سزای بە ئازار دەترسن) ئەوانەی پەندی لێوەردەگرن، وە دەزانن کە بێگومان خوا سزای توندە، وە پێغەمبەران‌و نێردراوانی ڕاستگۆو بە ڕاست دانراون.

## بەشێك:

## هەندێ لەو حوکمو بڕیارانەی ئەم چیرۆکە لە خۆی گرتوون:

یەکـەم: بێگومـان باسـکردنی هەواڵـی پیاوچـاکانو خراپـەکاران لـە لایـەن خـواوە بـۆ بەندەکانـی، حیکمەتـی تێدایـە، بـۆ ئـەوەی پەندیـان لـێ وەربگـرن، وە حاڵیـان بـە کوێ گەیشـت.

دووەم: چاکـەی ئیبراهیـم ﷺ کاتـێ خوا سـەرەتا بە چیرۆکەکـەی ئەو دەسـتی پێکردوە، بـەوەی کـە بەڵگەیـە لەسـەر گرنگیدان بـە بارودۆخیو بـە پەرۆش بـوون بۆی.

سـێیەم: شـەرعیەتدان بـە میوانـداری، ئەوەش لـە سـوننەتی ئیبراهیمە ﷺ کە خـوا فەرمانی کـردوە بـەم پێغەمبەرە ﷺو شـوێنکەوتووانی کـە شـوێنی ئوممەتەکەی ئەو بکـەون، لێرەدا خوا بە شـێوەی وەسـفو سـتایش کـردن هێناویەتی.

چـوارەم: دەبـێ میوان بە هەمـوو جۆرێ ڕێزی لـێ بگیرێ بـە هەموو جۆرەکانـی ڕێزگرتن بـە قسـەو کـردەوە، چونکـە خـوا وەسـفی میوانەکانـی کـرد بـەوەی ڕێزلێگیـراون، واتە: ئیبراهیـم ﷺ ڕێـزی لێگرتـوون، وە خـوا وەسـفی ئـەوەی کردوە کـە چی بـۆ میوانەکان کـرا لـە میوانداری بـە قسـەو کـردەوەش، وە هەروەها ڕێـز لێگیـراون لە لایـەن خواوە.

پێنجـەم: بێگومـان ئیبراهیـم ﷺ ماڵەکـەی شـوێنی مانـەوەی میـوانو ڕێبـوار بـوو، لەبەر ئـەوە بـوو چوونـە ژوورەوە بـۆ لای بەبـێ مۆڵـەت، بەڵکـو ڕێگـای ڕەوشـتیان گرتەبەر لە دەسـتپێکردن بـە سـڵاو کـردن، ئیبراهیمیـش وەڵامـی دانـەوە بـە سـڵاوێک تەواوتـر لە سـڵاوەکەیان، چونکـە بـە جوملەی ئیسـمی وەڵامی دانـەوە کە بەڵگەیە لەسـەر چەسـپانو جێگیر بوون.

شەشـەم: ڕێگەپێدانـی ڕۆیشـتن بـۆ لای کەسـێک کە بزانـرێ ئـەو بابەتە جـۆرێ پێوەندی بـەو کەسـەوە هەیە، چونکـە لـەوەدا سـوودێکی زۆر هەیە.

حەوتـەم: ڕەوشـت بـەرزیو نـەرمو نیانـی ئیبراهیـم لـە قسـەکردندا، کاتـێ گوتی: ﴿قَوْمٌ مُنكَرُونَ﴾ (واتـە: ئێـوە خەڵکێکـی نەناسـراون) نەیفەرمـوو: (أنكرتُكُـم) واتـە: مـن ناتان ناسـم، لـە نێـوان ئـەو دوو دەسـتەواژەدا جیـاوازی هەیـە، کە ئەمـە شـتێکە ڕوونە.

هەشـتەم: دەستپێشـخەریو پەلەکـردن لـە خزمەتکردنـی میوانـدا، چونکـە چاکترین چاکە ئەوەیـە بـە زوویـی بکـرێ، بۆیـە ئیبراهیـم ﷺ دەستپێشـخەری کـرد بـە ئامادەکردنـی خـواردن بـۆ میوانەکانی.

نۆیـەم: سـەربراوی ئامادەکـراو، کـە بێگومـان ئامادەکـراوە بـۆ جگـە لـەو میوانـەی کـە ئامادەیـە، ئەگـەر دابنرێـت بۆی هیـچ سـووکایەتیەکی تێدانیە، بەڵکـو ئـەوە ڕێزگرتنیەتی، وەک چـۆن ئیبراهیـم ﷺ کـردی، وە خوا هەواڵیدا کـە بێگومان میوانەکانـی ڕێزلێگیراون.

دەیـەم: ئـەوەی خـوا منەتـی کـردووە پێـی بەسـەر خۆشەویسـتیو خەلیلـی ئیبراهیـم لـە ڕێزگرتنـی زۆر، وە بوونـی ئـەو خواردنـەی کـە لـەلای ئامـادە بـوو، وە لـەماڵیـدا ئامادە کرابـوو، پێویسـتی بـەوە نەکرد بچێت لەبـازار یان لای دراوسـێ، یان جگە لەوانـە بیهێنێت.

یازدەیـەم: بێگومـان ئیبراهیـم ﷺ خـۆی خزمەتـی میوانەکانـی کـردووە، لـە کاتێکـدا خۆشەویسـتو خەلیلـی خـوای میهرەبـانو گـەورەی ئـەو دوو میوانـە بـوو.

دوازدەیـەم: ئیبراهیـم خواردنەکـەی لێیان نزیـک کردەوە لەو شـوێنەی ئەوان دانیشـتبوون، لـە جێگایەکـی دیکـە داینەنـاو پێیـان بڵێـت: (فەرموون یـان بڕۆن بـۆ لای) چونکـە ئەمە ئاسـانترە بۆ ئـەوانو چاکترە.

سـێزدەیەم: جـوان مامەڵـە کـردن لەگـەڵ میوان بە قسـەی نەرمو نیـان، بە تایبـەت لە کاتی نزیـک کردنـەوەی خواردن بـۆ لای، چونکە ئیبراهیـم ﷺ بە جوانترینو نـەرمو نیان ترین شـێوە خواردنـی خسـتە ڕوو بـۆ میوانـەکان، وە فەرمـووی: ﴿ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴾ (واتـە: ئایـا ناخـۆن) نەیفەرمـوو: بخـۆن. وە وێنـەی ئـەوە لەو قسـانەی جگە لەوانـە لە پێشـترن، بەڵکو بە ئامـرازی (العـرض) هێنای، فەرمـووی: ﴿ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴾.

جا پێویسـتە لەسـەر پەیـڕەوکار جوانتریـن دەسـتەواژە بەکاربهێنێت، ئەوەی کـە گونجاوەو شایسـتەیە بـۆ ئـەو جێگایـە، وەکـو ئـەوەی بـە میوانەکانـی بڵێـت: ئایـا ناخۆن، یـان ئایا نافەرمـوون لـە خزمەتتانـدا بیـنو شـەرەفمەندمان بکـەن، وە وێنەی ئەو قسـانە.

چـواردە: بێگومان هەرکەسـێ ترسـا لە کەسـێک بە هۆیەک لـە هۆکارەکان، ئەوە پێویسـتە ترسـەکەی لەسـەر لاببات، وە بـە هەرچی پێی وایە ترسـەکەی لادەچێت بـۆی باس بکاتو شـپرزەیی کـەم بکاتەوە، وەک فریشـتەکان بـە ئیبراهیمیان فەرموو کاتێ لێیان ترسـا، ﴿ لَا تَخَفْ ﴾ (مەترسـە) وە هەواڵیان پێدا بەو مژدە خۆشـە دوای ترسـان لێیان.

پـازدە: زۆر دڵخۆشـی خێزانـی ئیبراهیـم سـارا تا ئەوەی لێـی ڕوویدا کـە ڕوویـدا، لە دەمو چاوڕنینو هـاوار کردنێکی نائاسـایی.

شـازدە: ڕێـزو حورمەتی خـوا ﷻ بۆ ئیبراهیـمو خێزانەکەی سـارا، لە مژدەدان بـە منداڵێکی زاتـاو ژیر.

(٣٨-٤٠): ﴿ وَفِي مُوسَىٰٓ إِذۡ أَرۡسَلۡنَٰهُ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴿٣٨﴾ فَتَوَلَّىٰ بِرُكۡنِهِۦ وَقَالَ سَٰحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٞ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٞ ﴿٤٠﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَفِي مُوسَىٰٓ ﴾ وە ئەوەی خوا ﷻ مووسای پێناردوە بۆ لای فیرعەونو داروودەستەکەی، بە بەڵگە ڕوونەکانو موعجیزە ئاشکراکان، ئایەتو نیشانەیەکە بۆ ئەوانەی کە لە سزای بە ئێشو بە ئازار دەترسن، کاتێ مووسا ﵇ بەو بەڵگە ڕوونو ئاشکرایەوە هات، ﴿ فَتَوَلَّىٰ ﴾ فیرعەون ڕووی وەرگێڕا، ﴿ بِرُكۡنِهِۦ ﴾ واتە: بە هۆی دەسەڵاتەکەیەوە لە حەقو ڕاستیو لای لێ نەکردەوە، وە لەکەداری کرد بە مەزنترین لەکەدار کردن، وتی: ﴿ سَٰحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٞ ﴾ واتە: بێگومان مووسا ﵇ یان جادووگەرەو شتی خورافیاتی پێیە، هیچ شتێکی لە حەق پێ نیە، یان شێتە هەرچیش بڵێ لێی وەرناگیرێ، چونکە عەقڵی نیەو ناتەواوە.

ئەمە، بێگومان ئەوان زانیان بە تایبەتی فیرعەون کە مووسا ﵇ کەسێکی ڕاستگۆیە، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿١٤﴾ ﴾ النمل، (واتە: ئەو موعجیزانەیان دان پێدانەدەنا کە لە دڵی خۆیاندا بەڕاستیان دەزانی بە هۆی ستەمکاریو خۆبەزلزانییان).

مووسا بە فیرعەونی فەرموو: ﴿ قَالَ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ بَصَآئِرَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ الإسراء، (واتە: بێگومان تۆ دەزانی هیچ کەس ئەم موعجیزانەی نەناردۆتە خوارەوە بێجگە لە پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەوی کە ڕوونکەرەوەن).

(٤٠): ﴿ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٞ ﴿٤٠﴾ ﴾:

واتە: (ئێمەش خۆیو لەشکرەکەیمان گرتو فڕێمان دانە ناو دەریاوە کە ئەو) کەسێکی تاوانبارو زێدەڕۆو سەرکەشی دەکرد بەسەر خوادا، جا خوا تۆڵەی لێ سەند بە تۆڵەسەندنی کەسێکی زاڵی بە توانا.

(٤١-٤٢): ﴿ وَفِي عَادٍ إِذۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلرِّيحَ ٱلۡعَقِيمَ ﴿٤١﴾ مَا تَذَرُ مِن شَيۡءٍ أَتَتۡ عَلَيۡهِ إِلَّا جَعَلَتۡهُ كَٱلرَّمِيمِ ﴿٤٢﴾ ﴾:

﴿ وَفِي عَادٍ ﴾ ئەو هۆزە ناسراوە، بەڵگەیەکی مەزن هەیە ﴿ إِذۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلرِّيحَ ٱلۡعَقِيمَ ﴾ واتە: (کاتێ ناردمانە سەریان بایەکی گەرمی توند) کە هیچ خێرێکی تێدا نەبوو، کاتێ پێغەمبەرەکەیان کە هوودە ﵇ بە درۆیان دانا.

(٤٢): ﴿ مَا تَذَرُ مِن شَيۡءٍ أَتَتۡ عَلَيۡهِ إِلَّا جَعَلَتۡهُ كَٱلرَّمِيمِ ﴾ (واتە: بەسەر هەر شتێکدا بڕۆشتایە

وازی لێنەدەهێنـا) تـاوەک ڕزیـوی لێدەکـرد، جا ئەو زاتەی لـە ناوی بردن لـە کاتی تواناو دەسـەڵاتیاندا، بەڵگەیـە لەسـەر تەواوی هێـزو توانای، کە هیچ شـتێک ناتوانێ دەستەوسـانی بکات، تۆڵەسـێنەرە لەو کەسەی سـەرپێچی دەکات.

(٤٣-٤٥): ﴿ وَفِي ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٤٣﴾ فَعَتَوْا عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ فَأَخَذَتْهُمُ الصَّاعِقَةُ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴿٤٤﴾ فَمَا اسْتَطَاعُوا مِن قِيَامٍ وَمَا كَانُوا مُنتَصِرِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾

﴿ وَفِي ثَمُودَ ﴾ پەنـدو ئامۆژگـاری مـەزن هەیـە، کاتـێ خوا صالـح ﷺ نارد بـۆ ناویان، ئـەوان بەدرۆیـان دانـاو چاوقاییمیـان کـرد، خـوا ﷻ حوشـترێکی بـۆی نـارد تـا ببێتـە بەڵگەیەکـی بینـراو، ئـەم بەڵگەیـە هیچ سـودێکی پێنەگەیانـدن تەنها سەرکەشـیو ڕاکردن نەبێ.

جـا وتـرا: ﴿ لَهُمْ تَمَتَّعُوا حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٤٣﴾ فَعَتَوْا عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ فَأَخَذَتْهُمُ الصَّاعِقَةُ ﴾ واتـە: دەنگێکـی مەزنی لەناوبـەر ﴿ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴾ لە کاتێکـدا ئەوان تیاچوونـی خۆیانیان بەچاو دەبینی.

(٤٥): ﴿ فَمَا اسْتَطَاعُوا مِن قِيَامٍ ﴾ (واتـە: نـە توانـای هەسـتانەوەیان بوو) پێـی ڕزگار بن لە سـزا، ﴿ وَمَا كَانُوا مُنتَصِرِينَ ﴾ (نـە توانیان) خۆیـان ڕزگار بکەن.

(٤٦): ﴿ وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾

واتـە: بـە هەمـان شـێوە ئەوەی خـوا ﷻ هێنـای بەسـەر گەلی نـووح ﷺ، کاتـێ نووحیان بـەدرۆ دانـاو لـە فەرمانـی خـوا دەرچوون، خـوا ﷻ لـە ئاسـمانەوە ئاوێکـی بە خـوڕی بۆ دابەزانـدن، هەموویانـی نوقم کـرد تیایدا، بیبڕوایان هیچ شـوێنو جێگەیەکیـان نەما، ئەمەش نەریـتو سـوننەتی خوایـە لە بەرانبـەر ئەو کەسـانەی سـەرپێچی دەکەن.

(٤٧-٥١): ﴿ وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ وَالْأَرْضَ فَرَشْنَاهَا فَنِعْمَ الْمَاهِدُونَ ﴿٤٨﴾ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ فَفِرُّوا إِلَى اللَّهِ إِنِّي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ وَلَا تَجْعَلُوا مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ إِنِّي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥١﴾ ﴾

خـوا ﷻ تواناو دەسـەڵاتی مەزنـی ڕوون دەکاتـەوەو دەفەرمـوێ: ﴿ وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا ﴾ واتە: دروسـتمان کـردوە بـە پوختـیو ووردی، وە کردوومانە بە سـەقفێک بۆ زەویو ئەوەیشـی لەسـەریەتی، ﴿ بِأَيْدٍ ﴾ واتـە: بەهێـزو توانایەکـی مـەزن، ﴿ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴾ (وە ئێمـە فراوانکـەری) دەوروبەرو سەرانسـەری ئاسـمانەکانین.

هەروەهـا ئێمـە فراوانـی دەکەیـن بەسـەر بەندەکانمانـدا، بـەو ڕزقو ڕۆزیـەی کـە خـوا

گیانلەبەرێکـی بەجـێ نەهێشـتووە لـە چەقـی چۆڵەوانـیو قولآیـی دەریـاو ناوچـە بـەرزو نزمەکانـی ئاسـمان، مەگـەر ڕزقو ڕۆزی خـۆی پێگەیانـدووە بـە ئەنـدازەی پێویسـت، وە ئەوەنـدە چاکـەی پێگەیانـدووە کـە بێنیـازی کـردوە لـە هەموو شـتێک.

پاکـی بۆ ئـەو زاتەی کە بەخشـندەیی گشـتگیرە بـۆ هەمـوو بەدیهێنـراوەکان، وە بەرزیو بڵنـدی بـۆ ئەو زاتـەی ڕەحمـەتو میهرەبانـی دەوری هەمووانی داوە.

(٤٨): ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ فَرَشۡنَٰهَا ﴾واتـە: زەویمـان ڕاخسـتووە بـۆ خەڵکـی، هەرچیـان بـوێ لـە بەرژەوەندیەکانیـان تیایـدا ئەنجامـی دەدەن، لـە خانـوو چاندنو کشـتووکاڵو دانیشـتن، وە دروسـتکردنی ڕێگاویـان بـۆ ئەوەی بگـەن بـە مەبەسـتو ئامانجەکانیان.

وە کاتـێ کـە ڕاخـەر هەنـدێ جار دەگونجـێ چاکو بە سـوود بێ لـە هەمـوو ڕووێکەوە، وە دەشـگونجێ لـە ڕوویـەک جگـە لـە ڕوویەکـی دیکـە، خـوا ﷻ هەواڵیدا کە ئـەو زاتە ڕایخسـتووە بـە چاکتریـن ڕاخسـتن لەسـەر تەواوتریـن شـێوە، وە ستایشـی خـۆی کردوە بـەو ڕاخسـتنەو فەرموویەتی: ﴿ فَنِعۡمَ ٱلۡمَٰهِدُونَ ﴾(جـا چ ڕاخەرێکی چاکیـن) ئەو زاتەی ڕایخسـتووە بـۆ بەندەکانی بـە پێی داخـوازی حیکمـەتو میهرەبانـیو چاکەکانی.

(٤٩): ﴿ وَمِن كُلِّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَا زَوۡجَيۡنِ ﴾واتـە: (لـە هەمـوو شـتێک دروسـتمان کـردوە) جووتێـک نێـرو مـێ، لـە هەمـوو جـۆرە گیانـدارەکان ﴿ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴾(بـۆ ئـەوەی بیـر بکەنـەوە) بـەو نیعمەتانـەی کـە دایباراتـدوە بەسـەرتاندا، لـە ئەندازەکردنـی ئـەوە، وە حیکمـەتو دانایـی کاتـێ دایناوە ئەوەی هـۆکارە بۆ مانـەوەی جۆری گیانداران بە گشـتی، بۆ ئەوەی هەسـتن بـە گەشـەکردنو پەروەردەکـردنو خزمەتکردنیان، بەم هۆیەوە سـوودو بەرژەوەنـدی بەدەسـت بێنن.

(٥٠): ﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ﴾دوای ئـەوەی خـوا ﷻ بەندەکانی بانگکرد بۆ سـەرنجدانی ئایەتو نیشـانەکانی، کـە پێویسـت دەکات لێی بترسـنو بگەڕێنەوە بۆ لای، فەرمانـی کردوە بەوەی مەبەسـتە لـەوەدا، ئەویـش ڕاکردنە بـۆ لای، واتە: ڕاکردن لـەوەی کە خوا حـەزی لێناکات بـە ئاشـکراو نهێنـی، بـۆ لای ئـەوەی خـوا خۆشـی دەوێ بـە ئاشـکراو نهێنی، ڕاکـردن لە نەفامـی بـۆ لای زانسـت، وە لە کوفر بـۆ لای ئیمان، وە لەسـەرپێچی بـۆ لای گوێڕایەڵی، وە لـە بێئاگایـی بۆ لای یـادی خوا.

هـەر کەسـێ ئـەم کاروبارانـە تـەواو بکات ئـەوە هەمـوو ئاینـی تـەواو کـردوە، بێگومان ئـەوەی مەترسـیە لەسـەری نەمـاوە، وە ئەوپـەڕی مەبەسـتو داواکـراوی بەدەسـتهێناوە.

خـوا ﷻ گەڕانـەوەی بـۆ لای خـۆی ناوناوە بـە ڕاکردن، چونکە لـە گەڕانەوە بـۆ لای جگە لـە خـوا جۆرەهـا مەترسـیو ناڕەحەتـی بەدیدەکـرێ، بـەڵام لە گەڕانـەوە بـۆ لای خوا ﷻ جۆرەها خۆشـیو ئاسـایشو بەختـەوەریو سـەرکەوتن بەدیدەکرێ.

جـا بەنـدە ڕادەکات لـە قـەزاو قـەدەری خـوا، بـۆ لای قـەزاو قـەدەری ئـەو زاتـە، وە لـە هەرکەسـێ بترسـێ لێـی ڕادەکەیـت جگـە لـە خـوا، ئەویـش بەپێی ترسـان لێـی ڕاکردن دەبـێ، ﴿إِنِّي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ واتـە: دەتـان ترسـێنم لـە سـزای خـوا، وە ترسـێنەرێکم بۆتـان ڕوون دەکەمـەوە.

(٥١):﴿وَلَا تَجْعَلُوا مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ﴾ ئەمـە لـە ڕاکردنـە بـۆ لای خـوا ﷻ، بەڵکو ئەمە بنچینـەی ڕاکردنـە بـۆ لای، ئەوەیـە بەنـدە ڕابـکات لـە دانانـی پەرسـتراوێ جگە لـە خوا، لـە بتـەکانو گۆڕەکانو جگـە لەوانیـش، لەوانەی دەپەرسـترێن لـە غەیری خـوا، وە بەندە دڵسـۆز بـێ بـۆ پەروەردگاری لە پەرسـتنو تـرسو ئومێـدو پاڕانـەوەو گەڕانەوە.

﴿كَذَٰلِكَ مَا أَتَى الَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُوا سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ﴾، خـوا ﷻ دڵـی پێغەمبەرەکـەی دەداتـەوەو، دەربـارەی بەدرۆدانانی هاوبـەش دانەران، ئەوانـەی کە بەدرۆی دادەنێنو قسـەی ناشـرینی دەربارە دەکـەن، کە ئەو پـاکو بێگەردە لەوانـەی دەیدەنە پاڵی، بێگومـان ئەم قسـانە پیشـەو دابو نەریتـی تاوانبـارانو بەدرۆدانەرانی پێغەمبـەران بووە، جا خـوا هـەر پێغەمبەرێکـی ناردبـێ، بێگومـان گەلەکـەی تۆمەتباریـان کردوە بـە جادووگەر یـان بە شـێت.

كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٌ
٥٢ أَتَوَاصَوۡاْ بِهِۦۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ ٥٣ فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ فَمَآ أَنتَ
بِمَلُومٖ ٥٤ وَذَكِّرۡ فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٥ وَمَا خَلَقۡتُ
ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ٥٦ مَآ أُرِيدُ مِنۡهُم مِّن رِّزۡقٖ وَمَآ أُرِيدُ
أَن يُطۡعِمُونِ ٥٧ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ ٥٨
فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذَنُوبٗا مِّثۡلَ ذَنُوبِ أَصۡحَٰبِهِمۡ فَلَا يَسۡتَعۡجِلُونِ
٥٩ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن يَوۡمِهِمُ ٱلَّذِي يُوعَدُونَ ٦٠

(٥٢): ﴿ كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٌ ﴿٥٢﴾ ﴾[1]:

(٥٣): ﴿ أَتَوَاصَوۡاْ بِهِۦۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾:

﴿ أَتَوَاصَوۡاْ بِهِۦ ﴾ خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ئەم قسـانەی کـە لێیانـەوە دەرچووە -پێشـین و دواییـن- ئایـا ئەمانو ئـەوان ڕاسـپاردەیان بـۆ یەکتـری کـردوە، یـان هەندێکیـان هەندێکـی دیکەیـان فێرکردوە؟ با سـەری سـوورنەمێنێ بـە یەکدەنگ بوونیان لەسـەر ئـەوە، ﴿ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ ﴾[2] (واتـە: بەڵکـو ئەمـان سـەرکەش و یاخییـن) دڵو دەروونو کردەوەکانیـان لـە بیروایـیو سەرکەشـیدا لـە یـەک دەچـوو، جـا بۆیـە قسەکانیشـیان لـە یاخـی بوونیانـەوە سـەرچاوەی گرتبـوو؟

ئەمـە حەقیقەتو ڕاسـتیەکەیە، وەک خوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٞۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّثۡلَ قَوۡلِهِمۡۘ تَشَٰبَهَتۡ قُلُوبُهُمۡۗ ﴿١١٨﴾ ﴾ البقـرة، (واتـە: نەزانـەکان وتیـان: بۆچی خوا خۆی قسـەمان لەگـەڵ ناکات یـان نیشـانەیەکمان بـۆ نایـەت ئەوانەی لـە پێـش ئەمانیش دا بـوون هەمان شـتیان دەووت دڵو دەرونیـان لـە یـەک دەچێـت)، بـە هەمـان شـێوە کاتـێ بـڕواداران دڵو دەرونیان لە یـەک چـوو بـە ملکـەچ بوون بـۆ حـەق و گـەڕان بـە دوایـداو کارکـردن بـۆی، پەلەیان کـرد لـە برواهێنـان بـە پێغەمبەرەکانیانو بـە مـەزن دانانیـان، وە دواندنەکانیان بـە دواندنێ شایسـتەی ئـەوان بێت.

(٥٤): ﴿ فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٖ ﴿٥٤﴾ ﴾:

---

١ - تەفسیر نەکراوە.

٢ - لــە تەفســیرەکەدا بــەم جــۆرە هاتــوە: ﴿ أَمۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾ الطـور. ئـەوەی لەسـەرەوە دامانـاوە سـووڕەتی (الذاريـات)ە، وەرگێـڕ.

خـوا ﷻ فەرمـان بـە پێغەمبەرەکـەی دەکات ڕوو وەربگێرێـت لـە ڕوو وەرگێـڕە بـە درۆدانـەرەکانو دەفەرمـوێ: ﴿ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ ﴾ واتـە: گوێیـان پـێ مـەدەو لێیـان مەگـرە، ڕووبکـە کاری خـۆت، لۆمـەو سەرزەنشـت ناکرێـی لەسـەر گوناهەکانیـان، بەڵکـو تەنهـا ڕاگەیاندنـت لـە ئەسـتۆیە، بێگومـان ئـەوەی لـە ئەسـتۆت بـووە گەیاندووتـە.

(٥٥): ﴿ وَذَكِّرْ فَإِنَّ ٱلذِّكْرَىٰ تَنفَعُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾:

(واتـە: ئامۆژگـاری بکـەو بیریـان بخەرەوە چونکـە بێگومـان ئامۆژگاری سـوود ئەگەیەنێ بە بـڕواداران)، (التذکیر): بیرخسـتنەوە دوو جۆرە:

یەکـەم: بیرخسـتنەوەیەک بـەوەی وردەکاریەکـەی نەزانـراوە، لـەوەی کـە بە سروشـتو عەقـڵ پووختـەی زانـراوە، بەڕاسـتی خـوا عەقڵەکانی دروسـتکردوە لەسـەر خۆشـی خێرو پەسـند کردنـی، وە ڕق لێبـوون لە شـەڕو خراپەو خۆگرتنـەوە لێی، شەریعەتەکەشـی ڕێکاو ڕێکـە لەگـەڵ ئەوەدا، جا هەر شـتێ خـوا فەرمانی پێکردبـێ، وە قەدەغەی لێکردبـێ ئەوە لە شـەریعەتە، بێگومـان ئەوە لە ئامۆژگـاریو بیرخسـتنەوەیە. وە تەواوی بیرخسـتنەوە، ئەوەیە یـادی بخاتـەوە ئـەوەی فەرمانی پێکـراوە پێی لـە خێرو چاکـەو بەرژەوەندی، وە ئەوەشـی قەدەغـە کراوە لـە زیان.

دووەم: لـە بیرخسـتنەوە: بیرخسـتنەوە لەوەی کە زانـراوە لە لای بڕواداران، بـەڵام بێئاگایی‌و بێهۆشـی باڵـی بەسـەردا کێشـاوە، ئەوەیان بیـر دەخرێتەوە، وە چەنـد بارە دەکرێتـەوە بۆیان تـا لە بیرو هۆشـیاندا بچەسـپێت، وە ئاگـادار ببنەوەو کار بکـەن بەوەی بیریـان خراوەتەوە، وە بـۆ ئـەوەی چالاکـی‌و هیمەتیان بۆ دروسـت بێت، سـوودو بەرزبوونەوەیان بۆ دەسـتەبەر بێت .

خـوا ﷻ هەواڵیـداوە کـە بیـر خسـتنەوە سـوودی هەیـە بـۆ بـڕواداران، چونکـە ئـەوەی لەگەڵیانـە لـە ئیمـانو ترسـانو گەڕانـەوەو شـوێنکەوتنی ڕەزامەنـدی خـوا، دەبێتـە مایەی ئەوەی بیرخسـتنەوە سـوودیان پێبگەیەنێـت، وە ئامۆژگاری لەوانەدا جێگـای خۆی دەگرێ، وەکـو خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ ﴿٩﴾ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ ﴿١٠﴾ وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلْأَشْقَى ﴿١١﴾ ﴾ الأعلى، (واتـە: ئنجـا تۆش هـەردەم ئامۆژگـاری بکە ئەگەر سـوودی گەیاند * بێگومـان ئـەوەی لـە خوا بترسـێ پەندی لـێ وەردەگـرێ * وە ئـەوەی زۆر خراپیش بێ خـۆی لـێ دوور دەخاتەوە).

بـەڵام ئەو کەسـەی ئیمانی نیـەو ئامـادەی وەرگرتنی بیرخسـتنەوەی نیە، ئەوە بیرخسـتنەوە

هیـچ سـوودێکی پێناگەیەنێـت، وەکو زەوی سـوێر وایـە کە بـاران سـوودی پێناگەیەنێت بـە هیـچ شـێوەیەک، ئەو جۆرە کەسـانە ئەگـەر هەر نیشـانەیەکیان بـۆ بێت بـڕوا ناهێنن تا سـزای بە ئێـش نەبینن.

(٥٦-٥٨): ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ مَآ أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ ﴿٥٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴿٥٨﴾ ﴾

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ ئەمـە ئـەو ئامانجەیـە کـە خـوا ﷻ جنۆکـەو ئادەمیـزادی بـۆ دروسـتکردوە، وە سـەرجەم پێغەمبەرانـی ناردوە بانگـەواز بۆ ئەو مەبەسـتە بکـەن، ئەویش پەرسـتنیەتی، کە ناسـینو خۆشویسـتنو گەڕانەوە بـۆ لایو ڕوو تێکردنیو ڕوو وەرگێـڕان لـە غەیـری ئـەو دەگرێتـەوە، هەمـوو ئەوانەش وەسـتاون لەسـەر ناسـینی خـوا، چونکـە تـەواوی پەرسـتش لـە سـەر ناسـینی خـوا وەسـتاوە، بەڵکـو بەندە تـا زیاتر پەروەردگـاری بناسـێ پەرستنەکەی تەواوتـر دەبـێ، ئا ئەمەیە خـوا ئەرک پێسـپێردراوانی دروسـتکردوە لـە پێناویـدا، دروسـتی نەکـردوون لەبـەر ئەوەی پێویسـتی پێیـان بێ.

جـا ئـەو زاتە هیـچ ڕۆزییەکـی لـەوان نـاوێ، وە نایـەوێ خواردنی بدەنـێ، بـەرزی بۆ ئەو خوایـە دەوڵەمەنـدو بێنیـازە، لـە پێویسـتی بۆ لای کەسـێ بـە جۆرێ لـە جـۆرەکان، بەڵکو هەمـوو بەدیهێنـراوەکان پێویسـتیان بـەوە لـە سـەرجەم داواکاریەکانیاندا، ئا لەبـەر ئەمەیە فەرموویەتی:

(٥٨): ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ﴾ واتـە: (بە ڕاسـتی خـۆی) ڕۆزیدەرە، کە هیـچ گیانلەبەرێ نیە لـە سـەر زەوی یان لـە ئاسـمانەکان مەگـەر ڕزقو ڕۆزی لەلای خوایـە، وە خـوا دەزانێ بە شـوێنی مانەوەیو شـوێنی لێدەرچوونی.

﴿ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴾ واتـە: ئـەو زاتـەی خـاوەن هەمـوو هێـزو دەسـەڵاتێکە، بـەو هێـزو دەسـەڵاتەی ئـەو ئەسـتێرە مەزنانەی دروسـت کـردوە، وە بەو دەسـەڵاتەی ئاشـکراو نهێنی هەڵدەسـوڕێنێ، ویسـتی جێبەجـێ کـردوە لـە هەموو شـتەکاندا، ئـەوەی خوا بیـەوێ بووە، ئەوەیشـی خـوا نەیەوێ نابێ، دەستەوسـان نیـە بەرانبەر بە هیـچ هەڵهاتوویەک، کەسـیش لە دەسـەڵاتی ئـەو دەرناچـێ، لە توانـاو هێزی ئەوەیـە کـە ڕزقو ڕۆزی گەیانـدووە بە هەموو جیهان.

وە لـە هێـزو دەسـەڵاتی هەموو مـردووەکان زینـدوو دەکاتـەوە، دوای لەتو پـەت بوونو ڕزیـن، بـا لەگـەڵ خۆڵـدا جێگۆڕکێی پێکـردن، وە باڵنـدەو دڕنـدەکان خواردنیـان، لەتو

پـەت بـوون لـە چەقـی چۆڵەوانیو قوڵایـی دەریـاکان، هیچ کـەس ناتوانێ لە دەسـتی خوا دەربچـێ، وە دەزانـێ زەوی چەندیـان لـێ کـەم دەکاتـەوە، پاکی بـۆ ئەو خوایـەی خاوەن دەسـەڵاتی زۆر بەهێزە.

(٥٩-٦٠): ﴿ فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذَنُوبًا مِّثْلَ ذَنُوبِ أَصْحَٰبِهِمْ فَلَا يَسْتَعْجِلُونِ ﴿٥٩﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن يَوْمِهِمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٦٠﴾ ﴾:

﴿ فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ﴾ واتـە: بێگومان ئەوانەی سـتەمیان کردووەو پێغەمبەریـان بەدرۆ داناوە، ئـەوە لە سـزاو تۆڵـەدا، ﴿ ذَنُوبًا ﴾ واتە: بەشـێکیان بـۆ هەیە، وەکو چـۆن بـە هاورێکانیان کـرا، لـە خەڵکانی سـتەمکارو بـە درۆدانـەر، ﴿ فَلَا يَسْتَعْجِلُونِ ﴾ (دەی با ئیتر پەلـە نەکەن) لـە داواکردنی سـزا، بێگومان سـوننەتی خـوا لە سـەرجەم گەلەکاندا یەکـەو ناگۆڕێ.

جـا هـەر بـە درۆ دانـەرێ بەردەوام بێ لەسـەر بـەدرۆ دانانـی بەبێ تەوبـەو گەڕانـەوە، ئەوە بێگومـان هەر دەبێ سـزا بـدرێ، ئەگەرچی دواش بکـەوێ، لەبەر ئەمەیە خوا ﷻ هەڕەشـەی لێکـردوون بـە سـزای ڕۆژی دوایـیو، فەرموویەتـی: ﴿ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن يَوْمِهِمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴾، (واتـە: سـا هاوار بـۆ ئەوانەی بێبـڕوا بوون لە دەسـت ئـەو ڕۆژەیان کە بەڵێنیـان پێـدراوە) ئەویـش ڕۆژی دواییـە، کـە بێگومان بەڵێنیـان پێدراوە بە جۆرەها سـزاو تۆڵەکردنـەوەو کـۆتو زنجیر کـردن، هیچ پەنادەرێکیـان نیە، وە هیـچ ڕزگارکەرێکیان نیە لە سـزای خـوا، پەنـا دەگرین بـە خوا لەو سـزایە.

تەفسیری سووڕەتی (الذاریات) تەواو بوو.


بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
وَٱلطُّورِ ① وَكِتَٰبٍ مَّسْطُورٍ ② فِى رَقٍّ مَّنشُورٍ ③ وَٱلْبَيْتِ
ٱلْمَعْمُورِ ④ وَٱلسَّقْفِ ٱلْمَرْفُوعِ ⑤ وَٱلْبَحْرِ ٱلْمَسْجُورِ ⑥ إِنَّ
عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٌ ⑦ مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٍ ⑧ يَوْمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ
مَوْرًا ⑨ وَتَسِيرُ ٱلْجِبَالُ سَيْرًا ⑩ فَوَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ
⑪ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى خَوْضٍ يَلْعَبُونَ ⑫ يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ
جَهَنَّمَ دَعًّا ⑬ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ⑭

## تەفسیری سوورەتی (الطور)

## مەككیە (٤٩) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-١٦): ﴿ وَٱلطُّورِ (١) وَكِتَٰبٍ مَّسْطُورٍ (٢) فِى رَقٍّ مَّنشُورٍ (٣) وَٱلْبَيْتِ ٱلْمَعْمُورِ (٤) وَٱلسَّقْفِ ٱلْمَرْفُوعِ (٥) وَٱلْبَحْرِ ٱلْمَسْجُورِ (٦) إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٌ (٧) مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٍ (٨) يَوْمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوْرًا (٩) وَتَسِيرُ ٱلْجِبَالُ سَيْرًا (١٠) فَوَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ (١١) ٱلَّذِينَ هُمْ فِى خَوْضٍ يَلْعَبُونَ (١٢) يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا (١٣) هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ (١٤) أَفَسِحْرٌ هَٰذَآ أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ (١٥) ٱصْلَوْهَا فَٱصْبِرُوٓا۟ أَوْ لَا تَصْبِرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ (١٦) ﴾:

﴿ وَٱلطُّورِ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات بـەم كاروبارە مەزنانـە كە حیكمەتـی گەورەیان لەخۆ گرتـووە، لـە سـەر زیندووكردنەوەو پاداشـتی لە خواترسـانو بـەدرۆ دانەران، جا سـوێندی خـواردوە بـە طـوور، بریتیـە لەو شـاخەی كە خـوا لەگـەڵ پێغەمبەرەكەی مووسـای كوڕی عیمرانـدا قسـەی كرد، وە وەحـیو پەیامی بـۆ نارد لە بڕیـارەكان.

وە لـەو قسـەكردنەدا منـەت كردنـی خـوای تێدایـە بـۆ سـەر مووسـا ﷺ وە بـۆ سـەر ئوممەتەكـەی، كـە ئـەوە یەكێـك بـوو لـە ئایـەتو نیشـانە گەورەكانـی خـوا ﷻ، وە نازونیعمەتـێ بـوو كـە بەنـدەكان نەدەتوانـن ئەنـدازەی بكـەنو نەدەتوانـن بیژمێـرن.

(٢): ﴿ وَكِتَٰبٍ مَّسْطُورٍ ﴾ (واتـە: وە سـوێند بـە كتێبـی نووسـراو) پێدەچێ مەبەسـت پێی (اللوح المحفوظ) بـێ، كە خوا ﷻ هەموو شـتێكی تێدا نووسـیوە، وە دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی قورئانی پیـرۆز بێت، كە چاكتریـنی كتێبەكانە، خـوا ﷻ دایبەزاندوە هەواڵی سـەرەتاو دواییـنی تێدایـە، وە زانسـتی ڕابردوو داهاتووشـی لە خـۆ گرتووە.

(٣): ﴿ فِي رَقٍّ ﴾ واتـە: پـەڕە ﴿ مَّنشُورٍ ﴾ واتـە: نووسـراوە، دیـارەو شـاراوە نیـە، حاڵـی شـاراوە نیـە لەلای هەمـوو کەسـێکی عاقڵـی بینـاو بەرچـاو ڕوون.

(٤): ﴿ وَٱلْبَيْتِ ٱلْمَعْمُورِ ﴾ (سـوێند بـەو خانـەی ئاوەدانـە) ئەویـش بریتیـە لـەو ماڵـەی لە سـەرووی ئاسـمانی حەوتەمەوەیـە، لـە هەمـوو کاتەکانـدا ئاوەدانە بـە فریشـتە بەڕێزەکان، کـە هەمـوو ڕۆژێ حەفتا هەزار فریشـتە دەچێتـە ناویـەوە، بەندایەتـی پەروەردگاریانی تێدا دەکـەن، پاشـان تـا ڕۆژی دوایـی ناگەڕێنـەوە بۆ نـاوی، وە وتـراوە: (بیت المعمـور) ماڵی ئـاوەدان: (بریتیـە لە ماڵی خـوای بەڕێز) ئاوەدانە بـە تەوافکارانو نوێژ کـەرانو یادکەرەوان لـە هەمـوو کاتێکـدا، وە بەڕۆیشـتن بـۆ لای بۆ حـەجو عەمرە.

وەک چـۆن خـوا ﷻ سـوێندی پێ خواردوە لـە وتەیـدا: ﴿ وَهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ ﴿٣﴾ ﴾ التين، (واتـە: وە بـەم شـاری ئـارامو بـێ ترسـە کـە مەککەیـە) حەقـی خۆیەتـی ماڵـێ بکرێتـە چاکتریـن ماڵـی سـەر زەوی، کە حـەجو عەمرە کردن یەکێـک بێ لە ئەرکانەکانی ئیسـلام تیایـدا، کـە ئیسـلامەتی تەواو نابـێ تەنها بـەوە نەبێ، ئـەو ماڵەی کـە ئیبراهیمو ئیسـماعیل بوونیادیـان نـا، وە خـوا کردی بە جێگای پاداشـتو ئاسـایش بـۆ خەڵکی، وە سـوێندی پێ خـواردوەو مەزنـی ڕوون کردۆتـەوە کە شایسـتەیە پێی.

(٥): ﴿ وَٱلسَّقْفِ ٱلْمَرْفُوعِ ﴾ ئـەو ئاسـمانەی خـوا کردوویەتـی بە سـەقفێکی بـەرزو بڵند بۆ بەدیهێنـراوەکان، وە ماڵێـک بـۆ زەوی، ڕووناکیەکانی لـەوێ وەربگرێ، وە بە نیشـانەکانی ڕێگـا بدۆزێتـەوە، وە خـوا بـارانو ڕەحمەتو جۆرەهـا ڕزقو ڕۆزی لـێ دابارێنێ.

(٦): ﴿ وَٱلْبَحْرِ ٱلْمَسْجُورِ ﴾ واتـە: (سـوێند بـە دەریـای) پـڕ لـە ئـاو، کـە خـوا ﷻ پـڕی کـردوە، وە ڕێگـری لێکـردوە لەوەی بـەرز ببێتەوە بۆ سـەر زەوی، لەگەڵ ئەوەی سروشـت وا دەخـوازێ سـەر زەوی دابپۆشـێ، بـەڵام حیکمەتـی ئەو زاتـە وای پێکردوە کـە ڕێگری لێبـکات لـە ڕێکـردنو بـەرز بوونەوە، بـۆ ئەوەی بژی لەسـەر زەویـدا لە جۆرەهـا گیاندار، وتـراوە: مەبەسـت لە (المسـجور) ئـەو داگیرسـێنەرەی کـە ئاگر دادەگیرسـێنێ لـە ڕۆژی دواییـدا تـا دەبێتـە ئاگرێکی بڵێسـەداری پـڕ لە جۆرەها سـزا.

(٧): ئـەم شـتانەی خـوا ﷻ سـوێندی پـێ خـواردوون، بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی ئەوانـە لە نیشـانەکانی خـوان، وە بەڵگـەی یەکتاپەرسـتی خـوان، وە سـەلماندنی توانایەتـی، وە توانای زینـدوو کردنـەوەی مـردووەکان، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٌ ﴾ واتـە: (بێگومـان سـزای پەروەردگـارت) هـەر دەبێ ببێت، خـوا قسـەو بەڵێنی خۆی دەباتە سـەر.

(٨): ﴿ مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٖ ﴾ (واتـە: هیـچ بەرگـری کەرێـک نیـە) بەرگری لێبـکات، چونکە هیـچ شـتێ زاڵ نابێ بەسـەر توانـای خـوا، وە هیـچ هەڵهاتوویەکیش ڕزگـاری نابێت.
(٩): پاشـان باسـی وەسـفی ئـەو ڕۆژەی کـردوە کـە سـزای تێـدا دەدرێ، فەرموویەتـی: ﴿ يَوۡمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوۡرٗا ﴾ واتـە: ئاسـمان تێک دەچێتو ئەسـتێرەکان بەیەکـدا دەدەن، بە بەردەوامـی دەجوڵێـت بـە شـێوەیەکی بێزارکـەر بە بێ وەسـتان.
(١٠): ﴿ وَتَسِيرُ ٱلۡجِبَالُ سَيۡرٗا ﴾ واتـە: کێوەکانیـش لە جێـی خۆیان نامێنـن، وە دەجوڵێن وەک جوڵـەی هـەور، وەکو خـوری شـیکراوەیان لێدێـت، وە دوای ئـەوە ورد دەبن وەک تەپوتـۆزی پـەرشو بـڵاو، هەمـوو ئەوانـە لـە مەزنـی ڕۆژی دواییـە، وە مەترسـی ئەوەی تیایدایـە لـە کاروبـارە بێزارکـەرەکان، وە ئـەو بومەلـەرزە پەشـۆکێنەرانە کـە هەمـوو ئەو ئەسـتێرە مەزنانـەی بێـزارو پەشـۆکاندووە، ئـەی ئادەمیـزادی لاواز چۆن ناپەشـۆکێ.
(١١): ﴿ فَوَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴾ (واتـە: کەواتـە لەو ڕۆژەدا هاوار بـۆ بێبڕوایان) (الويل): وشـەیەکی گشـتیرە بۆ هەموو تۆڵەو خەمو سـزاو ترسـێک.
(١٢): پاشـان باسـی سـیفەتی ئەو بەدرۆدانەرانەی کردوە کە شایسـتەی سـزای دۆزەخن، بە هـۆی بە درۆدانانیانـەوە، فەرموویەتـی: ﴿ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي خَوۡضٖ يَلۡعَبُونَ ﴾ واتـە: ڕۆچوون لە کاری نـاڕەواداو یـاری تێدا دەکەن، جا زانسـتو لێکۆڵینەوەکانیان زانسـتی زیان بەخشـی لە خـۆ گرتـووە، لـە بەدرۆدانانی ڕاسـتیو بە ڕاسـت دانانی پـووچو ناحـەق، وە کردەوەکانیان کـردەوەی نەفامانو گێـلو گەمژەکانە، بە پێچەوانـەی خاوەنانی بەڕاسـتدانەرانو بڕواهێنان، بـە پێچەوانـەی ئـەوەی بەڕاسـتدانەرانو ئیمانـداران لەسـەرین، لـە زانسـتە بە سـوودەکانو کـردەوە چاکـەکان، ﴿ يَوۡمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا ﴾ واتـە: ڕۆژێ پاڵیان پێوە دەنرێ بـۆ دۆزەخ چـۆن پـاڵ پێوەنانێـک، وە دەبرێـن بـۆ دۆزەخ بە توندترین شـێوە، وە لەسـەر ڕوومەتیـان ڕادەکێشـرێن، بە سەرزەنشـتو لۆمەکردنەوە پێیـان دەوترێ:
(١٤): ﴿ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾ واتـە: ئەمـڕۆ بچێـژن سـزای هەمیشـەیی، کـە بە هیـچ شـێوەیەک نـە ئەنـدازە دەکرێو نـە وەسـف دەکرێ.

أَفَسِحْرٌ هَٰذَآ أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ ﴿١٥﴾ ٱصْلَوْهَا فَٱصْبِرُوٓا۟
أَوْ لَا تَصْبِرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ ۖ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾
إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَنَعِيمٍ ﴿١٧﴾ فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ
وَوَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٨﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَا
كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصْفُوفَةٍ ۖ وَزَوَّجْنَٰهُم
بِحُورٍ عِينٍ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلْحَقْنَا
بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَىْءٍ ۚ كُلُّ ٱمْرِئٍۭ بِمَا
كَسَبَ رَهِينٌ ﴿٢١﴾ وَأَمْدَدْنَٰهُم بِفَٰكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢٢﴾
يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأْسًا لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ ﴿٢٣﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ
غِلْمَانٌ لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ ﴿٢٤﴾ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ
بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٥﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِىٓ أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ
﴿٢٦﴾ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ إِنَّا كُنَّا
مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾ فَذَكِّرْ فَمَآ أَنتَ بِنِعْمَتِ
رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ ﴿٢٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ
ٱلْمَنُونِ ﴿٣٠﴾ قُلْ تَرَبَّصُوا۟ فَإِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُتَرَبِّصِينَ ﴿٣١﴾

(١٥): ﴿أَفَسِحْرٌ هَٰذَآ أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ﴾ (ئایـا ئـەم ئاگـرە جـادووە، یـان ئێـوە نابینـن) پێدەچـێ ئەمـە ئاماژەبێ بـۆ ئاگرو سـزا، وەک چۆن سـیاقی دەقەکە بەڵگەیـە لەسـەری، واتـە: کاتـێ ئاگـرو سـزایان بینـی بە توانجـەوە پێیـان دەوترێ: ئایـا ئەمـە جـادووەو حەقیقـەتو ڕاسـتی نیـە؟ بێگومـان بینیتـان، یان ئێوە لـە دونیادا نەتاندەبینـی، واتـە: نـە بەرچـاو ڕوونیتـان هەبـوو، نـە زانسـتتان لەلابـوو، بەڵکـو ئێوە کەسـانێکی نەفـام بـوون بـەم کاروبـارە، بەڵگـەو حوججەتـان لەسـەری پێویسـت نەبـوو؟ وەڵامیـش نەبوونـی ئـەو دووانەیە.

یـان بوونـی ئـەو ئاگـرە جـادوو بـووە، بێگومـان بۆتـان دەرکەوت ئـەوە زۆر حەقەو ڕاسـتگۆترین ڕاسـتیە، پێچەوانـەی جادووە لە هەمـوو ڕووەکانـەوە.

یـان ئـەوان نابینـن، بێگومـان کارەکـە پێچەوانەی ئەوەیـە، بەڵکـو بەڵگـەو حوججەی خوا پێویسـت بـووە لەسـەریان، پێغەمبەران بانگیـان کردوون بۆ بـڕوا بوون بەو سـزایە، بەڵگەو سـەلماندنی گەورەیان لەسـەر ئەوە بۆیـان هێنایەوە.

وە پێدەچـێ ئـەم ئاماژەیە لـە فەرموودەی خـوا ﷻ: ﴿أَفَسِحْرٌ هَٰذَآ أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ﴾ مەبەسـت پێـی ئەو پەیامـە ڕوونکـەرەوەو ڕێگا ڕاسـتە بێـت کـە پێغەمبـەر ﷺ هێناویەتی، واتـە: ئەمـەی موحەممـەد ﷺ هێناویەتـی جـادووە یـان نەبوونی بەرچـاو ڕوونـی ئێوەیە، تا کارەکەتـان لـەلا ئاڵـۆز بـوو؟ لـە حەقیقەتـدا ئـەوە لـە هەمـوو شـتێ ڕوونترەو لـە هەموو ڕاسـتیەک ڕاسـترە، بێگومـان بەڵگـەو حوججـەی خوا لەسـەریان پێویسـت بوو.

(١٦): ﴿ٱصْلَوْهَا﴾ واتـە: بچنـە نـاو ئاگـرەوە بە جـۆرێ دەورتان بداتو هەموو لاشـەتان بگرێتـەوەو بگاتە ناو سـینەتان.

﴿فَٱصْبِرُوٓا۟ أَوْ لَا تَصْبِرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ﴾ واتـە: ئارامگرتنتـان لەسـەر ئاگـر هیچ سـوودێکی

نیـە بۆتـان، هیـچ یەکێکتان دڵـی هەندێکـی دیکە ناداتەوە، سـزاتان لەسـەر سـووک نابێ، وە لـەو کارانـە نیـە ئەگەر بەنـدە ئارامی لەسـەر بگرێ نارەحەتی لەسـەر لابچێتو ناخۆشـی نەمێنێت.

بێگومـان خوا سـزای داون بـە هۆی کـردەوە خراپەکانیـانو ئەوەیشـی بەدەسـتیان هێناوە، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿إِنَّمَا تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ (واتـە: بێگومـان هـەر تۆڵـەی ئـەو کردەوانـەی دەتانکـرد لێتان دەسـەنرێتەوە).

(١٧-٢٠): ﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَنَعِيمٖ ١٧ فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ وَوَقَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ١٨ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ١٩ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٖ مَّصۡفُوفَةٖۖ وَزَوَّجۡنَٰهُم بِحُورٍ عِينٖ ٢٠﴾

کاتـێ باسـی سـزای بەدرۆدانەرانی کرد، باسـی نازونیعمەتی لە خواترسـانی کـرد، بۆ ئەوەی کـۆی بکاتـەوە لـە نێـوان هانـدانو ترسـاندندا، تـا دڵ لە نێـوان تـرسو ئومێـددا بێت، جا فەرمـووی: ﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ (واتـە: ئەوان دەترسـن) لـە پەروەردگاریان، ئەوانـەی خۆیان دەپارێـزن لـە تورەیـیو سـزای پەروەردگاریـان، بـە ئەنجامدانـی هۆکارەکانـی خۆپارێزی لـە جێبەجێکردنی فەرمانـەکانو دوورکەوتنـەوە لە قەدەغەکـراوەکان ﴿فِي جَنَّٰتٖ﴾ واتە: باخـات، باخچەکانـی پـڕ بـوون لـە دارودرەختـە تێکەڵـەکان، وە دەریـا هەڵقـوڵاوەکانو باڵەخانە سەرنجڕاکێشـەکانو ماڵـە ڕازاوەکان.

﴿وَنَعِيمٖ﴾ ئەمە گشتگیرە بە نیعمەتەکانی دڵو ڕووحو جەستە.

(١٨): ﴿فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ﴾ واتـە: سـەریان پێـی سـوردەمێنێ، چێـژ وەردەگرن بە دڵخۆشـیەوە لـەوەی خـوا پێـی داون لـەو نـازو نیعمەتانەی کە وەسـف ناکـرێ، وە نەفسو دەروون نازانـێ چـی بـۆ شـاراوەتەوە لە ئۆقرەی چـاوەکان.

وە پەروەردگاریان پاراسـتوونی لە سـزای دۆزەخ، هەرچی خۆشویسـتراوە پێی بەخشـیون، وە ڕزگـاری کـردوون لە تـرس، کاتێ ئـەوەی خوا پێـی خۆشـە ئەنجامیانـداو دوورکەوتنەوە لـەوەی خوا پێی ناخۆشـەو دەبێتـە هـۆی توورەیی ئەو.

(١٩): ﴿كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ﴾ واتـە: (بخـۆنو بخۆنـەوە) لـەوەی نەفـسو دەروونتـان ئارەزووی دەکات لـە هـەر جـۆرە خـواردنو خواردنەوەیەکـی بە تـام (و حەڵاڵ).

﴿هَنِيٓـَٔۢا﴾ واتـە: پیرۆزباییـان لێدەکـرێ بـە خواردنی ئەو خـواردنو خواردنەوانە لەسـەر خۆشـگوزەرانیو شـادمانی، ﴿بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ واتـە: ئـەوەی بـە دەسـتان هێنـا بە هۆی

کـردەوە چاکەکانتـانو قسـە باشـەکانتانەوە بـوو، ﴿ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصۡفُوفَةٍ ﴾ (واتـە: پاڵیـان داوەتەوە لەسـەر قەنەفەی ڕیزکراو)، (الإتكاء): دانیشـتن لەسـەر ڕووی جێگیربوونو پشـوودان، (والسـرر): بریتیە لـەو تەخـتو قەنەفانە بە جۆرەها شـێوە ڕازاونەتـەوە، بە جلو بەرگـی ڕازاوەو ڕایەخی جـوانو نایاب.

وە خـوا وەسـفی قەنەفەکانـی کـردوە بەوەی ڕیـزن تـا ببێتە بەڵگە لەسـەر ئـەوەی زۆرنو شـێوەی ڕێکخسـتنیان جوانـە، وە کۆبوونـەوەی خەڵکانـیو دڵخۆشـبوونیانو بـە چاکـی مامەڵەکردنیـان، وە نـەرمو نیانـی قسـەی هەندێکیـان بـۆ هەندێکـی دیکە.

کاتـێ کۆبوویـەوە بۆیـان لـە نازونیعمەتـی دڵو ڕووحو جەسـتە کـە بەختەتـەرە بەخەیاڵدا نەهاتـووە، لـە خـواردنو خواردنەوە بە تامـەکانو کۆڕو دانیشـتنە خـۆشو زۆر جوانەکان، هیـچ نەمایـەوە تەنهـا چێـژ وەرگرتن لـەو ئافرەتانـە نەبێ کە خۆشـی تـەواو نابـێ مەگەر بـەوان، خـوا باسـی کـردوە بێگومـان بـۆ ئـەوان هەیـە تەواوترینـی ئافرەتـان لـە ڕووی وەسـفو دروسـتکردنو ڕەوشـتەوە، کـە فەرموویەتـی: ﴿ وَزَوَّجۡنَـٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴾ (واتە: وە حۆریانـی چاوگـەشو چاوگەورەمـان کـردە هاوسـەریان) ئەوانیش ئـەو ئافرەتانەن کە کۆیـان کردوەتـەوە لـە جوانـی وێنەی ڕواڵـەتو دڵرفێنـی، وە لە ڕەوشـتی زۆر بـەرز، کە لـە جوانیانـدا تەماشـاکەران سەرسـام دەکـەن، وە عەقڵی جیهانیـان دەبەن، خەریکـە دڵەکان دەفـڕن لە پەرۆشـیان بۆ لایـان، وە حەزو ئارەزووی گەیشـتن پێیـان، (والعِين): چاوجوانو گـەورە کـە سـپیایەتیو چاویان پاکـەو ڕەشاییەکەشـی پـاکو قەترینە.

(٢١-٢٨): ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَـٰنٍ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَمَآ أَلَتۡنَـٰهُم مِّنۡ عَمَلِهِم
مِّن شَيۡءٖۚ كُلُّ ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ ﴿٢١﴾ وَأَمۡدَدۡنَـٰهُم بِفَـٰكِهَةٖ وَلَحۡمٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ ﴿٢٢﴾ يَتَنَـٰزَعُونَ فِيهَا كَأۡسٗا
لَّا لَغۡوٞ فِيهَا وَلَا تَأۡثِيمٞ ﴿٢٣﴾ ۞وَيَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ غِلۡمَانٞ لَّهُمۡ كَأَنَّهُمۡ لُؤۡلُؤٞ مَّكۡنُونٞ ﴿٢٤﴾ وَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ
بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٥﴾ قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا قَبۡلُ فِيٓ أَهۡلِنَا مُشۡفِقِينَ ﴿٢٦﴾ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ
ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلُ نَدۡعُوهُۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾ ﴾:

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَـٰنٍ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَمَآ أَلَتۡنَـٰهُم مِّنۡ عَمَلِهِم مِّن شَيۡءٖ ﴾ ئەمـە لـە تـەواوی نیعمەتەکانی بەهەشـتە، کە خـوا نەوەکانیـان دەگەیەنـێ پێیـان، ئەوانەی بـە بڕواداریێتـی شـوێنیان کەوتـوون، واتـە: ئەوانـەی گەیشـتوون پێیـان بـەو بڕوایەی کە لـە باوکانیانـەوە بۆیان ماوەتـەوە، وەچەکانیشـیان دەبنـە شـوێنکەوتەیان لـە بڕواهێنان، جا ئـەوە لە پێشـترە ئەگـەر وەچەکان شـوێنیان بکەون بـەو بڕوایـەی کە لە خـودی خۆیانەوە

سـەرچاوەی گرتـووە، ئـا ئەوانـەی باسـكران خـوا دەیانگەیەنێـت بـە پلـەی باوكانیـان لە بەهەشـتدا، ئەگەرچی پێیشـی نەگەن، وەک پاداشـتێک بـۆ باوكانیانو پاداشـتێكی زیاتریش بـۆ خۆیان.

لەگـەڵ ئەوەشـدا خـوا لـە كـردەوەی باوكانیـان كـەم نـاكات، لەوانەیـە كەسـێک خەیاڵ بـكات دۆزەخیانیش بەهەمان شـێوەن، خـوا منـداڵو وەچەكانیان پێیـان دەگەیەنێت، هەواڵی داوە بڕیـاری ئـەو دوو ماڵـە وەكـو یەكتـر نیـە، بێگومـان ئاگـر جێگـای دادپەروەرییـە، وە لـە دادوەری خـوا ﷻ ئەوەیـە هیـچ كەسـێک سـزا نـادات مەگـەر تاوانێكـی كردبـێ، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ كُلُّ ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ ﴾ واتـە: (هـەر كەسـەو) بارمتـەی كردەوەی خۆیەتـی، جـا هیـچ تاوانبارێک گوناهـی تاوانبارێكـی تر هەڵناگـرێ، ئەمـە ڕەخنەگرتنێكە لـە سـوودەكانی ئـەم ڕەخنەیـە لابردنـی ئـەو گومانەیە كە باسـكراوە.

(٢٢): وە دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَمۡدَدۡنَٰهُم ﴾ واتـە: دەیدەیـن بە خەڵكانی بەهەشـت لە بەخشـشو چاكـەی فراوانمـانو ڕزقو ڕۆزی گشـتگیرمان ﴿ بِفَٰكِهَةٖ ﴾ لـە تـرێو هەنارو سـێو، وە جۆرەهـا میـوەی بە تـام كە لـە سـەرووی ئەوەوەیە پێـی دەژین.

﴿ وَلَحۡمٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ ﴾ (واتـە: وە گۆشـتێكیان پێدەدەیـن) لە هەموو ئەوانـەی داوای دەكەنو نەفسـیان حـەزی پێیەتی، لە گۆشـتی باڵندەو جگـە لەوانیش.

(٢٣): ﴿ يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأۡسٗا ﴾ واتە: پەرداخی شەراب بەسەریاندا دەگێڕن، لە نێوان یەكتردا پێشكەشی دەكەن بە یەكتر، تازە لاوی هەمیشەیی بەسەریاندا دەگەڕێن، بە پەرداخو سوراحیو گڵاسی پڕ لە شەرابی سەرچاوەی ڕەوان، ﴿ لَّا لَغۡوٞ فِيهَا وَلَا تَأۡثِيمٞ ﴾ واتە: لە بەهەشتدا نە قسەی پڕو پووچی تێدایە، نە گوناهو سەرپێچی كردن، جا ئەگەر ئەم دووانە نەبوو، كاری سێیەم دەچەسپێت، ئەویش ئەوەیە قسەیان تیایدا قسەی چاكو پاكە، دەروون دەگەشێنێتەوەو دڵ خۆش دەكات، بە جوانترین شێوە مامەڵە لەگەڵ یەكتر دەكەن، وە خۆشترین كۆڕو مەجلیس دەبەستن، نابیستن لە پەروەردگاریان تەنها ئەوە نەبێ چاویان پێ ئۆقرە بگرێ، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ڕەزامەندی خوا لێیانو خۆشویستنیان.

(٢٤): ﴿ ۞وَيَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ غِلۡمَانٞ لَّهُمۡ ﴾ واتـە: خزمەتـكاری گەنـج ﴿ كَأَنَّهُمۡ لُؤۡلُؤٞ مَّكۡنُونٞ ﴾ (واتـە: ئەڵێـی مـرواری ناو سـەدەفن) لـە جوانیـانو قەشـەنگیان، بەدەوریانـدا دەگەڕێن بۆ خزمـەت كـردن، ئەنجامدانـی ئـەوەی پێیانە، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر زۆری نیعمەتەكانیو بەرفراوانیـانو تەواوی پشـوویان.

(٢٥): ﴿ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴾ (واتــە: بەهەشــتیەکان ڕوو دەکەنــە یەکتــریو پرســیار لــە یەکتــری دەکــەن) دەربــارەی کاروبــاری دونیا.

(٢٦): ﴿ قَالُوا ﴾ واتــە: لــە باس کردنــی ڕوون کردنــەوەی ئەوەی گەیاندنی بــەوەی ئەوان تیایدان لە خۆشــیو بەختــەوەری، ﴿ إِنَّا كُنَّا قَبْلُ ﴾ واتە: (ئێمە پێشــتر) لــە ژیانی دونیادا، ﴿ فِي أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ ﴾ واتــە: (لــە نــاو کــەسو کارمانــدا) دەترســاین، بۆیە لە ترســی خودا وازمــان لــە گوناح هێنــاو خۆمان چــاک کرد.

(٢٧): ﴿ فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا ﴾ (واتــە: خــوا منەتــی نا بەســەرماندا) بە ڕێنماییو ســەرکەوتن ﴿ وَوَقَانَا عَذَابَ السَّمُومِ ﴾ واتــە: لە ســزای زۆر گەرمو ســەخت پاراســتمانی.

(٢٨): ﴿ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ ﴾ (واتــە: بــە ڕاســتی ئێمــە لەمــەو پێــش خوامــان دەپەرســتو هاوارمــان لێدەکــرد) کــە ڕزگارمان بــکات لە ســزای ســەختو بمانگەیەنێت بــە نــازو نیعمەت، ئەمەش گشــتگیرە بــە پاڕانەوەی پەرســتنو پاڕانــەوەی داواکــردن، واتە: بــەردەوام لێــی نزیــک دەبینــەوە بــە جۆرەهــا نزیــک بوونــەوە، وە دەپاڕێینــەوە لــە هەموو کاتەکاندا.

﴿ إِنَّهُ هُوَ الْبَرُّ الرَّحِيمُ ﴾ (واتــە: بەڕاســتی ئەو چاکەکاری میهرەبانە) لــە چاکەکانی بۆمانو ڕەحمەتــی پێمــان، پێمانــی بەخشــیوە ڕەزامەندی خــۆیو بەهەشــتەکەی، وە پاراســتوونی لە خەشــمو قینیو لە دۆزەخ).

(٢٩-٤٣): ﴿ فَذَكِّرْ فَمَا أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ ﴿٢٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِ رَيْبَ الْمَنُونِ ﴿٣٠﴾ قُلْ تَرَبَّصُوا فَإِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُتَرَبِّصِينَ ﴿٣١﴾ أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلَامُهُم بِهَٰذَا أَمْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴿٣٢﴾ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ فَلْيَأْتُوا بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِ إِن كَانُوا صَادِقِينَ ﴿٣٤﴾ أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَائِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ الْمُصَيْطِرُونَ ﴿٣٧﴾ أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَهُ الْبَنَاتُ وَلَكُمُ الْبَنُونَ ﴿٣٩﴾ أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴿٤٠﴾ أَمْ عِندَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ ﴿٤١﴾ أَمْ يُرِيدُونَ كَيْدًا فَالَّذِينَ كَفَرُوا هُمُ الْمَكِيدُونَ ﴿٤٢﴾ أَمْ لَهُمْ إِلَٰهٌ غَيْرُ اللَّهِ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾:

﴿ فَذَكِّرْ ﴾ خــوا ﷻ فەرمــان بــە پێغەمبەرەکــەی دەکات کە یــادی خەڵکــی بخاتەوە، مســوڵمانانو بێبڕوایــان، بــۆ ئــەوەی بەڵگــەی خــوا پێویســت بــێ لەســەر ســتەمکاران، وە ســەرکەوتووان ڕێنمایــی وەربگــرن بــە یادکردنــەوەی، وە بــا گــوێ نــەدا بــە قســەی

هاوبەشـدانەرە بەدرۆدانـەرەکان، وە ئازاردانیـانو ئـەو قسـانەی کـە بەرهەڵسـتی خەڵکـی پێدەکـەن لـە شـوێنکەوتنی، لەگـەڵ زانیاریان ئـەو دوورترین کەسـە لێیەوە، لەبـەر ئەمەیە هەمـوو ناتەواویەکـی لێـی ڕەتکردوەتەوە کـە داویانەتـە پاڵی، جـا فەرموویەتی: ﴿فَمَآ أَنتَ بِنِعۡمَتِ رَبِّكَ﴾ (واتـە: چونکـە تـۆ بـە هۆی) منـەتو بەزەیـی خـوا، ﴿بِكَاهِنٖ﴾ واتە: نە هاوەڵـی جنۆکـەی هەیـە، هەندێ هەواڵـی پەنهانت بۆ بێنێ کە سـەد درۆ بداتـە پاڵی، ﴿وَلَا مَجۡنُونٍ﴾ (نەشـێتی)، شـێت: ئەو کەسـەیە کـە عەقڵی لـە دەسـتداوە، بەڵکو تـۆ تەواوترینی خەڵکـی لە ڕووی عەقڵـەوە، وە دوورترینیانی لە شـەیتانەکانو ڕاسـتگۆترینو گەورەترینو تەواوترینیانی.

(٣٠): وە جارێکـی دی ﴿يَقُولُونَ﴾ دەربـارەی (پێغەمبـەر دەیانـوت): بێگومـان ئـەو ﴿شَاعِرٞ﴾ شـاعیرەو شـیعر دەڵێ، ئەوەشـی هێناویەتی شـیعرە، خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَا عَلَّمۡنَٰهُ ٱلشِّعۡرَ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُۥٓ ٦٩﴾یـس، (واتـە: ئێمـە موحەممەدمان فێری شـیعر نەکردوەو شـیعر وتن شـیاوی ئـەو نیە).

﴿أَمۡ نَتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيۡبَ ٱلۡمَنُونِ﴾ واتـە: چاوەڕوانـی مردنـی دەکەیـن، بەم نزیکانـە کارەکەی پـووچ دەبێتەوەو ئێمـەش لێی دەحەسـێینەوە.

(٣١): ﴿قُلۡ﴾ لـە وەڵامـی ئەم قسـە پووچانەدا پێیـان بڵێ: ﴿تَرَبَّصُواْ﴾ واتـە: چاوەڕوانی مردنـم بـن، ﴿فَإِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُتَرَبِّصِينَ﴾ (واتە: بێگومان منیـش لەگەڵتاندا چاوەڕوانم) چاوەڕوانتـان دەکـەم خوا سـزاتان بدات لـە لایەن خۆیەوە، یان لەسـەر دەسـتی ئێمە.


أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلَٰمُهُم بِهَٰذَآ ۚ أَمْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴿٣٢﴾ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥ ۚ
بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ
﴿٣٤﴾ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَبِّكَ
أَمْ هُمُ ٱلْمُصَۣيْطِرُونَ ﴿٣٧﴾ أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ ۖ فَلْيَأْتِ
مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَهُ ٱلْبَنَٰتُ وَلَكُمُ ٱلْبَنُونَ ﴿٣٩﴾
أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴿٤٠﴾ أَمْ عِندَهُمُ ٱلْغَيْبُ
فَهُمْ يَكْتُبُونَ ﴿٤١﴾ أَمْ يُرِيدُونَ كَيْدًا ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هُمُ ٱلْمَكِيدُونَ ﴿٤٢﴾
أَمْ لَهُمْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٣﴾ وَإِن يَرَوْا۟ كِسْفًا
مِّنَ ٱلسَّمَآءِ سَاقِطًا يَقُولُوا۟ سَحَابٌ مَّرْكُومٌ ﴿٤٤﴾ فَذَرْهُمْ حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟
يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى فِيهِ يُصْعَقُونَ ﴿٤٥﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِى عَنْهُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا
وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ عَذَابًا دُونَ ذَٰلِكَ وَلَٰكِنَّ
أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ۖ وَسَبِّحْ
بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٤٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَإِدْبَٰرَ ٱلنُّجُومِ ﴿٤٩﴾
سُورَةُ النَّجْمِ

(٣٢): ﴿ أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلَٰمُهُم بِهَٰذَآ ۚ أَمْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴾ واتە: ئایا ئەم بەدرۆدانانەیانو ئەو قسانەی کە کردوویانە، ئایا فامو ژیرەکانیان فەرمانیان پێدەدەن؟ بە ڕاستی خراپترینو دزێوترین عەقڵە کە ئەو قسەی لێوە دەرچووە.

جا بە ڕاستی عەقڵانێک تەواوترینی ناو خەڵکی لە ڕووی عەقڵەوە بە شێت دابنێت، وە ڕاستگۆترینی ناو ڕاستگۆیان بە درۆو پووچ دابنێت، ئەو عەقڵانە شێتەکان خۆیان بە پاک ڕادەگرن لە ئاستیاندا، یان ئەوەی وای لێکردن ئەوە بکەن ستەمو یاخی بوونیان بوو؟

ئەوەش ڕاستیەکەیە، جا سەرکەشیو یاخی بوون سنووری بۆ نیە لەسەری بوەستی، جێگای سەرسوڕمان نیە سەرکەشی زێدەڕۆو هەر قسەو کردارێکی لێوە دەربچێت. ﴿ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥ ﴾ واتە: موحەممەد ﷺ قورئانی هەڵبەستووە، لە نەفسی خۆیەوە وتوویەتی؟

(٣٣): ﴿ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴾ واتە: جا ئەگەر بڕوایان هەبوایە، ئەوەی وتیان نەیان دەوت.

(٣٤): ﴿ فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴾ ئەو قورئانە خۆی هەڵیبەستووە؟ بێگومان ئێوە عەرەبی زمان پاراوو ڕەوان بێژن، بێگومان بەرەنگارتان بووەتەوە تەحەداتان دەکات کە ئێوەش نامەیەکی هەڵبەستراوو وێنەیەکی ئەو قورئانە بهێنن، تا دژایەتیەکەتان ڕاست دەربچێت، یان دان بە ڕاستگۆیی ئەودا بنێن، بێگومان ئێوە ئەگەر کۆ ببونایەتەوە، ئێوەی ئادەمیزادو جنۆکە، توانای دژایەتی کردنی پێغەمبەرتان نەدەبوو، وە توانای هێنانی وێنەی ئەو قورئانەتان نەبوو، جا ئەو کات ئێوە لە نێوان دوو کاردان:

یان بڕوا دێنن پێیو ڕێنمایی لێوەردەگرن، یان عینادیو کەللەڕەقی دەکەن شوێنی ئەوە دەکەون فێری بوون لە پووچو بەتاڵ.

(٣٥): ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴾ (واتە: ئایا ئەوان لە خۆیانەوە دروست بوون، یاخود دروستکاری خۆیانن) ئەمە بەڵگەیە لەسەریان، بە کارێ هیچیان پێناکرێ جگە لە

خۆبەدەستەوەدانو ملکەچی نەبێ بۆ حەقو ڕاستی، یان دەرچوون لە پێویست بوونی عەقڵو ئاین، ڕوون کردنەوەی ئەمەش بەم شێوەیە: ئەوان نکووڵی لە یەکتاپەرستی خوا دەکەن پێغەمبەرەکەی ﷺ بە درۆ دەزانن، ئەوەش پەیوەستە بە نکووڵی کردن لەوەی کە خوا دروستی کردوون.

بێگومان چەسپاوە هەم بە عەقڵو هەم بە شەرع، کە بە ڕاستی کارەکان دەرناچن لە یەکێک لەم سیانە:

یان ئەوان لەخۆیانەوە دروست بوون بە بێ هیچو لە خۆڕا، واتە: هیچ بەدیهێنەرێکیان نیە، بەڵکو بە بێ بوون هاتنەتە بوون، بەدیهێنەر نیە، ئەمەش زۆر مەحاڵو ئەستەمە.

یان خۆیان دروستکەری خۆیانن، بەهەمان شێوە ئەمەش مەحاڵە، بێگومان ناگونجێ هیچ کەسێک نەفسی خۆی هێنابێتە بوون.

ئەگەر ئەم دوو کارە پووچ بوویەوە، مەحاڵیان ڕوون بوویەوە، بەشی سێیەم دەچەسپێت کە بریتیە لەوەی بێگومان خوا دروستی کردوون.

وە ئەگەر ئەوەش چەسپا، ئەوە بێگومان زانراوە خوا پەرستراوە بەتاکو تەنها، کە نابێو ناگونجێ هیچ کەس بپەرسترێ جگە لە خوا.

(٣٦): کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ﴾ (واتە: ئەی ئایا ئەوان ئاسمانەکانو زەویان دروستکردوە) ئەمەش پرسیارە بەڵگەیە لەسەر دانپێدانانی ڕەتکردنەوە، واتە: ئاسمانەکانو زەویان دروست نەکردوە، تا ببنە هاوبەشی خوا، ئەمەش کارێکی ڕوونە.

بەڵام بەدرۆدانەران ﴿ لَّا يُوقِنُونَ ﴾ واتە: زانستی تەواویان نیە، وە دڵنیاییەک ببێتە مایەی ئەوەی سوود لە بەڵگە شەرعیو عەقڵیەکان وەربگرن.

(٣٧): ﴿ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ ٱلْمُصَۜيْطِرُونَ ﴾ واتە: ئایا گەنجینەی ڕەحمەتی پەروەردگارت لە لای ئەو بە درۆدانەرانەیە، بە ویستی خۆیان کێیان بوێ پێی ببەخشن، وە ڕێگری بکەن لەوەی دەیانەوێ؟ واتە: ئا لەبەر ئەوە قەدەغەیان کردوە لەسەر خوا پێغەمبەرایەتی ببەخشێت بە بەندەو پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ، وەکو ئەوە وایە کرابێتنە بریکارو دەسەڵات پێدراو لەسەر گەنجینەی خوا، بێگومان ئەوان زۆر لەوە بچووکترو زەلیل ترن، هیچ سوودێکیان بەدەست نیە بۆ خۆیان، وە نە زیانو نە مردنو نەژیانو نە زیندوو کردنەوە، ﴿ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ۚ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴿٣٢﴾ ﴾الزخرف (واتە: ئایا ئەوان ڕەحمەتی پەروەردگارت دابەش دەکەن، لە کاتێکدا ئێمە لە نێوانیاندا دابەشمان کردوە هۆی گوزەرانیان لەم ژیانی دونیایەدا).

﴿ أَمْ هُمُ ٱلْمُصَۜيْطِرُونَ ﴾ واتە: (یان ئەوان) دەسەڵاتدارن لەسەر دروستکراوی خواو موڵکی، بە

زاڵ بوونو توانا؟ بەو شێوەیە نیە، بەڵکو ئەوان بێتواناو هەژارن.
(٣٨): ﴿ أَمۡ لَهُمۡ سُلَّمٞ يَسۡتَمِعُونَ فِيهِ ﴾ واتە: ئایا ئەوان ئاگادارن بە پەنهان، لە نێوان فریشتە نزیکەکان شتێ لە پەنهان دەبیستن، تا هەواڵ بدەن دەربارەی شتانێک جگە لەوان کەس نەیزانێ؟
﴿ فَلۡيَأۡتِ مُسۡتَمِعُهُم ﴾ (با گوێگرەکەیان بهێنێ) ئەوەی بانگەشەی گوێگرتن دەکات، ﴿ بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ﴾ (واتە: بەڵگەیەکی ڕوون) چۆن دەتوانێ ئەوە بهێنێ.
خوا زانای نهێنیو ئاشکرایە، کەس ئاگادار ناکات بەسەر نهێنی خۆیدا، مەگەر پێغەمبەرێک کە لێی ڕازی بێت هەواڵی پێبدات بەوەی دەیەوێ لە زانستی خۆی.
جا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ چاکترینی پێغەمبەرانو زاناترینو پێشەواترینیانە، ئەو هەواڵدەرە بەوەی خوا هەواڵی پێداوە لە یەکتاپەرستی خواو پەیمانو هەڕەشەیو جگە لەوانەش لە هەواڵە ڕاستەکان، وە بەدرۆدانەران لە نەفامانو گومڕاو سەرلێشێواوو عینادو کەللەڕەقان، کام لەم هەواڵدەرانە لە پێشترە بە وەرگرتنی هەواڵەکەی؟
بە تایبەت پێغەمبەر ﷺ بێگومان بەڵگەو سەلماندنەکانی هێناوەتەوە لەسەر ئەوەی کە هەواڵی پێداوە، کە وەکو ئەوە وایە بە چاو ببینرێت، وە گەیشتووەتە ئەوپەڕی ڕاستی، ئەوان نەیانتوانیوە لەسەر ئەوەی بانگەوازی بۆ دەکەن شتێکی گوماناویش بهێننەوە، سەرەڕای بەجێهێنانی بەڵگە.
(٣٩): خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَمۡ لَهُ ٱلۡبَنَٰتُ ﴾ (واتە: ئایا کچان بۆ خوایە) وەک پێتان وایە ﴿ وَلَكُمُ ٱلۡبَنُونَ ﴾ (کوڕانیش بۆ ئێوە) دوو شتی ناپەسند پێکەوە کۆ دەکەنەوە؟ منداڵتان داناوە بۆی، وە هەڵبژاردنی خراپترینی ئەو دوو بەشە؟ ئایا لەم بە کەم دانانە بۆ خوا شتێکی دیکە هەیە؟!
(٤٠): ﴿ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ ﴿ أَجۡرٗا ﴾ لەسەر گەیاندنی پەیامەکەت ﴿ فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ ﴾ (واتە: ئەوانیش لەبەر بژاردنی باریان گرانە)؟ کارەکە بەو شێوەیە نیە، بەڵکو تۆ سووریت لەسەر فێرکردنیان، بە خۆبەخش بە بێ داوای هیچ شتێک، بەڵکو ماڵێکی زۆر دەبەخشیت لە پێناو ئەوەی پەیامەکەت وەربگرنو وەڵامی بانگەوازەکەت بدەنەوە، وە دەبەخشی بەوانەی کە هێشتا دڵیان جێگیر نەبووە لەسەر ئیسلام، بۆ ئەوەی زانستو ئیمان لە دڵیاندا جێگیر بێت.
(٤١): ﴿ أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ ﴾ (واتە: ئایا زانیاری غەیبیان لە لایە؟ جا ئەوان لەبەری دەنووسنەوە) ئەوەی فێری دەبن لە پەنهانەکان، تا وایان لێدێت ئاگادار دەبن بەسەر شتانێک کە پێغەمبەر پێی ئاگادار نەبووە، بەوهۆیەوە لە دژی دەوەستنو عینادیو نکووڵی دەکەن بەوەی لە لایانە لە زانستی پەنهان؟ بێگومان زانراوە ئەوان ئوممەتێکی نەخوێندەواری نەفامو گومڕان.
پێغەمبەریش ﷺ زانستێکی لە لایە مەزنتر لە جگە لەخۆی، خوا هەواڵی پێداوە بەزانستی پەنهان کە

هیچ کەسێک لە دروستکراوەکان پەی پێنابەن، هەموو ئەمانە پەیوەست کردنیانە بە ڕێگا عەقڵیو نەقڵیەکان لەسەر خراپی قسەکانیان، وە وێنای پووچی بە چاکترینی ڕێگاکانو ڕوونترینیان، وە سەلامەتترینیان لە ڕەخنە گرتن.

(٤٢): وتەی خوا ﷻ: ﴿ أَمْ يُرِيدُونَ ﴾ (ئایا دەیانەوێت) بە لەکەدار کردنت، وە بەوەی کە پێی هاتووی ﴿كَيْدًا ﴾ (فێڵێک بکەن) ئاینەکەتی پێ پووچ بکەنەوە، بەهۆیەوە کاروبارت تێک بدەن؟

﴿ فَالَّذِينَ كَفَرُوا هُمُ الْمَكِيدُونَ ﴾ (واتە: دەی هەر بێبڕوایان فێڵ لێکراون) واتە: فێڵەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ سەر خۆیان، زیانەکەشی هەر بۆ خۆیانە، بێگومان خوا ئەوەی کرد -ستایش بۆ خوا- بێبڕوایان هەرچی لە توانایاندا بوو کردیان لە فرتو فێڵ، خوا پێغەمبەرو ئاینەکەی خۆی سەرخست بەسەریاندا، وە ڕیسواو سەرشۆڕی کردن.

(٤٣): ﴿ أَمْ لَهُمْ إِلَٰهٌ غَيْرُ اللَّهِ ﴾ واتە: ئایا پەرستراوێکیان هەیە هاواری پێبکرێو ئومێدی سوودی پێ هەبێو بترسێ لە زیانی جگە لە خوا ﷻ؟

﴿ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ (واتە: خوا پاکە لە هەموو هاوبەشێک کە بۆی بڕیار دەدەن) هیچ هاوبەشێکی نیە لە موڵکدا، وە هیچ هاوبەشێکی نیە لە تەنهاییو پەرستندا.

ئەوەی مەبەستە لە فەرمایشتەکەدا کە لەو پێناوەدا هاتووە، ئەویش پووچی پەرستنی جگە لە خوایە، وە ڕوون کردنەوەی خراپیەتی بەو بەڵگە یەکلاکەرەوانە.

ئەوەی هاوبەشدانەران لەسەری دەڕۆن پووچە، وە ئەوەی پێویستە بپەرسترێو نوێژی بۆ بکرێو سوژدەی بۆ ببرێ، وە بە دڵسۆزی لێی بپاڕێتەوە، پاڕانەوەی پەرستنو پاڕانەوەی داواکردن، بریتیە لە خوای پەرستراوی خاوەن ناوو سیفاتە تەواوەکان، خاوەن زۆرترین سیفاتە چاکەکانو کارە جوانەکان، خاوەن گەورەییو ڕێز، وە عیززەتی چەسپاو، تاکو تەنهاو بێنیازو گەورەو ستایشکراو.

(٤٤-٤٦): ﴿ وَإِن يَرَوْا كِسْفًا مِّنَ السَّمَاءِ سَاقِطًا يَقُولُوا سَحَابٌ مَّرْكُومٌ ﴿٤٤﴾ فَذَرْهُمْ حَتَّىٰ يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي فِيهِ يُصْعَقُونَ ﴿٤٥﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِي عَنْهُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾:

خوا لە باسکردنی ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە بێگومان هاوبەشدانەران ئەوانەی حەقی ئاشکرا بە درۆدادەنێن، ئەوانە لە ڕاستی لایان داوەو ڕوویان کردووەتە پووچ، بێگومان ئەگەر بۆ سەلماندنی حەق هەر بەڵگەیەک بهێنرێ، ئەوان شوێنی ناکەون، وە پێچەوانەی دەجوڵێنەوەو عینادی دەکەن، دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يَرَوْا كِسْفًا مِّنَ السَّمَاءِ سَاقِطًا ﴾ واتە: ئەگەر لە ئاسمانەوە بەڵگە ڕوونەکان بکەونە خوارەوە، واتە: بەشێکی گەورە لە سزا ﴿ يَقُولُوا سَحَابٌ مَّرْكُومٌ ﴾ واتە: ئەمە هەورێکە بەسەر یەکدا

کەوتووە بە عادەتو دابو نەریت. واتە: بێباکن لەوەی هەر ئایەتو نیشانەیەک ببینن، پەندی لێ وەرناگرن.

(٤٥): ئەوان هیچ چارەسەرێکیان نیە جگە لە سزاو تۆڵە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ فَذَرۡهُمۡ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي فِيهِ يُصۡعَقُونَ ﴾ (واتە: دەی لێیان گەڕێ تا تووشی ڕۆژی خۆیان دەبن کە تیایدا لە ناو دەچن) ئەویش ڕۆژی دواییە کە تووشی سزاو تۆڵە دەبن تیایدا، سزایەک بەهیچ جۆرێ نەئەندازە دەکرێو نە وەسفیش.

(٤٦): ﴿ يَوۡمَ لَا يُغۡنِي عَنۡهُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـٔٗا ﴾ واتە: (ڕۆژێ دێت فێڵەکانیان هیچ سودێکیان پێناگەیەنێ) نە زۆر نەکەم، ئەگەر چی لە دنیادا فێڵیان دەکرد بۆ ماوەیەکی کەم پێی دەژیان، لە ڕۆژی دواییدا فێڵەکانیان پەرشو بڵاو دەبێو تواناکانیان پووچ دەبێتەوە، هیچ یارمەتیەک نادرێن لە سزای خوا، ﴿ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴾.

(٤٧-٤٩): ﴿ وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ عَذَابٗا دُونَ ذَٰلِكَ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٤٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡهُ وَإِدۡبَٰرَ ٱلنُّجُومِ ﴿٤٩﴾ ﴾:

﴿ وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ عَذَابٗا دُونَ ذَٰلِكَ ﴾ واتە: کاتێ خوا باسی سزای ستەمکارانی کرد لە ڕۆژی دواییدا، هەواڵیدا ئەوان سزایەکیان بۆ هەیە جگە لە سزای ڕۆژی دوایی، ئەویش گشتگیرە بە سزای دونیا بە کوشتنو بە کۆیلە کردنو دەرکردن لە ماڵو وڵات، وە سزای ژیانی بەرزەخو ناو گۆڕ، ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ واتە: لەبەر ئەوەیە هەر شتێ شایستەی سزاو تۆڵەیە ئەنجامیانداوە.

(٤٨): ﴿ وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ ﴾ کاتێ خوا ﷻ بەڵگەو سەلماندنەکانی ڕوون کردەوە لەسەر پووچی قسەی بەدرۆدانەران، فەرمانی کرد بە پێغەمبەرەکەی گوێیان نەداتێ، وە چاوەڕوانی بڕیاری پەروەردگاری بێت قەدەریو شەرعی، بە پەیوەست بوونیو بەردەوام بوون لەسەری، وە خوا پەیمانی پێداوە بە بەسبوون بە وتەی خۆی: ﴿ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَا ﴾ واتە: لە پێش چاوی ئێمەدای، وە پاراستنو گرنگی دان بە کاروبارت. وە فەرمانی پێکردوە ئارام بگرێو بەندایەتی بکات فەرموویەتی: ﴿ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ﴾ واتە: لە شەودا.

(٤٩): فەرمان کردنی تێدایە بە شەونوێژ، یان کاتێ هەستایت بۆ پێنج نوێژەکە، بە بەڵگەی ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡهُ وَإِدۡبَٰرَ ٱلنُّجُومِ ﴾ واتە: (وە بیپەرستەو ستایشی بکە) لە کۆتایی شەودا، نوێژی بەیانیش دەچێتە ناویەوە. خواش زاناترە.

تەفسیری سوورەتی (الطور) تەواو بوو.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ (١) مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ (٢) وَمَا يَنطِقُ عَنِ
الْهَوَىٰ (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ (٤) عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَىٰ (٥)
ذُو مِرَّةٍ فَاسْتَوَىٰ (٦) وَهُوَ بِالْأُفُقِ الْأَعْلَىٰ (٧) ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ (٨)
فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ (٩) فَأَوْحَىٰ إِلَىٰ عَبْدِهِ مَا أَوْحَىٰ (١٠)
مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَىٰ (١١) أَفَتُمَارُونَهُ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ (١٢) وَلَقَدْ رَآهُ
نَزْلَةً أُخْرَىٰ (١٣) عِندَ سِدْرَةِ الْمُنتَهَىٰ (١٤) عِندَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَىٰ (١٥)
إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ (١٦) مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ (١٧) لَقَدْ رَأَىٰ
مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَىٰ (١٨) أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّىٰ (١٩) وَمَنَاةَ
الثَّالِثَةَ الْأُخْرَىٰ (٢٠) أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَىٰ (٢١) تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ
ضِيزَىٰ (٢٢) إِنْ هِيَ إِلَّا أَسْمَاءٌ سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم مَّا أَنزَلَ
اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ
وَلَقَدْ جَاءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ الْهُدَىٰ (٢٣) أَمْ لِلْإِنسَانِ مَا تَمَنَّىٰ (٢٤) فَلِلَّهِ
الْآخِرَةُ وَالْأُولَىٰ (٢٥) وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي
شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَن يَشَاءُ وَيَرْضَىٰ (٢٦)

## تەفسیری سوورەتی (النجم)

## مەککیە (٦٢) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-١٨): ﴿وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ (١) مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ (٢) وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ (٤) عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَىٰ (٥) ذُو مِرَّةٍ فَاسْتَوَىٰ (٦) وَهُوَ بِالْأُفُقِ الْأَعْلَىٰ (٧) ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ (٨)﴾

﴿وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ (١) مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ﴾ خوا ﷻ سوێند بە ئەستێرەکان دەخوات کاتێ ئاوا دەبن لە کۆتایی شەوو سەرەتای هاتنی ڕۆژ، چونکە لەوەدا ئایەتو نیشانەی مەزن بەدی دەکرێ، کە پێویستی کردوە سوێندی پێ بخورێت، ڕاستی ئەوەیە ئەستێرە ناوی ڕەگەزە، گشتگیرە بۆ هەموو ئەستێرەکان بە گشتی، خوا سوێندی بە هەموو ئەستێرەکان خواردووە لەسەر ڕاستی ئەو پەیامە خواییەی پێغەمبەر هێناویەتی، چونکە لەوەدا گونجانێکی سەرسوڕهێنەر هەیە، چونکە خوا ئەستێرەی کردوەتە جوانی ئاسمان، بە هەمان شێوە وەحیو شوێنەوارەکانی جوانین بۆ زەوی، جا ئەگەر زانستی بە جێماوی پێغەمبەران نەبووایە، ئەوە خەڵکی لە تاریکستانێکدا بوون تاریکتر لە شەوەزەنگ.

سوێند لەسەر خوراو پاک ڕاگرتنی پێغەمبەرە ﷺ لە گومڕابوون لە زانستەکەیدا، وە لادان لە ڕاستی مەبەستەکەیدا، ئەوەش دەیسەلمێنێ کە ڕێنمایی کراوە لە زانستیدا، ڕێنمایی کارە لە چاکی مەبەستیو ئامۆژگاریکەرە بۆ ئوممەت، بە پێچەوانەی ئەوەی گومڕاکەران لەسەری دەڕۆن لە خراپی زانستو خراپی مەبەست.

وە فەرموویەتی: ﴿صَاحِبُكُمْ﴾ بۆ ئەوەی بێداریان بکاتەوە لەو زانیاریانەی هەیانە دەربارەی ڕاستگۆییو هیدایەت، بێگومان کارو کردەوەی پێغەمبەر ﷺ لە لای بێبڕوایانی مەککە شاراوە نیە.

(٣): ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴾ واتە: قسەکانی لە هەواو هەوەسەوە دەرنەچووە.
(٤): ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴾ واتـە: شـوێنی هیـچ شـتێ ناکـەوێ جگـە لـەوە نەبـێ خـوا نیگـای بـۆی کـردوە لـە هیدایـەتو خۆپارێزی لـە خـودی خۆیـدا، وە لە غەیـری خۆیدا. ئەمـەش بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی سـوننەت وەحیو نیگایـە لە لایەن خواوە بـۆ پێغەمبەرەکەی، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴿١١٣﴾ ﴾ النسـاء، (واتە: وە خـوا کتێـبو حیکمەتـی بـۆ سـەر تـۆ دابەزانـدووە) بێگومـان پێغەمبـەر ﷺ مەعصومو پارێـزراوە لـەوەی هەواڵـی پێـدەدات دەربـارەی خـواو دەربـارەی شـەریعەتەکەی، چونکە فەرمایشـتەکانی لـە پووچیەوە سـەرچاوە ناگـرێ، بەڵکو لـە وەحیو نیگـاوە دەردەچێ.
(٥): پاشان باسی مامۆستای پێغەمبەر ﷺ دەکات چاکترینی فریشتە بەرێزەکانو تەواوترینیان، فەرموویەتی: ﴿ عَلَّمَهُۥ ﴾ واتە: جبریل ﷵ وەحی دابەزاندووە بۆ پێغەمبەر ﷺ، ﴿ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴾ واتە: خاوەن توانای ئاشکراو نهێنیە، بەهێزە لەسەر جێبەجێ کردنی ئەوەی خوا فەرمانی پێکردوە بە جێبەجێ کردنی، بەهێزە لەسەر گەیاندنی وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ، وە ڕێگری کردنی لە گوێ هەڵخستنی شەیتانەکان بۆی، یان شتێ بخەنە ناویەوە لەو نەبێ.
ئەمـەش پاراسـتنی خوایـە بـۆ وەحیەکەی، کـە ناردوویەتـی لەگەڵ ئـەم پێغەمبـەرە بەهێزو دەستپاکەدا.
(٦): ﴿ ذُو مِرَّةٍ ﴾ واتـە: (خاوەنـی) هێـزە، وە ڕەوشـتی چـاکو جوانـی ئاشـکراو نهێنـی، ﴿ فَٱسْتَوَىٰ ﴾ جبریـل ﷵ، (لەسـەر شـێوەی ڕاسـتەقینەی خـۆی وەسـتاوە).
(٧): ﴿ وَهُوَ بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴾ واتـە: بە ئاسـۆی ئاسـمانەوەیە کە دەروانێتە سـەر زەوی، ئەو لە رووحـە بەرزەکانـە کە شـەیتانەکان پێی ناگـەن، وە توانای ئەوەیان نیـە پێی بگەن.
(٨): ﴿ ثُمَّ دَنَا ﴾ واتـە: (پاشـان نزیـک بوویەوە) جبریـل ﷵ لە پێغەمبـەر ﷺ بۆ گەیاندنی وەحـی بـۆ لای، ﴿ فَتَدَلَّىٰ ﴾ (هاتـە خوارەوە) بۆ سـەری لە ئاسـۆی بەرزەوە.
(٩): ﴿ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ ﴾:
﴿ فَكَانَ ﴾ لـە نزیـک بوونـەوەی لێـی ﴿ قَابَ قَوْسَيْنِ ﴾ واتـە: بـە ئەنـدازەی دوو کەوان، کەوانیـش ناسـراوە ﴿ أَوْ أَدْنَىٰ ﴾ واتـە: نزیکتـر لـە دوو کـەوان، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە پێغەمبـەر ڕاسـتەوخۆ پەیامەکـەی وەرگرتووە، هیـچ هۆکارێک لە نێـوان ئەوو جبریـل دا نەبووە.
(١٠): ﴿ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾ ﴾:

﴿ فَأَوْحَىٰٓ ﴾ واتە: خوا بە هۆی جبریلەوە ﷺ سروشی کرد ﴿ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ ﴾ بۆ موحەممەد ﷺ ﴿ مَآ أَوْحَىٰ ﴾ واتە: ئەوەی سروشی بۆ کرد لە شەریعەتی مەزنو هەواڵی ڕاست.

(١١-١٢): ﴿ مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ ﴾: واتە: ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بە چاو بینی لە وەحی خوا لەگەڵ دڵی یەکیان گرت، وە بیستنیو دڵیو بینینی ڕێککەوتن لەسەری.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر تەواوی ئەو سروشەی کە خوا سروشی بۆی کرد، وە ئەو وەریگرت لێیەوە بە وەرگرتنێک کە هیچ گومانو دوو دڵیەکی تێدا نەبوو، ئەوەی بە چاوی بینی دڵی بە درۆی نەخستەوە، هیچ گومانیشی لەوەدا نەبوو.

وە دەگونجێ مەبەست لەوەدا، ئەوە بێ کە پێغەمبەر ﷺ لەو شەوەی ئیسراو میعراجی پێکرا لە نیشانە مەزنەکانی خوای بینی، وە بێگومان ئەو دڵنیا بووەیەوە بە دڵو بە بینینی، ئەمە تەواوە لە لێکدانەوەی دەقە پیرۆزەکەدا.

وە وتراوە: مەبەست لەوەدا، پێغەمبەر ﷺ لە شەوی ئیسرائدا پەروەردگاری بینیوەو قسەی لەگەڵدا کردوە، ئەمەش هەڵبژاردەی زۆرێکە لە زانایان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) بەمە بینینی پێغەمبەریان بۆ پەروەردگاری چەسپاندووە لە دونیادا.

بەڵام ڕاست وتەی یەکەمە، وە مەبەست پێی جبریلە، وەکو چۆن سیاقی دەقەکە بەڵگەیە لەسەری، پێغەمبەر جبریلی بینی لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی دوو جار: جارێک لە ئاسۆی هەرە بەرزەوە لە ژێر ئاسمانی دونیا وەک پێشتر باسکرا، وە جاری دووەم لە سەرووی ئاسمانی حەوتەم ئەو شەوەی شەوڕۆیی کرا بە پێغەمبەر ﷺ، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی:

(١٣-١٨): ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ﴿١٦﴾ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾ ﴾:

(١٣): ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴾: واتە: موحەممەد ﷺ جارێکی تر جبریلی بینی، دابەزی بۆ لای.

(١٤): ﴿ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴾ (واتە: لای درەختی (سدرة المنتهى) ئەویش بریتیە لە دارێکی زۆر مەزن لە سەرووی ئاسمانی حەوتەمەوەیە، ناو نراوە بە (سدرة المنتهى) ئەوەی بەرز دەبێتەوە لە زەوی لەوێ کۆتایی پێدێت، وە هەر وەحیو نیگایەک هەبێو جگە لەویش لەوێوە خوا بۆ سەر زەوی دایدەبەزێنێ.

یان زانستی بەدیهێنراوەکان لەوێ کۆتاییان پێدێت، واتە: لەبەر ئەوەی لە سەرووی ئاسمانەکانو زەویەوەیە ئەوە ئەوپەڕێتی لە بەرزێتیدا، یان لەبەر غەیری ئەوە، خوا زاناترە.
پێغەمبەر ﷺ لەو شوێنەدا کە جێگای ڕووحە بەرزە پاکە جوانەکانە، نە شەیتان نزیکی دەبێتەوەو نە ڕووحە پیسەکان.
(١٥): ﴿ جَنَّةُ الْمَأْوَىٰ ﴾ واتە: ئەو بەهەشتەی کۆکەرەوەی هەموو نیعمەتەکانە، بە جۆرێ هەموو ئاواتو مەبەستەکانی تێدا دێتە دی، هەموو حەزەکان بۆ لای ئەو دەڕۆن، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بەهەشت بەرزترینی شوێنەکانەو لە سەرووی ئاسمانی حەوتەمە.
(١٦): ﴿ إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ﴾ واتە: شتێکی مەزن سیدرە دادەپۆشێ بە فەرمانی خوا کەس وەسفی نازانێ جگە لەو زاتە.
(١٧): ﴿ مَا زَاغَ الْبَصَرُ ﴾ واتە: بەلای ڕاستو چەپدا نەیدەڕوانی لە دەرەوەی مەبەستەکەی، ﴿ وَمَا طَغَىٰ ﴾ چاوی سنووری نەدەشکاند، ئەمەش تەواوی ڕەوشت بەرزیەتی ﷺ، کە پلەیەکی پێبەخشی سنووری تێنەپەڕاندو خۆی لێی لانەدا.
ئەمەش تەواوترین ڕەوشتە مەزنەکانە کە پێشکەوتووە پێی بەسەر ئەوانەی پێش خۆیو ئەوانەی دوای خۆی، بێگومان کەم تەرخەمی بە یەکێک لەمانە دەبێت:
یان ئەوەیە بەندە ئەو شتەی فەرمانی پێکراوە بەجێی ناهێنێ، یان کەمتەرخەمی تێدا دەکات، یان زێدەڕۆیی، یان بە لای ڕاستو چەپدا، ئەمانە هەموویان لە پێغەمبەردا ﷺ نەبووە.
(١٨): ﴿ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَىٰ ﴾ لە بەهەشتو ئاگرو جگە لەوانەش لەو کاروبارانەی کە بینی لەو شەوەی شەوڕۆیی پێکرا.
(١٩-٢٥): ﴿ أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَىٰ ﴿٢٠﴾ أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰ ﴿٢٢﴾ إِنْ هِيَ إِلَّا أَسْمَاءٌ سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَاءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ الْهُدَىٰ ﴿٢٣﴾ أَمْ لِلْإِنسَانِ مَا تَمَنَّىٰ ﴿٢٤﴾ فَلِلَّهِ الْآخِرَةُ وَالْأُولَىٰ ﴿٢٥﴾ ﴾:
﴿ أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَىٰ ﴾ کاتێ خوا ﷻ پەیمانی موحەممەدی ﷺ بە پاک ڕاگرت، کە بریتیە لە هیدایەتو ئاینی ڕاستو دروستو فەرمان کردن بە پەرستنی خواو یەکتاپەرستی ئەو زاتە، ئنجا باسی پووچی ئەوەی کرد هاوبەشدانەران

لەسەری دەڕۆن، لە پەرستنی ئەوانەی کە هیچ شتێ لە سیفاتەکانی تەواوییان تێدانیە، نە سوودیان هەیە نە زیان، بەڵکو کۆمەڵە ناوێکی بەتاڵن لە ماناو ناوەڕۆک، هاوبەشدانەران خۆیانو باپیرە نەفامو گومراکانیان ناویان ناون، کۆمەڵە ناوێکی پووچیان بۆ داهێنان کە شایستەیان نیە، خۆیانو خەڵکیان پێ هەڵدەخەڵەتاند.

بێگومان پەرستراوانێک ئەمە حاڵیان بێت شایستەی تۆزقاڵە زەرەیەک لە پەرستن نین، وە ئەو بتانەی کە ناویان ناون بەو ناوانە، پێیان وابوو ئەو ناوانە وەرگیراون لە وەسفانێک کە پێی وەسف کراون، جا ناویان (اللات) لە (الإله) شیاوی بەندایەتیە، وە (العزى) لە (العزیز) وە (مناة) لە (المنان) بێبڕواییان کرد بە ناوەکانی خواو چاوقایمیانی کرد لە هاوبەشدانان بۆی، ئەم ناوانە داڕنراون لە مانا. جا هەر کەسێک کەمترین عەقڵی هەبێت، پووچیو بەتاڵی ئەو وەسفانە دەزانێ.

(٢١): ﴿ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ﴾ واتە: ئایا کچان بۆ خوا دادەنێن بە بۆچوونی خۆتانو کوڕانیش بۆ خۆتان؟

(٢٢): ﴿ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰٓ ﴾ واتە: (ئەگەر وابێ دابەش کردنێکی) ستەمکارانەیە، جا چ ستەمێ مەزنترە لە دابەش کردنێ فەزڵی بەندەی بەدیهێنراوی تێدا بدرێ بەسەر بەدیهێنەردا؟! بەرزیو بڵندی بۆ خوا لە قسەکانیان، بەرزیەکی گەورەو مەزن.

(٢٣): فەرموودەی خوا ﷻ ﴿ إِنْ هِيَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ﴾ واتە: (ئەم بتانە هەر ناوێکی ڕووتن کە ئێوەو باووباپیرانتان لێتان ناون خوا داینەبەزاندووە لەسەر پەرستراوێتی ئەوان) بەڵگەو سەلماندن لەسەر ڕاستی بۆچوونەکەتان، هەر کارێک خوا هیچ بەڵگەیەکی لەسەر دانەبەزاندبێ ئەوە پووچو بەتاڵەو ناکرێ بە ئاین، ئەوان -لە خودی خۆیاندا- شوێنی هیچ بەڵگەیەک نەکەوتوون دڵنیابن لەسەری. بەڵگەکانیان بریتی بوو لە گومانی خراپو نەفامی تەواو، وە ئەوەیشی هەواو هەوەسیان حەزی پێدەکرد لە هاوبەش دانانو بیدعە، کە ڕێک دێتەوە لەگەڵ حەزەکانیان، لە کاتێکدا پێویست نیە لەسەریان وا بخوازێ شوێنی گومان بکەون بە هۆی نەبوونی زانستو ڕێنمایی، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴾ واتە: (لە کاتێکدا کە بەڕاستی لەلایەن پەروەردگاریانەوە هیدایەتیان بۆ هاتووە) کە ڕێنماییان دەکات لە بابەتی یەکتاپەرستیو پێغەمبەرایەتی، وە هەموو داواکاریەکان کە بەندەکان پێویستیان پێیەتی. جا هەموویان خوا ﷻ ڕوونی کردۆتەوە بە تەواوترین ڕوونکردنەوە،

وە بەڵگـەو سـەلماندنی بـۆ هێناوەتەوە کە پێ بکات لەسـەر ئـەوانو جگە لەوانیش شـوێنی بکـەون، بۆ هیچ کەسـێک عـوزرو بیانـوو بەڵگە نەماوە لـە دوای ڕوونکردنەوەو سـەلماندن. ئەگـەر ئەوەی ئـەوان لەسـەرین دەرەنجامی شـوێنکەتنی گومانـەو کۆتاییەکـەی بەدبەختی هەتـا هەتایـیو سـزای هەمیشـەییە، مانەوە لەسـەر ئـەم حاڵە ئەوپـەڕی گێلـیو گەمژەییو ئەوپـەڕی سـتەمە، لەگـەڵ ئـەوەدا هیـواو ئاوات دەخـوازنو بە نەفسـی خۆیان بوغـرا دەبن.

(٢٤-٢٥): لەبـەر ئەمەیـە خـوا ﷻ نکوڵـی ئـەو کەسـە دەکات کـە پێـی وایە ئـارەزووی هەرچـی بـکات بـۆی دێتـە دی، ئـەوە درۆ دەکات لـەو قسـەیدا، وەک فەرموویەتی: ﴿ أَمْ لِلْإِنسَـٰنِ مَا تَمَنَّىٰ ﴿٢٤﴾ فَلِلَّهِ ٱلْـَٔاخِرَةُ وَٱلْأُولَىٰ ﴾ واتـە: (ئایـا مـرۆڤ ئـارەزووی هەرچـی بکات بـۆی دێتـە دی، نەخێـر * چونکە هـەر خوایە خاوەنـی دونیاو ئاخیـرەت) جا دەیانبەخشـێ بـە هـەر کەسـێ کـە خـۆی بیـەوێ، وە دەیگرێتـەوە لـە هـەر کـەس کـە خـۆی بیەوێ، کاروبـارەکان شـوێنی هیـواو ئاواتەکانیـان ناکەوێ، وە بە پێـی هیواو ئـارەزووی ئەوان نیە.

(٢٦): ﴿ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ لَا تُغْنِى شَفَـٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ لَيُسَمُّونَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ تَسْمِيَةَ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢٧﴾ وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ﴿٢٨﴾ ﴾

خـوا ﷻ نکوڵـی لـەو کەسـە دەکات کە جگـە لەئەو دەپەرسـتێ، لـە فریشـتەکانو جگە لەوانیـش، وە پێـی وایە پەرسـتنی ئەوانە سـوودی بۆی دەبـێو تکای بـۆ دەکات لەلای خوا لـەڕۆژی دواییـدا ﴿ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ ﴾ لـە فریشـتە نزیکـەکانو بەڕێزترینیـان ﴿ لَا تُغْنِى شَفَـٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا ﴾ واتـە: سـوودی نیـە بـۆ کەسـێ داوای لێبـکاتو خـۆی پێـدا هەڵبواسـێو ئومێـدی پێـی هەبێ.

﴿ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ ﴾ واتە: (مەگەر دوای ئەوەی کە خوا مۆڵەت بدات بۆ کەسێ کە خۆی بیەوێو ڕازی بێ) تکا کردن دەبێ دوو مەرجی تێدا کۆببێتەوە: مۆڵەتدانی خوا لە تکا کردن، وە ڕەزامەندی ئەو بۆ تکا بۆ کراو، ئەوەی زانراوەو چەسپاوە بێگومان هیچ کردەوەیەک وەرناگیرێ مەگەر تەنها بەدڵسۆزی لەپێناو خوادا بێ، وە بەپێی شەریعەت بێ، کەواتە هاوبەشدانەران هیچ بەشێکیان نیە لە تکاکردنی تکاکاراندا، ئەوان دەرگای ڕەحمەتی بەبەزەییترینی بەبەزەییەکانیان بەسەر خۆیاندا داخست.

إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ لَيُسَمُّونَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ تَسْمِيَةَ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢٧﴾
وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ ۖ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ
ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ﴿٢٨﴾ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا ٱلْحَيَوٰةَ
ٱلدُّنْيَا ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن
سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴿٣٠﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى
ٱلْأَرْضِ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَسَـٰٓـُٔوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟
بِٱلْحُسْنَى ﴿٣١﴾ ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَـٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَ ۚ
إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلْمَغْفِرَةِ ۚ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ
وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِى بُطُونِ أُمَّهَـٰتِكُمْ ۖ فَلَا تُزَكُّوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۖ هُوَ أَعْلَمُ
بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴿٣٢﴾ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴿٣٣﴾ وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰٓ
﴿٣٤﴾ أَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ ﴿٣٥﴾ أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِى صُحُفِ
مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴿٣٧﴾ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ
﴿٣٨﴾ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَـٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ
﴿٤٠﴾ ثُمَّ يُجْزَىٰهُ ٱلْجَزَآءَ ٱلْأَوْفَىٰ ﴿٤١﴾ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿٤٢﴾
وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ ﴿٤٣﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا ﴿٤٤﴾

(٢٧-٣٠): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ لَيُسَمُّونَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ تَسْمِيَةَ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢٧﴾ وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ ۖ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ﴿٢٨﴾ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴿٣٠﴾ ﴾

مانای ئەوەیە بێگومان ئەوانەی هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، پێغەمبەرانیش بەدرۆدادەنێن، ئەوانە بروایان بەرۆژی دوایی نیە، بە هۆی بروانەبوونیان بەرۆژی دوایی بوێریان کرد بەرانبەر بەخوا، بە چەندین قسەو کردەوە دژ بە خواو پێغەمبەرەکەی، لە قسەکانیان: (فریشتەکان کچانی خوان) پەروەردگاریان پاکو بێگەرد ڕانەگرت لە بوونی منداڵ، ڕێزیان لە فریشتەکان نەگرتو بە گەورەیان دانەنان، لەوەی کە بە ڕەگەزی مێ ناویان بردن.

(٢٨): لە کاتێکدا ئەوان هیچ زانیاریەکیان دەربارەی نیە، نە دەربارەی خوا، نە دەربارەی پێغەمبەرەکەی، وە سروشتو عەقڵەکان نابنە بەڵگە لەسەر ئەوە، بەڵکو زانست بە گشتی بەڵگەن لەسەر هەڵوەشاندنەوەی قسەکانیان، وە بێگومان خوا پاکو بێگەردە لە منداڵو هاوڕێ، چونکە تاکو تەنهاو بێنیازە، کەسی لێ نەبووەو لە کەس نەبووە، هەرگیز کەس هاوشێوەو هاوتای نیە، وە فریشتە بەڕێزەکان نزیکن لە خوا ﷻ، ڕاوەستاون لە خزمەتیدا: ﴿ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٦﴾ ﴾التحريم، (واتە: کە نافەرمانی خوا ناکەن لەوەی کە فەرمانیان پێدەدات، وە چ فەرمانێکیان پێ بدرێت دەیکەن) هاوبەشدانەران لەوەدا شوێنی شتی ناشرین کەوتوون، ئەویش گومانە کە هیچ سوودێکی نیە لە زانینی حەقو ڕاستیدا، چونکە حەقو ڕاستی دەبێ دڵنیایی تێدابێو لە بەڵگەی براوەو سەلماندنی یەکلاکەرەوەوە سەرچاوەی گرتبێ.

(٢٩): کاتێ ئەمە پیشەی ئەوانە بوو کە باسکرا، ئەوان هیچ مەبەستێکیان نیە لە

شـوێنکەوتنی حەقدا، بەڵکو مەبەسـتو ئامانجیان تێرکردنی نەفسو ئارەزووەکانیانە، خوا ﷻ فەرمانـی بـە پێغەمبەرەکـەی کـرد بە پشـت تێکـردن لەو کەسـەی پشـت دەکات لە یادی ئـەو، کـە بریتیـە لە زیکـری حەکیـمو قورئانـی مـەزنو هەواڵی بەخشـندە، پشـتی کردوە لـە زانسـتی بـە سـوود، بێجگـە لـە ژیانـی دونیا هیچـی دیکـەی نـاوێ، ئەمـەش ئەوپەڕی ئیرادەیەتی.

ئـەوەی زانـراوە بێگومـان بەنـدە کار نـاکات تەنهـا بـۆ شـتێ نەبـێ خـۆی دەیـەوێ، جـا کۆششـەکانیان کـورت کراوەتـەوە لەسـەر دونیـاو لـەزەتو حـەزوو ئارەزووەکانی، چۆن بەدەسـت بـێ بـە دەسـتی دێنن، وە بـە هـەر ڕێگایەک بۆیـان هەڵبکـەوێ دەستپێشـخەری دەکەن.

(٣٠): ﴿ ذَٰلِكَ مَبۡلَغُهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ ﴾ واتـە: ئەمە ئەوپەڕی زانسـتو زانیاریو مەبەسـتیانە. بەڵام ئەوانـەی بڕوایـان بـەڕۆژی دوایی هەیـەو بەڕاسـتی دادەنێـن، ئەوانەی خـاوەن دڵو عەقڵو ژیریـن، هیممـەتو ورەو ئیرادەیـان ماڵـی دواڕۆژە، وە زانسـتیان چاکتریـنو گەورەترینی زانسـتەکانە، ئەویـش زانسـتی وەرگیراوە لـە کتێبی خـواو سـوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ.

خـوا ﷻ زاناتـرە بەوەی شایسـتەی ڕێنماییە، ڕێنمایـی دەکات لەوەی کە شایسـتەی ڕێنمایی نیـە، دەیداتـە دەسـتی نەفسـی خۆیـیو ڕیسـواو سەرشـۆڕی دەکات، بۆیـە لە ڕێگـای خوا لادەدات، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱهۡتَدَىٰ ﴾ فـەزڵو چاکـەی خـۆی دادەنێـت لەو جێگایـەی کە دەزانـێ شایسـتەیە پێی.

(٣١-٣٢): ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ بِٱلۡحُسۡنَى (٣١) ٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَۚ إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلۡمَغۡفِرَةِۚ هُوَ أَعۡلَمُ بِكُمۡ إِذۡ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَإِذۡ أَنتُمۡ أَجِنَّةٞ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡۖ فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ (٣٢) ﴾:

﴿ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات ئەو خاوەنی موڵکە، تاکو تەنهایە لە موڵکداریی دونیاو دواڕۆژدا، وە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوی دایە موڵکی خوان، هەڵیاندەسوڕێنێو بەڕێوەیان دەبات بە دەسەڵاتی مەزن لە بەندەکانیو دروست کراوانیدا، وە هەرچی بیەوێ لە شەریعەتی خۆی بەسەریاندا جێبەجێی دەکات، وە فەرمانیان پێدەکاتو قەدەغەیان لێدەکات، پاداشتیان دەداتەوە لەسەر ئەوەی فەرمانی پێکردوونو قەدەغەی لێکردوون، پاداشتی گوێڕایەڵان دەداتەوە، وە سەرپێچیکاران سزا دەدات.

﴿ لِيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ ﴾ (تـا سـزای ئەوانـە بـدات) کـە کـردەوەی خراپیـان کـردوە لـە کوفـرو ئەوەیشـی لـە خـواری ئەوەوەیـە ﴿ بِمَا عَمِلُواْ ﴾ لە کـردەوەی خراپە بە سـزایەکی سەخت.

﴿ وَيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُواْ ﴾ (وە پاداشـتی ئەوانـە بداتەوە کـە چاکەیان کردوە) لـە بەندایەتی کردنـی خـواو چاکـە لەگـەڵ دروسـتکراوەکانی بە جۆرەهـا چاکـە ﴿ بِٱلْحُسْنَى ﴾ واتە: بە حاڵەتـی چاک لـە دونیـاو دوارۆژدا، گەورەترینـی ئەوانـەش ڕەزامەنـدی پەروەردگاریانو سـەرکەوتنیانە بە نازونیعمەتی بەهەشـت.

(٣٢): پاشان باسی سیفاتەکانیانی کردوەو فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ ﴾ واتە: ئەنجامی دەدەن هەرچی خوا فەرمانی پێکردوە لە واجبو پێویستیەکان، کە وازهێنانیان یەکێکە لە تاوانە گەورەکان، وە وازدەهێنن لە قەدەغەکراوە گەورەکان وەک زیناو خواردنەوەی شەرابو خواردنی ڕیباو کوشتنی خەڵکو، وێنەی ئەمانە لە تاوانە مەزنەکان، ﴿ إِلَّا ٱللَّمَمَ ﴾ ئەویش گوناهە بچوکەکانە کە خاوەنەکەی بەردەوام نەبێ لەسەریان، یان جار لە دوای جار ئەنجامی بدات بە شێوەیەکی کەم، ئەمە تەنها بە ئەنجامدانی بەندە پێی دەرناچێ لە ڕیزی چاکەخوازان، بێگومان ئەمانە لەگەڵ ئەنجامدانی پێویستو واجبەکانو وازهێنان لە قەدەغەکراوەکان، دەچێتە ژێر لێبوردنی خوا، کە هەموو شتێکی گرتۆتەوە، لەبەر ئەمەیە خوا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلْمَغْفِرَةِ ﴾ (بە ڕاستی پەروەردگارت لێبوردنی فراوانە) جا ئەگەر لێبوردنی ئەو نەبووایە وڵاتو خەڵکی لەناو دەچوون، وە ئەگەر لێخۆشبوونو نەرمو نیانی ئەو نەبووایە، ئاسمان دەکەوتە سەر زەوی، وە هیچ گیاندارێک لەسەر زەوی نەدەمایەوە، لەبەر ئەمەیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: [الصَّلَوَاتُ الخَمْسُ، وَالجُمُعَةُ إِلَى الجُمُعَةِ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ مُكَفِّرَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ إِذَا اجْتُنِبَتِ الكَبَائِرُ] (أخرجه أحمد برقم: (٩١٨٦)، ومسلم برقم: (٢٣٣))، واتە: پێنج نوێژە فەرزەکە، هەینی بۆ هەینیو ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان، دەبنە کەفارەتی ئەو گوناهانەی لە نێوانیانە، بە مەرجێ خۆدوورگیرابێت لە گوناهە گەورەکان.

کە دەفەرمـوێ: ﴿ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ ﴾ واتـە: خـوا ﷻ لـە هەمـوو کەس بـە حاڵـی ئێـوە زاناترە، وە ئەوەشـی لـە سروشـتتان دایە، لـە لاوازیو بێهێـزی لـە بەرانبـەر زۆرێک لەوانـەی خوا فەرمانـی پێکـردوون، وە لە زۆری پاڵنـەرەکان بـۆ لای هەنـدێ لـە قەدەغەکـراوەکان، وە زۆری ئەوانـەی سەرنجڕاکێشـن، وە نەبوونـی ڕێگریـە بەهێزەکان.

لاوازی بوونـی هەیـەو دەبینـرێ تیاتانـدا كاتـێ خوا لە زەوی دروسـتی كـردوون، وە كاتێ ئێـوە كۆرپەلـە بـوون لـە سـكی دایكتانـدا، بـەردەوام لاوازیتـان تێدایـە، ئەگەر چـی خوا هێـزی پێداون لەسـەر ئـەوەی فەرمانـی پێكـردوون، بـەلام لاوازی بەردەوامە.

جـا زانیاریـی بـەم حاڵەتـان گونجـاوە لەگـەڵ حیكمەتـی پەرسـتراوێتیو بەخشـندەیی پەروەردگارێتیـدا، كە داتان پۆشـێت بە میهرەبانـیو لێبوردەییو لێخۆشـبوونیو چاكەكانی، وە تـاوانو گوناهەكانتـان لەسـەر لادبـات، بـە تایبەت ئەگـەر بەنـدە مەبەسـتی ڕەزامەندی پەروەردگـاری بـوو لـە هەمـوو كاتەكانـدا، وە كۆششـی كـرد لـەوەی نزیكـی دەكاتەوە لـە خـوا لە زۆربـەی كاتەكانـدا، وە ڕاكردنـی لـەو گوناهانەی كـە دەبێتە مایـەی توورەیی پەروەردگـاری، پاشـان هەڵە لـە دوای هەڵـە دەكات، بێگومان خوا بەڕێزترینـی بەڕێزەكانەو بـە بەزەیـی ترینیانـە، بـە بەزەییتـرە بۆ بەندەكـەی لە بـاوك بـۆ كوڕەكەی.

هـەر دەبـێ وێنـەی ئەمـە لـە لێبوردنـی پەروەردگاریـەوە نزیـك بێـت، وە خـوای گـەورە لـە هەمـوو كاتەكانیـدا وەلامـی بداتـەوە، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾ واتـە: پاكـی نەفسو دەروونتـان بـە خەڵكـی ڕادەگەیەنـن لـە ڕووی سـتایش كردنـەوە، ﴿هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴿٣٢﴾﴾ النجم (واتـە: خـوا زاناتـرە بـەو كەسـەی خۆپارێـزە) بێگومـان خۆپارێـزی جێگـای نـاو دڵـە، پاداشـت دەداتـەوە لەسـەر ئـەوەی لەنـاو دڵدایـە لـە چاكـەو خۆپارێـزی، بـەلام خەڵكـی هیـچ سـوودێكیان نابێـت بۆتـان لـە لای خـوا.

(٣٣-٦٢): ﴿أَفَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي تَوَلَّىٰ ﴿٣٣﴾ وَأَعۡطَىٰ قَلِيلٗا وَأَكۡدَىٰٓ ﴿٣٤﴾ أَعِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلۡغَيۡبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ
﴿٣٥﴾ أَمۡ لَمۡ يُنَبَّأۡ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَإِبۡرَٰهِيمَ ٱلَّذِي وَفَّىٰٓ ﴿٣٧﴾ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰ ﴿٣٨﴾
وَأَن لَّيۡسَ لِلۡإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعۡيَهُۥ سَوۡفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ثُمَّ يُجۡزَىٰهُ ٱلۡجَزَآءَ ٱلۡأَوۡفَىٰ
﴿٤١﴾ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلۡمُنتَهَىٰ ﴿٤٢﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضۡحَكَ وَأَبۡكَىٰ ﴿٤٣﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحۡيَا ﴿٤٤﴾ وَأَنَّهُۥ
خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطۡفَةٍ إِذَا تُمۡنَىٰ ﴿٤٦﴾ وَأَنَّ عَلَيۡهِ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأُخۡرَىٰ ﴿٤٧﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغۡنَىٰ
وَأَقۡنَىٰ ﴿٤٨﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ ٱلشِّعۡرَىٰ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّهُۥٓ أَهۡلَكَ عَادًا ٱلۡأُولَىٰ ﴿٥٠﴾ وَثَمُودَاْ فَمَآ أَبۡقَىٰ ﴿٥١﴾ وَقَوۡمَ
نُوحٖ مِّن قَبۡلُۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ هُمۡ أَظۡلَمَ وَأَطۡغَىٰ ﴿٥٢﴾ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَةَ أَهۡوَىٰ ﴿٥٣﴾ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نَذِيرٞ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلۡأُولَىٰٓ ﴿٥٦﴾ أَزِفَتِ ٱلۡأٓزِفَةُ ﴿٥٧﴾ لَيۡسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ
كَاشِفَةٌ ﴿٥٨﴾ أَفَمِنۡ هَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ تَعۡجَبُونَ ﴿٥٩﴾ وَتَضۡحَكُونَ وَلَا تَبۡكُونَ ﴿٦٠﴾ وَأَنتُمۡ سَٰمِدُونَ ﴿٦١﴾ فَٱسۡجُدُواْۤ لِلَّهِۤ
وَٱعۡبُدُواْ۩ ﴿٦٢﴾﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ أَفَرَءَيْتَ ﴾ (واتـە: جا ئایا بینیت) ناشـرینی حاڵی ئەو کەسـەی کە فەرمانـی پێکـراوە بـە بەندایەتـیو یەکتاپەرسـتی پەروەردگـاری، ئەویش پشـتی هەڵکردو ڕووی وەرگێـرا لێـی؟ ئەگـەر نەفـسو دەروونـی ڕێـی پێدابـێ بە بەخشـینی هەندێ شـتی کـەم، کـە بێگومـان بـەردەوام نابێ لەسـەری، بەڵکـو چروکـی دەکات خـۆی دەگرێتەوەو ڕێگری دەکات.

بە ڕاسـتی چاکە پیشـەو سروشـتی ئەو نیـە، بەڵکو سروشـتی پشـت تێکردنە لـە گوێڕایەڵی خـواو پابەنـد نەبـوون لەسـەر کاری چاکـە، لەگـەڵ ئەمـەدا ئـەو خـۆی بە پـاکو چاک دادەنێـت، وە لـە جێگایـەک دایدەنـێ لـە غەیری جێگـای خۆی.

(٣٥): ﴿ أَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ ﴾ (واتـە: ئایـا زانیـاری پەنهانـی لایەو بەچـاو دەبینێ) پەنهـانو هەواڵـی پێدەدا، یان ئەو قسـە هەڵدەبەسـتێت لەسـەر خوا، کەللەڕەقو بوێرە لەسـەر هەمـوان لـە کۆکردنـەوە لـە نێـوان خراپەکاریـیو خۆ بـە پاک دانـان، وەکو چـۆن ئەوە ڕاسـتیەکەیە، چونکـە زانیویەتـی کە بێگومان زانسـتی پەنهانـی لەلا نیە، ئەگـەر گریمانەش بکرێـت ئەو بانگەشـەی ئـەوە دەکات، ئـەوە هەواڵە یەکلاکـەرەوەکان دەربارەی زانسـتو زانیـاری پەنهان کە لەسـەر دەسـتی پێغەمبـەری مەعصومو پارێـزراو هاتووە، بەڵگەن لەسـەر هەڵوەشـاندنەوەی قسـەکەی، ئەویش بەڵگەیە لەسـەر پووچێتی.

(٣٦-٣٧): ﴿ أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ ﴾ (واتـە: ئایـا هەواڵـی پێنـەدراوە) ئـەم بانگەشـەکارە، ﴿ بِمَا فِى صُحُفِ مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴾ واتـە: هەسـتاوە بەهەمـوو ئەوانـەی خـوا پێـی تاقیکردوەتـەوە، وە فەرمانـی پێکـردوە لـە شـەریعەتەکانو بنەماکانی ئاینو لـقو پۆکانی.

(٣٨-٣٩): وە لـەو پەڕاوانـەدا حوکـمو بڕیارێکـی زۆر هەن، لـە گرنگترینیـان، ئەوەیە خوا باسـی کردوەو فەرموویەتـی: ﴿ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿٣٨﴾ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾ واتـە: هەمـوو کەسـێک کـردەوەی چـاکو خراپـی خـۆی بۆ خۆیەتـی، کەس کـردەوەو کۆششـی کەسـێکی دیکـە بـۆ خـۆی نابـات، وە هیـچ کەسـێک تاوانـی کەسـێکی دیکە هەڵناگرێ.

(٤٠): ﴿ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ﴾ (واتـە: بێگومان پاداشـتی کۆششـی خۆی لـە داهاتوودا دەبینـێ) لـە دوارۆژدا، چاکەو خراپـەی لە یەکتر جیـا دەکاتەوە.

(٤١): ﴿ ثُمَّ يُجْزَىٰهُ ٱلْجَزَآءَ ٱلْأَوْفَىٰ ﴾ (واتـە: پاشـان پاداشـتی دەدرێتەوە) بە تەواوی لەسـەر هەمـوو کـردەوەکان، ئەوانـەی زۆر چـاکو پاکـن، ئەوانـەش لـە ڕادە بـەدەر خراپـن، بە

پاداشـتێک هەمـوو بەدیهێنـراوەکان تێکـڕا دان بـە دادپەروەریـدا دەنێـن، وە ستایشـی خوا دەکـەن لەسـەری، تەنانـەت دۆزەخیەکانیـش کاتێ دەخرێنە ئاگـرەوە دڵیان پڕە لە ستایشـی پەروەردگاریـان، وە دانپێدانـان بـە تـەواوی حیکمەتی ئەو زاتـە، ڕەخنە لە خۆیـان دەگرن، بێگومـان ئەوان خۆیان نەفسـی خۆیانیـان گەیاند بەو حاڵە، وە تووشـی خراپتریـن جێگەیان کرد.

(٣٩): بێگومـان بەڵگـەی هێناوەتەوە بە وتەی خـوا ﷻ: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾ (واتـە: بـە ڕاسـتی ئادەمیـزاد جگـە لـە کۆششـی خـۆی خـاوەن هیچـی تـر نیـە) بـۆ ئەو کەسـەی پێـی وایـە نزیکـی دروسـت نیە، کۆششـی خۆی بـکات بە دیـاری بـۆ زیندووان یـان بۆ مـردووان.

وتوویانە: چونکە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾ جا گەیشتنی کۆششی کەسێک بۆ کەسێکی تر پێچەوانەی ئەم دەقەیە، لەمەدا سەرنجو تێبینی هەیە، بە ڕاستی دەقەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بۆ ئادەمیزاد نیە تەنها ئەوە نەبێ کە خۆی بۆ خۆی ئەنجامی دەدات، ئەمەش حەقەو هیچ گومانێکی تێدانیە، وە ئەوەی تێدانیە کە ببێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کۆششی جگە لە خۆی سوودی پێناگەیەنێ، ئەگەر ئەو کەسە پێی ببەخشێ، هەروەک چۆن ئادەمیزاد تەنها خاوەن ماڵی خۆیەتیو ئەوەی کە موڵکێتیو لە ژێر دەستیدایە، ئەمە نابێتە ڕێگر لە بەردەم ئەوەی کەسێک ماڵی خۆی پێ ببەخشێت کە هی خۆیەتی.

(٤٢): کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ الْمُنتَهَىٰ ﴾ واتـە: سـەرەنجامی کارەکان تەنهـا بـۆ لای خـوا دەگەڕێتـەوە، وە بەدیهێنراوەکانیش بـە زیندوو کردنـەوەو کۆکردنەوە، سـەرەنجامیش بـۆ لای خوایـە لـە هەمـوو حاڵەتێکـدا، جـا کۆتایـی زانسـتو حیکمـەتو میهرەبانـیو سـەرجەم تەواویـەکان بـۆ لای دەگەڕێتەوە.

(٤٣): ﴿ وَأَنَّهُ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ ﴾ واتـە: ئـەو زاتـە هۆکارەکانی پێکەنینو گریـان دینێتە بـوون، ئەویـش خێـرو شـەڕەو دڵخۆشـیو خـەمو پەژارەیـە، ئەو زاتـە خـاوەن حیکمەتی تـەواوە لەوەدا.

(٤٤): ﴿ وَأَنَّهُ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا ﴾ واتـە: ئـەو زاتـە تـاکو تەنهایـە بـە هێنانەبـوونو لـە ناوبـردن، هـەر ئەو زاتە دروسـتکراوەکانی هێناوەتە بـوونو فەرمانی پێکـردوونو قەدەغەی لێکـردوون، دوای مردنیـان جارێکـی دیکـە دەیانهێنێتـە بـوون، بـە پێـی ئـەو کردەوانـە پاداشـتیان دەداتـەوە کـە لـە دونیـادا کردوویانە.

وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطۡفَةٍ إِذَا تُمۡنَىٰ
﴿٤٦﴾ وَأَنَّ عَلَيۡهِ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأُخۡرَىٰ ﴿٤٧﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغۡنَىٰ وَأَقۡنَىٰ ﴿٤٨﴾ وَأَنَّهُۥ
هُوَ رَبُّ ٱلشِّعۡرَىٰ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّهُۥٓ أَهۡلَكَ عَادًا ٱلۡأُولَىٰ ﴿٥٠﴾ وَثَمُودَاْ فَمَآ
أَبۡقَىٰ ﴿٥١﴾ وَقَوۡمَ نُوحٖ مِّن قَبۡلُۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ هُمۡ أَظۡلَمَ وَأَطۡغَىٰ
﴿٥٢﴾ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَةَ أَهۡوَىٰ ﴿٥٣﴾ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ
رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نَذِيرٞ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلۡأُولَىٰٓ ﴿٥٦﴾ أَزِفَتِ ٱلۡأٓزِفَةُ
﴿٥٧﴾ لَيۡسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ ﴿٥٨﴾ أَفَمِنۡ هَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ
تَعۡجَبُونَ ﴿٥٩﴾ وَتَضۡحَكُونَ وَلَا تَبۡكُونَ ﴿٦٠﴾ وَأَنتُمۡ سَٰمِدُونَ
﴿٦١﴾ فَٱسۡجُدُواْۤ لِلَّهِۤ وَٱعۡبُدُواْ۩ ﴿٦٢﴾

(٤٥): ﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ﴾ (واتــە: بــە ڕاسـتی هــەر ئــەوە دوو جــۆری دروسـت کــردوە) ئـەو دوو جۆرەی تەفسـیر کردوە بــە وتــەی خــۆی: ﴿ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ﴾ (نێرو مــێ) ئەمــەش نــاوی ڕەگــەزە گشـتگیرە بـۆ هەمـوو گیانلەبـەرەکان، ئادەمیـزادو ئاژەڵەکانیـش، ئــەو زاتــە تاکــە بــە بەدیهێنانیــان.

(٤٦): ﴿مِن نُّطۡفَةٍ إِذَا تُمۡنَىٰ﴾ (واتــە: لــە نوتفەیــەک کاتێــک دەڕژێنرێتــە منداڵدانــەوە) ئەمــەش لــە مەزنترینــی بەڵگەکانــە لەســەر تــەواوی توانــاو تاکــو تەنهایــی ئــەو زاتــە بــە دەســەڵاتو مەزنە کــە ئــەو گیاندارانەی بەدیهێنــاوە بچووکــو گەورەیــان لــە نوتفەیەکــی لاواز، لــە ئاوێکــی بێنرخ، پاشــان گەشــەی پێکــردوەو تەواوی کــردوە تا گەیشــتە ئەوەی کە گەیشــت، پاشــان بوو بــە ئادەمی تیایــدا، یان بــۆ بەرزترینی پلــەو پایــەکان، یــان بــۆ نزمترینــی پلــەکان.

(٤٧) لەبەر ئەمەیە بەڵگەی هێناوەتەوە بە دەستپێکردنی دروستکردن لەسەر دووبارە دروستکردنەوە، فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّ عَلَيۡهِ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأُخۡرَىٰ﴾ (واتە: وە بەڕاستی هەر لەسەر خوایە دروستکردنەوەی ڕۆژی دوایی) بەندەکان دووبارە دروستدەکاتەوە لە گۆڕەکانیانەوە، وە کۆیان دەکاتەوە لە ڕۆژی دیاریکراو، وە پاداشتیان دەداتەوە لەسەر چاکەو خراپەکان.

(٤٨): ﴿وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغۡنَىٰ﴾ واتــە: بەنــدەکان دەوڵەمەنــد دەکات بــە ئاســان کردنــی کاروباری بژێوییــان لــە بازرگانیــەکانو جۆرەهــا کاروکەســابەت لــە پێشــەکانو جگــە لەوانیــش ﴿وَأَقۡنَىٰ﴾ واتــە: بەندەکانــی کەڵــک لەماڵو ســامانەکان وەردەگرن بە هەمــوو جۆرەکانی، وە دەبــن بــە خاوەنی ماڵێکــی زۆر، ئەمەش لــە نیعمەتەکانێتی لەســەر بەندەکانــی کە هەموو نیعمەتــەکان لە لایــەن خواوەیە، ئەوە پێویســت دەکات بۆ بەندەکان سوپاســگوزاری بکەنو بیپەرستن بــە تــاکو تەنهاو بــێ هاوبەش.

(٤٩): ﴿ وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ ٱلشِّعۡرَىٰ ﴾ (واتــە: بــە ڕاســتی هــەر ئــەو زاتەیــە پەروەردگــاری ئەسـتێرە) ئەویـش ئەسـتێرەی ناسـراوە بـە شـیعرا ناونـراوە بـە (المـرزم) (ئەسـتێرەیەکی گەورەیــە) تایبەتــی کردوە بە باســکردن، ئەگەرچــی پەروەردگاری هەموو شــتێکە، چونکە ئــەم ئەســتێرەیە لەوانەیە کە لە ســەردەمی نەفامیدا پەرســتراوە، خوا هەواڵــی داوە لە ڕەگەزی ئــەوەی هاوبەشــدانەران دەیپەرســتن، بەڕێوەبــراو دروســتکراوە، چۆن دەکرێن بە پەرســتراو لەگــەڵ خوادا.

(٥٠): ﴿ وَأَنَّهُۥٓ أَهۡلَكَ عَادًا ٱلۡأُولَىٰ ﴾ (واتــە: بێگومــان ئــەو خــوا گەلی عادی یەکەمــی لە ناو بــرد) ئەوانیــش گەلی هــوود ﷺ بوون، کاتــێ پێغەمبەرانیــان بەدرۆدانا، خوا لــە ناوی بردن بــە بایەکی ســەختی ســاردی بە تینی بــە گرمە.

(٥١): ﴿ وَثَمُودَاْ ﴾ گەلــی صالــح ﷺ خــوا نــاردی بــۆ لای ثمود بەدرۆیــان دانــا، خــوا حوشــترێکی بــۆ ناردن وەکــو نیشــانەو بەڵگەیــەک، ئنجا ئەوان حوشــترەکەیان ســەربڕیو پێغەمبەرەکەیــان بەدرۆدانــا، پاشــان خوا لــە ناوی بردن ﴿ فَمَآ أَبۡقَىٰ ﴾ (کەســیانی نەهێشــت) بەڵکــو خوا ئیبــادەی کــردن تــا کۆتایان.

(٥٢): ﴿ وَقَوۡمَ نُوحٖ مِّن قَبۡلُۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ هُمۡ أَظۡلَمَ وَأَطۡغَىٰ ﴾ (واتــە: وە گەلــی نووحــی لــە پێشــدا لەنــاو بــرد کــە بەڕاســتی ئــەوان ســتەمکارترو ســەرکەش تر بــوون) لــەم ئۆممەتانــە، خوا نوقمــی کــردن، خنکاندنــی لــە دەریادا.

(٥٣): ﴿ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَةَ ﴾ (گوندو شــارەکان) ئەوانیش گەلی لووط بــوون، ﴿ أَهۡوَىٰ ﴾ واتە: خــوا بە جۆرێ تووشــی ســزای کردن هیچ کەســێکی لــە پێش ئــەوان لە جیهانــدا بەو جۆرە ســزا نەدابــوو، شــارو گوندیانی ســەرو ژێر کــرد، وە وردە زیخــی گڵینی بــە دوای یەکدا بێ پچــڕان بارانده ســەریان، لەبەر ئەمەیــە فەرموویەتی:

(٥٤): ﴿ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴾ بە ســزای ســەخت داپپۆشــی بە داپۆشــین، واتە: شــتێکی مەزن کــە هەرگیز وەســف ناکرێ.

(٥٥): ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ﴾ واتــە: بــە چ نازونیعمــەتو فــەزڵو چاکەیەکــی خــوا بە گومانــی ئەی ئادەمیــزاد؟ بێگومان نیعمەتەکانی خوا ئاشــکرایە، گومــانو دوودڵی وەرناگرێ بــە جــۆرێ لە جــۆرەکان، جا هــەر نیعمەتێک لــەلای بەندەکان بێ ئــەوە لەلایــەن خواوەیە، وە هیــچ کــەس نارەحەتیەکان لانابــات جگە لەو.

(٥٦): ﴿ هَٰذَا نَذِيرٞ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلۡأُولَىٰٓ ﴾ واتــــە: ئــــەم پێغەمبــــەرە قورەیشــــیە هاشــــمیە کــــە

موحەممــەدی کــوڕی عەبدوڵڵایــە ﷺ شــتێکی تــازەو داهێنــراو نیــە لــە پێغەمبەرایەتیــدا، بەڵکــو پێغەمبەرانێکــی زۆر پێشــی کەوتــوون، وە بانگەوازیــان کــردوە بــەو بانگــەوازەی کــە ئــەو دەیــکات، جــا لەبــەرچ هۆکارێــک نکووڵــی پەیامەکــەی دەکــەن؟ وە بــە چ بەڵگەیــەک بانگەوازەکــەی پــووچ دەکەنــەوە؟ ئایــا ڕەوشــتەکانی بەرزترینــی نــاو ڕەوشــتی پێغەمبــەران نەبــووە؟

ئایــا بانگــەوازی بــۆ خێــرو دوورکەوتنــەوە لــە خراپــە نەبــووە؟ ئایــا قورئانــی مەزنــی نەهێنــاوە کــە پــووچو بەتــاڵ ڕووی تێنــاکات، نــە لــە ئێســتاو نــە لــە دوارۆژدا، نــە بــە لێکــەم کردنــەوەو نــە بــە لــێ زیــاد کــردن، چونکــە نێردراوەتــە خــوارەوە لەلایــەن خــوای کاردروســتی ستایشــکراو؟

ئایــا خــوا ﷻ لە نــاوی نەبــردوون ئەوانەی لــە پێش ئــەو پێغەمبەرانیــان بــەدرۆ دەزانی؟ جا چ شــتێ ڕێگــری ســزای کــرد لەوانــەی موحەممەدیان بــەدرۆ دادەنا، پێشــەوای خواناســان، وە گــەورەی ئــەو کەســانەی کــە لــە ڕۆژی قیامەتــدا بــە دەســت نوێژەکانیان دەناسـێنرێن ﴿أَزِفَتِ ٱلۡأٓزِفَةُ﴾ واتــە: کاتــی ڕۆژی دوایــی نزیــک بۆتــەوەو نیشــانەکانی دەرکەوتوون.

(٥٨): ﴿لَيۡسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ﴾ واتــە: ئەگــەر ڕۆژی دوایــی هاتو ئەو ســزایەی کە بەڵێنی پێــدراوە هات.

(٥٩): پاشــان هەڕەشــەی لــە نکوولێــکاران کــردوە ئەوانــەی نکوولــی پەیامــی پێغەمبەر ﷺ دەکــەن، ئەوانــەی پەیامەکەی بــە درۆ دادەنێن کە قورئانی پیرۆزە، جــا فەرموویەتی: ﴿أَفَمِنۡ هَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ تَعۡجَبُونَ﴾ واتــە: ئایا لەم فەرمایشــتە کە چاکتریــن‌و بەرێزترینی فەرمایشــتەکانە ســەرتان لێــی ســوڕدەمێنێ، وە وای دادەنێــن کــە پێچەوانــەی ئــەو دابو نەریتەیــە کــە لە دەرەوەی حەقیقەتە ناســراوەکانە؟

ئەمــەش لــە نەفامــی‌و گومرایــی‌و یاخــی بوونیانەوەیــە، ئەگەرنــا ئــەوە فەرمایشــتێکە ئەگــەر بفەرمــوێ ڕاســتی فەرمــووە، وە ئەگــەر قســە بــکات ئــەوە قســەی یەکلاکەرەوەیە کــە گاڵتــەی تێدانیــە، ئەویــش بریتیــە لــە قورئانــی پیــرۆز، کــە ئەگــەر دابەزێنرایــە بــۆ ســەر کێــوێ دەتبینــی بــە ملکەچــی‌و لــەت لــەت بــوو لــە ترســی خــوا، زیــادی دەکــرد بــۆ ئەوانــەی خــاوەن عەقــڵ‌و ژیــری‌و بۆچوونــی ڕاســت‌و ئیمانــی چەســپاوو دڵنیاییــن، وە ئــەوەی شــیاوی سەرســوڕمانە سەرســام بوونــە لــە عەقڵــی ئــەو کەســانەی بــەو قورئانــە سەرســام دەبــن، وە گێلــی‌و گومڕاییانــە.

(٦٠): ﴿ وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ ﴾ واتــە: پێدەکەنــنو گاڵتــەی پێدەکەن، لەگــەڵ ئەوەدا ئەوەی پێویســتە کاریگەری لەســەر نەفــسو دەروونەکان بــێو چاوەکانی پێ بگــری، گوێ گرتنە لــە فەرمــانو قەدەغەکراوەکانیو بەڵێنو هەڕەشــەکانی خــوا، وە لاکردنەوەیە بــۆ هەواڵە پڕ لە ڕاســتیەکانی.

(٦١-٦٢): ﴿ وَأَنتُمْ سَٰمِدُونَ ﴾ واتــە: بــێ ئاگــان لێــیو بیــری لێناکەنــەوە، ئەمــەش بە هۆی کەمــی عەقــڵو ئاینیــان. جا ئەگــەر ئێــوە بەندایەتی خواتــان بکردایــەو شــوێنی ڕەزامەندی خــوا بکەوتنایــە لــە هەمــوو کاتەکانــدا ئــەوە بــەم شــێوەیە نەدەبــوون کــە خــاوەن عەقڵو ژیــرەکان خۆیانــی لــێ دەپارێــزن، ﴿ فَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ وَٱعْبُدُوا۟ ﴾ فەرمــان کردن بە ســوژدەبردن بــۆ خــوا بــە تایبەتی بــۆ ئەوەیە بیێتــە بەڵگە لەســەر فــەزڵو چاکەی ئــەو، بێگومان ســوژدە بــردن نهێنــیو کاکڵــەی پەرســتنە، چونکە کاکڵەی پەرســتن ترســانە لە خــواو ملکەچبوونە بــۆی، ســوژدە بــردن مەزنتریــن حاڵەتە کــە بەندە پێی گــەردن کەچ دەبــێ، بێگومــان دڵو جەســتەی پێکــەوە گەردن کــەچ دەبــن، وە بەڕێزتریــنو پیرۆزترینــی ئەندامانی جەســتەی دەخاتــە ژێــر پێــکان، پاشــان فەرمانــی کــردوە بــە پەرســتن بــە گشــتی، کە گشــتگیرە بۆ هەمــوو ئەوانــەی خــوا پێی خۆشــەو پێــی ڕازیــە، لە قســەو وتــەو ئاشــکراو نهێنیەکان.

تەفسیری سوورەتی (النجم) تەواو بوو.


بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ ﴿١﴾ وَإِن يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا
سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ﴿٢﴾ وَكَذَّبُوا وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣﴾
وَلَقَدْ جَاءَهُم مِّنَ الْأَنبَاءِ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ﴿٤﴾ حِكْمَةٌ بَالِغَةٌ فَمَا تُغْنِ
النُّذُرُ ﴿٥﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ يَوْمَ يَدْعُ الدَّاعِ إِلَىٰ شَيْءٍ نُّكُرٍ ﴿٦﴾

## تەفسیری سوورەتی (القمر)

## مەککیە (٥٥) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٥): ﴿ اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ
﴿١﴾ وَإِن يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ
مُّسْتَمِرٌّ ﴿٢﴾ وَكَذَّبُوا وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ
وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣﴾ وَلَقَدْ
جَاءَهُم مِّنَ الْأَنبَاءِ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ
﴿٤﴾ حِكْمَةٌ بَالِغَةٌ فَمَا تُغْنِ النُّذُرُ
﴿٥﴾ ﴾:

﴿ اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ ﴾ خوا ﷻ رایدەگەیەنێ کە ڕۆژی دوایی نزیک بۆتەوەو کاتی هاتنی هاتووە، لەگەڵ ئەوەدا ئەو بەدرۆ دانەرانە بەردەوام بە درۆی دادەنێن، ئامادەی دابەزینی نین، خوا ﷻ چەندین ئایەت و نیشانەی مەزنیان پێ نیشان دەدات کە بەڵگەن لەسەر ڕوودانی، هەموو کەسێکی ئاسایی بڕوای پێ دێنێ.

جا لە مەزنترینی ئەو نیشانانەی بەڵگەن لەسەر ڕاستی ئەو پەیامەی موحەممەدی کوڕی عبداللە ﷺ هێناویەتی، کاتێ بەدرۆدانەران داوایان لێکرد بەڵگەیەکیان نیشان بدات لە دەرەوەی سروشت، کە ببێتە نیشانەیەک لەسەر تەواوی و ڕاستی پەیامەکەی، پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ مانگ کرد بە ویستی خوا، ئەویش بوو بە دوو لەتەوە، لەتێکیان لەسەر کێوی (أبي قُبيس) وە لەتێکی دیکەی لەسەر کێوی (قعیقعان) (کێوێکی بچووکە لە مەککە) هاوبەشدانەرانو جگە لەوانیش ئەم نیشانە مەزنەیان بینی، کە هیچ بەدیهێنراوێ ناتوانێ بە ساختەو چاوبەست ئەو کارە بکات.

(٢): شتێکیان بینی پێشتر نەیان بینیبوو، بەڵکو نەیان بیستبوو شتێکی لەو جۆرە، یان هاوشێوەی بۆ هیچ یەکێک لە پێغەمبەران ڕوویدات، هەناسەیان بەوە سواربوو، وە هەرگیز ئیمان بەوە نەچووە دڵەکانیانەوەو خواش خێری بۆ ئەوان نەویست، جا پەنایان بردە لای

بوختــانو یاخیبوونیــانو وتیــان موحەممەد ﷺ جــادووی لێکردوویــن، بەڵام نیشــانەی ئەوە بێگومــان ئێوە پرســیار دەکەن لەو کەســەی کــە دێ بۆ لاتان لــە گەشــتکردنەوە، جا ئەگەر ئــەو توانــای هەبێ لەســەر ســیحر کردن لــە ئێوە، ئــەوە ناتوانێ ســیحر لە کەســێ بکات کە لــە پێــش چــاوی نیە، دەی پرســیار بکەن لە هەر کەســێ لە گەشــت کردنــەوە دێ بۆ لاتان، ئــەو کەســەیش هەواڵیان پــێ دەدات بــە لەتبوونی مانــگ، جا وتیــان: ﴿ سِحۡرٞ مُّسۡتَمِرّٞ ﴾ واتــە: (جادوویەکــی بەردەوامــە) موحەممەد ﷺ جادووی لــە ئێمەو جگە لــە ئێمەش کردوە.

(٣): ئەمــە یەکێکــە لــەو بوختانانــەی کە تەنها کەســی گێلو گەمــژەو گومرا لــە ڕێنمایی‌و عەقڵــی پــێ هەڵدەخەڵەتــێ، ئەمەش تەنهــا نکووڵیکردنیان نیە لەو نیشــانەیە، بەڵکــو لە هەموو ئایــەتو نیشــانەیەک کــە بێ بۆیــان، ئەوان ئامــادەن ڕووبــەڕووی ببنەوە بە پــووچو بەتاڵو ڕەتکردنــەوەی، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتــی: ﴿ وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةٗ يُعۡرِضُواْ ﴾ (وە ئەگەر بیبرواێان موعجیزەیــەک ببینن پشــت هەڵدەکــەن) لێــرەدا ڕاناوەکــە ناگەڕێتەوە بــۆ لەتبوونی مانگ، بۆیــە نەیفەرمــووە: ئەگەر بینیان، بەڵکــو فەرموویەتی: ﴿ وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةٗ يُعۡرِضُواْ ﴾ مەبەســتی ئــەوان شــوێنکەوتنی ڕاســتی‌و ڕێنمایــی نەبــوو، بەڵکــو مەبەســتیان شــوێنکەوتنی هــەواو هــەوەس بــوو، لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ وَكَذَّبُواْ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡ ﴾ هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ فَإِن لَّمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَكَ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهۡوَآءَهُمۡ ٥٠ ﴾ القصص، (واتــە: ئنجــا ئەگــەر بــە گوێیــان نەکــردی ئەوە بزانــە کــە تەنها شــوێن هەواو ئــارەزووی خۆیــان دەکەون).

بێگومــان ئەگــەر ئەوان مەبەســتیان شــوێنکەوتنی هیدایــەت بووایە، ئــەوە بڕوایــان دەهێناو شــوێنی موحەممــەد ﷺ دەکەوتن، چونکە خوا لەســەر دەســتی ئەو نیشــانیدا چەندیــن بەڵگەو نیشــانەو ســەلماندنی یەکلاکــەرەوە، کــە بەڵگەن لەســەر ســەرجەم داواکاریــە خواییەکانو مەبەســتە شــەرعیەکان ﴿ وَكُلُّ أَمۡرٖ مُّسۡتَقِرّٞ ﴾ واتــە: (لــە کاتێکــدا هەمــوو کارێک ســەرەنجامێکی هەیــە) تــا ئێســتا کارەکــە نەگەیشــتووە بــە ئامانــجو کۆتاییەکــەی، وە بــە دڵنیاییــەوە دەگــات بــە کۆتایــی، جا ڕاســتگۆ لە بەهەشــتە پــڕ لە نــازو نیعمەتەکانــدا دەبێ، وە لــە لێ خۆشــبوونو ڕەزامەنــدی ئەودا بــە درۆدانەریش لە تووڕەیی‌و ســزای خــوادا دەبێ بە هەمیشــەیی.

وە خــوا ﷻ ڕوونیدەکاتــەوە ئــەوان نــە مەبەســتێکی ڕاســتەقینەیان هەیــە نــە شــوێنکەوتنی ڕێنمایــی، فەرموویەتــی: ﴿ وَلَقَدۡ جَآءَهُم مِّنَ ٱلۡأَنۢبَآءِ ﴾ واتــە: هەواڵــی پێشــوو داهاتوو

موعجیـزە ئاشـکراکان، ﴿ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ﴾واتـە: سەرزەنشـت کـەرێ سەرزەنشـتیان بـکاتو بیانگەڕێنێتـەوە لـە سەرلێشـێواوی‌و گومراییـان، وە ئەویـش ﴿ حِكْمَةٌ ﴾ حیکمەتێکـە لەلایـەن خـواوە ﴿ بَلِغَةٌ ﴾واتـە: تـەواوە، تـا بەڵگـەو حوجەی پـێ بکات لەسـەر جیهانیـان، وە هیـچ کەسـێک بەڵگـەی نەمێنـێ لەسـەر خـوا دوای پێغەمبـەران ﴿ فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ ﴾واتـە: بـەڵام ترسـاندنی ترسـێنەران بـۆ بێبـڕوا سـوودی نیـە) وەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٩٧﴾ ﴾یونس، (واتـە: بـڕوا ناهێنـن * هەرچەندە بۆیان بێـت هەموو بەڵگەو نیشـانەیەک تا بـە چـاوی خۆیـان سـزای سـەختی ئـازاردەر نەبینن).

(٦-٧): ﴿ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ يَوْمَ يَدْعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَىْءٍ نُّكُرٍ ﴿٦﴾ خُشَّعًا أَبْصَٰرُهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ ﴿٧﴾ ﴾:

خـوا ﷻ بـە پێغەمبەرەکـەی دەفەرمـوێ: بێگومـان دەرکـەوت هیـچ چارەیەک نەمـاوە بۆ ڕێنمایـی کردنـی بەدرۆدانـەران، وە هیـچ نەماوەتـەوە جگە لە پشـت تێکردنیـانو ڕوو لێ وەرچەرخانیـان، جـا فەرموویەتـی: ﴿ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ ﴾ە چاوەڕوانـی ڕۆژێکـی گـەورەو نارەحەتیەکـی بێپایانیـان بـۆ بکـە، ئەویـش کاتـێ ﴿ يَدْعُ ٱلدَّاعِ ﴾کـە ئیسـرافیل عليه السلام (بانگـی خەڵکی دەکات)، ﴿ إِلَىٰ شَىْءٍ نُّكُرٍ ﴾واتە: بۆ لای شـتێکی زۆر ناخۆش خەڵکی نکوولـی لێدەکـەن، دیمەنێـک نابینـی لـەوە ناشـرینترو بە ئێش تـر بێت، جا ئیسـرافیل فوو دەکات بـە فـوو کردنـێ مردووەکانـی پێ دەردەچـێ لـە گۆڕەکانیان بۆ وێسـتگەی ڕۆژی دوایی.


خُشَّعًا أَبْصَٰرُهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ ﴿٧﴾
مُّهْطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِ يَقُولُ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ ﴿٨﴾ كَذَّبَتْ
قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا عَبْدَنَا وَقَالُوا مَجْنُونٌ وَٱزْدُجِرَ ﴿٩﴾ فَدَعَا
رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَغْلُوبٌ فَٱنتَصِرْ ﴿١٠﴾ فَفَتَحْنَآ أَبْوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ
﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ عَلَىٰٓ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾
وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ تَجْرِى بِأَعْيُنِنَا جَزَآءً لِّمَن كَانَ
كُفِرَ ﴿١٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٥﴾ فَكَيْفَ كَانَ
عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿١٦﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾
كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿١٨﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا
صَرْصَرًا فِى يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ ﴿١٩﴾ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ
مُّنقَعِرٍ ﴿٢٠﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٢١﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ
لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٢٢﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِٱلنُّذُرِ ﴿٢٣﴾ فَقَالُوٓا أَبَشَرًا
مِّنَّا وَٰحِدًا نَّتَّبِعُهُۥٓ إِنَّآ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٢٤﴾ أَءُلْقِىَ ٱلذِّكْرُ عَلَيْهِ
مِنۢ بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ ﴿٢٥﴾ سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ ٱلْكَذَّابُ ٱلْأَشِرُ
﴿٢٦﴾ إِنَّا مُرْسِلُوا ٱلنَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَٱرْتَقِبْهُمْ وَٱصْطَبِرْ ﴿٢٧﴾

(٧): ﴿خُشَّعًا أَبْصَٰرُهُمْ﴾واتە: لەو نارەحەتیو مەترسیەی کە دەگاتە ناو دڵەکانیان، زەلیلو ڕیسوا دەبن، وە چاویان کزو شۆر دەبێ.

﴿يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ﴾ ئەویش گۆڕەکانە ﴿كَأَنَّهُمْ﴾واتە: لە زۆریانداو تێکەڵ بوونی هەندێکیان بە هەندێک، هەروەک ﴿جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ﴾واتە: (کولله) پەرشو بڵاو دەبنەوە بە زۆری لەسەر زەوی.

(٨): ﴿مُّهْطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِ﴾واتە: بە پەلە بەدەم بانگەوازی جاڕدەرەکەوە دەچن، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە جاڕدەر بانگیان دەکاتو فەرمانیان پێدەکات بە ئامادەبوون لە وێستگەی ڕۆژی دوایی، بەدەم بانگەوازەکەیەوە دەچنو پەلە دەکەن لە وەڵامدانەوەی.

﴿يَقُولُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾واتە: بێبڕوایان دەڵێن): ئەوانە کە سزایان ئامادە بووە: ﴿هَٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ﴾واتە: ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر دژوارو سەختە) هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ ﴿١٠﴾﴾المدثر، (واتە: لەسەر کافران سووکو ئاسان نیە) مەفهوومو تێگەیشتنی ئەوە، بێگومان ڕۆژی دوایی سووکو ئاسانە لەسەر بڕواداران.

(٩-١٧): ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا عَبْدَنَا وَقَالُوا مَجْنُونٌ وَٱزْدُجِرَ ﴿٩﴾ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَغْلُوبٌ فَٱنتَصِرْ ﴿١٠﴾ فَفَتَحْنَآ أَبْوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ ﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ عَلَىٰٓ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾ وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ تَجْرِى بِأَعْيُنِنَا جَزَآءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴿١٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٥﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿١٦﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾﴾

کاتێ خوا ﷻ باسی حاڵی بەدرۆدانەرانی پێغەمبەرەکەی کرد، کە بێگومان ئایەتو نیشانەکان هیچ سوودی نیە بۆیان، ترساندنی بە سزای ئۆممەتەکانی پێشوو کە

پێغەمبەرانیـان بـە درۆدادەنـا، چـۆن خـوا لە ناوی بردن‌و سـزای خـۆی حەڵاڵ کـرد بۆیان.
سـەرەتا باسـی گەلـی نووحی کرد، یەکـەم پێغەمبـەر ﷺ خوا نـاردی بۆ لای گەلێـک بتیان دەپەرسـت، بانگـی کـردن بـۆ یەکتاپەرسـتی خـواو بەندایەتـی کردنـی بە تـاک‌و تەنهاو بـێ هاوبـەش، ئـەوان ڕێگریـان کـرد لـە وازهێنـان لـە هاوبەشـدانان، وتیـان: ﴿ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾ ﴾ نـوح، (واتە: وە وتیان: دەسـت هەڵنەگـرن لـە بـت‌و پەرسـتراوەکانتان، وە دەسـت هەڵنەگرن لە پەرسـتنی وەددو سـواع‌و یەغـوس‌و یەعوق‌و نەسـر).
نووح ﷺ بەردەوام بانگی دەکردن بۆ لای خوا بە شەوو بە ڕۆژو بە ئاشکراو نهێنی، ئەوە هیچ سوودێکی پێ نەگەیاندن جگە لە عینادی‌و یاخی بوون‌و لەکەدارکردنی پێغەمبەرەکەیان، لەبەر ئەمەیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ فَكَذَّبُوا۟ عَبْدَنَا وَقَالُوا۟ مَجْنُونٌ ﴾ (واتە: جا بەندەی ئێمە نووحیان بە درۆزن دانا، وە وتیان نووح شێتە) چونکە پێیان وابوو ئەوەی ئەوان لەسەری دەڕۆن لە هاوبەش دانان‌و گومڕایی، ئەوە تەواوەو عەقڵ ئاماژەی پێ دەکات، ئەوەیشی نووح ﷺ هێناویەتی نەفامی‌و گومڕاییە، تەنها لە کەسانی شێتەوە دەردەچێ.
ئـەوان لـەوەدا درۆیـان کرد، ئـەو حەقیقەتانـەی کە جێگیـرە بە پێی شـەرع‌و عەقـڵ ئەوان هەڵیانگێڕایـەوە، بێگومـان ئـەوەی ئـەو هێناویەتـی بریتیە لەو ڕاسـتیەی کـە ڕێنمایی عەقڵە ڕوونـاک‌و ڕاسـت ڕەوەکان دەکات بۆ لای هیدایـەت‌و ڕووناکی‌و ژیری، ئەوەیشـی ئەوان لەسـەری دەڕۆن گومڕاییەکـی ڕوون‌و دیارە. کە دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱزْدُجِرَ ﴾ واتە: گەلەکەی سەرزەنشـتیان کـردو هەڕەشـەیان لێکردو توونـدو تیژ بـوون لەگەڵیدا کاتـێ بانگی کردن بـۆ لای خـوا ﷻ. ئەوەندەیان بەس نەبوو-خـوا ڕوویان ڕەش بکات- کە بـڕوای پێ نەهێنن‌و بـە درۆی دانەنێـن، تـا لە ئازاردانیدا گەیشـتنە ئـەوەی، ئـەوەی توانایان بوو لەسـەری، ئا بەم شـێوەیە دوژمنانی پێغەمبەران ئەمـە حاڵیانە لەگـەڵ نێردراوەکانیاندا.
(١٠): لـەو کاتـەدا نـووح ﷺ داوای لـە پەروەردگـاری کـرد ﴿ أَنِّى مَغْلُوبٌ ﴾ واتـە: بـە ڕاسـتی من شکسـتم خـواردوە، توانـام نیە لە سـەرکەوتن بەسـەریاندا، چونکە کـەس بڕوای نەهێنـا لـە گەلەکـەی جگە لـە خەڵکێکی زۆر کـەم نەبێت، توانایشـیان نەبوو لـە ڕووبەڕوو بوونـەوەی گەلەکەیاندا.
﴿ فَٱنتَصِرْ ﴾ خوایـە تـۆ یارمەتیم بدە، وە لـە دەقێکی دیکـەدا فەرموویەتی: ﴿ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ ﴾ نـوح، (واتـە: ئـەی پەروەردگار لەسـەر زەوی هیچ

کەسێکی بێبڕوا مەهێڵە).
(١١): خـوا ﷻ وەڵامـی دایـەوەو یارمەتیـدا لـە گەلەکـەی، خوا ﷻ فەرمـووی: ﴿ فَفَتَحْنَآ أَبْوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ ﴾ واتـە: (ئێمـەش هەمـوو دەرگاکانـی ئاسـمانمان کـردەوە)، بـە ئاوێکـی زۆری یـەک لـە دوای یـەک، ﴿ وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا ﴾ واتە: (کانیـاوی زۆرمان لـە زەوی هەڵقوڵانـد) جـا لـە ئاسـمانەوە ئاوێکی لـە ڕادەبـەدەر دەهاتە خـوارەوە، وە زەوی هەمـووی تەقـی تەنانـەت ئـەو تەنوورانـەی کـە نانیـان تێـدا دەکرا، کـە لـە داب‌و نەریتدا جێگـای بوونـی ئـاو نیە، چونکـە شـوێنی ئاگرە.
﴿ فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ ﴾ واتـە: ئـاوی ئاسـمان‌و زەوی (بـە یەک گەیشـتن) ﴿ عَلَىٰٓ أَمْرٍ ﴾ لەسـەر بڕیارێـک لەلایـەن خـواوە بـەو بەیـەک گەیشـتنە ﴿ قَدْ قُدِرَ ﴾ واتـە: خـوا لـە ئەزەلـدا نوسـیبووی وەک سـزایەک بـۆ سـتەمکارە یاخیبـووەکان.
(١٣): ﴿ وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ ﴾ واتـە: بەنـدەی خۆمان نووحمان ڕزگار کرد لەسـەر ئـەو کەشـتیەی کە (بـە چەند پارچـە) بزمارێـک داکوترابـوو توونـدو تۆڵکرابوو ﴿ تَجْرِى بِأَعْيُنِنَا ﴾ واتـە: نـووح عليه السلام‌و ئەوانەی لەگەڵیـدا بڕوایان هێنابـوو، وە ئەوەیشـی هەڵیگرتبوو لـە جۆرەهـا بەدیهێنـراوەکان، بـە چاودێـری‌و پاراسـتنی خوا لە خنـکان‌و نقووم بـوون، وە تەماشـا کردنـی وەکیلی خـوای مەزن، بە ڕاسـتی ئـەو زاتە چاکتریـن پارێـزەرو وەکیلە.
﴿ جَزَآءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴾ واتـە: ئـەوەی کردمـان بە نووح عليه السلام کـە کردمان لـە ڕزگار بوون لـە نقـووم بوونی گشـتی، ئـەوە پاداشـتێک بوو بـۆ ئـەو، کاتێ گەلەکـەی بەدرۆیـان داناو بڕوایـان پـێ نەهێنا، ئەویش خۆڕاگـر بوو لەسـەر بانگەوازکردنیان، وە بەردەوام بوو لەسـەر فەرمانـی خـوا، هیچ شـتێک نەیتوانی ڕێگـری لێبکات، وە هیـچ بەرهەڵسـتیکارێک نەیتوانی بەرهەڵسـتی بـکات، هـەروەک خـوا ﷻ لە دەقێکـی دیکـەدا دەربارەی دەفەرمـوێ: ﴿ قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهْبِطْ بِسَلَٰمٍ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ ﴿٤٨﴾ ﴾هـود (واتـە: وترا: ئەی نـووح عليه السلام دابـەزە لە کەشـتیەکە بە هێمنـی‌و بێوەی لەلایـەن ئێمەوە، وە بەپیـت‌و فڕی زۆر بەسـەر خۆتـەوە وە بەسـەر گەلانێک کە پەیـدا ئەبن لەوانـەی کە لەگـەڵ تۆدان).
دەگونجـێ مەبەسـت ئـەوە بـێ: ئێمە گەلـی نووحمـان لەنـاو بـرد، وە هێنامان بەسـەریاندا ئـەوەی کە هێنامان لە سـزاو سەرشـۆڕی سـزایەک بوو بۆیان، لەسـەر بێبڕوایـی‌و عینادی‌و یاخیبوونیـان، وە ئەمـەش ڕوودەکاتـە سـەر خوێندنـەوەی ئـەو کەسـەی خوێندوویەتـی بە (بفتـح الكاف).

(١٥)﴿ وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾ واتــە: بێگومــان ئێمــە چیرۆکــی نــووح ﷺمان هێشــتەوە لەگــەڵ گەلەکەیدا تا ببێتە بەڵگەو نیشــانەیەک بۆ کەســێ پەندی لــێ وەربگرێت، لــەوەی کــە هەر کەســێک ســەرپێچی پێغەمبــەران بــکاتو یاخی بێــت لێیان، ئــەوە خوا بە ســزای گشــتگیری ســەخت لە ناوی دەبات.

یــان راناوەکــە لــە وشــەی﴿ تَّرَكْنَٰهَآ ﴾ دەگەڕێتــەوە بــۆ کەشــتیەکەو رەگەزەکــەی، جــا بنچینــەی دروســتکردنی دەگەڕێتەوە بۆ فێرکــردن لە لایەن خواوە بــۆ بەندەکەی نووح ﷺ، پاشــان خوا پیشــەو رەگەزی ئەو کەشــتیەی هێشــتەوە لــە ناو خەڵکیــدا، تا ئەوە ببێتــە بەڵگە لەســەر میهرەبانــی خــوا بە دروســت کراوەکانــیو گرنگی پێدانــی پێیان، وە تــەواوی تواناو داهێنانی دروســت کردنی.

﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾ واتە: ئایا کەسێک هەیە بیر لە ئایەتەکان بکاتەوە، بیرو هۆشی بخاتە کار لەو دەقانەی کە بۆی دێت؟ ئەوە بێگومان لەوپەڕی ڕوون کردنەوەو ئاسانی دایە.

(١٦)﴿ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴾ واتــە: ئایا ســزاو ئاگــادار کردنەوەی خــوا چۆن دەبینی ئــەی بینەر کــە بەڵگە بۆ هیــچ کەســێک ناهێڵێتەوە.

(١٧)﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾ واتــە: بــە ڕاســتی ئاســانمان کــردوە فەرمایشــتی ئــەم قورئانــە بۆ لەبــەر کــردنو جێبەجــێ کــردن، وە ماناکانی بۆ تێگەیشــتنو زانســت، چونکــە چاکتریــن فەرمایشــتە لــە ڕووی قســەپێکردنەوە، ڕاســتگۆترین مانــاو ڕوونتریــن تەفســیری هەیــە، جا هــەر کەســێک ڕووی تێبــکات خــوا ئامانجەکەی لەســەر ســووک دەکات، وە بــۆی ئاســان دەکات، (والذکر) ئامۆژگــاری گشــتگیرە بــۆ هەمــوو ئەوانــەی جیهانیــان ئامۆژگــاری پێوەردەگرن لــە حەڵاڵو حــەرام، وە بڕیارەکانــی فەرمانو قەدەغەکــردن، وە بڕیارەکانــی پاداشــتو ئامۆژگــاریو پەنــدەکان، وە بیروبــاوەڕە بــە ســوودەکانو هەواڵــە ڕاســتەکان.

(١٨-٢٢)﴿ كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿١٨﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِى يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ ﴿١٩﴾ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ ﴿٢٠﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٢١﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٢٢﴾ ﴾ :

﴿ كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿١٨﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ ﴾ گەلــی عــاد بریتــی بــوون لــە هۆزێکــی ناســراو لــە یەمــەن، خوا ﷻ هــودی بۆ نــاردن، بانگی دەکــردن بۆ یەکتاپەرســتی خــواو بەندایەتــی کردنــی، جــا ئــەوان بەدرۆیــان دانــا، ئنجــا خــوا ﷻ دایبەزاندە ســەریان،

﴿ رِيحًا صَرْصَرًا ﴾ واتـە: (بایەکـی سـارد)ی زۆر سـەخت﴿ فِي يَوْمِ نَحْسٍ ﴾ واتـە: (لـە ڕۆژێکـی) سـەختدا سـزایەکی بـە ئێـش﴿ مُّسْتَمِرٍّ ﴾ بـەردەوام بـوو لەسـەریان حـەوت شـەوو هەشـت ڕۆژ بەبـێ وچـان﴿ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ ﴾ (خەڵکـی هەڵەگرت) لـە توونـدی ئەو بایـە بـەرزی دەکردنـەوە بـۆ ئاسـمانو، پاشـان دەیدان بـە زەویداو لە نـاوی دەبـردن، ئنجا دەبـوون﴿ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ ﴾ واتـە: لاشـەیان لـە دوای لـە ناوچوونیـان وەک لقـی دارخورمـای پـووکاوی لـێ دەهـات، کـە بایەکـی سـەخت لێـی دەداتو دەکەوێتە سـەر زەوی، هیـچ بەدیهێنـراوێ لـە خـوا ﷻ یاخـی نابێ ئەگـەر سـەرپێچی فەرمانەکانـی بکات.
(٢١)﴿ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴾ (جـا ئایـا سـزاو ترسـاندنم چـۆن بـوو)؟ سـوێند بە خوا سـزایەکی سـەخت بوو، وە ئەو ترسـاندنەی هیچ بەڵگەو حوججەیەکی بۆ کەس نەهێشـتەوە.
﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾ خـوا ﷻ ئەمەی دووبارە کردۆتەوە وەک ڕەحمەتێ بـە بەندەکانـیو گرنگیدانـی پێیـان، کاتـێ بانگـی کـردوون بـۆ لای ئـەوەی بەرژەوەندی دونیـاو دوارۆژیانـی تێدایە.
(٢٣-٣٢)﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِٱلنُّذُرِ ﴿٢٣﴾ فَقَالُوٓا۟ أَبَشَرًا مِّنَّا وَٰحِدًا نَّتَّبِعُهُۥٓ إِنَّآ إِذًا لَّفِى ضَلَـٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٢٤﴾ أَءُلْقِىَ ٱلذِّكْرُ عَلَيْهِ مِنۢ بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ ﴿٢٥﴾ سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ ٱلْكَذَّابُ ٱلْأَشِرُ ﴿٢٦﴾ إِنَّا مُرْسِلُوا۟ ٱلنَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَٱرْتَقِبْهُمْ وَٱصْطَبِرْ ﴿٢٧﴾ وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ ٱلْمَآءَ قِسْمَةٌۢ بَيْنَهُمْ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ ﴿٢٨﴾ فَنَادَوْا۟ صَاحِبَهُمْ فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ ﴿٢٩﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٣٠﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَكَانُوا۟ كَهَشِيمِ ٱلْمُحْتَظِرِ ﴿٣١﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٣٢﴾ ﴾ :
﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ ﴾ گەلـی ثمود ئـەو گەلـە ناسـراوو بـە ناوبانگەیـە کـە لـە زەوی حیجـردا دەژیـان، پێغەمبەرەکەیـان صالـح ﷺ کاتـێ بانگی کردن بـۆ لای بەندایەتـی خوای تاکو تەنهـای بـێ هـاوەڵ، وە ترسـاندنی بە سـزای بـە ئێـش ئەگـەر پێچەوانـەی بجوڵێنەوە.
(٢٤): بـەڵام ئـەوان بەدرۆیـان زانـیو لـووت بەرزیان نواند لە ئاسـتیدا، وتیـان﴿ أَبَشَرًا مِّنَّا وَٰحِدًا نَّتَّبِعُهُۥ ﴾ واتـە: چـۆن شـوێنی کەسـێک بکەویـن فریشـتە نەبێو لـە خۆمان بـێ، لە جگـە لە خۆمـان نەبێ کـە بێگومان فریشـتە لـە ئێمـە گەورەترە.
لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەوە تەنها یەک کەسـە﴿ إِنَّآ إِذًا ﴾ واتـە: ئەگەر شـوێنی بکەوین ئەویش بـەو حاڵـە﴿ لَّفِى ضَلَـٰلٍ وَسُعُرٍ ﴾ واتـە: ئـەوە ئێمـە گومـڕاو سـەر لـێ شـێواوین. وە ئـەم قسـەیە لـە گومڕایـیو بەدبەختیان بـوو، ئەوان ڕەتیـان کردەوە شـوێنی پێغەمبـەرێ بکەون لـە ئادەمیـزاد، خۆیـان نەپاراسـت لە پەرسـتنی داروو بـەردوو وێنە.

(٢٥): ﴿ أَءُلْقِيَ ٱلذِّكْرُ عَلَيْهِ مِنۢ بَيْنِنَا ﴾ واتــە: چـۆن خـوا تایبەتی کـردوە لە ناو ئێمـەداو تەنها سروشـی بـۆ نـاردووە؟ چـی تایبەتمەندیەکـی تێدایـە لـە نێوانماندا؟ ئەمـە ڕەخنـەو بیانوو گرتنـە لەلایـەن ئەوانەی درۆیان دەکـرد بە ناوەی خواوە، بـەردەوام ئـەوان ئەمەیان دووبارە دەکـردەوەو لـە گومانـدا بوون لـە بانگـەوازی پێغەمبـەران، بێگومـان خـوا ﷻ وەڵامی ئەم گومانـەی دایـەوە بـە وتـەی پێغەمبـەران بـۆ ئۆممەتەکانیـان: ﴿ قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ﴿١١﴾ ﴾ إبراهيم (واتـە: پێغەمبەرەکانیـان پێیـان وتـن ئێمـە ئادەمیزادێکیـن وەکـو ئێـوە، بـەڵام خـوا منـەت دەنێ بەسـەر هـەرکام لـە بەندەکانیدا کە بیـەوێ).

جا پێغەمبەران خوا منەتی ناوە بەسەریاندا بە چەندین سیفاتو خوڕەوشتی بەرزو تەواوێتی، بەو هۆیەوە شایستەبوون بۆ هەڵگری پەیامی پەروەردگاریان، وە تایبەت بوون بە وەحی ئەو زاتە، لە میهرەبانیو کاردروستی ئەو زاتە ئەوەیە کە پێغەمبەران ئادەمیزاد بوون، خۆ ئەگەر لە فریشتەکان بوونایە ئەوە ئادەمیزاد نەیدەتوانی لێیان وەربگرێت، وە ئەگەر پێغەمبەران لە فریشتەکان بوونایە ئەوە خوا ﷻ سزای بۆ بە درۆدانەران پێش دەخست.

مەبەسـت لەم قسـانەی کە دەرچـووە لەلایەن ثمـودەوە بەرانبەر بـە پێغەمبەرەکەیـان صاڵحو بـە درۆدانانـی، لەبەر ئەمەیـە بڕیاریاندا بەسـەریدا بەم بڕیـارە سـتەمکارانەو وتیان: ﴿ بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ ﴾ واتـە: (بەڵکـو صاڵح پیاوێکـی) زۆر درۆزنو خراپەکارو خوود پەسـندە، خوا ڕوویـان ڕەش بکات.

ئـای چەنـدە گەمژەو سـتەمکارو کەللەڕەقن، لە ئاسـتی ڕاسـتگۆیانو ئامۆژگـاری کاران بە وتـارو دواندنـی ناشـرین، بێگومان خـوا ﷻ سـزای داون کاتێ یاخیبوونیـان زۆر بوو.

(٢٧): خوا ﷻ حووشـترێکی نارد کە ئەویش گەورەترین نازونیعمەتی خوا بوو بەسـەریانەوە، نیشـانەیەک بوو لە نیشـانەکانی خوا ﷻ، وە نیعمەتێ بوو سـوودیان لە شیرەکەی وەردەگرت کـە بـۆ هەموویان بـەس بـوو، ﴿ فِتْنَةً لَّهُمْ ﴾ واتـە: تاقیکردنەوەیەک بوو لەلایـەن خواوە بـۆ ئـەوان ﴿ فَٱرْتَقِبْهُمْ وَٱصْطَبِرْ ﴾ واتـە: خۆڕاگربـە لەسـەر بانگەوازەکەتو چـاوەڕوان بکە سـەرەنجام چیان بەسـەردێ، یان چـاوەڕوان بکە ئایا مسـوڵمان دەبن یـان بێبڕوا.


وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ الْمَاءَ قِسْمَةٌ بَيْنَهُمْ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ ﴿٢٨﴾ فَنَادَوْا صَاحِبَهُمْ
فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ ﴿٢٩﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٠﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ
صَيْحَةً وَاحِدَةً فَكَانُوا كَهَشِيمِ الْمُحْتَظِرِ ﴿٣١﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ
لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٣٢﴾ كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ بِالنُّذُرِ ﴿٣٣﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَا
عَلَيْهِمْ حَاصِبًا إِلَّا آلَ لُوطٍ نَّجَّيْنَاهُم بِسَحَرٍ ﴿٣٤﴾ نِّعْمَةً مِّنْ عِندِنَا
كَذَٰلِكَ نَجْزِي مَن شَكَرَ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدْ أَنذَرَهُم بَطْشَتَنَا فَتَمَارَوْا بِالنُّذُرِ
﴿٣٦﴾ وَلَقَدْ رَاوَدُوهُ عَن ضَيْفِهِ فَطَمَسْنَا أَعْيُنَهُمْ فَذُوقُوا عَذَابِي
وَنُذُرِ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ صَبَّحَهُم بُكْرَةً عَذَابٌ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣٨﴾ فَذُوقُوا
عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٤٠﴾
وَلَقَدْ جَاءَ آلَ فِرْعَوْنَ النُّذُرُ ﴿٤١﴾ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا كُلِّهَا فَأَخَذْنَاهُمْ
أَخْذَ عَزِيزٍ مُّقْتَدِرٍ ﴿٤٢﴾ أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُولَٰئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَاءَةٌ
فِي الزُّبُرِ ﴿٤٣﴾ أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ ﴿٤٤﴾ سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ
وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ بَلِ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾
إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَىٰ
وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾

(٢٨): ﴿ وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ الْمَاءَ قِسْمَةٌ بَيْنَهُمْ ﴾ واتــە: هەواڵیــان پــێ بــدە ئاوەکە لــە نێوان ئەوانو حوشــترەکەدا بەشــکراوە، ڕۆژێکی دیاریکــراو بــۆ ئــەوەو ڕۆژێکــی دیکــەی دیاریکــراو بۆ ئەوانــە، ﴿ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ ﴾ واتــە: هــەر یەکەیــان ئامادەبــێ لــە کاتــی نــۆرەی خۆیــدا، وە خــۆی بپارێــزێ لەوەی کــە نــۆرەی خــۆی نیە.

(٢٩): ﴿ فَنَادَوْا صَاحِبَهُمْ ﴾ (جــا بانگــی هــاوڕێ خراپەکەیــان کــرد) ئــەوەی کــە ڕاســتەوخۆ ســەری بــڕی، ئــەو کەســە خراپتریــنو بەدبەختترینــی نــاو هۆزەکــە بــوو، ﴿ فَتَعَاطَىٰ ﴾ واتــە: ســەرکردایەتی کــردن کاتــێ داوای ســەربڕینیان لێکــرد، ﴿ فَعَقَرَ ﴾ واتــە: (ئنجــا ســەریبڕی).

(٣٠):﴿ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴾ ســەخترین ســزا بــوو، خــوا ﷻ بۆی نــاردن دەنگێکی زۆر بەهێــزو بومەلەرزەیەکــی گەورە ســەرتاپای لە ناو بــردن، وە صالح ﷺو ئەوانــەی لەگەڵیدا بڕوایــان هێنابوو ڕزگاری کــردن، ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾.

(٣٣-٤٠): ﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ بِالنُّذُرِ ﴿٣٣﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِبًا إِلَّا آلَ لُوطٍ نَّجَّيْنَاهُم بِسَحَرٍ ﴿٣٤﴾ نِّعْمَةً مِّنْ عِندِنَا كَذَٰلِكَ نَجْزِي مَن شَكَرَ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدْ أَنذَرَهُم بَطْشَتَنَا فَتَمَارَوْا بِالنُّذُرِ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدْ رَاوَدُوهُ عَن ضَيْفِهِ فَطَمَسْنَا أَعْيُنَهُمْ فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ صَبَّحَهُم بُكْرَةً عَذَابٌ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣٨﴾ فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٤٠﴾ ﴾:

﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ﴾ (واتــە: گەلــی لووط بڕوایــان نەهێنا) بە لووط ﷺ، کاتــێ بانگی کردن بــۆ بەندایەتــی کردنــی خــوای تاکو تەنهــای بێ هــاوەڵ، وە ڕێگــری لێکردن لــە هاوبەش دانــانو فاحیشــەو کاری خراپــە کە پێش ئەوان هیچ کەسێک لــە جیهاندا ئەنجامــی نەدابوو. جــا بــە درۆیان دانــاو بــەردەوام بــوون لەســەر هاوبەشــدانانو خراپەکاریەکانیــان، تەنانەت ئــەو فریشــتانەش کە لــە وێنــەی میوان هاتــن، کاتێ گەلــی لووط بیســتیان ئــەوان هاتوون

بـۆ ماڵـی لـووط ﷺ، بـە پەلـە خۆیـان گەیانـدە ئـەو جێگایـە بـۆ فاحیشـەو کاری خراپە لەگەڵیانـدا، خـوا ﷻ نەفرینـی لێکـردن‌و ڕووڕەشـی کـردن، داوای میوانەکانیـان لـە لووط کرد.

خـوا فەرمانـی کـرد بـە جبریـل ﷺ بـە باڵەکانـی کوێـری کـردن، پێغەمبەرەکەیشـیان ترسـاندنی بـە خەشـم‌و قیـن‌و تۆڵـەی خـوا ﴿ فَتَمَارَوۡاْ بِٱلنُّذُرِ ﴾ (واتە: بـەڵام ئـەوان دەمە دەمێـان دەکـرد) لـەو ترسـاندنانەدا گومانیـان هەبوو.

(٣٨)﴿ وَلَقَدۡ صَبَّحَهُم بُكۡرَةً عَذَابٞ مُّسۡتَقِرّٞ ﴾ خـوا ﷻ وڵاتەکەیانـی هەڵگەڕانـدەوە بەسـەریاندا خـواروو ژێری کردن، وە وردە زیخـی گڵینی داباراند بەسـەریاندا بە دوای یەک بەبـێ پچـڕان، نیشـانەدار کرابوون لـە لای پەروەردگارتەوە بـۆ زێدەڕەوان، خـوا ﷻ لووطو گەلەکـەی ڕزگـار کرد لە نارەحەتی مەزن، وەک پاداشـتێک بۆیان لەسـەر سوپاسـگوزاری کردنـی پەروەردگاریـان، وە بەندایەتـی کردنـی بە تـاک‌و تەنها بەبـێ هاوبەش.

(٤١-٥٥): ﴿ وَلَقَدۡ جَآءَ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ ٱلنُّذُرُ ﴿٤١﴾ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كُلِّهَا فَأَخَذۡنَٰهُمۡ أَخۡذَ عَزِيزٖ مُّقۡتَدِرٍ ﴿٤٢﴾ أَكُفَّارُكُمۡ خَيۡرٞ مِّنۡ أُوْلَٰٓئِكُمۡ أَمۡ لَكُم بَرَآءَةٞ فِي ٱلزُّبُرِ ﴿٤٣﴾ أَمۡ يَقُولُونَ نَحۡنُ جَمِيعٞ مُّنتَصِرٞ ﴿٤٤﴾ سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوۡعِدُهُمۡ وَٱلسَّاعَةُ أَدۡهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ إِنَّ ٱلۡمُجۡرِمِينَ فِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٖ ﴿٤٧﴾ يَوۡمَ يُسۡحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ ﴿٤٩﴾ وَمَآ أَمۡرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٞ كَلَمۡحِۭ بِٱلۡبَصَرِ ﴿٥٠﴾ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَآ أَشۡيَاعَكُمۡ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿٥١﴾ وَكُلُّ شَيۡءٖ فَعَلُوهُ فِي ٱلزُّبُرِ ﴿٥٢﴾ وَكُلُّ صَغِيرٖ وَكَبِيرٖ مُّسۡتَطَرٌ ﴿٥٣﴾ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَنَهَرٖ ﴿٥٤﴾ فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ ﴿٥٥﴾ ﴾ :

﴿ وَلَقَدۡ جَآءَ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ ﴾ واتـە: (بێگومـان هات بۆ سـەر) فیرعـەون‌و گەلەکەی ﴿ ٱلنُّذُرُ ﴾ خـوا مووسـای کەلیمـی بـۆ نـاردن، وە پشـتیوانی لێکـرد بـە بەڵگـەی ڕوون‌و ئاشـکراو موعجیـزە یەکلاکـەرەوەکان، وە پەنـدو ئامۆژگـاری نیشـانیاندا، کـە نیشـانی جگـە لەوانی نەدابـوو، بـەڵام ئـەوان هەمـوو ئایـەت‌و نیشـانەکانی خوایان بـە درۆ دانا، خـوای گەورەش گرتنـی‌و سـزای دان، بـە سـزادانی زاڵـی دەسـەڵاتدار، فیرعەون‌و هەمـوو سـەربازەکانی لە دەریـادا نقـووم کرد.

(٤٣): مەبەسـت لـە باسـکردنی ئـەم چیرۆکانـە ئاگـادار کردنـەوەو ترسـاندنی خەڵکـی‌و ئەوانـەی تێدایـە کـە پێغەمبـەر ﷺ بـە درۆ دادەنێن، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتی﴿ أَكُفَّارُكُمۡ خَيۡرٞ مِّنۡ أُوْلَٰٓئِكُمۡ ﴾ واتـە: ئەوانـەی بەڕێزترینـی پێغەمبەرانیـان بـە درۆ دانـا، چاکتـرن لـە

بـە درۆدانەرانـی ڕابـردوو ئەوانـەی خوا باسـی لـە ناوچـوونو بەسـەرهاتەکانیان دەکات؟ جـا ئەگـەر باشـترن لـەوان دەگونجـێ ڕزگاریـان ببـێ لە سـزا، وە تووشـیان نەبـێ ئەوەی تووشـی خراپـەکاران بـوو، کارەکـە بەوشـێوەیە نیـە، بێگومـان ئەگـەر ئـەوان لە پێشـینی خۆیـان خراپتـر نەبوونایـە ئەوە لـەوان چاکتـر نیـن﴿ أَمۡ لَكُم بَرَآءَةٞ فِي ٱلزُّبُرِ ﴾ واتـە: یان خـوا بەڵێـنو پەیمانێکـی لێوەرگرتـوون لـەو پەرتووکانـەی کە خـوا دایبەزاندووە بۆ سـەر پێغەمبـەران، جـا ئـەو کات بڕواتـان وابـوو کـە بێگومـان ئێوە سـەرفرازو ڕزگـار بوون بە هـەواڵو پەیمانـی خوا؟

(٤٤): ئەمـەش حەقیقـەت نیـە، بەڵکـو شـتی لەو جـۆرە نابێ نـە بە پێـی عەقڵو نە بـە پێی شـەرع، کە پاکـیو بەرائەتیان نووسـرابێ لەو کتێبە ئاسـمانیانەی دادپـەروەریو حیکمەتیان لەخـۆ گرتـووە، لە حیکمەتو دادپـەروەری نیە ڕزگاربوونی هاوشـێوەی ئـەو کەللەڕەقانەی کـە بەرێزتریـنو چاکترینـی پێغەمبـەران بـەدرۆ دادەنێـن، هیچ نەمایـەوە تەنها ئـەوە نەبێ هێزێکیـان هەبـێ یارمەتیـان بدات، خـوا ﷻ هەواڵیدا ئـەوان دەڵێـن﴿ نَحۡنُ جَمِيعٞ مُّنتَصِرٞ ﴾ (واتـە: ئێمـە کۆمەڵێکی سـەرکەوتووینو نابەزین).

(٤٥): خـوا ﷻ لاوازیو شکسـتیان ڕوون دەکاتـەوەو دەفەرمـوێ﴿ سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴾ (واتـە: بێگومـان کۆمەڵەکەیان دەشـکێنرێو هەڵدێـن)، هەروەک چـۆن هەواڵیدا ڕوویـدا، خـوا ﷻ شکسـتی بـە کۆمەڵـە گەورەکەیـان هێنـا لە جەنگـی بـەدردا، وە گەورە پیـاوانو دارودەسـتەکانیانی لـە ناوبـرد کە بـە هۆیـەوە زەلیل بـوون، وە ئایـنو پێغەمبەرو کۆمەڵـی بڕوادارانی سەرخسـت.

(٤٦) لەگـەڵ ئـەوەدا بەڵێنێکیـان بـۆ هەیە کە سـەرەتاو کۆتاییـان کۆدەکاتـەوە، ئەوانەیان لـە دونیادا ئازاریان چەشـتوەو ئەوانەیشـی لەزەتیان وەرگرتـووە، لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتی: ﴿ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوۡعِدُهُمۡ ﴾ واتـە: کـە پاداشـتیان دەدرێتـەوە، وە مافـی ڕاسـتەقینەیان لـێ وەردەگیرێتـەوە بـە دادپەروەری.

﴿ وَٱلسَّاعَةُ أَدۡهَىٰ وَأَمَرُّ ﴾ واتـە: (سـزای ئەو ڕۆژە) مەزنترو سـەختترو گەورەتـرە لە هەموو ئەوانـەی گومانـی پێدەبەن یان دێ بـە خەیاڵیاندا.

(٤٧)﴿ إِنَّ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴾ واتـە: ئەوانـەی تاوانـی زۆریـان ئەنجامـداوە، ئەویـش گوناهـە گەورەکانـە لە هاوبەشـدانانو جگە لە ئەویـش لە سـەرپێچیەکان﴿ فِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٖ ﴾ واتە: گومـڕان لـە دونیـادا، گومڕان لە زانسـتدا، گومـڕان لـە ئەنجامدانی کردەوەیـەک ڕزگاریان

بکات لە سـزا، لە ڕۆژی دواییشـدا لە سـزای بە ئێشـدان، وە ئاگر جەسـتەیان دەسـوتێنێ تا دەگات بـە دڵەکانیان.

(٤٨): ﴿ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ﴾(واتـە: ئـەو ڕۆژەی کـە لـە ئاگـری دۆزەخدا بەسـەر ڕووخسـاریاندا ڕادەکێشـرێن) کـە بریتیـە لـە بەرێزترینـی شـوێن لە نـاو ئەندامانی جەسـتەیان، وە ئازاریشـی سـەختترە لـە ئـازاری ئەوانـی دیکـە، بەو شـێوەیە سەرزەنشـتو لۆمـە دەکرێو پێیـان دەوترێ: ﴿ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ ﴾واتـە: بچێژن ئازاری ئاگـرو تووڕەیی‌و ناخۆشیەکانی.

(٤٩): ﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴾(واتـە: بێگومـان ئێمـە هەمـوو شـتێکمان بـە ئەنـدازە دروسـتکردوە) ئەمـە گشـتگیرە هەمـوو دروسـتکراوەکانی جیهانـی سـەرەوەو خـوارەوە دەگرێتـەوە، بـە ڕاسـتی خـوا ﷻ بـە تـاکو تەنهـا دروسـتی کـردوون، جگـە لـە ئـەو دروسـتکەرێکی تریـان نیـە، هاوبەشـی نیـە لـە دروسـت کردنیانـدا.

وَمَآ أَمۡرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٞ كَلَمۡحِۭ بِٱلۡبَصَرِ ﴿٥٠﴾ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَآ
أَشۡيَاعَكُمۡ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿٥١﴾ وَكُلُّ شَيۡءٖ فَعَلُوهُ فِي ٱلزُّبُرِ
﴿٥٢﴾ وَكُلُّ صَغِيرٖ وَكَبِيرٖ مُّسۡتَطَرٌ ﴿٥٣﴾ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ
فِي جَنَّٰتٖ وَنَهَرٖ ﴿٥٤﴾ فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ ﴿٥٥﴾

(٥٠): وە دروستی کردوە بە قەزاو قەدەرێک زانستی پێشیکەوتووە، وە قەڵەمی بەسەردا هێناوە بە کاتی دروست کردنیانو ئەندازەکردنیان، وە هەموو ئەوانەش دەگرێتەوە لە وەسفەکان، ئەوەش لە لای خوا ئاسانە ﴿ وَمَآ أَمۡرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٞ كَلَمۡحِۭ بِٱلۡبَصَرِ ﴾ (واتە: وە فەرمانی ئێمە تەنها یەکجارە وەک چاوترووکانێ وایە لە خێراییدا) جا ئەگەر هەر شتێکی بوێ پێی دەفەرموێ: ببە، ئەویش دەست بەجێ دەبێ، وەک چاوتروکانێک بێ بەربەستو هیچ گرانیەک.

(٥١): ﴿ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَآ أَشۡيَاعَكُمۡ ﴾ (واتە: بێگومان زۆر لە کەسانی بێبڕوای وەک ئێوەمان لەناو بردوە) لە ئۆممەتەکانی پێشین، ئەوانەی کردەوەیان ئەنجامدا وەکو کردەوەکانی ئێوە، وە بە درۆیان زانی وەک چۆن ئێوە بە درۆتان زانی، ﴿ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴾ واتە: ئەمێ وەرگرێک هەیە بزانێ کە سوننەتو نەریتی خوا لە یەکەمینو دواییدا هەر یەکە، وە بێگومان کاردروستی ئەو زاتە وەک پێویستی کرد لەناوبردنی ئەو خراپەکارانە، بێگومان ئەوانیش وەکو ئەمان وان، هیچ جیاوازیەک لە نێوان ئەو دوو دەستەیەدا نیە.

(٥٢): ﴿ وَكُلُّ شَيۡءٖ فَعَلُوهُ فِي ٱلزُّبُرِ ﴾ واتە: هەرچی کردەوەیەکیان کردوە لە چاکەو خراپە لە کتێبەکانی قەزاو قەدەردا نووسراوە.

(٥٣): ﴿ وَكُلُّ صَغِيرٖ وَكَبِيرٖ مُّسۡتَطَرٌ ﴾ واتە: (ووردو درشتی کردەوەکانیان) هەموو نووسراوە، ئەمە حەقیقەتی قەزاو قەدەرە کە بێگومان هەموو شتەکان بە گشتی خوا پێیان زانایەو ئاگادارە، نووسیویەتیو لە لایەتی لە (اللوح المحفوظ) جا هەر شتێ خوا بیەوێ دەبێ، وە هەر شتێ خوا نەیەوێ نابێ. ئەوەی لەسەر مرۆڤ

نووسـرابێت هـەر پێـی دەگـاتو لێـی دەربـاز نابێـت، ئەوەشـی لەسـەری نەنووسـرابێت دووچـاری نابێـت.

(٥٤): ﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾بێگومـان ئەوانـە لـە خـوا دەترسـن بەجێبەجـێ کردنـی فەرمانـەکانو وازهێنـان لـە قەدەغەکـراوەکان، ئەوانـەی خۆیـان پاراسـتووە لـە هاوبـەش دانـانو گوناهـە گـەورەو بچوکـەکان، ﴿ فِي جَنَّٰتٖ وَنَهَرٖ ﴾واتـە: لـە بەهەشـتانی پـڕ لـە نازونیعمـەت دان، ئـەو بـاخو بەهەشـتانەی کـە نـە چـاو بینیویەتـی، نـە گـوێ بیسـتوویەتی، وە نەبەخەتـەرە بەسـەر دڵـی ئادەمیـزاددا هاتـووە، لـە باخاتـی ڕازاوەو چـڕو پـڕ، وە ڕووبـاری ڕۆیشـتوو، وە کۆشـکو تـەلاری بـەرزو جێگـای سـەرنج ڕاکێـشو خـواردنو خواردنـەوە بەتامـەکان، وە حۆریـە چـاو گـەشو جوانـەکانو باخچـە ڕازاوەکان لـە نـاو بەهەشـتەکاندا، وە ڕەزامەنـدی خـوای گـەورەو سـەرفرازی بـە نزیـک بـوون لـەو زاتـە، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی:

(٥٥): ﴿ فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ ﴾واتـە: لـە نیشـتگەیەکی پەسـند دان لای پاشـایەکی بـە دەسـەڵاتو بـە توانـا) پرسـیار مەکـە لـە دوای ئـەوە پەروەردگاریـان چیـان پێدەبەخشـێ لـە ڕێـزو بەخشـندەیی خـۆی، وە بۆیـان زیـاد دەکات لـە چاکـەو ئیحسـانو منەتەکانـی، خـوا لەوانمـان بگێـڕێ بێبەشـمان نـەکات لـەو خێـرو چاکەیـەی لـە لایەتـی بـە هـۆی ئـەو شـەڕو خراپەیـەی لـە لامانـە. (آمـین).

تەفسیری سوورەتی (القمر) تەواو بوو.


سورة الرحمن
بسم الله الرحمن الرحيم
الرَّحْمَٰنُ (١) عَلَّمَ الْقُرْآنَ (٢) خَلَقَ الْإِنسَانَ (٣) عَلَّمَهُ الْبَيَانَ (٤)
الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ (٥) وَالنَّجْمُ وَالشَّجَرُ يَسْجُدَانِ (٦)
وَالسَّمَاءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ الْمِيزَانَ (٧) أَلَّا تَطْغَوْا فِي الْمِيزَانِ (٨)
وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا الْمِيزَانَ (٩) وَالْأَرْضَ
وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ (١٠) فِيهَا فَاكِهَةٌ وَالنَّخْلُ ذَاتُ الْأَكْمَامِ (١١)
وَالْحَبُّ ذُو الْعَصْفِ وَالرَّيْحَانُ (١٢) فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (١٣)
(١٤) خَلَقَ الْإِنسَانَ مِن صَلْصَالٍ كَالْفَخَّارِ (١٥) وَخَلَقَ الْجَانَّ مِن
مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ (١٦) فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (١٧) رَبُّ
الْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ الْمَغْرِبَيْنِ (١٨) فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (١٩)

## تەفسیری سوورەتی (الرحمن)
## مەککیە (٧٨) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-١٣): ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ (١) عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ
(٢) خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ (٣) عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ
(٤) ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ (٥) وَٱلنَّجۡمُ
وَٱلشَّجَرُ يَسۡجُدَانِ (٦) وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا
وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ (٧) أَلَّا تَطۡغَوۡاْ فِي
ٱلۡمِيزَانِ (٨) وَأَقِيمُواْ ٱلۡوَزۡنَ بِٱلۡقِسۡطِ وَلَا
تُخۡسِرُواْ ٱلۡمِيزَانَ (٩) وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا
لِلۡأَنَامِ (١٠) فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَٱلنَّخۡلُ ذَاتُ
ٱلۡأَكۡمَامِ (١١) وَٱلۡحَبُّ ذُو ٱلۡعَصۡفِ وَٱلرَّيۡحَانُ
(١٢) فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (١٣)﴾:

﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴾ ئەم سوورەتە بەڕێزو گەورەیە خوا ﷻ بە ناوی خۆی دەستی پێکردوە (الرحمن) کە بەڵگەیە لەسەر فراوانیو میهرەبانیو گشتگیری چاکەکانیو فراوانی فەزڵی. پاشان باسی ئەوەی کردوە کە بەڵگەیە لەسەر میهرەبانی خۆی، وە ئەو شوێنەوارەی خوا دەیگەیەنێ بە بەندەکانی لە نازونیعمەتە ئاینیو دونیاییەکان، دوای هەموو ڕەگەزو جۆرێ لە نیعمەتەکانی ئادەمیزادو جنۆکە ئاگادار دەکاتەوە بە سوپاسگوزاری کردنیو دەفەرموێ: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾.

(٢): ﴿ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ ﴾ واتە: بەندەکانی فێری فەرمایشتو ماناکانی قورئان کردووەو ئاسانی کردوە بۆیان، ئەمەش مەزنترین منەتو میهرەبانیە کە بە هۆیانەوە ڕەحمی بە بەندەکانی کردوە، کاتێ قورئانێکی ڕۆشنی بۆ دابەزاندوون بە چاکترین فەرمایشتو چاکترین ڕاڤەکردن، هەموو خێرێ لە خۆدەگرێو سەرزەنشتی هەموو شەڕو خراپەیەک دەکات.

(٣): ﴿ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ﴾ ئادەمیزادی دروستکردوە) بە جوانترین شێوە، ئەندامانی

جەســتەی تــەواون بونیادی پتەوو قایمــە، خوای داهێنــەر وردبینی لە دروســتکردنیدا کردوە، جیــای کردۆتــەوە لە هەموو گیانــدارەکان.

(٤): بەوەی ﴿ عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ ﴾ واتە: دەرخســتنی ئەوەی لە ویژدانی دایە، ئەمەش گشــتگیرە بــە فێرکردنــی دەربڕیــن و فێرکردنــی نووســین، ئــەو فێرکردنەی کە خــوا ئادەمیــزادی پێ جیاکردۆتــەوە لە جگــە لە خۆی، لــە گەورەترینی نیعمەتــەکان و مەزنترینیانە لەســەری.

(٥): ﴿ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ ﴾ واتــە: خــوا ﷻ خــۆرو مانگــی دروســت کــردوەو ڕامیهێنــاون، زۆر بــە وردی دێــن و دەچــن، وە بــە ئەندازەیەکــی ڕێــک و پێــک، ئەمــەش ڕەحمــەت و گرنگــی دانێکــە بــە بەنــدەکان، بــۆ ئــەوەی لــە ووردبینــی مانــگ و خــۆردا بتوانــن بــە بەرژەوەندیەکانــی خۆیان هەســتن، وە بــۆ ئەوەی بەنــدەکان ژمارەی ســاڵەکان و هەژمارکردنیــان بزانــن.

(٦): ﴿ وَٱلنَّجْمُ وَٱلشَّجَرُ يَسْجُدَانِ ﴾ واتــە: ئەســتێرەکانی ئاســمان و گژووگیــاو دارودرەختــەکان پەروەردگاریــان دەناســن، وە ســوژدەی بــۆ دەبــەن و گوێڕایەڵــی دەکەن و ملکەچــی دەبــن، وە گــەردن کەچیــان دەکات بــۆ بەرژەوەنــدی و ســوودی بەندەکانــی.

(٧): ﴿ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا ﴾ (ئاســمانی بــەرز کردۆتــەوە) بــە ســەقفێک بــۆ بەدیهێنراوەکانی ســەر زەوی، ﴿ وَوَضَعَ ﴾ خــوا دایناوە ﴿ ٱلْمِيزَانَ ﴾ واتــە: دادپــەروەری لــە نێــوان بەندەکانــدا لــە قســەو گوفتــارەکان، مەبەســت پێــی تەرازووی ناســراو نیــە بە تەنهــا، بەڵکو ئــەوەی کــە باســمان کــرد تــەرازووی چاکــە دەچێتــە نێویــەوە، وە ئــەو پێوانەیــەی کــە شــتەکانی پــێ دەپێورێــت، وە ئەندازەو ڕووبــەرەکان کــە نادیارەکانی پێ ڕێــک دەخرێت، وە ئــەو ڕاســتیانەی کــە بــە دادپــەروەری یەکلادەبێتەوە لــە نێــوان بەندەکاندا، لەبــەر ئەمەیە فەرموویەتی:

(٨): ﴿ أَلَّا تَطْغَوْا۟ فِى ٱلْمِيزَانِ ﴾ واتــە: خــوا ﷻ تەرازووی دابەزاندووە بۆ ئــەوەی زێدەڕۆیی تێــدا نەکــەن، چونکــە ئەگــەر فەرمــان بگەڕێتــەوە بــۆ عەقــڵ و بۆچوونەکانتان ئــەوە کەم و کورتــی و ناتەواویــەک دروســت دەبــێ مەگەر تەنهــا خوا بزانــێ، وە ئاســمانەکان و زەویش تێــک دەچــن، ﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلْوَزْنَ بِٱلْقِسْطِ ﴾ واتــە: بــەردەوام بــا کێشــانەکانتان بــە دادپــەروەری بــێ، لــەوەی تواناو دەســەڵاتتان پێــی دەگات.

﴿ وَلَا تُخْسِرُوا۟ ٱلْمِيزَانَ ﴾ واتــە: کــەم و کورتــی تێــدا مەکــەن بــە پێچەوانەیــەوە بجوڵێــن، چونکــە ئــەوە ســتەم و تــاوان و یاخــی بوونە.

(١٠): ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا ﴾ واتــە: خوا ﷻ زەوی ڕاخســتووە لەســەر ئەوەی لەســەریەتی، لــەو چڕو پــڕیو جێگیربوونــەو جیــاوازی وەســفەکانیو دۆخەکانــی، ﴿ لِلۡأَنَامِ ﴾ واتە: بــۆ خەڵکــی بۆ ئــەوەی جێگیــر بن، وە بــۆ ئــەوەی ببێتــە بێشــکەو ڕاخەرێک بۆیــان، ماڵی تێدا دروســت بکــەنو دانەوێڵــەی تێــدا بچێنن، ئاوی لــێ دەربهێنــن، وە هاتووچــۆ بکەن بە ڕێگــا کراوەکانیــداو ســوود لــە کانزاکانــی وەربگــرن، وە هەموو ئــەوەی تیایدایــە، لەوەی پێویســتیان پێیەتی.

(١١): پاشــان باســی بژێویە گرنگیەکانی ناو زەوی کــردووەو فەرموویەتی: ﴿ فِيهَا فَٰكِهَةٞ ﴾ ئەویــش بریتیــە لە کــۆی درەختەکان کــە بەروبــووم دێننە بەرهــەم، کە بەندەکان ســوودی لــێ وەردەگــرن لە تــرێو هەنجیرو هەنارو ســێوو جگــە لەوانە.

﴿ وَٱلنَّخۡلُ ذَاتُ ٱلۡأَكۡمَامِ ﴾ (واتــە: دارخورمــای خاوەن دەفر شــۆڕ دەبێتــەوە کەرت کەرت دەبێــت قۆنــاغ بە قۆناغ تا تــەواو پێدەگــات دەبێت، ئنجــا دەبێتە قووتو بژێــویو دەخورێ لێــی هەڵدەگیری، دانیشــتوو گەشــتیار لێی هەڵدەگــرن، وە میوەیەکی بە لەزەتــە لە چاکترینی میوەکانە.

(١٢): ﴿ وَٱلۡحَبُّ ذُو ٱلۡعَصۡفِ ﴾ واتــە: (دانەوێڵــەی) خــاوەن پەلو پۆدار ئاژەڵەکان ســوود لە کایەکــەی وەردەگــرن، وە جگــە لەویــش، وە دەچێتە نــاو ئــەوەوە دانەوێڵــەی گەنمو جۆو برنجو زوڕاتو جگــە لەوانیش.

﴿ وَٱلرَّيۡحَانُ ﴾ دەگونجێ مەبەســت لەوە هەمــوو بژێویەکان بێت کــە ئادەمیزاد دەیخوات، ئەمــەش لــە بابەتــی دانەپاڵی گشــتیە لەســەر تایبەتی، ئەو کات خــوا بێگومــان منەتی کردوە بەســەر بەندەکاندا، بە بژێــویو ڕزقو ڕۆزی بە گشــتیو تایبەتی.

وە دەگونجــێ مەبەســت لــە ڕەیحــان ئــەو ڕەیحانەبێ کــە ناســراوە، وە بێگومان خــوا منەتی کــردوە بەســەر بەندەکانیدا بەوەی ئاســانی کردوە لەســەر زەویــدا، لە جۆرەهــا بۆنی خۆشو ڕازاوە، کــە ڕووحــەکان پێی ئاســوودە دەبنو نەفــسو دەروونەکان دەکرێنەوە. کاتێ باســی زۆرێ لــە نازوونیعمەتەکانــی کــرد، کــە بەچاوو بینایــی دەبینــرێ وە دواندنەکــەش لەگەڵ ئادەمیــزادو جنۆکەدایــە، خــوا چەســپاندنی بەنازوونیعمەتەکانیو فەرمــووی: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ واتــە: جــا بــەکام لەنازوونیعمەتــە ئاینــیو دنیاییەکانی خوا بــڕوا ناکەن؟ ئــای چەنــدە جوانــە وەڵامــی جنۆکــەکان کاتــێ پێغەمبەر ﷺ ئــەم ســوورەتەی بەســەریاندا خوێنــد، هەر کە بگەیشــتایە بە وتــەی خــوا ﷻ: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ دەیانوت:

خوایـە گیـان بـە هیـچ كام لـە نـازو نیعمەتەكانـی تـۆ بێبڕوانین، سـتایش بـۆ تۆ، ئـا ئەمە پێویسـتە لەسـەر بەنـدە ئەگـەر ئایەتەكانی خـوای بەسـەردا بخوێنرێتـەوە، دانـی پێدادەنێ‌و سـوپاس‌و ستایشـی دەكات لەسەری.

(١٤-١٦): ﴿ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ كَٱلۡفَخَّارِ ﴿١٤﴾ وَخَلَقَ ٱلۡجَآنَّ مِن مَّارِجٖ مِّن نَّارٖ ﴿١٥﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٦﴾ ﴾:

ئەمـە لـە نیعمەتەكانـی خوایـە بەسـەر بەندەكانیـەوە، كاتـێ پێـی نیشـانداون شـوێنەواری توانـاو داهێنانـی دروسـتكردنی كـە ﴿ خَلَقَ ﴾ باوكـی مرۆڤایەتی، ئەویـش ئادەمە ﷺ ﴿ مِن صَلۡصَٰلٖ كَٱلۡفَخَّارِ ﴾ واتـە: لـە قوڕێكـی تەڕكـراو، كە بـەو تەڕیـە قایمكراوەو وردەكاری تێـدا كـردوە تـا وشـكەوە بـووە، جـا زڕنـە زڕن‌و دەنگێكـی هەبوو لـە دەنگی فەخفـوری دەچـوو كە لەسـەر ئاگـر چێشـتی پێدەكرێ.

﴿ وَخَلَقَ ٱلۡجَآنَّ ﴾ واتـە: باوكـی جنۆكـەكان، ئەویش ئیبلیسـی نەفریـن لێكراوە ﴿ مِن مَّارِجٖ مِّن نَّارٖ ﴾ واتـە: لـە بڵێسـەی ئاگرێكـی پـاك‌و بـێ دووكـەڵ، یـان ئـەو ئاگرەی دووكەڵـی تێكەڵە.

ئەمـەش بەڵگەیە لەسـەر ڕێـزو حورمەتـی پێكهاتـەی ئادەمیزاد كـە لەقوڕو خۆڵ دروسـت كـراوە، ئـەوە جێگـای سـەنگینی‌و هێمنـی‌و سـوودو بەرژەوەندیەكانـە، بـە پێچەوانـەی پێكهاتـەی جنۆكـەكان كـە ئاگرە، ئەویـش جێگای مەترسـی‌و هەڵەشـەیی‌و سـەرەڕۆیی‌و شـەڕو خراپەیە.

كاتـێ باسـی دروسـتكردنی ئادەمیزادو جنۆكـەو توخمی ئەوانیكـرد، دیارە ئـەوە منەتی ئەو زاتەیە بەسـەر بەندەكانیـەوە، فەرموویەتی: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾.

(١٧-١٨): ﴿ رَبُّ ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ وَرَبُّ ٱلۡمَغۡرِبَيۡنِ ﴿١٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٨﴾ ﴾:

واتـە: خـوا پەروەردگـاری هەمـوو ئەوانەیـە كـە خـۆرو مانـگ‌و ئەسـتێرە ڕووناكەكانیان بەسـەردا هەڵهاتـووە، وە هەمـوو ئەوانەیـە كـە بەسـەریدا ئـاوا بـووە، وە هەمـوو ئەوانـەی تیایدایـە، جـا هەموویان لەژێـر بەڕێوەبـردن‌و پەروەردگاریتی ئەو زاتەدایـە، وە لێرەدا بەدوو هێناویەتـی لەبـەر گشـتگیری، هـەردوو خۆرهـەڵات، خۆرهەڵاتـی هاویـن‌و خۆرهەڵاتـی زسـتان، وە خۆرئـاواش بەهەمان شـێوە.

مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ
رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ
رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٣﴾ وَلَهُ ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ ﴿٢٤﴾
فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٥﴾ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ
رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَـٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٨﴾
يَسْـَٔلُهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٠﴾ سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ ﴿٣١﴾ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٢﴾ يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ
أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟ لَا تَنفُذُونَ
إِلَّا بِسُلْطَـٰنٍ ﴿٣٣﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٤﴾ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا
شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴿٣٥﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا
تُكَذِّبَانِ ﴿٣٦﴾ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَٱلدِّهَانِ
﴿٣٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٨﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔلُ عَن
ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ ﴿٣٩﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٠﴾
يُعْرَفُ ٱلْمُجْرِمُونَ بِسِيمَـٰهُمْ فَيُؤْخَذُ بِٱلنَّوَٰصِى وَٱلْأَقْدَامِ ﴿٤١﴾

(١٩-٢٠): ﴿ مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٣﴾ ﴾:

مەبەست لەو دوو دەریایە: دەریای شیرین‌و دەریای سوێرە، ئەو دوو دەریایە هەردووکیان دەگەن بە یەکتر، ئاوە شیرینەکە دەگات بە ئاوە سوێرەکە، تێکەڵیش دەبن، بەڵام خوا بەربەستێکی لە نێوانیاندا دروست کردوە، تا یەکێکیان زاڵ نەبێت بەسەر ئەوەی دیکەدا، وە سوود بەدەست بێت لە هەر یەکێک لەو دووانە، ئاوی شیرینی لێی دەخۆنەوەو دارودرەخت‌و کشتوکاڵەکانیان پێ ئاو دەدەن، ئاوی سوێریش هەوای پێ پاک دەبێت‌و نەهەنگ‌و ماسی‌و مرواری‌و مەرجانی پێ لەدایک دەبێت، وە دەبێتە جێگای چەسپاوی‌و ڕامهێنراو بۆ کەشتیەکان، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی:

(٢٤-٢٥): ﴿ وَلَهُ ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ ﴿٢٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٥﴾ ﴾:

﴿ وَلَهُ ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ ﴾ واتە: خوا ﷻ کەشتیە گەورەکانی بۆ بەندەکانی ڕامهێناوە دەریاو زەریا دەبڕن بە مۆڵەتی ئەو زاتە، کە ئادەمیزاد دروستی کردوە، جا لە گەورەییاندا وەکو کێوە مەزنەکان وان، جا خەڵکی سواریان دەبن، وە هەرچی کەرەستەو پێویستی‌و شتومەکی بازرگانیان هەیە باری دەکەن لەسەری، جگە لەوانەش هەرشتێکی دیکە کە پێویستیان پێی هەبێ، بێگومان پاراستوویەتی پارێزەری ئاسمانەکان‌و زەوی، ئەمەش لە نیعمەتە مەزنەکانی خوایە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾.

(٢٦-٢٨): ﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَـٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٨﴾ ﴾:

﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ﴾ واتــە: هەرچی لەســەر زەویدایە لە مرۆڤ‌و جنۆکەو ســەرجەم گیانلەبــەران، نامێنــێ‌و دەمــرێ‌و تیادەچــێ، تەنها ئەو زینــدووە دەمێنــێ کە مردنی بەســەردا نایــەت ﴿ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴾ واتــە: خــاوەن مەزنــی‌و شــکۆو گەورەیــە، ئــەو زاتــەی کــە بە مــەزن‌و گەورە دادەنــرێ، لەبەر ئەویش شــتەکانی دیکــە ڕێزیــان لێدەگیرێ، وە خــاوەن ڕێــزە کــە بریتیــە لە چاکــەو بەخشــندەیی فــراوان، وە پاڵنــەری ئەوەیــە ڕێز لە دۆســتەکانی بگرێــت، وە بەدیهێنــراوە تایبەتمەندەکانــی بە جۆرەهــا ڕێزگرتن، ئــەو زاتەی دۆســتەکانی ڕێــزی لێدەگــرن‌و بــە گــەورەی دادەنێــن‌و خۆشــیان دەوێ‌و ملکەچــی دەبن‌و دەیپەرســتن، ﴿ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ (واتە: جــا کام لە نیعمەتەکانــی پەروەردگارتان بــە درۆ دەزانن).

(٢٩-٣٠): ﴿ يَسْأَلُهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٠﴾ ﴾: ﴿ يَسْأَلُهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾ واتــە: ئەو زاتــە بێنیازە لە بەدیهێنراوەکانی، بەخشــندەیی‌و ڕێــزی فراوانــە، هەمــوو خەڵکــی هــەژارن بــەو زاتــە، داوای هەمــوو پێویســتیەکانیان لــەو دەکــەن، بــە قــەد چاوپروکانێــک‌و کەمتریــش لــە چاوپروکانێــک لێی بێنیــاز نین.

ئــەو زاتــە بــەرزە: ﴿ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ﴾ (واتە: هەمــوو ڕۆژێ خــوا لە کردنــی کارێکدایە) هــەژارێ دەوڵەمەنــد دەکات‌و دەســتگیرۆیی بێنەوایــەک دەکات، دەبەخشــێ بــە گەلێک‌و لــە گەلێکــی دیکە دەگرێتــەوە، دەمرێنــێ‌و زینــدوو دەکاتەوە، پلــەو پایە بــەرز دەکاتەوەو دایدەبەزێنــێ، هیــچ کارێ لە کارێکی دیکە ســەرقاڵی نــاکات، بابەتەکانیــش بەهەڵەیدا نابن، نــە پێداگــری پێداگــرەکان وای لێدەکات بریــار بدات، نە درێــژی داواکردنــی داواکاران.

پــاک‌و بێگەردی بۆ خوای ڕێزدارو بەخشــندە کە بەخششــەکانی هەرچی لەناو ئاســمانەکان‌و زەویدایــە گرتۆتــەوە، وە بەزەیی‌و نەرم‌و نیانی هەموو بەدیهێنراوەکانی داپۆشــیوە، لە گشــت چرکــەو ســاتەکاندا، بــەرزی بۆ ئەو زاتەی ســەرپێچی ســەرپێچیکاران ڕێگری بەخشــینی لێ نــاکات، وە بێنیازی هــەژارە نەفامەکان ڕێگری بەخشــینی لێ ناکات.

ئــەم کاروبارانــە کــە هەواڵیــداوە ئــەو زاتــە لــە هەمــوو ڕۆژێکــدا لــە کردنــی کارێکدایە ئەویــش ئەنــدازە کردنــەکان‌و بەڕێوەبردنەکانێتــی کــە لــە کۆنــەوە ئەنــدازەی کــردووەو لە قــەدەر نووســیویەتی، بەردەوام خــوا لەکاتەکانی خۆیانــدا بەپێی حیکمەتی خــۆی جێبەجێیان دەکات، ئەویــش بڕیــارە ئاینیەکانێتــی کــە بریتیــە لــە فەرمــان‌و قەدەغەکــردن، وە بڕیــارە قەدەریەکانــی کــە بەســەر بەندەکانیــدا دەیهێنــێ مــاوەی مانەوەیــان لــەم ژیانــەدا، تــا ئــەم

بەدیهێنراوانــە تــەواو دەبــن‌و کۆتاییــان پــێ دێ، وە خــوا ﷻ بڕیــاری پاداشــت دانەوەیــان تێــدا جێبەجــێ بــکات، دادوەری‌و فــەزڵ‌و چاکــەی خــۆی پێیــان نیشــان بــدات، کــە بــەو هۆیــەوە دەیناســنەوەو بەتاک‌و تەنهــای دادەنێن، ئەرک پێســپێردراوان دەگوازێتــەوە لەماڵی تاقیکردنــەوە بــۆ ماڵــی ژیان.

لــەو کاتــەدا یەکلادەبێتــەوە بەجێبەجێ کردنی ئــەم بڕیارانەی کــە کاتیان هاتــووە، ئەویش مەبەســتە لە فەرمایشــتی خوا کــە فەرموویەتی:

(٣١-٣٢): ﴿ سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ ﴿٣١﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٢﴾ ﴾:

واتــە: لەمــەولا یەکلادەبینــەوە بۆ لێپرســینەوەو پاداشــت دانەوەتــان، بەپێی ئــەو کردەوانەی کــە کردووتانە لــە ماڵــی دونیادا.

(٣٣): ﴿ يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَٰنٍ ﴿٣٣﴾ ﴾

ئەگــەر خــوا ﷻ کــۆی کردنــەوە لــە ڕۆژی دوایــی، هەواڵیــان پێــدەدات بە دەستەوەســانی‌و لاوازیــان، وە تــەواوی دەســەڵاتی خــۆی‌و جێبەجــێ کردنــی‌و تواناکانــی، خــوا ئەوانــی بە بێتوانــا دا لــە قەڵــەم‌و فەرمــووی: ﴿ يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ (واتــە: ئــەی کۆمەڵــی جنۆکــەو ئادەمیــزاد ئەگــەر) دەرچەیــەک دەبینــن بــۆ ئــەوەی پێــی دەربچن لــە موڵــک‌و دەســەڵاتی خــوا ﴿ فَٱنفُذُوا۟ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَٰنٍ ﴾ واتــە: ناتوانــن لــە دەســەڵاتی ئەو دەربچــن مەگــەر بەهێزو دەســەڵات‌و تەواوی توانــا، بێگومــان ئەوانیــش ئەوەیــان نیــە، ئــەوان بــۆ نەفســی خۆیــان نەســوودیان هەیەو نە زیــان لادەبــەن‌و نەمــردن‌و نــە ژیــان‌و نــە زیندووبوونەوە؟ جــا لــەو مەیدانەدا هیچ کەســێ قســە نــاکات مەگــەر بــە مۆڵەتی خــوا، وە هیــچ نابیســتێ جگە لــە چپــە، وە لــەو مەیدانەدا دەســەڵاتدارو بــێ دەســەڵات، پاشــاو گــەدا، دەوڵەمەنــدو هــەژار وەکو یــەک دەبن.

(٣٥-٣٦): ﴿ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴿٣٥﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٦﴾ ﴾:

پاشــان باســی ئەوەی کــردوە کە بۆیانی ئامــادە کردوە لــەو ڕۆژە مەزنەدا، جــا فەرموویەتی: ﴿ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ ﴾ واتــە: بۆتــان دەنێــرێ ئــەی ئادەمیــزادو جنۆکــە بڵێســەی ئاگرێکــی پــاک‌و پاڵێوراو، ﴿ وَنُحَاسٌ ﴾ (مســی تواوە) ئەویــش بریتیە لەو گڕو بڵێســەیەی کــە تێکەڵــە بە دووکەڵ، مانــای ئەوەیە ئــەم دوو کارە ناخــۆش‌و نارەحەتە دەنێردرێنە ســەر

هەردووکتــان ئــەی گرۆی جنۆکەو ئادەمــی، وە دەورتــان دەدەن هەرگیز یارمەتــی نادرێن، نەخۆتــان دەتوانــن یارمەتــی خۆتــان بــدەن، نــە کەســێک هەیــە جگە لــە خــوا یارمەتیتان بدات.

وە کاتــێ کــە ترســاندنی خــوا بــۆ بەندەکانــی وەک نازونیعمەتــێ وایــە بەســەریانەوە، وە گورزێکــە پەلکێشــیان دەکات بــۆ بەرزترینــی داواکاریــەکانو بەڕێزترینی بەخششــەکان، بۆیــە منەتــی کــردوە بەســەریانداو فەرموویەتــی: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾.

(٣٧-٤٢): ﴿ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَٱلدِّهَانِ ﴿٣٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٣٨﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ ﴿٣٩﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٠﴾ يُعْرَفُ
ٱلْمُجْرِمُونَ بِسِيمَٰهُمْ فَيُؤْخَذُ بِٱلنَّوَٰصِى وَٱلْأَقْدَامِ ﴿٤١﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٢﴾ ﴾:

﴿ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ ﴾ واتــە: (ئنجــا کاتــێ ئاســمان لــەت بــوو) لــە ڕۆژی دواییــدا، وە زۆری وروژاندنــەکانو تــرسو دڵەڕاوکێــکان، خۆرو مانگی ئــەو ئاســمانە دەکوژێنەوە، وە ئەســتێرەکانی بەردەبنــەوە، ﴿ فَكَانَتْ ﴾ لــە ســەختی ترسو بێــزاری ﴿ وَرْدَةً كَٱلدِّهَانِ ﴾ واتــە: وەکــو ڕۆنــی تــواوەی هەڵقرچــاو ســوور هەڵدەگــەڕێ ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٣٨﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ ﴾ واتــە: (ئنجــا لــەو ڕۆژەدا) پرســیار ناکرێ لە تاوانــی هیــچ ئادەمــیو جنۆکەیــەک بەوەی کــە کردوویانــە، چونکە خــوا زانــای پەنهانو ئاشــکراو ڕابــردوو داهاتوە، وە دەیەوێ پاداشــتی بەندەکانــی بداتەوە بەوەی حاڵیــان دەزانێ، و بێگومــان بــۆ چاکەخوازانو خراپــەکاران لە ڕۆژی دواییــدا چەندین نیشــانەی داناوە پێیان دەناســرێنەوە، وەک فەرموویەتــی: ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾آل عمران، (واتە: ڕۆژێــک دێــت کــە چەند ڕوویەک ســپی دەبــن، وە چەنــد ڕوویــەک ڕەش دەبن).

وە لێــرەدا فەرموویەتــی: ﴿ يُعْرَفُ ٱلْمُجْرِمُونَ بِسِيمَٰهُمْ فَيُؤْخَذُ بِٱلنَّوَٰصِى وَٱلْأَقْدَامِ ﴾ واتــە: (خراپــەکاران بە ڕووخســاریان دەناســرێن) ئنجا ڕادەکێشــرێن بە مووە پێشــی ســەریانو بە قاچەکانیــان، پاشــان فــڕێ دەدرێنــە ناو دۆزەخــەوە، بەڵکو لەبەر ئــەوە پرســیاریان لێدەکات بــۆ سەرزەنشــت کــردنو دانپێدانان بــەوەی ئەنجامیــان داوە، ئەو زاتــە لەوان زاناتــرە بەوەی کردوویانــە، بــەڵام دەیــەوێ بەڵگــەی یەکلاکــەرەوەو حیکمەتــی گــەورەی بــۆ خەڵکــی دەربکەوێ.


فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا
ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٤٣﴾ يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ ﴿٤٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ
رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٥﴾ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٧﴾ ذَوَاتَآ أَفْنَانٍ ﴿٤٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا
تُكَذِّبَانِ ﴿٤٩﴾ فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ ﴿٥٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٥١﴾ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٍ زَوْجَانِ ﴿٥٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٥٣﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشٍۭ بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ ۚ وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ
﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٥﴾ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ
لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٥٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٥٧﴾ كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٥٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٥٩﴾ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴿٦٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا
تُكَذِّبَانِ ﴿٦١﴾ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا
تُكَذِّبَانِ ﴿٦٣﴾ مُدْهَآمَّتَانِ ﴿٦٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٦٥﴾ فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴿٦٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٧﴾
فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ ﴿٦٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٩﴾

**(٤٣-٤٥):** ﴿ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٤٣﴾ يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ ﴿٤٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٥﴾ ﴾:

بـە بەدرۆدانەران دەوترێ بەوانەی پەیمانو هەرەشـەیان بەدرۆ داناوە کاتـێ ئاگریان بۆ هەڵدەگیرسێ: ﴿ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾ (واتـە: ئەمـە ئـەو دۆزەخەیە کە تاوانبـاران بـە درۆیـان دەزانـی) جـا بـا بە هـۆی بەدرۆدانانیانەوە سەرزەنشـتیان بکات، وە بـا بچێـژن لـە سـزاو ناخۆشـیو گـڕی دۆزەخو کۆتوبەنـد کردنیـان، ئـەوەش پاداشـتی بـە درۆ دانانیانە.

﴿ يَطُوفُونَ بَيْنَهَا ﴾ واتـە: (هاتووچـۆ دەکەن) لـە نێوان چینەکانـی دۆزەخو گڕو گەرمیـدا، ﴿ وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ ﴾ واتە: ئاوێکـی زۆر گەرم، لە گەرمیدا گەیشـتووەتە ئەوپەڕی، وە زەمهەریرەکەیشـی زۆر سـاردو سـەختە، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾.

**(٤٦-٦٥):** ﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٧﴾ ذَوَاتَآ أَفْنَانٍ ﴿٤٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٩﴾ فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ ﴿٥٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥١﴾ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٍ زَوْجَانِ ﴿٥٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٣﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشٍۭ بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ ۚ وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٥﴾ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٥٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٧﴾ كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٥٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٩﴾ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴿٦٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦١﴾ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٣﴾ مُدْهَآمَّتَانِ ﴿٦٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٥﴾ ﴾:

(کـە دەفەرمـوێ:) ﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ تـا کۆتایـی سوورەتەکە.

واتـە: بـۆ ئەو کەسـەی لـە پەروەردگاری دەترسـێو لە خزمەتیدا دەوەسـتێ، جـا وازی لەوە

هێنــاوە کــە خــوا قەدەغەی کــردوە لێی، وە ئــەوەی ئەنجامداوە کــە خوا فەرمانــی پێکردوە، دوو باخــی لە بەهەشــتدا بــۆ هەیە، قاپو قاچــاخو ڕازاندنەوەو دروســتکردنی ئــەو دوو باخە لــە ئاڵتوونــە، یەکێــک لــەو دوو باخە لــە پاداشــتی وازهێنانــە لــە قەدەغەکــراوەکان، ئەوی دیکە لەســەر ئەنجامدانــی کارە چاکەکانە.

(٤٨): وە لــە وەســفەکانی ئــەو دوو باخــە ﴿ ذَوَاتَآ أَفۡنَانٖ ﴾ واتــە: لــەو دوو باخــەدا هەیــە لــە جۆرەهــا نازونیعمەتــی ڕەنگــاو ڕەنــگو جــۆراو جــۆر، نیعمەتــی ئاشــکراو نهێنــی، کە چــاو نەیبینیــوە، گوێ نەیبیســتووە، بــە خەتەرە بەســەر دڵی کەســدا نەهاتــووە، دارودرەختی سەرنجراکێشــی تێدایــە، خــاوەن لقو پۆی زۆر جــوان، بەرهەمــی زۆر بەتامیــان پێوەیە، یان ئــەو دوو باخــە خــاوەن چەندین جۆرو بەشــن لە هەمــوو بەشــەکانی نیعمــەتو جۆرەکانی، کــۆی (فــن) واتــە: جۆر.

(٥٠): وە لەنــاو ئــەو دوو باخــەدا هەیــە ﴿ عَيۡنَانِ تَجۡرِيَانِ ﴾ (واتە: دوو کانیــاوی ڕەوان) چۆن بیانــەوێ بەری دەدەنــەوە، بە ئــارەزووی خۆیان.

(٥٢): ﴿ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٖ ﴾ (واتــە: هەیــە لەنــاو ئــەو دوو باخــەدا) لــە هەمــوو جــۆرە میــوەکان ﴿ زَوۡجَانِ ﴾ (دوو جــۆر) جۆرێکــی لــەزەتو ڕەنگــی هەیــە کــە لــە جۆرەکەی دیکــەدا نیە.

(٥٤): ﴿ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشِۭ بَطَآئِنُهَا مِنۡ إِسۡتَبۡرَقٖ ﴾ (واتــە: پاڵیــان داوەتــەوە لەســەر جــۆرە فەرشــێک کــە بەرەکانیــان لــە ئاورێشــمی ئەســتوورە) ئەمــە ســیفەتی ڕاخــراوو فەرشــی خەڵکانــی بەهەشــتەو دانیشــتنیانە لەســەری، ئــەوان پاڵیــان داوەتــەوە لەســەری، بە دانیشــتی چەســپاوو حەوانــەوە، وەکــو دانیشــتنی پاشــاکان لەســەر کورســیەکانیان.

ئــەو فەرشــانە کــەس نازانێ وەســفی جوانیــان بکات جگــە لە خــوا، تەنانەت ئەو فەرشــانەی لەســەر زەویــن لــە ئاوریشــمن، کــە لــە چاکتریــن جــۆری حەریــرو ڕازاوەترینیانــە، دەبێ ڕواڵەتیــان کــە ڕوومەتــی دەخەنە ســەر چــۆن بێت؟!

﴿ وَجَنَى ٱلۡجَنَّتَيۡنِ دَانٖ ﴾ (الجنــى) بریتیــە لــە بەروبوومــی ڕێــک، واتە: بەرهەمــی ئەو دوو باخــە نزیــک دەســتە بۆ خواردن، ئەو کەســەی کە وەســتاوەو ئەو کەســەش کە دانیشــتووە، ئــەوەی پاڵکەوتوە دەســتی پێــی دەگات.

(٥٦-٥٨): ﴿ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ ﴾ واتــە: (ژنانێکــی تێدایــە) کــە تەنها چاویــان بڕیوەتە مێردەکانیــان لە چاکیو جوانیان، وە تەواوی خۆشەویســتیان بۆیان، هەروەها مێردەکانیشــیان

تەنهـا تەماشـای ژنەكانیان دەكەن لـە چاكیو جوانیانـدا، وە لەزەتی گەیشـتن پێیان.
﴿ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَانٌّ ﴾ واتـە: پێش ئەوان دەسـتی كەسـیان پێ نەگەیشـتووە لـە ئادەمیو جنۆكـە، بەڵكو ئەوانە كچانێكی هاوتەمەنی خۆشەویسـتن بـەلای مێردەكانیانەوە بـە هۆی چاكی مامەڵەیانو ناز كردنیانو قسـەی خۆشـیانەوە، وە لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتی:
﴿ كَأَنَّهُنَّ الْيَاقُوتُ وَالْمَرْجَانُ ﴾ (واتـە: ئـەو حۆریانە وەك یاقوتو مەرجـان وان) ئەویش بە هۆی پاكـیو جوانیو دیمەنـی ڕازاوەیان.
(٦٠): ﴿ هَلْ جَزَاءُ الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ ﴾ واتـە: ئایـا پاداشـتی ئـەو كەسـەی چاكـە دەكات لـە بەندایەتـی كردنـی پەروەردگاریـدا وسـوودی بـۆ بەندەكانـی هەیە، شایسـتەی ئـەوە نیـە پاداشـت بدرێتەوە بە پاداشـتێكی بـێ پایـانو سـەرفرازی گـەورەو نازونیعمەتی بـەردەوامو ژیانێكـی سـەلامەت، ئـەم دوو باخە بـەرزە بـۆ نزیكانن.
(٦٢): ﴿ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴾ واتـە: (وە بێجگـە لـەو دووباخەی كە باسـكران دوو باخی تـر هـەن) بونیاتنانیانو قـاپو قاچـاخو ڕازاندنەوەیـانو ئـەوەی تیایاندایە لەزیـوە، دانراوە بـۆ یارانی لای ڕاسـتە.
(٦٤): ئەو دوو باخە ﴿ مُدْهَامَّتَانِ ﴾ واتە: ڕەش دەنوێنن لە زۆری سەوزبوونیاندا.
(٦٦-٧٠): ﴿ فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴿٦٦﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٧﴾ فِيهِمَا فَاكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ ﴿٦٨﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٩﴾ فِيهِنَّ خَيْرَاتٌ حِسَانٌ ﴿٧٠﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧١﴾ حُورٌ مَّقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ ﴿٧٢﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٣﴾ ﴾:
﴿ فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴾ واتـە: (لـەو دوو باخـەدا دوو كانیـاوی) هەڵقوڵاویـان تێدایە ﴿ فِيهِمَا فَاكِهَةٌ ﴾ لـە هەمـوو جۆرەكانـی میـوە، وە بـە تایبەترینیـان دارخورماو هەنـار، ئەو دووانـەی كـە سـوودو قازانجێكی زۆریـان تێدایە.

فِيهِنَّ خَيْرَٰتٌ حِسَانٌ ﴿٧٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٧١﴾ حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ ﴿٧٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا
تُكَذِّبَانِ ﴿٧٣﴾ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٧٤﴾ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٥﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفْرَفٍ خُضْرٍ
وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ ﴿٧٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٧﴾
تَبَٰرَكَ ٱسْمُ رَبِّكَ ذِى ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٧٨﴾

﴿ فِيهِنَّ ﴾ واتە: لە هەموو باخەکاندا ﴿ خَيْرَٰتٌ حِسَانٌ ﴾ واتە: (ئافرەتانی) ڕەوشت چاکو ڕووخسار جوان هەیە، جوانی ڕواڵەتو جوانی ناخیان، وە جوانی دروستکردنو جوانی ڕەوشتیانی پێکەوە کۆکردۆتەوە.

(٧٢): ﴿ حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ ﴾ واتە: حۆریانێک کە لە خێمەی مرواریدان، خۆیان ئامادە کردوە بۆ مێردەکانیان، ئەمەش ئەوە ڕەت ناکاتەوە دەرچوونیان بۆ ناو باخچەکانی بەهەشت، هەروەک چۆن نەریتی کچە پاشاکان وابووە.

(٧٤-٧٦): ﴿ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٧٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٥﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ ﴿٧٦﴾ ﴾:

واتە: هاوەڵانی ئەم دوو باخە پاڵدانەوەیان لەسەر پشتی سەوز، ئەویش ئەو ڕاخەرانەیە کە لەسەرووی کۆڕو مەجلیسە بەرزەکانەوەیە، کە زیاترە لەسەر کۆڕو مەجلیسەکانیان، بۆتە پشتیەک لە پشتی کۆڕو مەجلیسەکانیان بۆ ئەوەی ببێتە ڕازاوەییەکی زیاترو دیمەنێکی جوانتر ﴿ وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ ﴾ (العبقري): شێوەیەکە بۆ هەموو چنینێکی ڕازاوەو جوان، لەبەر ئەمەیە وەسفکراوە بەجوانیەکی گشتگیر، بەهۆی جوانی دروستکردنو جوانی سروشتو نەرمی لەدەست لێداندا.

ئەم دوو باخە لە خواری دوو باخەکەی یەکەمن، وەکو چۆن خوا ﷻ لەسەر ئەوە فەرموویەتی: ﴿ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴾ وە وەک چۆن وەسفی دوو باخی کردوە بە چەند وەسفێک، وەسفی دوو باخی دوواینی نەکردوە، دەربارەی دوو باخی یەکەم فەرموویەتی: ﴿ فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ ﴾ وە دەربارەی دوو باخی دوایین: ﴿ عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴾، بێگومان زانراوە جیاوازی لە نێوان ئاوی ڕۆیشتوو ئاوی هەڵقوڵاو، وە دەربارەی دوو باخە یەکەمینەکە فەرموویەتی: ﴿ ذَوَاتَآ أَفْنَانٍ ﴾ وە دەربارەی دوو باخە دواینەکە نەیفەرمووە،

وە دەربـارەی دوو باخـە یەکەمینـەکان فەرموویەتـی: ﴿ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٖ زَوۡجَانِ ﴾ وە دەربـارەی دوو باخـە دواینەکە: ﴿ فِيهِمَا فَٰكِهَةٞ وَنَخۡلٞ وَرُمَّانٞ ﴾ بەڕاسـتی شـتێکی زانـراوە جیاوازی لـە نێـوان ئەم دوو وەسـفەدا.

دەربـارەی دوو باخـە یەکەمەکە فەرموویەتـی: ﴿ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشِۭ بَطَآئِنُهَا مِنۡ إِسۡتَبۡرَقٖۚ وَجَنَى ٱلۡجَنَّتَيۡنِ دَانٖ ﴾ دەربـارەی دوو باخـە دواینەکـە ئـەوەی نەفەرمـووە، بەڵکـو فەرموویەتـی: ﴿ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفۡرَفٍ خُضۡرٖ وَعَبۡقَرِيٍّ حِسَانٖ ﴾، وە دەربـارەی دوو باخـە یەکەمینەکـە لـە وەسـفی خێزانەکانیانـدا فەرموویەتـی: ﴿ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٞ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنّٞ ﴾ وە دەربـارەی دوو باخـە دواینەکـە فەرموویەتـی: ﴿ حُورٞ مَّقۡصُورَٰتٞ فِي ٱلۡخِيَامِ ﴾ بێگومـان جیـاوازی لە نێـوان ئـەم دووانەدا ئاشـکرایە.

وە دەربارەی دوو باخـە یەکەمینەکە فەرموویەتی: ﴿ هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ﴾ ئـەوەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی دوو باخـە یەکەمینەکـە پاداشـتی چاکەخوازانـە، ئـەوەی نەفەرمـووە دەربـارەی دوو باخـە دواینەکـە، تەنها پێشخسـتنی دوو باخی یەکەم لەسـەر دوو باخـی دووەم بەڵگەیـە لەسـەر فـەزڵو چاکەیـان. جا بـەم ڕووانـە فەزڵی دوو باخـی یەکەم دەردەکـەوێ بەسـەر دوو باخی دواییندا، وە بێگومـان ئەو دوو باخە یەکەمینـە ئامادە کراون بـۆ نزیکان، لـە پێغەمبەرانو ڕاسـتگۆیانو بەنـدە تایبەتمەنـدە چاکەکانی خـوا، وە ئەو دوو باخـە دوایینە ئامـادە کراون بـۆ هەموو بـڕواداران.

وە لـە هەریـەک لـەو بەهەشـتانەی باسـکران چـاو نەیبینیـوە، گـوێ نەیبیسـتووە، وە بەخەتـەرەش بەسـەر دڵی کەسـدا نەهاتووە، وە تیایاندایـە ئەوەی نەفس ئـارەزووی دەکاتو چـاو لەززەتی لێوەردەگـرێ، وە خەڵکەکەی لە ئەوپـەڕی حەوانەوەو ڕەزامەنـدیو دڵنیاییو خۆشـگوزەرانی دان، تەنانـەت هەریەکـە لـەوان وا نابینێ کەسـێک حاڵی لەو باشـتر بێ، وە کەسـێک نازونیعمەتـی لەو بەرزتـر بێ.

(٧٨): ﴿ تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ ذِي ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ٧٨ ﴾:

کاتـێ باسـی فراوانـی فـەزڵو چاکەکانـی کـردوە فەرموویەتـی: ﴿ تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ ذِي ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ﴾ واتـە: مەزنـی بۆ ئـەو زاتەی کە خـاوەن گەورەییو بەخشـشو شـکۆی تەواوو ڕێزە بـۆ دۆسـتەکانی خۆی.

تەفسیری سوورەتی (الرحمن) تەواو بوو.


سورة الواقعة
بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
إِذَا وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ١ لَيۡسَ لِوَقۡعَتِهَا كَاذِبَةٌ ٢ خَافِضَةٞ رَّافِعَةٌ
٣ إِذَا رُجَّتِ ٱلۡأَرۡضُ رَجّٗا ٤ وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ بَسّٗا ٥ فَكَانَتۡ
هَبَآءٗ مُّنۢبَثّٗا ٦ وَكُنتُمۡ أَزۡوَٰجٗا ثَلَٰثَةٗ ٧ فَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ
مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ٨ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ
ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ٩ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ١٠ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ١١
فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ١٢ ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ١٣ وَقَلِيلٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ
١٤ عَلَىٰ سُرُرٖ مَّوۡضُونَةٖ ١٥ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيۡهَا مُتَقَٰبِلِينَ ١٦

## تەفسیری سووڕەتی (الواقعة)

## مەککیە (٩٦) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-١٢): ﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ١ لَيۡسَ لِوَقۡعَتِهَا كَاذِبَةٌ ٢ خَافِضَةٞ رَّافِعَةٌ ٣ إِذَا رُجَّتِ ٱلۡأَرۡضُ رَجّٗا ٤ وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ بَسّٗا ٥ فَكَانَتۡ هَبَآءٗ مُّنۢبَثّٗا ٦ وَكُنتُمۡ أَزۡوَٰجٗا ثَلَٰثَةٗ ٧ فَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ٨ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ٩ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ١٠ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ١١ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ١٢﴾

﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات بە ڕووداوی قیامەت کە هەر دەبێ ڕووبدات، کە ﴿لَيۡسَ لِوَقۡعَتِهَا كَاذِبَةٌ﴾ واتە: لە ڕوودانیدا هیچ گومانو دوو دڵیەک نیە، چونکە بەڵگە عەقڵیو نەقڵیەکان لەسەری کۆکن، وە حیکمەتی خواش بەڵگەیە لەسەری.

(٣): ﴿خَافِضَةٞ رَّافِعَةٌ﴾ واتە: نزم کەرەوەی کەسانێکە بۆ خواری خوارەوە، وە بەرزکەرەوەی کەسانێکە بۆ بەرزترینی پلەکان.

(٤): ﴿إِذَا رُجَّتِ ٱلۡأَرۡضُ رَجّٗا﴾ واتە: (کاتێ کە زەوی) هێنرایە جوڵەو شپرزەیی.

(٥): ﴿وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ بَسّٗا﴾ واتە: (وە چیاکان) ورد بوون.

(٦): ﴿فَكَانَتۡ هَبَآءٗ مُّنۢبَثّٗا﴾ (بوون بە تەپوو تۆزی پرشو بڵاو) زەوی بە جۆرێکی لێهات کێوی بەسەرەوە نەما ﴿فَيَذَرُهَا قَاعٗا صَفۡصَفٗا ١٠٦ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجٗا وَلَآ أَمۡتٗا ١٠٧﴾ طه، (واتە: ئنجا ڕێکو ساف بێ ئاوو گژووگیا دەیهێڵێتەوە * نابینی تیایدا هیچ جۆرە لاریو بەرزیو نزمیەک).

(٧): ﴿وَكُنتُمۡ﴾ ئەی خەڵکینە ﴿أَزۡوَٰجٗا ثَلَٰثَةٗ﴾ بوون بە سێ کۆمەڵو دەستەوە بە پێی کردەوە چاکو خراپەکانتان.

(٨): پاشـان دریـژەی داوە بـە حاڵی ئەو سـێ کۆمەڵـەو فەرموویەتی: ﴿ فَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴾ بـە مەزنداناندنـی پلەو پایـەو بارودۆخیان.
(٩): ﴿ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴾ واتـە: (یارانـی) لای چەپ ﴿ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴾ ترسـاندنێکە بـۆ بارودۆخیان.
(١٠): ﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ١٠ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴾ واتـە: پێشـکەوتووان لـە دونیادا بۆ لای خێـرو چاکـەکان هەر ئـەوان پێشـکەوتوون لـە دوارۆژدا بۆ چوونە ناو بەهەشـتەکان.
ئـا ئەوانـەی ئەمـە وەسـفیانە نزیکانی بارەگـای خوان لەنـاو بەهەشـتانی پڕ لـە نازونیعمەت، لـە بەرزتریـن پلـەو پایەکانـدان، لەنـاو باڵەخانـەو خانـووە بەرزەکانـدان کـە لە سـەرووی ئەوانـەوە هیـچ ماڵێکی دیکـە نیە.
(١٣): ئەوانـەی کـە باسـکران ﴿ ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾ واتـە: کۆمەڵێکـی زۆرن لـە پێشـکەوتووەکان لـەم ئوممەتـەو جگـە لەمانیـش.
(١٤): ﴿ وَقَلِيلٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ١٤ ﴾: (واتە: وە کەمێکن لە پاشـینیان لە ئوممەتی موحەممەدﷺ) ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر فـەزڵو چاکـەی کۆمەڵـی یەکەم لە سـەرەتای ئـەم ئوممەتە لەسـەر پاشـینیان، چونکـە نزیکان لـە پێشـینەکان زیاتر بوون لە پاشـینەکان.
(١٥): ﴿ عَلَىٰ سُرُرٖ مَّوۡضُونَةٖ ١٥ ﴾: نزیکـەکان تایبەتمەندترینـی نـاو خەڵکیـن، ﴿ عَلَىٰ سُرُرٖ مَّوۡضُونَةٖ ﴾ (واتـە: لەسـەر کورسـیو قەنەفـەی) چنـراون بە ئاڵتـونو زیوو مـرواریو گەوهـەرو جگـە لەوانیـش لـە ڕازاوەکان کـە هیـچ کـەس نایزانـێ جگـە لـە خوا.
(١٦): ﴿ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيۡهَا مُتَقَٰبِلِينَ ١٦ ﴾: ﴿ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيۡهَا ﴾ واتـە: پاڵدەدەنـەوە لەسـەر ئـەو قەنەفانە، دانیشـتنی تەواوو پڕ لـە دڵنیاییو حەوانـەوەو جێگیر بوون، ﴿ مُتَقَٰبِلِينَ ﴾ هـەر یەکەیـان ڕووی لـە بەرانبەرەکەیەتـی بـە دڵێکی پـاک، وە ئەدەبو ڕەوشـتی جوانو بەرانبەر بوونـی دڵەکان.

يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ
﴿١٨﴾ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ وَفَٰكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ
﴿٢٠﴾ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢١﴾ وَحُورٌ عِينٌ ﴿٢٢﴾ كَأَمْثَٰلِ ٱللُّؤْلُوِ
ٱلْمَكْنُونِ ﴿٢٣﴾ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا
وَلَا تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا ﴿٢٦﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ مَآ أَصْحَٰبُ
ٱلْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِى سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ
﴿٣٠﴾ وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾ وَفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ
﴿٣٣﴾ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُنَّ أَبْكَارًا
﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ لِّأَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾
وَثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٤٠﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ
﴿٤١﴾ فِى سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٍ
وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ ﴿٤٥﴾ وَكَانُوا۟
يُصِرُّونَ عَلَى ٱلْحِنثِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٤٦﴾ وَكَانُوا۟ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا
تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٤٧﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾ قُلْ إِنَّ
ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْءَاخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٥٠﴾

(١٧-١٨): ﴿ يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿١٨﴾ ﴾:

﴿ يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ ﴾ دەگەڕێن بەسەر خەڵكانی بەهەشتدا بۆ خزمەت كردنو جێبەجێكردنی پێیەكانیان، مندالآنێكی بچووك لەو پەڕی جوانیو پاكیدان، ﴿ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ ﴿٢٤﴾ ﴾الطور، (واتە: ئەڵێی مرواری ناو سەدەفن) داپۆشراون هیچ گۆڕانێكیان بەسەردا نایەت.

دروست كراون بۆ مانەوەو هەمیشەیی، نە پیر دەبنو نەدەگۆڕێنو نە تەمەنیان زیاد دەكات، بەسەریاندا دەگەڕێن بە پێدانی شەراب ﴿ بِأَكْوَابٍ ﴾ ئەو پەرداخەی كە هیچ گرێیەكی تێدانیە، ﴿ وَأَبَارِيقَ ﴾ ئەو قاپو قاچاخانەی كە گرێیان تێدایە ﴿ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴾ واتە: پەرداخی پڕ لە شەرابی بە لەززەت كە هیچ نەخۆشیەكی تێدانیە.

(١٩): ﴿ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ ﴾:

﴿ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا ﴾ واتە: تووشی سەرئێشە نابن وەك چۆن شەرابی دونیا خاوەنەكەی تووشی سەرئێشە دەكات. ﴿ وَلَا ﴾ ئەوان تیایدا ﴿ يُنزِفُونَ ﴾ واتە: عەقڵیان مەست نابێو بیرو هزریان ناڕوات، وەك چۆن لە شەرابی دونیادا هەیە، بە پوختی بێگومان هەموو ئەوانەی كە لە بەهەشتدان لە جۆرەها نازونیعمەت كە ڕەگەزەكەیان لە دونیادا هەیە، لە بەهەشتدا هیچ پێی نارەحەت نابن، وەك خوا لە سوورەتی (محمد)دا فەرموویەتی: ﴿ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ﴿١٥﴾ ﴾، (واتە: چەندەها ڕووباری تێدایە لە ئاوی سازگاری تامو بۆن نەگۆڕاو، وە چەندەها ڕووبار لە شیر كە تامی نەگۆڕاوە، وە چەندەها ڕووبار لە شەرابی نایابی بەلەزەتو خۆش بۆ بنۆشانی، وە چەندەها ڕووباریشی تێدایە لە هەنگوێنی پاڵفتە).

لێرەدا باسی شەرابی بەهەشتی كردووەو هەموو بەلاو نارەحەتیەكی لێ دوور خستۆتەوە،

کە لـە دونیادا (ئـەم جۆرە شـەرابە) بوونـی هەیە.
(٢٠): ﴿ وَفَٰكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾
واتـە: (میوەهاتیـش کـە خۆیـان هەڵیدەبژێـرن) چـۆن هەڵیدەبژێـرنو چاویـان حـەزی لێـدەکاتو نەفـسو دەروونیان ئارەزووی لێـدەکات، لە هەموو میوە خـۆشو بەلەززەتەکان، دەسـتەبەر بـووە، بۆیان بـە تەواوتریـنو چاکترین شـێوە.
(٢١): ﴿ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢١﴾ ﴾
واتـە: وە گۆشـتی هـەر باڵندەیەک کە حـەزی لێبکەن، لە هـەر ڕەگەزێ بێ ئەگـەر بیانەوێ بـە بـرژاوی دێتە بەردەسـتیان، یان بە شـێوەی لێنان یـان غەیری وانە.
(٢٢-٢٤): ﴿ وَحُورٌ عِينٌ ﴿٢٢﴾ كَأَمْثَٰلِ ٱللُّؤْلُؤِ ٱلْمَكْنُونِ ﴿٢٣﴾ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾:
﴿ وَحُورٌ عِينٌ ﴾ واتـە: حـۆری چاوگەشـیان بـۆ هەیـە (الحوراء) ئـەو کچەیە لـە چاوانیدا شـۆخو شـەنگی بەدی دەکـرێ، وە جوانـیو ڕازاوەیی (والعیـن) چاویان جـوانو گەورەیە، جوانـی چاویـش لەمێینەدا لـە گەورەترینی بەڵگەکانـە لەسـەر جوانیەکەی، ﴿ كَأَمْثَٰلِ ٱللُّؤْلُؤِ ٱلْمَكْنُونِ ﴾ واتـە: وەکـو مـرواری سـپی پـاکو پاڵفتـەو ڕازاوە وان، پارێزراو لـە چاوو باو خـۆر، کـە ڕەنگـی لـە جوانتریـن ڕەنگەکانە، هیـچ ناتـەواویو کـەمو کورِیەکـی تێدانیە بـە جـۆرێ لـە جـۆرەکان، بە هەمـان شـێوە حۆریـە چاوگەشـەکان هیـچ کەمو کـورِیو ناتەواویەکـی تێدانیـە، بەڵکو ئـەوان خاوەن تەواوترین وەسـفەکانو جوانترین سـیفاتەکانن. جـا هەر کەسـێ لێـی بڕوانـێ هیچ نابینـێ تەنهـا ڕاکێشـانی دڵو گەشـاوەیی نەبـێ، ئا ئەو نیعمەتـە ئامادەکراوە بۆیـان، ﴿ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ (واتە: لە پاداشـتی ئـەو کردەوانەی کـە ئەنجامیـان ئـەدا) جـا هـەر وەک چـۆن کردەوەکانیـان چاک بـوو خوا ﷻ پاداشـتی چاکـی دانـەوەو سـەرکەوتنی بە نسـیب کردن.
(٢٥): ﴿ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾ ﴾:واتـە: نابیسـتن لـە نـاو بەهەشـتدا نـە قسـەی بێهـودەو بـێ کەڵـک، وە نـە قسـەیەک هاوەڵەکـەی پـێ تاوانبـار بکات.
(٢٦): ﴿ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا ﴿٢٦﴾ ﴾: واتە: جگە لە قسەی چاک نەبێ، ئەوەش لەبەر ئەوەیەماڵی پاکو بێگەردەکانە، کەسی تێدانیە جگە لە خەڵکی پاک نەبێ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئاکاری جوانی خەڵکانی بەهەشت لە دواندنەکانیاندا لە نێوان یەکتر، ئەویش بریتیە لە چاکترینی قسەکانو باشترینیانە بۆ دڵەکان، وە پارێزراوترینیانە لە هەموو قسەیەکی بێهودەو گوناە، داوا دەکەین لەو زاتە بە فەزڵو چاکەی خۆی (بمانخاتە ئەو جێگایە).

(٢٧): پاشـان باسـی ئەوەی کـرد کە ئامادەی کـردوە بۆ یارانـی لای ڕاسـت، فەرموویەتی: ﴿ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡيَمِينِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡيَمِينِ ﴾ واتـە: پلـەو پایەیان بەرزەو بارودۆخیـان گەورەیە.

(٢٨): ﴿ فِي سِدۡرٖ مَّخۡضُودٖ ٢٨ ﴾ واتـە: (لـە ژێر سـێبەری داری سـیدری) بـێ درِکو لق و پـۆی بێ زیانـدان، دانراوە بۆ شـوێنی ئـەو بەرهەمە بەلەزەتـە، سـیدریش تایبەتمەندی هەیە، سـێبەری بەردەوام، حەوانەوەی جەسـتە لـە ژێریدا.

(٢٩): ﴿ وَطَلۡحٖ مَّنضُودٖ ٢٩ ﴾(والطلح): واتـە: مۆز ناسـراوە، ئەویش دارێکـی گەورەیە لە چۆڵەوانیدایـە، لقەکانـی هۆنراوەتەوە بە هێشـووی مـۆزی بە لەززەت.

(٣٠-٣١): ﴿ وَظِلّٖ مَّمۡدُودٖ ٣٠ وَمَآءٖ مَّسۡكُوبٖ ٣١ ﴾(واتـە: لـە ژێـر سـێبەری بـەردەوامو دوورو درێـژ دان)، واتـە: زۆر، لـە کانیـاوو دەریـا ڕۆیشـتوەکانو ئـاوە هەڵقـوڵاوەکان.

(٣٢-٣٣): ﴿ وَفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ ٣٢ لَّا مَقۡطُوعَةٖ وَلَا مَمۡنُوعَةٖ ٣٣ ﴾ واتـە: (وە میوەهاتـی زۆر) وەکـو میوەهاتـی دونیا نیە لـە کاتێ لـە کاتەکاندا تەواو دەبێو دەسـتکەوتنی قـورس دەبێ بـۆ ئەو کەسـەی دەیەوێـت، بەڵکو بە بـەردەوام بوونـی هەیە، وە دەسـت بۆ بردنـی نزیکە، بەنـدە بـە هـەر جۆرێک بێـت دەتوانی لێـی بخوات.

(٣٤): ﴿ وَفُرُشٖ مَّرۡفُوعَةٍ ٣٤ ﴾ واتـە: (ڕایەخێکـی) بەرز لە سـەرووی خێزان، ئـەو ڕایەخانە لـە حەریـرو زێـرو مروارین، وە ئەوەشـی کە کـەس نایزانی جگـە لە خوا.

(٣٥): ﴿ إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءٗ ٣٥ ﴾ واتـە: ئێمـە ئافرەتانـی بەهەشـتمان دروسـتکردوە بـە دروسـتکردنێ جگـە لـەو دروسـتکردنەی لە دونیـادا هەیە، دروسـتکردنێکی تـەواو قبووڵی لەناوچـوون نەکات.

(٣٦): ﴿ فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا ٣٦ ﴾ (واتە: گێڕاومانن بە کچانێک) بچووکو گەورە.

(٣٧): ﴿ عُرُبًا أَتۡرَابٗا ٣٧ ﴾: هەمـوو ئەوانـە حـۆری لە خۆ دەگـرێ لەگـەڵ ئافرەتانی دونیا، بێگومـان ئەم وەسـفە -بریتیە لە وەسـفی کچێتـی- پەیوەسـتە پێیانەوە لە هەمـوو کاتەکاندا، وەکـو چۆن خودیـان ﴿ عُرُبًا أَتۡرَابٗا ﴾ (واتـە: ئەویندارانـی هاوتەمەنانن) پەیوەسـتە پێیانەوە لە هەمـوو بارودۆخێکدا.

(والعـروب): بریتیـە لـە ئافرەتێکی خۆشویسـتراو لـە لای مێردەکەی، بە جوانی قسـەکانیو جوانـی شـێوازو دیمەنی، ئـەو ئافرەتە ئەگەر قسـە بکات عەقڵـەکان شـەیدا دەکات، گوێگر ئـاوات دەخـوازی قسـەکانی تـەواو نەبن، بـە تایبەت لـە کاتی گۆرانـی وتنیان بـەو دەنگە ناسـکو خۆشـانە، وە ئەگـەر تەماشـای ڕەوشـتی بـکات دڵـی پیاوەکـەی پـڕ دەکات لـە

خۆشـی، وە ئەگـەر لـە جێگایەکـەوە بچێتـە جێگایەکی تر، ئـەو جێگایە پڕ دەبێـت لە بۆنی خـۆش‌و ڕووناکـی، کـە ئەمـە نازو نوز کـردن لە کاتـی جـووت بوونیـش دا دەگرێتەوە.
(الأتـراب): ئـەو ئافرەتانەی لە یەک تەمەندان، سـی‌و سـێ سـاڵن، کـە ئەوپـەڕی گەنجێتیە، جـا ژنەکانیـان هاوسـەرەکانیان زۆر خـۆش دەوێ، هاوڕایانـن‌و جێگـای ڕەزامەنـدی مێردەکانیانـن، قـەت خەمبـار نابن‌و کەسـیش خەمبـار ناکەن، بەڵکـو ئەوانە دڵخۆشـکەرن‌و ئۆقـرەی چاوەکانـن‌و مایـەی ڕوونـی بینایین.
(٣٨): ﴿ لِّأَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ﴾: واتە: بۆ یارانی لای ڕاست ئامادە کراوەو ڕێکخراوە.
(٣٩-٤٠): ﴿ ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾: واتـە: ئـەم بەشـە لـە یارانـی لای ڕاسـت ژمارەیەکـی زۆرن لـە پێشـینان‌و ژمارەیەکـی زۆر لە پاشـینان.
(٤١-٤٨): ﴿ وَأَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِي سَمُومٖ وَحَمِيمٖ ﴿٤٢﴾ وَظِلّٖ مِّن يَحۡمُومٖ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٖ وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَبۡلَ ذَٰلِكَ مُتۡرَفِينَ ﴿٤٥﴾ وَكَانُواْ يُصِرُّونَ عَلَى ٱلۡحِنثِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٤٦﴾ وَكَانُواْ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ ﴿٤٧﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلۡأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾:
﴿ وَأَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴾ واتـە: مەبەسـت لـە هاوڕێیانـی لای چـەپ هاوەڵانـی ئاگـرن‌و ئەوانـەی کـردەوەی خراپیـان ئەنجامداوە.
(٤٢): خـوا ﷻ باسـی سـزای کـردوە بۆیـان کە بە حەقیقـەت پێی دەگـەن، جـا هەواڵیداوە کـە ئـەوان، ﴿ فِي سَمُومٖ ﴾ واتـە: بایەکی گـەرم لە گەرمـی دۆزەخەوە، نەفـس‌و دەروونیان دەبـات، وە تووشـی دڵەڕاوکێیـان دەکات بە سـەختترین شـێوە ﴿ وَحَمِيمٖ ﴾ واتـە: ئاوێکی گەرم هەناویـان دەپچڕێنێ.
(٤٣): ﴿ وَظِلّٖ مِّن يَحۡمُومٖ ﴾ واتـە: گـڕی ئاگـرێ تێکەڵـە لەگـەڵ دووکەڵـدا ﴿ لَّا بَارِدٖ وَلَا كَرِيمٍ ﴾ واتـە: نـە فێنکـی تێدایەو نـە کەڵکـی هەیە.
مەبەسـت ئەوەیـە لـەو شـوێنەدا خـەم‌و پـەژارەو دوودڵـی‌و شـەڕو نارەحەتیـەک هەیە کە هیـچ خێرێکـی تێدانیـە، چونکـە نەرێنـی کردنـی دژ چەسـپاندنی دژەکـەی دەگرێتەوە.
(٤٥): پاشـان باسـی ئـەو کردەوەیانـی کـردوە کـە گەیاندوونی بـەو سـزایە فەرموویەتی:
﴿ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَبۡلَ ذَٰلِكَ مُتۡرَفِينَ ﴾ واتـە: دونیـا سـەرقاڵی کـردن‌و کاروکردەوەیـان لـە پێناویـدا کـردو چێـژو لەزەتیـان لێوەرگـرت، بـێ ئومێـدی کردن لـە چاکەو کـردەوەی چـاک، جـا ئەمـە ئـەو خۆشـگوزەرانیەیە کە خـوا ﷻ سەرزەنشـتی کـردوە.
﴿ وَكَانُواْ يُصِرُّونَ عَلَى ٱلۡحِنثِ ٱلۡعَظِيمِ ﴾ واتـە: ئەوانـە گوناهی گەورەیان ئەنجـام دەداو داوای لێ

خۆشـبوونیان لێـی نەدەکـردو پەشـێمان نەدەبوونـەوە، بەڵکو بـەردەوام بوون لەسـەر ئەوەی پەروەردگاریـان تـوورە دەکات، پێشـیان خسـت بـۆ خۆیـان بـە گوناهانێکـی زۆری لـێ نەبووردە.

(٤٧-٤٨): ئـەوان نکوولیـان لـە زیندووبونـەوە دەکـردو بـە دووریـان دەزانـیو دەیانوت: ﴿ وَكَانُوا۟ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا ﴾ واتـە: چـۆن زیندوودەکرێینـەوە دوای مردنمـان، لـە کاتێکـدا لەتو پـەت بووینو بووین بە ئێسـکو پروسـکو خـۆڵ؟ ئەمەش مەحاڵـە ﴿ أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٤٧﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴾ (واتـە: ئێمـە زیندوودەکرێینـەوە * یاخـود باووباپیرانـی دێرینیشـمان). خـوا ﷻ وەڵامـی دانـەوەو فەرمووی:

(٤٩-٥٠): ﴿ قُلْ إِنَّ ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٥٠﴾ ﴾

واتـە: بێگومـان پێشـینی دروسـتکراوو پاشـینانیان هەموویـان خـوا زیندوویـان دەکاتەوەو ڕاپێچیـان دەکات بـەرەو مەیدانـی ڕۆژی دیاریکراو، خوا ﷻ ئەندازەی کـردوە بۆ بەندەکانی کاتـێ کـە دروسـتکراو کۆتایـی پێـدێو نامێنـێ، وە خـواش دەیـەوێ پاداشـتیان بداتەوە لەسـەر ئـەو کردەوانـەی کە لـە دونیـادا کردوویانە.

ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَآكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾
فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ
شُرْبَ ٱلْهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾ نَحْنُ خَلَقْنَٰكُمْ فَلَوْلَا
تُصَدِّقُونَ ﴿٥٧﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تُمْنُونَ ﴿٥٨﴾ ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ
ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٥٩﴾ نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٦٠﴾
عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ
عَلِمْتُمُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُولَىٰ فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ
﴿٦٣﴾ ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴿٦٤﴾ لَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَٰهُ
حُطَٰمًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ ﴿٦٥﴾ إِنَّا لَمُغْرَمُونَ ﴿٦٦﴾ بَلْ نَحْنُ
مَحْرُومُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ
مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا
تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ
شَجَرَتَهَآ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾ نَحْنُ جَعَلْنَٰهَا تَذْكِرَةً وَمَتَٰعًا
لِّلْمُقْوِينَ ﴿٧٣﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ۞ فَلَآ أُقْسِمُ
بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾

**(٥١-٥٣):** ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَآكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾ فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٥٣﴾﴾:

﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ﴾ (واتـە: پاشـان ئێـوە ئـەی ئەوانـەی گومـرا بـوون) لـە ڕێگـای هیدایـەتو ڕێنمایـی، شـوێنی ڕێگـای خـراپو لـە ناوچـوون کەوتـن، ﴿ٱلْمُكَذِّبُونَ﴾ (ئـەی ئەوانـەی) پێغەمبەران بـە درۆ دادەنێـن، وە ئـەوەش بـە درۆ دەزانـن کـە هێنابووی لـە حەقو ڕاسـتیو پەیمانو هەڕەشـە کـردن، ﴿لَآكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ﴾ (واتـە: لـە بەرووبوومـی درەختی زەقنەبـووت دەخـۆن) ئەویـش خراپترینو پیسـترینو بـۆن ناخۆشـترین درەختـە، وە دیمەنێکـی ناشـرینی هەیـە ﴿فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ﴾ (ورگیانـی لـێ پـڕ دەکـەن). ئـەوەی پێویسـت دەکات لێـی بخۆنـەوە بریتیـە لە برسـێتیەکی زۆر کـە لە نـاو جگەریاندا گـڕ دەگـرێ، وە خەریکـە دڵیـان بپچـڕێ، وە ئەم خواردنـەی کە دەیانـەوێ برسـێتیان پێ لابـبـات نـە تێریـان دەکاتو نە بێنیازیـان دەکات لە برسـێتی.

**(٥٥):** ﴿فَشَٰرِبُونَ شُرْبَ ٱلْهِيمِ ﴿٥٥﴾﴾: بـەڵام خواردنەوەیـان خراپتریـن خواردنەوەیە، ئەویش ئەوەیـە لەسـەر ئـەو خواردنـەدا ئاوێکـی گـەرم دەخۆنـەوە نـاو زگیـان دەکوڵێنـێ، وەکو خواردنـەوەی حوشـترێکی (الهیـم) واتە: ئـەو تینوێتیەی کە بە سـەختی تینـووی دەبێ، یان (هیـم) بـە مانای نەخۆشـیەک دێ تووشـی حوشـتر دەبێ هەرگیـز تێر ئـاو نابێ.

**(٥٦):** ﴿هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾﴾:

﴿هَٰذَا﴾ ئـەم خـواردنو خواردنەوەیـە ﴿نُزُلُهُمْ﴾ مێوانـداری خوانەناسـانە ﴿يَوْمَ ٱلدِّينِ﴾ (لـە ڕۆژی پاداشـت) ئەویش ئـەو میوانداریەیە کە پێشـیان خسـتووە بۆ خۆیـان، وە فەزڵو چاکەیـان داوە بەسـەر مێوانداری خواو دۆسـتانی.

خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْفِرْدَوْسِ نُزُلًا ﴿١٠٧﴾

خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبۡغُونَ عَنۡهَا حِوَلٗا ﴿١٠٨﴾ ﴾الكهف. (واتــە: بــە ڕاسـتی ئەوانــە کە ئیمــانو بڕوایان هێنــاوە وە کــردەوەی چاکیــان کــردوە بەهەشــتانی فیردەوس جێگــای میوانــداری ئەوانە * بــە بەردەوامــی تێیدا دەمێننــەوە داوای گواســتنەوە ناکــەن لەو بەهەشــتەدا).

(٥٧): ﴿ نَحۡنُ خَلَقۡنَٰكُمۡ فَلَوۡلَا تُصَدِّقُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾:

پاشــان باســی بەڵگەی عەقڵی کــردوە لەســەر زیندووبونــەوە، فەرموویەتی: ﴿ نَحۡنُ خَلَقۡنَٰكُمۡ فَلَوۡلَا تُصَدِّقُونَ ﴾ واتــە: ئێمــە ئێوەمان هێناوەتە بوون دوای ئەوەی شــتێکی باســکراو نەبوون، بەبــێ دەستەوســانیو مانــدوو بــوون، ئایــا ئەو زاتــەی بــە دەســەڵاتە لەســەر بەدیهێنانتان بە دەســەڵات نیە لە ســەر دروســت کردنەوەتــان جارێکــی دیکە؟ بەڵــێ بێگومان ئــەو زاتە بە دەســەڵاتە بەســەر هەموو شــتێکدا، ئا لەبــەر ئەمەیە سەرزەنشــتی کردوون لەســەر ئەوەی کە ڕۆژی دواییــان بەڕاســت دانەنــاوە، لــە کاتێکــدا لــەوە مەزنتــرو گەورەتر بە چــاوی خۆیان دەبینن.

(٥٨-٦٢): ﴿ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تُمۡنُونَ ﴿٥٨﴾ ءَأَنتُمۡ تَخۡلُقُونَهُۥٓ أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡخَٰلِقُونَ ﴿٥٩﴾ نَحۡنُ قَدَّرۡنَا بَيۡنَكُمُ ٱلۡمَوۡتَ وَمَا نَحۡنُ بِمَسۡبُوقِينَ ﴿٦٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمۡثَٰلَكُمۡ وَنُنشِئَكُمۡ فِي مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٦١﴾ وَلَقَدۡ عَلِمۡتُمُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأُولَىٰ فَلَوۡلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾:

واتــە: جــا پێــم بڵێــن ســەرەتای دروســتکردنتان لــەو مەنیــەی دەیڕێژنــە نــاو منداڵدانــەوە، ئایــا ئێــوە ئــەو مەنیەتــان دروســتکردوە، وە ئەوەیشــی لێــی دروســت دەبــێ؟ یان ئــەو خوا بەدیهێنــەرەی کــە دروســتی کردوە لــە ئێــوەدا حەزوو ئــارەزوو کەرەســتەی نێرو مــێ، وە ڕێنمایــی هــەر یــەک لەوانەی کردوە بــۆ ئەو جێگایە، خۆشــی خســتۆتە نێــوان ژنو مێردو بەزەیــیو ســۆزداری تێیانــدا دانــاوە، کە هــۆکاری بوونــی منداڵە.

(٦٢): ئــا لەبــەر ئەمەیــە گواســتنیەوە لەســەر بەڵگــە هێنانــەوە بــە بەدیهێنانی یەکەم لەســەر بەدیهێنانــی دوای مــردن، جــا فەرمــووی: ﴿ وَلَقَدۡ عَلِمۡتُمُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأُولَىٰ فَلَوۡلَا تَذَكَّرُونَ ﴾ ئــەو زاتــەی بــە توانایــە لەســەر بەدیهێنانتان بــە توانایە لەســەر دووبــارە دروســتکردنەوەتان.

(٦٣-٦٧): ﴿ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تَحۡرُثُونَ ﴿٦٣﴾ ءَأَنتُمۡ تَزۡرَعُونَهُۥٓ أَمۡ نَحۡنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴿٦٤﴾ لَوۡ نَشَآءُ لَجَعَلۡنَٰهُ حُطَٰمٗا فَظَلۡتُمۡ تَفَكَّهُونَ ﴿٦٥﴾ إِنَّا لَمُغۡرَمُونَ ﴿٦٦﴾ بَلۡ نَحۡنُ مَحۡرُومُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾:

﴿ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تَحۡرُثُونَ ﴾ ئەمــە منەتێکــە لەلایــەن خواوە بەســەر بەندەکانــی، بانگیان دەکات پێــی بــۆ لای یەکتاپەرســتیو بەندایەتــی کردنــیو گەڕانــەوە بــۆ لای، کاتــێ نازونیعمەتی کــردوە بەســەریاندا، بەوەی ئاســانی کردوە بۆیان لــە چاندنی کشــتوکاڵو بەرووبوومەکان،

جـا لەوانـە بژێـوی‌و ڕزق‌و ڕۆزی‌و میـوەکان دێنـە بەرهـەم، ئـەوە لـە پێویسـتی‌و بەرژەوەندیەکانیانـە، کە ناتوانن بیانژمێرن سـەرەڕای سـوپاس کردنیان‌و پێدانـی مافەکانیان، جـا چەسـپاندوونی بـە منەتـی خـۆی‌و فەرموویەتی:

(٦٤): ﴿ ءَأَنتُمۡ تَزۡرَعُونَهُۥٓ أَمۡ نَحۡنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴾ واتـە: ئایـا ئێـوە دەرتـان هێنـاوە ڕووەکانـێ لە زەویـدا؟ یـان ئێوە گەشـەتان پێ کـردوون؟ ئایـا ئێـوە گـوڵ‌و بەروومەکەتـان دەرهێناوە تـا بـووە بـە دانەوێڵەیەکی بـە بەرهـەم هاتـوو، وە بەرهەمێکـی پێگەیوو؟ یان خـوا تاک‌و تەنهایـە لـەوەدا، نازونیعمەتـی پێکردوە بەسـەرتاندا؟

ئێـوە ئەوپـەڕی ئەوەی دەیکـەن ئەوەیـە زەوی دەکێڵن‌و تۆمەکـەی تێ فرێ ئەدەن، پاشـان دوای ئـەوە نازانـن چی دەبـێ، لەوە زیاتر تواناو دەسـەڵاتتان نیـە، لەگەڵ ئـەوەدا، ئاگاداری کردوونەتـەوە کـە ئەو کێڵانـە لە بەردەم مەترسـیدایە ئەگـەر خـوا نەیهێڵێـت‌و نەیپارێزێ بۆتـان‌و بیـکات بە چێـڕو لەزەت تـا ماوەیەکی دیاری کـراو، جـا فەرموویەتی: ﴿ لَوۡ نَشَآءُ لَجَعَلۡنَٰهُ ﴾ واتـە: (ئەگـەر بمانویسـتبایە) ئەو کشـت‌و کاڵە چێنـراوەو ئەوەشـی تیایدایە لە بەرووبـووم (دەمانگێـڕا) ﴿ حُطَٰمٗا ﴾ واتـە: بە پووش‌و پەلاشـێکی بێ کەڵـک‌و بێ ڕزق‌و ڕۆزی ﴿ فَظَلۡتُمۡ ﴾ واتـە: ئیتـر واتان لێبێت بە هـۆی ئەوەی کردوومانە بـە پووش‌و پەلاش دوای ئـەوەی پێیەوە مانـدوو بوون‌و خەرجیەکـی زۆرتان تێیدا کـردوە ﴿ تَفَكَّهُونَ ﴾ واتە: پەشـیمان ببنەوەو حەسـرەت بخۆن لەوەی تووشـتان بووە، بەو شـێوەیە دڵخۆشـیتان نەمێنی‌و سـەرتان سـوور بمێنێ‌و بڵێن:

(٦٦): ﴿ إِنَّا لَمُغۡرَمُونَ ﴾ واتـە: بەڕاسـتی ئێمـە زەرەرمان کردو تووشـی بەڵایـەک بووین لە بیـخ دەریهێناین.

(٦٧): پاشـان دوای ئـەوە دەزانـن لـە کوێوە هاتوون، وە بـە چ هۆکارێک زیانتـان کرد، جا دەڵێـن ﴿ بَلۡ نَحۡنُ مَحۡرُومُونَ ﴾ (واتـە: بەڵکو بێبەش کرابووین.) ستایشـی خوا بکـەن کاتێ بۆی ناشـتوون، پاشـان هێشـتوویەتیەوەو تـەواوی کـردوە بۆتـان، هیـچ بەڵایەکی بـۆ نەناردووە کە بـە هۆیـەوە بێبەش بن لـە سـوودو خێرەکەی.

(٦٨-٧٠): ﴿ أَفَرَءَيۡتُمُ ٱلۡمَآءَ ٱلَّذِي تَشۡرَبُونَ ٦٨ ءَأَنتُمۡ أَنزَلۡتُمُوهُ مِنَ ٱلۡمُزۡنِ أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡمُنزِلُونَ ٦٩ لَوۡ نَشَآءُ جَعَلۡنَٰهُ أُجَاجٗا فَلَوۡلَا تَشۡكُرُونَ ٧٠ ﴾

واتـە: کاتـێ باسـی نیعمەتەکانـی خواردنـی کـردوە بەسـەر بەندەکانیـەوە، ئینجـا باسـی نیعمەتەکانـی خـۆی کـردوە لە ئاوی شـرین‌و سـازگار کە لێـی دەخۆنەوە، بێگومـان ئەگەر

خـوا سـووکـو ئاسـانی نەکردبایـە بۆتـان، ئـەوە ئێـوە هیـچ دەرچەیەکتـان نەدەبـوو پێی بگـەن، بێگومـان ئـەو زاتـەی بارانی دابەزانـدووە لەنـاو هەورەکانـەوە، تا بە هۆیـەوە ئاوێ ڕویشـتووی لـێ دەبێـت لەسـەر ڕووی زەوی‌و نـاو زەوی، وە هـەر لـەو بارانـەوە دەریـای هەڵقـوڵاو بـە خـوڕ دەبێ.

وە لـە نیعمەتەکانـی خـوا ئەوەیـە ئـاوی سـازگارو شـرین کـردوە، ئاسـانی کـردوە لەلای نەفسـەکانەوە، خـۆ ئەگەر بیویسـتایە دەیکرد بە سـوێرو تـاڵو ناخۆش بەلای نەفسـەکانەوە، هیـچ سـوودێکی لـێ وەرنەدەگیرا، ﴿ فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴾ (ئیتر بۆ سوپاسـی) خـوای گەورە ناکەن لەسـەر ئـەوەی نازونیعمەتی داوە بەسـەرتاندا.

(٧١-٧٤): ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَآ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾ نَحْنُ جَعَلْنَٰهَا تَذْكِرَةً وَمَتَٰعًا لِّلْمُقْوِينَ ﴿٧٣﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ﴾:

﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَآ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنشِـُٔونَ ﴾ ئەمـە نیعمەتێکـە دەچێتـە نـاو ئەو پێویسـتیانەوە کـە بەدیهێنراو بێنیـاز نیە لێی، بە ڕاسـتی خەڵکی پێویسـتیان پێیەتـی لـە زۆرێـک لـە کاروبارەکانیـانو ناتەواویەکانیـان، خـوا جێگیری کـردوون بەو ئاگـرەی بەدیهێنـاوە لـە دارەکانـدا، بەڵکو ئـەو خوایە ئـەو ئاگـرەی بەدیهێناوە لـە دارێکی سـەوز، ئنجـا بـووە بە ئاگـرێ بە قەدەر پێویسـتی بەنـدەکان دەگـرێ، جا ئەگـەر لێبوونەوە لـە کاروبارەکانیـان دەیکوژێننەوەو خامۆشـی دەکەن.

(٧٣): ﴿ نَحْنُ جَعَلْنَٰهَا تَذْكِرَةً ﴾ (واتـە: ئێمـە ئـەو ئاگرەمان کردوە بە هـۆی یادخەرەوەی) بەنـدەکان بـە نیعمەتـی پەوەردگاریـان، وە یادخەرەوەیەک بـە ئاگـری دۆزەخ کە خوا ﷻ ئامـادەی کـردوە بـۆ سـەرپێچیکاران، وە کردوویەتـی بە گورزێـک بەندەکانی پـێ دەبات بـۆ ماڵی پڕ لـە نـازو نیعمەتی.

﴿ وَمَتَٰعًا لِّلْمُقْوِينَ ﴾ واتـە: (وە هۆی سـوود وەرگرتن) بۆ گەشـتیاران، خوا ﷻ گەشـتیارانی تایبـەت کـردوە، چونکـە سـوودی گەشـتیار بـەو ئاگـرە مەزنتـرە لـە جگـە لە خـۆی، وە دەکـرێ هـۆکار لـەوەدا ئەوەبـێ چونکـە دونیـا هەمـووی ماڵی گەشـت کردنە، بەنـدە لەو کاتـەی لـە دایـک دەبێ گەشـتیارە بـۆ لای پەروەردگاری، ئـەم ئاگرەش خـوا کردوویەتی بـە چێژێـک بۆ گەشـتیاران لە ژیانـی دونیـادا، وە یادخەرەوەیـەک بۆیان بە ماڵـی دواڕۆژ.

(٧٤): کاتـێ کـە ڕوونـی کـردەوە لـە نازونیعمەتەکانـی کـە پێویسـت دەکات بەندەکانی سـوپاسو ستایشـی بکـەنو بیپەرسـتن، فەرمانی کرد بـە یادکردنـەوەو بە پـاک ڕاگرتنی،

خـوا سـووکـو ئاسـانی نەکردبایـە بۆتـان، ئـەوە ئێـوە هیـچ دەرچەیەکتـان نەدەبـوو پێی بگـەن، بێگومـان ئـەو زاتـەی بارانی دابەزانـدووە لەنـاو هەورەکانـەوە، تا بە هۆیـەوە ئاوێ ڕویشـتووی لـێ دەبێـت لەسـەر ڕووی زەویو نـاو زەوی، وە هـەر لـەو بارانـەوە دەریـای هەڵقـوڵاو بـە خـوڕ دەبێ.

وە لـە نیعمەتەکانـی خـوا ئەوەیـە ئـاوی سـازگارو شـرین کـردوە، ئاسـانی کـردوە لەلای نەفسـەکانەوە، خـۆ ئەگەر بیویسـتایە دەیکرد بە سـوێرو تـاڵو ناخۆش بەلای نەفسـەکانەوە، هیـچ سـوودێکی لـێ وەرنەدەگیرا، ﴿ فَلَوۡلَا تَشۡكُرُونَ ﴾ (ئیتر بۆ سوپاسـی) خـوای گەورە ناکەن لەسـەر ئـەوەی نازونیعمەتی داوە بەسـەرتاندا.

(٧١-٧٤): ﴿ أَفَرَءَيۡتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمۡ أَنشَأۡتُمۡ شَجَرَتَهَآ أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾ نَحۡنُ جَعَلۡنَٰهَا تَذۡكِرَةٗ وَمَتَٰعٗا لِّلۡمُقۡوِينَ ﴿٧٣﴾ فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ﴾:

﴿ أَفَرَءَيۡتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمۡ أَنشَأۡتُمۡ شَجَرَتَهَآ أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡمُنشِـُٔونَ ﴾ ئەمـە نیعمەتێکـە دەچێتـە نـاو ئەو پێویسـتیانەوە کـە بەدیهێنراو بێنیـاز نیە لێی، بە ڕاسـتی خەڵکی پێویسـتیان پێیەتـی لـە زۆرێـک لـە کاروبارەکانیـانو ناتەواویەکانیـان، خـوا جێگیری کـردوون بەو ئاگـرەی بەدیهێنـاوە لـە دارەکانـدا، بەڵکو ئـەو خوایە ئـەو ئاگـرەی بەدیهێناوە لـە دارێکی سـەوز، ئنجـا بـووە بە ئاگـرێ بە قەدەر پێویسـتی بەنـدەکان دەگـرێ، جا ئەگـەر لێبوونەوە لـە کاروبارەکانیـان دەیکوژێننەوەو خامۆشـی دەکەن.

(٧٣): ﴿ نَحۡنُ جَعَلۡنَٰهَا تَذۡكِرَةٗ ﴾ (واتـە: ئێمـە ئـەو ئاگرەمان کردوە بە هـۆی یادخەرەوەی) بەنـدەکان بـە نیعمەتـی پەوەردگاریـان، وە یادخەرەوەیەک بـە ئاگـری دۆزەخ کە خوا ﷻ ئامـادەی کـردوە بـۆ سـەرپێچیکاران، وە کردوویەتـی بە گورزێـک بەندەکانی پـێ دەبات بـۆ ماڵی پڕ لـە نـازو نیعمەتی.

﴿ وَمَتَٰعٗا لِّلۡمُقۡوِينَ ﴾ واتـە: (وە هۆی سـوود وەرگرتن) بۆ گەشـتیاران، خوا ﷻ گەشـتیارانی تایبـەت کـردوە، چونکـە سـوودی گەشـتیار بـەو ئاگـرە مەزنتـرە لـە جگـە لە خـۆی، وە دەکـرێ هـۆکار لـەوەدا ئەوەبـێ چونکـە دونیـا هەمـووی ماڵی گەشـت کردنە، بەنـدە لەو کاتـەی لـە دایـک دەبێ گەشـتیارە بـۆ لای پەروەردگاری، ئـەم ئاگرەش خـوا کردوویەتی بـە چێژێـک بۆ گەشـتیاران لە ژیانـی دونیـادا، وە یادخەرەوەیـەک بۆیان بە ماڵـی دوارۆژ.

(٧٤): کاتـێ کـە ڕوونـی کـردەوە لـە نازونیعمەتەکانـی کـە پێویسـت دەکات بەندەکانی سـوپاسو ستایشـی بکـەنو بیپەرسـتن، فەرمانی کرد بـە یادکردنـەوەو بە پـاک ڕاگرتنی،

جـا فەرمـووی: ﴿ فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ﴾ واتـە: پەروەردگـاری مەزنـت بـە پاک ڕابگـرە، ئـەو زاتـەی نـاو سـیفەتەکانی تەواون، خـاوەن چاکـەی زۆرو بـێ پایانە.
وە ستایشـی بکـە بەدڵو زمانو ئەندامانی جەسـتەت، چونکە شـیاوی ئەوەیە سوپاسـگوزاری بکـرێو بێبڕوایـی پـێ نەکـرێ، وە یـادی بکـرێو لـە بیـر نەکـرێ، گوێڕایەڵـی بکرێو سـەرپێچی نەکرێ.

(٧٥-٨٧): ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٞ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ﴿٧٧﴾ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ أَفَبِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَنتُم مُّدۡهِنُونَ ﴿٨١﴾ وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَوۡلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلۡحُلۡقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمۡ حِينَئِذٖ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُبۡصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوۡلَآ إِن كُنتُمۡ غَيۡرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرۡجِعُونَهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾:

﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴾ خـوا ﷻ سـوێندی خـواردوە بـە ئەسـتێرەکانو شـوێنی هەڵهاتنیـان، واتـە: ئـاوا بوونیان لـە خۆرئاوایانـەوە، وە ئـەو شتانەیشـی ڕوودەدات لە لایەن خـواوە لـەو کاتانەدا، لـەو ڕووداوانەی کە بەڵگەن لەسـەر مەزنیو گەورەییو یەکتاپەرسـتی ئـەو زاتە.

پاشـان ئەو سـوێند پێخـوراوەی بە مـەزن دانـاوەو فەرموویەتـی: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٞ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ﴾ (واتـە: بەڕاسـتی ئـەم سـوێندە ئەگەر بزانـن سـوێندێکی زۆر گەورەیـە)، لەبەر ئەوە سـوێندێکی گەورەیە چونکـە لە ئەسـتێرەکانو ڕێکردنیانو دیارنەمانیـان لە خۆرئاوای خۆیـان، بەڵگـەو نیشـانەیەکی زۆر هەیـە کورت هەڵناهێنرێ، پاشـان سـوێند لەسـەر خوراو چەسـپاندنی قورئانـە، کە بێگومـان حەقەو هیچ گومـانو دوودڵیەکی تێدانیـە. وە ئەو قورئانە بـەرزو بەڕێـزە خێـرو زانسـتێکی زۆری لەخۆگرتـووە، جـا هەموو خێـرو زانسـتێ ئەوە لە قورئانـەوە سـەرچاوەی گرتوەو لەوێـوە هەڵێنجراوە.

إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ فِى كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا
ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ أَفَبِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ
أَنتُم مُّدْهِنُونَ ﴿٨١﴾ وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَوْلَآ
إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ
إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ
﴿٨٦﴾ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ
﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنْ أَصْحَٰبِ
ٱلْيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَٰمٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩١﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ
ٱلْمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٩٣﴾ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ
﴿٩٤﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٩٥﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٩٦﴾

(٧٨): ﴿ فِى كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴾ واتە: (لەناو کتێبێکی) شاراوەدایە لە پێش چاوی دروستکراو، ئەم کتێبە شاراوەیە بریتیە لە (اللوح المحفوظ) واتە: بێگومان ئەم قورئانە لە (اللوح المحفوظ)دا نووسراوە، مەزنە لەلای خواو فریشتە بەرزو بەڕێزەکان.

پێدەچێ مەبەست لە کتێبی شاراوە ئەو کتێبە بێ کە بە دەستی فریشتەکانەوەیە، ئەوانەی خوا دایاندەبەزێنێ بە ناردنی وەحیەکەی، بێگومان مەبەست لەوەدا ئەو قورئانە شاراوەیە لە شەیتانەکان، هیچ توانایەکیان نیە بەسەریدا لە گۆڕینی، وە نە لە زیادەو ناتەواوی‌و گوێ هەڵخستن بۆ بردنی هەواڵەکانی.

(٧٩): ﴿ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴾ واتە: کەس دەست لە قورئان نەدات جگە لە فریشتە بەڕێزەکان ئەوانەی خوا پاکی کردوونەتەوە لە بەڵاو تاوان‌و ناتەواوی.

جا ئەگەر جگە لە فریشتە پاکەکان کەس دەستی لێنادات، وە پیس‌و شەیتانەکان هیچ توانایەکیان نیە دەستی لێبدەن، دەقەکە دەبێتە بەڵگە بە بێدارکردنەوە لەسەر ئەوەی کە دروست نیە دەست بدرێ لە قورئان جگە لە کەسی پاک، دەقەکە هەواڵە (خبر) بە واتای قەدەغەکردن (النهي) هاتووە، واتە: نابێت جگە لە پاکان کەس دەست لە قورئان بدات.

(٨٠): ﴿ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ واتە: بێگومان ئەم قورئانە وەسفکراوە بەو سیفاتە مەزنانە، ئەویش نێردراوەتە خوارەوە لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە، ئەو زاتەی بەندەکانی پەروەردە دەکات بە نیعمەتە دینی‌و دونیاییەکان.

لە گەورەترین پەروەردە کە بەندەکانی پێ پەروەردە کردبێ، دابەزاندنی ئەم قورئانەیە کە بەرژەوەندی هەردوو دونیای تێدایە، وە بە هۆیەوە خوا میهرەبانی داباراندووە بەسەر بەندەکانی کە هەرگیز ناتوانن سوپاسگوزاری بکەن.

(٨١): وە ئەوەی پێویستە لەسەریان پێی هەستن‌و ئاشکرای بکەن‌و بانگەشەی بۆ بکەن‌و رایبگەیەنن، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ أَفَبِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَنتُم مُّدْهِنُونَ ﴾ واتە: دەی ئایا ئێوە بەم کتێبە مەزنەو یادە پڕ لە حیکمەتە (تدهنون) واتە: ئێوە دەیشارنەوە لە ترسی خەڵکی‌و شورەیی نەنگی‌و زمانیان؟

ئەمە نابێ‌و ناگونجێ، بەڵکو ئەوە گونجاوە قسەیەک بشاردرێتەوە کە خاوەنەکەی متمانەی پێ نەبێت، بەڵام قورئانی پیرۆز ئەو ڕاستیەیە هەر کەسێک بیەوێ سەربکەوێ بەسەریدا شکست دەخوا، وە هەر هێزێک پەلاماری بدات ئەوە بێگومان هەر قورئان زاڵ دەبێ بەسەریدا، ئەو قورئانە نە فێڵی تێدا دەکرێ‌و نە دەشاردرێتەوە، بەڵکو رادەگەیەنرێ‌و ئاشکرا دەکرێ.

(٨٢): ﴿ وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ﴾ واتە: ئێوە لە بەرانبەر منەتی خوا بەسەرتانەوە بە ڕزق‌و ڕۆزی بێبڕوایی دەکەن بە نیعمەتەکانی، جا دەڵێن: بارانمان بۆ باری بە بۆنەی فلان کەس‌و فلان کەسەوە، وە نیعمەتەکان دەدەنە پاڵ لای غەیری ئەو زاتەی پێی بەخشیون.

جا بۆچی سوپاسگوزاری خوا نەبوون لەسەر چاکەکانی، کاتێ خوا دایبەزاند بۆتان تا فەزڵ‌و چاکەی خۆیتان بۆ زیاد بکات، چونکە بێگومان بەدرۆدانان‌و بێبڕوایی پاڵنەرن بۆ بەرز کردنەوەی نیعمەتەکان‌و پێویستبوونی تۆڵە.

﴿ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴾ واتە: دەی بۆچی کاتێ گیان دەگاتە گەروو، وە ئێوە لەو کاتەدا تەماشای ئامادەبوو دەکەن، لەو کاتەدا ئێمە لە ئێوە نزیکترین لێیەوە بە زانستمان، وە فریشتەکانیشمان، بەڵام ئێوە نابینن.

(٨٦): ﴿ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴾ واتە: دەی بۆچی ئەگەر ئێوە پێتان وایە ئێوە زیندوو ناکرێنەوەو لێپرسینەوەتان لێ ناکرێ‌و پاداشت نادرێنەوە، ڕووحەکانتان دەگەڕاندەوە بۆ ناو جەستەکانیان ﴿ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ وە ئێوە دانی پێدادەنێن کە دەستەوسانن لە گەڕانەوەی ڕووحەکان بۆ شوێنی خۆیان، جا ئەو کاتە یان ئەوەیە دان بەو ڕاستیەدا دەنێن کە موحەممەد ﷺ هێناویەتی، یان ئەوەیە عینادی‌و نکوڵی دەکەن، وە حاڵ‌و دەرەنجامی خۆتان دەزانن.

(٨٨-٩٦): ﴿ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ

مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَٰمٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩١﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٩٣﴾ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ ﴿٩٤﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٩٥﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٩٦﴾ ﴾:

خـوا ﷻ باسـی بارودۆخـی ئـەو سـێ دەسـتەیەی کـردوە: نزیـکانو یارانـی لای ڕاسـتو بەدرۆدانـەرە گومـڕاکان، لـە سـەرەتای ئـەم سـوورەتەدا، لـە ماڵی مانـەوەدا، لـە کۆتایی دا باسـی بارودۆخیانـی کردوە لـە کاتی سـەرەمەرگدا، جا فەرموویەتـی: ﴿ فَأَمَّآ إِن كَانَ ﴾ (جا ئەگـەر) مـردوو ﴿ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴾ (لـە نزیک خـراوان بێ لە خـوا) ئەوانیش ئەو کەسـانەن واجـبو سـوننەتەکانیان بەجێهێناوەو وازیـان لە قەدەغە کـراوەکانو ناپەسـندەکان هێناوە. (٨٩): ﴿ فَرَوْحٌ ﴾ واتە: حەسـانەوەو دڵنیایيو خۆشـی دڵو ڕووحیان بۆ هەیە، ﴿ وَرَيْحَانٌ ﴾ ناوێکـی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو لەزەتێکی جەسـتەیی، لە جۆرەها خـواردنو خواردنەوەکانو جگـە لەوانیـش، وتـراوە: ڕەیحـان: بریتیە لە پـاکو بێگەردی ناسـراو، جا ئـەو کات دەبێتە دەربڕینـێ بـە جۆری شـتێ لە ڕەگـەزی خـۆی، ﴿ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴾ واتە: کۆکـەرەوەی ئەو دووانەیـە پێکـەوە، تیایدایە چـاو نەیبینیوە، گوێ نەیبیسـتووە، بەختەرەش بەسـەر دڵی هیچ کەسـێکدا نەهاتـووە، مـژدە دەدرێ بـە نزیکەکان لـە کاتی سـەرەمەرگدا، بـەم مژدەیە کە خەریکـە ڕووحەکان لە خۆشـیدا دەفرن.

وەک خـوا فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴿٣٢﴾ ﴾ فصلت.

(واتـە: بەڕاسـتی ئەوانـەی وتیـان: خـوا پەروەردگارمانەو لە پاشـان ڕاسـت (لەسـەر ئاین) بـەردەوام بـوون * فریشـتەکان پۆل پۆل دێنـە لایان (پێیـان دەڵێن) کە مەترسـنو خەفەت مەخـۆن، وە مژدەبـێ لێتـان بـەو بەهەشـتەی کـە بەڵێنتـان پـێ درابـوو * ئێمـە لـە ژیانی دونیـاو لـەڕۆژی دوایـیدا پشـتیوانی ئێوەین، وە لـە هەرچی داوا بکـەن لەوێدا لـە خزمەتتان دایـە * ڕێزلێنـانو میوانداریـە لە لایەن خـوای لێبـووردەی میهرەبانەوە). خـوای بەرزو مەزن فەرمایشـتەکەی خـۆی ڕاڤە کردوەو فەرموویەتـی: ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ﴿٦٤﴾ ﴾ یونـس. (واتـە: هـەر بۆ ئەوانـە مزگێنی لە ژیانـی دونیاداو لە دواڕۆژیشـدا) بەڕاسـتی ئـەم مژدەیـەی کە باسـکراوە مژدەیـە لە ژیانـی دونیادا.

(٩٠): ﴿ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴾ (وە ئەگەر لە هاوەڵانی دەستی ڕاست بێ) ئەوانەن ئەرکەکانیان بەجێهێناوەو دوور کەوتوونەتەوە لە قەدەغەکراوەکان، ئەگەرچی هەندێ کەمو کورتیشیان هەبێ لە هەندێ لە مافەکاندا، کە زیانی بەیەکتاپەرستیو بڕواکەیان نەهێنابێت، جا بە کەسێکیان دەوترێ، ﴿ فَسَلَٰمٞ لَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴾ واتە: سڵاو بۆ تۆ لە برایانی لای ڕاستت، واتە: سڵاوی لێدەکەن کاتێ دەگاتە لایان، یان پێی دەوترێ: سەلامەتی بۆ تۆ لەو بەڵاو نارەحەتیو سزایانە، چونکە تۆ لە یارانی لای ڕاستی، لەوانەی کە پارێزراو بوون لە گوناهە گەورەکان.

(٩٢): ﴿ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴾ واتە: ئەوانەی ڕاستیان بەدرۆداناو گومڕا بوونو ڕێنماییان وەرنەگرت.

(٩٣): ﴿ فَنُزُلٞ مِّنۡ حَمِيمٖ ﴿٩٣﴾ وَتَصۡلِيَةُ جَحِيمٍ ﴾ واتە: میوانداریان ئەو ڕۆژەی دەگەنە لای پەروەردگاریان چوونە ناو دۆزەخە دەوریان دەداتو دەگا بە دڵیان، وە ئەگەر فریاکەوتن بکەن لە سەختی تینوێتی، ﴿ يُغَاثُواْ بِمَآءٖ كَٱلۡمُهۡلِ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَۚ بِئۡسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا ﴿٢٩﴾ ﴾الكهف، (واتە: ئاوێکیان بۆ دەهێنرێ وەک مسی تواوە ڕوودەمو چاوەکان دەبرژێنێ ئای چ خواردنەوەیەکی پیسو خراپە، وە ئای چ شوێنو جێگەیەکی خراپە).

(٩٥): بە ڕاستی ئەوەی خوا ﷻ لەم سوورەتەدا باسی کردوە لە پاداشت دانەوەی بەندەکان بە پێی کردەوەکانیان چاک بێ یان خراپ، وە وردەکاری ئەوانەش، ﴿ لَهُوَ حَقُّ ٱلۡيَقِينِ ﴾ واتە: کە هیچ گومانو دوودڵیەکی تێدانیە، بەڵکو ڕاستیەکی جێگیرە کە هەر دەبێ ڕووبدات.

بێگومان خوا نیشانی بەندەکانی داوە بەڵگە یەکلاکەرەوەکان لەسەر ئەوانە، تەنانەت وای لێهاتووە لەلای خاوەن دڵو ژیرەکان وەکو ئەوە وایە چەشتبێتیانو حەقیقەتەکەیان بە چاو بینیبێ، ستایشی خوایان کردوە لەسەر ئەوەی تایبەتمەندی کردوون پێی، لەم نیعمەتە مەزنو خەڵاتە گەورەیە.

لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ﴾ پاکی بۆ پەروەردگاری مەزنمان، وە بەرزو بڵندیو بێگەردی بۆ ئەو زاتە، لەوەی ستەمکارانو نکوڵیکاران دەربارەی دەیڵێن. ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان، ستایشێکی زۆرو پاکو گەورە.

تەفسیری سوورەتی (الواقعة) تەواو بوو.




## تەفسیری سوورەتی (الحديد)

## مەدەنییە (٢٩) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٦): ﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١﴾ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢﴾ هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْءَاخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣﴾ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤﴾ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥﴾ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيْلِ وَهُوَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٦﴾ ﴾

﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی مەزنیو گەورەییو فراوانی دەسەڵاتی، بێگومان هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە لە گیاندارە قسەکەرەکانو بێدەنگەکانو جگە لەوانیش، ستایشی پەروەردگاریان دەکەنو بە پاکو بێگەرد ڕایدەگرن لەوەی شیاوی مەزنی ئەو زاتە نییە، هەموویان گوێڕایەڵی پەروەردگاریانن‌و ملکەچی دەسەڵاتی ئەون، وە شوێنەواری حیکمەتی ئەو زاتە لەناویاندا دەرکەوتووە، لەبەر ئەمەیە فەرمویەتی: ﴿ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ (وە هەر ئەو زاتە باڵادەستی کاربەجێیە) جا ئەمە تیایدایە دەرکەوتنی پێویستی هەموو بەدیهێنراوەکانی جیهانی سەرەوەو خوارەوە بە پەروەردگاریان لە هەموو ڕوویەکەوە، وە پشتگیری دەسەڵاتیو زاڵبوونی بەسەر هەموو شتەکانداو گشتگیری حیکمەتی لە دروستکردنیو کاروبارەکانیدا.

(٢): پاشان هەواڵیداوە دەربارەی گشتگیری موڵکو دەسەڵاتیو فەرموویەتی: ﴿ لَهُۥ مُلْكُ

ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ ﴾ (واتــە: هــەر بۆ ئەوە دەســەڵاتو خاوەنێتی ئاســمانەکانو زەوی دەژێنــێو دەمرێنــێ)، واتــە: خــوا ﷻ دروســتکەری ئەوانەیــە، ڕزقو ڕۆزیــدەرو بەڕێوەبەریانــە بــە توانــاو دەســەڵاتی ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴾ (وە ئــەو زاتە دەســەڵاتی بەســەر هەمــوو شــتێکدا هەیە).

(٣): ﴿ هُوَ ٱلۡأَوَّلُ ﴾ کــە پێــش ئــەو هیچ شــتێکی تــر نەبــووە ﴿ وَٱلۡأٓخِرُ ﴾ دوای ئەو هیچ شــتێکی تر نەبووە ﴿ وَٱلظَّٰهِرُ ﴾ لە ســەرووی ئــەوەوە هیچ شــتێکی دیکە نیە ﴿ وَٱلۡبَاطِنُۖ ﴾ لــە خــواری ئــەوەوە هیچی دیکە نیــە ﴿ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴾ واتــە: زانســتی دەوری دیارو نادیــارەکانو نهێنیەکانو ســەرجەم کاروبارەکانی ڕابــردوو داهاتووی داوە.

هُوَ ٱلَّذِی خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِی سِتَّةِ أَیَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ
عَلَى ٱلْعَرْشِ یَعْلَمُ مَا یَلِجُ فِی ٱلْأَرْضِ وَمَا یَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا یَنزِلُ مِنَ
ٱلسَّمَآءِ وَمَا یَعْرُجُ فِیهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَیْنَ مَا كُنتُمْ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ
بَصِیرٌ ﴿٤﴾ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ
﴿٥﴾ یُولِجُ ٱلَّیْلَ فِی ٱلنَّهَارِ وَیُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِی ٱلَّیْلِ وَهُوَ عَلِیمٌۢ بِذَاتِ
ٱلصُّدُورِ ﴿٦﴾ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُوا۟ مِمَّا جَعَلَكُم
مُّسْتَخْلَفِینَ فِیهِ فَٱلَّذِینَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَأَنفَقُوا۟ لَهُمْ أَجْرٌ كَبِیرٌ ﴿٧﴾
وَمَا لَكُمْ لَا تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلرَّسُولُ یَدْعُوكُمْ لِتُؤْمِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ وَقَدْ
أَخَذَ مِیثَٰقَكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِینَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِی یُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبْدِهِۦٓ
ءَایَٰتٍۭ بَیِّنَٰتٍ لِّیُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمْ
لَرَءُوفٌ رَّحِیمٌ ﴿٩﴾ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا۟ فِی سَبِیلِ ٱللَّهِ وَلِلَّهِ مِیرَٰثُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَا یَسْتَوِی مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ
وَقَٰتَلَ أُو۟لَٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِینَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَٰتَلُوا۟
وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِیرٌ ﴿١٠﴾ مَّن ذَا
ٱلَّذِی یُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَیُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ وَلَهُۥٓ أَجْرٌ كَرِیمٌ ﴿١١﴾

(٤): ﴿هُوَ ٱلَّذِی خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِی سِتَّةِ أَیَّامٍ﴾ بەکەمینیـان ڕۆژی یەکشـەممە، دواهەمینیـان ڕۆژی جومعـە ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ ڕۆیشـتنێک شـیاو بـێ بـە گەورەیـی ئـەو زاتـە، لـە سـەرووی هەمـوو دروسـت کراوەکانـە، ﴿یَعْلَمُ مَا یَلِجُ فِی ٱلْأَرْضِ﴾ لـە دانەوێڵـەو گیانـدارو بـارانو جگـە لەوانیـش ﴿وَمَا یَخْرُجُ مِنْهَا﴾ لـە ڕووەکـو دارودرەخـتو گیانـدارانو جگە لەوانیـش ﴿وَمَا یَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ لـە فریشـتەکانو قـەزاو قـەدەرو ڕزقو ڕۆزیـەکان ﴿وَمَا یَعْرُجُ فِیهَا﴾ لـە فریشـتەکانو ڕووحەکانو دوعاو پاڕانەوەو کردەوەکانو جگـە لەوانیش ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَیْنَ مَا كُنتُمْ﴾ (واتـە: وە لـە هـەر کوێ بـن خـوا لەگەڵتانـە) وەک خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿مَا یَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَیْنَ مَا كَانُوا۟ ﴿٧﴾﴾ المجادلة، (واتـە: چپـەی هیـچ سـێ کەسـێک نیە کە خـوا چوارەمیـان نەبێـت، وە چپەی هیـچ پێنج کەسـێک نیە کە ئـەو شەشـەمیان نەبێت، وە نـە کەمتـر لـەو ژمـارە نە زۆرتـر نیە مەگـەر خوایـان لەگەڵدایـە لەهـەر جێگایەکـدا بن). ئـەم لەگەڵـدا بوونـە لەگەڵـدا بوونی زانسـتو ئاگـادار بوونـە، ئا لەبـەر ئەمەیە هەڕەشـەی کـردوەو پەیمانیـداوە بە پاداشـتیَ کردەوەکان، بـەوەی کە فەرموویەتـی: ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِیرٌ﴾ ئـەو زاتـە بینایـە بـەوەی ئەنجامـی دەدەن لـە کـردەوەکان، لـە چاکـەو خراپـە، پاداشـتتان دەداتـەوە لەسـەریو بۆتـان دەپارێزێ.

(٥): ﴿لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ (واتە: خاوەنداریێتی ئاسمانەکانو زەوی) بە موڵکو دروستکردنو بەندەکانەوە (هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە) هەڵیان دەسوڕێنێ چۆن بیەوێ لە فەرمانە قەدەریەکان (قەزاو قەدەر)و شەرعیەکان هەڵقوڵاوە لە حیکمەتی پەروەردگاریێتی ئەو زاتە، ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ﴾ (واتە: وە هەموو کارێک هەر بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە).

(٦): ﴿ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ ﴾ واتە: شەو دەبات بەناو ڕۆژدا تا شەو بە تاریکی خۆی دایان دەپۆشی، ئنجا پشوو ئەدەنو دەحەوێنەوە. پاشان ڕۆژ دەخات بەناو شەودا ئەوەی تاریکیە لەسەر زەوی لایدەباتو جیهان ڕووناک دەکاتەوە، جا بەندەکان دەکەونە جوڵەو هەڵدەستن بۆ بەجێهێنانی بەرژەوەندیو کارو کەسابەتیان.

بە بەردەوام خوا شەو دەهێنێ بەسەر ڕۆژداو ڕۆژ دەهێنی بەسەر شەودا، وە دەیگێڕێ لە نێوانیاندا بە زیادەو کەمیو درێژیو کورتی تا وەرزو کاتەکان بەو شێوەیە ڕێک بن، وە بەرژەوەندیەکان بە هۆیانەوە دەستەبەر ببن، گەورەییو مەزنیو پیرۆزی بۆ پەروەردگاری جیهانیان، وە بەرزی بۆ ئەو زاتە بەرێزو بەخشندەیە کە بەخشیویەتی بەسەر بەندەکانیدا بە نیعمەتە ئاشکراکانو نهێنیەکان، ﴿ وَهُوَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾ بەوەی لە ناو دڵی جیهانیان دایە، هەر کەسێ شایستەی ئەوەبێ خوا سەرکەوتووی دەکات، وە هەرکەسێکیش شایستەی ئەوە نەبێ خوا ڕێنمایی ناکات.

(٧-١١): ﴿ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِۖ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَأَنفَقُواْ
لَهُمۡ أَجۡرٞ كَبِيرٞ (٧) وَمَا لَكُمۡ لَا تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ لِتُؤۡمِنُواْ بِرَبِّكُمۡ وَقَدۡ أَخَذَ مِيثَٰقَكُمۡ إِن
كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ (٨) هُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦٓ ءَايَٰتِۢ بَيِّنَٰتٖ لِّيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَإِنَّ
ٱللَّهَ بِكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ (٩) وَمَا لَكُمۡ أَلَّا تُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَا يَسۡتَوِي
مِنكُم مَّنۡ أَنفَقَ مِن قَبۡلِ ٱلۡفَتۡحِ وَقَٰتَلَۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡظَمُ دَرَجَةٗ مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَقَٰتَلُواْۚ وَكُلّٗا
وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ (١٠) مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ
وَلَهُۥٓ أَجۡرٞ كَرِيمٞ (١١) ﴾:

﴿ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِ ﴾ خوا ﷻ فەرمان بە بەندەکانی دەکات بە بڕواهێنان پێیو بە پێغەمبەرەکەیو بەوەی پێی هاتووە، وە بە بەخشین لە پێناوی خوادا لەو ماڵو سامانانەی کە خوا داینـاوە لە نێو دەستیان، وە کردوونی بەجێنشین لەسەری، بۆ ئەوەی سەرنج بدات کە ئێوە چۆن ڕەفتارو کردەوە دەکەن.

پاشان دوای ئەوەی فەرمانی پێکردن بەوانەی هانیدان لەسەری بە باسکردنی ڕێکخستنی پاداشت لەسەری، جا فەرمووی: ﴿ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَأَنفَقُواْ ﴾ واتە: کۆیان کردۆتەوە لە نێوان بڕواهێنان بە خواو پێغەمبەرەکەیو بەخشین لە پێناویدا ﴿ لَهُمۡ أَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴾ (پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە) گەورەترینو مەزنترینیان

ڕەزامەنـدی پەروەردگاریانـەو سـەرکەوتنە بـە ماڵـی ڕێـزداری، وە ئـەوەی تیایدایـە لـە نـازو نیعمەتـی بـەردەوامو نەبـڕاوە، کـە خـوا ﷻ ئامـادەی کـردوە بـۆ بـڕواداران‌و تێکۆشـەران.

(٨): پاشـان باسـی هـۆکاری پاڵنەری ئەوانـی کرد بـۆ بڕواهێنان‌و نەبوونی هیچ بەربەسـت‌و ڕێگریـەک لێـی، فەرمـووی: ﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ لِتُؤْمِنُوا بِرَبِّكُمْ وَقَدْ أَخَذَ مِيثَاقَكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ واتـە: چـی ڕێگریتـان لێـدەکات لـە بڕواهێنـان، لـە کاتێکدا پێغەمبـەر موحەممـەد ﷺ چاکترینـی نـاو پێغەمبەرانـە، وە بەڕێزترین بانگخوازێکـە بانگتان دەکات بـۆ لای خوا.

ئەمـە دەستپێشـخەری پێویسـت دەکات بـۆ وەڵامدانـەوەی بانگەوازەکـەی، وە بەدەمـەوە چـوون‌و، وەڵامدانـەوەی ئـەو ڕاسـتیەی پێـی هاتـووە. بێگومـان خـوا ﷻ بەڵێـن‌و پەیمانی بڕواهێنانـی لێوەرگرتـوون ئەگـەر ئێـوە بـڕوادارن.

لەگـەڵ ئەوەدا لـە بەزەیـی‌و گرنگیدانی پێتـان ئەوەیە تەنها بـەوەوە نەوەسـتاوە پێغەمبەرتان بـۆ بنێـرێ کـە بەڕێزترینی نـاو خەڵکیـە، بەڵکو پشـتیوانی کردوە بـە چەندیـن موعجیزەو ڕێی پێ نیشـانداون لەسـەر ڕاسـتی ئـەوەی هێناویەتـی بە بەڵگـە ڕوونەکان.

(٩): لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ هُوَ الَّذِي يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبْدِهِ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ ﴾ واتـە: (خـوا ئـەو زاتەیە دادەبەزێنێ بەسـەر بەندەکەیدا نیشـانە ڕوون‌و) ئاشـکراکان، ڕێنیشـاندەری ژیرو عاقڵەکانن لەسـەر ڕاسـتی هەمـوو ئەوانەی پێغەمبـەر ﷺ هێناویەتـی، بێگومان ئەوانە ڕاسـتی دڵنیاکەرەوەن.

﴿ لِيُخْرِجَكُم ﴾ (تـا دەرتـان بێنێـت) بـە ناردنـی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ ناوتـان، وە ئەوەیشـی خـوا دایبەزاندووە لەسـەر دەسـتی لـە قورئـان‌و سـوننەت. ﴿ مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ ﴾ واتە: لـە تاریکسـتانی نەفامـی‌و بێبڕوایـی بـۆ لای ڕووناکـی زانسـت‌و بڕواهێنـان، ئەمـەش لـە میهرەبانـی‌و بـە سـۆزی خوایە بـۆ ئێوە، کاتـێ بەبەزەییتـر بووە بـە بەندەکانی لـە دایک بۆ منداڵەکـەی خـۆی ﴿ وَإِنَّ اللَّهَ بِكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ (وە بـە ڕاسـتی خـوا بەرانبـەر بـە ئێوە بە سـۆزو میهرەبانە).

(١٠): ﴿ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﴾ واتـە: چ شـتێ ڕێگریتان لێدەکات لە بەخشـین لە ڕێـی خـوادا، وە واتان لێـدەکات ڕەزیلی بکـەن ﴿ وَلِلَّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾ لە کاتێکدا ئێـوە خاوەنـی هیـچ نیـن، بەڵکـو (میراتـی ئاسـمانەکان‌و زەوی هـەر بـۆ خـوا دەمێننەوە)،

جا سـەرجەم سـەروەتو سـامانەكان لـە داهاتوویەكـی نزیكدا لە دەسـتی ئێـوە دەردەچن‌و دەگوازرێنـەوە، یـان ئێـوە جێیـان دێڵـن‌و دەگوازرێنـەوە، پاشـان موڵـك دەگەڕێتـەوە بۆ خاوەنـە بـەرزو مەزنەكەی.

جـا هەوڵ بدەن بەخشـین بكەن بە دەسـتكەوتێ مادام ئەو ماڵ‌و سـامانانە لەبەر دەسـتاندایە، وە وەك هەلێـك بیقۆزنـەوە، پاشـان خـوا ﷻ بە درێژی باسـی كردەوەكانی كـردوە بەپێی بارودۆخ‌و كاردروستی خۆی، فەرموویەتی: ﴿ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا ﴾ (واتـە: یەكسـان نیـن ئەوانەتـان كە لە پێـش گرتنـی مەككـەدا ماڵیـان بەخشـیوەو جەنگـاون ئەوانـە پلەوپایەیـان زۆر گەورەترە لەوانـەی كـە لـە دوای گرتنـی مەككـە ماڵیـان بەخشـیوەو جەنگاون) مەبەسـت لـە (فتح) لێـرەدا بریتیـە لـە (فتـح الحديبيـە) كاتێ ئـەو ئاشـتەوایە روویداو لـە نێـوان پێغەمبەر ﷺ‌و لـە نێـوان قورەیشـدا، كە ئـەوە مەزنترینی سـەركەوتنەكان بوو، بـە هۆیـەوە بڵاوبوونەوەی ئیسـلام‌و تێكـەڵ بوونی موسـڵمانان لەگـەڵ بێبروایـان، وە بانگەوازكردن بـۆلای ئاینی خوا بەبـێ ڕێگـری دەسـتەبەر بـوو، جا لەو كاتـەدا خەڵكی پۆل پـۆل دەهاتنە ناو ئیسـلامەوە، وە موسـڵمانان شـانازیان كرد بە شـانازیەكی مەزن.

مسـوڵمانان پێـش ئـەم سـەركەوتنە نەیاندەتوانـی بانگـەواز بكـەن بـۆ لای ئایـن، جگە لەو شـوێنەی خەڵكەكـەی موسـڵمان بـوو وەك مەدینـەو دەورووبـەری، ئەو كات هەركەسـێ موسـڵمان ببوایـە لە خەڵكـی مەككەو جگـە لەوێش، لەوڵاتی هاوبەشـدانەران سـزا دەدراو دەترسـێنرا، ئـا لەبـەر ئەمەیـە هەر كەسـێ پێـش فەتحـی مەككە ببیەخشـیایەو كوشـتاری بكردایـە، مەزنتریـن پلـەو پایەو پاداشـتی هەیـە لەوەی كـە موسـڵمان نەبووەو كوشـتاری نەكـردووەو نەیبەخشـیوە، تەنهـا لـە دوای فەتحـی مەككـە نەبـێ، بێگومـان ئـەوە ئەوپەڕی حیكمەتـە، ئا لەبـەر ئەوەیە پێشـینەكان‌و هاوەڵـە دیارو بەڕێـزەكان زۆربەیـان پێش فەتحی مەككـە مسـوڵمان بوون.

كاتـێ كـە جیاوازی لـە نێـوان كارەكاندا هەبـوو، لەوەیـە وا خەیاڵی بكرێ كـەم‌و كوڕی‌و سەرزەنشـت لـەو جیاكـراوەدا هەیـە، خـوا ﷻ خۆپارێزی كرد لـەوەو فەرمـووی: ﴿ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ﴾ واتـە: ئەوانـەی موسـڵمان بـوون‌و كوشـتاریان كـردو بەخشـیان پێـش فەتحـی مەككـە، وە دوای فەتحـی مەككە، هەموویان خوا بەڵێنی بەهەشـتی پێـداون، ئەمەش بەڵگەیـە لەسـەر فـەزڵ‌و چاكـەی هـاوەڵان بە گشـتی (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) چونكە خوا

شـایەتی بۆ داون بـە بڕواهێنانو پەیمانـی پێداون بە بەهەشـت، ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴾ واتـە: پاداشـتی هەر یەکەتـان دەداتـەوە بەپێی کـردەوەی خۆی.
(١١): پاشـان خـوا ﷻ هانیـداوە لەسـەر بەخشـین لـە ڕێگایـدا، چونکـە جیهادو تێکۆشـان پەیوەسـتە لەسـەر بەخشـینو خەرج کردنی ماڵ بـۆ ئامادەکردنی، جـا فەرموویەتی: ﴿ مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا ﴾ (واتـە: کێیـە ئەو کەسـەی قـەرز دەدات بە خوا بـە قەرزێکی چـاک) ئەویـش بەخشـینێکی پاکە، کـە پوخـتـو پاڵفتەیە لە پێنـاوی خوادا، ڕێـک دێتەوە لەگـەڵ ڕەزامەنـدی خـوادا لـە ماڵێکـی حەڵاڵی پـاکو خاوێن، بـەو ماڵە نەفسـی خۆی پێ خاوێـن بکاتـەوە، ئەمـەش لـە ڕێـزو بەخشـندەیی خوایە، کاتـێ کە نـاوی لێناوە بـە قەرز، مـاڵو سـامان هـی ئەوەو بەنـدەش بەندەی ئـەوە، وە پەیمانیداوە بـە چەنـد بەرانبەرێکی زۆر لەسـەر بەخشـینی ئەو ماڵـە، بێگومان ئەو زاتـە میهرەبانو بەخشـندەیە.
وە ئـەو پاداشـتە چەنـد بەرانبـەرە شـوێنو جێگـای ڕۆژی دواییـە، ڕۆژێ هەمـوو کەسـێ هـەژاری خـۆی بـۆ دەردەکـەوێو پێویسـتی بـە کەمتریـن شـت هەیـە لە پاداشـت.


يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ
وَبِأَيْمَانِهِم بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ
فِيهَا ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ يَوْمَ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ
لِلَّذِينَ آمَنُوا انظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ارْجِعُوا وَرَاءَكُمْ
فَالْتَمِسُوا نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُ بَابٌ بَاطِنُهُ فِيهِ الرَّحْمَةُ
وَظَاهِرُهُ مِن قِبَلِهِ الْعَذَابُ ﴿١٣﴾ يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ قَالُوا بَلَىٰ
وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَارْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ الْأَمَانِيُّ
حَتَّىٰ جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ وَغَرَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ ﴿١٤﴾ فَالْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ
فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مَأْوَاكُمُ النَّارُ هِيَ مَوْلَاكُمْ
وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٥﴾ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ
قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ
أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ
مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿١٦﴾ اعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا قَدْ بَيَّنَّا
لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّ الْمُصَّدِّقِينَ وَالْمُصَّدِّقَاتِ
وَأَقْرَضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١٨﴾

**(١٢-١٥):** ﴿ يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِم بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ يَوْمَ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ لِلَّذِينَ آمَنُوا انظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ارْجِعُوا وَرَاءَكُمْ فَالْتَمِسُوا نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُ بَابٌ بَاطِنُهُ فِيهِ الرَّحْمَةُ وَظَاهِرُهُ مِن قِبَلِهِ الْعَذَابُ ﴿١٣﴾ يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ قَالُوا بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَارْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ الْأَمَانِيُّ حَتَّىٰ جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ وَغَرَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ ﴿١٤﴾ فَالْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مَأْوَاكُمُ النَّارُ هِيَ مَوْلَاكُمْ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٥﴾ ﴾

خوا ﷻ فەزڵو چاکەی بڕواهێنانو شادی خەڵکەکەی بەو بڕواهێنانە لە ڕۆژی دواییدا ڕوون دەکاتەوە، وەک دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِم ﴾ واتە: ئەگەر ڕۆژی دوایی هاتو خۆر پێچرایەوەو مانگ داڕوخاو تاریک بوو، خەڵکی کەوتنە تاریکستانی، وە پردی (الصراط) یش لەسەر پشتی دۆزەخ جێگیر کرا، لەو ڕۆژەدا پیاوانو ئافرەتانی بڕوادار دەبینی، ڕووناکی بڕوایان لە پێشیانەوەو لە لای ڕاستیانەوە دەڕوات، جا بە بڕواو ڕووناکیان دەڕۆن لەو کاتە سەختو گرانەدا، هەریەکەو بە پێی بڕواکەی، لەو کاتەدا مژدەیان پێی دەدرێ بە گەورەترین مژدە، جا پێیان دەوترێ: ﴿ بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴾ (واتە: مژدەی ئێوە ئەمڕۆ بەهەشتانێکە کە ڕووباری زۆر بە ژێریاندا دەڕوات تیا دەمێننەوە بە هەمیشەیی هەر ئەوەیە سەرکەوتنی گەورە).

گەورەیی بۆ خوا، ئای چەندە خۆشە ئەم مژدەیە بۆ دڵەکانیان، چەند بەچێژە بۆ نەفسو دەروونەکانیان، کاتێ دەستەبەر بوو بۆیان هەموو داواکاریەکی خۆشویستراو، وە ڕزگار بوون لە هەموو خراپەیەکی مەترسیدار.

جـا کاتـێ دووڕووەکان بـڕواداران دەبینـن بـە ڕووناکیەکەیـان ڕێدەکـەن، ئەوانیـش ڕووناکیەکەیـان کوژاوەتـەوەو لە تاریکیـدا ماونەتەوە بـە ڕاماوویو دوودڵی، بـە بڕواداران دەڵێـن: ﴿ ٱنظُرُونَا نَقۡتَبِسۡ مِن نُّورِكُمۡ ﴾ واتـە: لایەکمان لێبکەنەوە تا بە ڕووناکیتان تروسـکێک وەربگریـن ڕێـی پێبکەیـن بەڵکـو دەرباز بین لە سـزا.

﴿ قِيلَ ﴾ جـا پێیـان دەوتـرێ: ﴿ ٱرۡجِعُواْ وَرَآءَكُمۡ فَٱلۡتَمِسُواْ نُورٗا ﴾ (واتـە: بگەڕێنـەوە بۆ دواوەی خۆتـان داوای ڕووناکـی بکـەن بۆ خۆتان) ئەگـەر ئەوە دەگونجـێو دەسـتدەدات، بێگومان شـتی لەو جۆرە دەسـت نـادات، بەڵکـو لە ئەسـتەمەکانە.

﴿ فَضُرِبَ ﴾ لـە نێـوان بـڕواداران‌و دووڕووەکانـدا ﴿ بِسُورٖ ﴾ واتـە: شـورایەکی بەهێـزو ئەسـتوور دەکێشـرێ لـە نێوانیانـدا ﴿ لَّهُۥ بَابُۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحۡمَةُ ﴾ (واتـە: کـە دەرگایەکـی تێدایـە ڕووی نـاوەوەی ڕەحمەتـی تیایـە) ئـەوەش نزیکـی بڕوادارانـە ﴿ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلۡعَذَابُ ﴾ (واتـە: دەرەوەیشـی ڕووی لـە سـزایە) ئـەوەش نزیکـی دووڕووەکانـە.

(١٤): دووڕووان بانگـی ئیمانـداران دەکـەن‌و بـە گەردنکەچـیو زەلیلیو بەزەیـی هاتنەوە دەڵێـن: ﴿ أَلَمۡ نَكُن مَّعَكُمۡ ﴾ (واتـە: ئایـا ئێمـە لەگـەڵ ئێـوە نەبوویـن) لـە ژیانـی دونیـا دەمانـوت: (لا إلـه الأ اللـه) وە نوێژمـان دەکـردو ڕۆژومان دەگـرت جیهادو تێکۆشـانمان دەکـردو کارمان دەکرد وەکـو ئێوە؟ ﴿ قَالُواْ بَلَىٰ ﴾ (واتـە: ئیماندارانیش دەڵێـن: بەڵێ) ئێوە لەگەڵمانـدا بـوون لـە ژیانی دونیا، بـە ڕواڵـەت وەکو ئێمە کارتـان دەکـرد، کردەوەکانتان کـردەوەی دوو ڕووەکان بـوو بڕواتـان پێنەبـوو، وە نیـەت‌و نیـازی ڕاسـتگۆیانەو چاکتان نەبـوو، بەڵکـو ئێـوە ﴿ فَتَنتُمۡ أَنفُسَكُمۡ وَتَرَبَّصۡتُمۡ وَٱرۡتَبۡتُمۡ ﴾ واتـە: گومانتـان لـە هەواڵـی خوا بوو کـە گومـان هەڵناگرێ.

﴿ وَغَرَّتۡكُمُ ٱلۡأَمَانِيُّ ﴾ (واتـە: هیـواو ئاواتـی) پـووچ فریـوی دان، کاتێ ئاواتتان خواسـت ئـەوەی بـڕواداران بەدەسـتیان هێنـاوە ئێوەش بە دەسـتی بهێنن بە بـێ ئەوەی بـڕواو دڵنیایی تەواوتـان هەبێ.

﴿ حَتَّىٰ جَآءَ أَمۡرُ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: تـا کاتـی مردنتـان هـات، ئێـوەش لـەم بارودۆخـە ناهەموارو سەرزەنشـتکراوەدا بـوون، ﴿ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ﴾ ئەویـش ئـەو شـەیتانە بـوو کـە کوفرو گومـان‌و دوودڵـی لـە لاتـان جوانکـرد، ئێـوەش دڵنیابـوون پێـیو متمانەتـان بـوو بـە بەیمانەکـەی هەواڵەکەیتـان بـە ڕاسـت دانـا.

(١٥): ﴿ فَٱلۡيَوۡمَ لَا يُؤۡخَذُ مِنكُمۡ فِدۡيَةٞ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ (واتـە: ئەمـڕۆ هیـچ قەرەبوویـەک

وەرناگیـرێ نـە لە ئێوە نە لـە بێبڕوایان) ئەگەر بە قـەد زەوی ئاڵتوون لە بـری ڕزگاربوونتان بـدەن، وە ئەوەندەی تریشـی لەگەڵ بێ لێتـان وەرناگیرێ.
﴿ مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ ﴾ جێگاتـان (ئاگـرە)، ﴿ هِىَ مَوْلَىٰكُمْ ﴾ (واتـە: ئـەو ئاگرە شـیاوتانە) کە دەتانگرێتـە خـۆی ﴿ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾ (ئای سـەرەنجامێکی چەند خراپـە) دۆزەخ، هەروەها دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٨﴾ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ﴿٩﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا هِيَهْ ﴿١٠﴾ نَارٌ حَامِيَةٌۢ ﴿١١﴾ ﴾القارعة (واتـە: وە ئـەوەی کێشـی چاکەکانـی سـووک بێت * ئـەوە هاویـە جێگـای ئەوە * تـۆ چوزانیـت هاویە چیـە * ئاگرێکی هەڵگیرساوە)!
(١٦-١٧): ﴿ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿١٦﴾ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾:
کاتـێ کـە خـوا ﷻ باسـی حاڵـی پیاوانـی بـڕوادارو ئافرەتانـی بـڕوادارو پیاوانـی دووڕوو ئافرەتانـی دوو ڕووی کـرد لـە دواڕۆژدا، ئـەوە دەبـوو دڵەکانی بانگ بکردایە بۆ ترسـان لە پەروەردگاریـانو ملکەچـی ئـەو زاتـە مەزنە، خـوا ﷻ سەرزەنشـتی بڕواداراني کرد لەسـەر نەبوونـی گەردنکەچـیو بە مـەزن دانانـی، جـا فەرمـووی: ﴿ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ ﴾ واتـە: ئایـا کاتی ئـەوە نەهاتووە دڵی بـڕواداران نەرم بـێو ملکـەچ بـێ بـە زیکرو یـادی خـوا کـە قورئانی پیـرۆزەو گـەردن کەچـی فەرمانو قەدەغەکراوەکانـی بـێ، ئـەوەی ناردوویەتیە خـوارەوە بە حەقو ڕاسـتی کـە موحەممەد ﷺ هێناویەتی؟
ئەمـەش هاندانـی تێدایـە لەسـەر کۆشـش کردنـی ملکـەچ بوونـی دڵ بـۆ خـوای بـەرزو مـەزن، لەوەیشـی کـە دایبەزانـدووە لە کتێـبو حیکمـەت، بـڕواداران لە هەمـوو کاتێکدا ئامۆژگـاری وەربگـرن بـە ئەحکامە شـەرعیەکانو لێپرسـینەوە لە نەفسو دەروونیان بکەن لەسـەر ئـەوە ﴿ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ ﴾ واتـە: بـا وەکو ئەوانـە نەبـن کە خـوا ﷻ کتێبی بـۆ دابەزاندن کە پێویسـتکەری ملکەچبوونـی دڵو گەردن کەچـی تـەواو بوو، پاشـان نە بـەردەوام بوون لەسـەریو نە جێگیـر بوون، بەڵکو سـەردەمو زەمانێکـی دوورو درێژیـان تێپەڕی بەسـەریاندا، ئەوان بـەردەوام بوون لـە بێئاگایی، ئیمانیان پـەرشو بـڵاو بـوو دڵنیاییشـیان نەمـا، ﴿ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴾ (واتـە: ئنجا دڵیـان ڕەق بـوو، وە زۆربەیـان یاخـیو لـە سـنوور دەرچـوو بـوون)، دڵـەکان پێویسـتیان

بەوەیــە یــاد بخرێنەوە بەوەی خــوا دایبەزانــدووە، وە بدوێنرێــن بە حیکمەت، نابــێ هەرگیز لێــی غافــڵ بــێ، چونکە بە راســتی ئــەوە هۆکارێکە بــۆ رەق بوونــی دڵو بەســتنی چاو.

(١٧): ﴿ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ بێگومان ئایــەتو نیشــانەکان ڕێنیشــاندەری عەقڵەکانن لەســەر زانســت بــە دواکاریەکانی خــوا، ئەو زاتــەی زەوی زینــدوو کردۆتــەوە دوای مردنــی، بــە توانایــە لەســەر ئــەوەی مــردووەکان زینــدوو بکاتــەوە دوای مردنیــان، پاداشــتیان دەداتــەوە بەپێــی کردەوەکانیــان، ئــەو زاتەی زەوی زینــدوو دەکاتــەوە دوای مردنــی بە ئاوی باران، بە توانایە لەســەر زینــدوو کردنەوەی دڵــە مــردووەکان بــەوەی دایبەزاندوە لــەو قورئانە بــۆ ســەر پێغەمبەرەکەی ﷺ.

ئــەم دەقە بەڵگەیە لەســەر ئــەوەی بێگومان ئەو کەســە عەقڵی نیە ئەگــەر ڕێنمایی وەرنەگرێ بە بەڵگەو نیشــانەکانی خواو ملکەچی شــەریعەتەکەی نەبێ.

(١٨-١٩): ﴿ إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَٰتِ وَأَقْرَضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَٰعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١٨﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ ۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٩﴾ ﴾:

﴿ إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَٰتِ ﴾ واتــە: ئەوانــەی زۆریــان بەخشــیوە لــەو بەخشــینانەی پێویســتو پەســندن، ﴿ وَأَقْرَضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ﴾ (واتــە: ئەوانــەش قــەرز دەدەن بەخــوا بــە قەرزێکــی چــاک) بەوەی پێشــیان خســتووە لەماڵو ســامانەکانیان لــە ڕێگاکانــی خێرو چاکــەدا، کە دەبێتــە زەخیرەیەک بۆیان لــەلای پەروەردگاریــان ﴿ يُضَٰعَفُ لَهُمْ ﴾ (واتە: چەنــد بەرانبــەر دەیاندرێتــێ) واتــە: چاکەیــەک بەرانبــەرە بە دە تــا حەوت ســەد ئەوەندە تا زیاتــر لــەوە ﴿ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴾ واتــە: ئەویــش ئەوەیــە خــوا بــۆی ئامــادە کــردون لە بەهەشــتدا کــە نەفــسو دەروونــەکان نایزانن.

وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَۖ وَٱلشُّهَدَآءُ
عِندَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ
بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٩﴾ ٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ
ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ
وَٱلْأَوْلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ
مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمًاۖ وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ
مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌۚ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿٢٠﴾
سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ ٱلسَّمَآءِ
وَٱلْأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ
ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢١﴾ مَآ أَصَابَ
مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مِّن
قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٢٢﴾ لِّكَيْلَا
تَأْسَوْاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْۗ وَٱللَّهُ
لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ
ٱلنَّاسَ بِٱلْبُخْلِۗ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٤﴾

(١٩) ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ﴾ بڕواهێنـان لـە لای ئەهلـی سـوننە بریتیـە لـەوەی کـە کیتـابو سـوننە بەڵگەبـێ لەسـەری، کـە بریتیـە لـە قسـەی دڵو زمـان، وە کـردەوەی دڵو زمـانو ئەندامانـی جەسـتە، ئـەوەش هەمـوو شـەریعەتەکانی ئایـن لـە خۆدەگـرێ بـە ئاشـکراو نهێنیـان، جـا ئەوانـەی ئەمانەیـان پێکـەوە کۆکردۆتـەوە بریتیـن لـە ڕاسـتگۆیان، واتـە: ئەوانـەی پلـەو پایەیـان لـە سـەرووی پلـەو پایـەی بڕوادارانەوەیـە بـە گشـتیو لـە خـوار پلـەی پێغەمبەرانـن.

﴿وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ﴾(واتـە: وە شـەهیدان لـەلای پەروەردگاریـان خـاوەن پاداشـتو نـوورو ڕووناکـی خۆیانـن) هەروەکـو چـۆن لـە فەرمـوودەی ڕاسـتدا هاتـووە: {إِنَّ فِي الجنَّـةِ مِئَةَ دَرَجَـةٍ أَعَدَّهَـا اللـهُ لِلْمُجَاهِدِيـنَ فِي سَـبِيلِ اللـهِ مَـا بَـيْنَ الدَّرَجَتَـيْنِ كَمَا بَـيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ} (أخرجـه البخـاري: (٢٧٩٠))، واتـە: بێگومـان لـە بەهەشـتدا سـەد پلـەو پایـە هەیـە، لـە نێـوان دوو پلـەدا وەک نێوانـی ئاسـمانو زەوی وایـە، خـوا ئامـادەی کـردوە بـۆ ئەوانـەی جیهـاد دەکـەن لـە ڕێگـای ئـەودا، ئەمـەش بـەرزیو نزیکیـان دەخـوازێ لـە خـوای گـەورە.

﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ﴾ (واتـە: ئەوانـەی کـە بێبڕوابـوونو بەڵگـەو نیشـانەکانی ئێمەیـان بـە درۆ زانـی ئەوانـە هاوەڵـی ئاگـری دۆزەخـن). ئـەم ئایەتانـە هەمـوو جۆرەکانـی خەڵکـی کۆکردۆتـەوە لـە چاکـەکارانو ڕاسـتگۆیان، شـەهیدان، هاوەڵانـی دۆزەخ، جـا چاکـەکاران: ئەوانـەن کـە پێشـینەی کارەکانیـان چاکەیـە لەگـەڵ خەڵکیـدا، وە سـوودگەیاندنە پێیـان بـە پێـی توانایـان، بـە تایبـەت سـوودگەیاندن بـە مـاڵو سـامان لـە ڕێگـەی خـوادا.

ڕاستگۆیان: ئەوانەن کە پلەکانی بڕواهێنانو کردەوەی چاکو زانستی بە سوودو دڵنیایی ڕاستەقینەیان تەواو کردوە.
شەهیدان: ئەوانەن کە لە پێناوی خوادا کوشتاریان کردوە بۆ بەرزکردنەوەی وشەی خوا، نەفسو ماڵیان بەخشیوە لە پێناوی خواداو کوژراون.
هاوەڵانی دۆزەخ: ئەو بێبڕوایانەن کە ئایەتو بەڵگەکانی خوایان بە درۆ زانیوە.
بەشێکی تر ماوە خوای گەورە لە سوورەتی (الفاطر)دا باسی کردوە، ئەوانیش (المقتصدون)ن، (المقتصد) مامناوەندین ئەوانەن کە ئەرکەکانیان جێبەجێ کردوەو وازیان لە قەدەغەکراوەکان هێناوە، بەڵام ئەوە نەبێ هەندێ کەمتەرخەمیان هەبووە لەمافەکانی خواو مافی بەندەکانی، جا ئەوانە دەرئەنجامیان بەهەشتە، ئەگەرچی سزایش بدرێن بە هۆی هەندێ لەوانەی کردوویانە.
(٢٠-٢١): ﴿ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ وَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞۚ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ٢٠ سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أُعِدَّتۡ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ٢١ ﴾:
﴿ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی ڕاستی ژیانی دونیاو ئەوەیشی لەسەریەتی، ئامانجی ڕوون دەکاتەوە، ئامانجی خەڵکەکەشی بەوەی کە گاڵتەو ڕابواردنە، جەستەکان گاڵتەو گەمەی پێدەکەن، دڵەکانیش ڕادەبوێرن پێی، ئەمەش ڕاستی دونیایە ئەوەی کە دیارە لەناو ئەوانەی دونیا ویستن، بێگومان تۆ دەیانبینی هەموو تەمەنیان بەسەر بردوە بە ڕابواردنی دڵەکانو بێئاگایی لە یادی خوا، ئەوەیشی لە پێشیانە لە پەیمانو هەڕەشە کردن، دەیانبینی ئاینەکەیان کردوە بە گەمەو ڕابواردن.
بە پێچەوانەی خەڵکانی بە ئاگاو پیاوانی ڕۆژی دوایی، بە ڕاستی دڵەکانیان ئاوەدانە بە یادی خواو ناسینو خۆشویستنی، کاتەکانیان بەسەر بردوە بە ئەنجامدانی ئەو کردەوانەی نزیکیان دەکاتەوە لە خوا ﷻ، لە سوودی کورتو تێپەڕ.
خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ وَزِينَةٞ ﴾ واتە: ڕازاندنەوەیە لە جلو بەرگو خواردنو خواردنەوەو کەرەستەی گواستنەوەو بیناو باڵەخانەو ناوبانگو جگە لەوانیش،

﴿ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ ﴾ هەریـەک لـە خەڵکەکـەی دەیـەوێ خـۆی هەڵبکێشـێ بەسـەر ئـەوی دیکـەداو سـەرکەوتوو زاڵ بـێ لـە هەمـوو کاروبارەکانیـدا، ناوبانگـی زیاتـر بـێ لـە بارودۆخەکانیـدا ﴿ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ ﴾ زۆری لـە مـاڵو دارایـیو منداڵـدا، واتـە: هەریەکـەو دەیـەوێ ئـەو زیاتـری هەبـێ لـە جگـە لـە خـۆی لـە مـاڵو منداڵـدا، ئەمـەش حەقیقـەتو ڕاسـتی دونیایـە، ڕوودانێتـی لـە ئـەو کەسـانەی کـە دونیایـان خـۆش دەوێو دڵنیـان پێـی، بـە پێچەوانـەی ئـەو کەسـەی دونیـاو حەقیقەتـی دەناسـێ، کردوویەتـی بـە پـردێ نەیکـردوە بـە جێگـای مانـەوەو هەمیشـەیی، کێبڕکـێ دەکات لـەوەی نزیکـی دەکاتـەوە لـە خـوا ﷻ، وە ئـەو هۆکارانـە بەکاردێنـێ کـە دەیگەیەنـێ بـە خـوا، جـا ئەگـەر ببینـێ کەسـێ کێبڕکێـی لەگەڵـدا دەکات لـە زۆری لـە مـاڵو منداڵـدا، ئـەو کێبڕکێـی لەگەڵـدا دەکات بـە کـردەوەی چاکـە.

پاشـان نموونـەی بـۆ دونیـا هێناوەتـەوە، کـە وەک بارانێـک وایـە بباریتە سـەر زەویەک جـا بـە هـۆی ئـەو بارانـەوە ڕووەکـی زۆر ڕوواوەو تێکـەڵ بـووەو بـە یەکـدا چـووە، سـەوزیو ڕووەکـی زەوی لـەوەی کـە خەڵکـیو ئاژەڵیـش دەیخـۆن، هەتـا کاتـێ زەوی بـە سـەوزیو ڕووەک ڕەونـەقو جوانـی خـۆی وەردەگـرێو خـۆی دەڕازێنێتـەوە، وە ڕووەکەکـە ئـەو جوتیارانـە دڵخـۆش دەکات، ئەوانـەی کـە هیمـەتو ورەو سـەرنجیان کـورت کردۆتـەوە تەنهـا بـۆ دونیـا، ئنجـا فەرمانـی خـوا بێـتو ئـەو ڕووەکـە لـە نـاو بچـێو ووشـکو زەرد بـێ، بگەڕێتـەوە بـۆ حاڵەتـی یەکەمـی، هەروەکـو ئـەوەی سـەوزیەکی تێـدا نەڕوابـێ، وە وێنایەکـی جـوانو سەرنجڕاکێشـی نەبینـرا بـێ.

بـە هەمـان شـێوە دونیـا کاتـێ کـە پرشـنگدارو گەشـە بـۆ خاوەنەکـەی، چـی بـوێ لـە داواکاریەکانـی دونیـا دەسـتەبەر دەبـێ، وە ڕووبکاتـە هـەر کارێ لـە کارەکانـی دەبینـێ دەرگاکانـی بـۆ کراوەیـە، لـە نـاکاودا تووشـی قـەزاو قـەدەرێ ببـێ ئـەوەی لـە دەسـتیدایە نەمێنـێ، دەسەڵاتیشـی بەسـەردا نەمێنـێ، یـان ئـەو جێـی بهێڵـێ، لێـەوە دەربچـێ بـە دەسـتی بەتـاڵ، هیچیشـی پێـش نەخسـتبێ بـۆ خـۆی جگـە لـە کفنەکـەی نەبـێ، توورەیـی بـۆ کەسـێ ئەمـە هیـواو ئامانـجو ئاواتەکانـی بـێ، کاروکـردەوەو کۆششـی تەنهـا بـۆ ئـەوە بـێ.

بـەڵام کـردەوەی دوارۆژ تەنهـا ئـەوە بـە سـوودەو دەبێتـە زەخیـرە بـۆ خاوەنەکـەیو هاوڕێتـی بەنـدە دەکات بـە هەمیشـەیی، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ

شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ ﴾واتــە: حاڵــی ڕۆژی دوایــی بەتــاڵ نابــێ لەیەکێــک لــەم دوو کاروبــارە: یــان ســزای ســەخت لەنــاو ئاگــری دۆزەخو کــۆتو بەنــدو ناخۆشــیەکانی، بــۆ کەسـێک کــە دونیــا مەبەســتو هیــواو ئاواتەکانــی بــێ، بوێــری بــکات لەســەر ســەرپێچی کردنــی خــواو ئایــەتو نیشــانەکانی خــوا بــەدرۆ بزانــێو بێبڕوایــی بــکات بــە نیعمەتەکانــی.

یــان لێخۆشــبوونی خــوا لــە گوناهــەکانو لابردنــی ســزاکان، ڕەزامەنــدی لــە لایــەن خــواوە بــۆ ئــەو کەســەی دونیــا دەناســێو کۆشــش دەکات بــۆ دواڕۆژ بــە کۆشــش کــردن.

هەمــوو ئەمانــە مــرۆڤ بانــگ دەکات بــۆ خۆگرتنــەوە لــە دونیــاو حەزکــردنو ڕووکردنــە دواڕۆژ، لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴾ (واتــە: ژیانــی دونیــا هیــچ نیــە) جگــە لــە ڕابواردنــێ ڕادەبوێــرێو ســوودی لــێ وەردەگــرێ، ناتەواویەکانــی پــێ پــڕ دەکاتــەوە، پێــی هەڵناخەڵەتــێو دڵنیــا نابــێ لێــی، مەگــەر کەســانی خــاوەن عەقڵــی لاواز، ئەوانــەی شــەیتان فریــوی داون بــە لێبوردەیــی خــوای گــەورە.

(٢١): ﴿ سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ ﴾پاشــان فەرمانــی کــردوە بــە پێشــبڕکێ بــۆ دەســت خســتنی لێخۆشــبوونی خــواو ڕەزامەنــدی ئــەوو بەهەشــتەکەی، ئەویــش بــە کۆشــش کــردن دەبــێ بــە هۆکارەکانــی لێخۆشــبوون، لــە تەوبــە کردنــی ڕاســتەقینەو داوای لێبوردنــی بەســوودو دوور کەوتنــەوە لــە گوناهــەکانو ئەوەشــی مەترســی گوناهــی لێدەکــرێ، وە پێشــبڕکێ بــۆ بەدەســتهێنانی ڕەزامەنــدی خــوا بــە کــردەوەی چــاک، وە ســوور بــوون لەســەر ئەنجامدانــی ئــەو کارەی دەبێتــە مایــەی ڕەزامەنــدی خــوا بــە بەردەوامــی، لــە چــاک بــوون لــە بەندایەتــی بەدیهێنــەر، وە چــاک بــوون لەگــەڵ خەڵکــی بــە هەمــوو ڕووەکانــی چاکــە، لەبــەر ئەمەیــە خــوا باســی ئــەو کردەوانــەی کــردوە کــە پێویســتن بــۆ ئــەوە.

جــا فەرموویەتــی: ﴿ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ﴾(واتــە: وە بــۆ بەهەشــتێک کــە پانتایەکــەی بــە وێنــەی پانتایــی ئاســمانو زەویــە، ئامــادە کــراوە بــۆ ئەوانــەی بڕوایــان هێنــاوە بــە خــواو پێغەمبەرانــی).

بڕواهێنــان بــە خــوا پێغەمبەرەکــەی بنەمــاو لقەکانــی ئایــن دەچنە ناویــەوە ﴿ ذَٰلِكَ فَضْلُ

ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ ﴾ واتــە: ئەمــەی کــە ڕوونمــان کــردەوە بۆتــانو ئــەو ڕێگایانەمــان بــاس کــرد بۆتــان تیایــدا، کــە گەیەنــەرن بــۆ بەهەشــت، ئــەو ڕێگایانــەی کــە گەیەنەرن بــۆ دۆزەخ، بێگومــان چاکــەی خــوا لــە پاداشــتی بێپایــانو مــەزن، لــە مەزنتریــن منــەتو چاکەکانیەتــی بەســەر بەندەکانیەوە.

﴿ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴾ (واتــە: وە خــوا خــاوەن بەخششــی گەورەیــە) ئــەو زاتــەی کــە ستایشــکردنی ئەژمــار ناکــرێ، بەڵکــو ئــەو زاتــە وەک چــۆن ستایشــی خــۆی دەکات، لــە ســەرووی ئەوەشــەوە بەندەکانــی ستایشــی دەکــەن.

(٢٢-٢٤): ﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ٢٢ لِّكَيۡلَا تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا تَفۡرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٍ ٢٣ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِۗ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ٢٤ ﴾:

خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات دەربــارەی گشــتگیری قــەدەر، دەفەرمــوێ: ﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ ﴾ (واتــە: هیــچ زیــانو بەڵایــەک ڕووی نــەداوە نــە لــە زەویو نــە لــە خــودی خۆتانــدا) ئەمــە گشــتگیرە بــۆ هەمــوو بــەڵاو موسیبەتەکان کــە تووشــی خەڵکــی دەبــن لــە چاکــەو خراپــە، جــا هەموویــان خــوا لــە (اللوح المحفوظ) دا نووســیویەتی بچــووکو گەورەیــان، ئەمــە کارێکــی مەزنــە عەقڵــەکان دەوری نــادەن، بەڵکــو سەرســام دەبــێ دڵــی ئــەو کەســانەی ژیــرو عاقڵــن، بــەڵام لەســەر خــوا ئاســانە.

(٢٣): ﴿ لِّكَيۡلَا تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا تَفۡرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمۡ ﴾ خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات بــە بەندەکانــی بــەوە، لەبــەر ئــەوەی ئــەو یاســایە بچەســپێ لــە لایــان، وە بۆیــان ڕوون بکاتــەوە ئــەوەی تووشــیان دەبــێ لــە چاکــەو خراپــە، جــا بــا خەفــەت نەخــۆنو خەمبــار نەبــن، لــەوەی لــە دەســتیان چــووەو، لەوەشــی نەفــسو دەروونیــان تەماحــی کــردووەو حــەزی لــێ بــووە، چونکــە زانیویانــە ئــەوەی لــە (اللــوح المحفــوظ) دا نووســراوە هــەر دەبــێ ڕووبــدات، هیــچ دەرچەیــەک نیــە بــۆ ڕێگریکــردن لێــی، وە بادڵخــۆشو غــەرا نەبــن بــەوەی خــوا پێــی داون، خۆشــی لــووت بــەرزیو خراپــەکاری، چونکــە دەزانــن ئــەوان بەهــەوڵو توانــای خۆیــان نەگەیشــتوون بــە ئــەوە، بەڵکــو بــە فــەزڵو چاکــەو منەتــی خــوا پێــی گەیشــتوون، دەی بــا ســەرقاڵ بــن بــە شــوکرانە بژێــری ئــەو زاتــەی نیعمەتــی پێــداونو خراپــەی لــێ دوور خســتوونەتەوە، لەبــەر

ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴾ واتـە: کەسـی لـووت بـەرزی خۆبەزلزانـی دڵڕەقـی سەرسـام بـوو بەخـۆ، شـانازیکەر بـە نیعمەتەکانـی خـوا، دەیداتـە پـاڵ نەفسـی خـۆیو یاخـی دەبـێو لـە هـەواو ئارەزوەکانیـدا بـەکاری دێنێ، هـەروەک خـوای بـەرزو مـەزن فەرموویەتـی: ﴿ ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَـٰهُ نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍۭ بَلْ هِىَ فِتْنَةٌ ﴿٤٩﴾ ﴾الزمر، (واتـە: پاشـان هەرکاتـێ بەهرەیەکمـان پێـدا دەڵێ: بەڕاسـتی ئـەم بەهرەیـەم پێـدراوە بـە هـۆی لێزانـی خۆمـەوە وانیـە بەڵکـو ئـەوە ئەزمـوونو تاقیکردنەوەیـە).

﴿ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبُخْلِ ﴾ واتـە: کـۆی دەکەنـەوە لە نێـوان دوو کاری سەرزەنشـت کـراو کـە هەریەکێکیـان بەسـە بـۆ خراپـە، (البخـل): ڕەزیلـیو چروکـی: بریتیـە لـە ڕێگـری کردنـی ئـەو مافانـەی کـە پێویسـتن، فەرمانکـردن بـە خەڵکـی بـە چروکـی، بـە ڕەزیلـی خۆیانـەوە نەوەسـتاون، تـا ئەمریـان کـردوە پێـی بـە خەڵکـیو هانیانـداون لەسـەر ئـەم خـوو ڕەوشـتە سەرزەنشـت کـراوە بـە قسـەو کرداریـان، ئەمـەش پشـت تێکردنیانـە لـە گوێڕایەڵـی پەروەردگاریـانو ڕوو وەرگێڕانیانـە لێـی.

﴿ وَمَن يَتَوَلَّ ﴾(هـەر کـەس پشـت هەڵبـکات) لـە گوێڕایەڵـی خـوا ﷻ ئـەوە زیـان ناگەیەنـێ تەنهـا بـە نەفسـی خـۆی نەبـێ، هەرگیـز خـوا زیانـی پـێ ناگـات.

﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴾(واتـە: بێگومـان خـوا هـەر خـۆی بێنیازی سوپاسـکراوە) ئـەو زاتـەی کـە بێنیـازیو دەوڵەمەنـدی لـە تایبەتمەندیەکانێتـی، ئـەو زاتەی کـە خاوەن ئاسـمانەکانو زەویـە، تەنهـا ئـەو بەندەکانـی دەوڵەمەنـدو هـەژار دەکات، ستایشـکراوە خاوەنـی هەمـوو ناوێکـی چـاکو وەسـفێکی تـەواو، وە هەمـوو کردەوەیەکـی جـوان شایسـتەیە سـتایش بکـرێ لەسـەریو بـە مـەزن دابنـرێ.


لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ ٢٥ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَاهِيمَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ فَمِنْهُم مُّهْتَدٍ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ٢٦ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰ آثَارِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَآتَيْنَاهُ الْإِنجِيلَ وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا فَآتَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ٢٧ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَآمِنُوا بِرَسُولِهِ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِ وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ٢٨ لِّئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ الْكِتَابِ أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَيْءٍ مِّن فَضْلِ اللَّهِ وَأَنَّ الْفَضْلَ بِيَدِ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ٢٩

**(٢٥-٢٧):** ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَاهِيمَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ فَمِنْهُم مُّهْتَدٍ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰ آثَارِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَآتَيْنَاهُ الْإِنجِيلَ وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا فَآتَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٢٧﴾﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ﴾ (واتە: بە ڕاسـتی ئێمـە پێغەمبەرانی خۆمانمـان نـاردوە بـە بەڵگـەو موعجیـزەی ڕوونـەوە) ئەوانیـش ئـەو بەڵگـەو نیشـانەو شـایەتانەن کـە بەڵگـەن لەسـەر حەقیقـەتو ڕاسـتی ئـەو پەیامـەی هێناویانـە ﴿وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ﴾ کتێـب: نـاوی ڕەگـەزە، هەموو ئـەو کتێبانـە دەگرێتەوە کـە خوا ﷻ دایبەزانـدوە بـۆ هیدایەتو ڕێنمایـی خەڵکی، وە ڕێنیشـاندانیان بۆلای ئەوەی سـوودی هەیە بـۆ دیـنو دونیایـان، ﴿وَالْمِيزَانَ﴾ ئەویـش دادپەروەریە لـە قسـەو کردەوەکاندا، ئەو ئاینـەی پێغەمبـەران پێی هاتـوون هەمووی دادپەروەریە لـە فەرمـانو قەدەغەکراوەکانی، وە لـە مامەڵـە کـردن لەگەڵ خەڵکیـدا، هەروەها لـە تاوانەکانو تۆڵەو سـنوورو میـراتو جگە لەوانیش).

ئەویـش ﴿لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾ (واتـە: بۆ ئـەوەی خەڵکـی بەدادگەری ڕەفتـار بکەن لەنـاو خۆیانـدا) هەسـتن بەجێبەجـێ کردنی ئاینـی خـواو بەدەسـتهێنانی بەرژەوەندیەکانیان کـە هەرگیز لـە ژمـاردن نایە.

ئەمــەش بەڵگەیــە کــە ســەرجەم پێغەمبــەران یەکدەنگــن لەســەر بنەمــای شــەرع، ئەویــش بەجێهێنانــی دادپەروەریــە ئەگەرچــی جۆرەکانــی دادپــەروەری بگــۆڕێ بــە پێــی کاتو بارودۆخــەکان، ﴿ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ ﴾(واتە: ئاسـنمان دابەزانـدوە کە هێزی بەتینــی جەنگــی تێدایە) لە کەرەسـتە جەنگیــەکان، وەک چــەکو قەڵغانو جگــە لەوانیش ﴿ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ ﴾ئەویــش ئەوەیە کــە دەبینرێ لە ســودەکانی، لە جۆرەها پیشەســازیو پیشــەوەریو قــاپو قاچاخــەکانو کەرەســتەی کێــڵان، تەنانەت ئەو شــتەی کە پێویســتی بە ئاســن نیــە ڕیژەکــەی زۆر کەمە.

﴿ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ ﴾(واتــە: وە تــا دەربیخــات چ کەســێک یارمەتــی ئاینــی خــواو پێغەمبەرانــی دەدات کە پەنهانیشــە) واتە: بۆ ئــەوەی خــوا دایبمەزرێنێ خودی تاقیکردنــەوەکان بــەوەی دایبەزاندوە لە کتێبو ئاســن، تــا دەربکەوێ کێ ســەری دەخات، وە یارمەتــی پێغەمبەرەکانــی دەدات لــە حاڵەتــی پەنهــان (کە إخلاصــی تــەواوە) بڕوابوون ســوودی هەیــە، پێــش ئــەو شــایەتیەی (کــە هێنانــەوەی پاســاوە) هیــچ ســوودێکی نیە بە بوونــی بڕواهێنــان تیایــدا، چونکــە ئەوکاتــە (ئیمــان) پێویســت دەبێــت (بــە چاوی ســەر شــتەکان دەبینن).

﴿ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴾واتــە: هیــچ شــتێ دەستەوســانی نــاکاتو هیــچ هەڵهاتوویــەک لێی ڕزگــاری نابێــت، لــە هێزو دەســەڵاتی ئەوەیە ئاسـنی دابەزاندوە کــە کەرەســتە بەهێزەکانی لێدروســت دەکــرێ، لە هێزو دەســەڵاتی ئەو زاتە بەتوانایە لەســەرکەوتن بەســەر دوژمنانیدا، بەڵام دۆســتانی بــە دوژمنەکانی تاقیدەکاتەوە، تــا دەریبخات کێ یارمەتــی ئاینەکەی دەدات بــە پەنهــان، خــوا ﷻ لەم جێگەیــەدا کتێبو ئاســنی پێکــەوە گرێــداوە، چونکە بــەم دووانە خــوا ﷻ ئاینەکــەی ســەردەخاتو وشــەی خــۆی بــەرز دەکات: بــەو کتێبــەی کــە بەڵگەو ســەلماندنی تێدایــە، وە بەشمشــێری ســەرخەر بــە مۆڵەتــی خــوا، ئا ئــەو دووانــە بەجێهێنانی خوایــە بــە دادپەروەری کــە بەڵگەیان پــێ دەهێنرێتەوە لەســەر حیکمەتی خــواو تەواوی ئەو زاتــە، تەواوی شــەریعەتەکەی کــە دایمەزراندوە لەســەر زمانــی پێغەمبەرانی.

کاتــێ باســی نێردراوێتی پێغەمبەرانی کردوە بە گشــتی، باســی تایبەتمەنــدی دوو پێغەمبەری بەڕێــزی کــردوە نــوحو ئیبراهیــم ﵉، کــە خــوا پێغەمبەرایەتــیو کتێبــی لــە نــەوەی ئەوانــدا دانــا، وەک فەرمــووی: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَاهِيمَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ ﴾ واتــە: پێغەمبەرانــی یەکەمیــنو دواییــنەکان هەموویان لە وەچــەی نوحو

ئیبراهیمـــن ﷺ، بـە هەمـان شـێوە کتێبـەکان بـە گشـتی دابەزیـوون بۆ سـەر نـەوەی ئەم دوو پێغەمبـەرە بەڕێـزە﴿ فَمِنْهُم ﴾ واتـە: لەوانـەی پێغەمبەرمان بۆ نـاردن﴿ مُّهْتَدٍ ﴾ واتە: ڕێنماییـان وەرگرت بە بانگەوازەکانیـان، ملکەچی فەرمانەکانیان بـوون، ڕێنماییان وەرگرت بـە هیدایەتـی ئـەوان﴿ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴾ واتە: دەرچوونـە لـە گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵـی پێغەمبەرانو نێـردراوان، وەک خـوا ﷻ فەرموویەتی:﴿ وَمَآ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ ﴾ یوسف. (واتـە: وە زۆربەی خەڵکی هەرچەندە تۆ سـووربیت لەسـەر بڕواهێنان نابنە بـڕوادار).

﴿ ثُمَّ قَفَّيْنَا ﴾ واتـە: بە شـوێن ئەوانماندا نـارد،﴿ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ﴾ (واتـە: دیسـان پێغەمبەرانی خۆمانمان نارد، وە دواتر عیسـای کـوڕی مەریەم)، خـوا ﷻ عیسـای ﷺ تایبـەت کـردوە، چونکـە سـیاقی باسـەکە لەگـەڵ ئـەو گاورانەدایە کـە پێیـان وایـە شـوێنکەوتووی عیسـان﴿ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ ﴾ کـە بریتیـە لـە کتێبە بەڕێزەکانـی خـوا﴿ وَجَعَلْنَا فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً ﴾ (واتـە: وە لـە دڵـی ئەوانـەدا کە شـوێنکەوتوون سـۆزو بەزەیمان دروسـت کـرد) وەک خـوا ﷻ فەرموویەتی:
﴿ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾ المائـدة.

(واتە: سـوێند بێـت دەبینیت خراپترینی خەڵکی بۆ دوژمنایەتی لەگـەڵ بڕواداراندا جوولەکەو هاوبەشـدانەرانن، سـوێند بێت دەبینیـت نزیکترینیان لە خۆشەویسـتی بۆ بـڕواداران، ئەوانەن کـە دەیانـوت بێگومـان ئێمـە گاوریـن ئەوەش لەبـەر ئەوەیـە بێگومان لـە ناویاندا قەشـەو گۆشـەگیرانێک هـەن کە بەڕاسـتی ئەوان خۆیـان بە گـەورە دادەنێن).

لەبـەر ئەمەیـە گـاورەکان لـە دڵـەوە نـەرمو نیانتـر بـوون لـە غەیـری خۆیـان، تا لەسـەر شـەریعەتی عیسـا بـوون،﴿ وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا ﴾ (وە گۆشـەگیریەک کـە خۆیـان دایان هێنابـوو)، (الرهبانیـة) واتە: پەرسـتش بە گۆشـەگیری، ئـەوان دایانهێنا لە نەفـسو دەروونی خۆیانـەوە، وە کردیـان بـە ئـەرک لەسـەر خۆیـانو پابەنـد بـوون بـە پابەنـد بوونێک کە خـوا لەسـەریانی نەنووسـیبوو نەیکردبـوو بـە ئـەرک، بەڵکـو خۆیان لـە نەفـسو دەروونی خۆیانەوە پەیوەسـت بـوون پێیەوە، مەبەسـتیان لـەوەدا ڕەزامەندی خوا بوو، لەگەڵ ئەوەشـدا ﴿ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ﴾ واتـە: وەک پێویسـت ئـەو گۆشـەگیریەیان بەجـێ نەهێنـاو

مافەکانیـان نـەدا، جـا کەمتەرخەمیـان کـرد لـە دوو ڕووەوە: لـە ڕووی داهێنانیـان، وە لـە ڕووی بەجـێ نەهێنانیـان بـەوەی کردیـان بە ئەرک بەسـەر نەفـس‌و دەروونی خۆیـان، ئەم بارودۆخـە زۆرینەیـە لـە بارودۆخـی ئەوانـدا، تیایاندایە ڕاسـتە لەسـەر فەرمانی خـوا، لەبەر ئەمەیـە فەرمویەتـی: ﴿ فَـَٔاتَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ ﴾واتە: ئەوانـەی بڕوایان هێناوە بـە موحەممـەد ﷺ لەگـەڵ بڕوابوونیـان بە عیسـا ؑ، هـەر یەکـە بەپێی ئیمانـی خۆی خوا پێـی بەخشـیوە ﴿ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴾واتـە: زۆریشـیان یاخین.

(٢٨-٢٩): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَءَامِنُوا۟ بِرَسُولِهِۦ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِۦ وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِۦ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٨﴾ لِّئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ ٱلْكِتَـٰبِ أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّن فَضْلِ ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلْفَضْلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾ ﴾

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَءَامِنُوا۟ بِرَسُولِهِۦ يُؤْتِكُمْ ﴾ ئـەم دواندنـە دەگونجـێ دوانـدن بـێ لەگـەڵ خـاوەن کتێبـەکان، ئەوانـەی بڕوایـان بە مووسـاو عیسـا ؑ هێناوە، فەرمانـی پێکـردوون کار بکـەن بـە داخـوازی بڕواهێنانیـان، بـەوەی لەخوا بترسـن‌و واز لە سـەرپێچیەکانی بهێنـن‌و بڕوا بە پێغەمبەرەکـەی موحەممەد ﷺ بهێنن، بێگومـان ئەوان ئەگەر ئەوەیـان بەجێهێنـا ئـەوە خـوا پێیـان دەبەخشـێ ﴿ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِۦ ﴾واتـە: دوو بەش لە پاداشـت، بەشـێک لەسـەر بڕواهێنانیان بە پێغەمبەرانی پێشـوو، بەشـێک لەسـەر بڕواهێنانیان بـە موحەممـەد ﷺ، دەگونجـێ فەرمانەکـە گشـتی بـێ، خاوەنانـی کتێـب‌و جگـە لەوانیش بگرێتـەوە، ئەمـە دیـاروو ڕوونـە، بێگومـان خـوا ﷻ فەرمانـی پێکـردوون بـە بڕواهێنان‌و خۆپارێـزی، کـە هەموو ئایـن لەناویاندا کۆدەبێتەوە ئاشـکراو نهێنی‌و بنچینـەو لق‌و پۆکانی، بێگومـان ئـەوان ئەگەر ئـەم فەرمانە مەزنـە جێبەجێ بکەن خـوا پێیان دەبەخشـێ، ﴿ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِۦ ﴾ هیـچ کـەس ناتوانێ وەسـف‌و ئەنـدازەی بکات جگە لـە خوا نەبێ، پاداشـتێ لەسـەر بڕواهێنـان‌و پاداشـتێ لەسـەر خۆپارێـزی، یـان پاداشـتێ لەسـەر جێبەجـێ کردنـی فەرمانـەکان‌و پاداشـتێ لەسـەر دوورکەوتنـەوە لـە قەدەغەکـراوەکان، یـان مەبەسـت لەو دووانـە دووبـارە بوونـەوەی پێدانـە جار لـە دوای جار.

﴿ وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِۦ ﴾ واتـە: زانسـت‌و ڕێنمایـی‌و ڕووناکیەکتان پێدەبەخشـێ کـە ڕێنموونـی پـێ بکـەن لـە تاریکیەکانـی نەفامـی، لـە گوناهەکانتـان خـۆش دەبێـت، ﴿ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴾ (واتـە: خـوا خاوەنـی بەخششـی زۆر گەورەیە) با ئەم پاداشـتە بـەزۆر نەزانێ‌و سـەری پێ سـوڕنەمێنێ لە بەخششـی‌و چاکـەی خوای خـاوەن فەزڵی مەزن،

کـە بەخششـی هەمـوو ئاسـمانەکانو زەوی گرتوەتـەوە، هیـچ بەدیهێنراوێک بەتـاڵ نیە لە بەخششـی خوا بـە قـەد چاوتروکانێک نـە کەمتریـش لەوە.

﴿ لِّئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّن فَضْلِ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: فـەزڵو چاکـەی خۆمانمـان بۆتـان ڕوون کـردەوە بۆ کەسـێک بـڕوای هێنابێ بـە بڕواهێنانێکی گشـتیو لە خـوا ترسـابێو بـڕوای بەپێغەمبەرەکـەی هێنابـێ، لەبەر ئەوەی خـاوەن کتێبەکان زانسـتیان هەبـێ بـەوەی توانایان نیە بەسـەر شـتێ لە چاکەو بەخششـی خـوا، واتە: ناتوانـن قەدەغەی بکـەن لەسـەر خوا بـە پێی هـەواو هـەوەسو عەقڵـە فاسـیدو خراپەکانیـان، جـا وتوویانە: ﴿ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ﴿١١١﴾ ﴾البقـرة، (واتـە: کـەس ناچێتـە بەهەشـتەوە مەگـەر یەکێـک کـە جوولەکـە یـان گـاور بێـت ئەمـە) ئاواتیان دەخواسـت لەسـەر خـوا بـە هیـواو ئاواتی پـڕو پووچ.

خـوا هەواڵیـدا ئەوانـەی بڕوایان هێناوە بـە پێغەمبەرەکـەی موحەممەد ﷺ دوو بەشـیان هەیە لـە ڕەحمەتـی خـوا، وە ڕووناکیو لێخۆشـبوونیش، بە کوێرایـی چاوی خـاوەن کتێبەکان.

﴿ وَأَنَّ ٱلْفَضْلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ﴾ وە تـا بزانـن (واتە: هەرچی بەخشـش هەیە بەدەسـتی خوایـە دەیـدات بە هەر کەسـێک کە خـۆی بیەوێـت) لەوەی کـە حیکمەتـی دەیخوازێت لە بەخششـی خـۆی پێی بـدات ﴿ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴾ (واتـە: خوا خاوەنی بەخششـی زۆر گەورەیـە) کـە هیچ کـەس ناتوانێت ئەنـدازەی بکات.

تەفسیری سوورەتی (الحدید) تەواو بوو.


سورة المجادلة
بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ
وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ١ ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ
مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمْ ۖ إِنْ أُمَّهَٰتُهُمْ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔى
وَلَدْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ ٱلْقَوْلِ وَزُورًا ۚ وَإِنَّ
ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ٢ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ
لِمَا قَالُوا۟ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۚ ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ
بِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ٣ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ
مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۖ فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ
مِسْكِينًا ۚ ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۗ
وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٤ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ
كُبِتُوا۟ كَمَا كُبِتَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ وَقَدْ أَنزَلْنَآ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۚ
وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ ٥ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُم
بِمَا عَمِلُوٓا۟ ۚ أَحْصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ٦

# تەفسیری سوورەتی (المجادلة)

## مەدەنییە (٢٢) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٤): ﴿ قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمْ ۖ إِنْ أُمَّهَٰتُهُمْ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔى وَلَدْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ ٱلْقَوْلِ وَزُورًا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا۟ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۚ ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٣﴾ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۖ فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ۚ ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۗ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾:

ئـەم دەقانـە لەبارەی کەسـێک لـە پشـتیوانەکانەوە دابەزی (الأنصار) خێزانەکەی سـکاڵای خـۆی بـردە لای پێغەمبـەر ﷺ کاتی پیاوەکەی قەدەغەی کرد لەسـەر نەفسـی خـۆی، دوای پێکـەوە ژیانێکـی دوورو درێـژو بوونـی ماڵو منـداڵ، ئەو پیاوە کەسـێکی بەسـاڵادا چوو بـە تەمـەن بـوو، خێزانەکـەی سـکاڵای حاڵـی خـۆیو مێردەکـەی بـۆ لای خـواو بۆ لای پێغەمبەرەکـەی ﷺ بـرد، چەندیـن جار دووبـارەی کردەوەو دەریخسـت.

خـوا فەرمـووی: ﴿ قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ﴾ واتـە: (بێگومـان خـوا بیسـتی وتـەی ئـەو ژنـەی کـە لەبـارەی مێردەکەیـەوە گفتووگـۆی لەگـەڵ دەکـردی، وە سـکاڵای خۆی بـۆ لای خوا دەبـرد، وە خـوا گوێی لە) وتووێـژی هەردووکتـان بـوو لـە نێـوان یەکتردا.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ ﴾ واتـە: (بـە ڕاسـتی خوا بیسـەری) هەمـوو دەنگەکانە لە هەمـوو کاتەکاندا لەسـەر جـۆری پێویسـتیەکان، ﴿ بَصِيرٌ ﴾ ڕێکردنـی مێروولەیەکـی ڕەش دەبینـێ لەسـەر

بەردێکـی کەڕ لە شـەوێکی تاریکدا، ئەمـەش هەواڵدانـە دەربارەی تەواوی بیسـتن‌و بینینی، دەوردانـی بـە کاروبـارە وردو گـەورەکان، لـە نـاو ئەوەشـدا ئامـاژە هەیـە بـەوەی خوا لە نزیکتریـن ماوەدا سـکاڵاکەی لادەبـات‌و بـەڵاو نارەحەتیەکەی لەسـەر هەڵدەگـرێ، لەبەر ئەمەیـە باسـی حوکمـی ئـەوەو حوکمـی جگە لە ئەویشـی کـردوە بە شـێوەیەکی گشـتی، وەک فەرموویەتـی: ﴿ ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمْۖ إِنْ أُمَّهَٰتُهُمْ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔي وَلَدْنَهُمْ ﴾ (واتـە: ئەوانەتـان کـە (ظهـار) دەکـەن لەگـەڵ ژنەکانیانـدا ئەوانـە دایکی ئـەوان نیـن دایکـی ئـەوان هەر ئـەو ژنانەن کـە ئەوانیان لـێ بـووە). (ظهـار) کـردن لە ژن ئەوەیـە پیـاو بڵێـت: تـۆ لە جێـی دایکمیت، یان پشـتی تـۆ وەکو پشـتی دایکم وایـە) یان هەرکەسـێکی تـر لـە مەحرەمەکانـی، یان بڵێ: تۆ لەسـەر مـن قەدەغەی، بە مەرجـێ نەریت لای ئـەوان لـەم قسـەدا وشـەی (الظهـر) پشـت بێـت، لەبـەر ئەمەیـە خـوا نـاوی نـاوە بە (ظهـار) فەرموویەتـی: ﴿ ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمْ ﴾ واتە: چۆن ئـەم جۆرە قسـەیە دەکـەن کە دەزانن ئـەوە هیچ حەقیقەتێکـی نیە، ژنەکانیـان دەچوێنن بەو دایکانەیـان کـە لێیانـەوە هاتوونەتە بـوون،؟ لەبەر ئەمەیە خـوا کارەکەی بە گـەورە داناوەو ناشـرینی کـردوە، فەرموویەتـی: ﴿ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ ٱلْقَوْلِ ﴾ واتـە: قسـەیەکی خـراپ ﴿ وَزُورًا ﴾ واتـە: درۆ ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴾ واتـە: لـەو کەسـەی هەنـدێ لەسـەرپێچیەکانی کـردوە فریـای کەوتـووە بە تەوبـەی ڕاسـتەقینە، ﴿ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا۟ ﴾ زانایـان بۆچوونـی جیاوازیان هەیە دەربـارەی (العود) گەڕانەوە، وتـراوە: مانـای سـووربوونە لەسـەر جیماع کـردن لەلایەن ئـەو کەسـەوە کە (ظهـار)ی لە ژنەکـەی کـردوە، ئـەو تەنها بە سـووربوونی کەفارەتی باسـکراوی لەسـەر پێویسـت دەبێ، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی بێگومان خوا ﷻ باسـی کـردوە لـە کەفارەتدا، کـە دەبێ پێـش بەیەک گەیشـتن بـێ، ئەویـش تەنها بە سـووربوونە لەسـەری.

وتـراوە: مانـای حەقیقەتی جیماع کردنـە، بەڵگەش لەسـەر ئەمە ئەوەیە کە خـوا فەرمویەتی: ﴿ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا۟ ﴾ وە ئـەوەی وتویانـە بریتیـە: لـە جـووت بـوون. لەسـەر هـەردوو بۆچوونەکـە ﴿ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ﴾ ئەگـەر گەڕانـەوە بینـرا ئـەوە کەفارەتی ئـەم قەدەغەکراوە (ئازادکردنـی بەندەیەکـی) بـڕوادارە وەک لـە دەقێکـی دیکەدا بەسـتراوەتەوە، نێـر بێ یان مـێ، بـە مەرجێ سـەلامەت بـێ لـە ناتـەواوی زیانبەخش بـەکار کردن.

﴿ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ﴾ واتـە: پێویسـتە لەسـەر پیـاو وازبهێنـێ لە چوونـە لای ژنەکەی کە

(ظهـار)ی کـردوە لێی تـا بەندەیەک ئازاد نـەکات بە کەفـارەت ﴿ ذَٰلِكُمْ ﴾ ئەم حوکمەی کـە باسـمان کـرد بۆتـان ﴿ تُوعَظُونَ بِهِۦ ﴾ واتـە: ڕوونی دەکاتـەوە حوکـمو بڕیارەکەی بۆتـان، لەگەڵ ترسـاندنێکی بەسـتراو پێیەوە، چونکە مانـای ئامۆژگاری باسـکردنی حوکمو بڕیـارە لەگـەڵ هانـدانو ترسـاندندا، جـا ئەو کەسـەی دەیەوێـت ظیهـار بکات ئەگـەر بیر بکاتـەوە پێویسـت دەبێ لەسـەری بەندەیەک ئـازاد بکات، ئـەوە خۆی دەپارێـزێ لەو کارە ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴾ پاداشـتی هەمـوو کەسـێ دەداتەوە بەپێـی کردەوەکەی.

﴿ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ ﴾ (ئنجا ئەگەر کەسـێک دەسـتی نەکـەوت) بەندەیەک ئـازاد بکات، بەوەی هەر دەسـتی نەکـەوێ یان پـارەی نرخەکـەی نەبـێ ﴿ فَصِيَامُ شَهۡرَيۡنِ مُتَتَابِعَيۡنِ مِن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۖ فَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ ﴾ ڕۆژوو، ﴿ فَإِطۡعَامُ سِتِّينَ مِسۡكِينٗاۚ ﴾ یـان: ئەوەیـە خواردنیـان پـێ بـدات لـە ڕزقی وڵاتەکەی بـە پێی پێویسـتیان، ئەمـەش بۆچوونـی زۆرێکە لـە ڕاڤەکارانی قورئـان، یـان: خـواردن دەدرێ بـە هـەر هەژارێک بـە ئەندازەی مشـتێ گەنم یـان (صاع) ێـک، کـە چـوار مشـت دەکات لـە جگـە لـە گەنـم لـەوەی کە دروسـتە بـدرێ بـە پێی سروشـت، ئەمـەش بۆچوونـی دەسـتەیەکی دیکەیە لـە زانایان.

ئـەو حوکمـەی کە ڕوونمـان کردەوە بۆتانو ئاشـکرامان کـرد ﴿ لِتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ ﴾ (واتـە: بـۆ ئـەوەی بـڕوا بکـەن بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی) ئەویـش بـە پابەنـد بوونـە بەم حوکـمو بڕیـارەو جگـە لەویـش، لـە بڕیـارەکانو کارکـردن پێـی، چونکـە پابەنـد بوون بـە بڕیارەکانـی خـواو کارکـردن پێیـان لـە ئیمانەوەیـە، بەڵکـو ئەوە مەبەسـتە، لەوانەشـی کـە ئیمانـی پێ زیـاد دەبێو کامـڵ دەبـێو گەشـە دەکات ﴿ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۗ ﴾ (واتە: ئەوانـەش سـنووری خـوان) دەبێتە بەربەسـتێ لەوەی تووشـی ببێ، بۆیە پێویسـتە لەسـەری سـنوور نەبەزێنـێو کەمتەرخەمـی تێـدا نـەکات ﴿ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ (واتـە: وە بـۆ بێبڕوایـان سـزای سـەخت هەیـە) لـەم دەقانـەدا چەندیـن حوکـمو بڕیار لەخـۆ دەگرێ:

یەکـەم: بەزەیـی خوا بـە بەندەکانـیو خەمخۆری بۆیان، کاتێ باسـی سـکاڵای ئـەم ئافرەتە تووشـبوەی کـرد، کارەسـاتەکەی لەسـەر لابـردو بەرز کـردەوە، بەڵکـو ئەو کارەسـاتەی بـە بڕیارێکـی گشـتی بـەرز کـردەوە بۆ هەر کەسـێ تـووش دەبێ بـە وێنەی ئەم کێشـەو گیـرو گرفتە.

دووەم: بێگومـان (ظهـار) تایبەتـە بـە قەدەغەکردنـی ژن، چونکـە خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ مِّن نِّسَآئِهِم ﴾ جـا ئەگـەر کەنیزەکەکـەی لەخـۆی قەدەغـە بـکات ئـەوە پێـی ناوترێت

(ظهـار) بەڵکـو ئـەوە وەکـو قەدەغەکردنـی خـواردنو خواردنـەوە وایـە، تەنهـا کەفارەتی سـوێندخواردن تیایـدا پێویسـت دەبێ.

سـێیەم: دروسـت نیە (ظهار) لـە ئافرەتێ بکـرێ پێش ئـەوەی بگوازرێتەوە، چونکـە ناچێتە چوارچێـوەی ژنەکانیـەوە لە کاتـی (ظهار) کردندا، وەک چۆن دروسـت نیە تـەڵاق بدرێ، جا یەکسـانە ئەگەر ڕاسـتەوخۆ بێ یان هەڵپواسـیبێ.

چـوارەم: بێگومـان (ظهـار) قەدەغەیـە، چونکـە خـوا ناوینـاوە بـە خـراپو ناپەسـند لـە قسـەکردندا، هەروەهـا درۆ کردنێکـی نابەجێشـە.

پێنجـەم: ئاگـەدار کردنـەوەی خـوا لـە ڕووی بڕیـارو کاردروسـتیەوە، چونکـە خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ مَا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمْ ﴾.

شەشـەم: بـاش نیـەو کەراهەتـی هەیە بـۆ پیاو بانگـی خێزانەکەی بـکات بە نـاوی یەکێ لە مەحرەمەکانـی، وەک بڵـێ: ئـەی دایکـم، یاخود ئـەی خوشـکمو وێنەی ئەوانـەش، چونکە ئـەوە لەیەک دەچـێ لەگـەڵ مەحرەمدا.

حەوتـەم: کەفـارەت پێویسـت دەبـێ تەنهـا بـە گەڕانـەوەو سـووربوونە لەسـەر جیمـاع کـردن لەلایـەن ئەو کەسـەوە کـە (ظهـار)ی لـە ژنەکەی کـردوە، لەسـەر جیـاوازی دوو بۆچوونەکـەی پێشـوو نـەک تەنهـا بـە ظهـار کـردن.

هەشـتەم: دروسـتە لـە کەفارەتـی کۆیلـە، منـداڵ یـان گـەورە، نێـر بێ یـان مێ، بـە هۆی ڕەهایـی دەقەکە لـەوەدا.

نۆیـەم: بێگومان پێویسـتە کەفارەتەکە دەربهێنـرێ ئەگەر ئازاد کردنـی کۆیلەبێ یان ڕۆژوو گرتـن پێـش جووتبـوون، هەروەکـو چـۆن خـوا بەسـتویەتیەوە بـە پێچەوانـەی کەفارەتی خواردەمەنـی، بێگومـان بـۆ ئـەوە لەو کاتـەدا جووت بوون دروسـتە.

دەیـەم: بێگومـان پێدەچـێ حیکمـەت لـە پێویسـت بوونـی کەفـارەت پێش جـووت بوون بێتـە پاڵنـەرێ بۆ دانـی کەفارەتەکـە، چونکە ئەگەر حـەزوو ئامەزرۆی بـۆ جیماع جووڵاو زانـی کـە ناتوانێ ئـەو کارە بـکات مەگەر لـە دوای کەفارەتەکە ئـەوە پەلەی تێـدا دەکات بە دانـی کەفارەتەکە.

یـازدە: هـەر دەبێ خواردنی شەسـت کـەس بە کەفـارەت بـدرێ، ئەگەر خواردنی شەسـت کەسـی کۆکـردەوەو بەخشـی بەیەک کـەس، یان زیاتر لـەوە لە خواری شەسـت کەس بێ ئەوە دروسـت نیە، چونکە خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ﴾.

(٥): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ كُبِتُوا۟ كَمَا كُبِتَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ وَقَدْ أَنزَلْنَآ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۚ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٥﴾ ﴾:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾ دژایەتـی کردنـی خـواو پێغەمبەرەکـەی: بریتیـە لـە پێچەوانەبـوونو سـەرپێچی کردنیـان، بـە تایبـەت لـە کارە زۆر ناشـرینو قیزەونەکانـدا، وەک دژایەتـی خـواو پێغەمبەرەکـەی بـە بێبڕوایـیو دژایەتـی کردنـی دۆسـتانی خوا، کە دەفەرموێ: ﴿ كُبِتُوا۟ كَمَا كُبِتَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ واتە: سەرشـۆڕو ڕیسـوا بـوون، هەروەکو چۆن بـە پێشـینیان کرا، پاداشـت درانـەوە بەپێـی کردەوەکانیـان، هیـچ بەڵگەیەکیان نیە لەسـەر خـوا، چونکـە خـوا بەڵگـەی بەهێـزو دەسـەڵاتی خۆی پێویسـت کـردوە لەسـەر خەڵکیو بیانـووی بڕیـون، بێگومـان بەڵگـەی ڕوونو ئاشـکرای ناردوەتـە خوارەوە، کـە حەقیقەتو مەبەسـتەکان ڕوونو ئاشـکرا بـکات، جا هەرکەسـێ شـوێنیان بکەوێو کاریـان پێ بکات ئـەوە لەڕێنمایـی کراوانو سـەرکەوتووانە ﴿ وَلِلْكَٰفِرِينَ ﴾ بـۆ ئەوانەی بێبڕوایـی پێ دەکەن ﴿ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾ واتـە: سـزایەک ڕیسـواو سەرشـۆڕیان دەکات، وەک چـۆن لـووت بەرزیـان کـرد لە ئاسـت نیشـانەو بەڵگەکانـی خـوا، ئەویش سەرشـۆڕو زەلیلـی کردن.

(٦-٧): ﴿ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟ ۚ أَحْصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٦﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟ ۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٧﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ﴾ ڕۆژێـک خوا بەدیهێنـراوەکان زیندوو دەکاتەوە، ﴿ جَمِيعًا ﴾ (تێکـڕا) پاشـان ئەوان لـە گۆڕەکانیان بە پەلە هەڵدەسـتن، پاداشـتیان دەداتەوە بەپێـی کردەوەکانیان، ﴿ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟ ﴾ (واتە: پاشـان هەواڵیان پـێ دەدات بەوەی کـە کردوویانـە) لـە چاکـەو خراپە، چونکـە بێگومان ئـەوەی زانیوەو لـە (اللـوح المحفوظ) دا نوسـیویەتی، وە فەرمانـی کـردوە بە فریشـتە بەڕێزە پارێـزەرەکان کە بینووسـن، بکەران ئـەوەی ئەنجامیـان داوە بیریـان چووە، خـواش هەموو ئەوانـەی تۆمار کـردوە، ﴿ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾ (واتـە: وە خوا بەسـەر هەموو شـتێکدا ئاگادارە)

أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مَا يَكُونُ مِن
نَجْوَىٰ ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَا أَدْنَىٰ
مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا
عَمِلُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ٧ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ
نُهُوا عَنِ النَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَيَتَنَاجَوْنَ بِالْإِثْمِ
وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ وَإِذَا جَاءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ
بِهِ اللَّهُ وَيَقُولُونَ فِي أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا اللَّهُ بِمَا نَقُولُ حَسْبُهُمْ
جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمَصِيرُ ٨ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا
تَنَاجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَاجَوْا بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ
وَتَنَاجَوْا بِالْبِرِّ وَالتَّقْوَىٰ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ٩ إِنَّمَا
النَّجْوَىٰ مِنَ الشَّيْطَانِ لِيَحْزُنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَيْسَ بِضَارِّهِمْ
شَيْئًا إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ١٠ يَا أَيُّهَا
الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُوا فِي الْمَجَالِسِ فَافْسَحُوا يَفْسَحِ
اللَّهُ لَكُمْ وَإِذَا قِيلَ انشُزُوا فَانشُزُوا يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ
وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ١١

لەسەر ڕواڵەتەکانو نهێنیەکانو شاراوەکان، ئا لەبەر ئەمەیە هەواڵیداوە دەربارەی فراوانی زانستیو دەوردانی بەوەی لەناو ئاسمانەکانو زەویدایە، لە ووردو درشتو گەورە، وە بێگومان ئەو زاتە ﴿ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَا أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا ﴾ (واتە: چپەی هیچ سێ کەسێک نیە کە خوا چوارەمیان نەبێت، وە چپەی هیچ پێنج کەسێک نیە کە ئەو شەشەمیان نەبێت، وە نە کەمتر لەو ژمارە، نە زۆرتر نیە، مەگەر خوایان لەگەڵدایە لە هەر جێگایەکدا بن) مەبەست لەم لەگەڵدابوونە لەگەڵدابوونی زانستە، وە دەوردانی بەوەی چپەی پێ دەکەنو دەیشارنەوە لە نێوان خۆیاندا، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ (واتە: بە ڕاستی خوا بەهەموو شتێک ئاگادارو زانایە).

(٨-٩): ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نُهُوا عَنِ النَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَيَتَنَاجَوْنَ بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ وَإِذَا جَاءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ وَيَقُولُونَ فِي أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا اللَّهُ بِمَا نَقُولُ حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿٨﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَنَاجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَاجَوْا بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ وَتَنَاجَوْا بِالْبِرِّ وَالتَّقْوَىٰ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٩﴾ ﴾

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نُهُوا عَنِ النَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَيَتَنَاجَوْنَ بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ ﴾ (النجوى): بریتیە لە چپە چپ کردنی نێوان دوو کەس یان زیاتر، هەندێ جار بۆ خێرو چاکەیەو هەندێ جار بۆ شەڕو خراپەیە. خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە بڕواداران چپە بکەن بە چاکە، ئەویش ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو خێرو گوێڕایەڵیو هەستان بەبەجێهێنانی مافی خواو مافی بەندەکانی، (التقوى) لێرەدا ناوێکی کۆکەرەوەیە بە وازهێنان لە هەموو قەدەغەو گوناهێک.

جـا کەسـی بـڕوادار ئـەم فەرمانـە خواییـە جێبەجێـدەکات، نایینـی چپە چپ بکاتو قسـە بـکا تەنها بـەوە نەبێ نزیکی دەکاتـەوە لەخـواو دووری دەخاتەوە لە تووڕەییەکانی. کەسـی خراپـەکار کەمتەرخەمـی دەکات لـە فەرمانەکانی خـوا، چپە چپی خراپو دەسـت درێژیو تـاوان دەکاتو بـێ فەرمانـی پێغەمبەرەکەشـی دەکات، وەک ئـەو دوو ڕووانـەی کە ئەمە پیشـەو حاڵیانە لەگـەڵ پێغەمبەردا.

خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوۡكَ بِمَا لَمۡ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ ﴾ واتە: بەبێ ڕەوشـتی لەگەڵتا دەجوڵێنـەوە لـە کاتی سـڵاوکردنیان بـۆت، ﴿ وَيَقُولُونَ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ ﴾ واتە: لەناخـی خۆیاندا دەڵێـن کە خوای زانای پەنهانو ئاشـکرا باسـی کـردوە: ﴿ لَوۡلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ ﴾ (واتە: بۆچـی خـوا سـزامان نادات بە هـۆی ئەو قسـانەی کە پێـی دەڵێین).

مانـای وایـە ئـەوان کەمتەرخەمـن لـەوەدا، بەڵگـەش دەهێننـەوە بەپێـش نەخسـتنی سـزا لەسـەریان، خـوا ڕوونیدەکاتـەوە کـە بێگومـان ئـەو مۆڵـەت دەداو پشـت گوێـی ناخات، فەرموویەتـی: ﴿ حَسۡبُهُمۡ جَهَنَّمُ يَصۡلَوۡنَهَاۖ فَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴾ واتـە: دۆزەخیان بەسـە کە هەموو بەدبەختـیو سـزایەکی لەخـۆ گرتـووە، کـە دەوری داون، وە سـزا دەدرێـن تێیدا ﴿ فَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴾ (ئـای کـە جێگایەکـی زۆر خراپـە) ئەوانەی کە باسـکراون یـان خەڵکانێکن لە دوو ڕووەکان ئیمانەکەیـان دەردەخـەنو دەدوێـن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، بـەم دواندنەی کەوا خەیـاڵ دەکـەن ئـەوان مەبەسـتیان پێی خێـرو چاکەیە، بـەڵام ئـەوان لـەوەدا درۆ دەکەن، یـان خەڵکانێکـن لـە خاوەنانـی کتێب ئەوانـەی ئەگـەر سـڵاویان بکردایە لـە پێغەمبەر ﷺ دەیانـوت: (السـام علیـک یا محمـد) مەبەسـتیان لەمە مـردن بوو.

(١٠): ﴿ إِنَّمَا ٱلنَّجۡوَىٰ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ لِيَحۡزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيۡسَ بِضَآرِّهِمۡ شَيۡـًٔا إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١٠ ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلنَّجۡوَىٰ ﴾ واتـە: دوژمنانـی بـڕواداران چپـە دەکـەن بە فرتو فێـڵو داواکردنـی خراپـە دژ بە بـڕواداران ﴿ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ﴾ (لـە شـەیتانەوەیە) کە فرتو فێڵـی لاوازو بێ سـوودە ﴿ لِيَحۡزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ (واتە: تـا ئەوانەی کـە بڕوایان هێناوە دڵتەنـگ بکات) ئەمـە ئەوپەڕی فێـڵو مەبەسـتیەتی ﴿ وَلَيۡسَ بِضَآرِّهِمۡ شَيۡـًٔا إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ ﴾ (واتـە: لـە کاتێکـدا کـە هیچ شـتێک زیانیـان پـێ ناگەیەنێـت مەگەر بـە فەرمانـی خوا)، بێگومـان خـوا پەیمانیـداوە بـە بـڕواداران بـە زاڵ بـوونو سـەرکەوتن بەسـەر دوژمنانـدا، فەرموویەتـی: ﴿ وَلَا يَحِيقُ ٱلۡمَكۡرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهۡلِهِۦ ٤٣ ﴾ فاطر، (واتـە: وە فێـڵو پیلانـی

خـراپ تەنها زیـان بـە خاوەنەكـەی دەگەیەنێ).
جـا دوژمنانـی خـواو پێغەمبەرەكـەیو بـڕواداران هەرچەنـدە چپـەو فـڕو فێڵ بكـەن ئەوە زیانەكـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ خۆیـان، بـڕواداران هیـچ زیانێكیـان پـێ ناگات مەگەر شـتێ خـوا بە قـەزاو قـەدەر نووسـیبێتی،﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾ واتـە: (ئیماندارانیش با تەنها) پشـت بـە خوا ببەسـتنو متمانەیـان بە پەیمانـی هەبێ، چونكـە بێگومان هەركەسـێ پشـت بەخـوا ببەسـتێ ئـەوە دەیپارێزێ لە فێڵـی دوژمنان، وە لـە كاروباری دیـنو دونیایدا.
(١١):﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمۡ تَفَسَّحُواْ فِي ٱلۡمَجَٰلِسِ فَٱفۡسَحُواْ يَفۡسَحِ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ١١ ﴾:
﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمۡ تَفَسَّحُواْ فِي ٱلۡمَجَٰلِسِ فَٱفۡسَحُواْ يَفۡسَحِ ٱللَّهُ لَكُمۡ ﴾ واتـە: ئەمـە پەروەردكرنـە لـە لایەن خواوە بۆ بەنـدە بڕوادارەكانـی ئەگەر كۆبوونـەوە لە كۆڕێك لـە كۆڕەكانیان، پێویسـتی كرد هەندێكیان یـان هەندێ لەوانەی هاتـوون جێگەیان بكرێتەوە لـە كۆڕەكـەدا، بێگومـان لـە ئـەدەبو پـەروەردە ئەوەیـە جێگەیـان بۆ فـراوان بكـرێ بۆ ئـەوەی ئەم مەبەسـتە دەسـتەبەر بێت.
ئـەوە زیـان ناگەیەنێـت بە دانیشـتوو، مەبەسـتی براكـەی دەسـتەبەر دەبێ بێ ئـەوەی زیان بگـات بە دانیشـتوو، پاداشـتیش لـە ڕەگەزی كردەوەیە، هەركەسـێك گوشـاد بـكات خوا بـۆی گوشـاد دەكات، وە هـەر كەسـێك فراوانـی بـكات بـۆ براكـەی خـوا بۆی فـراوان دەكات﴿ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ ﴾ واتـە: (ئەگـەر پێتان گوترا) هەسـتن، وە لـە جێگەی خۆتان لابچـن لـە كـۆڕو مەجلیسـەكانتان بـە هۆكارێـك هاتبێتە پێـش﴿ فَٱنشُزُواْ ﴾ واتـە: پەلە بكـەن لە هەسـتاندا بۆ دەسـتەبەر بوونـی ئـەو بەرژەوەندیە.
بە ڕاسـتی هەسـتان بـە وێنەی ئـەم كاروبارانە لە زانسـتو ئیمانەوەیە، خوای گـەورەش پلەو پایـەی خاوەنانـی زانسـتو بـڕوا بەرز دەكاتـەوە بـە چەندین پلە بـە گوێرەی ئـەوەی خوا تایبەتـی كـردوون پێی لە زانسـتو ئیمان.
﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴾ پاداشـتی هەمـوو كەسـێك دەداتـەوە بـە پێـی كردەوەكەی، جا ئەگـەر چاكـە بـوو بە چاكـە، ئەگەر خراپـەش بوو بـە خراپە. لـەم دەقەدا چاكەی زانسـت دەردەكـەوێ، بێگومـان جوانـیو ڕازاوەیـیو بەرهەمـی پـەروەردە بوونـە بـە ئادابەكانـیو كاركردنـە بـە داخوازیەكانی.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَٰجَيۡتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ
صَدَقَةٗۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ
(١٢) ءَأَشۡفَقۡتُمۡ أَن تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَٰتٖۚ فَإِذۡ لَمۡ تَفۡعَلُواْ
وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ
وَرَسُولَهُۥۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ (١٣) ۞أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ
قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مَّا هُم مِّنكُمۡ وَلَا مِنۡهُمۡ وَيَحۡلِفُونَ عَلَى ٱلۡكَذِبِ
وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ (١٤) أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدًاۖ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ
يَعۡمَلُونَ (١٥) ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَهُمۡ
عَذَابٞ مُّهِينٞ (١٦) لَّن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ
شَيۡـًٔاۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ (١٧) يَوۡمَ يَبۡعَثُهُمُ
ٱللَّهُ جَمِيعٗا فَيَحۡلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ
عَلَىٰ شَيۡءٍۚ أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ (١٨) ٱسۡتَحۡوَذَ عَلَيۡهِمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ
فَأَنسَىٰهُمۡ ذِكۡرَ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱلشَّيۡطَٰنِ
هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ (١٩) إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡأَذَلِّينَ
(٢٠) كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغۡلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِيٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ (٢١)

**(١٢-١٣):** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَٰجَيۡتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَةٗۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ (١٢) ءَأَشۡفَقۡتُمۡ أَن تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَٰتٖۚ فَإِذۡ لَمۡ تَفۡعَلُواْ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ (١٣) ﴾

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَٰجَيۡتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَةٗۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ (١٢) ءَأَشۡفَقۡتُمۡ أَن تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَٰتٖۚ ﴾

خوا ﷻ فەرمان دەكات بە بڕواداران بە خێركردن لە بەرانبەر قسە كردنی پەنهان لەگەڵ پێغەمبەرەكەی موحەممەد ﷺ وەك ئەدەبێك بۆیانو فێربوونو بە مەزندانانی پێغەمبەر ﷺ چونكە بەڕاستی ئەم مەزندانانە چاكترو پاكترە بۆ بڕواداران، واتە: بە هۆی ئەوەوە چاكەو پاداشتتان زۆر دەبێ، وە پاک دەبنەوە لە پیسو چەپەڵی كە لە نێوانیاندا وازهێنانە لە ڕێزگرتنی پێغەمبەرو بە ڕەوشت بوون لەگەڵی بە چپە كردنی زۆر كە هیچ بەرهەم ناهێنێ، چونكە ئەگەر فەرمان بكرێ بە خێركردن لە كاتی چپەكردن لەگەڵیدا، ئەمە دەبێتە تەرازوویەک بۆ ئەو كەسەی سوورە لەسەر خێرو زانست، جا گوێ نادات بە خێرو چاكە.

هەر كەسێ سوور نەبێ لەسەر خێرو زانستو حەزی لێ نەبێ، بەڵكو مەبەستی زۆر قسەكردن بێت، بە هۆی ئەو خێرو چاكەوە دەست هەڵدەگری لەوەی كە ئازاری پێغەمبەر ﷺ دەدات، ئەم فەرمانە بۆ كەسێكە توانای خێر كردنی هەبێت.

بەڵام ئەوەی دەست كورتەو ناتوانێ خێر بكات، ئەوە بێگومان خوا كاری لەسەر تەنگ نەكردوە، بەڵكو لێی خۆش بووەو لێی بووراوە، ڕێگەیشی پێدراوە چپە بكات بەبێ پێش خستنی خێر كردنێک كە لە توانایدا نەبێ.

پاشان كاتێ خوای بەرزو مەزن تامەزرۆیی بڕوادارانی بینی، وە نارەحەتی خێركردن لە سەریان

لەگەڵ هەر چپەکردنێکدا، فەرمانەکەی لەسەریان ئاسان کرد، سزای نەدان بە وازهێنان لە خێرکردن لە کاتی چپەکردن، بە مەزن دانانو ڕێزداری پێغەمبەر ﷺ وەکو خۆی مایەوەو نەسخ نەکرایەوەو هەڵنەوەشایەوە، چونکە ئەم بڕیاری خێرکردنە لە کاتی قسەی پەنهان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ تەنها خێرکردن نیە، بەڵکو مەبەست بە ئەدەب بوونە لەگەڵ پێغەمبەرو ڕێزگرتنێتی.

خوا فەرمانی کردوە بە برواداران بەو فەرمان پێکراوە گەورانە هەستن کە مەبەستن، جا فەرموویەتی: ﴿ فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُوا ﴾ واتە: (ئنجا ئەگەر خێرتان نەکرد) پێشخستنی خێرکردنی گران نەکردوە لەسەرتان، ئەوەش بەس نیە، چونکە بەڕاستی مەرج نیە ئەو خێرکردنە ئاسان بێت لەسەر بەندەو لە توانایدا بێت، لەبەر ئەمەیە بەستوویەتیەوە بە وتەی خۆیو فەرموویەتی: ﴿ وَتَابَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ ﴾ واتە: لێتان خۆش بوو لەوەی نەتانتوانی خێر بکەن پێش قسە کردن بە پەنهان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ

﴿ فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ ﴾ بە پایەکانیو مەرجەکانیو سەرجەم سنوورو پێویستیەکانی، ﴿ وَآتُوا الزَّكَاةَ ﴾ ئەوەی پێویست کراوە لە ماڵو سامانەکانتان، بۆ ئەو کەسانەی شایستەن.

ئەم دوو پەرستشە دایکی هەموو پەرستشە جەستەییو ماڵیەکان، هەر کەسێ بە شێوەیەکی شەرعی ئەنجامیان بدات، ئەوە بە مافی خواو بەندەکانی خوا هەستاوە، بۆیە لە دوای ئەوە فەرموویەتی: ﴿ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ ﴾ ئەمە گشتگیرترە لەوەی لە فەرمانەکاندا هاتووە.

وە دەچێتە نێو ئەمەوە گوێڕایەڵی کردنی خواو گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەرەکەی، بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانیانو دوور کەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکان، وە بەڕاستدانانی ئەوەی هەواڵی پێداوەو وەستان لە ئاستی سنوورەکانی خوا.

پەند لەوەدا دڵسۆزیو چاکەو ئیحسانە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾ جا خوا ﷻ دەزانێ بە کردەوەکانتان، وە بەچی هۆیەکەوە کردووتانە، پاداشتتان دەداتەوە بە پێی زانستی خۆی بەوەی لە ناو دڵەکانتاندایە.

(١٤-١٩): ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ تَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى الْكَذِبِ
وَهُمْ يَعْلَمُونَ (١٤) أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (١٥) اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً
فَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ (١٦) لَّن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلَا أَوْلَادُهُم مِّنَ اللَّهِ شَيْئًا
أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ (١٧) يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ
وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ (١٨) اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَأَنسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ أُولَٰئِكَ
حِزْبُ الشَّيْطَانِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الْخَاسِرُونَ (١٩) ﴾ :

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی ناشرینی حاڵی ئەو دووڕووانەی کە بێبڕوایان لە جوولەکەو گاورەکانو جگە لەوانیش دەکەن بە دۆستو پشتیوان، لەوانەی کە خوا ﷻ خەشمو قینی لێگرتوون، وە چاکترین بەشیان وەرگرتووە لە نەفرینی خوا، ئەوانە نە لە بڕواداران، وە نەلە بێبڕوایانن، ﴿ مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ﴿١٤٣﴾ ﴾النساء (واتە: ئەوانە گیریان خواردوە لە نێوانیاندا نە ئەوەیە پاڵ بدەن بە بڕوادارانەوە نە ئەوەشە پاڵ بدەن بە کافرانەوە).

ئەوانە بڕوادار نین بە ڕواڵەتو بە ناوەڕۆک، چونکە ناوەڕۆکیان لەگەڵ بێبڕوایانە، لەگەڵ بێبڕوایاندا نین بە ڕواڵەتو بە ناوەڕۆک، چونکە بە ڕواڵەت لەگەڵ بڕواداراندان، ئەمەش وەسفیانە کە خوا کردوویەتی، لە کاتێکدا ئەوان سوێند دەخۆن لەسەر پێچەوانەکەی کە بریتیە لە درۆ، سوێند دەخۆن کە ئەوان بڕوادارن، خۆیانیش چاک دەزانن ئەوان بڕوادار نین.

جا پاداشتی ئەو خیانەتکارو خراپەکارو درۆزنانە ئەوەیە خوا سزایەکی سەختی بۆ ئامادە کردوون، کە هیچ کەس ناتوانێ ئەندازەی بکاتو هیچ کەسیش نازانێ وەسفی چۆنە، بەڕاستی ئەوەی ئەوان دەیانکرد کارێکی خراپو نارەوا بوو، چونکە کارێکیان کرد کە ببێتە مایەی توورەبونی خواو سزاو نەفرینی خۆی لەسەریان پێویست بکات.

﴿ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً ﴾واتە: (سوێندەکانیان کردبوە) قەڵغانو پارێزەر، خۆیان پێ دەپاراست لە لۆمەو سەرکۆنەی خواو پێغەمبەرەکەیو بڕواداران، جا بە هۆی ئەمەوە ڕێگری خۆیانو جگە لە خۆیانیان دەکرد لە ڕێبازی خوا، ئەویش ئەو ڕێگایەیە کە هەرکەسێ بیگرێتە بەر دەیبات بەرەو بەهەشتانی پڕ لە نازونیعمەت، وە هەر کەسێکیش ڕێگری لێبکات، هیچ ڕێگایەکی دیکەی لە بەردەمدا نیە تەنها ئەو ڕێگایە نەبێ کە دەیگەیەنێ بە ئاگری دۆزەخ.

﴿ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾ (ئنجا سزای ڕیسواکەریان بۆ هەیە) چونکە کاتێ لووت بەرزیان کردوە لە ئاستی بڕواهێنان بە خواو ملکەچ بوونی ئایەتو نیشانەکانی، خوا سەرزەنشتی کردوون بە سزای هەمیشەیی، کە بۆ ساتێکیش لەسەریان هەڵناگیرێو تەماشا ناکرێن ﴿ لَّن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ﴾ (واتە:ماڵو منداڵیان هیچ سوودێکی نیە بۆیان) هیچ بەرگریەکیان لێ ناکەن لە سزای خوا، وە هیچ بەشێکیان لە پاداشت بۆ دەستەبەر ناکەن ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ پەیوەستن پێیەوە، ئەوانەی لەو ئاگرە دەرناچن ﴿ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾بە هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە.

وە هەر كەسێ لەسەر شتێک بژی لەسەر ئەوە دەمرێ، هەروەک چۆن دوو ڕووەكان لە دنیادا ڕاستیەكانیان لە بڕواداران دەشاردەوەو سوێندیان بۆ دەخواردن كە ئەوان بڕوادارن، جا لەڕۆژی دواییشدا كاتێ خوا هەموویان زیندوو دەكاتەوە، سوێند بۆ خوا دەخۆن، وەک چۆن لە دنیادا سوێندیان بۆ بڕواداران دەخوارد، وە وایان دەزانی لەو سوێند خواردنەیاندا شتێكیان بە دەستەوەیە، چونكە بێبڕوایی‌و دوو ڕوویی‌یانو پووچی بیروو بڕوایان بە بەردەوام قووڵ دەبوو لە ناخیاندا، قۆناغ بە قۆناغ هەتا هەڵیخەڵەتاندنو پێیان وابوو ئەوان لەسەر ڕاستیەكن پشتی پێدەبەسترێ‌و پاداشتی پێدا هەڵدەواسرێ، ئەوان لەوەدا درۆیان دەكرد، بێگومان ئەوەی زانراوە كە درۆ كردن خوای زانای پەنهانو ئاشكرا فریو نادات.

ئەمەی بەسەریاندا هات لە زاڵبوونی شەیتان بوو، كە دەستی گرت بەسەریانداو كردەوەكانیانی لە پێش چاویان ڕازاندەوەو یادی خوای لەبیر بردنەوە، بە ڕاستی ئەوە دوژمنێكی دیارە كە هیچی لێیان ناوێ تەنها خراپە نەبێت، ﴿ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ﴾ فاطر، (واتە: بێگومان شەیتان تاقمو كۆمەڵەكەی بانگ دەكات بۆ ئەوەی ببنە هاوەڵانی ئاگری هەڵگیرساوی دۆزەخ).

﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَٰنِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴾ (واتە: ئەوانە كۆمەڵو حیزبی شەیتانن با بزانن كە بەڕاستی هەر حزبی شەیتان زەرەر مەندە) ئەوانەی كە ئاینو دونیاو نەفس‌وماڵیان دۆڕاندوە.

(٢٠-٢١): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ٱلْأَذَلِّينَ ﴿٢٠﴾ كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٢١﴾ ﴾:

ئەمە پەیمانو هەڕەشەكردنە، هەڕەشەكردنە بۆ ئەو كەسەی دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەكەی دەكات، بە بێبڕوایی‌و سەرپێچی كردن، بێگومان ئەو كەسە ڕیسواو زەلیلە، هیچ سەرەنجامێكی چاک‌و ستایشكراوی نیە، وە هیچ بەیداخێكی نیە سەری بخات.

وە پەیمانیداوە بەو كەسەی بڕوای پێ دەهێنێ، وە بە پێغەمبەرانی‌و شوێنی پەیامی ئەوان دەكەوێ، ئەوە لە حیزب‌و دەستەی سەركەوتووانە، بێگومان سەرفرازی‌و سەركەوتن‌و زاڵ بوونیان بۆ هەیە لە دونیاو دوارۆژدا، ئەمەش پەیمانێكە نە دەشكێنرێ‌و نە دەگۆڕدرێ، چونكە لە لایەنی خوای ڕاستگۆی بەهێزی بە دەسەڵاتەوە دراوە، كە هیچ شتێک دەستەوسانی ناكات لەوەی دەیەوێ.

لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَٰئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُولَٰئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٢٢﴾

**(٢٢):** ﴿لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَٰئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُولَٰئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٢٢﴾﴾

**واتە: ئەمەو ئەوە پێکەوە کۆ نابنەوە، بە ڕاستی بەندە بڕوادار نابێ بەخواو بەڕۆژی دوایی مەگەر کار بکات بە پێویستیەکانی بڕواهێنانو ئەوەیشی پەیوەستە پێیەوە، لە خۆشویستنی ئەو کەسەی بڕوای هێناوەو پشتیوانی کردنی، وە ڕق لێبوونەوە لەوە بەجێی نەهێناوەو دژایەتی کردنی، ئەگەرچی نزیکترین کەس بێ لێیەوە، ئەمە بریتیە لە بڕواهێنانی ڕاستەقینە، کە بەرهەمو مەبەستەکەی دەرکەوتووە.**

**خاوەنانی ئەم وەسفە ئەوانەن کە خوا بڕوای لە دڵیاندا وێنەکێشاوەو چەسپاندوویەتیو چاندوویەتی، بە چاندنێ نە دەلەقێو نە گومانو دوو دڵی کاریگەری تێدەکات، ئەوانیش ئەو کەسانەن خوا سەری خستوون بە وەحیو نیگاو یارمەتیو چاکەی خۆی.**

**ئەوانەن کە ژیانێکی پاکیان هەیە لە دونیادا، وە لە بەهەشتی پڕ لە نازونیعمەتیشدا ماڵی مانەوەیان بۆ هەیە، ئەو بەهەشتەی کە تێیدایە لە هەموو ئەوانەی کە نەفسو دەروون حەزی پێدەکەنو چاو لەزەتی لێدەبینێو هەڵیدەبژێرێ، وە چاکترین نازو نیعمەت بۆ ئەوان ئامادەیە، ئەویش ئەوەیە کە خوا ﷻ لێیان ڕازی دەبێو هەرگیز لێیان توورە نابێ، ئەوانیش ڕازی دەبن لە پەروەردگاریان بەوەی پێی بەخشیون، لە جۆرەها ڕێزو پاداشتی بێپایانو بەخشینەکانو پلەو پایە بەرزەکان،**

بـە جـۆرێ نابینـن لـە سـەرووی ئـەوەی خـوا پێیانیـداوە هیـچ ئامانجێـکو کۆتاییـەک. بـەڵام ئـەوەی پێـی وایـە ئـەو بـڕوای هەیە بـە خـواو بـەڕۆژی دوایـی، لەگەڵ ئەوەشـدا دۆسـتایەتی دوژمنانـی خـوا دەکات، ئـەو کەسـەی خـۆش دەوێ کـە واز لـە بڕواهێنانـی دێنێـتو پشـت گوێـی دەخـات، بێگومـان ئەمـە بڕواهێنانێکـی خەیـاڵ پـلاوو پـێ وا بوونـە، کـە هیـچ حەقیقەتێکـی نیـە، چونکـە بێگومـان هـەر کارێـک پێویسـتی بـە بەڵگـەو سـەلماندنێ هەیـە کـە بیسـەلمێنێو بـە ڕاسـتی دابنـێ، تەنهـا بانگەشـە کـردن هیـچ سـوودێکی نیـەو نایسـەلمێنێ کـە خاوەنەکـەی ڕاسـت دەکات.

تەفسیری سوورەتی (المجادلة) تەواو بوو.


سورة الحشر
بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمۡ لِأَوَّلِ ٱلۡحَشۡرِۚ مَا ظَنَنتُمۡ أَن يَخۡرُجُواْۖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمۡ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنۡ حَيۡثُ لَمۡ يَحۡتَسِبُواْۖ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعۡبَۚ يُخۡرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيۡدِيهِمۡ وَأَيۡدِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ٢ وَلَوۡلَآ أَن كَتَبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡجَلَآءَ لَعَذَّبَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابُ ٱلنَّارِ ٣

## تەفسیری سووڕەتی (الحشر)

**مەدەنییە (٢٤) ئایەتە**

**بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە**

**(١-٧):** ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمۡ لِأَوَّلِ ٱلۡحَشۡرِۚ مَا ظَنَنتُمۡ أَن يَخۡرُجُواْۖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمۡ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنۡ حَيۡثُ لَمۡ يَحۡتَسِبُواْۖ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعۡبَۚ يُخۡرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيۡدِيهِمۡ وَأَيۡدِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ٢ وَلَوۡلَآ أَن كَتَبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡجَلَآءَ لَعَذَّبَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابُ ٱلنَّارِ ٣ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۖ وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٤ مَا قَطَعۡتُم مِّن لِّينَةٍ أَوۡ تَرَكۡتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيُخۡزِيَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ٥ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٦ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٧﴾

**ئەم سوورەتە ناونراوە بە سوورەتی (بني النظير) ئەوانیش دەستەیەکی گەورە بوون لە جوولەکە لە دەوروبەری مەدینە دەژیان لە کاتی هاتنی پێغەمبەر ﷺ.**

**کاتێ پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئەوانیش بێبڕوا بوون پێی لە کۆی ئەوانەی بێبڕواییان پێ کرد لە جوولەکەکان، کاتێ کۆچی کرد بۆ مەدینە، لەگەڵ هەموو تایفەکاندا ڕێککەوت ئەوانەی کە دراوسێی بوون لە دەووروبەری مەدینە.**

**بەڵام دوایی جەنگی بەدر بە شەش مانگ یان وێنەی ئەو، پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ**

ناویـان، قسـەی لەگەڵـدا کـردن یارمەتـی بـدەن دەربـارەی خوێـن بایـی ئـەو دووانەی لە هـۆزی (کلاب) بـوون کـە عەمری کـوڕی ئومەیـەی (الضمري) کوشـتبوونی، جـا وتیان: یارمەتیـت دەدەیـن ئـەی باوکـی قاسـم، لێـرەدا دانیشـە تـا کارەکـەت بـۆ رادەپەڕێنیـن، هەندێکیـان رێگەیـان بـۆ هەندێکـی دیکـە چۆڵ کرد، شـەیتان فریـوی دان بـۆ بەدبەختی، ئـەو بەدبەختیـەی کـە لەسـەریان نووسـرابوو، پیلانیان گێـڕا بە کوشـتنی پێغەمبـەر ﷺ، وە وتیـان: کێتـان ئـەم دەسـتارە دەباتـە ئەو سـەربانەو فڕێـی دەداتە خـوارەوە بـۆ پێغەمبەر ﷺ سـەری پـێ پـان بکاتـەوە؟ خراپترینیـان عەمری کـوڕی جەحاش بـوو وتی: من، سـەلامی کـوڕی مشـکەم وتی: نەخێـر کاری لەو جۆرە مەکەن، سـوێند بـە خوا هەواڵـی پێی دەدرێ بـەوەی ئێـوە خەیاڵـی دەکـەن، ئـەوەش شـکاندنی پەیمانـە کە لـە نێـوان ئێمـەو ئەودایە، راسـتەوخۆ پێغەمبـەر ﷺ وەحـی بـۆ هات لە لایـەن پەروەردگاریـەوە بەو پیلانـەی دایانابوو بۆی.

بـە پەلـە هەڵسـا رووی کـردە مەدینە کاتێ گەیشـت بـە هاوەڵەکانـی، وتیان: هەسـتایتو ئێمـە هەسـتمان پێـت نەکـرد، ئەویـش هەواڵـی ئەوەی پێـدان بـەو پیلانەی کـە جوولەکە خەیاڵیـان کردبـوو. پێغەمبـەر ﷺ نوێنـەری نارد بـۆ ناویان کە پێیـان بڵێـت: (أن أخرجوا من المدينـة ولا تسـاكنوني بهـا، وقـد أجَّلتكم عـشراً، فمـن وجـدت بعـد ذلك بهـا ضربت عنقـه) واتە: دەربچـن لـە شـاری مەدینە تێـدا دامەنیشـن، تەنهـا دە ڕۆژ مۆڵەتـم پێتـان داوە، دوای ئەوە هەرکەسـێکی تێـدا ببینم دەدەم لـە گەردنی.

چەنـد ڕۆژێـک ماونـەوە خۆیان ئامـادە دەکـرد، عەبدوڵڵای کـوڕی ئوبەی کوڕی سـەلول نامـەی بۆیـان نـارد: دەرمەچـن لە مـاڵو شـوێنی خۆتان، مـن دوو هـەزار پیـاوم لەگەڵدایە دێنـە نـاو قەڵاکانتانـەوە دەمـرن لـە پێناوتانـدا، وە (بنـي قريظـة)و هاوپەیمانەکانتـان لـە (غطفـان) یارمەتیتـان دەدەن.

گەورەکەیـان حویـەی کـوڕی ئەختەب تەماحی بۆ دروسـت بـوو لەوەی (کوڕی سـەلول) پێـی گـوت، نێـردراوای نـارد بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺ دەیفەرمـوو: ئێمـە دەرناچین لـە ماڵو شـوێنەکانمان، چیـت لـە دەسـت دێـت درێغـی مەکـە، پێغەمبـەر ﷺ (الله أكبـر)ی کردو، لەگـەڵ هاوەڵەکانـی دەرچـوو بۆ سـەریان، عەلی کـوڕی ئەبو تالیـب هەڵگـری بەیداخەکە بـوو، ئەوان لـە قەڵاکانـی خۆیاندا بـوون تیـرو بەردیان دەهاوێشـت.

(بنـي قريظـة)ش پشـتیوانیان لێنەکـردن، کـوڕی سـەلولو هاوپەیمانەکانیـان لـە (غطفـان)

خیانەتیـان لێکردن، پێغەمبەر ﷺ گەمـارۆی دان، دارخورماکانیانی بڕیو سـوتاندنی، ئەوانیش نێردراویـان نـارد بـۆ لای: ئێمـە دەردەچیـن لـە مەدینـە، فەرمانی کـرد بـە دەرچوونیان بە خۆیـانو منداڵەکانیـان، دەشـتوانن بـە قەد باری حوشـترەکانیان شـت ببەن جگـە لە چەک نەبێـت، پێغەمبـەر ﷺ دەسـتی بەسـەر مـاڵو چەکەکانیاندا گرت.

مـاڵو سـامانی (بنـو النضیر) تایبەت بوون بـۆ پێغەمبـەرو ﷺ هەڵبژێـردراوانو بەرژەوەندی مسـوڵمانان، دابەشـی نەکـرد بـە پێنـج یـەک، چونکە خوا ئـەو دەسـتکەوتانەی پێـدا بە بێ جەنگ، مسـوڵمانان بۆ بەدەسـتهێنانی ئەسـپو حوشـترێکیان تاو نەدابوو، دەربەدەری کردن بـۆ خەیبـەر، وە گەورەکەیـان حویـەی کـوڕی ئەختەبیـان تێدا بـوو، پێغەمبەر ﷺ دەسـتی گـرت بەسـەر زەویو مـاڵو چەکەکانیانـدا، لـە چەکـەکان پەنجـا زرێو پەنجـا کۆپارەی سـەرو سـێ سـەدو چل شمشـێری دەسـتکەوت، ئەمەش پووختەی چیرۆکەکەیانە خاوەنانی (کتێبـی) ژیاننامە باسـیان کردوە.

(١) خـوا ﷻ لـەم سـوورەتەدا بە هەواڵدان دەسـتی پێکردوە، بەوەی هەرچی لە ئاسـمانەکانو زەویـە بـە پـاکو بێگـەردی ستایشـی پەروەردگاریـان دەکـەن، وە بـە پـاک ڕایدەگـرن لـەوەی شـیاوی گەورەیی ئـەو زاتە نیـە، وە دیپەرسـتنو ملکەچی مەزنی ئـەو دەبن، چونکە ئـەو زاتـە بە دەسـەڵاتە زاڵە بەسـەر هەموو شـتێکدا، هیـچ شـتێک ڕێگری لێنـاکاتو هیچ کەسـێک لێی یاخـی نابێت.

خـوا کاربەجێیـە لـە دروسـتکردنیو فەرمانیدا، هیچ شـتێک لە خـۆڕاو بە هاوەنتە دروسـت نـاکات، شـەریعەتێک دانانێت کـە بەرژەوەندی تێدا نەبـێ، وە بە پێی داخـوازیو حیکمەتی خـۆی کاروبـارەکان بەڕێوە دەبات.

لەوانـە سەرخسـتنی خوا بـۆ پێغەمبەرەکەی بەسـەر ئەوانـەی بێبڕوابوون لـە خاوەنانی کتێب لـە (بنـي النضـير) کاتێ غـەدرو خیانەتیان کـرد لەگـەڵ پێغەمبەر ﷺ، ئەویـش دەریکردن لە مـاڵو خاکەکەیان کـە خوویان پێـوە گرتبوو لەگەڵیـدا ڕاهاتبوون.

بێگومـان دەرکردنیـان تێیـدا یەکـەم دەرپەڕانـدنو دەربـەدەر کردن بـوو، خوا لەسـەریانی نووسـیبوو لەسـەر دەسـتی پێغەمبـەر موحەممـەد ﷺ، ئـاوارەو دەربـەدەر بـوون بـۆ خەیبەر، دەقـە پیرۆزەکـە دەبێتـە بەڵگە لەسـەر ئـەوەی دەرپەڕانـدنو دەربەدەرکردنێکی دیکەشـیان تـووش دەبـێ جگە لەمە. بەڕاسـتی ئـەوەش ڕوویـدا کاتـێ پێغەمبەر ﷺ دەربـەدەری کردن بـۆ خەیبـەر، پاشـان عومـەر (خوای لـێ ڕازی بێـت) ئەوەیـان مابـوو دەری کردن.

(٢) ﴿ مَا ظَنَنتُمْ ﴾ (بــە تەمــا نەبــوون) ئــەی بــرواداران ﴿ أَن يَخْرُجُوا ﴾ (کــە دەربچــن) لــە شــوێنەکانیان بــە هــۆی قەڵاکانیــان ڕێگــری کردنیــانو ســەربەرزیان تیایدا، ﴿ وَظَنُّوا أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ اللَّهِ ﴾ (واتــە: خۆشــیان وایــان دەزانــی کــە قەڵاکانیــان دەیانپارێــزێ لــە ســزای خــوا) بۆیــە سەرســامو یاخی بــوون پێــی، وە وایــان دەزانی کەس دەرەقەتیــان نایــەت لەو شــوێنەدا، لە ســەرووی هەمــوو ئەوانەوە خوا ویســتی وابــوو کە ئەو قــەڵاو پارێزەرانە هیــچ بێنیازی نەکــردن، وە ئەو هێزو دەســەڵاتەیان ســوودی پێنەگەیاندن. لەبــەر ئەمەیە فەرموویەتــی: ﴿ فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا ﴾ واتە: (بۆیە ســزای خوایان بــۆ هــات) لــەو شــوێنەی کــە بــە خەیاڵیانــدا نەدەهات کــە لەوێــوە بێــت، ئەویــش ئەوەیە کــە خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ ﴾ (واتــە: خوا خســتیە نــاو دڵیانەوە) ترســێکی ســەخت کــە ئــەوە ســەربازی گــەورەی خــوا بــوو، کــە هیــچ ســوودێکی نیە لە گەڵیــدا بوونــی ژمارەو خــۆ ئامادەکــردنو هێــزو توندی.

ئــەوەی کــە پێیــان وابــوو، وە گومانیــان بــۆ دەبــرد، کــە کەلێنــی لێــوە دروســت ببــێ، قەڵاکانیــان بــوو کە خۆیــان تێدا دامەزراندبــوو، نەفسو دەروونیــان لە دڵنیاییدا بــوو، بە هۆی قایمــیو ســەختی قەڵاکانیــان، بێگومــان هــەر کەســێک پشــت بە جگە لــە خوا ببەســتێت ئــەوە سەرشــۆڕە، ئەوەشــی جگــە لە خــوا پشــتیوانێکی دیکــە هەڵببژێــرێ ئــەوە دەبێتە بەڵا بەسەریەوە.

فەرمانێکــی ئاســمانیان بــۆ هــات دابــەزی بــۆ ســەر دڵەکانیــان کــە جێگــای جێگیربوونو ئارامگرتنــە، یــان نزمــیو لاوازیــە، خــوا هێــزو تونــدی دڵەکانیانــی لابــرد، لە بــری نزمیو لاوازیو ترســی خســتە جێگــای، هیــچ چــارەو توانایەکیــان نەمــا لە ئاســتیدا، جا ئــەوە بوو بــە پشــتیوانیەک لەســەریان، لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ ﴾ (واتــە: خانووەکانــی خۆیانیــان وێــران دەکــرد بەدەســتی خۆیانو بە دەســتی ئیمانــداران) بەو شــێوەیەی کە ئــەوان ڕێکەوتنو دانوســتانیان کــرد لەگــەڵ پێغەمبەردا ﷺ لەســەر ئــەوەی بــاری حوشــترێک لەگــەڵ خۆیانــدا ببــەن، جــا زۆرێ لــەو خانووانــەی بەدەســتی خۆیــان دروســتیان کردبــوو ڕازاندبوویانەوە، بەدەســتی خۆیــان هەڵیانوەشــاندەوە، وە بروادارانیــان زاڵ کــرد بەســەر خۆیانــدا، بەهــۆی یاخیبوونیــان لەســەر تێکدانــی مــاڵو شــوێنەکانیانو ڕووخانــی قەڵاکانیــان، ئــەوان تاوانیــان کــرد بەرانبــەر نەفســی خۆیــان، وە بــوون بــە گەورەترینــی یارمەتیــدەر بۆ ئــەو مەبەســتە ﴿ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ ﴾ (واتە:

ئنجـا پەنـد وەربگـرن) ئەی ئەو کەسـانەی خاوەنی بیـری تیـژوو عەقڵی تەواون، بە ڕاسـتی لەمـەدا پەنـدی تێدایـە، تۆڵـەی خـوای تێـدا بەدیدەکـرێ لـە دژی ئەوانـەی نکووڵی حەق دەکـەنو شـوێنی هـەواو ئارەزوویان دەکـەون، ئەوانە نە دەسـەڵاتیان سـوودیان پێگەیاندن، نـە هێزیـان بوو بە بەربەسـت بۆیان، نـە قەڵاکانیان پاراسـتنی، کاتێک کـە فەرمانی خوایان بـۆ هـاتو سـزای خوایان پێگەیشـت بـە هـۆی گوناهەکانیـان، جا پەنـدو ئامۆژگـاری بە هەمـوو ماناکانـە نـەک تایبەت بـە هۆکار.

بێگومـان ئـەم دەقـە بەڵگەیـە لەسـەر بایەخدان بـە فەرمـان، ئەویـش بایەخدانـی هاوتایە بە هاوتاکەی، وە ئەندازەکردنی شـتێ لەسـەر هاوشـێوەی خۆی، وە بیرکردنەوە لەوەی حوکمو بڕیـارەکان لەخۆدەگـرێ لـە واتاو بڕیـار، کە لە جێگـای عەقڵو بیـر کردنەوەدایـە، ئا بەو شـێوەیە عەقـڵ تـەواو دەبـێو بینایـی ڕووناک دەبێـتو ئیمان زیـاد دەکاتو تێگەیشـتنی ڕاستەقینە دەسـتەبەر دەبێت.

پاشـان خـوا ﷻ هەواڵیداوە کە ئەو جولەکانە تووشـی هەمـوو ئەوانە نەبوون کە شایسـتەیانە لـە تۆڵەکردنـەوە، وە بێگومـان ئـەو زاتـە لـە سـەری سـووک کردن. جـا ئەگەر ئـەو زاتە دەربـەدەری بەسـەریاندا نەهێنایـە، کە تووشـیان بوو، وە لـە قەدەری خۆی بۆی نووسـیبوون کـە گۆڕانـی بەسـەردا نایەت، ئـەوە بە جۆرێکـی تر لـە دونیـادا سـزا دەدرانو تۆڵەیان لێ دەکرایەوە.

(٣) بـەڵام بێگومـان بـۆ ئـەوان هەیـە لـەدوارۆژدا سـزای ئاگـر، کـە هیـچ کـەس نازانێ سـەختیو نارەحەتیەکـەی جگـە لە خـوا، جا بـا واخەیـاڵ نەکەن کـە سـزایان کۆتایی پێ هـات، ئەوەی خـوا بـۆی دانـاون لەسـزای دوارۆژ مەزنترو سـەخترە.

ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۖ وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ
ٱلْعِقَابِ ﴿٤﴾ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ
أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ
عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ
وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ
قَدِيرٌ ﴿٦﴾ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ
وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ
دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ
وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ
﴿٧﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ
يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ
أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن
قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ
حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ
وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾

(٤) ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾ واتــە: ئــەوەش بەهــۆی ئــەوەوە بــوو دژایەتــی خــواو پێغەمبەریــان کــرد، وە تێکۆشــان لــە ســەرپێچیکردنیان، ئەمــەش نەریـــتو ســـوننەتی خوایـــە لەبەرانبـــەر هـــەر کەسـێکدا کـــە دژایەتـــی بـــکات ﴿ وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ (واتــە: وە هــەر کەسـێک دژایەتـی خــوا بـکات ئـەوە بــە ڕاسـتی خــوا تۆڵەسـێنی بــە تینــە).

(٥) ﴿ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ واتــە: کاتـــێ کـــە (بنـــو نظـــیر) سەرزەنشـــتی پێغەمبــەری خــواو موسـڵمانانیان کــرد، لــە بڕینـی دار خورمـاو دارودرەختـەکان، وە پێیـان وابـوو ئـەوە فەسـادو خراپەکاریـە، بۆیـە لــەو ڕێگەیــەوە تانەیــان لــە موســڵمانان دەدا، خــوا ﷻ هەواڵیــدا کــە بەڕاســتی بڕینــی دار خورمــا ئەگــەر بڕیبێتیــان یــان هێشــتبێتیانەوە لەســەر بنــجو بنەمای خــۆی، ئــەوە بێگومان بــە ویســـتو بڕیــاری خــوا بــووە، ﴿ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾ (واتــە: وە بــۆ سەرشـــۆڕ کردنـی خراپـەکاران) کاتـێ زاڵـی کــردن بەســەر بڕینـی دار خورمـاکانو ســووتاندنیان، بــۆ ئــەوەی ببێتــە تۆڵەیــەک بۆیــانو ڕیســوا بوونــێ لــە دونیــاداو زەلیلیــەک پێــی بناسـرێ، دەستەوسـانی تەواویـان کـە نەیانتوانـی دارخورماکانیـان ڕزگـار بکـەن، ئـەو دار خورمایانــەی کــە کەرەســتەی هێزیــان بــوو (اللينة): ناوێکــە هەمــوو دارخورمــاکان دەگرێتــەوە، لەســەر ڕاســترینو لــە پێشــترینی ئەگــەرەکان، ئەمــەش حاڵــی (بني النظير) بــوو، وە چــۆن خــوا ســزایدان لــە دونیــادا.

(٦) دواتــر باســی ئــەو کەســەی کــردوە کــە مــاڵو ســامانەکانیان دەگوازرێتــەوە بــۆی، فەرموویەتــی: ﴿ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ ﴾ (واتــە: ئــەو دەســتکەوتانە کــە خــوا ســەندیەوە بــێ جەنــگ کــردن بــۆ پێغەمبەرەکــەی) لــە خەڵکــی ئــەم گونــدە کــە

ئەوانیــش (بنـي نظـیر)ن ﴿ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ ﴾ ئێـوەش ئـەی بـڕواداران ئـەوەی بەدەسـتان هێنـاو پەلەتـان کـردو کۆبوونـەوە ﴿ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ ﴾ واتـە: مانـدوو نەبـوون لـە بەدەسـتهێنانیاندا، نـە بـە نەفـسو دەروونتـان، نـە بـە مـاڵو سـامانەکانتان، بەڵکـو خـوا ترسـی خسـتە دڵەکانیانـەوە بـە پـاکو پاڵفتەیـی هاتـە بەردەسـتان.

لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾ (واتــە: بەڵکــو خــوا پێغەمبەرانــی زاڵ دەکات بەســەر هــەر کەسـێکدا کـە بیەوێـت وە خـوا بەسـەر هەمـوو شـتێکدا بـە دەسـەڵاتە) لـە تـەواوی دەسـەڵاتی هیـچ بەرگریـکاریێ لـە ئاسـتیدا ناتوانـێ بەرگـری لـە خـۆی بـکات، وە هیـچ بەهێزێـک نیـە لـە ئاسـتیدا هێـز بنوێنـێ، وە پێناسـەی (الفَـيء) لـە زاراوەی فەقیهەکانـدا: بریتیـە لـە بردنـی ماڵـی بێبڕوایـان بـە حـەق بەبێ کوشـتار، وەک ئـەم ماڵـەی کـە ڕایـان کـردو وازیـان لێهێنـا لـە ترسـی مسـوڵمانانـدا، وە ناونـراوە بـە (الفَـيء) چونکـە لـەو بێبڕوایانـە گەڕاوەتـەوە کـە شایسـتە نیـن پێـی بـۆ مسـوڵمانان، ئەوانـەی مافـی تەواویـان هەیـە تیایـدا.

(٧) بڕیـاری گشـتی ئەوەیـە وەک خـوا ﷻ باسـی کـردووە فەرموویەتـی: ﴿ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰ ﴾ بـە گشـتی، یەکسـانە خـوا دەسـتی خسـتبێ لـە سـەردەمی پێغەمبەرەکـەی یـان دوای ئـەو، بـۆ هـەر کەسـێ کاروبـاری ئوممەتەکـەی لـە دوای ئەو بەڕێـوە دەبـات، ﴿ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾ ئـەم ئایەتە وەک ئـەو ئایەتەیـە کـە لـە سـوورەتی (الأنفـال)دا هاتـوە: ﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٤١﴾ ﴾، (واتە: وە بزانـن بێگومـان هەرچیەکتـان لـە غەنیمـەت گـرت ئـەوە بەڕاسـتی پێنـج یەکـی ئـەو دەسـتکەوتە بـۆ خـواو پێغەمبـەرو بـۆ خزمانـی پێغەمبـەرو بـۆ هەتیـوانو بـۆ هـەژارانو بـۆ ڕێبوارانـە)، ئـەم (الفَـيء)ە دابـەش دەبـێ بـۆ پێنـج بـەش:

یەکـەم: پێنـج یـەک بـۆ خـواو پێغەمبەرەکەیەتـی، خـەرج دەکـرێ لـە بەرژەوەنـدی گشـتی موسـڵمانانـدا.

دووەم: بـۆ خزمانـی پێغەمبـەر ﷺ، ئەوانیـش نەوەکانـی هاشـمو نەوەکانـی موتەلیـب کاتێ کـە بـوون، بەیەکسـانی دابـەش دەکـرێ لـە نێـوان نێـرو مێکانیاندا، بۆیـە بەنـو موتەلیب خراوەتـە نـاو پێنـج یـەک لەگـەڵ نەوەکانـی هاشـم، وە نەوەکانـی دیکـەی (عبدمنـاف)

نەخراونەتــە نێویــەوە، چونکــە نەوەکانــی موتەلیــب بەشــدار بــوون لەگــەڵ نەوەکانــی هاشــم لــە چوونــە نــاو دۆڵو شــیوەکە، کاتــێ کــە قورەیــش گرێبەســتیان کــرد لەنێــوان یەکــدا بــۆ دوور خســتنەوەو دژایەتــی کردنیــان، ئــەوان پێغەمبــەری خوایــان سەرخســت بــە پێچەوانــەی غەیــری خۆیــان، ئــا لەبــەر ئەمەیــە پێغەمبــەر ﷺ دەربــارەی نەوەکانــی موتەلیــب فەرموویەتــی: ((إنهـم لم يفارقـوني في الجاهليـة ولا الإسـلام)) واتــە: بێگومــان ئــەوان لەمــن دانەبــڕاون نــە لــە نەفامــیو نــە لــە ئیســلامەتیدا.

سێیەم: پێنــج یــەک بــۆ هــەژارو هەتیــوان، ئەوانیــش ئــەو کەســانەن کــە باوکیــان نیــەو باڵــغ نەبوونە.

چوارەم: وە پێنج یەک بۆ نەداران.

پێنجــەم: بەشــێک بــۆ ڕێبــواران، ئەوانیــش ئــەو ڕێبوارانــەن کــە لــە مــاڵو وولاتــی خۆیــان دابــڕاون.

بۆیــە خــوا ﷻ ئــەم ئەندازەیــەی دانــاوە وە (الفَــيء)ی کــورت کردۆتــەوە لــە مانــەدا ﴿ كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ ﴾ واتــە: تــا دەســت بــە دەســتی پــێ نەکــرێ (ئــەو مــاڵو ســامانە) ﴿ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡ ﴾ (واتــە: لــە نــاو دەوڵەمەنەکانتــان) بێگومــان ئەگــەر خــوا ئەنــدازەی نەکردایــە، ئــەوە دەســتاو دەســتی دەکــرد لــە نێــوان دەوڵەمەنــدو بەهێزەکانــدا، ئەوانەیشــی کــە بــێ توانــان هیچیــان دەســت نەدەکــەوت، ئــا لەوەشــدا خراپەکاریــەک هەیــە کــە کــەس نایزانــێ جگــە لــە خــوا.

وەک چــۆن لــە شــوێنکەوتنی فەرمــانو شــەریعەتی خــوادا بەرژەوەندیەکــی زۆری تێدایــە هەژمــار ناکــرێ، لەبــەر ئەوەیــە خــوا ﷻ فەرمانــی کــردوە بــە یاســایەکی گشــتگیرو بنچینەیەکــی گشــتیو فەرموویەتــی: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْ ﴾ (واتــە: ئــەوەی پێغەمبــەر پێتــان دا وەریبگــرن، وە ئــەوەی لێتانــی قەدەغــە کــرد وازی لێبهێنــن) ئەمــە گشــتگیرە بــۆ بنەماکانــی ئایــنو لــقو پۆکانــی، ئاشــکراو نهێنــی، وە ئــەوەی پێغەمبــەر ﷺ هێناویەتــی پێویســتە لەســەر بەنــدەکان وەریبگــرنو شــوێنی بکــەون، دروســتیش نیــە ســەرپێچی بکــەن، بێگومــان فەرمانــی پێغەمبــەر ﷺ لــە ســەر بڕیــاردان بــە شــتێ وەکــو فەرمانــی خــوا وایــە، ڕووخســەتو بیانــوو بــۆ هیــچ کەســێک نیــە وازی لێبهێنــێ، وە دروســت نیــە قســەی هیــچ کەســێک پێــش بخــرێ بەســەر فەرمــوودەی ئــەودا.

پاشـــان فەرمانیکـــردوە بـــە خۆپارێـــزیو ترســـان لـــە خـــوا، کـــە بەهۆیـــەوە دڵو ڕووحو دونیـاو دوارۆژ ئـاوەدان دەبنـەوە، وە بـە هۆیـەوە بەختـەوەری هەمیشـەیيو سـەرکەوتنی مـەزن دەسـتەبەر دەبـێ، وە بـە لـە دەسـتدانی بەدبەختـیو سـزای هەمیشـەیی تـووش دەبـێ، جـا فەرموویەتـی: ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴾ بـۆ کەسـێک واز لـە خۆپارێـزی بهێنـێو شـوێنی هـەواو ئـارەزوو بکەوێـت.

(٨-٩): ﴿ لِلۡفُقَرَآءِ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأَمۡوَٰلِهِمۡ يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلۡإِيمَٰنَ مِن قَبۡلِهِمۡ يُحِبُّونَ مَنۡ هَاجَرَ إِلَيۡهِمۡ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمۡ حَاجَةٗ مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٞۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٩﴾ ﴾:

﴿ لِلۡفُقَرَآءِ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأَمۡوَٰلِهِمۡ يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلۡإِيمَٰنَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾ پاشـــان خـــوا ﷻ باســـی حیکمـــەتو هـــۆکاری پێویســـت دەکات، بـــە کردنـــی ئـــەو ماڵانـــە بـــە ماڵـــی (الفَـيء) بـــۆ ئـــەو کەســـانەی ئەنـــدازە کـــردوە، ئـــەوان شایســـتەن بـــە یارمەتیـدان، مافـی خۆیانـە بـۆ ئـەوان دابنـرێ، ئەوانیـش لـە نێوانـی ئـەو کۆچکەرانـەی کـە کۆچیـان کـردووەو مـاڵو سـەروەتو سـامانو خۆشەویسـتانیان بەجـێ هێشـتوە، لـە پێنـاوی خـواو سەرخسـتنی ئاینەکـەیو خۆشویسـتنی پێغەمبەرەکەیـدا، ئـا ئەوانـە ئـەو ڕاسـتگۆیانەن کـە کاریـان کـردوە بـە داخـوازی ئیمانەکەیـان، وە ئیمانەکەیـان سـەلماندووە بـە کـردەوەی چـاکو پەرستشـە قـورسو گرانـەکان، بـە پێچەوانـەی ئـەو کەسـەی بانگەشـەی بڕواهێنـان دەکاتو نەیسـەلماندوە بـە جیهـادوو کـۆچ کـردنو جگـە لەوانیـش لـە پەرستشـەکانی دیکـە.

وە لـە نێوانـی دانیشـتواندا ئەوانیـش ئـەوسو خـەزرەج بـوون، ئەوانـەی بڕوایـان هێنابـوو بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ بـە ویسـتو ئـارەزووی خۆیـان، وە داڵـدەی پێغەمبەریـان دابـوو بەرگریشـیان لـێ کردبـوو لـە سـوورو ڕەش، وە ماڵـی کۆچکـردنو ئیمانیـان کردبـوە بارەگایـەک تـا بـوو بـوە لانـەو جێگایـەک بـڕواداران دەگەڕانـەوە بـۆ لایو لـە کاتـی ناخۆشـیدا پەنایـان پـێ دەبـرد، وە نیشـتەجێ دەبـوون لـە ژێـر چاودێـریو پاراسـتنی موسـڵماناندا، کاتـێ کـە هەمـوو شـارەکان بـە گشـتی جێگـای جەنـگو هاوبەشـدانانو شـەڕ بـوو. بـەردەوام پیاوانـی ئایـن پەنایـان دەبـرد بـۆ لای پشـتیوانان

تـا ئاینـی ئیسـلام بڵاوبوویـەوەو بەهێـز بـوو، تـا وای لێهـات قۆنـاغ بـە قۆنـاغ زیـادی دەکـردو کـەم کـەم گەشـەی دەکـرد، تـا دڵەکانیـان ئـازاد کـرد بـە زانسـتو ئیمـانو قورئـان، شـارەکانیش بـە شمشـێرو ڕم.

ئەوانـەی لـە کـۆی وەسـفە جوانەکانیانـدا، ﴿ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ ﴾ (واتـە: ئـەوەی کـۆچ بـکات بـۆ لایـان خۆشـیان دەوێ) ئەمیـش لەبـەر خـۆش ویسـتنیان بـۆ خـواو پێغەمبەرەکـەی، خۆشەویسـتانی ئەویـان خـۆش دەویسـت، وە ئـەو کەسەیشـیان خـۆش دەویسـت کـە ئاینەکـەی سـەر دەخـات ﴿ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا ﴾ واتـە: حەسـوودیو ئیرەیـی بـە کۆچکـەران نابـەن لـەوەی خـوا پێـی بەخشـیونو تایبەتـی کـردوون، بـە فـەزڵو چاکـەی خـۆی، وە ئـەو ڕێـزەی کـە ئـەوان شایسـتەین، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر سـەلامەتی دڵەکانیـان، وە ڕەتکردنـەوەی بوغـزو ڕقو کینـەو ئیرەیـی تیایانـدا.

وە بەڵگەیشـە لەسـەر ئـەوەی کۆچکـەران چاکتـرن لـە پشـتیوانان، شـک نابـەن لـە دڵـی خۆیانـدا هیـچ جـۆرە ئیرەیـیو بەخیلیـەک، لـەوەی بـە کۆچکـەران دراوە، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە بەڕاسـتی خـوا ﷻ بەخششـێکی پـێ بەخشـیون، نـە بەخشـیویەتی بـە پشـتیوانانو نـە جگـە لەوانیـش، وە لەبـەر ئـەوەی کۆیـان کردۆتـەوە لـە نێـوان سەرخسـتنو کـۆچ کردنـدا.

وە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ﴾ واتـە: لـە وەسـفەکانی پشـتیوانان کـە بـە هۆیـەوە پێشـکەوتن بەسـەر غەیـری خۆیانـدا، وە جیابوونـەوە پێـی لەگـەڵ غەیـری خۆیانـدا، ئەویـش تەواوتریـن جـۆری بەخشـندەییە، کـە بریتیـە لـە بـاوودان (الإیثـار) بـەوەی نەفـس حـەزی پێـدەکات لـە مـاڵو سـامانو جگـە لەویـش، وە بەخشـینی بـە کەسـێکی تـر لەگـەڵ ئـەوەدا پێویسـتی پێیەتـی، بەڵکـو خـۆی زۆر پێویسـتی پێیەتـی.

ئەمـەش ڕوونـادات مەگـەر لـە کەسـێکی خووڕەوشـت پـاک، وە خۆشویسـتن لەبـەر خـوای پێـش خسـتبێ بەسـەر خۆشویسـتنی حـەزو ئـارەزووەکان، لەوانـەش چیرۆکـی ئـەو پیـاوە لـە دانیشـتووان (الأنصاري) کـە دەقەکـە بـە هۆیـەوە دابـەزی کاتـێ بـاوی میوانەکەیـدا بـە خواردنـی خـۆیو مـاڵو منداڵەکـەی، بـە برسـێتی شـەویان کـردەوە. (الإیثـار) پێچەوانـەی (الأثرة)یـە، جـا (الإیثـار) سـتایش کـراوە، (الأثـرة) سەرزەنشـت

کـراوە، چونکـە لـە نیشـانەکانی ڕەزیلـیو ڕژدیـە. ﴿ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾(واتـە: ئـەو کەسـەی خـۆی لـە ڕژدیو چرووکـی دەروونـی بپارێـزێ بـە ڕاسـتی هـەر ئەوانـن لـە سـەرفرازان)، وە پاراسـتنی ڕژدیو چرووکـی نەفـس، پاراسـتنی هەمـوو ئەوانـە دەگرێتـەوە کـە خـوا فەرمانـی پێکـردوە، چونکـە ئەگـەر بەنـدە پارێزرابـوو لـە چرووکـی دەروونـی، ئـەوە نەفسـی ڕێگـەی پـێ دەدات بـە فەرمانەکانـی خـواو پێغەمبەرەکـەی، ئەنجامیـان دەدات بـە گوێڕایەڵـی ملکەچـیو بـە سـنگێکی فراوانـەوە وەریـان دەگـرێ، وە نەفـسو دەروونـی ڕێگـەی پێـدەدات بـە واز هێنـان لـەوەی خـوا قەدەغـەی کـردوە، ئەگەرچـی خۆشەویسـتیش بێـت بـە لای نەفسـەوەو حـەز لـە کردنـی بـکات.

وە نەفسـی ڕێگـەی پـێ بـدات بـە بەخشـینی مـاڵ لەڕێگـەی خـوادا، وە لـە پێنـاو ڕەزامەنـدی ئـەودا، ئـا بـەم شـێوەیە سـەرکەوتنو سـەرفرازی دەسـتەبەر دەبـێ، بـە پێچەوانـەی کەسـێ خـۆی لـە ڕژدیو چرووکـی نەفسـی نەپارێـزێ، بەڵکـو تـووش بووبـێ بـە چرووکـی لـە کاری چاکـەدا، بێگومـان ئـەوە بنچینـەی خراپـەو توخمێتـی. جـا ئـەم دوو بەشـە بەڕێـزی پـاکو پاڵفتەیـە، هاوەڵانـی بەڕێـزو زانـا بەناوبانگەکانـن، ئەوانـەی بەدەسـتیان هێنـا لـە پێشـین فـەزڵو چاکـەو سەرگوزەشـتەی چـاک، کـە بـە هۆیـەوە پێشـی دوای خۆیـان کەوتـنو گەیشـتن بـە پێشـینی خۆیـان، ئـەوان بـوون بـە ناودارانـی بـڕواداڕانو گـەورە پیاوانـی موسـڵمانو پێشـەوای پارێزکاران.ئەوەنـدە بەسـە بـۆ دوای ئـەوان لـە بەخشـشو چاکـە شـوێن پێـی ئـەوان هەڵبگـرنو ڕێنماییەکانـی ئـەوان وەربگـرن، ئـا لەبـەر ئەمەیـە خـوا ﷻ باسـی شـوێنکەوتووانی ئـەوان دەکات، ئـەوەی پەیوەسـتە پێیانـەوەو شـوێن پێیانـی هەڵگرتـووە، فەرموویەتـی:

وَالَّذِينَ جَاءُو مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا
الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ
آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ﴿١٠﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ
نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ
لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا
وَإِنْ قُوتِلْتُمْ لَنَنْصُرَنَّكُمْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ
﴿١١﴾ لَئِنْ أُخْرِجُوا لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ وَلَئِنْ قُوتِلُوا لَا يَنْصُرُونَهُمْ
وَلَئِنْ نَصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنْصَرُونَ ﴿١٢﴾ لَأَنْتُمْ
أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِمْ مِنَ اللَّهِ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ
لَا يَفْقَهُونَ ﴿١٣﴾ لَا يُقَاتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرًى مُحَصَّنَةٍ
أَوْ مِنْ وَرَاءِ جُدُرٍ بَأْسُهُمْ بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا
وَقُلُوبُهُمْ شَتَّى ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٤﴾ كَمَثَلِ
الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ قَرِيبًا ذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ
أَلِيمٌ ﴿١٥﴾ كَمَثَلِ الشَّيْطَانِ إِذْ قَالَ لِلْإِنْسَانِ اكْفُرْ فَلَمَّا
كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِنْكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦﴾

(١٠): ﴿وَالَّذِينَ جَاءُو مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾:

﴿وَالَّذِينَ جَاءُو مِنْ بَعْدِهِمْ﴾ واتــە: ئەوانــەش لــە دوای کۆچکــەرانو دانیشــتووان هاتــن، ﴿يَقُولُونَ﴾ بــە شــێوەی ئامۆژگــاری بــۆ خۆیــانو بــۆ ســەرجەم بــڕواداران دەیانــوت: ﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ﴾ (واتــە: ئــەی پەروەردگارمــان لــە ئێمــە خــۆش بــە وە لــە برایانیشــمان خــۆش ببــە کــە پێشــمان کەوتــوون لــە بڕواهێنانــدا).

ئەمــە دوعــاو نزایەکــی گشــتگیرە بــۆ ســەرجەم بــڕواداران، ئەوانــەی پێــش کەوتــوون لە هــاوەڵان، وە لــە پێــش ئــەوانو دوای ئەوانیــش، ئەمــەش لــە بەخششــەکانی بڕواهێنانــە، کــە بــڕواداران هەندێکیــان ســوود دەبەخشــن بــە هەندێکــی دیکەیــان، وە هەندێکیــان دەپارێنــەوە بــۆ هەندێکــی دیکەیــان، بــە هــۆی بــەژدار بوونیــان لــەو بڕواهێنانــەی کــە گرێدانــی برایەتــی لــە نێــوان بڕوادارانــدا خواســتووە، کــە لــە لــقو پۆکانــی ئەوەیــە هەندێکیــان نــزا بــۆ هەندێکــی دیکــە بکــەن، هەندێکیــان هەندێکــی دیکەیــان خۆشــبوێ. بۆیــە خــوا ﷻ لــە نــزاو پاڕانــەوەدا ڕقو کینــەی نــاو دڵــی ڕەت کردۆتــەوە، کــە کــەم تا زۆر دەگرێتــەوە، کــە ئەگــەر ڕقو کینــە نەمــا ئــەوە پێچەوانەکــەی دەچەســپێ، ئەویــش بریتیــە لــە خۆشەویســتی لــە نێــوان بــڕوادارانو پشــتیوانیو ئامۆژگــاری کــردنو وێنــەی ئەوانــەش کــە لــە مافــی بڕوادارانــە، جــا خــوا ﷻ وەســفی کــردوە ئــەوەی لــە دوای هــاوەڵان دێــت بــە بڕواهێنــان، چونکــە وتەکانیــان: ﴿سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ﴾ (پێشــمان کەوتــوون لــە بڕواهێنانــدا) بەڵگەیــە لەســەر بەشــدار بــوون لــە بڕواهێنــان، وە ئــەوان

شـوێنی هاوەڵـە بەڕێـزەکان کەوتـوون لـە بیـرو بـڕوای ئیمـانو بنچینەکانـی، ئەوانیـش شـوێن کەوتووانـی سـوننەن، ئەوانـەی کـە ئـەم وەسـفە تـەواوە ناگونجـێ تەنهـا بـۆ ئـەوان نەبـێ.

وە وەسـفی کـردوون بـە دان پێدانـان بـە گوناهـەکانو داوای لـێ خۆشـبوون، وە داوای لـێ خۆشـبوونی هەندێکیـان بـۆ هەندێکـی دیکـە، وە هەوڵدانیـان بـۆ لابردنـی ڕقو کینـەو بوغـزو غـەرەز لـە دڵەکانیانـدا، بەرانبـەر بـرا بڕوادارەکانیـان، چونکـە پاڕانەوەیان بـەو شـێوەیە ئـەوە پێویسـت دەکات کـە باسـمان کـرد، وە خۆشەویسـتی هەندێکیـان بـۆ هەندێکـی دیکـە لەخۆدەگـرێ، وە کەسـێکیان ئـەوەی بـۆ خـۆی پێـی خۆشـە بـۆ براکەیشـی پێـی خـۆش بـێ، وە ئامۆژگـاریو قسـەی چاکـی بـۆ بـکات، بـە ئامـادە بـوونو ئامـادە نەبـوون، بـە مردوویـیو زیندوویـی، ئایەتـە پیرۆزەکـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە ئەمـە لـە کـۆی مافـی بڕوادارانـە هەندێکیـان بـۆ هەندێکـی دیکەیـان.

پاشـان نزاکەیـان تـەواو کـردوە بـە دوو نـاوی بەڕێـز، کـە بەڵگـەن لەسـەر تـەواوی میهرەبانـیو بەزەیـیو چاکـەی خـوا بۆیـان، کـە لـە کـۆی هەموویـان بەڵکـو لـە گەورەترینیـان سـەرکەوتنیانە بـە جێبەجـێ کردنـی مافەکانـی خـواو مافـی بەندەکانـی، جـا ئـەم سـێ جـۆرە لـە جۆرەکانـی ئـەم ئوممەتـەن، ئەوانـە شایسـتەن بـۆ (الفَـيء) کـە سـوودو قازانجەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ بەرژەوەنـدی ئیسـلام، ئەوانـەش ئەهـلو شایسـتەی ئـەوەن، خـوا بمـان گێـڕێ بـە یەکێـک لـەوان بـە منـەتو بەخششـی خـۆی (اللهـم آمین).

(١١-١٣): ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قُوتِلْتُمْ لَنَنصُرَنَّكُمْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١١﴾ لَئِنْ أُخْرِجُوا لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ وَلَئِن قُوتِلُوا لَا يَنصُرُونَهُمْ وَلَئِن نَّصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٢﴾ لَأَنتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِم مِّنَ اللَّهِ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿١٣﴾ ﴾

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ ﴾ پاشـان خـوا ﷻ بـە سەرسـووڕمانەوە باسـی حاڵـی دوو ڕووەکانـی کـرد، ئەوانەی تەماحیان خسـتە پێـش براکانیـان لـە خاوەنانـی کتێـب، لـە سەرخسـتنیانو پشـتگیری کردنیـان لەسـەر بـڕواداران، وە ئـەوان بـە خـاوەن کتێبەکانیـان دەوت: ﴿ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ

وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا ﴾ (واتــە: ئەگــەر دەربکرێــن ئێمــەش لەگەڵتانــدا دەردەچیــن) هەرگیــز گوێڕایەڵــی هیــچ کــەس ناکەیــن لەسەرنەخســتنی ئێــوەدا، دوورمــان بخاتــەوە یــان بمانترســێنێ.

﴿ وَإِن قُوتِلْتُمْ لَنَنصُرَنَّكُمْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴾ (واتــە: ئەگــەر جەنگتــان لەگەڵــدا بکــرێ بێگومــان ئێمــە یارمەتــی ئێــوە دەدەیــن بــە ڕاســتی خــوا شــایەتی ئــەدات کــە ئــەوان درۆزنــن) لــەم پەیمانــەی کــە براکانــی خۆیانیــان پــێ هەڵخەڵەتانــد.

ئەمــە زۆر ناکــرێ لەســەریان، چونکــە بێگومــان درۆکــردن وەســفی ئەوانە، فێڵو ســاختەو درۆو دەلەســە هاوشــانیانە، وە دوو ڕوویــیو ترســنۆکی هاوڕێیانــە، ئا لەبــەر ئەمەیە خوا ﷻ بــەدرۆی خســتوونەتەوە بــە وتــەی خــۆی، کــە وەک چــۆن باســی دەکات هاتۆتــە جــێ، فەرموویەتــی: ﴿ لَئِنْ أُخْرِجُوا ﴾ لــە شــارو وڵاتەکانیــان، بــە دەربــەدەریو ڕاگواســتن، ﴿ لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ ﴾ (ئــەوان لەگەڵیــان دەرناچــن) چونکــە وڵاتیــان خــۆش دەوێو خۆراگــر نیــن لەســەر کوشــتارو خاوەنــی بەڵێــنو پەیمانــی خۆیــان نیــن.

﴿ وَلَئِن قُوتِلُوا لَا يَنصُرُونَهُمْ ﴾ (واتــە: وە ئەگــەر جەنگیــان لــە دژ کــرا یارمەتیــان نــادەن) بەڵکــو تــرس بــاڵ دەکێشــێ بــە ســەریانداو تووشــی دۆڕانو هەڵوەشــانەوە دەبــن، براکانیشــیان سەرشــۆڕو ڕیســوا دەکــەن کاتــێ پێویســتیان پێیــان دەبێــت ﴿ وَلَئِن نَّصَرُوهُمْ ﴾ (ئەگــەر یارمەتیــان بــدەن) بــە گریمانــەو وادانــان ﴿ لَيُوَلُّنَّ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴾ واتــە: بێگومــان پشــت هەڵدەکــەن لــە کوشــتارو ســەرکەوتن، وە سەرکەوتنیشــیان بــۆ نابــێ لــە لایــەن خــواوە.

ئــەو هــۆکارەی بــوو بــە مایــەی پێویســت بوونــی یارمەتــی نەدانیــانو هەڵهاتنیــان، ئێــوە ئــەی بــڕواداران ﴿ أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِم مِّنَ اللَّهِ ﴾ (ترســتان زیاتــرە لــە دڵــی ئەوانــدا تــا خــوا) ئەوەنــدە لــە ئێــوە ترســان لــە خــوا نەترســان، ترســی بەدیهێنراویــان پێشخســت، ئــەو بەدیهێنــراوەی کــە هیچــی بــە دەســت نیــە، نــە بــۆ ن خــۆی، نــە بــۆ جگــە لــە خــۆی ســوود بــێ یــا زیــان، لەســەر ترســان لــە بەدیهێنــەر کــە زیــانو ســوودو بەخشــینو گرتنەوە بــە دەســتی ئــەوە، ﴿ لَأَنتُمْ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴾ (ئــەوەش لەبــەر ئەوەیــە کــە بێگومان ئــەوان تێناگــەن) لــە پلەو پایــەی کاروبــارەکانو حەقیقەتــی شــتەکان نازانــن، بەڵکــو تێگەیشــتنی ڕاســتەقینە ئەوەیــە تــرسو ئومێــدو خۆشویســتنی بەدیهێنــەر پێــش بخــرێ بەســەر غەیــری ئــەودا، وە جگــە لەویــش شــوێن

کەوتــووی ئــەو بــیّ.
(١٤): ﴿ لَا يُقَـٰتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَآءِ جُدُرٍۭ بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴿١٤﴾ ﴾
﴿ لَا يُقَـٰتِلُونَكُمْ جَمِيعًا ﴾واتــە: لــە حاڵەتــی کۆبوونەوەیانــدا ﴿ إِلَّا فِي قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَآءِ جُدُرٍۭ ﴾واتــە: نەدامــەزراون لەســەر کوشــتارکردنتان، نــە ســوورن لەســەری، مەگــەر لــە کاتێکــدا لەنــاو قــەڵای لادێکانیانــدا بــن، یــان لەپشــت دیــوارو خەندەقــی قایمــەوە، جــا ئــەوان ئــەو کاتــە لەوەیــە بەربەســتێکیان بــۆ دەســتەبەر بــیّ، بــە پشــت بەســتن بــە قــەڵاو دیوارەکانیــان، نــەک بــە هــۆی بوێــریو زیرەکــی خۆیــان، ئەمــەش مەزنتریــن سەرزەنشــت کردنــە.
﴿ بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ ﴾واتــە: دژایەتــی نێوانیــان زۆر ســەختە، نــە هیــچ بــەڵاو دەردێ لــە جەســتەیاندایە، وە نــە لــە هێزیــان، بەڵکــو بــەڵا دایــە لــە لاوازی ئیمانیــانو نەبوونــی یەکدەنگیــان، ئــا لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا ﴾واتــە: کاتــێ دەیانبینــی پێکــەوەنو پشــتیوانی یــەک دەکــەن.
﴿ وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ﴾واتــە: بــەڵام دڵەکانیــان پــڕە لــە ڕقو کینــەو جیایــە لــە یەکتــر، ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ئــەوەی پێویســتی کــرد بۆیــان کــە بێــوەی بناســرێن لــەوەی باســکرا، ﴿ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴾هیــچ عەقــڵو ژیریەکیــان نیــە، چونکــە بێگومــان ئەگــەر ئــەوان عەقڵیــان هەبووایــە، ئــەوە بــاوی زۆر چــاکو پەســەندیان دەدا بەســەر چاکــدا، وە ڕازی نەدەبــوون بــە نەفــسو دەروونیــان بــە خراپتریــنی ئــەو دوو هێڵــە، وە قســەیان یــەک دەبــوو دڵەکانیشــیان پەیوەســت دەبــوو بەیەکــەوە، ئــا بــەو شــێوەیە یارمەتــیو پشــتیوانی یەکتریــان دەکــرد، لەســەر بەرژەوەندیەکانیــان، وە ئــەوەی ســوودی دەبــێ بــۆ دیــنو دونیایــان.
(١٥): ﴿ كَمَثَلِ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ قَرِيبًا ذَاقُوا۟ وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٥﴾ ﴾
نموونــەی ئــەو سەرشــۆڕانە لــە ئەهلــی کتێــب، ئەوانــەی خــوا ﷻ پێغەمبەرەکــەی سەرخســت بەســەریاندا، وە ســزاو نارەحەتــی پــێ چەشــتن لــە ژیانــی دونیــادا، وە سەرینەخســتن بەرانبــەر بــە دوژمنانیــان، ﴿ كَمَثَلِ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ قَرِيبًا ﴾ ئەوانیــش هاوبەشــدانەرانی قورەیــش بــوون، ئەوانــەی شــەیتان کردەوەکانیانــی بــۆ ڕازانــدەوە ﴿ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّي جَارٌ لَّكُمْ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ

عَقِبَيۡهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكُمۡ إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوۡنَ ﴿٤٨﴾ ﴾ الأنفال، (واتــە: ئەمــڕۆ هیــچ کــەس بەســەرتاندا زاڵ نابــێ، وە بێگومــان مــن پەنــادەرو پارێــزەری ئێــوەم، ئنجــا کاتــێ هــەردوو دەســتەکە ڕووبــەڕووی یەکتــر بوونــەوە شــەیتان پاشــەو پــاش بــە دوای خۆیــدا گەڕایــەوەو وتــی: بەڕاســتی مــن بەریــم لــە ئێــوە، چونکــە بەڕاســتی ئــەوەی مــن دەیبینــم ئێــوە نایبینــن).

نەفســیان فریــوی دان، وە فریــوی دان ئــەوەی کــە فریــوی دان، ئەوانــەی کــە هیــچ ســوودێکیان پــێ نەگەیانــدن، وە بەرگــری ســزایان لێنەکــردن تــا ئامــادە بــوون لــە جەنگــی بــەدردا، بــە خۆبەگــەورە زانیــن‌و لــووت بەرزیــەوە پێیــان وابــوو ئــەوان پێغەمبــەرو بــڕواداران لەنــاو دەبــەن، جــا خــوا ﷻ پێغەمبەرەکــەی‌و بڕواداراني سەرخســت، تــا گــەورەو دەســەڵات دارەکانیانیــان کوشــت، وە کۆمەڵێکیــان لــێ بەدیــل گرتــن‌و بەشــێکی دیکەیشــیان ڕایــان کــرد.

ئــا بــەو شــێوەیە ســەرەنجامی هاوبەشــداناناو یاخیبوونــی خۆیانیــان چەشــت، ئەمــە لــە دونیــادا، ﴿ وَلَهُمۡ ﴾ لــە دوارۆژدا ســزای ئاگریــان بــۆ هەیــە.

(١٦): ﴿ كَمَثَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ إِذۡ قَالَ لِلۡإِنسَٰنِ ٱكۡفُرۡ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ ﴾:

وێنــەی ئــەو دوو ڕووانــەی کــە براکانیــان فریــودا لــە خاوەنانــی کتێــب: ﴿ كَمَثَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ إِذۡ قَالَ لِلۡإِنسَٰنِ ٱكۡفُرۡ ﴾ (واتــە: وەک شــەیتان وایــە کــە بــە مرۆڤــی وت: بێبڕوابــە) کوفــری لــە لا ڕازانــدەوەو جوانــی کــردو بانگــی کــرد بــۆ لای، کاتــێ کــە فریــوی پــێ خــواردو بێبــڕوا بــوو، وە تووشــی بەدبەختــی بــوو شــەیتان هیــچ ســوودێکی پــێ نەگەیانــد، کــە پشــتیوانی دەکــردو بانگــی دەکــرد بــۆ لای ئــەوەی کــە بانگــی کــرد، بەڵکــو بــەری بــوو لێــی‌و، ﴿ قَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ واتــە: مــن توانــام نیــە ڕێگــری ســزات لــێ بکــەم، بەڵکــو مــن ناتوانــم بێنیــازت بکــەم بــە قــەد تۆزقاڵــە زەڕەیــەک لــە چاکــە.


فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِي ٱلنَّارِ خَٰلِدَيۡنِ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ
ٱلظَّٰلِمِينَ ١٧ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ
مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٨
وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ نَسُواْ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمۡ أَنفُسَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ١٩ لَا يَسۡتَوِيٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصۡحَٰبُ
ٱلۡجَنَّةِۚ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ٢٠ لَوۡ أَنزَلۡنَا هَٰذَا
ٱلۡقُرۡءَانَ عَلَىٰ جَبَلٖ لَّرَأَيۡتَهُۥ خَٰشِعٗا مُّتَصَدِّعٗا مِّنۡ خَشۡيَةِ
ٱللَّهِۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ
٢١ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۖ
هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ٢٢ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ
ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ
ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٢٣ هُوَ ٱللَّهُ
ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ يُسَبِّحُ
لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٢٤

(١٧): ﴿ فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِي ٱلنَّارِ خَٰلِدَيۡنِ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٧ ﴾
﴿ فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ ﴾ بانگکەر بریتیە لە شەیتان، بانگکراویش ئادەمیزادە کاتێ گوێڕایەڵی دەکات ﴿ أَنَّهُمَا فِي ٱلنَّارِ خَٰلِدَيۡنِ فِيهَا ﴾ (واتە: بێگومان هەردوولا لە دۆزەخدا ئەمێننەوە بە هەمیشەیی) وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ٦ ﴾فاطر، (واتە: بێگومان ئەو شەیتانە تاقمو کۆمەڵەکەی بانگ دەکات بۆ ئەوەی ببنە هاوەڵانی ئاگری هەڵگیرساوی دۆزەخ). ﴿ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾(واتە: ئەمەیە سزای ستەمکاران) ئەوانەی بەشدار بوون لە ستەمو بێبڕوایی ئەگەرچی جیاوازن، لە توونديو سەختی سزادانیان، ئەمەش پیشەی شەیتانە لەگەڵ هەموو دۆستانی، ئەو بانگیان دەکات بۆلای ئەوەی زیانی هەیە بۆیان، وە هەڵیان دەخەڵەتێنێ تا دەکەونە نێو پیلانەکەیەوەو هۆکارەکانی سزایان لەسەر پێویست دەبێ، ئەو کاتە لێیان بەری دەبێو بەجێیان دێڵێ.

سەرزەنشتو سەرکۆنەکردن بۆ ئەو کەسەی گوێڕایەڵی دەکات، بەڕاستی خوا ﷻ ئاگەداری کردوونەتەوە لە گوێڕایەڵی کردنی، وە هەواڵیداوە بە مەبەستو سەرەنجامو داهاتووی، جا هەرکەسێ پێش بکەوێ بە گوێڕایەڵی کردنی ئەوە سەرپێچیکەرەو هیچ بیانوویەکی بۆ نیە.

(١٨-٢١): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ
خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٨ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ نَسُواْ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمۡ أَنفُسَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ
١٩ لَا يَسۡتَوِيٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۚ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ٢٠ لَوۡ أَنزَلۡنَا
هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ عَلَىٰ جَبَلٖ لَّرَأَيۡتَهُۥ خَٰشِعٗا مُّتَصَدِّعٗا مِّنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا
لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ٢١ ﴾

خـوا ﷻ فەرمـان بـە بەنـدە بڕواداره‌کانـی دەکات، بـەوەی بڕواهێنـان پێویسـتی کـردوەو دەیخـوازێ، لـە پەیوەسـت بـوون بـە خۆپارێـزیو ترسـان لێـی، بـە ئاشـکراو نهێنـی لـە هەمـوو بارودۆخەکانـدا، وە چاودێـری ئـەوە بکـەن کـە خـوا ﷻ فەرمانی پێکـردوون، لە بڕیـارو شـەریعەتەکانو یاسـاو ڕێسـاکانی، وە تەماشـا بکـەن چی بـۆ ئـەوان هەیەو چیش لـە سـەریانە، وە چیان بەدەسـت هێنـاوە لـەو کردەوانەی کە سـوودیان پـێ دەگەیەنێ، یان زیانیـان لـێ دەدات لـە ڕۆژی دواییدا.

جـا بێگومـان ئەگـەر ڕۆژی دوایـی لە پێـش چاویان بـێو بیکەن بـە ڕووگـەی دڵەکانیان، گرنگـی پێبـدەن بـە مانـەوە تیایدا، هەوڵو کۆشـش بکـەن بـە ئەنجامدانی کـردەوەی زۆر بـۆ گەیشـتن پێـی، وە پـاکو پاڵفتەی بکەن لـە هەموو تەڵخو بەربەسـتەکان، کـە ڕێگریان لێـدەکات لـە ڕۆیشـتنیان، یـان دەبێتـە بەربەسـت بۆیان، یـان لەسـەر ڕێگای ڕاسـت لایان دەدات، هەروەهـا ئەگـەر بزانـن خوا شـارەزایە بەوەی کە دەیکـەن، کردەوەکانیـان لە لای شـاراوە نیـە، وە هیچ لـەلای ئەو زاتە ون نابێو پشـتگوێ ناخـرێ، ئەوە پێویسـت دەبێت لە سـەریان بـە دڵ گەرمیـەوە کۆششـی بۆ بکـەن، ئەم دەقـە بنەمـاو بنچینەیە لە لێپرسـینەوەی بەنـدە لـە نەفـسو دەروونـی، وە پێویسـتە لەسـەری بیدۆزێتـەوە ئەگەر هەسـتی بـە کەمو کوڕیـەک کـرد، پێویسـتە خـۆی لێـی دابڕنـێ بـە تەوبـەی ڕاسـتەقینەو پشـتکردنو ڕوو وەرگێـڕان لـەو هۆکارانـەی کە دەبنە مایەی ئەوەی تووشـی کـەمو کوڕی ببـێ، وە ئەگەر بینـی نەفـسو دەروونـی کەمتەرخەمـە لـە فەرمانـێ لـە فەرمانەکانی خـوا، ئـەوە تواناکانی دەخاتـە گەڕو پشـت بـە پەروەردگاری دەبەسـتێ بـە تەواوکـردنو وردەکاری تیایدا.

دەیپێـوێ لـە نێـوان منەتەکانی خواو فـەزڵو چاکەکانـی، وە لـە نێـوان کەمتەرخەمیەکانی خـۆی، بێگومـان ئـەو پێوانە ئەوە پێویسـت دەکات لەسـەری شـەرمو حەیا لە خـۆی بکات.

بێبەشـبوونی تـەواو ئەوەیـە بەنـدە بێئاگا بێ لـەم کارە، وە خـۆی بچوێنێ لەگەڵـێ خوایان لـە بیرخۆیـان بردبێتەوە، وە بێئاگـا بن لە یادکردنـەوەیو بەجێهێنانی مافەکانـی، وە ڕوویان کردبێتـە حـەزوو ئارەزووەکانـی نەفسو دەروونیان، سـەرکەوتوو نەبووبـنو خێرو چاکەی زۆریـان بۆ دەسـتەبەر نەبووبێ.

بەڵکـو خـوا بەرژەوەنـدی خۆیانـی لەبیـر خۆیـان بردۆتـەوەو بێئاگـای کردون لە سـوودو وەدەسـتهاتووەکانی، بۆیـە هەمـوو کارەکانـی خـراپو لـە سـنوور دەرچـووە، گەڕانەوە بە زەرەرمەنـد بوونـی هـەردوو دونیا، سـتەمو فێڵێکیان کرد نـە دەتوانن دایبپۆشـنو نە دەتوانن

پـڕی بکەنــەوە، چونکــە ئەوانــەن دەرچــوان لــە فەرمانــی خــوا، ئەوانــەی کە دەرچــوون لە گوێڕایەڵـی پەروەردگاریـان، خۆیان خسـتۆتە نێو سـەرپێچیەکانیەوە.

جـا ئایا یەکسـانە کەسـێ لە خوا ترسـابێو خۆپارێـزی کردبـێ، وە بزانێ چـی پێش خۆی نـاردوە بـۆ دواڕۆژی، شایسـتەبێ بـە بەهەشـتە پڕ لـە نازونیعمەتـەکان -لەگـەڵ ئەوانەدا بێ کـە خوا بەخششـی خـۆی داباراندوە بەسـەریاندا لـە پێغەمبەرانو ڕاسـتگۆیانو شـەهیدانو پیاوچـاکان- وە کەسـێ بێئاگـا بووبـێ لە یـادی خواو مافەکانـی بیر چووبـێ، بەدبەخت بێ لـە دونیاو شایسـتەی سـزای دواڕۆژ بێ.

جـا یەکەمـەکان ئەوانــن سـەرفرازو سـەرکەوتوو، وە ئەوانی دیکـە ئەوانــن زەرەرمەندانو دۆڕاوان، کاتـێ خـوا ﷻ ڕوونیکـردوە بۆ بە بەندەکانـی ئەوەی ڕوونی کـردەوە، وە فەرمانی پێکـردنو قەدەغـەی لێکـردن لە کتێبە پیرۆزەکەیـدا، ئەوە وادەخوازێ تـا پەلە بکەن بۆ لای ئـەوەی خـوا بانگی کـردوونو هانی لەسـەر داون، ئەگەرچی لـە ڕەقیو وشـکیدا دڵەکانیان وەکـو کێـوە داکوتـراوەکان بێـت، بێگومـان ئـەم قورئانە ئەگـەر خـوا ﷻ دایبەزاندایە بۆ سـەر کێـوێ دەتبینـی بـە ملکەچیو لەت لـەت بوو لە ترسـی خـوا، واتە: بە هـۆی تەواوی کاریگـەری لە دڵـەکان، بە ڕاسـتی ئامۆژگاریەکانی قورئـان مەزنترینی ئامۆژگارین لەسـەر دڵەکان بـە ڕەهایی.

وە فەرمـانو قەدەغەکراوەکانـی قورئـان بریـارو بەرژەوەندیەکانـی لەخۆگرتـووە، ئەویش ئاسـانترین شـتە لەسـەر نەفـسو دەروونـەکان، هەروەهـا لەسـەر جەسـتەکانیش، بەتاڵـە لە نارەحەتـیو تێچـوون، نـە دژیەکـی تێدایـە نەجیـاوازیو نەگرانـیو نـە نارەوایيو لـە ڕێ لادان، دەگونجـێ بـۆ هەمـوو سـەردەمێک، شـیاوە بـۆ هەموو کەسـێک.

پاشـان خـوا هەواڵـی داوە کـە ئـەو نموونـە دەهێنێتـەوە بـۆ خەڵکـی، وە حـەڵاڵو حـەرام ڕوون دەکاتـەوە بـۆ بەندەکانی لـە کتێبەکەیـدا، لەبەر ئەوەی بیـر بکەنەوە لـە ئایەتەکانیو سـەرنجیان بـدەن، بەڕاسـتی بیرکردنـەوە تێیدا دەرگای گەنجینەی زانسـتی بـۆ واڵا دەکات، ڕێگاکانـی چاکـەو خراپـەی بـۆ ڕوون بکاتـەوە، وە هانـی بدات لەسـەر ڕەوشـت بەرزیو دووری بخاتـەوە لـە ڕەوشـتی ناپەسـند، هیچ شـتێک لەوە بەسـوودتر نیـە بۆ بەنـدە کە بیر بکاتـەوە لـە قورئانو سـەرنجی ماناکانـی بدات.

(٢٢-٢٤): ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۖ هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ
(٢٢) هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ

ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٤﴾ ﴾:

﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ﴾ ئـەم دەقـە پیرۆزانـە زۆرێک لەناوە جوانەکانی خواو وەسـفە بەرزەکانـی لەخۆگرتـوە، پلەو پایەی مەزنەو بەڵگەکانی سـەر سـووڕهێنەرە، جـا هەواڵیداوە کـە بێگومـان خـوا پەرسـتراوێکە هیـچ پەرسـتراوێکی دیکـە نیـە بە حـەقو ڕاسـتی جگە لـەو، ئەویـش بە هـۆی تەواوێتـی مەزنیو چاکـەی گشـتگیریو بەڕێوەبردنی گشـتی، هەر پەرسـتراوێک جگە لـە خوا پووچەو شایسـتەی بەندایەتی کـردن نیە بە قـەد گەردیلەیەک، چونکـە هـەژارو دەستەوسـانو ناتـەواوە، نـە خاوەنی نەفسـی خۆیەتـی، نە هیچی بەدەستە بـۆ جگـە لەخۆی، پاشـان وەسـفی نەفسـی خۆی کردوە بـە زانسـتی گشـتگیری بەرفراوان، لـەوەی لەبەرچـاوی خەڵـک پەنهانـەو نایبینن، وە بە بەزەیی گشـتگیری کـە دەوری هەموو شـتێکی داوەو گەیشـتووە بە هەموو زیندەوەرێ، پاشـان باسـی گشـتگیری پەرسـتراوێتیو تـاکو تەنهایـی کـردوە لە پەرسـتندا، بەڕاسـتی ئەو زاتـە خاوەنـی هەمـوو خاوەندارەکانە، جـا جیهانی سـەرەوەو خـوارەوەو خەڵکەکـەی هەموویـان ژێر بـاری ئەون، بێدەسـەڵاتو دەستەوسـانو بەڕێوەبراون.

﴿ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ﴾ واتـە: پـاکو بێگـەردو پیرۆزو سـەلامەت لـە هەموو ناتـەواویو بـەڵاو نەخۆشـیو کەمو کوڕیـەک، مـەزنو گـەورە، چونکـە (القـدوس) بەڵگەیـە لەسـەر پـاکو بێگەردی لـە هەموو ناتەواویـەک، وە بەمەزندانانی خوا لە وەسـفو گەورەییەکانیدا.

﴿ ٱلْمُؤْمِنُ ﴾ واتـە: بە ڕاسـتدانەری هەموو پێغەمبـەرانو بەدیهێنراوەکانی، بـەوەی هێناویانە بـە بەڵگەو نیشـانە ڕوونەکانو سـەلماندنە یەکلاکەرەوەکان.

﴿ ٱلْعَزِيزُ ﴾ واتـە: ئـەو زاتەی کە کـەس زاڵ نابێ بەسـەریداو، کەس ناتوانـێ ڕێگری لێ بـکات، بەڵکـو زاڵە بەسـەر هەموو شـتێکداو هەموو شـتێک ملکەچی ئەون.

﴿ ٱلْجَبَّارُ ﴾ واتـە: ئـەو زاتەیـە کـە زاڵو سـەرکەوتووە بەسـەر گشـت بەندەکانـدا، وە سـەرجەم بەدیهێنـراوان گەردنکەچـی بـوون، کـە داڵدەی بـێ نەوایان دەداتو هـەژارەکان بێنیـازو دەوڵەمەنـد دەکات، ﴿ ٱلْمُتَكَبِّرُ ﴾ واتە: ئەو زاتەی خاوەنـی هەموو گەورەییو مەزنیەکـە، پـاکو باڵفتەیە لـە هەموو ناتـەواویو زوڵمو سـتەمێک.

﴿ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ (واتـە: پاکـیو بێگـەردی بـۆ ئـەو خوایـە لـەو

هاوبەشانەی کە بۆی دائەنرێ) ئەمە بەپاک ڕاگرتنی گشتیە، لە هەموو ئەوانەی هاوبەشدانەران وەسفیان پێکردوە. ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ﴾ هەموو بەدیهێنراوەکانە ﴿ ٱلْبَارِئُ ﴾ داهێنەری داهێنراوەکانە، ﴿ ٱلْمُصَوِّرُ ﴾ وێنەکێشی وێنەکانە، ئەم ناوانە پەیوەستن بە دروست کردنو بەڕێوەبردنو ئەندازەکردن، بە ڕاستی هەموو ئەوانە خوا تاکو تەنهایە پێی، هیچ کەسێک بەشدار نەبووە لەگەڵیدا.

﴿ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾ واتە: خاوەن هەموو ناوێکی زۆرە هیچ کەس ناتوانێ بیژمێرێو بیزانێ جگە لە خوا، لەگەڵ ئەوەش هەموویان جوانن، واتە: سیفاتی تەواون بەڵکو بەڵگەن لەسەر تەواوترینی سیفاتەکانو مەزنترینیان، ناتەواویان تێدانیە بە جۆرێ لە جۆرەکان.

وە لە جوانیان خوا ﷻ خۆشیانی دەوێ، وە ئەو کەسەیشی خۆش دەوێ کە خۆشیانی دەوێ، وە حەز دەکات بەندەکانی بەو ناوانە بپاڕێنەوەو داوای لێ بکەن. وە لە تەواوی ئەو زاتە خاوەن هەموو ناوە جوانو سیفاتە بەرزەکانە، بەڕاستی هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکانو زەویدان پێویستیان بەو زاتە هەیە بە بەردەوامی، ستایشی ئەو زاتە دەکەن، وە داوای پێویستیەکانیان لەو دەکەنو لێی دەپاڕێنەوە، بە فەزڵو بەخشندەیی خۆی پێیان دەبەخشێ لەوەی ڕەحمەتو کاردروستی خۆی دەیخوازێ.

﴿ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ ئەو زاتەی هەر شتێکی بوێ دەبێ، وە هیچ شتێک ناکات مەگەر حیکمەتو بەرژەوەندیەکی تێدایە.

تەفسیری سووڕەتی (الحشر) تەواو بوو.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ
إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ يُخْرِجُونَ ٱلرَّسُولَ
وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَٰدًا فِى سَبِيلِى
وَٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِى تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعْلَمُ بِمَآ أَخْفَيْتُمْ
وَمَآ أَعْلَنتُمْ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١﴾ إِن
يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا۟ لَكُمْ أَعْدَآءً وَيَبْسُطُوٓا۟ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم
بِٱلسُّوٓءِ وَوَدُّوا۟ لَوْ تَكْفُرُونَ ﴿٢﴾ لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ
يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣﴾ قَدْ كَانَتْ
لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا
بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا
وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ إِلَّا قَوْلَ
إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ
رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤﴾ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا
فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَٱغْفِرْ لَنَا رَبَّنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٥﴾

## تەفسیری سوورەتی (الممتحنة)

## مەدەنییە (١٣) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٩): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ عَدُوِّى
وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا۟
بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ يُخْرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن
تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَٰدًا فِى سَبِيلِى
وَٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِى تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعْلَمُ
بِمَآ أَخْفَيْتُمْ وَمَآ أَعْلَنتُمْ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ
ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١﴾ إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا۟ لَكُمْ
أَعْدَآءً وَيَبْسُطُوٓا۟ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ
وَوَدُّوا۟ لَوْ تَكْفُرُونَ ﴿٢﴾ لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَآ
أَوْلَٰدُكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣﴾ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ
وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ
وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن
شَىْءٍ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤﴾ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَٱغْفِرْ لَنَا رَبَّنَآ إِنَّكَ
أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٥﴾ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ
ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٦﴾ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً وَٱللَّهُ قَدِيرٌ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧﴾
لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ
ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ وَظَٰهَرُوا۟ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ أَن
تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩﴾ ﴾

زۆرێک لە ڕاڤەزانانی قورئان باسی هۆکاری دابەزینی ئەم دەقە پیرۆزانەیان کردوە، کە دەربارەی (حاطب)ی کوڕی ئەبی بەلتەعە هاتوون، کاتێ پێغەمبەر ﷺ ویستی مەککە ڕزگار بکات، جا (حاطب) نامەیەکی نارد بۆ قورەیش هەواڵی پێدان بە هاتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ سەریان، بۆ ئەوەی دەستێکی هەبێ لەلای ئەوان، نە بە هۆی گومانی لە ئاینی ئیسلامو نە بە

هـۆی دوو ڕوویـیـەوە، ئـەم نامەیەی بـە ئافرەتێکـدا نارد.
پێغەمبـەر ﷺ هەواڵـی پێـدرا دەربـارەی ئـەو نامەیـە، نێـردراوی خـۆی نارد بـۆ لای ئـەو ئافرەتە پێـش گەیشـتنی بـە مەدینـە نامەکەی لـێ وەرگرت، پێغەمبـەر ﷺ سەرزەنشـتی (حاطـب)ی کرد (خـوا لێـی ڕازی بێ) ئەویش عـوزرو بیانووی بۆ هێنایـەوە، ئنجا پێغەمبـەر بیانووەکەی وەرگرت.
ئـەم دەقانـە قەدەغەکردنێکـی توندی تێدایـە دەربارەی دۆسـتایەتی کافران لە هاوبـەش دانەران‌و جگـە لەوانیـش، وە گەیاندنی خۆشەویسـتی بۆیان، بە ڕاسـتی ئـەوە ڕەتکەرەوەی ئیمـان‌و بڕوایەو پێچەوانـەی میللەتـی ئیبراهیمی خەلیلـە ﷺ، وە پێچەوانەی ئەو عەقڵەیە کە خۆپاراسـتن لە دوژمن پێویسـت دەکات، ئـەو دوژمنـەی هەرچی لە توانایـدا هەبـێ بەکاریدەهێنێ‌و هـەل دەقۆزێتەوە لە گەیاندنـی زەرەرو زیان بـە دوژمنەکەی، جـا فەرموویەتی:
(١): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ کار بکـەن بـە داخـوازی ئیمانەکەتـان، لە دۆسـتایەتی ئەو کەسـەی ئیمانەکـەی بەجێهێنـاوە، وە دژایەتـی کردنـی ئەو کەسـەی دژایەتـی دەکات، چونکـە بێگومان ئـەو کەسـە دوژمنـی خـواو دوژمنـی بڕوادارانە، جـا دەفەرمـوێ: ﴿ وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ ﴾ واتـە: (دوژمنانـی خۆتـان مەکەن بە دۆسـتی خۆتان دۆسـتایەتی خۆتانیان بـۆ بنوێنن) واتـە: پەلە بکەن لە خۆشەویسـتی دەربڕین‌و کۆشـش بکەن بـۆ بەجێهێنانـی هۆکارەکانی، چونکە خۆشەویسـتی ئەگەر دروسـت بـوو، ئـەوە یارمەتیدان‌و دۆسـتایەتی بەدوایـدا دروسـت دەبێ، جا بەنـدە دەردەچـێ لە ئیمـان دەچێتە ڕیـزی بێبڕوایانـەوە، وە جیادەبێتـەوە لە کۆمەڵی بـڕواداران.
ئـا ئـەم کەسـەی کەسـی بێبـڕوای کـردوە بـە دۆسـت هیـچ پیاوەتیەکـی تێدانیـە، ئـەو چـۆن دۆسـتایەتی دوژمنترینـی دوژمنانـی دەکات، کـە هیچـی لێ نـاوێ جگە لە شـەڕو خراپـە نەبێ، وە پێچەوانـەی پەروەردگارێتـی، وە ئـەو پشـتیوانەی کـە چاکـەی بـۆ ئـەو دەوێ، وە فەرمانـی پێـدەکات‌و هانـی دەدات لەسـەری؟ هەروەهـا ئـەوەی کـە بانگـی بـڕوادار دەکات بـۆ دژایەتی کردنـی بێبـڕوا، بێگومـان ئـەوان بێبڕوا بـوون بەوەی بـڕواداران هێنایـان لە حەق‌و ڕاسـتی، هیچ شـتێ لـەم پێچەوانەبوون‌و دژایەتیـە مەزنتر نیـە، چونکە بێبڕوا بـوون بە بنچینـەی ئاینەکەیان، وە پێیـان وابـوو ئێـوە گومڕان‌و لەسـەر هیدایەت‌و ڕێنمایـی نین، لە کاتێکـدا ئـەوان بێبڕواییان کرد بـە حـەق، کـە هیچ گومـان‌و دوو دڵیەکـی تێدا نیە، هەر کەسـێک حـەق‌و ڕاسـتی ڕەت بکاتەوە ئەسـتەمە بەڵگەیەکـی بە دەسـتەوە بێ بەڵگەبێ لەسـەر ڕاسـتی قسـەکەی، بەڵکو تەنها زانسـت بە حـەق بەڵگەیـە لەسـەر پووچـی‌و خراپی قسـەی ئەو کەسـەی کـە ڕەتـی کردۆتەوە.
وە لە دژایەتیە سـەختەکانیان بێگومـان ئەوان ﴿ يُخْرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ ﴾ واتـە: پێغەمبەرو ئێوەش

دەردەكـەن ئـەی بـڕواداران لـە وڵاتەكانتـان، ئێوە هیــچ تاوانێكتـان نیە لـەوەدا، تەنها ئـەوە نەبێ بڕواتان هێناوە بە خوای پەروەردگارتان، كە پێویسـتە لەسـەر هەموو خەڵكی بەگشـتی بیپەرسـتن، چونكـە پەروەردەی كـردوونو نازونیعمەتی ڕشـتووە بەسـەریاندا بە نیعمەتە ئاشـكراو نهێنیەكان. كاتـێ كە پشـتیان هەڵكرد لـەم فەرمانەی كە پێویسـترینی پێویسـتیەكانە، ئێوەش بەجێتـان هێنا، دژایەتـی ئێوەیان كـردو دەربەدەرتانیـان كرد لە شـارو وڵاتەكانتان.

جـا چ ئایـنو چ پیاوەتـیو عەقڵێـك دەمێنـێ لەگەڵ بەنـدەدا ئەگەر پشـتیوانی بێبڕوایـان بكات، ئەوانـەی كـە ئەمـە وەسـفیانە لە هەمـوو سـەردەمو شـوێنێكدا؟! هیچ ڕێگریـان لێنـاكات مەگەر ترس یـان بەربەسـتێكی بەهێز.

﴿ إِن كُنتُمۡ خَرَجۡتُمۡ جِهَٰدٗا فِي سَبِيلِي وَٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِيۚ ﴾ واتـە: ئەگـەر مەبەسـتی دەرچوونتـان جەنگ كـردن بێـت لە ڕێگـەی خوادا، بـۆ بەرز ڕاگرتنی وشـەی خـواو بەدەسـتهێنانی ڕەزامەنـدی خوا، جـا بزانــن ناوەڕۆكی ئەمە بریتیە لە دۆسـتایەتی دۆسـتانی خـواو دژایەتی دوژمنەكانی، بە ڕاسـتی ئەمـە خـۆی لە خۆیـدا جەنـگو جیهادە لـە ڕێگـای خـوادا، ئـەو دۆسـتایەتیو دژایەتیكردنە لە مەزنترینـی ئەوانەیـە كـە نزیكـەكان پێـی نزیـك دەبنــەوە لـە پەروەردگاریـان، ڕەزامەنـی ئەو زاتەیشـی پێ بەدەسـت دەهێنن.

﴿ تُسِرُّونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعۡلَمُ بِمَآ أَخۡفَيۡتُمۡ وَمَآ أَعۡلَنتُمۡۚ ﴾ واتـە: چـۆن بەنهێنـی دۆسـتایەتی بێبڕوایـان دەكـەنو دەیشـارنەوە، لەگەڵ ئـەوەدا دەزانـن خوا زانایە بـەوەی دەیشـارنەوەو ئەوەی ئاشـكرای دەكـەن؟! جـا ئەگـەر ئەوە لە لای بـڕواداران شـاراوە بێت، لـە لای خوا شـاراوە نیە، لە داهاتـوودا پاداشـتی بەنـدەكان دەداتـەوە بـەوەی دەیزانـێ دەربارەیان لە خێرو شـەڕ.

﴿ وَمَن يَفۡعَلۡهُ مِنكُمۡ ﴾ واتـە: (هەر كەسـێك لە ئێوە) دۆسـتایەتی بێبڕوایان بـكات، دوای ئەوەی خـوا ئاگـاداری كردنـەوە لێیـان، ﴿ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴾ (واتە: ئـەوە بێگومان ڕێی ڕاسـتی ون كـردوە) چونكـە ڕێگایەكی گرتووەتە بەر پێچەوانەی شـەرعو عەقـڵو جوامێریی مرۆڤایەتیە.

(٢): پاشـان خوا سـەختی دژایەتیـان ڕوون دەكاتەوە، بـڕواداران دەجوڵێنێ لـە دژایەتیكردنیان، جا فەرمـووی: ﴿ إِن يَثۡقَفُوكُمۡ ﴾ واتـە: (ئەگەر) بتانبینن، هەلیان بۆ برەخسـێ بـە ئازاردانتان.

﴿ يَكُونُواْ لَكُمۡ أَعۡدَآءٗ ﴾ بـە ئاشـكرا ﴿ وَيَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ ﴾ (واتە: وە دەسـتیان درێژ دەكەن بۆتان) بە كوشـتنو لێدانو وێنـەی ئەوانە ﴿ وَأَلۡسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ ﴾ واتە: (زمانیان) بە قسـەكردنێكی خـراپ، لـە تانەو تەشـەرو جگـە لەویـش، ﴿ وَوَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ ﴾ (واتـە: ئاواتەخوازن كـە ئێوە بێبـڕوا بوونایـەت، بە ڕاسـتی ئەمە ئامانجـی ئەوانە كە دەیانەوێـت لێتان.

(٣): جـا ئەگەر بەڵگەتان هێنایەوەو وتان: پشـتیوانی بێبڕوایان دەکەیـن لەبەر نزیکیو خزمایەتیو مـاڵو سـامان، هەرگیز سـوودتان پێناگەیەنن نـە ماڵەکانتانو نـە منداڵەکانتان لـە لای خوا بە هیچ شـێوەیەک ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ (واتـە: خـوا بینایـە بەوەی کـە دەیکەن). لەبـەر ئەوەیە ئاگـاداری کردوونەتـەوەو ترسـاندوونی لە دۆسـتایەتی بێبڕوایـان، ئەوانەی دۆسـتایەتی کردنیان زیانتـان پێدەگەیەنێ.

(٤): بـە ڕاسـتی بـۆ ئێـوە هەیـە ئـەی کۆمەڵـی بـڕواداران ﴿ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ واتە: سەرمەشـقو پێشـەوایەتیەکی چـاکو پەیڕەوکردنێـک سـوودتان پێدەگەیەنـێ، ﴿ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ ﴾ واتـە: (لـە ئیبراهیم ﷺو ئەوانـەی لەگەڵیدا بوون) لە بـڕواداران، چونکە فەرمانم پێکردن شـوێنی میللەتـی ئیبراهیـم ﷺ بکەون.

﴿ إِذۡ قَالُواْ لِقَوۡمِهِمۡ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمۡ وَمِمَّا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ واتە: ئیبراهیم ﷺو ئەوانەشـی شوێنی کەوتبـوون خۆیـان بـەری کرد لە گەڵـە هاوبەشـدانەرەکەیان، وە لەو شـتانەش کە دەیانپەرسـتن لە جیاتـی خوا.

پاشـان بـە ئاشـکرا دژایەتی خۆیانیـان ڕاگەیانـد، وتیـان: ﴿ كَفَرۡنَا بِكُمۡ وَبَدَا ﴾ (واتە: ئێمـە بڕوامان نیـە بە ئاینـی ئێـوە)، وە ئاشـکرا بـوو دەرکـەوت، ﴿ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةُ وَٱلۡبَغۡضَآءُ ﴾ واتە: (لە نێـوان ئێمـەو ئێـوەدا) ڕق لێبـوون بـە دڵو نەمانـی خۆشەویسـتی، وە دژایەتی بە جەسـتەکان، بۆ ئـەو دژایەتـی ڕقو کینـە کاتێکی دیاریکـراو نیە، بەڵکو ئـەوە، ﴿ أَبَدًا ﴾ (بۆ هەمیشـەییە) مادام بەردەوامـن لەسـەر بێبڕواییتـان، ﴿ حَتَّىٰ تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥٓ ﴾ واتـە: جـا ئەگـەر بڕواتـان هێنا بە خـوای تاکو تەنهـا دژایەتـیو ڕقو کینە نامێنـێ، دەگۆڕێ بۆ خۆشەویسـتیو پشـتیوانی.

جـا بـۆ ئێوە هەیـە ئەی بـڕواداران سەرمەشـقی چاک لـە ئیبراهیـمو ئەوانـەی لەگەڵیدا بـوون لە بەجێهێنانـی بڕواهێنانو یەکتاپەرسـتیو هەسـتان بـە داخوازیەکانی بڕواهێنانو یەکتاپەرسـتی، وە لـە هەمـوو شـتێک خوای پـێ بپەرسـتن بە تـاکو تەنها.

﴿ إِلَّا ﴾ تەنهـا لـە یەک شـتدا ئەویـش ﴿ قَوۡلَ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ ﴾ (ئەو قسـەیەی ئیبراهیم بـە باوکی) ئـازەری هاوبەشـدانەری بێبـاوەڕی عینـادی یاخیبووی گـوت، کاتێ ئیبراهیـم ﷺ بانگی کرد بۆ بڕواهێنانو یەکتاپەرسـتی ڕێگری کـرد، ئیبراهیم فەرمـووی: ﴿ لَأَسۡتَغۡفِرَنَّ لَكَ ﴾ (واتە: بێگومان داوای لێخۆشـبوونت بـۆ دەکـەم) لـە کاتێکـدا ﴿ وَمَآ أَمۡلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍ ﴾ (واتـە: هیچـم بەدەسـت نیـە لـە بەرانبـەر خوادا بـۆ تـۆ) بەڵکو تەنهـا پەروەردگـارم دەپەرسـتم، ئومێـدەوارم لە پەرسـتنو نـزای پەروەردگارمـدا بێ هیـوا نەبم وەکـو ئێوە.

بۆ ئێوە نیە لەم حاڵەتەدا پەیڕەوی ئیبراهیم (عليه السلام) بکەن کە پاڕاوەتە پێی بۆ هاوبەشدانەر، بۆ ئێوە نیە دوعاو نزا بۆ هاوبەشدانەران بکەنو بڵێن: ئێمە لەو پاڕانەوەیەدا شوێنی میللەتی ئیبراهیم (عليه السلام) کەوتووین، چونکە خوا (جل جلاله) باسی بیانووی ئیبراهیمی کردوە لەو پاڕانەوەدا، کە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾ ﴾ التوبة، (واتە: وە داوای لێخۆشبوونی ئیبراهیم بۆ باوکی تەنها لەبەر وادەو بەڵێنێک بوو کە بە باوکی دابوو کە داوای لێبوردنی بۆ بکات جا کاتێ بۆی ڕوون بوویەوە کە بێگومان باوکی دوژمنی خوایە خۆی لێ بەری کرد بەڕاستی ئیبراهیم زۆر لە خواترسو لەسەرخۆ بوو).

وە بۆ ئێوە هەیە سەرمەشقێکی چاک لە ئیبراهیمو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، کاتێ لە خوا پاڕاونەتەوەو پشتیان پێ بەستووەو گەڕاونەتەوە بۆ لای، وە دانیان بە بێدەسەڵاتیو کەمو کورتی خۆیاندا ناوە، فەرموویانە: ﴿ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا ﴾ واتە: پشتمان بە تۆ بەست بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی سوودی هەیە بۆمانو دوور خستنەوەی ئەو شتەی زیانمان لێ دەدات، وە متمانەمان بە تۆیە ئەی پەروەردگارمان لەوەدا.

﴿ وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا ﴾ واتە: گەڕاوینەتەوە بۆ گوێڕایەڵی تۆو ڕەزامەندیت، وە هەموو ئەوانەی نزیکمان دەکاتەوە لە تۆ، ئێمە لەوەدا کۆشش کارین، وە بە ئەنجامدانی چاکەکان کەمتەرخەمی ناکەین، وە چاک دەزانین ئێمە سەرئەنجام بۆ لای تۆ دەگەڕێینەوە، بۆیە خۆمان ئامادە دەکەین بۆ گەیشتن بە خزمەتی تۆ، وە کاردەکەین بەوەی کە لە تۆ نزیکمان دەکاتەوە.

(٥): ﴿ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾ واتە: بێبڕوایان زاڵ مەکە بەسەرماندا بە هۆی گوناهەکانمانەوە، تووشی فیتنەمان بکەنو ڕێگریمان لێ بکەن لەوەی لە توانایاندایە لە کاروبارەکانی ئیمان، هەروەها بینە مایەی فیتنە بۆ نەفسی خۆیان، جا بێگومان ئەوان ئەگەر ببینن سەرکەوتوو زاڵن، وا گومان دەبەن کە لەسەر حەقنو ئێمەش لەسەر پووچین، بۆیە بێبڕواییو سەرکەشی زیاتر دەکەن، ﴿ وَٱغْفِرْ لَنَا ﴾ (لێمان خۆشبە) ئەوەی ئەنجاممان داوە لە گوناهو خراپەکان، وە ئەوەی کەمتەرخەمیمان کردوە لە فەرمانو بڕیارەکان ﴿ رَبَّنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ﴾ زاڵی بەسەر هەموو شتێکدا، ﴿ ٱلْحَكِيمُ ﴾ ئەو زاتەیە هەموو شتەکان لە جێگای خۆیاندا دادەنێ، جا بە عیزەتو دەسەڵاتو حیکمەتت سەرمان بخە بەسەر دوژمنانداو لە گوناهەکانمان ببورە، کەمو کورتیو ناتەواویەکانمان چاک بکە.

لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ
وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴿٦﴾ عَسَى اللَّهُ أَن يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ
وَبَيْنَ الَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً وَاللَّهُ قَدِيرٌ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ
﴿٧﴾ لَّا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم
مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ
﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن
دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَىٰ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَٰئِكَ
هُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٩﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ
فَامْتَحِنُوهُنَّ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا
تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَآتُوهُم
مَّا أَنفَقُوا وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ
وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ وَاسْأَلُوا مَا أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْأَلُوا مَا أَنفَقُوا
ذَٰلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ وَإِن فَاتَكُمْ
شَيْءٌ مِّنْ أَزْوَاجِكُمْ إِلَى الْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَآتُوا الَّذِينَ ذَهَبَتْ
أَزْوَاجُهُم مِّثْلَ مَا أَنفَقُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾

پاشان دووبارە هانیداون لەسەر پەیڕەوكردنی ئیبراهیمو شوێنكەوتووانی، فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ (واتە: بێگومان بۆ ئێوە لە ئیبراهیمو بڕوادارەكاندا سەرمەشقێكی جوان هەیە).

ئەم سەرمەشقیە ئاسان ناكرێ بۆ هەموو كەسێك، بەڵكو ئاسان دەكرێ لەسەر كەسێك كە: ﴿كَانَ يَرْجُوا اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ﴾ (واتە: ئومێدو هیوای بێ بەخواو بەڕۆژی دوایی) چونكە بەڕاستی بڕواهێنانو ئومێدبوونی پاداشت هەموو كارێكی گران لەسەر بەندە ئاسان دەكات، وە هەموو شتێكی زۆر لە پێش چاوی كەم دەكات، وە پێویست دەكات لەسەری زۆر پەیڕەوی بەندە چاكەكانی خواو پێغەمبەران بكات، چونكە ئەو وادەبینێت نەفسو دەروونی هەژارەو ناچارە بەوە، زۆریش ناچارە.

﴿وَمَن يَتَوَلَّ﴾ (واتە: هەركەسێك پشت هەڵبكات) لە گوێڕایەڵی خواو شوێنكەوتنی پێغەمبەرانی، ئەوە تەنها زیان بە خۆی دەگەیەنێ، وە هیچ شتێك زیان بە خوا ناگەیەنێ.

﴿فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ﴾ ئەو زاتەی كە خاوەنی دەوڵەمەندی ڕەهایە لە هەموو ڕووەكانەوە، بە هیچ جۆرێك پێویستی بە هیچ كەسێك لە دروستكراوەكانی نیە، ﴿الْحَمِيدُ﴾ ستایشكراوە لە زاتو ناوو سیفەتەكانیو كارەكانیدا، بە ڕاستی ئەو زاتە لە هەموو شتەكاندا شایستەی ستایشە.

پاشان هەواڵیداوە بەڕاستی ئەم دوژمنایەتیەی كە خوا فەرمانی پێكردوە بە بڕواداران بۆ هاوبەشدانەران، وە وەسفی كردون بە بەجێهێنانی، تا بەردەوام بن لەسەر هاوبەشدانانو بێبڕواییان، بەڕاستی ئەوان ئەگەر بڕوابهێنن، ئەوە حوكمو بڕیار لەگەڵ هۆكارەكەیدا دەسوڕێتەوە، ئەوكاتە خۆشەویستی ئیمانیش دەگەڕێتەوە.

كەواتە: ئەی بڕواداران بێ ئومێد مەبن لە گەڕانەوەی هاوبەشدانەران بۆ بڕواهێنان،

﴿ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَجۡعَلَ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَ ٱلَّذِينَ عَادَيۡتُم مِّنۡهُم مَّوَدَّةٗۚ ﴾ (واتـه: جـا دڵنیابـن خـوا دروسـت دەکات لـە نێـوان ئێـوەو ئەوانـەی دوژمنایەتیتـان لەگـەڵ کـردوون لـەوان دۆسـتایەتیو خۆشەویسـتی بـە ئیمانهێنانی زۆربەیان) هۆکارەکەیشـی گەڕانەوەیانە بـۆ بڕواهێنان،﴿ وَٱللَّهُ قَدِيرٞۚ ﴾ خـوا بـە توانایە بەسـەر هەمـوو شـتێکدا، لەو توانـاو دەسـەڵاتە ڕێنمایـی کردیەتی بـۆ دڵـەکان، وە هەڵگەڕانەوەیانـە لـە حاڵێکـەوە بـۆ حاڵێکی تـر،﴿ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ هیچ تاوانێکـی ئەوەنـدە بـە مـەزن دانەناوە کـە لێی خۆش نەبـێ، وە هیـچ ناتەواویـەک ئەوەندە گـەورە نیـە نەیپۆشـێ ﴿ قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ٥٣ ﴾ الزمر، (واتـە: ئەی موحەممـەد بڵێ: ئەی بەندەکانـم ئـەی ئەوانـەی کـە زۆر خۆتـان گوناهبار کـردوە نائومێـد مەبن لـە میهرەبانیو بەزەیـی خـوا چونکـە بێگومـان خوا لـە هەمـوو گوناهەکانتـان خۆش دەبـێ بەڕاسـتی هەر ئـەوە لێبـووردەی بـە بەزەییە)، لەم دەقـەدا ئاماژەو مـژدە هەیە بۆ موسـڵمان بوونـی هەندێ لـە هاوبەشـدانەران، ئەوانـەی ئەو کاتە دوژمنـی بڕواداران بـوون، بێگومان ئـەوەش ڕوویدا، سـوپاسو سـتایش تەنها بـۆ خوا.

کاتـێ ئـەم دەقـە پیرۆزانە دابەزی کـە وروژێنەرن لەسـەر دژایەتـی بێبڕوایـان، کاریگەری لـە بـڕواداران کـرد بەوپـەڕی کاریگـەری، وە بەجێیـان هێنـا بـە چاکتریـن شـێوە، وایان دەزانـی گوناهبـار دەبن لە پەیوەنـدی لەگەڵ هەندێ لـە خزمە هاوبەشـدانەرەکانیان، گومانی ئەوەیـان دەبـرد کـە ئـەو کارە دەچێتـە نـاو قەدەغەکـراوی خـوا، خـوا ﷻ هەواڵـی پێدان کـە ئـەو کارە ناچێتـە نـاو قەدەغـە کـراوەوە، جـا فەرمـووی:﴿ لَّا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَلَمۡ يُخۡرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ أَن تَبَرُّوهُمۡ وَتُقۡسِطُوٓاْ إِلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴾ واتـە: خـوا ڕێگریتـان لێ نـاکات لە چاکەو پەیوەندیو بەخششـی دیـار، وە دادپـەروەری بەرانبەر هاوبەشـدانەران لـە خزمەکانتـانو جگـە لەوانیـش، لـە کاتێکـدا ئـەوان جەنگیـان لەگـەڵ نەکـردوون لەسـەر ئـەم دینـە، وە دەریـان نەکـردوون لە جێگـاو شـوێنەکانتان، ئێـوە هیچ گوناهتـان ناگـات پەیوەندیتـان لەگەڵیانـدا هەبـێ، چونکـە بوونـی پەیوەندی لـەم حاڵەتەدا نـە مەترسـی تێدایە نـە خراپە، هـەروەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی دەربارەی بـاوکو دایکی هاوبەشـدانەر ئەگـەر منداڵەکەیـان موسـڵمان بێـت:﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَاۖ وَصَاحِبۡهُمَا فِي ٱلدُّنۡيَا مَعۡرُوفٗاۖ وَٱتَّبِعۡ سَبِيلَ مَنۡ أَنَابَ إِلَيَّۚ ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ١٥ ﴾ لقمان، (واتـە: ئەگـەر بـاوکو

دایکــت ئەوپــەڕی هەوڵیانــدا لەگەڵــت بۆ ئــەوەی شــتێ بکەیت بە هاوبەشــی مــن کە هیچ زانیاریەکــت پــێ نیــە، ئــەوە گوێڕایەڵیــان مەکــە، بەڵام لــە دونیــادا زۆر بە چاکــی هاوڕێ یەتیــان بکــەو شــوێن ڕێگای کەسێک بکــەوە کە بــە دڵســۆزی گەڕاوەتەوە بــۆ لای من، (لــەدواڕۆژدا) گەڕانەوەتــان تەنهــا بــۆ لای منــە، ئنجــا هەواڵتــان دەدەمــێ بــەو کردەوانەی کردووتانە).

خــوا ﷻ کــە دەفەرمــوێ: ﴿ إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ ﴾(واتــە: بێگومــان خوا ڕێگریتــان لێــدەکات لەوانــەی کــە جەنگیان لەگەڵ کــردوون) واتــە: لەپێنــاو ئاینەکەتاندا، دژایەتــی کــردن لــە پێنــاو دینی خــوا، وە دژایەتــی کردنی ئەو کەسەشــی پێی هەڵدەســتی.

﴿ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ وَظَٰهَرُوا۟ ﴾واتــە: یارمەتــی خەڵکانێکیــان داوە ﴿ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ ﴾ (واتە: لەســەر دەرکردنتــان)، خوا قەدەغەی لێکــردوون ﴿ أَن تَوَلَّوْهُمْ ﴾(واتە: دۆســتایەتیان لەگــەڵ بکــەن) بــە خۆشویســتن و یارمەتیدان بە قســەو کــردەوە، بــەڵام چاکــەو پیاوەتیتان کــە دۆســتایەتی هاوبەشــدانەران لــە خۆ ناگــرێ، ئەوە خــوا قەدەغــەی لێنە کــردوون، بەڵکو ئــەوە لــە چوارچێــوەی فەرمــان کردنــە بە چاکە بــە شــێوەیەکی گشــتی بەرانبەر بــە خزم و نزیکــەکان، وە جگــە لەوانیــش لــە ئادەمیزادو جگــە لەوانیش.

﴿ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾(واتــە: هــەر کەسێک پشــتیوانیان لێبــکات ئــا ئەوانــە خۆیــان ســتەمکارن) ئەو ســتەمەش بەپێی دۆســتایەتیەکە دەبێــت، جا ئەگەر دۆســتایەتیەکی تــەواو بــوو، ئــەوە دەبێتــە بێبڕوایــی و دەریــدەکات لە بازنــەی ئیســلام، وە لە خــواری ئەوە چەندیــن پلــە هەیــە، تیایاندایە قــووڵ و ئەســتوورە، تیاشــیاندایە لە خــوار ئەوەوەیە.

(١٠-١٢): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ ۖ فَإِنْ
عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ ۖ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ۖ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُوا۟ ۚ وَلَا جُنَاحَ
عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۚ وَلَا تُمْسِكُوا۟ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ وَسْـَٔلُوا۟ مَآ أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْـَٔلُوا۟ مَآ
أَنفَقُوا۟ ۚ ذَٰلِكُمْ حُكْمُ ٱللَّهِ ۖ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ وَإِن فَاتَكُمْ شَىْءٌ مِّنْ أَزْوَٰجِكُمْ إِلَى ٱلْكُفَّارِ
فَعَاقَبْتُمْ فَـَٔاتُوا۟ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَٰجُهُم مِّثْلَ مَآ أَنفَقُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا
يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ ۙ
فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ﴾

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ ۖ فَإِنْ

﴿عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ﴾ کاتێ ئاشتەوایی حودەیبیە کرا، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوبەشدانەران ڕێککەوتنی کرد، لەسەر ئەوەی کە ئەگەر کەسێک لە لایەن هاوبەشدانەراوە هەڵهات و هات بۆ لای مسوڵمانان، بە مسوڵمانی، دەبێ بیگێڕێتەوە بۆ لای هاوبەشدانەران، ئەمەش وشەیەکی گشتگیری ڕەها بوو ئافرەتان و پیاوانی دەگرتەوە. هەرچی پیاوانە خوا ڕێگری نەکرد لە پێغەمبەرەکەی نەیانگێڕێتەوە، وەکو وەفا بوونێک بەو مەرجەو تەواو کردنی ئاشتەوایی کە گەورەترین بەرژەوەندیە. بەڵام ئافرەتان کاتێ گێڕانەوەیان خراپەی زۆری تێدایە، خوا فەرمانی کرد بە بڕواداران ئەگەر ئافرەتانی ئیماندار هاتن بۆ لایان بە کۆچکەری، وە گومانیان هەبوو لە ڕاستگۆیی ئیمانیان با تاقییان بکەنەوە بەوەی ڕاستیان پێ دەردەکەوێ لە بڕواهێنانێکی تەواو، پێدەچی بڕواهێنانەکەی ڕاستگۆیانە نەبێ، بەڵکو حەزێک بێت بۆ مێردێک یان وڵاتێک یان جگە لەوانە لە مەبەستە دونیاییەکان.

ئەگەر ئەو ئافرەتانە بەم وەسفە بوون، ئەوە ڕەتکردنەوەیان پێویست دەبێ، وەکو وەفا بوونێک بەو مەرجە بە بێ تووش بونی زیان، وە ئەگەر تاقیان کردنەوە بینیان ئەو ئافرەتانە ڕاستگۆن، یان زانیان ڕاستگۆن بەبێ تاقیکردنەوە، ئەوە با نەیانگێڕنەوە بۆ لای بێبروایان.

﴿لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ﴾ (واتە: نە ئەو ئافرەتانە حەڵاڵن بۆ ئەو مێردە بێبڕوایانە، وە نە ئەو مێردانەش بۆ ئەو ئافرەتانە حەڵاڵن) گێڕانەوەیان خراپەیەکی گەورەیە خوا لەبەرچاوی گرتووە، هەروەها وەفابوونیشی بە مەرج ڕاگرتووە تێیدا بەوەی بێبڕوایان چییان خەرج کردوە بۆ خێزانەکانیان پێیان بدرێتەوە لە مارەیی و ئەوەشی بە شوێن ئەودا دێت، لە جیاتی ژنەکانیان.

ئەو کات مسوڵمانان گوناهبار نابن مارەیان بکەن، ئەگەرچی مێردیشیان هەبێت لە ژێر دەسەڵاتی هاوبەشدانەراندا، بەڵام بە مەرجێ مارەیی و بژێویان بۆ دابین بکەن.

وەک چۆن ئافرەتی مسوڵمان حەڵاڵ نیە بۆ بێبڕوا، بە هەمان شێوە ئافرەتی بێبڕواش حەڵاڵ نیە بۆ مسوڵمان لای خۆی بیهێڵێتەوە مادام لەسەر بێبڕواییە، جگە لە خاوەن کتێبەکان. لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُمْسِكُوا۟ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ﴾ (واتە: ژنە کافرە بێ نامەکان لای خۆتان ڕامەگرن) جا ئەگەر ڕاگرتنیانی قەدەغەی کردبێ، ئەوە زەواج کردن لەگەڵیاندا لە پێشترە (کە حەرامە).

﴿ وَسۡـَٔلُواْ مَآ أَنفَقۡتُمۡ ﴾(واتــە: ئێــوە داوای ئــەوە بكەنــەوە كــە خەرجتــان كــردوە) ئــەی بــڕواداران، كاتــێ خێزانەكانتان بــە هەڵگەڕاوەیی دەگەڕێنــەوە بۆ لای بێبڕوایــان، جا ئەگەر بێبڕواییــان نەفەقــەی ژنەكانیــان وەردەگرن كــە هاتوونەتە ناو مســوڵمانان، حەقــی خۆیەتی مســوڵمانانیش لەبەرانبــەردا نەفەقــەی ئــەو ژنانەیــان وەربگرن كــە هەڵگەڕاونەتــەوەو لە ناو بێبڕوایانــدا ماونەتەوە.

ئــەم دەقــە دەبێتــە بەڵگە لەســەر ئــەوەی دەرهێنانی مارەیــی لە پیــاودا نرخێنــراوە، جا ئەگەر كەســێك نیكاحــی ژنــی كەســێكی دیكــە تێك بــدات، بە شــیردان یــان جگە لــەوە، ئەوە پێویســتە لەســەری زامنی مارەییەكــە بكات.

ئــەم فەرمانــەی كــە خــوا باســی كــردوەو ڕوونــی كردوەتــەوە بۆتــان، بڕیــاری پێــدەدات لــە نێوانتانــدا، ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴾جــا خــوای گــەورە دەزانــێ چــی گونجــاوە بۆتــان لە بڕیــارەكان، وە یاســاو ڕێســاتان بــۆ دادەنێــت بەپێــی حیكمــەتو دانایــی خــۆی.

خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ وَإِن فَاتَكُمۡ شَيۡءٞ مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ إِلَى ٱلۡكُفَّارِ ﴾ بــەوەی خێزانەكانتــان هەڵبگەڕێنــەوەو بــڕۆن بــۆ نــاو بێبڕوایــان، ﴿ فَعَاقَبۡتُمۡ فَـَٔاتُواْ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتۡ أَزۡوَٰجُهُم مِّثۡلَ مَآ أَنفَقُواْ ﴾وەك باســكرا لە پێشــەوە بێبڕوایــان مارەیی ژنەكانیان وەردەگــرت ئەگەر كۆچیان بكردایــەت بــۆ لای مســوڵمانان. جــا هەر كەســێك لــە مســوڵمانان خێزانەكەی ڕۆشــتبێ بۆ نــاو بێبڕوایانو لە دەســتی دەرچوویێ، ئەوە پێویســتە لەســەر مســوڵمانان غەنیمەتــی پێ بدەن لەبــری ئــەوەی لــە دەســتی چــووە ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ﴾جــا بڕوابوونتــان بە خــوا پێویســت دەكات لــە ســەرتان كە بــە بەردەوامی پەیوەســت بــن بــە پارێزكاریی.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَوَلَّوْا۟ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ قَدْ يَئِسُوا۟ مِنَ ٱلْءَاخِرَةِ كَمَا يَئِسَ ٱلْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْقُبُورِ ﴿١٣﴾

(١٢): ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ﴾ ئـەم مەرجانـەی لـەم دەقـەدا باسـکراون ناونـراوە (بەیعەتـی ئافرەتـان) ئەوانـەی پەیمـانو بەڵێنیـان داوە لەسـەر بەجێهێنانـی ئـەو ئەرکانـەی کـە نێـرو مێ تێیـدا بەشـدارن لـە هەمـوو کاتەکانـدا، بـەڵام پیـاوان بەپێـی بارودۆخیـان ئەرکی سەرشـانیان دەگـۆڕێ، جـا پێغەمبـەرﷺ هەرچـی خـوا فەرمانـی پـێ بکردایـە جێبەجێـی دەکـرد، جـا ئەگـەر ئافرەتـان بهاتایـەن بـۆلای پەیمانی لەگەڵ ببەسـتنو پابەنـد بن بـەم مەرجانـە، ئەویـش پەیمانی لێوەردەگرتـنو دڵـی خـۆش دەکـردنو داوای لێخۆشـبوونی لـە خوا بۆیـان دەکرد، لـەوەی کـە ڕوودەدات لێیـان لـە کەمتەرخەمـی، وە دەیخسـتنە نـاو کۆمەڵـی بڕوادارانەوە، بـەوەی ﴿لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾ بەڵکـو خـوا بەتـاکو تەنها بپەرسـتن، ﴿وَلَا يَسْرِقْنَ﴾ واتـە: دزی نەکـەن، ﴿وَلَا يَزْنِينَ﴾ واتـە: (داوێـن پیسـی نەکـەن) هەروەکو چـۆن بوونی هەبـوو بـە زۆری لەنـاو داوێـن پیسـەکانداو ئەوانەی دۆسـتی ژێـر بەژێریـان هەیە، ﴿وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ﴾ (واتـە: منداڵانـی خۆیـان نەکـوژن) هەروەکـو چـۆن لەنـاو ئافرەتانـی سـەردەمی نەفامیـدا بوونـی هەبـوو، ئەوانـەی کچەکانیـان زینـدە بـە چـاڵ دەکـرد، ﴿وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ﴾ بوختـان کـردن: بریتیـە لەدرۆ هەڵبەسـتن بـۆ کەسـێکی دیکـە، واتـە: هیچ جـۆرە بوختانێـک هەڵنەبەسـتن، یەکسـانە پەیوەسـت بێ بەخۆیـانو مێردەکانیان، یان پەیوەسـت بێ بە جگە لـەوان، ﴿وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ﴾ واتـە: سـەرپێچیت نەکـەن لـە هـەر فەرمانێکدا فەرمانیـان پێ بکەیـت، چونکـە فەرمانی تۆ تەنهـا چاکەیـە، وە لەوانـەش گوێڕایەڵـی کردنیـان بۆت لـە قەدەغەکردن، لە قیژەو سـنگ هەڵدڕیـنو ڕووخسـار شـێواندنو هاوار کردن بـە هاواری نەفامـی ﴿وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ﴾ لـە کەمتەرخەمیـانو پاک کردنـەوەی دڵەکانیان ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ﴾ واتە: خـاوەن لێبوردەیی

زۆره بـۆ سـەرپێچیکاران، وه ئیحسـانو چاکـەش بۆ گوناهبـارانو تەوبـەکاران ﴿ رَّحِيمٌ ﴾ ڕەحمـەتو میهرەبانـی هەمـوو شـتێکی داپۆشـیوه.

(١٣): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَوَلَّوْاْ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ قَدْ يَئِسُواْ مِنَ ٱلْءَاخِرَةِ كَمَا يَئِسَ ٱلْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْقُبُورِ ﴿١٣﴾ ﴾

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾واتـە: ئـەی بڕواداران! ئەگـەر ئێوه بڕوادارن بـە پەروەردگارتان، وه شـوێنی ڕەزامەنـدی ئـەو کەوتـوونو دوور کەوتوونەتەوه لە خەشـمو قینی ئـەو زاته ﴿ لَا تَتَوَلَّوْاْ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ﴾(واتـە: کەسـانێک کـە خوا غەزەبی لـێ گرتوون مەیکەن بـە دۆسـتی خۆتـان) بۆیە غەزەبـی لێ گرتـوون بەهـۆی بێبڕواییانـەوه، ئەمەش گشـتگیره بـۆ سـەرجەم بێبڕوایـان ﴿ قَدْ يَئِسُواْ مِنَ ٱلْءَاخِرَةِ ﴾واتـە: بێگومـان ئـەوان بێبـەش بـوون لە چاکـەی دوارۆژ، هیـچ بەشـێکیان نەبـوو تیایـدا، دەی ئاگـاداری خۆتـان بـن بیانکـەن بـە دۆسـتو گونجـاو بن لەگەڵیاندا لەسـەر خراپـەکاریو بێبڕواییـان، جا ئێـوەش بێبەش دەبن لەخێـری دوارۆژ وەک چـۆن ئـەوان بێبەش بوون، وه کـە دەفەرموێ: ﴿ كَمَا يَئِسَ ٱلْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْقُبُورِ ﴾(واتـە: هەرچـۆن بێبڕوایـان بـێ هیـوان لە مـردووی ناو گۆڕسـتان) کاتێ گەیشـتنەماڵـی دوارۆژ حەقیقەتـی کارەکەیان بـە چاوی خۆیـان بینی، وه زانیـان بە زانینی دڵنیاکـەرەوه، کـە بێگومـان ئەوان هیچ بەشـێکیان نیـە تیایدا.

پێدەچـێ ماناکـەی ئـەوه بێـت: بە ڕاسـتی ئـەوان بـێ هیوا بـوون لـە ڕۆژی دوایـی: واتە: نکوولێـان کردووەو بێبڕوا بوون پێی، ئەو کات جێگای سەرسـووڕمان نیە دەسـت پێشـخەری بکـەن بـۆ توورەیـیو خەشـمو قینـی خـواو پێویسـتبوونی سـزادانیو بێئومێـد بوونیـان لە دوارۆژ، وەک چـۆن بێبڕوایانـی نکوولێـکاری ڕۆژی دوایـی لـە دونیـادا بێ هیـوا بوون لە گەڕانـەوەی مردووانـی نـاو گۆڕ بـۆ لای خوا.

تەفسیری سووڕەتی (الممتحنة) تەواو بوو.


سورة الصف
بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ
١ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ٢
كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفْعَلُونَ ٣ إِنَّ
ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم
بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ ٤ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ لِمَ
تُؤْذُونَنِي وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ فَلَمَّا زَاغُوٓاْ
أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ٥

## تەفسیری سوورەتی (الصف)
## مەدەنییە (١٤) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ١ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ٢ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفْعَلُونَ ٣ ﴾

﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ﴾ ئـەم دەقـە ڕوونکردنـەوەی مەزنـیو زاڵـیو دەسـەڵاتی خوایـە، وە زەلیـل بوونـی هەمـوو بەدیهێنراوەکانـە بۆ بـەرزیو بڵنـدی ئـەو زاتـە، وە هەمـوو ئەوانەی لـە نـاو ئاسـمانەکانو زەویدان یـادی خوا دەکـەنو دەیپەرسـتنو داوای پێویسـتیەکانیان لـەو دەکـەن، ﴿ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ﴾ ئـەو زاتـەی کـە زاڵـە بەسـەر هەمـوو شـتەکاندا بـە عیـززەتو دەسـەڵاتی، ﴿ ٱلْحَكِيمُ ﴾ کاربەجێیە لە دروسـتکردنو فەرمانیـدا، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴾ واتـە: (ئەی ئـەو کەسـانەی بڕواتـان هێناوە) بۆچی قسـەی چاک دەکـەنو هانی خەڵکی لەسـەر دەدەن، هەنـدێ جاریش وەسـفو ستایشـی پێدەکەن، خۆشـتان ئەنجامی نادەن، وە قەدەغەی شـەڕو خراپـە دەکـەن، هەنـدێ جار نەفسـی خۆتـان بە پـاک ڕادەگرن، کەچـی ئێوە پیـس بوون پێیـەوەو بـەوە وەسـف کـراون؟

ئایـا ئـەم حاڵەتە ناشـرینو سەرزەنشـت کراوە شـیاوە بـۆ بـڕواداران؟ یان لـە گەورەترین مایـەی ڕقو تووڕەییـە لـە لای خـوا، کـە بەندە شـتێ بڵێـتو کـردەوەی پێنـەکات؟ بۆیە پێویسـتە لەسـەر ئـەو کەسـەی فەرمـان بـە چاکـە دەکات خـۆی یەکـەم کـەس بێـت بە ئەنجامدانـی، وە ئـەو کەسەشـی ڕێگـری دەکات لە خراپـە یەکەم کەس بێت کـە لێی دوور بێـت، خوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ

أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾البقرة، (واتــە: ئایــا فەرمان بەســەر خەڵکیدا دەدەن بە چاکــە؟ وە خۆتان فەرامــۆش دەکــەن لەگەڵ ئەمەشــدا کە ئێــوە دەوری پەڕاوەکــە تەورات دەکەنــەوە دەی ئایا ژیر نابــن‌و تێناگەن).

شــوعەیب ﷺ بــە گەلەکــەی فەرمــوو: ﴿وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ ﴿٨٨﴾ ﴾هــود، (واتــە: وە مــن هەرگیــز نامــەوێ پێچەوانــەی ئێــوە بکــەم، لــەو کارەی ڕێگــری ئێــوەی لــێ دەکــەم).

(٤): ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ ﴿٤﴾ ﴾: ئەمــە هاندانــە لــە لایــەن خــواوە بــۆ بەندەکانی لەســەر جەنــگ‌و جیهاد لــە ڕێگــای خوادا، وە فێرکردنیانــە کــە چــۆن مامەڵــە بکــەن، بــە ڕاســتی پێویســتە لەســەریان بــە یــەک ڕیز بوەســتن لــە جەنــگ کردندا، بــە شــێوەیەکی ڕێک‌و چەســپیوو یەکســان، بەبــێ ناتەواوی‌و کەموکــوڕی لەنــاو ڕیزەکانــدا، ڕیزەکانیــان بــە شــێوەی یاســاو ڕێخســتن بێت، بــەو یەک ڕیزیــە یەکســانی لــە نێــوان تێکۆشــەران‌و هاوکاریکردنــی یەکتــری‌و ترســاندنی دوژمــن دروســت دەبــێ، وە چــالاک کردنــی هەندێکیــان بــۆ هەندێکــی دیکە.

لەبــەر ئەمەیــە پێغەمبــەر ﷺ ئەگــەر ئامــادەی جەنــگ‌و کوشــتار بووایــە، هاوەڵەکانــی ڕیز دەکــرد، وە ڕێکی دەخســتن لە شــوێنەکانی خۆیــان دایدەمەزرانــدن، لەبەر ئەوە هەرکەســێ کاری خــۆی بزانــێ چیــە، هەندێکیان بــە هــۆی هەندێکیانەوە بــێ ئاگا نەبــن، بەڵکو هەموو دەســتەیەک گرنگــی بدات بە شــوێنەکەی خــۆی‌و بە ئەرکی سەرشــانی خۆی هەســتێت، ئا بەم ڕێگایــە کارەکان تــەواو دەبن.

(٥): ﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ لِمَ تُؤۡذُونَنِي وَقَد تَّعۡلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡۖ فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾ ﴾:

﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ﴾ (واتــە: کاتێــک مووســا بــە گەلەکەی وت) بە ســەرکۆنە کردنیان لەســەر ئــەو کارەی کردیان، وە سەرزەنشــت کردنیان لەســەر ئازاردانی، بە ڕاســتی ئــەوان دەیانزانــی مووســا پێغەمبــەری خوایــە: ﴿لِمَ تُؤۡذُونَنِي﴾ (بۆچــی ئــازارم دەدەن) بە قســەو کــردارەکان ﴿وَقَد تَّعۡلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ﴾ (واتــە: لــە کاتێکــدا بە دڵنیاییــەوە دەزانــن کــە من نێــردراوی خوام بــۆ ئێوە).

لــە مافەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیــە ڕێزی لێ بگیرێ‌و بە مەزن دابنــرێ‌و ملکەچی فەرمانەکانی بکــرێ‌و پەلــە بکــرێ لە جێبەجــێ کردنــی بڕیارەکانــی، بــەڵام ئازاردانی پێغەمبــەر ﷺ -کە

چاکـەی بەسـەر خەڵکیـەوە لـە سـەرووی هەمـوو چاکەکانەوەیـە دوای چاکـەی خـوا- لەوپـەڕی قیزەونـیو ناشـرینیو بوێریو لادانـە لە ڕێگای ڕاسـت، ئەو ڕێگایـەی زانیویانەو وازیـان لێهێنـاوە، لەبـەر ئەمەیە فەرموویەتـی: ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓاْ﴾ واتە: لایاندا لە حەقو ڕاسـتی بـە مەبەسـت ﴿أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ﴾ (واتە: خـواش دڵـی وەرگێڕان) وەک سـزایەک بۆیان لەسـەر ئـەو ڕووو وەرگێڕانەیـان کـە هەڵیـان بژاردبـوو بـۆ خۆیـانو ڕازی بـوون پێی، خوا سـەرکەوتووی نەکـردن بـۆ ڕێنمایی، چونکە شـیاوی خێر نەبـوون، وە شایسـتەی هیچ نین جگـە لـە شـەڕ نەبـێ ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾ واتـە: ئەوانەی کـە بە بـەردەوام لە ڕێدەرچـوون وەسـفە بۆیـان، هیچ مەبەسـتێکیان نیە لـە ڕێنمایـی وەرگرتندا.

ئـەم دەقـە ئـەوە دەگەیەنـێ کـە گومراکردنـی بەنـدەکان لـە لایـەن خـواوە زوڵمو سـتەم نیـە لـەو زاتـەوە، وە هیـچ بەڵگەیەکیان لەسـەر خـوا نیـە، بەڵکو ئـەو گومرابوونـە بە هۆی خۆیانەوەیـە، ئـەوان خۆیان دەرگـای هیدایـەتو ڕێنماییان بەسـەر خۆیاندا داخسـت دوای ئـەوەی کە ناسـیان، جـا پاداشـتیان دەداتـەوە دوای ئـەوە بـە گومرابـوونو لادان، کە هیچ چارەیەکیـان نیـە لە بەرگـری کردنـی، وە هەڵگەڕانەوەی دڵـەکان وەک سـزایەک بۆیانو دادپەروەریـەک لەلایـەن خـواوە بۆیـان، وەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفۡـِٔدَتَهُمۡ وَأَبۡصَٰرَهُمۡ كَمَا لَمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَنَذَرُهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ١١٠﴾ الأنعام، (واتە: وە دڵو چاویـان وەردەگێڕیـنو لادەدەیـن لـە بڕواهێنـان هەروەکو لە سـەرەتاوە بڕوایان بە قورئـان نەهێنـا وە لێیـان دەگەڕێین لەسـەر کەشـی خۆیانـدا هەر سـەرگەردان بن).

وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا
بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ فَلَمَّا
جَاءَهُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ٦ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى
اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُوَ يُدْعَىٰ إِلَى الْإِسْلَامِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ
٧ يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ
الْكَافِرُونَ ٨ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ
عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ ٩ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ
تِجَارَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ١٠ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ
فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ١١
يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَمَسَاكِنَ
طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ١٢ وَأُخْرَىٰ تُحِبُّونَهَا نَصْرٌ
مِّنَ اللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ ١٣ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا
أَنصَارَ اللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ لِلْحَوَارِيِّينَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللَّهِ
قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللَّهِ فَآمَنَت طَّائِفَةٌ مِّن بَنِي إِسْرَائِيلَ
وَكَفَرَت طَّائِفَةٌ فَأَيَّدْنَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَىٰ عَدُوِّهِمْ فَأَصْبَحُوا ظَاهِرِينَ ١٤

**(٦-٩):** ﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَاءَهُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٦﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُوَ يُدْعَىٰ إِلَى الْإِسْلَامِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿٧﴾ يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ﴿٨﴾ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ ﴿٩﴾ ﴾:

﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی عینادیو یاخیبوونی نەوەکانی ئیسرائیل، ئەوانەی عیسای کوڕی مەریەم بانگی کردنو پێی وتن: ﴿ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم ﴾ واتە: خوای گەورە منی ناردوە بۆ ئەوەی بانگتان بکەم بۆ خێرو چاکەو ڕێگریتان بکەم لە شەڕوو خراپە، وە پشتیوانی لێکردووم بە بەڵگە ڕوونەکان، وە ئەوەیشی دەبێتە بەڵگە لەسەر ڕاستی منو بوونم، ﴿ مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ ﴾ واتە: هاتووم بەوەی مووسا ﷺ پێی هاتووە لە تەوراتو شەریعەتە ئاسمانیەکان، جا ئەگەر من بانگەشەی پێغەمبەرایەتیم بکردایە، ئەوە شتێکم دەهێنا جگە لەوەی پێغەمبەران پێی هاتوون، ئەو تەوراتەی لە پێش مندا هاتووە بەڕاستی دادەنێم، ئەو تەوراتە هەواڵو مژدەی بە هاتنی من داوە، بۆیە هاتمو نێردرام بە بەڕاستدانەری ﴿ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ ﴾ (واتە: وە مژدەتان پێ دەدەم بە پێغەمبەرێ کە لە دوای من دێو ناوی ئەحمەدە) ئەویش موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدول موتەلیبی هاشمیە.

جا عیسا ﷺ وەکو پێغەمبەران بە ڕاست دانەری پێغەمبەرانی پێشوو پێغەمبەری داهاتووە، بە پێچەوانەی درۆزنەکان، چونکە ئەوان دژی پێغەمبەرانن بە تەوپەڕی دژ بوون، وە لە وەسفو ڕەوشتو فەرمانو قەدەغەکردندا پێچەوانەی ئەون ﴿ فَلَمَّا

جَآءَهُم ﴿ پێغەمبەر موحەممەد ﷺ کە عیسا ﷺ مژدەی پێدابوو، ﴿ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾ واتە: بەڵگە روونەکان، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە بەراستی ﴿ قَالُواْ ﴾ نکوولیان لە راستی کردوو بەدرۆیان داناو وتیان: ﴿ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴾ ئەمە لە سەرسورهێنەرترینی سەرسوور هێنەرەکانە، ئەو پێغەمبەرەی کە پەیامەکەی روون کراوەتەوە روونتر لە خۆری رۆژ، دەکرێت بە جادووگەرێ جادووەکەی روونو ئاشکرابێ، ئایا گێلیو سەرشۆڕی لەمە مەزنتر هەیە، ئایا هیچ درۆهەڵبەستنێ لەم درۆ هەڵبەستنە گەورەترە، کە رەتی دەکاتەوە هەموو ئەوانەی لە پەیامەکەیدا بە روونو ئاشکرایی هاتوون، وە ئەوە دەچەسپێنێ بۆی کە ئەو پێغەمبەرە دوورترین کەسە لێیەوە؟ ﴿ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ ﴾ (واتە: جا کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە درۆ هەڵبەستێ بە دەم خواوە) بەم درۆیەو جگە لەمەش، لەکاتێکدا ئەو هیچ بیانوویەکی نیەو بیانوو بەڵگەی براوە، چونکە ئەو ﴿ يُدۡعَىٰٓ إِلَى ٱلۡإِسۡلَٰمِۚ ﴾ وە بۆی روون دەکرێتەوە بە بەڵگە ئاشکراکانی. ﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ ئەوانەی لە سەر ستەمکردنیان بەردەوامن، ئامۆژگاری هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێ، نە روونکردنەوەو نە سەلماندنیش نایانترسێنێ.

بە تایبەت ئەو ستەمکارانەی کە رووبەرووی حەقو راستی وەستانەتەوە بۆئەوەی رەتی بکەنەوەو پووچ سەربخەن، تا لەبەر ئەمەیە خوا ﷻ دەربارەیان فەرموویەتی: ﴿ يُرِيدُونَ لِيُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ ﴾ (واتە: دەیانەوێ رووناکی دینی خوا بکوژێننەوە بە فووی دەمیان) لەوەی دەرچووە لێیانەوە لە وتارە فاسیدو خراپەکانیان کە حەقی پێ رەت دەکەنەوە، ئەو وتارانەش هیچ حەقیقەتێکیان نیە، بەڵکو مرۆڤی بەرچاو روون زانستو زانیاری زیاد دەبێ دەربارەی ئەوەی ئەوان لەسەری دەرۆن لە پووچو بەتاڵی، ﴿ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾ واتە: بە دڵنیاییەوە خوا ﷻ سەرخستنی ئاینەکەی لە ئەستۆ گرتووە، وە تەواوکردنی ئەو حەقەی کە پێغەمبەرانی پێ ناردوەو ئاشکراکردنی رووناکی خۆی لەسەر هەموو وڵاتان، با بێبڕوایانیش پێیان ناخۆش بێ، وە با ئەو هەموو هۆکارانەش بەکاربێنن کە پێی دەگەن بە کوژاندنەوەی رووناکی خوا، بەراستی ئەوان دۆڕاون، وێنەی ئەوان وەکو کەسێک وایە بەدەمی فوو بکات لە خۆرو روناکیەکەی بکوژێنێتەوە، نە گەیشتن بە مەبەستەکانیان وە نە عەقڵیان سەلامەت بوو لە ناتەواویو لەکەدار

کـردن تیایـدا.
پاشـان باسـی هـۆکاری سەرخسـتنی ئاینـی ئیسـلامی کـرد بـە هەسـتەوەریو واتایـی، جـا فەرمـووی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ ﴾ (واتـە: خـوا ئـەو زاتەیـە کـە پێغەمبەری خـۆی نـاردوە بـە ڕێنمایـی)، واتـە: بـە زانسـتی بـە سـوودو کـردەوەی چـاک، بـەو زانسـتەی کـە ڕێنمایـی دەکات بـۆ لای خـواوماڵـی ڕێـزداری، وە ڕێنمایـی دەکات بـۆ چاکتریـن کـردەوەو ڕەوشـتەکان، وە ڕێنمایـی دەکات بـۆ بەرژەوەندیەکانـی دونیـاو دواڕۆژ، ﴿ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ ﴾ واتـە: ئـەو ئاینـەی کـە ئاینداری پـێ دەکـرێو وە پەروەردگاری جیهانیانـی پـێ دەپەرسـترێ، کـە بریتیـە لـە حـەقو ڕاسـتی نـە ناتـەواوی تێدایـەو نـە کـەمو کـوڕی بەسـەردا دێ، بەڵکـو فەرمانەکانـی خۆراکـی دڵو ڕووحەکانـەو ئارامـی جەسـتەکانە، وە وازهێنـان لـە قەدەغەکراوەکانـی سـەلامەتیە لـە شـەڕو خراپـە.
ئـەوەی پێغەمبـەری پـێ هاتـووە لـە ڕێنمایـیو ئاینـی ڕاسـت، گەورەتریـن بەڵگـەو سـەلماندنە لەسـەر ڕاسـتێتی، ئـەوە سـەلماندنێکی بـۆ ماوەیـە تـا دونیـا بمێنـێ، کەسـی ژیـر تـا زیاتـر بیـری لێبکاتـەوە زیاتـر دڵخـۆشو بەرچـاو ڕوون دەبـێ.
﴿ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ﴾ واتـە: سـەریبخات بەسـەر هەمـوو ئاینێکـدا بـە بەڵگـەو سـەلماندن، وە شوێنکەوتووانیشـی سـەربخات ئەوانـەی کـە پێـی هەسـتاون بـە شمشـێرو ڕم، بـەڵام خـودی ئایـن ئـەم وەسـفە پەیوەسـتە پێیـەوە لـە هەمـوو کاتێکـدا، هەرگیـز ناگونجـێ سـەرکەوتوویەک سـەربکەوێ بـە سـەریدا، یـان دوژمنێـک لـە ئاسـتیدا بوەسـتێ ئیـلا درزی تێدەکـەوێو ئیفلیـج دەبـێ، بـەڵام ئەوانـەی دراونەتـە پـاڵ ئایـن بێگومـان ئەگـەر بەجێـی بهێنـن، وە خۆیـان ڕوونـاک بکەنـەوە بـە ڕووناکیەکـەیو ڕێنمایـی وەربگـرن بـە ڕێنماییەکـەی، لـە بەرژەوەندیەکانـی دیـنو دونیایانـدا، بـە هەمـان شـێوە هیـچ کەسـێک ناتوانـێ لـە ڕوویانـدا بوەسـتێ، وە هـەر دەبـێ سـەربکەون بەسـەر شـوێنکەوتووانی ئاینەکانـی دیکـەدا.
وە ئەگـەر پشـتگوێیان خسـتو ڕازی بـوون بـەوەی کـە تەنهـا بدرێنـە پـاڵ ئاینـی ئیسـلام، ئـەوە هیـچ سـوودێکیان پـێ ناگەیەنـێ، وە پشـت گوێخسـتنی ئـەوان دەبێتـە هـۆی زاڵ بوونـی دوژمنـان بەسـەریاندا. وە ئەمـە دەزانـێ هـەر کەسـێک بارودۆخـەکان بخوێنێتـەوە، وە تەماشـای سـەرەتای مسـوڵمانانو دواییەکانیـان بـکات.
(١٠-١٤): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿١٠﴾ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ

﴿وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ١١ يَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ وَيُدۡخِلۡكُمۡ
جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١٢ وَأُخۡرَىٰ تُحِبُّونَهَاۖ نَصۡرٞ
مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتۡحٞ قَرِيبٞۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٣ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ
لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت
طَّآئِفَةٞۖ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ ١٤﴾

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ﴾ واتە: ئەمە وەسیەتو ڕێنمایی‌و ڕێنیشاندانە لە لایەن میهرەبانترینی میهرەبانەکان، بۆ بەندە بڕوادارەکانی، بۆ مەزنترین بازرگانی‌و گەورەترین داواکاری‌و بەرزترین خوازراو، ڕزگار بوونی پێ بەدەست دەهێنێ لە سزای زۆر بە ئێش‌و سەرکەوتن بە نازو نیعمەتی هەمیشەیی.

وە بە (أداة العرض) هێناویەتی کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەمە فەرمانێکە حەزی لێدەکاو پەسەندە بەلای هەموو بەرچاوو ڕوونێک، وە بەرز دەبێتەوە بۆ لای هەموو کەسێکی ژیر، وەکو ئەوەیە وترابێت: ئەم بازرگانیە چیە کە ئەمە ڕێزو شکۆیەتی؟ فەرموویەتی: ﴿تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ (واتە: بڕوا بێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی).

ئەوەی زانراوە بە ڕاستی ئیمانی تەواو بریتیە لە دانپێدانانی بڕانەوە بەوەی خوا فەرمانی پێکردوە بە دانپێدانان پێی، بە پێویست زانی کردەوەکانی جەستەیە، لە گەورەترین کردەوەکانی جەستەش جەنگ‌و جیهاد کردن لە ڕێگای خوادا، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ﴾ (واتە: وە تێکۆشن لە ڕێگای خوادا) بەوەی گیانی خۆتان ببەخشن بۆ دژایەتی دوژمنانی ئیسلام، وە مەبەست سەرخستنی ئاینی خواو بەرز ڕاگرتنی وشەی ئەو زاتەیە.

وە دەبەخشن بەشێک لە ماڵەکانتان لەو داواکراوەدا، بەڕاستی ئەگەر چ قورس‌و گرانە بەلای نەفس‌و دەروونەوە، بێگومان ئەوە ﴿خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ بە ڕاستی خێرو چاکەی دونیایی تێدایە لە سەرکەوتن بەسەر دوژمنەکاندا، وە سەربەرزیەک دژ بە زەلیلی، وە ڕزق‌و ڕۆزی فراوان‌و فراوانی دڵو کرانەوەی.

وە لە دوارۆژیشدا سەرکەوتن بە پاداشتی خواو ڕزگار بوون لە سزای، لەبەر ئەمەیە باسی پاداشتی کردوە لە دوارۆژدا، جا فەرموویەتی: ﴿يَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ﴾ (واتە: لە گوناهەکانتان خۆش دەبێ) ئەمە گوناهە بچووکەکان‌و گەورەکان

دەگرێتــەوە، چونکــە بــە ڕاســتی ئیمــان بــە خــواو جیهــاد کــردن لــە ڕێگایــدا، دەبنــە مایــەی ســڕینەوەی گوناهــەکان ئەگــەر گوناهــە گەورەکانیــش بــێ.
﴿ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾ واتــە: (وە دەتانخاتــە باخاتێکــەوە) بــە ژێــر باڵەخانەکانــیو بیناکانــیو نهۆمەکانــیو دارەکانــی جۆگــەی زۆر بــە ژێریانــدا دەڕوات، چەندەهــا ڕووبــار لــە ئــاوی ســازگارو تــامو بــۆن نەگــۆڕاو، وە چەندەهــا ڕووبــار لــە شــیر کــە تامــی نەگــۆڕاوە، وە چەندەهــا ڕووبــار لــە شــەرابی نایــاب بــە لەزەتو خۆشــە بــۆ نۆشــانی، وە چەندەهــا ڕووباریشــی تێدایــە لــە هەنگوینــی پاڵفتــە، وە لــەوێ هەمــوو جــۆرە میوەجاتێکیــان بــۆ ئامادەیــە.
﴿ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ ﴾ واتــە: (وە دەتانخاتــە خانوو کۆشــکی زۆر پاکو خۆشــەوە) هەمــوو پاکیەکــی لەخــۆ گرتــووە، لــە بــەرزیو بڵنــدیو جوانــیو ڕازاوەیــی کۆشــکو تــەلارەکان، تەنانــەت خەڵکــە خــاوەن پلــەو پایــە بــەرزەکان لەنــاو نهۆمەکانــدا خەڵکــی بەهەشــت دەیانبینــن، هەروەکــو چــۆن ئەســتێرە گەشــاوەکان لــە ئاســۆی ئاســمان ڕۆژهــەڵات یــان ڕۆژئــاوا.
تەنانــەت خانــوو باڵەخانەکانــی بەهەشــت هەندێکــی لــە خشــتی ئاڵتونــەو هەندێکــی لــە خشــتی زیــوو، وە خێمــەو چادرەکانیــان لــە مــرواریو مەرجانــە، وە هەنــدێ لــە خانووەکانــی لــە زمــرودو گەوهــەری ڕەنگــاو ڕەنگــە لــە جوانتریــن ڕەنگــەکان، تەنانــەت لــە ڕوونیانــدا لەنــاوەوە ڕووکەشــیان دەبینــرێ، وە لــە دەرەوەش ناوەوەیــان دەبینــرێ، وە تیایدایــە لــە پاکــیو جوانــی ئــەوەی کــە وەســفکەران ناتوانــن وەســفی بکــەن، بەختــورەش بــە ســەر دڵــی هیــچ یەکێــک نەهاتــووە لــە جیهانیــان، ناتوانــن هەســتی پــێ بکــەن تــا نەیبینــن، وە چێــژ وەربگــرن لــە جوانیەکــەی، وە دڵیــان پێــی ئۆقــرە بگــرێ.
ئــا لــەو حاڵەتــەدا ئەگــەر خــوا خەڵکــی بەهەشــتی بەجۆرێکــی کامــڵو تەواوی دروســت نەکردایــە کــە مردنیــان بەســەردا نایــەت، لەوەیــە لــە خۆشــیاندا بمردنایــە، پاکــی بــۆ ئــەو زاتــەی هیــچ کەســێ لــە بەدیهێنراوەکانــی ناتوانــێ ستایشــی ئــەو زاتــە بژمێــرێ، بەڵکــو وەک چــۆن ئــەو زاتــە خــۆی ستایشــی نەفســی دەکاتو، لــە ســەرووی ستایشــی بەندەکانیەوەیــە.
بــەرزیو گەورەیــیو جوانــی بــۆ ئــەو زاتــەی کــە ماڵــی پــڕ لــە نازونیعمەتــی بەدیهێناوە،

وە تیایـدا دایـنـاوە لـە گەورەیـیـو جوانـی کـە عەقڵـی خەڵکـی سەرسـام دەکاتو دڵـیـان دەبـات، بـەرزی بۆنـەو زاتـەی خاوەنـی حیکمەتـی تـەواوە، لەکـوێ ئـەو حیکمەتانـەی ئەگـەر بەهەشـتی نیشـانی بەنـدەکان بدایـە کاتـێ کـە دروسـتی کـردوە، وە تەماشـای ناویـان بکردایـە لـە نازونیعمەتـەکان، ئـەوە هیـچ کەسـێک لێـی دوانەدەکـەوت، وە هەرگیـز ژیانیـان نەدەبـردە سـەر لـەم دنیـا براوەیـەدا، کـە نازونیعمەتەکانـی بەسـتراون بـە ناخۆشـیەکانەوە، وە خۆشـیەکانی بەسـتراون بەجـێ هێشـتنیانەوە.

بەهەشـت ناونـراوە بـە بەهەشـتی (عـدن) چونکـە خەڵکەکـەی بـە هەمیشـەیی تیایـدان، هەرگیـز لێـی دەرناکرێـن، وە حەزناکـەن جێگۆرکێیـان پـێ بکـرێ، ئـەوە پاداشـتی بـێ پایـانو جوانـە، سـەرکەوتنی مەزنـە کـە هیـچ سـەرکەوتنێ وێنـەی ئـەوە نیـە، ئەمـە پاداشـتی ڕۆژی دواییـە.

بـەڵام پاداشـتی دونیـا بـۆ ئـەم بازرگانیـە خـوا ﷻ باسـی کـردوەو فەرموویەتـی: ﴿ وَأُخْرَىٰ تُحِبُّونَهَا ﴾ واتـە: شـتێکی ترتـان پـێ دەدرێ کـە حـەزی لێدەکـەن ئەویـش ﴿ نَصْرٌ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾ (سـەرکەوتن لەلایـەن خـواوە) بۆتـان لەسـەر دوژمـن، سـەربەرزیو دڵخۆشـی پـێ دەسـتەبەر دەبێـت، ﴿ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ ﴾ (ڕزگـار کردنێکـی نزیـک) بازنـەی ئیسـلامی پـێ فـراوان دەبـێو ڕزقو ڕۆزی زۆری پـێ دەسـتەبەر دەبـێ، ئەمـە پاداشـتی بـڕوادارە تێکۆشـەرە جەنگاوەرەکانـە.

بـەڵام ئـەو بڕوادارانـەی لـە ئەهلـی جیهـاد نیـن، ئەگـەر جگـە لـە ئـەوان هەسـتێ بـە جەنـگو جیهـاد کـردن، خـوا ﷻ بێئومێدیـان نـاکات لـە فـەزڵو چاکـەی خـۆی، بەڵکو فەرموویەتـی: ﴿ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ واتـە: بـە پاداشـتی بەپەلـە لـە ئێسـتاو لـە داهاتـوودا، هەریەکـەو بەپێـی ئیمانەکـەی، ئەگەرچـی ناگـەن بـە پلـەی جەنگـاوەران لەڕێگـای خـوادا، هـەروەک پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتـی: {إِنَّ فِي الْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ أَعَدَّهَا اللَّهُ تَعَالَى لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِهِ مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ} (أخرجه برقم: (٦٩٨٧)، عن أبي هريرة)، واتـە: بێگومـان لـە بەهەشـتدا سـەد پلـەو پایـە هەیـە، خـوا ئامـادەی کـردوە بـۆ تێکۆشـەرانی ڕێـی خـۆی، لـە نێـوان دوو پلـەدا وەک نێوانی ئاسـمانو زەوی وایـە، خـوا ئامـادەی کـردوە بـۆ ئەوانـەی جیهـاد دەکـەن لـە ڕێگـای ئـەودا، پاشـان خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوٓا۟ أَنصَارَ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: (ئـەی ئەوانـەی کـە بڕواتـان هێنـاوە ببـن بـە یارمەتیدەرانـی ئاینـی خـوا) لـە قسـەو کـردەوەکان، ئەویـش

بــە هەســتان بــە ئاینــی خــواو ســووربوون لەســەر بەجێهێنانــیو جێبەجــێ کردنــی بەســەر کەســانی دیکــەدا، وە جەنــگو جیهــاد دژی ئەوانــەی نکوولــی لێدەکــەنو پشــت گوێــی دەخــەن بــە جەســتەو مــاڵو ســامان، وە جیهــادی ئــەو کەســەش کــە پێــی وایــە زانســتی لــە لایــەو حەقــی پــێ ڕەت دەکاتــەوە، بــە تێکشــکانی بەڵگەکــەی، وە بیانــوو بڕینــیو ئاگادارکردنــەوەی لێــی.

وە لەسەرخســتنی ئاینــی خــوا! فێربوونــی کتێبــی خــواو ســونەتی پێغەمبەرەکەیەتــی ﷺ وە هانــدان لەســەریانو فەرمــان کــردن بــە چاکــەو ڕێگــری کــردن لــە خراپــە، پاشــان خــوا ﷻ هانــی بــڕواداران دەدات بــە پەیڕەوکردنــی پێشــینانیان لــە چاکەخــوازان، وەک فەرمویەتــی: ﴿ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ ﴾واتە: خستیە ڕوو بۆیانو ئاگــاداری کردنــەوەو پێــی وتــن: کــێ یارمەتیــدەری منــە، وە لەگەڵمــا هەڵدەســتێ بــۆ سەرخســتنی ئاینــی خــواو شــوێنم دەکــەوێو لەگەڵمــا دەردەچــێ؟

هاوڕێکانــی دەستپێشــخەریان کــردو وتیــان: ﴿ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِۖ ﴾(ئێمــە یارمەتیدەرانــی دینــی خوایــن)، ئنجــا عیســا ﷺ فەرمانــی خــوای جێبەجــێ کــردو ئاینەکەی سەرخســت، خــۆیو ئەوانــەی لەگەڵیــدا بــوون لــە هاوڕێیانــی، ﴿ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴾ (واتــە: ئنجــا دەســتەیەک لــە نەوەکانــی ئیســرائیل بڕوایــان هێنــا) بــە هــۆی بانگــەوازی عیســاو هاوڕێیانــی، ﴿ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞۖ ﴾(دەستەیەکیشــیان بێبــڕوا بــوون) دەستەیەکیشــیان ملکەچــی بانگەوازەکەیــان نەبــوون، ئنجــا بــڕواداران جەنگــی بێبڕوایانیــان کــرد، ﴿ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ ﴾واتــە: بڕواداراتمــان بەهێــز کــردو سەرمانخســتن بەســەر بێبڕوایانــدا ﴿ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ ﴾واتــە: بۆیــە ســەرکەوتنو زاڵ بــوون بەســەریاندا، جــا ئێــوەش ئــەی ئوممەتــی موحەممــەد ﷺ ببنــە پشــتیوانو بانگخــوازی ئاینەکــەی خــوا، خــوا ســەرتان دەخــات وەک چــۆن پێــش ئێــوەی سەرخســت، وە زاڵتــان دەکات بەســەر دوژمنەکانتانــدا.

تەفسیری سوورەتی (الصف) تەواو بوو.


سُورَةُ الجُمُعَةِ
بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡمَلِكِ ٱلۡقُدُّوسِ ٱلۡعَزِيزِ
ٱلۡحَكِيمِ ١ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ
ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ
مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٢ وَءَاخَرِينَ مِنۡهُمۡ لَمَّا يَلۡحَقُواْ بِهِمۡۚ
وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٣ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ
ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ٤ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ ثُمَّ لَمۡ
يَحۡمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢاۚ بِئۡسَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ
ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ
٥ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ إِن زَعَمۡتُمۡ أَنَّكُمۡ أَوۡلِيَآءُ لِلَّهِ مِن
دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٦ وَلَا يَتَمَنَّوۡنَهُۥٓ
أَبَدَۢا بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ٧ قُلۡ
إِنَّ ٱلۡمَوۡتَ ٱلَّذِي تَفِرُّونَ مِنۡهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمۡۖ ثُمَّ تُرَدُّونَ
إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٨

## تەفسیری سوورەتی (الجمعة)

## مەدەنییە (١١) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١): ﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡمَلِكِ ٱلۡقُدُّوسِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ١ ﴾ :

﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡمَلِكِ ﴾ واتە: تەسبیحاتی خوا دەکاتو ملکەچی فەرمانەکانی دەبێو دەیپەرستێ هەموو ئەوانەی لەناو ئاسمانەکانو زەویدان، چونکە تەواوو پاشایە، ئەو زاتەی موڵکی جیهانی سەرەوەو خوارەوە هی ئەوە، هەموویان موڵکی ئەون لەژێر بەڕێوەبردنی ئەودان﴿ ٱلۡقُدُّوسِ ﴾ پاکو بێگەردە لەهەموو بەڵاو نەخۆشیو ناتەواویەک ﴿ ٱلۡعَزِيزِ ﴾ زاڵە بەسەر هەموو شتەکاندا﴿ ٱلۡحَكِيمِ ﴾ لە دروستکردنو فەرمانیدا، جا ئەم وەسفە مەزنانە بانگەشە دەکەن بۆلای بەندایەتی خوای تاکو تەنهای بێ هاوبەش.

(٢-٤): ﴿ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٢ وَءَاخَرِينَ مِنۡهُمۡ لَمَّا يَلۡحَقُواْ بِهِمۡۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٣ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ٤ ﴾ :

﴿ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا ﴾ مەبەست لە نەخوێندەواران: ئەوانەن کە کتێبیان لەلا نیە، وە شوێنەواری پێغەمبەرایەتیش لە عەرەبو غەیری ئەوانیش، لەوانەی کە خاوەن کتێب نەبوون، جا خوا ﷻ منەتێکی مەزنی کرد بەسەریاندا، مەزنتر بوو لە منەتی بەسەر جگە لە ئەوان، چونکە ئەوان زانستو خێریان تێدا نەبوو، وە لە گومڕاییەکی ڕوونو ئاشکرادا بوون، داروو بەردو بتیان دەپەرست، وە خووڕەوشتی دڕندە زیانمەندەکانیان لە خۆ گرتبوو، بەهێزەکانیان لاوازەکانیان دەخوارد، ئەوان لە ئەوپەڕی نەفامیدا بوون بە زانستی پێغەمبەران.

خـوا ﷻ پێغەمبەرێكـی بـۆ نـاردن لـە خۆیـان، ڕەچەڵەكیـان دەناسـی، وە وەسـفە جـوانو ڕاسـتگۆیەتیەكانی، خـوا ﷻ كتێبەكـەی بـۆ دابەزانـد ﴿ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ ﴾ (واتـە: دەخوێنێتەوە بەسـەریاندا نیشـانەكانی خوا) كە یەكلاكەرەوەن پێویسـتكەری ئیمانو دڵنیایین ﴿ وَيُزَكِّيهِمۡ ﴾(پاكیـان دەكاتـەوە) بـەوەی هانیـان دەدات لەسـەر ڕەوشـتە بـەرزەكان، وە دڕێـژەی پێ دەدات بۆیان بە وردو درشـتی، وە قەدەغەیان دەكات لە ڕەوشـتە ناشـرینەكان. ﴿ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ ﴾واتە: (فێریان دەكات) زانسـتی قورئانو زانسـتی سـوننەت، كـە زانسـتی یەكەمیـنو دوایـین لـە خـۆ دەگـرێ، جـا ئـەوان دوای ئـەم فێركـردنو پاككردنەوەیـە بـوون بـە زاناتریـن خەڵـك، بەڵكـو بوون بـە پێشـەوای خاوەن زانسـتو ئاینـەكان، وە تەواترینـی ناو خەڵكی لە ڕووی ڕەوشـتەوەو چاكترینیان لـە ڕووی ڕێنماییو بارودۆخـەوە، خۆیـان بۆ خۆیـان ڕێنماییان وەرگـرت، ڕێنمایی خەڵكیشـیان كـرد تا بوون بـە پێشـەوای ڕێنمایـی كراوانو پێشـەوای لە خواترسـان، خوا بـە ناردنی ئـەو پێغەمبەرە ﷺ فـەزڵو منەتـی هەیە بەسـەریانەوە، بـە تەواوترین نیعمـەتو گەورەتریـن خەڵات.

﴿ وَءَاخَرِينَ مِنۡهُمۡ لَمَّا يَلۡحَقُواْ بِهِمۡ ﴾ واتـە: وە منەتـی كـردوە بەسـەر گەلانـی دیكـەی جگـە لـەوان، واتـە: جگـە لـە نەخوێنـدەوارەكان، لەوانـەی دوای ئـەوان دێنو لـە خاوەن كتێبەكانیـش، كـە هێشـتا پێیـان نەگەیشـتبوون، واتـە: لـە وانـەی ڕاسـتەوخۆ پەیامـی پێغەمبەریـان وەرگرتـووە.

دەگونجـێ ئەوان پێیان نەگەیشـتبن لە ڕووی فـەزڵو چاكە، وە دەگونجێ پێیان نەگەیشـتبن لە سـەردەمدا، بـە هەرحاڵ هەردوو ماناكە ڕاسـتن.

بێگومـان ئەوانـەی كە خـوا پێغەمبەرەكەی بۆ نـاردنو بینیـانو دەمـاو دەم بانگەوازەكەیان لـێ وەرگـرت، تایبەتمەنـدی فەزڵیـان هەیـە، كە هیچ كـەس پێیـان ناگات تیایـدا، ئەمەش لـە عیـزەتو حیكمەتێتـی، چونكـە بەندەكانـی فەرامـۆش نەكـردوە بـە هاوەنتـە، بەڵكـو پێغەمبەرانـی بـۆ نـاردوون، وە فەرمانـی پێكـردوونو قەدەغـەی لێكـردوون، ئەویـش لـە فـەزڵو مەزنـی خوایـە، ئەیـدا بە هـەر كەسـێك لـە بەندەكانی كە خـۆی بیـەوێ، ئەویش چاكتـرە لـەو نیعمەتانـەی پێـی بەخشـیون لـە لـەش سـاغیو فراوانـی ڕزقو ڕۆزیو جگە لەوانیـش لـە نازونیعمەتـە دونیاییەكان. هیچ شـتێك مەزنتر نیـە لە نیعمەتی ئایـن كە تۆوی سـەركەوتنو خۆشـبەختیو بەختەوەریو هەمیشـەییە.

(٥-٨): ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ ثُمَّ لَمۡ يَحۡمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢاۚ

﴿بِئۡسَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ إِن زَعَمۡتُمۡ أَنَّكُمۡ أَوۡلِيَآءُ لِلَّهِ مِن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٦ وَلَا يَتَمَنَّوۡنَهُۥٓ أَبَدَۢا بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ٧ قُلۡ إِنَّ ٱلۡمَوۡتَ ٱلَّذِي تَفِرُّونَ مِنۡهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمۡۖ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٨﴾:

﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ ثُمَّ لَمۡ يَحۡمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢا﴾ کاتێ خوا ﷻ باسی منەتی خۆی کرد لەسەر ئەم ئوممەتەی کە پێغەمبەری نەخوێندەواری بۆ ناردن، وە تایبەتی کردن بە فەزڵو چاکە کە هیچ کەس پێیان ناگات، وە بە هۆیەوە پێش کەوتن بەسەر یەکەمینو دواییندا، تەنانەت ئەو خاوەن کتێبانەی کە پێیان وابوو ئەوان زانای خواناسن، باسی ئەوانەی کردوە کە تەوراتی داوە بەسەریاندا لە جولەکەو گاورەکان، وە فەرمانی پێکردوون فێری ببنو کار بە ناوەڕۆکی بکەن، بەڵام ئەوان هەڵیان نەگرتو هەڵنەستان بەوەی درابوو بەسەر شانیاندا، ئەوانە هیچ چاکەیەکیان نیە، نموونەیان وەک گوێدرێژێک وایە کە بارێ کتێبی هەڵگرتبێ، ئایا ئەو گوێدرێژە سوود لەو کتێبانە وەردەگرێ کە بەسەر پشتیەوەیە؟ ئایا بە هۆی ئەوەوە چاکەو فەزڵێکی بۆ دەبێ؟ یان تەنها بەشی هەڵگرتنێتی؟

ئەمە نموونەی زانایانی جولەکەیە، ئەوانەی کاریان نەکرد بەوەی لە ناو تەوراتدایە، کە لە گەورەترینو مەزنترینیان فەرمان کردن بوو بە شوێنکەوتنی موحەممەدو موژدە دان پێی، وە بڕواهێنان بەوەی هێناویەتی لە قورئانی پیرۆز، ئایە سوودی وەرگرتووە کە سێ ئەمە وەسفی بێ لە تەورات جگە لە ڕیسواییو زەرەرمەندیو پێویستبوونی بەڵگە لەسەریو بیانوو بڕینی؟

ئەم نموونەیە پڕاوپڕە دەربارەی بارودۆخیان، ﴿بِئۡسَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ کە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرەکەمانو ڕاستی ئەو پەیامەی هێناویەتی. ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ واتە: ڕێنماییان ناکات بۆ بەرژەوەندیەکانیان، مادام ستەم کردن وەسفیانەو عینادیو کەللەڕەقی پیشەیانە.

لە ستەمی جولەکەو یاخی بوونو عینادی کردنیان، بێگومان ئەوان چاک دەیانزانی کە لەسەر پووچن، بەڵام وا خۆیان دەردەخست کە ئەوان لەسەر حەقنو دۆستی ڕاستەقینەی خوان بێجگە لە خەڵکی.

لە بەر ئەمەیە خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە پێغەمبەرەکەی کە پێیان بڵێ، ئەگەر ئێوە

ڕاست دەکەن لەوەی کە پێتان وایە ئێوە لەسەر حەقو ڕاستینو دۆستی ڕاستەقینەی خوان، ﴿فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ﴾(واتە: کەوابوو داوای مردن بکەن) ئەمە فەرمانێکی سووکە، بێگومان ئەگەر ئەوان بیان زانیبا لەسەر حەقن هەرگیز نەدەوەستان لە ئاستی ئەم بەربەرەکانێیەدا، کە خوا کردوویەتی بە بەڵگە لەسەر ڕاستیان، ئەگەر ئاواتی مردن بخوازن، وە بە درۆی داناون ئەگەر ئاواتی مردن نەخوازن.

وە کاتێ ئەوە لێیان ڕووی نەدا، لەگەڵ ئاگادار کردنەوەیان بەوە ئەوە زانرا کە بێگومان ئەوان زانان بە پووچیو خراپی ئەو ڕێبازەی لە سەری دەڕۆن، لە بەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُۥٓ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾(واتە: وە ئەوانە هەرگیز داوای مردن ناکەن لەبەر ئەوەی کە بەدەستی خۆیان پێشیان خستووە)، لەو گوناهو سەرپێچیانەی کە بە هۆیانەوە دەترسن لە مردن، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ناگونجێ ستەمی ئەوان لە خوا شاراوە بێ.

ئەمە وە ئەگەرچی ئەوانە هەرگیز داوای مردن ناکەن، لەبەر ئەو گوناهانەی کە بە دەستی خۆیان پێشیان خستووە، وە لێی ڕادەکەن بەوپەڕی ڕاکردن، بێگومان ئەوە ڕزگاریان ناکات، بەڵکو هەر دەبێ ئەو مردنە پێیان بگات کە خوا بە حەتمی لە سەر بەندەکانی نووسیوە، پاشان دوای مردنو تەواوبوونی چارەنووسەکان، هەموو خەڵکی بە گشتی لە ڕۆژی دواییدا دەگەڕێنەوە بۆ لای زانای پەنهانو ئاشکرا، جا هەواڵیان دەداتێ بەوەی کە کردوویانە لە چاکەو خراپەو زۆرو کەم.

(٩-١١): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ
لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ
ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن
كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٩ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ
فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ
وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٠
وَإِذَا رَأَوۡاْ تِجَٰرَةً أَوۡ لَهۡوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيۡهَا وَتَرَكُوكَ
قَآئِمٗاۚ قُلۡ مَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ مِّنَ ٱللَّهۡوِ وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِۚ
وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ١١ ﴾:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ
إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ
٩ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ
مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٠
وَإِذَا رَأَوۡاْ تِجَٰرَةً أَوۡ لَهۡوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيۡهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمٗاۚ قُلۡ مَا عِندَ
ٱللَّهِ خَيۡرٞ مِّنَ ٱللَّهۡوِ وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِۚ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ١١

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ ﴾ خوا ﷻ فەرمـان دەکات بـە بەنـدە بڕوادارەکانـی، بـە ئامـادە بوونیـان بـۆ نوێـژی هەینـی، وە پەلەکـردن تیایـدا لـەو کاتـەی بانـگ دەکـرێ بـۆ نوێـژ، وە کۆششـی بـۆ بکـەن، مەبەسـت لـە کۆشـش کـردن لێـرەدا: پەلەکردنـە بـۆ نوێـژی هەینـیو گرنگـی پێدانێتـی، وە بـە گرنگتریـن شـت لـەو ڕۆژەدا دابنـرێ، نـەک ئـەو نەخۆشـیەی قەدەغـەی لێکـراوە پەلـەی تێـدا بـکات لەکاتـی ڕۆیشـتنی بـۆ نوێـژ.

وە خـوا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَ ﴾ واتـە: واز لـە کڕیـنو فرۆشـتن بێنـن کاتێـک کـە بانگـدرا بـۆ نوێـژ، وە ڕووی تێبکـەن بێگومـان ﴿ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ ﴾ (واتـە: ئـا ئـەوە بـۆ ئێـوە چاکتـرە) لـە سـەرقاڵ بوونتـان بـە کڕیـنو فرۆشـتنو لـە دەسـتدانی نوێـژە فـەرزەکان، کـە بریتیـە لـە گرنگتریـن فـەرزەکان، ﴿ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾ بێگومـان ئـەوەی لـە لای خوایـە چاکتـرەو دەمێنـێ، هـەر کەسـێک بـاوی دونیـا بـدات بەسـەر دواڕۆژدا ئـەوە زەرەری کـردوە بـە زەرەرمەندیەکـی ڕاسـتەقینە، لەو ڕووەی کـە وا گومـان دەبـات ئـەو قازانجـی کـردوە، ئـەم فەرمـان کردنـە بـە وازهێنـان لـە کڕیـنو فرۆشـتن کاتیـە لـە مـاوەی نوێژەکـەدا، ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ بـۆ بەدەسـتهێنانی کارو کەسـابەتو بازرگانیـەکان، کاتێـک کـە سـەرقاڵ

بــوون بــە بازرگانــی، جێگــای گومانــی بێئاگــا بوونــە لــە یــادی خــوا، خــوا ﷻ فەرمانــی کــردوە بــە زۆر یادکردنــەوەی، جــا فەرموویەتــی: ﴿ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾واتە: لــە کاتــی وەســتانتان بــە پێــوەو لــە کاتــی دانشــتنتان، وە لەســەر تەنیشــتان ﴿ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾بــە ڕاســتی زۆر یــاد کردنــی خــوا گەورەتریــن هــۆکاری ســەرکەوتنە.

﴿ وَإِذَا رَأَوْاْ تِجَٰرَةً أَوْ لَهْوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيْهَا ﴾(واتــە: هەرکارێکــی بازرگانــی یــان کارێکــی بــێ هــودە ببینــن) لــە مزگــەوت دەردەچــن، بــە هــۆی ســووربوونیان لەســەر شــتی بــێ هــودەو بازرگانــی، وە وازیــان لــە خێــرو چاکــە هێنــا، ﴿ وَتَرَكُوكَ قَآئِمًا ﴾(واتــە: تــۆ بەجێدەهێڵــن بــە ڕاوەســتاوی) لــە کاتێکــدا وتــار بــۆ خەڵــک دەخوێنــی، ئەویــش لــە ڕۆژی هەینیــدا بــوو، کاتــێ پێغەمبــەر ﷺ وتــاری دەخوێنــد بــۆ خەڵکــی، کاروانیــەک هاتــە شــاری مەدینــە بازرگانــی پــێ بــوو، کاتێــک کــە خەڵکــی نــاو مزگەوتەکــە ئەمەیــان بیســت بڵاوەیــان لێکــردو مزگەوتیــان بەجێهێشــت، وە پێغەمبەریــان بەجێهێشــت لــە کاتــی وتاردانــدا، بــە جــۆرێ پەلەیــان کــرد کــە پێویســتی نەدەکــرد بــەو شــێوەیە پەلــە بکــەن، بــە پێچەوانــەی ئــەدەبو ڕەوشــت بــوو.

﴿ قُلْ مَا عِندَ ٱللَّهِ ﴾(واتــە: ئــەوەی لــە لای خوایــە) لــە ئەجــرو پاداشــت بــۆ کەســێ پەیوەســت بــێ بــە چاکــەو خۆڕاگربــێ لەســەر بەندایەتــی پەروەردگــاری ﴿ خَيْرٌ مِّنَ ٱللَّهْوِ وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِ ﴾ (واتــە: چاکتــرە لــە شــتی بــێ هــودەو بازرگانــی) ئەگەرچــی هەنــدێ ئامانــجو مەبەســتی تێــدا دەســتەبەر بــێ، بێگومــان ئــەوە کــەمو تــەواو بــووە، هیــچ خێرێکــی تێــدا نیــە بــۆ دواڕۆژ. ئارامگرتــن لەســەر گوێڕایەڵــی خــوا نابێتــە هــۆی نەمانــی ڕزقو ڕۆزی، چونکــە بەڕاســتی خــوا باشــترینی ڕۆزیدەرانــە، هــەر کەســێ لــە خــوا بترســێ ڕزقو ڕۆزی دەدات لــە لایەکــەوە بــە خەیاڵیــدا نەهاتــوە.

## لەم ئایەتانەدا سوودو وەدەستهاتوویەکی زۆر بەدی دەکرێ:

یەکەم: بەڕاستی هەینی فەرزە لەسەر سەرجەم بڕواداران، پێویستە لە سەریان پەلەی تێدا بکەنو گرنگی پێ بدەن.
دووەم: بەڕاستی دوو وتار لە ڕۆژی هەینیدا فەرزن، پێویستە ئامادەی هەردووکیان بن، چونکە زیکرو یادی ڕاڤە کردوە بە دوو وتار، جا خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە ڕۆیشتن بۆ ئەو دوو نوێژەو پەلەکردن تیایدا.
سێیەم: ڕێگەپێدانی بانگدان لە ڕۆژی هەینیو فەرمان پێکردنی.
چوارەم: قەدەغەکردنی کڕینو فرۆشتن دوای بانگی هەینی، ئەویش لەبەر ئەوەیە ئەرکێک لە دەست دەچێو لێی بێئاگاو سەرقاڵ دەبێ.
ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەموو فەرمانێک ئەگەرچی ڕێگە پێدراویش بێ لە بنچینەدا، ئەگەر ببێتە مایەی لە دەستدانی پێویستیەک ئەوە لەو حاڵەتەدا دروست نیە.
پێنجەم: فەرمان کردن بە ئامادە بوونی هەردوو وتارەکە لە ڕۆژی هەینیدا، وە سەرزەنشت کردنی ئەو کەسەی ئامادەیان نابێ، وە پێویستە لە هەردوو وتارەکەدا بێدەنگ بێ.
شەشەم: پێویستە لەسەر ئەو بەندەیەی کە ڕووی کردۆتە بەندایەتی خوا، لە کاتی داواکاری نەفسو دەروون بۆ لای شتی بێ هودەو بازرگانیو ئارەزووەکان، ئەوە یادی نەفسو دەروونی بخاتەوە بەوەی لەلای خوایە لە خێرو چاکەکان، وە ئەوەیشی باوی ڕەزامەندی ئەو دەدات بەسەر هەواو ئارەزووەکاندا.

تەفسیری سوورەتی (الجمعة) تەواو بوو.


سورة المنافقون
بسم الله الرحمن الرحيم
إذا جاءك المنافقون قالوا نشهد إنك لرسول الله والله يعلم إنك
لرسوله والله يشهد إن المنافقين لكاذبون ① اتخذوا
أيمانهم جنة فصدوا عن سبيل الله إنهم ساء ما كانوا
يعملون ② ذلك بأنهم آمنوا ثم كفروا فطبع على قلوبهم فهم
لا يفقهون ③ وإذا رأيتهم تعجبك أجسامهم وإن يقولوا
تسمع لقولهم كأنهم خشب مسندة يحسبون كل صيحة
عليهم هم العدو فاحذرهم قاتلهم الله أنى يؤفكون ④

## تەفسیری سوورەتی (المنافقون)

## مەدەنییە (١١) ئایەتە

## بەناوی خوای بەبەزەیی و میهرەبان

(١-٦): ﴿ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشۡهَدُ
إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ
يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ١ ٱتَّخَذُوٓاْ
أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّهُمۡ سَآءَ
مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٢ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ
فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَفۡقَهُونَ ٣ ۞وَإِذَا
رَأَيۡتَهُمۡ تُعۡجِبُكَ أَجۡسَامُهُمۡۖ وَإِن يَقُولُواْ تَسۡمَعۡ
لِقَوۡلِهِمۡۖ كَأَنَّهُمۡ خُشُبٞ مُّسَنَّدَةٞۖ يَحۡسَبُونَ كُلَّ صَيۡحَةٍ
عَلَيۡهِمۡۚ هُمُ ٱلۡعَدُوُّ فَٱحۡذَرۡهُمۡۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ
٤ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ يَسۡتَغۡفِرۡ لَكُمۡ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوۡاْ رُءُوسَهُمۡ وَرَأَيۡتَهُمۡ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسۡتَكۡبِرُونَ
٥ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ أَسۡتَغۡفَرۡتَ لَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ لَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ
ٱلۡفَٰسِقِينَ ٦ ﴾:

کاتێ پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینەو مسوڵمانان زۆر بوون لە ناو مەدینەو دەسەڵاتیان تێیدا پەیدا کرد، خەڵکانێک لەو شارە لە ئەوس و خەزرەج ئیسلامەتیان دەردەخستو بێبڕواییان لە ناخیاندا دەشاردەوە، بۆ ئەوەی ناوبانگیان بمێنێ و خوێنیان پارێزراو بێ و ماڵیان سەلامەت بێت .

ئنجا خوا باسی هەندێ لە وەسفەکانیانی کرد کە بە هۆیەوە دەناسرانەوە، بۆ ئەوەی بەندەکان خۆیان لێیان بپارێزن، وە بۆ ئەوەی بەرچاویان ڕوون بێ، جا فەرمووی: ﴿ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ ﴾ (واتە: کاتێک دووڕووان دێنە لات) بە درۆ کردنەوە (دەڵێن:) ﴿ نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ﴾ ئەم شایەتیە لەلایەن دوو ڕووەکانەوە لەسەر شێوەی درۆو دوو ڕوویی بوو، لەگەڵ ئەوەی ئەو پێویستی بە شایەتی ئەوان نیە لە پشتیوانی پێغەمبەرەکەی، جا بێگومان ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴾ لە قسەو بانگەشەکانیاندا، بێگومان

ئــەوەش حەقیقەتو راسـتیەک نەبوو لە لایــەن ئەوانەوە.
﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ ﴾ (واتــە: ســوێندە درۆكانــی خۆیــان كرد بوو بــە) قەڵغانێــک خۆیانیان پێ دەپاراسـت لــەوەی بە دوو ڕوویــی بناســرێن، ﴿ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ﴾ (واتــە: ڕێگریان كــرد لــە ڕێگــای خــوا) بــە نەفــسو دەروونــی خۆیــان، وە ڕێگــری خەڵكیشــیان دەكــرد لەو كەســانەی ئاگــاداری حاڵیــان نەبــوون ﴿ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ (واتــە: بــە ڕاســتی ئــەوان كارێكــی خراپیــان دەكرد) كاتێ ئیمانیان ئاشـكرا كــردو بێبڕواییان لە ناخی خۆیاندا شـاردەوە، وە سوێندیشــیان لەســەری خوارد ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئەوەی كــە دوو ڕوویی بــۆ ڕازاندنەوە ﴿ بِأَنَّهُمۡ ﴾ بــە هــۆی ئــەوەی ئــەوان جێگیرو چەسـپاو نەبــوون لە ســەر ئیمــان، بەڵكــو ﴿ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ ﴾ (واتــە: بڕوایــان هێنــا پاشــان بێبڕوا بــوون، ئنجا مۆر نــرا بەســەر دڵیاندا) بە شـێوەیەک هەرگیز خێــرو چاكە نەچێتە ناویــەوە، ﴿ فَهُمۡ لَا يَفۡقَهُونَ ﴾ (واتــە: ئیتر ئەوان هیچ تێناگــەن) لەوەی ســوودی هەیە بۆیــان، ئاوڕیان نەدەدایەوە بە لای ئەو شــتەی كــە بەرژەوەندی ئەوانی تێــدا بوو.
﴿ وَإِذَا رَأَيۡتَهُمۡ تُعۡجِبُكَ أَجۡسَامُهُمۡۖ ﴾ (واتــە: هــەر كاتێــک دەیانبینیــت لــەشو قەڵافەیــان سەرســامت دەكات) لــە جوانیو گەشـاوەییان ﴿ وَإِن يَقُولُواْ تَسۡمَعۡ لِقَوۡلِهِمۡۖ ﴾ واتە: (ئەگەر قســە بكــەن گوێ لە قســەیان دەگریــت) لە جوانــی دەربڕینیانو چێــژ وەرگرتن لە گــوێ گرتنیاندا. لــەشو قەڵافەو قســەكانیان جێگــای سەرســوڕمانە، بەڵام لە پشــتی ئەوەوە ڕەوشــتێكی جوانو ڕێنماییەكــی چاک بەدی ناكرێ، ئــا لەبەر ئەمەیە خــوا فەرموویەتی: ﴿ كَأَنَّهُمۡ خُشُبٞ مُّسَنَّدَةٞۖ ﴾ (واتە: دوو ڕووان هەروەک داری هەڵسـپێردراون) هیچ ســوودێكیان نیە، وە هیچیان لێ دەســت ناكــەوێ جگــە لــە زیانــی پەتــی نەبــێ ﴿ يَحۡسَبُونَ كُلَّ صَيۡحَةٍ عَلَيۡهِمۡۚ ﴾ (واتــە: وا گومــان دەبەن هەمــوو هاوارێک بۆ ســەر ئەوانە)، ئەویــش بە هۆی ترســنۆكیو تۆقیــنو لاوازی دڵەكانیانەوە، وە ئــەو گومــانو دوو دڵیــەی لە ناخەكانیاندا هەیە، دەترســن كەسـێک پێی ئاگــادار بێ.
جــا ئەوانــە ﴿ هُمُ ٱلۡعَدُوُّ ﴾ دوژمنــی ڕاسـتەقینەن، چونكــە دوژمنــی دیــارو جیاكراوە ئاســانترە لــەو دوژمنــەی هەسـتی پــێ ناكــرێ، ئــەوە كەسـێكی تەڵەكەبــازو هەڵخەڵەتێنــەرە، وا خــۆی دەردەخات دۆســتو پشـتیوانە، بــەڵام لە ناخــدا دوژمنێكی ئاشـكرایە، ﴿ فَٱحۡذَرۡهُمۡۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴾ واتــە: چــۆن ڕوو وەردەگێــڕن لە ئاینی ئیسـلام دوای ئــەوەی بەڵگەكانیــان بۆ ڕوون بووەتــەوە، ڕوو دەكەنــە بێبڕوایــی كــە هیچ ســوودێكی بۆیــان نیە جگــە لە زیــانو بەدبەختی،


وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ
وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ٥ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ
أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ
إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ٦ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ
لَا تُنفِقُوا۟ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّوا۟ وَلِلَّهِ
خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ
٧ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ
مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ
ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ٨ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُلْهِكُمْ
أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَن يَفْعَلْ
ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ٩ وَأَنفِقُوا۟ مِن مَّا رَزَقْنَٰكُم
مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِىٓ
إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ١٠ وَلَن
يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَا وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ١١

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ﴾ بەو دوو ڕووانە: ﴿ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ ﴾ (واتە: وەرن بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا تـا داوای لێبوردنتـان بـۆ بـکات) لـەوەی دەرچـووە لێتانـەوە بـۆ ئـەوەی بارودۆختـان چـاک بێـتو کردەوەکانتـان وەرگیـراو بـێ، کەچـی زۆر بـە تووندی ڕێگریـان کـرد. ﴿ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ ﴾ (سـەریان بـا دەدەن) وەک ڕێگـری کردنێـک لـە داوا کردنـی پارانـەوە لـە پێغەمبـەر ﷺ ﴿ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ ﴾ (دەیانبینـی ڕوو وەردەگێـڕن) لـە ڕاسـتی چونکـە ڕقیـان لێیەتـی ﴿ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴾ لـە شـوێنکەوتنی بـە هـۆی یاخـی بـوونو عینـادیو کەللەڕەقیانـەوە.

ئەمـە حاڵیانـە کاتـێ بانـگ دەکرێـن بـۆ داواکردنـی پارانـەوە لـە پێغەمبـەر ﷺ ئەمـەش لـە بەزەیـی خـواو ڕێـزی ئـەو زاتەیـە بـۆ پێغەمبەرەکەی، کـە نەهاتـن بـۆ لای داوای لێ خۆشـبوونیان بـۆ بـکات، بێگومـان یەکسـانە بـۆ ئەوانـە داوای لێبوردنیان بـۆ بکەیت، یان داوای لێبوردنیـان بـۆ نەکەیـت، هەرگیـز خـوا لێیان خـۆش نابـێ، چونکە گەلێکـی لە ڕێ لادەرن، لـە فەرمانـی خوا دەرچـوون، بێبڕوایـیـان هەڵبژاردوە بەسـەر بڕوادا، ئـا لەبەر ئەمەیە داوای لێخۆشـبوونی پێغەمبـەر هیـچ سـوودێکی نیـە بۆیـان، ئەگەر داواشـیان بـۆ بکات.

وەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ٨٠ ﴾ التوبة، (واتـە: ئـەی موحەممـەد ﷺ داوای لێبوردنیـان بـۆ بکەیـت یـان داوای لێبوردنیـان بـۆ نەکەیـت یەکسـانە، ئەگـەر داوای لێبوردنیـان بۆ بکەیـت حەفتا جار ئـەوە خـوا هەرگیـز لێیـان نابورێ ئەمـەش بە هۆی ئەوەیـە بێگومان ئـەوان بێبـڕوا بوون بە خـواو پێغەمبەرەکـەی، وە خـوا ڕێنمایـی خەڵکانـی دەرچـوو لـە ئاین نـاکات).

(٧-٨): ﴿ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا۟ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّوا۟ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ

ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَا يَفۡقَهُونَ ﴿٧﴾ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعۡنَآ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ لَيُخۡرِجَنَّ ٱلۡأَعَزُّ مِنۡهَا ٱلۡأَذَلَّۚ وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٨﴾ ﴾.

ئەمە لە توونـدی دژایەتـی کردنیانە بـۆ پێغەمبـەرو مسـوڵمانان، کاتێک کـە کۆبوونەوەو یەکگرتوویـی هاوەڵانیـان بینـی، وە پەلەکردنیـان لـە ڕەزامەنـدی پێغەمبەردا، بـە بۆچوونە فاسـیدەکەی خۆیان وتیـان: ﴿ لَا تُنفِقُواْ عَلَىٰ مَنۡ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّواْ ﴾ (واتە: مـاڵ مەبەخشـن بەوانـەی کـە لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوان تا بـڵاوەی لـێ بکـەن) بێگومان ئـەوان بـە بۆچوونـە خراپەکانیـان پێیـان وابـوو ئەگـەر مـاڵو سـامانو خێرۆخێراتی دوو ڕووەکان نەبـێ بـۆ مسـوڵمانان، ئـەوە یەکگرتـوو نابـن لە سەرخسـتنی ئاینـی خوادا.

ئەمـە لە سەرسـووڕهێنەرترینی سەرسـووڕهێنەرەکانە، ئەو دوو ڕووانە بانگەشـەی ئەوە بکەن کـە خۆیان سـوورترین کەسـن بـۆ زەلیـل کردنـی ئاینـی ئیسـلامو ئازاردانی مسـوڵمانان، وێنـەی ئـەم بانگـەوازەی کە کەسـی پـێ هەڵناخەڵەتێ جگە لەو کەسـانەی کـە ئاگادار نین بە حەقیقەتـی کاروبارەکان.

لەبـەر ئەمەیە خـوا ﷻ وەڵامی قسـەکانیان دەداتـەوەو دەفەرمـوێ: ﴿ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ جـا ڕزقو ڕۆزی دەدات بـە هـەر کەسـێک خـۆی بیـەوێ، وە ڕێگـری لـێ دەکات بـە ویسـتی خـۆی، وە هۆکارەکان ئاسـان دەکات بۆ هەر کەسـێ خـۆی بیەوێ، وە گرانـی دەکات بۆ هەر کەسـێ کە خـۆی بیـەوێ، ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَا يَفۡقَهُونَ ﴾ (بەڵام دوو ڕووەکان نازانـن) لەبـەر ئەوەیـە ئەم قسـەیان کرد کـە ناوەڕۆکەکەی ئـەوە دەگەیەنێ گەنجینەکانـی ڕزقو ڕۆزی لـە دەسـتی ئەواندایـەو بە ویسـتی ئەوانە.

﴿ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعۡنَآ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ لَيُخۡرِجَنَّ ٱلۡأَعَزُّ مِنۡهَا ٱلۡأَذَلَّ ﴾ (واتـە: دوو ڕووەکان دەڵێن: سـوێند بـێ ئەگەر گەڕاینەوە بـۆ مەدینە دەسـەڵاتدارو بەڕێـزەکان لاتو ڕووتەکان لـە مەدینـە دەردەکـەن)، ئەویش لە غەزای مورەیسـیع (المريسـيع)دا بوو، کاتێـک لە نێوان هەنـدێ لـە کۆچکـەرانو دانیشـتوواندا دەمەقاڵێـەک ڕوویـدا، بیرو هۆشـەکان لێـڵ بوون ئـەو کاتـە دوو ڕوویـی دوو ڕووەکان دەرکـەوت، ئـەوەی لـە ناخیانـدا بـوو ئاشـکرایان کـرد، گەورەکەیـان کـە عەبدوڵـڵای کـوڕی ئوبـەی کـوڕی سـەلول بـوو، وتـی: وێنەی ئێمـەو ئەوانـە، مەبەسـتی کۆچکـەران بوو، وەکو قسـەی ئـەو کەسـە وایە کـە وتوویەتی: سـەگەکەت تێر بکەی دەتـخوا.

وە وتـی: ﴿لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ﴾ بـە بۆچوونـی خـۆی کـە خـۆیو بـرا دوو ڕووەکانـی خـاوەن عیـزەتو سـەربەرزین، وە پێغەمبـەری خـواو شـوێنکەوتووانی زەلیلن، بەڵام پێچەوانەی قسـەی ئەو دوو ڕووە تەواوە، لەبەر ئەمەیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾ بە ڕاسـتی تەنها بـڕواداران بەڕێزن، دوو ڕووانو براکانیـان لـە بێبڕوایان زەلیلو سەرشـۆڕن ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (بـەڵام دوو ڕووەکان نازانـن)، ئـا لەبەر ئەوەیـە پێیان وابووە ئـەوان سـەربەرزو بەڕێزن، بە هـۆی یاخـی بوونیانـەوە بەوەی لەسـەری بوون لە پـووچو بەتاڵ.

(٩-١١): ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٩﴾ وَأَنفِقُوا۟ مِن مَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠﴾ وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَا ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١١﴾﴾:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ﴾ خـوا ﷻ فەرمان بـە بەنـدە بڕوادارەکانـی دەکات بە زۆر یاد کردنی، چونکە بە ڕاسـتی لـە زۆر یادکردنەوەی بردنەوەو سـەرکەوتنو خێـرو چاکەیەکی زۆر بـەدی دەکرێ، وە قەدەغـەی لێکردوون کە مـاڵو منداڵەکانیـان سـەرقاڵیان بکـەن لە یـادی ئەو زاتـە، چونکە بە ڕاسـتی خۆشەویسـتی مـاڵو منـداڵ دروسـتکراوە لە زۆرێـک لە نەفـسو دەروونەکاندا، جا پێش خسـتنی بەسـەر خۆشەویسـتی خـوا خەسـارەتو زەرەرمەندیەکـی مەزنـە، لـە بـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ﴾ واتـە: مـاڵو منداڵـی بێئاگـای بـکات لـە یـادی خـوا ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾ (ئـا ئەوانـە خۆیـان خەسـارۆمەندن) بـە خۆشـبەختی هەتـا هەتایـی، وە نازونیعمەتـی بـەردەوام، چونکـە باوی دونیـای براوەیان داوە بەسـەر دوارۆژی هەمیشـەییدا. خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ ۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾﴾التغابن، (واتـە: بێگومـان دارایـیو منداڵتـان هـەر هـۆی تاقیکردنەوەتانـن لـە کاتێکـدا خـوا پاداشـتی زۆر گـەورەی لـە لایـە)، خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿وَأَنفِقُوا۟ مِن مَّا رَزَقْنَٰكُم﴾ (واتـە: ببەخشـن هەندێ لـەو ڕۆزیانەی پێمـان داوون) هەموو نەفەقەو بەخشـشـە پێویسـتەکان دەچنـە نـاو ئەمـەوە، لـە زەکاتو کەفارەتـەکانو بژێـوی ژنـەکانو بەندەو کۆیلـەکانو وێنـەی ئەوانیـش، وە ئـەو نەفەقانـەی کـە پەسـندن، وەک بەخشـینی مـاڵ لە هەمـوو بەرژەوەندیەکانـدا.

وە فەرموویەتی: ﴿مِن مَّا رَزَقۡنَٰكُم﴾ بۆ ئەوەی بیێتە بەڵگە کە خوا تەکلیفی لە بەندەکان نەکردوە لە بەخیشنێ لە تواناییاندا نەبیٚو ئەرکی سەرشانیان قوورس بکات، بەڵکو فەرمانی پێ کردوون بە دەرهێنانی بەشێک لەوەی خوا پێیداون، ئەوەی کە بۆی ئاسان کردوونو هۆکارەکانیشی بۆ ئاسان کردوون، جا با سوپاسگوزاری ئەو زاتە بن کە پێی بەخشیون، بە دەست گیرۆیی کردنی برا هەژارو نەدارەکانیان، وە با بەو بەخشینە دەست پێشخەری مردن بکەن، چونکە ئەگەر مردن هات بەندە ناتوانێ بە قەد گەردیلەیەک خێرو چاکە بکات، لە بەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ﴾(واتە: پێش ئەوەی مردن یەخە بە یەکێکتان بگرێ ئەوسا بڵێ) بە حەسرەتەوە لەوەی لە دەستی داوە لەو کاتانەی کە توانای هەبووە، داوای گەڕانەوە بکات کە بێگومان ئەویش مەحاڵو نەستەمە: ﴿رَبِّ لَوۡلَآ أَخَّرۡتَنِيٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖ﴾ واتە: (خوایە خۆزگە مردنی منت دوا بخستایە بۆ ماوەیەکی نزیک) بۆ ئەوەی ئەو کردەوە چاکانە ئەنجام بدەم کە لە دەستم چوون.

﴿فَأَصَّدَّقَ﴾(ماڵم ببەخشیایە) لەو سامانەی کە هەمە، کە بە هۆیەوە ڕزگارم ببوایە لە سزاو شایستەی پاداشتی بێ پایان ببومایە.

﴿وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ بە جێبەجێ کردنی هەموو فەرمان پێکراوەکان، وە دوور کەوتنەوە لە قەدەغە کراوەکان، وە دەچێتە ناو ئەمەوە حەجو جگە لە ئەویش، ئەم داواکردنو ئاوات خواستنە کاتەکەی کۆتایی پێهاتووە، ناتوانێ بە دەستیان بهێنێتەوە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَا﴾ کە بۆی نووسراوە ﴿وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ لە چاکەو خراپە، جا پاداشتان دەداتەوە لەسەر ئەوەی زانیویەتی پێتان، لە نیەتەکانو کردەوەکان.

تەفسیری سوورەتی (المنافقون) تەواو بوو.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ
وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (١) هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم
مُّؤْمِنٌ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٢) خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ
بِالْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ (٣) يَعْلَمُ
مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ وَاللَّهُ
عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ (٤) أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَبْلُ
فَذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٥) ذَٰلِكَ بِأَنَّهُ كَانَت تَّأْتِيهِمْ
رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالُوا أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا فَكَفَرُوا وَتَوَلَّوا وَّاسْتَغْنَى
اللَّهُ وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ (٦) زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا قُلْ بَلَىٰ
وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ وَذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ (٧)
فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالنُّورِ الَّذِي أَنزَلْنَا وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ
(٨) يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ ذَٰلِكَ يَوْمُ التَّغَابُنِ وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ
وَيَعْمَلْ صَالِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن
تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (٩)

## تەفسیری سوورەتی (التغابن)

## مەککییە (١٨) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی و بەخشندە

(١-٤): ﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (١) هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٢) خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ (٣) يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ (٤) ﴾:

﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (١) هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ﴾ ئەم ئایەتە پیرۆزانە گشتگیرن لەسەر کۆمەڵێکی زۆری فراوان لە سیفەتە مەزنەکانی خوا، جا باسی تەواوی پەرستراوێتی خۆیو فراوانی دەوڵەمەندی خۆی کردوە، وە پێویست بوونی هەموو بەندەکان پێی، وە ستایش کردنی هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدایە بۆ پەروەردگاریان، بێگومان موڵکو دەسەڵات تەنها بۆ ئەو زاتەیە، هیچ بەدیهێنراوێک لە موڵکی ئەو زاتە دەرناچێ.

ستایش هەر هەمووی بۆ خوایە، ستایشێک لەسەر ئەوەی تایبەتە بە خواوە لە سیفەتە تەواوەکانی، ستایشێک لەسەر بەدیهێنانی هەموو شتەکان، ستایشێک لەسەر ئەوەی دایناوە لە حوکمو بڕیارەکان، وە بەخشینی نازو نیعمەتەکان.

دەسەڵاتی خوا گشتگیرە هیچ بوونەوەرێک لێی دەرناچێت، هیچ شتێک دەستەوسانی ناکات کە بیەوێ، وە خوا باسی ئەوەی کردوە کە ئەو زاتەیە بەندەکانی بەدیهێناوە، بڕوادارو بێبڕوای تیایاندا داناوە، جا بڕوابوونیانو بێبڕواییان هەموو بە قەزاو قەدەری خوایە، ئەو زاتە ئەوەی لەوان دەوێ، بەوەی تواناو ئیرادەی پێداون، بە هۆی ئەوانەوە

دەگـەن بـە هەمـوو ئەوانـەی دەیانەوێ لـە فەرمـانو قەدەغەکـراوەکان ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ (واتـە: خـوا بینایـە بە هەر شـتێک کـە ئەنجامـی دەدەن).

کاتێک باسـی دروسـتکردنی ئادەمیـزادی ئەرک پێ سـپێردراوی فەرمان پێکـراوی ڕێگری لێکـراوی کرد، ئنجا باسـی دروسـت کردنـی بەدیهێنراوەکانی دیکەی کرد، جـا فەرمووی: ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ ﴾ واتـە: ئەسـتێرەکانیو هەمـوو ئەوانەی تیایدایـە، بە چاکترین شـێوە دروسـتی کردوون، ﴿ بِٱلۡحَقِّ ﴾ واتە: بە حیکمەتو مەبەسـتو ئامانجێک تەنها خۆی دەزانێـت، ﴿ وَصَوَّرَكُمۡ فَأَحۡسَنَ صُوَرَكُمۡ ﴾ (واتـە: لـە جوانتریـن شێوەشـدا وێنـەی کێشـاون)، وەک فەرموویەتـی: ﴿ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ﴿٤﴾ ﴾ التين، (واتـە: بـە ڕاسـتی ئادەمیزادمـان دروسـت کرد لـە جوانترین شـێوەدا)، ئادەمیـزاد جوانترینـی بەدیهێنراوەکانە، لە ڕووی شـێوەو وێنـەو دیمەنەوە.

﴿ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴾ واتـە: گەڕانـەوە لـە ڕۆژی دواییـدا (هەر بـۆ لای خوایە) جا پاداشـتان دەداتـەوە لە سـەر بڕواهێنـانو بێبڕواییتان، وە پرسـیارتان لێدەکات لـەو نازونیعمەتانەی پێی بەخشـیون، ئایا هەسـتاون بـە سوپاسـگوزاری یان نا؟

پاشـان باسـی گشـتگیری زانسـتی خـۆی کـردوە، فەرموویەتـی: ﴿ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ (واتـە: هەرچـی لـە ئاسـمانەکانو زەویدایـە خـوا دەیزانـێ) لـە نهێنیـەکانو ئاشـکراکانو پەنهـانو شـاراوەکان، ﴿ وَيَعۡلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعۡلِنُونَۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾ واتـە: ئـەوەی تیایدایـە لە نهێنیە جوانـەکانو نهێنیە پیسـەکان، وە نیازە چاکەکانو مەبەسـتە خراپەکان.

جـا ئەگـەر خوا ﷻ زانـا بوو بـەوەی لەناو دڵو دەروونندایە، پێویسـت دەبێ لەسـەر کەسـی عاقڵـی بەرچـاو ڕوون جەخـت بکاتەوەو کۆشـش بکات لە پاراسـتنی ناخی، لە خوڕەوشـتە بەدو پیسـەکانو خۆڕازاندنـەوەی بە ڕەوشـتە جوانەکان.

(٥-٦): ﴿ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَبَؤُاْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبۡلُ فَذَاقُواْ وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُۥ كَانَت تَّأۡتِيهِمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَقَالُوٓاْ أَبَشَرٞ يَهۡدُونَنَا فَكَفَرُواْ وَتَوَلَّواْۚ وَّٱسۡتَغۡنَى ٱللَّهُۚ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٞ ﴿٦﴾ ﴾:

﴿ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَبَؤُاْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبۡلُ فَذَاقُواْ وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ ﴾ کاتـێ خـوا ﷻ باسـی وەسـفە تەواو مەزنەکانـی خـۆی کـرد، کـە بەهۆیانـەوە دەناسـرێو دەپەرسـترێو کۆشـش دەکـرێ بۆ ڕەزامەنـدی ئـەو زاتـە، وە دوور دەکەوێتەوە لـەو کارانەی تـووڕەی دەکات، ئنجـا هەواڵیدا بـەوەی بەسـەر ئۆممەتەکانـی پێشـوودا هێناویەتـی، وە ئـەو سـەدانەی کە ڕابـورد، ئەوانەی

کـە بـەردەوام هەواڵەکانیان لەسـەر زاری خەڵکانـی دوای خۆیانە، وە ڕاسـتگۆیانیش هەواڵی پـێ دەدەن، وە ئـەوان کاتێـک پێغەمبەرانیان بۆ هات بەڕاسـتی بەدرۆیانیـان زانیو عینادیو کەللەڕەقیـان کـرد، خـوا ﷻ پێـی چەشـتن تۆڵـەی کاری خۆیـان لـە دونیـادا، وە تیایـدا سەرشـۆڕو ڕیسـوای کـردن ﴿ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾لـە ژیانـی دواڕۆژدا، لـە بەر ئەمەیە باسـی هـۆکاری ئەم سـزایەی کـردووەو فەرموویەتـی: ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ئەو سـزاو تۆڵەیە کـە حەڵاڵمان کـرد بۆیـان، بە هـۆی ئـەوەوە بـوو کـە بێگومـان ئـەوان ﴿ كَانَت تَّأۡتِيهِمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾ واتـە: (پێغەمبەرانیـان بـۆ هات) بـە بەڵگە ڕوونو ئاشـکراکان، کە بەڵگەن لەسـەر ڕاسـتیو پووچـی، جـا لێی بێـزار بـوونو لـووت بەرزیان نوانـد لـە بەرانبـەر پێغەمبەرانیـان، وتیان: ﴿ أَبَشَرٞ يَهۡدُونَنَا ﴾واتـە: هیـچ چاکەیەکیـان نیـە بەسـەرمانەوە، بـە چ هۆکارێـک خوا ﷻ تایبەتی کردوون بە سـەرمانەوە؟! هـەروەک لە دەقێکی دیکـەدا فەرموویەتی: ﴿ قَالَتۡ لَهُمۡ رُسُلُهُمۡ إِن نَّحۡنُ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ ﴿١١﴾ ﴾إبراهيم، (واتـە: پێغەمبەرەکانیـان پێیـان وتـن: ئێمـە هـەر ئادەمیەکین وەکـو ئێوە، بـەڵام خوا منەت دەنـێ بەسـەر هـەر کام لـە بەندەکانیـدا کـە بیـەوێ)، ئـەوان ڕێگریـان لە فـەزڵو چاکەو منەتـی خـوا کـرد، بـۆ پێغەمبەرانـی کە ببـن بـە پێغەمبەر بـۆ خەڵکـی، وە لـووت بەرزیان نوانـد لـە ملکەچـی کردنیان بۆیـان، بۆیـە تووشـی بەندایەتی کردنـی بـەردو داروو وێنەی ئەوانـە بوونـەوە، ﴿ فَكَفَرُواْ ﴾ئنجـا بێبڕواییـان بـە خوا کـرد ﴿ وَتَوَلَّواْۚ ﴾پشـتیان کرد لە گوێڕایەڵـی خـوا، ﴿ وَّٱسۡتَغۡنَى ٱللَّهُۚ ﴾(واتـە: خـوا بێنیازی نواند لـە باوەڕهێنانی) ئـەوان، بۆیە گوێیـان پـێ نـادات، گومڕایـی ئـەوان بە هیچ جـۆرێ زیان بـە خـوا ناگەیەنێ.

﴿ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٞ ﴾واتـە: ئـەو زاتە دەوڵەمەنـدو بێنیازە، کـە خاوەنی دەوڵەمەنـدی تەواوی ڕەهایـە لە هەمـوو ڕووەکانەوە، ستایشـکراوە لـە گوفتارو کردارو وەسـفەکانیدا.

(٧): ﴿ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿٧﴾ ﴾ خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ ﴾خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی عینـادیو یاخیبوونـی بێبڕوایـان، وە بۆچوونـە پووچەکانیـانو بەدرۆزانینـی ڕۆژی دواییـان، بەبـێ هیـچ زانسـتو ڕێنمایـیو کتێبێکـی ڕێنیشـاندەر. جـا فەرمانـی کـردوە بـە بەڕێزترینـی بەدیهێنراوانـی کە سـوێند بخـوات بە پەروەردگـاری، لە سـەر زینـدوو کردنەوەیانو سـزادانیان لەسـەر کـردەوە پیـسو چەپەڵەکانیـان، وە بە هۆی ئـەوەی حەقیـان بـەدرۆ دادەنـا، ﴿ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴾(واتـە: وە ئەمـە بـۆ خـوا ئاسـانە)

بێگومـان ئەگـەر چـی قـورس‌و گرانـە بـەلای بەدیهێنراوەکانـەوە، ئەگـەر هێـزو توانـای هەموویـان بخەنـە کارو کۆببنـەوە لـە سـەر زیندووکردنەوەی یـەک مردوو، ئـەوە ناتوانن زینـدووی بکەنـەوە، بـەڵام خـوا ئەگەر هـەر کارێکی بـوێ پێی دەڵـێ: ببە، دەسـت بەجێ ئەویـش دەبێ.

خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُم قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾﴾ الزمر، (واتـە: کاتـێ فووکـرا بـە صـوڕدا یەکسـەر هەمـوو ئەوانەی لـە ئاسـمانەکان‌و زەویدان دەمـرن مەگەر کەسـانێ خوا بیـەوێ نەمـرن، پاشـان جارێکـی تـر فـوو دەکـرێ بـە صـوڕدا جـا لە پـڕ هەموو ڕاسـت دەبنـەوە چـاوەڕوان دەکەن).

(٨): ﴿فَـَٔامِنُوا بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلنُّورِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلْنَا ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٨﴾﴾ :

دەفەرمـوێ: ﴿فَـَٔامِنُوا بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلنُّورِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلْنَا﴾، کاتـێ خـوا ﷻ باسـی ئینـکاری‌و نکووڵـی کردنـی ئەوانەی کـرد کە نکووڵـی ڕۆژی دوایی دەکـەن، بێگومان ئـەو ئینکاریە لـە لایـەن ئەوانەوە بێبـڕوا بوونیـان دەگەیەنێ بە خـواو ئایەت‌و نیشـانەکانی، بۆیـە فەرمانی کـردوە بـەوەی دەیپارێـزێ لـە لەناوچـوون‌و بەدبەختـی، ئەویـش بـڕوا هێنانـە بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی‌و کتێبەکەی.

خـوا ﷻ بـە ڕووناکـی نـاوی هێنـاوە، چونکـە ڕووناکـی دژی تاریکیـە، ئەوەشـی لـە ناو قورئاندایـە کـە خـوا دایبەزانـدووە چەندیـن بڕیـارو شـەریعەت‌و هـەواڵ لەخـۆ دەگـرێ، چەندیـن ڕووناکیـە ڕێنماییان پێدەکـرێ لە تاریکایەکانـی نەفامی پەتی، وە ڕێـی پێدەکرێ لـە تاریکـی شـەوە زەنگی زۆر سـەختدا.

جـا جگـە لـە ڕێنمایـی بـە کتێبـی خـوا، ئەوانـە زانسـتێکن زیانەکەیـان زیاتـرە لـە سـوودەکەیان، خراپەیـان زیاترە لـە چاکەیـان، بەڵکو هیچ خێـرو سـوودێکی تێدانیە، جگە لـەوە نەبـێ ڕێک دێتـەوەو دەگونجێ لەگـەڵ ئـەوەی پێغەمبـەران هێناویانـە، وە بڕواهێنان بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی‌و کتێبەکـەی بڕانـەوەی تـەواو دەخـوازێ، وە دڵنیایی ڕاسـتەقینە پێـی، وە کارکـردن بـە ناوەڕۆکـی ئەو بـە ڕاسـتدانانە بـە جێبەجـێ کردنـی فەرمانەکان‌و دوورکەوتنـەوە لـە قەدەغەکـراوەکان، ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ جا پاداشـتان دەداتەوە بە پێـی کردەوەکانتـان، ئـەوەی چاکـەو ئـەوەی خراپە.

(٩-١٠): ﴿يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ ٱلْجَمْعِ ۖ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلتَّغَابُنِ ۗ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ

سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ
٩ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ وَبِئۡسَ
ٱلۡمَصِيرُ ١٠ ﴾

﴿ يَوۡمَ يَجۡمَعُكُمۡ لِيَوۡمِ ٱلۡجَمۡعِۖ ذَٰلِكَ ﴾ واتـە: ئـەو ڕۆژە وەبیـر بێننـەوە کـە خـوا هەمووتـان کۆ دەکاتـەوە، یەکەمیـن‌و دواییـنەکان، وە دەیانوەسـتێنێ لە جێگایەکی ترسـێنەرو سـامناک‌و مـەزن، هەواڵیشـیان پێـدەدات بـەوەی کردوویانـە، ئەوکاتـە جیـاوازی دەردەکەوێـت لـە نـاو بەدیهێنراوەکانـدا، خەڵکانێـک بـەرز دەکرێنـەوە بـۆ بەرزترین پلـەو پایـەکان، نهۆمە بـەرزەکان کـە هەمـوو لـەزەت‌و ئارەزووەکانـی لەخـۆ گرتووە.

خەڵکانێکیـش دادەبەزێنـی بـۆ نزمترین پلەکان‌و خـواری خوارەوە، جێگـای خەم‌و خەفەت‌و بێـزاری‌و سـزای سـەختە، ئەویـش دەرەنجامـی ئەوەیـە کـە پێشـیان خسـتووە بـۆ نەفسـی خۆیـان، لـە ڕۆژگارەکانـی ڕابـردووی ژیانیانـدا ئەنجامیانداوە، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتی: ﴿ يَوۡمُ ٱلتَّغَابُنِۗ ﴾ واتـە: زیانبـاری لـەو ڕۆژەدا دەردەکـەوێ، وە جیـاوازی لـە نێـوان دروسـتکراوەکاندا، بـڕواداران خراپـەکاران لە بیر دەکـەن، تاوانبارانیش بۆیـان دەردەکەوێ لەسـەر هیـچ نینـەو هەر ئـەوان زەرەرمەنـدن، وەک ئەوەی وتراوە: بە چ شـتێ سـەرفرازی‌و بەدبەختـی‌و نازونعمـەت‌و سـزا بە دەسـت هاتوە؟

خـوا باسـی هۆکاری ئەوانـەی کـردوە وەک فەرموویەتـی: ﴿ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ ﴾ واتە: (هەر کەسـێک بڕوابێنـێ بە خـوا) بڕواهێنانێکی تەواوو گشـتگیر بۆ هەموو ئەوانـەی خوا فەرمانی پێکـردوە کـە پێویسـتە بڕوایـان پێبهێنـرێ. ﴿ وَيَعۡمَلۡ صَٰلِحٗا ﴾ (واتـە: کـردەوەی چـاک بـکات) لـە فەرزو سـوننەتەکان، لـە جێبەجـێ کردنی مافەکانـی خواو مافـی بەندەکانی.

﴿ وَيُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾ (واتـە: دەیخاتـە نـاو بەهەشـتانێکەوە کـە جۆگـەی ئـاوی زۆر بـە ژێریانـدا دەڕوات)، تیایاندایـە ئـەوەی نەفـس‌و دەروون ئارەزووی دەکات‌و چـاو لەزەتـی لێوەردەگرێ، وە ڕووحـەکان هەڵیدەبژێرن‌و دڵـەکان بۆ لای دەڕۆن، ئـەوە کۆتایـی هەمـوو خۆشـیەکانە، ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾ (واتە: تێیـدا دەمێننـەوە بـە هەمیشـەیی، ئەوەیە بردنـەوەو سـەرکەوتنی مەزن).


وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ
خَالِدِينَ فِيهَا ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٠﴾ مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ
إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۗ وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ ۚ وَاللَّهُ بِكُلِّ
شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١﴾ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ ۚ فَإِن
تَوَلَّيْتُمْ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴿١٢﴾ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ
إِلَّا هُوَ ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١٣﴾ يَا أَيُّهَا
الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا
لَّكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ ۚ وَإِن تَعْفُوا وَتَصْفَحُوا وَتَغْفِرُوا
فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ
فِتْنَةٌ ۚ وَاللَّهُ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ
وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَأَنفِقُوا خَيْرًا لِّأَنفُسِكُمْ ۗ وَمَن يُوقَ
شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٦﴾ إِن تُقْرِضُوا
اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۚ وَاللَّهُ شَكُورٌ
حَلِيمٌ ﴿١٧﴾ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١٨﴾

﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ﴾ واتە: بێبڕواییان بە ئایەتەکان کرد بێ هیچ بەڵگەیەکی شەرعیو عەقڵی، بەڵکو بەڵگەو ڕوونکراوەکانیان بۆ هات، جا بە درۆیان داناو نکووڵیو عینادییان کرد لە بەڵگە ڕوونەکان. ﴿ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ خَالِدِينَ فِيهَا ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴾ چونکە هەموو ناخۆشیو بەدبەختیو سزایەکی تێدا کۆبووەتەوە.

(١١-١٣): ﴿ مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۗ وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ ۚ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١﴾ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ ۚ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴿١٢﴾ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١٣﴾ ﴾:

خوا دەفەرموێ: ﴿ مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ﴾ ئەمە گشتگیرە بۆ هەموو موسیبەتەکان لە نەفسوماڵو سامانو منداڵو خۆشەویستانو وێنەی ئەوانیش، هەموو ئەوانەی تووشی بەندەکان دەبن بە قەدەری خوایە، زانستی خوا پێشی ئەوانە کەوتووەو قەڵەمی ئەوی بەسەردا هاتووە، وە ویستی تێدا جێبەجێ بووەو حیکمەتی خواستوویەتی، مەبەست ئەوەیە، ئایا بەندە هەڵدەستێ بەو کارەی کە لەسەر شانیەتی لەم شوێنەدا، یان پێی هەڵناسێ؟

جا ئەگەر پێی هەڵسا، ئەوە پاداشتی بێپایانی بۆ دەبێ لە دونیاو دوارۆژدا، ئەگەر بڕوای وابوو ئەوە لەلایەن خواوەیەو پێی ڕازیبوو، وە ملکەچی فەرمانی بوو، خوا هیدایەتی دڵی دەدا، لە کاتی بەڵاو موسیبەتدا بێزار نابێ، وەک چۆن ڕوو دەدات لە کەسێ کە خوا دڵی هیدایەت نەداوە، بەڵکو چەسپاویو جێگیری پێدەبەخشێ لەکاتی ڕوودانی موسیبەتەکاندا، وە بەجێهێنانی پێویستیەکانی ئارامگرتن، جا بەو هۆیەوە پاداشتی بە پەلەی بۆ دروست دەبێ، لەگەڵ ئەوە خوا بۆی

هەڵدەگـرێ بەشـێک لـە پاداشـت لـە ڕۆژی دواییـدا، هـەروەک فەرموویەتـی: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّـٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾﴾الزمر، (واتـە: بـە ڕاسـتی تەنهـا دان بەخۆداگـران بـێ ژمـارە پاداشـتیان دەدرێتـەوە)، وە لەمـەدا زانـراوە ئـەو کەسـەی بـڕوای بـە خـوا نیـە لـە کاتـی هاتنـی قـەزاو قـەدەردا، بـەوەی تێبینـی قـەزاو قـەدەری نەکردبـێ، بەڵکـو تەنهـا لەگـەڵ هۆکارەکانـدا وەسـتابێ، بێگومـان ئـەوە زەلیـلو سەرشـۆڕ دەبێـتو خـوا دەیداتـە دەسـتی نەفـسو دەروونـی خۆیـەوە.

جـا ئەگـەر بەنـدە درایـە دەسـت نەفـسو دەروونـی خۆیـەوە ئـەوە نەفـس هیچـی لـەلا نیـە جگـە لـە شـپرزەیی‌و بـێ ئارامـی، کـە ئـەوە سـزایەکی پێشـخراوە بـۆ بەنـدە پێـش سـزای دوارۆژ، لەسـەر ئـەوەی زێدەڕۆیـی کـردوە لـە ئەرکـی ئارامگرتنـدا، ئەمـەش پەیوەسـتە بـە فەرمـوودەی خـوا ﷻ: ﴿وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ﴾(واتـە: هـەر کەسـێک بڕوابێنـێ بـە خـوا، خـوا ڕێنمایـی دڵـی دەکات) لـە ئاسـتی بـەڵاو موسـیبەتە تایبەتـەکان، بـەڵام ئـەوەی کـە پەیوەسـتە بـە بڕواهێنانـەوە بـە شـێوەیەکی گشـتی، ئـەوە خـوا هەواڵیـداوە کـە هـەر کەسـێک بڕوابهێنـێ، واتـە: بڕواهێنانـی فەرمـان پێکراو لـە بڕوابـوون بـە خـواو فریشـتەکانو کتێبـەکانو پێغەمبـەرانو ڕۆژی دوایـی‌و قـەزاو قـەدەر خێـرو شـەڕی، وە بڕواهێنانەکـەی سـەلماندبێ بـە بەجێهێنانـی ئـەوەی پێویسـتە لـە سـەری، بێگومـان ئـەم هـۆکارەی بەنـدە پێـی هەسـتاوە، گەورەتریـن هـۆکارە بـە هیدایەتدانـی خـوا بـۆی لـە بارودۆخەکانـی‌و قسـەو کردەوەکانیـدا، وە لـە زانسـتو کردەوەیـدا. ئەمـەش چاکتریـن پاداشـتە خـوا بەخشـیبێتی بـە بـڕواداران، وەک چـۆن خـوا ﷻ فەرموویەتـی لـە هەواڵەکانـدا کـە بێگومـان بـڕواداران خـوا چەسـپاویان دەکات لـە ژیانـی دونیـاو دوارۆژدا.

وە بنچینـەی چەسـپاند: چەسـپانی دڵو ئارامگرتنێتـی، وە دڵنیایـی لـە کاتـی ڕوودانـی بـەڵاو نارەحەتیـدا، وەک فەرموویەتـی: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ﴿٢٧﴾﴾إبراهیم، (واتـە: ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە خـوا دامەزراویـان دەکات بـە وتـەی چەسـپاو کـە شـایەتمانە لـە ژیانـی دنیـاو لـە ژیانـی دوارۆژیشـدا).

جـا شـوێنکەوتووانی ئیمـان خـاوەن ڕێنماییتریـن دڵـن، وە خـاوەن چەسـپاوترین دڵـن لەکاتـی شـتە بێزارکەرەکانـدا، ئەویـش بـە هـۆی ئـەو ئیمانـەی هەیانـە، وە خـوا کـە

دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ ﴾ واتـە: لـە جێبەجێكردنـی فەرمانەكانیانـداو دوور كەوتنـەوە لـە قەدەغەكراوەكانیـان، چونكـە بێگومـان گوێڕایەڵـی خـواو گوێڕایەڵی پێغەمبـەر چڵەپۆپـەی بەختـەوەری‌و ناونیشـانی سـەرفرازیە،﴿ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ ﴾ واتـە: لـە گوێڕایەڵـی خـواو گوێڕایەڵـی پێغەمبەرەكـەی﴿ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴾ واتـە: پێتـان ڕادەگەیەنـێ ئـەوەی پێـی نێـردراوە بۆتـان، ڕاگەیاندنێـك ڕوونیدەكاتـەوە بۆتـان‌و ئاشـكرای دەكات، وە دەیـكات بـە بەڵگـەو حوججـە بـە سـەرتانەوە، وە نـە ڕێنمایـی ئێـوە بـە دەسـتی ئـەوە نـە شـتێ لـە لـێ پرسـینەوەتان.

بەڵكـو لێپرسـینەوەتان لـێ دەكات لەسـەر بەجێهێنانـی گوێڕایەڵـی خـواو گوێڕایەڵـی پێغەمبەرەكـەی، یـان نەبوونـی ئەوانـە، زانـای پەنهـان‌و ئاشـكرایە.﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ واتـە: ئـەو تاكـە شایسـتەیە بـە بەندایەتـی كـردن‌و پەرسـتراوێتی، جـا هـەر پەرسـتراوێ جگـە لـە ئـەو پووچـە ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾ واتـە: بـا تەنهـا پشـت بـە خـوا ببەسـتن لـە هـەر كارێ فەرمانـی پێیـان كردبێـت، وە لـەوەی دەیانـەوێ پێـی هەسـتن.

بـە ڕاسـتی هیـچ كارێ لـە كاروبـارەكان ئاسـان نابـێ تەنهـا بـە یارمەتـی خـوا نەبـێ، هیـچ ڕێگایـەك نیـە بـۆ ئـەوە تەنهـا بـە پشـت بەسـتن نەبـێ بـە خـوا، پشـت بەسـتنی تـەواو تەنهـا بـەوە تـەواو دەبـێ بەنـدە گومانـی بـاش بـۆ پەروەردگـاری ببـات، وە متمانـەی پێبـكات بـە بـەس بـوون لـەو كاروبارانـەی كـە تێـدا پشـت بـە پەروەدگـار دەبەسـتێ، وە بـە پێـی بـڕوای بەنـدە پشـت بەسـتن دەبـێ، جـا هەركاتـێ ئیمـان بەهێـز بـوو پشـت بەسـتنیش بەهێـز دەبـێ.

(١٤-١٥): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَٱحْذَرُوهُمْ ۚ وَإِن تَعْفُواْ وَتَصْفَحُواْ وَتَغْفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ ۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ ﴾:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَٱحْذَرُوهُمْ ﴾ ئەمـە ترسـاندن‌و وریـا كردنەوەیـە لـە لایـەن خـواوە بـۆ بـڕواداران، لـە هەڵخەڵەتانیـان بـە ئافرەتـان‌و منـداڵان، بەڕاسـتی هەندێكیـان دوژمنـی ئێـوەن، دوژمنیـش ئەوەیـە خراپـەی تـۆی دەوێ، پیشـەی تـۆ ئەوەیـە خـۆت بپارێـزی لـەو كەسـەی ئەمـە وەسـفێتی، نەفـس‌و دەروونیـش پـەروەردە كـراوە لەسـەر خۆشویسـتنی ژنـان‌و منـداڵان.

خـــوا ئامۆژگـــاری بەندەکانـــی کـــردوە کـــە ئـــەم خۆشەویســـتیە پێویســـت نـــەکات لەسـەریان ملکەچـی داواکاریەکانـی ژنـانو منداڵانیـان کـە مەترسـی شـەرعی تێدایـە، وە هانـی داون لـە جێبەجـێ کردنـی فەرمانەکانـیو پێشخسـتنی ڕەزامەندیەکانـی، بـەوەی لـە لایەتـی لـە پاداشـتی مـەزن کـە داواکاریـە بـەرزەکانو خۆشویسـتراوە گرانبەهاکانی لەخـۆ گرتـووە، وە بـا بـاوی دوارۆژ بـدەن بەسـەر دونیایـی لەناوچـووی نەمـاوە.

وە کاتـێ ڕێگـری کـردن لـە گوێڕایەڵـی کردنـی ژنـانو منـداڵان زیانـی هەیـە بـۆ بەنـدە، وە ترسـاندن لـەو قەدەغەکردنـە هەنـدێ جـار دەبێتـە مایـەی توورەبـوون لێیـانو سـزادانیان، خـوا فەرمانـی کـردوە بـە خۆپاراسـتن لێیـان، وە پۆشـینیانو لێخۆشـبوونیان، چونکـە چەندیـن بەرژەوەنـدی لـەوەدا بـەدی دەکـرێ لـە ژمـاردن نایـەن، جـا فەرموویەتـی: ﴿ وَإِن تَعۡفُواْ وَتَصۡفَحُواْ وَتَغۡفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾ (واتـە: وە ئەگـەر لێیـان ببـورن، وە واز بێنـن لێیـان، وە خـۆش ببـن ئـەوە بێگومـان خـوا لێخـۆش بـووی میهرەبانـە) چونکـە پاداشـت لـە ڕەگـەزی کردەوەیـە. هەرکـەس لـە (خەڵـک) خـۆش ببـێ خـوا لێـی خـۆش دەبـێ، هـەر کەسـێ بپۆشـێ خـوا دەیپۆشـێ، هـەر کەسـێ ببـورێ خـوا لێـی دەبـوورێ، وە هـەر کەسـێ مامەڵـە لەگـەڵ خـوادا بـکات بـەو جـۆرەی خـوا پێـی خۆشـە، وە مامەڵـە لەگـەڵ بەندەکانـی خـوا بـکات، وەکـو ئـەوەی پێیـان خۆشـەو سـوودیان پێدەگەیەنـێ، خۆشویسـتنی خـواو خۆشویسـتنی بەندەکانیشـی بـە دەسـت دێنـێ، کارەکەشـی بـۆ پتـەو دەبێـت.

(١٦-١٨): ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٦ إِن تُقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا يُضَٰعِفۡهُ لَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ١٧ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١٨ ﴾:

﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ ﴾ خـوا ﷻ فەرمـان دەکات بـە خۆپارێـزیو ترسـان لێـی کـە ئەویـش بـە جێبەجـێ کردنـی فەرمانەکانـیو دوورکەوتنـەوە لـە قەدەغەکراوەکانـی، ئەوەشـی بەسـتووەتەوە بـە توانـاو دەسـەڵات.

ئـەم ئایەتـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە هـەر ئەرکێـک (واجـب) بەنـدە دەستاوسـان بـوو لـە ئەنجامدانـی، ئـەوە لەسـەری لادەچێـت، جـا ئەگـەر توانـی هەنـدێ لـە کارەکان جێبەجـێ بـکاتو دەستەوسـان بـوو لـە ئاسـتی هەندێکـی دیکەیـدا، ئـەوە تەنهـا ئـەوە ئەنجـام دەدا کـە توانـای هەیـە بەسـەریدا، ئـەوەی لـە توانایـدا نیـە لەسـەری لادەچێـت،

هــەر وەکــو پێغەمبــەر فەرموویەتــی: (إذا أمرتكـم بأمـر فأتـوا منـه مـا اسـتطعتم) واتــە: ئەگــەر فەرمانــم پێکــردن بــە ئەرکێــک بــە گوێــرەی توانــا جێبەجێــی بکــەن.
دەچێتــە نــاو ئــەم یاســا شــەرعیەوە زۆرێــک لــە لــق‌و پــۆکان کــە لــە ژمــاردن نایــەن، وە فەرمــوودەی خــوا ﷻ ﴿ وَٱسۡمَعُواْ ﴾ واتــە: گوێڕایەڵــی ئــەوە بــن کــە خــوا ئامۆژگاریتــان دەکات، وە ئەوەشــی بــۆی دانــاون لــە بڕیــارەکان، ئــەوە بــاش بزانــن، ملکەچیشــی ببــن ﴿ وَأَطِيعُواْ ﴾ فەرمانبــەرداری خــواو پێغەمبەرەکــەی بــن لــە هەمــوو کاروبارەکانتانــدا.
﴿ وَأَنفِقُواْ ﴾ (مــاڵ ببەخشــن) لــە بەخشــینە پێویســت‌و پەســەندەکان، ئــەو کارە دەبێتــە خێــر بــۆ ئێــوە لــە دونیــاو دواڕۆژدا، چونکــە هەمــوو خێــرەکان لــە جێبەجێکردنــی فەرمانەکانــی خــوا دایــە، وە وەرگرتنــی ئامۆژگاریەکانــی‌و ملکــەچ بوونی شــەریعەتەکەی، شــەڕو خراپــەش بەگشــتی لــە پێچەوانــەی ئەوانەدایــە.
بــەڵام نەخۆشــی‌و بەڵایــەک هەیــە ڕێگــری زۆرێــک لــە خەڵکــی دەکات لــە بەخشــینی ئــەوەی فەرمانیــان پــێ کــراوە، ئەویــش چرووکــی نەفســە کــە زۆرێ لــە خەڵکــی ڕاهاتــوون لەگەڵیــدا، بەڕاســتی نەفــس چرووکــی دەکات لــە ماڵــداو حــەز لــە بوونــی دەکات، حــەز نــاکات لەدەســتی دەربچــێ بــە ئەوپــەڕی حــەز نەکــردن.
جــا هەرکەســێ خــوا پاراســتبێتی لــە چرووکــی ماڵــی بــەوەی نەفســی ڕێگــە بــدات بــە بەخشــینی بەســوود ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾ (واتــە: هــەر ئەوانــەن ســەرکەوتوو ڕزگــار) چونکــە گەیشــتوون بــە داواکــراوو ڕزگاریــان بــووە لــە ترســێنراو، بەڵکــو پێدەچــێ ئــەوە گشــتگیر بێــت لــە هەمــوو ئەوانــەی کــە فەرمــان کــراوە بــە بەنــدە، وە ڕێگــری لێکــراوە.
بێگومــان ئەگــەر نەفســی ڕەزیــل‌و چــرووک بــوو، ملکەچــی ئــەوە نەبــوو کــە فەرمانــی پێکــراوە، نەیبەخشــی لــەوەی وەریگرتــووە، ئــەوە ســەرفراز نیــە، بەڵکــو دنیــاو دواڕۆژی لەدەســت داوە، بــەڵام ئەگــەر نەفســی نەفســێکی بەخشــندەی ئــارام‌و فــراوان بــوو بــۆ شــەرعی خــوا، بــەدوای ڕەزامەنــدی خــوا کەوتبــوو، لــە نێوانــی ئــەو نەفســەو لــە نێوانــی ئــەو ئەرکــەی پێــی ســپێردراوە هیــچ نەبــوو تەنهــا زانســت نەبــێ پێــی، وە زانینــی بەوەی جێگــای ڕەزامەنــدی خوایــە، ئــا بەوشــێوەیە ســەرفرازو ســەرکەوتوو ڕزگــار دەبــێ بــە ئەوپــەڕی ڕزگاربــوون.

پاشـان خـوا هانـی داوە بـۆ بەخشـین، جـا فەرموویەتـی:﴿ إِن تُقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنًا ﴾ (واتـە: ئەگـەر قـەرز بـدەن بـە خـوا بـە قەرزێکـی چـاک) ئەویـش هەمـوو بەخشـینێکە حـەڵاڵ بێـتو بەنـدە مەبەسـتی پێـی ڕەزامەنـدی خـوا بێـت، وە لـە جێگـای خۆیـدا دایبنێـت ﴿ يُضَٰعِفۡهُ لَكُمۡ ﴾ (واتـە: چەنـد بەرانبـەری دەکات بۆتـان)، بەخشـینێک بـە دە بەرانبـەر تـا حـەود سـەد بەرانبـەر تـا چەنـد بەرانبـەر زیاتـر لـەوە.

﴿ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ﴾ واتـە: هەروەهـا لەگـەڵ ئـەو ئەوەنـدە بەرانبـەرەدا (لێتـان خـۆش دەبـێ) بـە هـۆی بەخشـینو خێرکردنـەوە، چونکـە بەڕاسـتی خـوا بـە چاکـەو بەخشـینەکان گوناهـەکان لادەبـات، ﴿ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ١١٤ ﴾هود، (واتـە: بەڕاسـتی چاکـەکان خراپـەکان لادەبـەن)، ﴿ وَٱللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ﴾ لەسـەرخۆیە سـزا پێـش ناخـات بـۆ ئـەو کەسـەی سـەرپێچی دەکات، بەڵکـو مۆڵەتـی دەداتو پشـتگوێی ناخـات.

﴿ وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهۡرِهَا مِن دَآبَّةٖ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۖ ٤٥ ﴾فاطر، (واتـە: وە ئەگـەر خـوا قـار بگـرێ لـە خەڵکـی لـە بـەر ئـەو خراپانـەی کردوویانـە هیـچ گیانداریکـی لەسـەر زەویـدا نەدەهێشـت، بـەڵام مۆڵەتیـان دەدات تـا مـاوەی دیاریکـراو).

﴿ وَٱللَّهُ ﴾ (خـوای) بـەرز ﴿ شَكُورٌ ﴾ کەمتریـن کـردەوە لـە بەندەکانـی وەردەگـرێو زۆرتریـن پاداشـتیان دەداتـەوە، خـوا ﷻ سوپاسـی ئـەو کەسـە دەکات لـە پێناویـدا بەرگـەی نارەحەتیـەکان دەگـرێ، هەرکەسـێ واز لـە شـتێ بهێنـێ لەبـەر خـوا، خـوا بـۆی قەرەبـوو دەکاتـەوە بـە چاکتـر لـەوە. ﴿ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾ واتـە: (زانـای پەنهانـی ئاشـکرایە) ئـەوەی لـە پێـش چـاوی بەنـدەکان وون بـووە لـە سـەربازەکان کـەس نایزانـێ جگـە لـەو زاتـە نەبـێ، وە ئەوەیشـی دەیبینـن لـە بەدیهێنـراوەکان، ﴿ ٱلۡعَزِيزُ ﴾ ئـەو زاتەیـە کـە کـەس زاڵ نابـێ بـە سـەریدا، وە ڕێگـری لێناکـرێ، بـە دەسـەڵاتە بەسـەر هەمـوو شـتەکاندا، ﴿ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ واتـە: کاربەجێیـە لـە دروسـتکراوو فەرمانیـدا، ئـەو زاتـەی شـتەکان لـە جێگـای خۆیانـدا دادەنـێ.

تەفسیری سوورەتی (التغابن) تەواو بوو.


بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ لَا تَدۡرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا ١ فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمۡسِكُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ فَارِقُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖ وَأَشۡهِدُواْ ذَوَيۡ عَدۡلٖ مِّنكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمۡرِهِۦۚ قَدۡ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيۡءٖ قَدۡرٗا ٣ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ٤ ذَٰلِكَ أَمۡرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ إِلَيۡكُمۡۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعۡظِمۡ لَهُۥٓ أَجۡرًا ٥

## تەفسیری سوورەتی (الطلاق)

## مەدەنییە (١٢) ئایەتە

## بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ لَا تَدۡرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا (١) فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمۡسِكُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ فَارِقُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖ وَأَشۡهِدُواْ ذَوَيۡ عَدۡلٖ مِّنكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا (٢) وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمۡرِهِۦۚ قَدۡ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيۡءٖ قَدۡرٗا (٣) ﴾

خوا ﷻ پێغەمبەرەکەی ﷺ و بڕواداران دەدوێنێ، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ ﴾ واتە: (ئەی پێغەمبەر) ئەگەر ویستان ژنەکانتان تەڵاق بدەن، ﴿ فَطَلِّقُوهُنَّ ﴾ بۆ تەڵاق دانیان ڕێگایەکی شەرعی بگرنە بەر، پەلە مەکەن لە تەڵاقداندا کاتێک هۆکارەکانی دەبینن بەبێ لەبەر چاو گرتنی فەرمانی خوا، بەڵکو (تەڵاقیان بدەن) لە کاتی عیدەیاندا، بەوەی مێردەکەی تەڵاقی بدات ئەو ئافرەتە لە پاکیدابێ و لەگەڵیا جووت نەبووبێ، ئا ئەم تەڵاقە عیدە تیایدا ڕوون و ئاشکرایە.

بە پێچەوانەی تەڵاقدانی لە کاتی سووڕی مانگانەدا بێ، ئەو تەڵاقە ناژمێردرێ بەو سوڕی مانگانەیەی کە مێردەکەی تیایدا تەڵاقی داوە، بۆیە عیدەی ئەو ئافرەتە بە هۆی ئەوەوە درێژ دەبێتەوە.

بەهەمـان شـێوە ئەگـەر تەڵاقـی بـدا ژنەکـەی لـە پاکیـدا بـێو چوویێتـە لایو جـووت بوویـێ لەگەڵیـدا، ئـەوە دڵنیایـی نـادرێ لـە سـک پـڕ بوونـی، بۆیـە دەرناکـەوێو ڕوون نابێتـەوە بـە چـی عیدەیـە پشـت ببەسـترێ؟

خـوا ﷻ فەرمانیـداوە بـە ژماردنـی عیـدە، واتـە: ڕێکخسـتنی بـە سـووڕی مانگانـە ئەگـەر سـووڕی مانگانـەی هەبـوو، یـان بـە مانگـەکان ئەگـەر سـووڕی نەبـوو وە لـە دوو گیانیـش نەبـوو.

بێگومـان لـە ژماردنیـدا جێبەجـێ کردنـی مافـی خوایـە، وە مافـی ژنـی تەڵاقـدراوە، وە مافـی ئـەو کەسەیشـیە کـە دوای مێردەکـەی دەیخـوازێ، وە مافـی خۆیشـێتی لـە پێدانـی خەرجـیو وێنـەی ئەوانـە.

جـا ئەگـەر عیدەکـەی ڕێکخـرا ئـەوە بـە بەرچـاو ڕوونـی بارودۆخـی خـۆی دەزانـێ، وە دەزانـێ چـی لەسـەریەتی لـە حـەقو مافـەکان، وە چـی بـۆ ئـەوە. ئەمـە فەرمـان کردنـە بـە ژماردنـی عیـدە ئاراسـتەی پیـاو دەکـرێ، وە بـۆ ئافرەتیـش ئەگـەر ئـەرک پێسـپێردراو بـوو، وە ئەگەرنـا بـۆ خاوەنەکـەی. ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡ ﴾ واتـە: لـە هەمـوو کاروبارەکانتانـدا، وە لێـی بترسـن لـە مافـی خێزانـە تەڵاقدراوەکانتانـدا.

﴿ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ ﴾ (واتـە: ئـەو ژنانـە دەرمەکـەن لـە ماڵەکانـی خۆیـان) مـاوەی عیدەیـان، بەڵکـو پێویسـتە لـە ماڵەکانیانـدا بمێننـەوە، ئـەو ماڵـەی کـە مێردەکەی تەلاقـی داوە تیایـدا. ﴿ وَلَا يَخۡرُجۡنَ ﴾ واتـە: دروسـت نیـە ئافرەتانیـش لـە ماڵەکانیـان دەربچن.

بـەڵام قەدەغـە کـردن لـە دەرکردنیـان، لەبـەر ئـەوە پێویسـتە لەسـەر مێردەکـە لەهەمـان شـوێنی نیشـتەجێ بوونـدا خێزانەکـەی دابنـێ بـۆ ئـەوەی عیدەکـەی تیایدا تـەواو بکات، کـە ئـەوە مافێکـی سروشـتی خۆیەتـی. بـەڵام قەدەغـە کـردن لـە دەرچوونـی ئافرەتەکە، چونکـە دەرچوونـی پێشـێل کردنـی مافـی مێردەکەیەتـی، وە پارێزگـاری لێنەکردنێتـی، ئـەم قەدەغـە کردنـە لـە دەرچـوون لـە مـاڵ بـەردەوام دەبێـت، وە دەرکردنیـش تـا عیدەکـەی تـەواو دەبێـت، ﴿ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ ﴾ واتـە: مەگـەر کارێکـی ناشـرینی قیزەونـی ڕوونـی کـرد، پێویسـت بـوو دەربکـرێ، بـە جـۆرێ دەرنەکردنـی ببێتـە مایـەی زەرەر بـۆ ماڵەکـە، وەک ئـازاردان بـە قسـەی ناشـرینو ڕەفتـاری قیـزەون، ئـا لـەم حاڵەتـەدا دروسـتە بۆیـان ژنەکانیـان دەربکـەن، چونکـە ئـەو خـۆی بووەتـە

هــۆکاری دەرکردنــی خــۆی، دیــارە مانــەوەی لەماڵــی مێردەکەیــدا بــۆ جێگیــر کردنــی دڵــیو نــەرمو نیانیــە لەگەڵیــدا، ئەمــەش دەربــارەی ئافرەتــی خــاوەن عیــدەی گــەڕاوە (المعتــدة الرجعیــة).

بــەڵام ئافرەتــی تەڵاقــدراو بــۆ یەکجــاری شــوێنی نیشــتەجێبوونی بــۆ نیــە، چونکــە نیشــتەجێ بــوون شــوێنی نەفەقــە دەکــەوێ، نەفەقــەش پێویســتە لەســەر ئــەو ئافرەتــەی کــە دەگەڕێنرێتــەوە (الرجعیــة) جگــە لــە تەڵاقــدراوی هەمیشــەیی ﴿ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ ﴾ (واتــە: وە ئەوانــە ســنوورانێکی خواییــن) کــە خــوا دایناــوە بــۆ بەندەکانــی و کردوویەتی بــە شــەریعەت بۆیــان، وە فەرمانــی کــردوە بــە پابەنــد بوونیــانو وەســتان لەســەریان ﴿ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ ﴾ (واتــە: هــەر کەســێک لــە ســنوورانی خــوا دەربچێــت) بــەوەی لەگەڵیــدا نەوەســتێ، بەڵکــو زێدەڕۆیــی بــکات، یــان کەمتەرخەمــی تێــدا بــکات، ﴿ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ ﴾ (واتــە: بێگومــان ئــەوە ستەمی لــە خــۆی کــردوە) واتــە: بەشــی خــۆی بــە کــەم زانیــوەو لــە دەســتی داوە لــە شــوێنکەوتنی ســنورەکانی خــوا، کــە ئەویــش خۆشــبەختیە لــە دونیــاو دواڕۆژدا.

﴿ لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ﴾ واتــە: خــوا ﷻ عیــدەی دانــاوەو تەڵاقــی ڕێکخســتوەو دیــاری کــردوە لەبــەر چەنــد حیکمەتێکــی مــەزن.

لەوانــە: لەوانەیــە خــوا بەزەیــیو خۆشەویســتی پێــش بێنــێ لــە دڵــی مێردەکەیــدا، خێزانەکــەی بگەڕێنێتــەوەو پەیوەنــدی لەگەڵــدا ببەســتێ، بــۆ ئــەوەی ئــەو خۆشەویســتیە لــەو مــاوەی عیــدەدا دروســت ببێتــەوە، یــان لەوانەیــە تەڵاقــی دابێــت بــە هۆکارێکــەوە لــەو مــاوەی عیدەیــەدا هۆکارەکــە کۆتایــی پــێ هاتبــێ، ئنجــا بیگەڕێنێتــەوە بــە هــۆی نەمانــی هــۆکاری تەڵاقدانەکــە.

وە لــەو حیکمەتانــە: مــاوەی مانەوەیــە ژنەکەیــە، لــەو ماوەیــەدا پاکــی منداڵدانــی ئافرەتــە لــە پیاوەکــە دەردەکــەوێ. وتــەی خــوا ﷻ: ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ ﴾ واتــە: ئەگــەر مــاوەی تــەواو بوونــی عیــدە نزیــک بوویــەوە، چونکــە ئــەو ئافرەتانــە ئەگــەر عیدەیــان کۆتایــی پێهــات، ئــەوە مێردەکــەی سەرپشــک نیــە لــە نێــوان هێشــتنەوەو جیابوونەوەیــدا.

﴿ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ ﴾ (واتــە: ئەوســا بیانهێڵنــەوە بــە شــێوەیەکی چــاکو پــڕ لــە خۆشەویســتی) نــەک بــە شــێوەی زیــانو ویســتی شــەڕو خراپــەو بەنــد کــردن، چونکــە هێشــتەنەوەیان بــەم جــۆرە دروســت نیــە.

﴿ أَوْفَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ ﴾ واتــە: (لێــان جیابنــەوە) بــە جیابونەوەیەک هیچ مەترسـیەکی تێـدا نەبێـت، بەبـێ نـاوو ناتـۆرەو شـەڕو دژایەتـی، وە نـە بـە هـۆی زاڵبوونەوە بەشـێک لـە ماڵـی خێزانەکـەی ببـات، ﴿ وَأَشْهِدُواْ ﴾ بـە شـایەت بگـرن لەسـەر تەلاقـی ژنەکەو گەڕانـەوەی ﴿ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ ﴾ واتـە: دوو پیـاوی مسـوڵمانی دادپـەروەر، چونکـە لـە شـایەتی باسـکراودا ڕێگرتنـە بـۆ کردنـەوەی دەرگـای دژایەتـی کـردن، وە شـاردنەوەی هـەر یـەک لـەو دووانـە پێویسـتە ئاشـکرا بکرێـت، ﴿ وَأَقِيمُواْ ﴾ ئـەی شـایەتەکان ﴿ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِ ﴾ شـایەتی بـدەن بـە شـێوەی ڕاسـتەقینەی خـۆی، بەبـێ زیـادەو کـەمو کـوڕی، وە لـەو شـایەتیدانەدا بـا مەبەسـتتان تەنهـا خـوا بێـت، نـە خزمایەتـی لـە بەرچاو بگـرن، نـە هاوڕێیەتـیو دۆسـتایەتیو خۆشەویسـتی ﴿ ذَٰلِكُمْ ﴾ ئەوانـەی باسـمان کـرد بۆتـان لـە بڕیـارو سـنوورەکان ﴿ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ ﴾ (واتـە: ئامۆژگـاری ئەوانـەی پێدەکرێـت کـە بڕوایـان هەبێـت بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی) بێگومـان هـەر کەسـێ بـڕوای بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی هەبـێ پێویسـتە لەسـەری پەنـد وەربگـرێ بـە ئامۆژگاریەکانـی خـوا، وە پێشـی بخـات بـۆ دواڕۆژی لـە کـردەوە چاکـەکان ئـەوەی لـە توانایدایـە.

بـە پێچەوانـەی ئـەو کەسـەی ئیمـان لـە دڵیـدا نەمـاوە، چونکـە ئـەو کەسـە بـە خەیاڵیـدا نایـە چـی پێشخسـتووە بـۆ خـۆی لـە شـەڕو خراپـە، ئامۆژگـاری خـوا بـە مـەزن دانانێـت، چونکـە بـە پێویسـتی نازانێـت، کاتێـک کـە تـەلاق هەنـدێ جـار مـرۆڤ تووشـی تەنگـیو بێـزاریو خـەمو پـەژارە دەکات، خـوا ﷻ فەرمانیکـردوە بـە ترسـان لێـی، وە بەڵێنیـداوە هـەر کەسـێ خۆپارێـز بـێو لێـی بترسـێ، لـە تـەلاقو جگـە لەویـش، ئـەوە بێگومـان خـوا دەرووی لێدەکاتـەوە.

جـا ئەگـەر بەنـدە مەبەسـتی تـەلاق بـوو، تەلاقیـدا بـە شـێوەیەکی شـەرعی، بـەوەی یـەک تەلاقیـدا بەبـێ ئـەوەی لـە سـووڕی مانگانـەدا بـێ، وە بەبـێ ئـەوەی لـە پاکیـەک دابووبـێ چووبێتـە لای، ئـەوە بـە ڕاسـتی کاری لەسـەر توونـد ناکرێـت، بەڵکـو خـوا دەروی لێدەکاتـەوە دەتوانـێ جارێکـی تـر بگەڕێتـەوە بـۆ هاوسـەرگیری، ئەگـەر پەشـیمان بـوو لـە تەلاقـدان.

دەقەکـە ئەگەرچـی لـە میانـەی تـەلاقو گەڕانەوەدایـە، بـەلام پەنـد بـە کـۆی قسـەکانە، جـا هـەر کەسـێ لـە خـوا بترسـێو پەیوەسـت بـێ بـە ڕەزامەنـدی خـوا

لەهەمـــوو باروودۆخەکانیـــدا، ئـــەوە بێگومـــان خـــوا پاداشـــتی دەداتـــەوە لـــە دونیـــاو دوارِۆژدا، وە لــە كــۆی پاداشــتەكانی دەرگــای خێــری لێدەكاتــەوە لــە كاتــی هەمــوو ســەختیو ناخۆشــیەكدا، هــەروەك چــۆن كەســێک لــە خــوا بترســێ خــوا دەرووی خێــری لێدەكاتــەوە، وە هــەر كەســێک لــە خــوا نەترســێ دەكەوێتــە نێــو ســەختیەكانو تــاوانو كــۆتو بەنــدەكان، كــە توانــای نیــە خــۆی لــێ رِزگــار بــكاتو دەربچــێ لــە پێشــهاتەكانی.

بێگومـــان بەنـــدە ئەگـــەر لـــە خـــوا نەترســـێ لـــە تەلاقدانـــا، بەڵكـــو بـــە شـــێوەیەكی قەدەغەكــراو خێزانەكــەی تــەلاق بــدا، وەك تەلاقــی ســێ بەســێو وێنــەی ئەوانــە، ئــەوە بێگومــان هــەر دەبــێ بەجــۆرێ پەشــیمان ببێتــەوە كــە نەتوانــێ بیگێرِێتــەوەو لێــی دەربچــێ. كــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ﴾ واتــە: خــوا ﷻ رِزقو رِۆزی كەســی پارێــزكار دەدات لــە لایەكــەوە نــە بەخەیاڵیــدا دێو نــە هەســتی پێــدەكات.

﴿ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ﴾ واتــە: (وە هــەر كــەس پشــت بــە خــوا ببەســتێ) لــە كاروبــاری دیــنو دونیاییــدا، بــەوەی پشــت بــە خــوا ببەســتێ لــە بەدەســتهێنانی ئــەوەی ســوودی هەیــە بــۆیو رەتكردنــەوەی ئــەوەی زیانــی هەیــە بــۆی، وە متمانــەی پێــی هەبــێ لــە ئاســان كردنــی ئەوانــەدا ﴿ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ﴾ واتــە: ئــەو كارەی بەســە كــە پشــتی بــە خــوا بەســتووە پێــی، جــا ئەگــەر كارەكــە لــە كەفالەتــی دەوڵەمەنــدی بەهێــزی بــە دەســەڵاتی بــە بەزەییــدا بــوو، ئــەوە بێگومــان نزیكتــرە لــە بەنــدەوە لــە هەمــوو شــتێ.

بــەڵام هەنــدێ جــار حیكمەتــی خــوا وادەخــوازێ دوا بكــەوێ بــۆ كاتێكــی گونجــاو، بۆیــە فەرموویەتــی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ ﴾ واتــە: هــەر دەبــێ قــەدەری خــۆی بــە ئەنجــام بگەیەنــێ، بــەڵام ﴿ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا ﴾ واتــە: (بێگومــان خــوا بــۆ هەمــوو شــتێک) كاتو ئەندازەیەكــی دیاریكــراوی دانــاوە نــە تێدەپەرِێنــێو نە كەمــی دەكاتەوە.

(٤-٥): ﴿ وَٱلَّٰٓـِٔى يَئِسْنَ مِنَ ٱلْمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمْ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشْهُرٍ وَٱلَّٰٓـِٔى لَمْ يَحِضْنَ وَأُو۟لَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مِنْ أَمْرِهِۦ يُسْرًا ﴿٤﴾ ذَٰلِكَ أَمْرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ إِلَيْكُمْ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعْظِمْ لَهُۥٓ أَجْرًا ﴿٥﴾ ﴾

كاتــێ باســی تەلاقــی فەرمــان پێكــراوی كــرد، كــە دەبــێ لــە كاتــی عیــدەی ئافرەتانــدا بێــت، ئنجــا باســی عیــدەی كــرد، فەرمــووی: ﴿ وَٱلَّٰٓـِٔى يَئِسْنَ مِنَ ٱلْمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمْ ﴾ (واتــە: ئەوانــەی كــە بــێ هیــوا دەبــن لــە كەوتنــە حەیــزەوە لــە ژنانتــان) بــەوەی كــە

دەکەوتنــە ســـووڕەوە، دوای ئــەوەی ســـووڕەکەیان لەســـەر نەمــا، ئەمیــش بــە هــۆی گەورەیــی تەمەنیــان یــان جگــە لــەوە، وە ئومێــدی گەڕانــەوەی ســووڕی لێنەکــرا، ئــەوە بێگومــان عیدەکــەی ﴿ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ﴾ (ســێ مانگــە) بــۆ هەمــوو مانگــێ لــە بەرانبــەر یــەک ســـووڕدایە.

﴿وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ﴾ واتــە: ئــەو ئافرەتــە منداڵانــەی کــە بــە هــۆی منداڵیانــەوە هێشــتا نەکەوتوونەتــە ســـووڕی مانگانــە، یــان ئــەو ئافرەتانــەی کــە باڵــغ بــوون هێشــتا بــە تەواوەتــی نەکەوتوونەتــە ســووڕەوە، ئــەوە بێگومــان ئەوانیــش هەروەکــو ئــەو ئافرەتانــەن کــە بێئومێــد بــوون، عیدەیــان ســێ مانگــە، بــەڵام ئــەو ئافرەتانــەی کــە دەکەونــە ســـووڕی مانگانــەوە خــوا باســی عیدەکەیانــی کــردوەو فەرموویەتــی: ﴿وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖۚ ٢٢٨﴾ البقــرة، (واتـــە: وە ژنـــە تەڵاقـــدراوەکان دان بـــە خۆیانــدا دەگــرن تــا مــاوەی ســێ حەیــز).

کــە دەفەرمــوێ: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ﴾ (واتــە: ژنانــی دوو گیــان) عیدەیــان ﴿أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ﴾ واتــە: کــە ســکەکەیان بــە تــەواوی دابنێــن، لــە یــەک منــداڵ یــان زیاتــر، لــەو کاتــەدا نــە بــە مانــگ کار دەکرێــت نــە بــە جگــە لــە مانــگ، ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا﴾ واتــە: جــا هــەر کەســێ پارێــزکار بێــت خــوا کاری بــۆ ئاســان دەکاتو هەمــوو گرانیەکــی لەســەر ســووک دەکات.

﴿ذَٰلِكَ﴾ ئــەوە بڕیــاری خوایــە ڕوونــی کردۆتــەوە بۆتــان ﴿أَمۡرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ إِلَيۡكُمۡۚ﴾ بــۆ ئــەوەی لــە ســەری بــڕۆنو کاری پــێ بکــەنو بــە مەزنــی دابنێــن، ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعۡظِمۡ لَهُۥٓ أَجۡرًا﴾ مەترســی لەســـەر لادەبــات، ئــەوەی داواشــی دەکات بــۆی دەســـتەبەر دەکات.

أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا
عَلَيْهِنَّ وَإِن كُنَّ أُولَٰتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ فَإِنْ
أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ وَإِن
تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ (٦) لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ وَمَن
قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا
مَآ ءَاتَىٰهَا سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا (٧) وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ
عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا عَذَابًا
نُّكْرًا (٨) فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا (٩) أَعَدَّ ٱللَّهُ
لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فَٱتَّقُوا ٱللَّهَ يَٰٓأُولِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا قَدْ أَنزَلَ
ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا (١٠) رَّسُولًا يَتْلُوا عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٍ لِّيُخْرِجَ
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَمَن يُؤْمِنۢ
بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ
فِيهَآ أَبَدًا قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا (١١) ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ
وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓا أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ
كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا (١٢)

(٦-٧): ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ وَإِن كُنَّ أُولَٰتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ ﴿٦﴾ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ﴿٧﴾﴾:

﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ﴾ لـە پێشـەوە خـوا ﷻ باسـی قەدەغە کردنـی دەرکردنـی ئافرەتانـی تەڵاقـدراوی کـرد لـە ماڵـەکان، وە لێـرەدا فەرمانـی کرد بـە جێگیر کردنیـان، وە ئەنـدازەی دانانیـان بـە چاکـە، ئەویـش ئـەو ماڵەیـە وێنەی ئـەو ئافرەتەو ئەو پیـاوە تیایدا دەژیـن بە پێی توانـای مێردەکە، ﴿وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ﴾ واتـە: زیانیان پێ مەگەیەنـن لـەو کاتـەی لە ماڵەکانـدان، بە گوفتـار یان بـە ڕەفتار تـا تەنگیان پـێ هەڵبچنو لە ماڵـەکان دەربچـن، پێـش تـەواو بوونـی عیدەیـان، ئەو کاتـە ئێـوە ئەوانتـان دەرکردوە.

پوختەی ئەم باسـە خـوا ﷻ قەدەغەی کردوە لـە دەرکردنیان، وە ڕێگری کـردووە لە ئافرەتانیش لـە دەرچوونیـان، فەرمانـی کردوە بە نیشـتەجێ بوونیان، بە جـۆرێ زیانو نارەحەتیـان پێنەگات، ئەویش دەگەڕێتەوە بـۆ دابو نەریت.

﴿وَإِن كُنَّ﴾ واتە: تەڵاقـدراوەکان ﴿أُولَٰتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ (واتە: دوو گیـان بـوون ئـەوە خەرجیان بکێشـن تـا سـکەکانیان دادەنێـن) ئەویش بە هـۆی ئـەو منداڵەی کـە لـە سـکیدایە، ئەگـەر تەڵاقـی یەکجارەکـی بوو، بـۆ ئافرەتەکـە هەیەو بـۆ ئـەو منداڵەیش لـە سـکیدایە مێردەکـەی خەرجیان بکێشـێ، ئەگـەر تەڵاقەکـە تەڵاقـی گەڕانەوە بـوو، وە ئەو پـەڕی خەرجـی تـا سـکەکانیان دادەنێـن، ئەگەر سـکەکانیان دانـا، یـان ئەوەیە شـیر دەدەن بە منداڵەکانیـان یـان نا.

﴿فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ (واتـە: ئەوسـا ئەگـەر شـیریان دا بـە منداڵەکەتـان ئـەوە

ئێــوەش کرێــان بدەنــێ) ئەو ئەندازەی کــە بۆیان دیاریکــراوە، ئەگەر دیاریکراو بــوو، وە ئەگەر نــا ئــەوە وەکــو خەڵکیو بەپێــی نەریــت ﴿ وَأْتَمِرُواْ بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ ﴾واتــە: با هەریــەک لە ژنو مێردەکــەو جگــە لەوانیــش ڕاوێژ لە نێــوان یەکتردا بکەن بــە چاکە، ئەویش هەموو ئەو شــتانەیە کــە ســوودو بەرژەوەنــدی دونیــاو دوارۆژی تێدایــە، چونکــە بێئاگــا بوون لــە ڕاوێژ کــردن بە چاکــە شــەڕو زیانێکــی لــێ دەســتەبەر دەبێ کــەس نایزانێ جگە لــە خــوا، وە لە ڕاوێــژ کردندا یارمەتیدانــی یەکتر هەیە لەســەر چاکەکاریی‌و خواناســی.

وە ئــەوەی گونجــاوە لــەم جێگەیەدا کــە بەڕاســتی ژنو مێرد لە کاتــی جیابوونــەوەداو لە ماوەی عیــددەدا، بــە تایبەت ئەگــەر منداڵێکیان لــەو کاتەدا لە دایک بــوو، ئەمە بــە زۆری دووبەرەکی‌و ئــاژاوە دروســت دەبێت، بە هــۆی خەرجی ئافرەتەکــەو منداڵەکە لەگــەڵ جیابوونــەوەدا، ئەمەش بــە زۆری ڕوونــادات مەگــەر بە هۆی ڕقو کینــە، وە لە ڕقو کینەشــدا کاریگەریەکی زۆر بەجێ دەمێنێ.

هەریــەک لەوانــە فەرمانــی پێدەکرێ بــە چاکەو مامەڵــەی جوان، بەبــێ دژایەتــی‌و ناکۆکی، وە ئامۆژگــاری دەکــرێ لەســەر ئــەوە، ﴿ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ ﴾ئەگەر پێکەوە نەســازان لەســەر شــیردانی منداڵەکــە، (ئــەوە بــا شــیری پــێ بــدات)، ﴿ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ ﴾ئافرەتێکــی دیکــە جگە لــە ژنەکەی ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ ءَاتَيْتُم بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ٢٣٣ ﴾البقرة (واتــە: ئــەوە گوناهتــان ناگات ئەگــەر بیاندەنێ ئــەوەی بۆتان داناون بە خۆشــی، وە لــە خــوا بترســن‌و بزانــن بە ڕاســتی خــوا بینایە بــەوەی کــە دەیکەن).

ئەمــەش لــە کاتێکدایــە کــە منداڵەکــە ســنگی دایکی بگــرێ، ئەگــەر ســنگی هیــچ ئافرەتێکی نەگــرت جگــە لەدایکــی، ئەوە پێویســت دەبێ لە ســەری شــیری پێ بــدات، وە ئەگــەر ڕێگری کــرد، زۆری لــێ دەکرێ، کرێی ئافرەتی هاوشــێوەی خۆی پــێ دەدرێ، ئەگــەر ڕێک نەکەوتن لەســەر کرێکەی.

ئەمــە لــە دەقەکــەوە وەرگیــراوە لــە ڕووی مانــاوە، بێگومــان منــداڵ کاتێ لــە سکی دایکیدایە لەمــاوەی هەڵگرتنــدا دەرچوونــی بــۆ نیــە لێی، ئــەوە خوا پێویســتی کــردوە لەســەر خاوەنەکەی خەرجــی بکێشــێ، کاتێــک کە لــە دایک دەبــێ دەکــرێ لەلایەن دایکیەوە شــیری پــێ بدرێت، وە جگــە لە دایکیشــی، خــوا ﷻ ڕێگــەی بەهــەردوو کارەکە داوە، جــا ئەگەر لــە حاڵەتێکدا بوو منداڵەکــە شــیری نەدەخــوارد تەنها لە دایکی نەبــێ، ئەوە وەکو ئەوە وایە ســک پڕ بێ، پێویســت دەکــرێ لەســەر دایکەکەی شــیری پێ بدات، پاشــان خــوا خەرجی ئەنــدازە کردوە بــە گوێرەی

حاڵی مێردەکە، جا فەرموویەتی: ﴿ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ ﴾ واتە: با دەوڵەمەند بە پێی دەوڵەمەندی خۆی خەرجی بدات، با وەک هەژارەکان خەرجی نەدات.
﴿ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ ﴾ واتە: هەر کەسێک کەمدەستو بێ توانا بوو ﴿ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ﴾ (واتە: با بەپێی ئەوەی خوا پێیداوە) لە رزقو رۆزی خەرجی بدات، ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ﴾ (واتە: خوا داوا لە کەس ناکات مەگەر بەپێی ئەوەی کە پێیداوە) ئەمەش گونجاوە لەگەڵ حیکمەتو میهرەبانی خوادا، کاتێ خەرجی هەریەکەیانی داناوە بە پێی توانای خۆیان، وە کار ئاسانی کردووە لەسەر بێ توانا، بێگومان ئەو کەسە ئەرکی پێ ناسپێردرێ مەگەر بە پێی توانای خۆی، لە بابەتی خەرجیو جگە لە خەرجیش ﴿ سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ﴾ (واتە: بێگومان خوا دوای تەنگانە ئاسانی دێنێت) ئەمەش مژدەیە کە بۆ ئەو کەسانەی لە تەنگانەدان، کە بێگومان خوا ﷻ لە داهاتوویەکی نزیکدا ئەو سەختیو نارەحەتیەیان لەسەر هەڵدەگرێ ﴿ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٥﴾ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٦﴾ ﴾ الشرح، (واتە: بەڕاستی لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشیو ئاسانی دێت * بێگومان لە ڕاستیدا لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشیو ئاسانی دێ).

(٨-١١): ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨﴾ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ﴿٩﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ﴿١٠﴾ رَّسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٍ لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا ﴿١١﴾ ﴾:

﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨﴾ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ﴿٩﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی لەناوبردنی ئەو گەلە سەرپێچیکارانەو ئەو سەدە بەدرۆدانەرانەی پێغەمبەران، بێگومان زۆریو هێزو تواناکانیان سوودی پێنەگەیاندن بە هیچ شێوەیەک، کاتێ لێ پرسینەوەی سەختیان لەگەڵدا کرا، لەگەڵ سزای بە ئێش، خوا ﷻ سزای پێ چەشتن لە دەرەنجامی کردەوە خراپەکانیان، لەگەڵ سزای دونیادا، خوا ئامادەی کردووە بۆیان لە دوارۆژدا سزایەکی توند.
﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ واتە: (کەواتە لە خوا بترسن) ئەی خاوەن عەقڵەکان، ئەوانەی لە ئایەتو پەندو ئامۆژگاریەکانی تێدەگەن، بێگومان ئەو زاتەی سەدەکانی ڕابردووی لەناوبرد بەهۆی بەدرۆدانانیان، ئەوانەی دوای ئەوانیش وەک ئەوانن، هیچ جیاوازیەک نیە لە

نێـوان ئەو دوو دەسـتەیەدا.

پاشـان باسـی بەنـدە برواداره‌کانـی کـردوە بـەوەی قورئانی بـۆ دابەزانـدوون، کـە دایبەزاندووە بـۆ پێغەمبەرەکـەی تـا خەڵکی دەربێنـێ لە تاریکسـتانی بێبروایـیو نەفامیو سـەرپێچی، بۆ لای رووناکـی زانسـتو بـرواو گوێڕایەڵـی، هەنـدێ لـە خەڵکـی بروایـان پێهێنـاوە، وە هەندێکیان بروایـان پـێ نەهێناوە.

﴿ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَـٰلِحًا ﴾ (واتـە: وە هەر کەسـێ بـروا بە خوا بهێنـێو کردەوەی چاک بکات) لە پێویسـتو پەسـندەکان ﴿ يُدْخِلْهُ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ ﴾ (واتـە: خوا دەیخاتە بەهەشـتانێکەوە بـە ژێر درەختەکانیدا جۆگە ئـاوی زۆر دەڕوات) نازو نیعمەتـی بەردەوامی تێدایە کـە نە چـاو بینیوتی، نـە گوێ بیسـتوویەتی، نە بەختووره بەسـەر دڵی مرۆڤـدا هاتووە.

﴿ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا ﴾ (واتـە: تیایدا دەمێننەوە بە هەمیشـەیی بێگومان خوا لەوێ ڕۆزی چاکـی بـۆ ئامـادە کردوە) واتە: هەر کەسـێک بـڕوا نەهێنێ بـە خـواو پێغەمبەرەکەی، ئا ئەوانـە هاوەڵی ئاگرن بە هەمیشـەیی تیـا دەمێننەوە.

(١٢): ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَـٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا ﴿١٢﴾ ﴾.

پاشـان خـوا ﷻ هەواڵـی داوە کـە حـەوت ئاسـمانی بەدیهێنـاوەو ئەوەشـی لەناویاندایـە، وە بـە وێنـەی ئەوان حـەوت زەویشـی بەدیهێنـاوەو ئەوەشـی لەناویاندایە، وە ئەوەشـی لـە نێوانیاندایە، وە فەرمانیشـی دابەزانـدووە ئەویـش: شـەریعەتەکانو بڕیـارە ئاینیەکانە کە خوا وەحـی پێکردوە بـۆ لای پێغەمبەرەکانـی، لەبەر یادخسـتنەوەی بەندەکانو ئامۆژ گـاری کردنیان، بە هەمان شـێوە فەرمانـە گەردوونـیو قەدەریەکانیـش، کـە بەدیهێنراویـان پـێ بەڕێـوە دەبـات، هەمـوو ئەوانە لەبـەر ئەوەیـە تـا بەندەکان چـاک بزانـنو تێبگەن، خوا بـە تواناو دەسـەڵاتو زانسـتی دەوری هەموو شـتەکانی داوە، جا ئەگەر خوایان ناسـی بەو وەسـفە بـەرزو پیرۆزانەیو نـاوە جوانەکانی، وە پەرستشـیان کـردو خۆشـیان ویسـتو مافەکانیـان بەجێهێنـا، ئـا ئەمـە ئامانجو مەبەسـت لە دروسـتکردنو فەرماندا: ناسـینی خواو پەرسـتنێتی.

ئەوانـەی سـەرکەوتوو بوون لـە بەندە چاکەکانی خوا پێی هەسـتاون، ئەوانەشـی سـتەمکارو ڕوو وەرگێڕن پشـتیان تێکردوە.

تەفسیری سوورەتی (الطلاق) تەواو بوو.


سورة التحريم
بسم الله الرحمن الرحيم
يا أيها النبي لم تحرم ما أحل الله لك تبتغي مرضات أزواجك والله
غفور رحيم ① قد فرض الله لكم تحلة أيمانكم والله مولاكم وهو
العليم الحكيم ② وإذ أسر النبي إلى بعض أزواجه حديثا فلما
نبأت به وأظهره الله عليه عرف بعضه وأعرض عن بعض فلما
نبأها به قالت من أنبأك هذا قال نبأني العليم الخبير ③ إن
تتوبا إلى الله فقد صغت قلوبكما وإن تظاهرا عليه فإن الله
هو مولاه وجبريل وصالح المؤمنين والملائكة بعد ذلك
ظهير ④ عسى ربه إن طلقكن أن يبدله أزواجا خيرا منكن
مسلمات مؤمنات قانتات تائبات عابدات سائحات ثيبات
وأبكارا ⑤ يا أيها الذين آمنوا قوا أنفسكم وأهليكم نارا
وقودها الناس والحجارة عليها ملائكة غلاظ شداد
لا يعصون الله ما أمرهم ويفعلون ما يؤمرون ⑥ يا أيها الذين
كفروا لا تعتذروا اليوم إنما تجزون ما كنتم تعملون ⑦

## تەفسیری سوورەتی (التحریم)

## مەدەنییە (١٢) ئایەتە

## بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە

(١-٥): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ
تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ (١)
قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ وَٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ
وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ (٢) وَإِذۡ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ
بَعۡضِ أَزۡوَٰجِهِۦ حَدِيثٗا فَلَمَّا نَبَّأَتۡ بِهِۦ وَأَظۡهَرَهُ
ٱللَّهُ عَلَيۡهِ عَرَّفَ بَعۡضَهُۥ وَأَعۡرَضَ عَنۢ بَعۡضٖۖ فَلَمَّا
نَبَّأَهَا بِهِۦ قَالَتۡ مَنۡ أَنۢبَأَكَ هَٰذَاۖ قَالَ نَبَّأَنِيَ
ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡخَبِيرُ (٣) إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ
قُلُوبُكُمَاۖ وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوۡلَىٰهُ
وَجِبۡرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ (٤) عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبۡدِلَهُۥٓ
أَزۡوَٰجًا خَيۡرٗا مِّنكُنَّ مُسۡلِمَٰتٖ مُّؤۡمِنَٰتٖ قَٰنِتَٰتٖ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٖ سَٰٓئِحَٰتٖ ثَيِّبَٰتٖ وَأَبۡكَارٗا (٥) ﴾:

ئەمە سەرزەنشت کردنێکە لەلایەن خواوە بۆ پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ، کاتێ سەرجێی کردنی خۆی لەگەڵ ماریەی (هاوسەریدا) قەدەغە کرد، یان خواردنەوەی هەنگوێنی (لە خۆی قەدەغە کرد)، لە بەر خاتری هەندێ لە خێزانەکانی، لە چیرۆکێکی ناسراوو بەناوبانگدا، خوا ﷻ ئەم دەقانەی دابەزاندە خوارەوە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ﴾ واتە: ئەی ئەو کەسەی خوا نازونیعمەتی داباراندووە بەسەرتدا بە پێغەمبەرایەتیو وەحیو نێردراوی، ﴿ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ﴾ (واتە: بۆچی شتێک لە خۆت قەدەغە دەکەیت کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوویت) لەو پاکانەی کە دایباراندووە بەسەرتدا، وە بەسەر ئوممەتەکەتدا؟ ﴿ تَبۡتَغِي ﴾ دەتەوێ بەو قەدەغە کردنە ﴿ مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ (واتە: ڕەزامەندی ژنەکانت لە کاتێکدا خوا لێبووردەی میهرەبانە). ئەمە ڕوونو ڕەوانە بەوەی کە بێگومان خوا لە پێغەمبەرەکەی خۆش بووە، وە لۆمەو سەرزەنشتی لەسەر هەڵگرتو ڕەحمی لێکرد، وە ئەو قەدەغەکردنەی لەلای ئەوەوە دەرچوو بووبە هۆکارێک بۆ

دانانــی بڕیارێکــی گشــتی بۆ هەمــوو ئوممەت، جا خوای بــەرز بە دادوەری خــۆی بڕیارێکی گشــتی دەرکرد بۆ هەموو ســوێندێکو فەرمــووی: ﴿ قَدْ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَٰنِكُمْ ﴾ واتە: بێگومــان خــوا ئاینــی بــۆ دانــاون، وە ئەندازەی کــردوە بۆتــان کە بەچــی هەڵدەوەشــێتەوە، پێــش شــکاندنی، وەچیش دەبێتــە کەفارەت دوای شــکاندنی.

ئەویــش وەک ئەوەیە خوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُحَرِّمُوا۟ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ﴿٨٧﴾ ﴾المائـدة، (واتــە: ئــەی ئەوانــەی بڕواتان هێناوە ئەو شــتە پاکو خۆشــانەی کە خوا حەڵاڵی کردوە بۆتان یاســاغی مەکەن لە خۆتان، وە ســنوور مەشــکێنن)، تا ئــەوەی خوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيْمَٰنِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ﴿٨٩﴾ ﴾المائـدة، (واتــە: جــا کەفارەتی ســڕینەوەی شــکاندنی ئەو ســوێندانە خۆراک پێدانــی دە هــەژارە لــە خۆراکــێ مــام ناوەنــدی کە بە منــداڵو خێزانــی خۆتانــی دەدەن یان پۆشــاکی دە هــەژار یــان ئازادکردنــی بەندەیــەک جــا ئــەوەی هیــچ کام لەمانــەی دەســت نەکــەوت ئــەوە ســێ ڕۆژ بــە ڕۆژوو بێــت ئەوەی باســکرا کەفارەتــی ســوێندەکانتانە کاتێ کە ســوێندتان خواردو ســوێندەکەتان شــکاند).

جــا هــەر کەســێک حەڵاڵێک لەســەر خۆی حــەرام بکات، لە خــواردن یان خواردنــەوە، یان ســەرجێی، یــان ســوێند خــواردن بە خــوا لە ســەر کارێ یــان وازهێنان لێی، پاشــان ســوێند بخــوا، یــان بیەوێ ســوێند بخوا ئــەوە ئەم کەفارەتەی لەســەر پێویســتە، فەرمایشــتی خوا ﷻ: ﴿ وَٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ ﴾ واتــە: کارەکانــی ئێــوە بەڕێــوە دەباتو بــە چاکترین شــێوە پەروەردەتان دەکات لــە کاروبــاری ئایــنو دونیاتانــدا، وە بــەوەش شــەڕتان لــێ دوور دەخاتــەوە، ئــا لەبــەر ئەوەیــە خــوا هەڵوەشــاندنەوەی ســوێندەکانتانی بۆ داناون، بــۆ ئەوەی گەردنتــان ئازاد بێــت ﴿ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ ئــەو زاتــەی کە زانســتی دەوری ئاشــکراو نهێنیتانیــداوە، وە ئەو زاتــە کاربەجێیــە لــە هەمــوو ئەوانــەی دروســتی کــردوەو بڕیــاری پێــداوە، ئا بەو شــێوەیە یاســاو ڕێســای بۆ دانــاون کە ڕێــک دێتــەوە لەگــەڵ بەرژەوەندیەکانتانو گونجــاوە لەگەڵ بارودۆختان.

﴿ وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِىُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ حَدِيثًا ﴾ (واتــە: کاتێــک پێغەمبــەر ﷺ بەنهێنی لای هەندێ لــە خێزانەکانــی قســەیەکی درکاند) زۆرێک لــە ڕاڤەزانانی قورئان وتوویانــە: ئەوە حەفصەی دایکــی ئیمانــداران بــووە، پێغەمبــەر بە نهێنی قســەیەکی بۆ کــردووە، وە فەرمانــی پێکردوە

لای هیچ کەسێ باسی نەکات، بەڵام ئەو لای عائیشە باسی کرد.
وە خوا پێغەمبەرەکەی ئاگادار کردەوە لەو هەواڵەی کە حەفصە بڵاوەی پێکرد، پێغەمبەریش ﷺ هەندێ لە قسەکانی بۆی باسکردوو هەندێکی باس نەکرد، وەک ڕێزو نەرمو نیانیەک بوو لەلایەن پێغەمبەرەوە، جا﴿ قَالَتْ ﴾ حەفصە بە پێغەمبەری وت: ﴿ مَنْ أَنۢبَأَكَ هَٰذَا ﴾ (کێ ئەم) هەواڵەی پێداوی، کە لەلایەن هیچ یەکێک لە ئێمەوە دەرنەچووە؟ ﴿ قَالَ نَبَّأَنِيَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴾ (واتە: فەرمووی: خوای زانای ئاگادار پێی ڕاگەیاندم) ئەو زاتەی کە هیچی لێ شاراوە نیە، بە نهێنیو شاراوەکان دەزانێ.
﴿ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ﴾ (واتە: ئەگەر هەردووکتان تەوبە بکەنو بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، چونکە بە ڕاستی دڵتان لایداوە لە حەقو ڕاستی)، دواندنەکە بۆ دوو خێزانە بەڕێزەکەیەتی عائیشەو حەفصە (خوا لێیان ڕازی بێ) ئەوان هۆکار بوون لە قەدەغەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەسەر نەفسی خۆی ئەو شتەی کە حەزی لێدەکرد.
خوا ﷻ تەوبەو لێخۆشبوونی بۆ هەردووکیان خستەڕوو، سەرزەنشتیشی کردن لەسەر ئەوە، وە هەواڵی پێدان کە دڵیان لایداوە لەوەی پێویستە لە سەریان، لە خۆگرتنەوەو ئەدەبو ڕەوشت بەرزی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ وە ڕێز گرتنی، وە با ئەرکی لەسەر گران نەکەن.

﴿ وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيْهِ ﴾ واتە: پشتگیری یەکتر بکەن لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆشە، وە بەردەوام بن لەسەر ئەو کارە، ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوْلَىٰهُ وَجِبْرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَعْدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ﴾ (واتە: چونکە بێگومان خواو جبریلو ئیماندارە چاکەکانو دوای ئەوانیش فریشتەکانیش) هەموویان پشتیوانی پێغەمبەرن، هەرکەسێکیش ئەوانە پشتگیری لێبکەن بێگومان سەرخراوە، دژەکەیشی سەرشۆڕو زەلیلە.
لەمەدا گەورەترین چاکەو حورمەت بەدیدەکرێ بۆ گەورەی پێغەمبەران، کاتێک خوا ﷻ نەفسی پیرۆزیو بەدیهێنراوە تایبەتەکانی داناوە بە پشتیوانی کردنی ئەم پێغەمبەرە بەخشندەیە.

هەروەها ئەمە ترساندنی تێدایە بۆ دوو خێزانە بەڕێزەکەی لەوەی کە شاراوە نیە، هەروەها ترساندوونی بە حاڵەتێ کە زۆر قورسو گرانە بەلای ئافرەتانەوە، ئەویش تەڵاقە کە گرانترین شتە لەسەریان، فەرموویەتی: ﴿ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ ﴾ واتە: خۆتان بەرز مەکەن لەسەری، بێگومان ئەگەر ئەو ئێوە تەڵاق بدات،

کاری لەسـەر تەنـگ نابـێ، ناچـار نابێ بۆتان، لـە جیاتی ئێوە خـوا ژنانێکی باشـتر لە ئێوەی دەداتـێ، لـە ڕووی ئایـنو جوانیـەوە، ئەمـەش لـە بابەتـی هەڵواسـینێکە کە بوونـی نیە، وە پێویسـتیش نـاکات بوونـی هەبـێ، بێگومـان پێغەمبەر ﷺ تەڵاقـی نەدان، جا ئەگـەر تەڵاقی بدایـەن ئەوە خـوا ﷻ لەو خێزانـە بەرێزانە نـاوی نەدەهێنـان، ئەوانەی کۆیـان کردۆتەوە لە نێوان مسـوڵمانێتی ئەویش هەسـتانە بە شـەریعەتە ئاشـکراکان، وە بڕواهێنان ئەویش هەستانە بە شـەریعەتە شـاراوەکان، لـە بیرو بـڕواو کـردەوەی دڵەکان.

﴿ قَٰنِتَٰتٍ ﴾ (القنـوت) بریتیـە لـە بـەردەوام بوونـی گوێڕایەڵـی، ﴿ تَٰٓئِبَٰتٍ ﴾ تەوبەکاران لـەوەی خـوا پێی ناخۆشـە، جا وەسـفی کردوون بـە بەجێهێنانی ئـەوەی خوا پێی خۆشـە، وە داوای لێخۆشـبوون لـەوەی خوا پێی ناخۆشـە.

﴿ ثَيِّبَٰتٍ وَأَبۡكَارًا ﴾ واتـە: هەندێکیـان بێـوەژنو هەندێکیـان کیـژ، بـۆ ئـەوەی جۆراوجۆر بـێ لـەوەی حـەزی لێـدەکات، کاتـی ئـەم ترسـاندنو پەروەردەکردنیانە بیسـت، (خوایان لـێ ڕازی بێـت) دەستپێشـخەریان کـرد بـۆ ڕازی بوونـی پێغەمبـەر ﷺ، کەواتە ئەم وەسـفە پـڕاو پـڕە بۆیـان، جـا بوون بـە چاکترینـی ئافرەتانـی بـڕواداران، لەمـەدا بەڵگـە هەیە کە خـوا هەڵنابژێـرێ بـۆ پێغەمبەرەکـەی ﷺ جگـە لـە تەواوتریـن بارودۆخـەکانو بەرزترین کاروبـارەکان، کاتـێ خوا ﷻ هێشـتنەوەی ئـەو خێزانانـەی هەڵبژارد بـۆ پێغەمبەرەکەی کە باسـکران، بـۆ ئـەوەی لەگەڵیدا بژیـن، بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی ئـەوان چاکترینـی ئافرەتانو تەواوترینیانن.

(٦): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ٦ ﴾

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ واتـە: ئـەی ئـەو کەسـانەی خـوا منەتی ئیمانـی کردوە بەسـەرتاندا هەسـتن بە پێویسـتیەکانیو مەرجەکانـی، جـا ﴿ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا ﴾ (واتە: خۆتانو کـەسو کارتـان بپارێـزن لـە ئاگرێک) وەسـف کراوە بـەم وەسـفە ترسـناکو تۆقێنەرە، پاراسـتنی نەفسـیش بە پەیوەسـت کردن دەبێ بە فەرمانی خوا، وە بەجێهێنانـی فەرمانەکانیو دوورکەوتنـەوە لـە قەدەغەکراوەکانـی، وە داوای لێخۆشـبوون لـەوەی خوا تـوڕە دەکاتو سـزا پێویست دەکات.

وە پاراسـتنی ژنو منـداڵ بە پەروەردەکـردنو فێرکردنیان، وە ناچارکردنیان لەسـەر فەرمانی خـوا، بەنـدە سـەلامەت نابـێ مەگـەر کاتـێ هەسـتێت بـەوەی خـوا فەرمانـی پێکـردوە لە

نەفسـی خۆیـدا، وە ئەوانـەش دەچنـە ژێـر دەسـەڵاتی ئەو لـە ژنـەکانو منداڵـەکانو جگە لەوانیـش لـەوەی لەژێـر دەسـەڵاتو بەڕێوەبردنـی دایـە، خوا ﷻ وەسـفی ئاگـری کردوە بـەم وەسـفە بـۆ ئـەوەی بەندەکانـی بترسـێنێ لـە کەمتەرخەمـی لـە فەرمانەکانیـدا، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ﴾ (واتـە: سـووتەمەنیەکەی ئادەمیـزادو بـەردە)، هەر وەک فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ ﴾الأنبیـاء، (واتـە: بـە ڕاسـتی ئێـوە وە ئەوانـەش دەتانپەرسـتن جگە لە خـوا دەبنـە سـووتەمەنی هەڵگیرسـێنەری دۆزەخ ئێـوەو ئەوانە دەچنـە ناویەوە).

﴿ عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ ﴾ واتـە: (سەرپەرشـتی ئاگـری دۆزەخ دەکات چەنـد فریشـتەیەک) کـە مامەڵەیان زۆر ڕەقو وشـکە، زۆر تـووڕەن، بە دەنگەکانیـان دەتۆقێن، بە بینینیان دەترسـن، سەرزەنشـتی دۆزەخیـان دەکەن بەهێـزو توانایان، فەرمانی خوایان لەسـەر جێبەجـێ دەکـەن، کـە سـزای توونـدی بۆیـان یەکلایـی کردوەتـەوەو پێویسـتی کردوە، ﴿ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾ (واتـە: بـێ فەرمانـی خـوا ناکـەن لەوەی کـە فەرمانیـان پـێ بـدات، وە چ فەرمانێکیان پێ بـدرێ دەیکەن)، هەروەها ئەمەش سـتایش کردنـی فریشـتە بەڕێزەکانـی تێدایە، وە ملکـەچ بوونیان بۆ فەرمانـی خـواو گوێڕایەڵیان لە هەمـوو ئەوانەی خـوا فەرمانـی پێکردوون.

(٧): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَعْتَذِرُوا۟ ٱلْيَوْمَ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٧﴾ ﴾:

سـەرکۆنەی دۆزەخیـان دەکـرێ لـە ڕۆژی دواییـدا بـەم سـەرکۆنەکردنە، پێیـان دەوترێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَعْتَذِرُوا۟ ٱلْيَوْمَ ﴾ (واتـە: ئـەی ئەوانـەی کـە بێبـڕوا بـوون) ئەمـڕۆ عـوزرو بیانـوو مەهێننـەوە)، بـە ڕاسـتی کاتـی بیانوو هێنانـەوە نەمـاو هیچ سـوودێکی نیە، ئێسـتا هیـچ نەماوەتـەوە جگـە لـە پاداشـت لەسـەر کـردەوەکان، ئێـوەش هیچتـان پێـش نەخسـتووە جگـە لـە کوفـرو بێبڕوایـیو بەدرۆدانانـی ئایـەتو نیشـانەکان، وە دژایەتـی کردنـی پێغەمبـەرانو دۆسـتانی خوا.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمۡ
أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيُدۡخِلَكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي
مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ يَوۡمَ لَا يُخۡزِي ٱللَّهُ ٱلنَّبِيَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
مَعَهُۥۖ نُورُهُمۡ يَسۡعَىٰ بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَبِأَيۡمَٰنِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَآ
أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا وَٱغۡفِرۡ لَنَآۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٨
يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ
وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ٩ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا
لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱمۡرَأَتَ نُوحٖ وَٱمۡرَأَتَ لُوطٖۖ كَانَتَا تَحۡتَ
عَبۡدَيۡنِ مِنۡ عِبَادِنَا صَٰلِحَيۡنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمۡ يُغۡنِيَا عَنۡهُمَا
مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَقِيلَ ٱدۡخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ١٠
وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمۡرَأَتَ فِرۡعَوۡنَ إِذۡ
قَالَتۡ رَبِّ ٱبۡنِ لِي عِندَكَ بَيۡتٗا فِي ٱلۡجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرۡعَوۡنَ
وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ١١ وَمَرۡيَمَ ٱبۡنَتَ
عِمۡرَٰنَ ٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا
وَصَدَّقَتۡ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتۡ مِنَ ٱلۡقَٰنِتِينَ ١٢

(٨): ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيُدۡخِلَكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ يَوۡمَ لَا يُخۡزِي ٱللَّهُ ٱلنَّبِيَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥۖ نُورُهُمۡ يَسۡعَىٰ بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَبِأَيۡمَٰنِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا وَٱغۡفِرۡ لَنَآۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٨﴾﴾:

واتە: بە ڕاستی خوا ﷻ لەم دەقەدا فەرمانی کردوە بە تەوبەی یەکجاری (النصوح)، وە پەیمانی داوە بە لێ خۆشبوون لە گوناهەکانو چوونە بەهەشتەکانو سەرکەوتنو سەرفرازی، کاتێ بڕوادارن لە ڕۆژی دواییدا بە ڕووناکی ئیمانیان دەڕۆن، وە ڕێدەکەن بە ڕۆشنایەکەیو چێژ وەردەگرن بە حەوانەوەکەی، بەزەییان دێتەوە کاتێ ئەو ڕووناکیە دەکوژێتەوە دەدرێ بە دوو ڕووەکان، داوا دەکەن لە خوا کە ڕووناکیەکەیان بۆ تەواو بکات، ئەویش داواکەیان وەردەگرێ، ئەو ڕووناکیو دڵنیاییەی هەیانە دەیانگەیەنێ بە بەهەشتانی پڕ لە نازونیعمەت، وە دراوسێیەتی پەروەردگاری بەخشندە، هەموو ئەمانە لە شوێنەوارەکانی تەوبەی یەکجارین.

مەبەست لە تەوبەی یەکجاری: تەوبەی گشتگیرە بۆ هەموو گوناهەکان، کە بەندە لەگەڵ خوادا گرێیداوە، هیچ مەبەستێکی نیە تەنها لە پێناو خواو نزیک بوونەوە لەو، بەردەوام دەبێ لەسەری لە هەموو بارودۆخەکانیدا.

(٩): ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٩﴾﴾:

خوا ﷻ فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی ﷺ بە جیهادکردنی بێبڕوایانو ڕەقیو توندوتیژ بوون لەگەڵیاندا، ئەمەش گشتگیرە بۆ جیهادکردنیان بە پێویستکردنی بەڵگە لەسەریانو بیانوو بڕینیان، وە بانگەوازکردنیان بە ئامۆژگاری چاک، وە پووچ کردنەوەی ئەوەی ئەوان لەسەری دەڕۆن لە جۆرەها گومڕایی، وە جەنگ کردن لە دژیان بە چەکو کوشتار

كـردن، بـۆ ئەو كەسـەی كە یاخـی دەبێ لـە بەدەمـەوە چوونی بانگـەوازی خـوا، وە ملكەچی بڕیـاری نابـێ، ئـا ئەمە جەنـگ‌و توونـدو تیژی لـە دژ دەكرێ.

بـەڵام پلـەی یەكـەم پێویسـتە بـە چاكتریـن‌و لێزانتریـن شـێوە بێـت، جـا بێبڕوایـان‌و دوو ڕووەكان لـە دونیـادا سـزا دەدرێن بە زاڵبوونـی پێغەمبـەرو حیزبەكەی بەسـەریاندا، بە جەنگ‌و كوشـتاركردنیان، وە لـە دوارۆژیشـدا سـزای ئاگـرو خراپتریـن سـەرەنجامیان بـۆ دەبـێ، كە هەمـوو كەسـێكی بەدبەخـت‌و زەرەرمەنـد پێـی دەگات.

(١٠-١١): ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَـٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴿١٠﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١١﴾﴾

ئـەم دوو نموونەیـەی كـە خـوا ﷻ هێناویەتیەوە بـۆ بـڕواداران‌و بێبڕوایـان، بۆ ئەوەیـە ڕوونی بكاتـەوە بۆیـان كـە پەیوەنـدی بێبڕوا بـە بـڕوادارو نزیک بوونـەوە لێـی هیچ سـوودێكی پێ ناگەیەنـێ، بـە هەمـان شـێوە پەیوەندی بـڕوادار بـە بێبڕواوە هیـچ زیانێكـی پێناگـات، لەگەڵ هەسـتانی بە ئەركەكانی سـەر شـانی.

بێگومـان لەمـەدا ئامـاژەو ترسـاندنێک هەیە بـۆ خێزانەكانی پێغەمبـەر ﷺ لە سـەرپێچی كردن، چونكـە پەیوەنـدی ئـەوان بـە پێغەمبـەرەوە هیـچ سـوودێكیان پـێ ناگەیەنـێ لەگەڵ تـاوان‌و خراپەكاریـدا، بۆیـە خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ كَانَتَا﴾ واتـە: ئـەو دوو ئافرەتـە، ﴿تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَـٰلِحَيْنِ﴾ (واتـە: كـە لـە ژێر نیكاحـی دوو بەنـدەدا بوون لـە بەنـدە چاكەكانی ئێمـە) ئەوانیـش نووح‌و لـووط بـوون (علیهمـا السـلام)، ﴿فَخَانَتَاهُمَا﴾ ئنجـا خیانەتیان لێكـردن لە ئاینـدا، بەوەی لە سـەر ئاینـی مێردەكانیـان نەبوون، مەبەسـت لـە خیانـەت ئەمەیە، نـەک خیانەتـی ڕەچەڵەک‌و داوێنپیسـی، بێگومـان خێزانـی هیـچ پێغەمبەرێـک داوێن پیسـی نەكـردوە، خـوا خێزانی هیچ یەكێـک لـە پێغەمبەرانـی بـە داوێن پیـس دانەناوە.

﴿فَلَمْ يُغْنِيَا﴾ واتـە: نووح‌و لووط (نەیانتوانـی)، ﴿عَنْهُمَا﴾ لە خێزانەكانیان ﴿مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ﴾ واتـە: (شـتێک لە سـزای خوایان) لـێ دوور بخەنـەوە، (وە پێیـان وترا): ﴿ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ﴾ (واتـە: بڕۆنـە نـاو ئاگرەوە لەگـەڵ ئەوانەی كە دەڕۆنـە ناویەوە).

﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ﴾ ئەویش ئاسـیای كچـی موزاحم بوو

(خـوا لێـی ڕازی بـێ)، ﴿إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، خـوا وه‌سـفی کـردوه بـه‌ بڕواهێنـانو ملکـه‌چ بـوون بـۆ په‌روه‌ردگـاری، وه‌ داواکردنـی لـه‌ په‌روه‌ردگاری بـه‌ گه‌وره‌ترین داواکاری، ئه‌ویش به‌هه‌شـته‌و نزیکیـه‌ لـه‌ په‌روه‌ردگاری به‌خشـنده‌، داواکردنی که‌ خـوا ڕزگاری بکات لـه‌ فیرعه‌ونو کرده‌وه‌ قیزه‌ونه‌کانـی، وه‌ لـه‌ فیتنـه‌و بـه‌ڵای هه‌موو سـته‌مکارێ، جا خـوا ﷻ دوعاکـه‌ی لێوه‌رگرت به‌ ئیمانێکـی تـه‌واوه‌وه‌ ژیـا، ڕزگاری بوو له‌ بـه‌ڵاو فیتنه‌، له‌بـه‌ر ئه‌مه‌یه‌ پێغه‌مبـه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی: [كَمَـلَ مِـنَ الرِّجَـالِ كَثِيرٌ، وَلَمْ يَكْمُلْ مِنَ النِّسَـاءِ إِلاَّ آسِيَةُ امْـرَأَة فِرْعَـوْنَ، وَمَرْيَمُ بِنْتُ عِمْـرَانَ وَإِنَّ فَضْلَ عَائِشَـةَ عَـلَى النسَـاءِ كَفَضْـلِ الثَّرِيـدِ عَـلَى سَـائِرِ الطَّعَـامِ] (أخرجـه البخـاري برقـم: (٣٥٥٨)) واتـه‌: کامـڵ بـووه‌ لـه‌ پیاوانـدا ڕێژه‌یه‌کـی زۆر، وه‌ کامـڵ نه‌بووه‌ لـه‌ ئافره‌تانـدا جگه‌ لـه‌ (مه‌ریه‌می کچـی عیمران)و (ئاسـیای کچـی موزاحیم) خێزانـی فیرعـه‌ن، (خه‌دیجه‌ی کچـی خوه‌یلد)، وه‌ فـه‌زڵو چاکه‌ی عائیشـه‌ (خوایان لـێ ڕازی بێت) به‌سـه‌ر ئافره‌تانـه‌وه‌، وه‌کو فـه‌زڵو چاکه‌ی نـان تێگووشـه‌ وایه‌ به‌سـه‌ر هه‌مـوو خواردنه‌کاندا.

خـوا ﷻ فه‌رموویه‌تـی: ﴿وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَٰنَ ٱلَّتِىٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا﴾ (واتـه‌: وه‌ مه‌ریه‌مـی کچی عیمـران کـه‌ داوێنـی خـۆی) پاک ڕاگـرت‌و پاراسـتی له‌ فاحیشـه‌و خراپـه‌، به‌ هـۆی ته‌واوی ئاینـی‌و پاکـی‌و بێگـه‌ردی، ﴿فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا﴾ بـه‌وه‌ی که‌ جبریـل عليه السلام فووی کـرد به‌ گیرفانی زرێکه‌یدا، جا فووه‌که‌ی گه‌یشـت به‌ مه‌ریه‌م، ئینجا عیسـای کـوڕی مه‌ریه‌می لـێ بوو، پێغه‌مبه‌ری به‌خشـنده‌و گـه‌وره‌و مـه‌زن. ﴿وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ﴾ (واته‌: وه‌ بـڕوای هێنابـوو به‌ وته‌کانـی په‌روه‌ردگـاری خۆی‌و کتێبه‌کانـی) ئه‌مه‌ش وه‌سـف کردنێکه‌ بـۆ ئـه‌و بـه‌ زانسـت‌و زانیـاری، چونکـه‌ بـه‌ ڕاسـتی بڕواهێنـان بـه‌ وته‌کانی خـوا هه‌مـوو وته‌ ئاینـی‌و قه‌ده‌ریه‌کانـی ده‌گرێته‌وه‌.

وه‌ بڕواهێنـان بـه‌ کتێبه‌کانـی: ئـه‌و زانیاریه‌ ده‌خـوازێ که‌ به‌ ڕاسـت دانانی پێ ده‌سـته‌به‌ر ده‌بێ، ئـه‌وه‌ش نابـێ مه‌گـه‌ر به‌ زانسـت‌و کـرده‌وه‌، بۆیـه‌ فه‌رموویه‌تـی: ﴿وَكَانَتْ مِنَ ٱلْقَٰنِتِينَ﴾ واته‌: (لـه‌ ڕیـزی) گوێڕایه‌ڵانـی خوادا بـوو، ئه‌وانـه‌ی به‌رده‌وامن لـه‌ گوێڕایه‌ڵی کردنی، به‌ ترسـان‌و ملکـه‌چ بـوون. ئه‌مه‌ش وه‌سـفێکه‌ بۆ ئـه‌و به‌ ته‌واوی کـرده‌وه‌، بێگومـان مه‌ریه‌م خـوا لێی ڕازی بـێ ئافره‌تێکـی زۆر ڕاسـتگۆ بـوو: ئه‌ویش بریتیه‌ لـه‌ ته‌واوی زانسـت‌و کرده‌وه‌.

ته‌فسیری سووره‌تی (التحريم) ته‌واو بوو.


سورة الملك

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ ﴿٢﴾ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا مَا تَرَىٰ فِي خَلْقِ الرَّحْمَٰنِ مِنْ تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِنْ فُطُورٍ ﴿٣﴾ ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنْقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ﴿٤﴾ وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُومًا لِلشَّيَاطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ السَّعِيرِ ﴿٥﴾ وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿٦﴾ إِذَا أُلْقُوا فِيهَا سَمِعُوا لَهَا شَهِيقًا وَهِيَ تَفُورُ ﴿٧﴾ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظِ كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا بَلَىٰ قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾ وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَاعْتَرَفُوا بِذَنْبِهِمْ فَسُحْقًا لِأَصْحَابِ السَّعِيرِ ﴿١١﴾ إِنَّ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ بِالْغَيْبِ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١٢﴾

# تەفسیری سوورەتی (الملك)

## مەككییە (٣٠) ئایەتە

## بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە

(١-٤): ﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ ﴿٢﴾ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا مَا تَرَىٰ فِي خَلْقِ الرَّحْمَٰنِ مِنْ تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِنْ فُطُورٍ ﴿٣﴾ ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنْقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ﴿٤﴾﴾:

﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ﴾ واتە: گەورەو مەزنو بەرزە، خاوەن خێرو چاکەی زۆرو بێ ئەندازەیە (ئەو خوایە)، لە مەزنی ئەو زاتە ئەوەیە جیهانی سەرەوەو خوارەوە لە ژێر دەسەڵاتی ئەودان، هەر ئەویش دروستی کردوون، هەڵی دەسووڕێنێ بە هەر جۆرێ بیەوێ، لە حوکمو بڕیارە قەدەریو ئاینیەکان، شوێنی حیکمەتی ئەو زاتە کەوتوون، لە مەزنی ئەو زاتە تەواوی دەسەڵاتێتی، کە توانای هەیە بەسەر هەموو شتێکدا، وە بەو تواناو دەسەڵاتەی هەمووی هێناوەتە بوون لە بەدیهێنراوە مەزنەکان، وەک: ئاسمانەکانو زەوی.

وە ﴿خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ﴾ واتە: داینـاوە بۆ بەندەکانی کە بیانژیێنێو پاشان بیانمرێنێ، ﴿لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ (واتە: تا تاقیتان بکاتەوە کە کردەوەی کامتان چاکترە)، واتە: بە دڵسۆزترین شێوەو بە پێی قورئانو سوننەت، بێگومان خوا ﷻ بەندەکانی بەدیهێناوەو هێناونی بۆ ئەم ماڵە، هەواڵی پێداون کە ئەوان لێی دەگوازرێنەوە، فەرمانی پێ کردوون (بە شتی باش)و قەدەغەی کردوون (لە شتی خراپ)، وە تاقیکردوونەتەوە بەو حەزوو ئارەزووانەی کە پێچەوانەی فەرمانی ئەون، جا هەر کەسێ ملکەچی خوا بکاتو کردەوەی چاک ئەنجام بدات، خوا پاداشتی چاکی دەداتەوە لە هەردوو دونیا،

وە هــەر کەسـێک لابدات بـۆ لای هەواو ئـارەزووەکانو فەرمانی خوا پشـت گـوێ بخات، ئــەوە خراپترین سـزای بـۆ هەیە.
﴿ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ﴾ ئـەو زاتـەی خاوەن دەسـەڵاتی تەواوە، بە هۆی ئەو دەسـەڵاتەوە زاڵە بەسـەر هەموو شـتەکاندا، وە هەموو بەدیهێنراوەکانیش ملکەچی بوون، ﴿ ٱلْغَفُورُ ﴾ لــێ خۆشـبووە لــە گوناهبــارانو کەمتەرخەمــان، بە تایبــەت ئەگەر تەوبە بکــەنو بگەڕێنەوە بـۆ لای، ئەوە بێگومــان ئەویــش لــە گوناهەکانیــان خۆش دەبــێ، ئەگەر بگاتە بــەرزی ئاسـمانەکانیش، وە کــەمو کورتیەکانیشـیان دادەپۆشــێ ئەگەر پڕ بــەم دونیایە بێـت، ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ﴾ واتــە: (ئــەو زاتەی کە حەوت ئاسـمانی دروسـت کردوە چین لــە دوای چین) هەر چینێکیــان لــە ســەرووی چینەکــەی دیکەوەیــە، هەموویــان یەک چیــن نیــن، بەدیهێناوە بە ئەوپــەڕی جوانــیو ووردەکاری ﴿ مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ ﴾ واتــە: (تۆ نابینیت ئەی تەماشــاکەر لــە دروســتکراوەکانی خــوای میهرەباندا) هیــچ ناڕێکــیو ناتەواویەک. جا ئەگــەر ناتــەواوی ڕەتکرایــەوە لــە هەمــوو ڕوویەکــەوە، ئــەوە دەبێتــە جوانــیو چاکیەکی تــەواو، کــە گونجــاوە لــە هەمــوو ڕوویەکەوە، لــە ڕەنــگو شـێوازو بەرزیدا، وە ئەوەیشــی تیایدایــە لە خــۆرو مانگو ئەسـتێرە ڕووناکەکان، ئەوانــەی جێگیرن تیایاندا، وە ئەوانەیشــی ڕێدەکەن.

کاتێــک کــە تــەواوی ئاســمانەکان زانــرا، خــوا فەرمانــی کــرد بــە یــەک لــە دوای یەک تەماشــا کردنــیو ســەرنجدانی دەورووبــەری، جــا فەرمــووی:﴿ فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ ﴾ واتــە: چاو بگێــڕەو تەماشــای بکــە، بە تەماشــاکردنێکی ســەرنجدانو پەنــد وەرگرتــن، ﴿ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ﴾ واتــە: ناتــەواویو کــەمو کوڕییــەک.

﴿ ثُمَّ ٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ ﴾ مەبەســت لەمــەدا زۆر چاوگێڕانــە، ﴿ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ ٱلْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ﴾ واتــە: دەستەوســان دەبــێ لــەوەی کــە ناتەواویــەک یــان کــەمو کورتیەکی تیــا ببینــێ، ئەگەرچــی زۆر ســووربێ لەســەر ســەرنجدانی، پاشــان ڕاســتەوخۆ باســی جوانی ئاســمانەکانی کــردوەو فەرموویەتــی:

(٥-١٠): ﴿ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ ۖ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ
﴿٥﴾ وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٦﴾ إِذَآ أُلْقُوا۟ فِيهَا سَمِعُوا۟ لَهَا شَهِيقًا وَهِىَ تَفُورُ
﴿٧﴾ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلْغَيْظِ ۖ كُلَّمَآ أُلْقِىَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا۟ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا
نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا

﴿فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ١٠﴾.

(خـوای پەروەردگـار) دەفەرمـوێ: ﴿وَلَقَدۡ زَيَّنَّا﴾ واتـە: بێگومـان جوانمـان کـردووەو ڕازاندوومانەتـەوە ﴿ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا﴾ (ئاسـمانی دونیـا) ئـەوەی بەچاوتـان دەیبینـن، ﴿بِمَصَٰبِيحَ﴾ ئەویـش ئەسـتێرەکانە لەسـەر جیاوازیـان لە ڕووناکـیو ڕۆشـنیدا، بێگومان ئەگـەر ئاسـمانەکان ئەسـتێرەیان تێـدا نەبووایـە ئـەوە دەبـوون بە سـەقفێکی تاریـک، هیچ جوانیەکیـان نەدەبەخشـی، بـەڵام خوا ﷻ ئەم ئەسـتێرانەی کـردووە بە ڕازاندنـەوەو جوانیو ڕووناکـی بـۆ ئاسـمانەکان، وە کردوویەتی بـە مایەی هیدایـەتو ڕێنمایی لـە تاریکیەکانی دەشـتو دەریا.

هەواڵـی خـوا ئـەوە ڕەت ناکاتـەوە کـە ئـەو زاتـە ئاسـمانەکانی دونیـای ڕازاندوەتـەوە بە چـراکان، کـە زۆرێ لـە ئەسـتێرەکان لـە سـەرووی حـەوت ئاسـمانەکەوە بـن، چونکـە ئاسـمانەکان ڕوونـن، بـەو شـێوەیە جوانـیو زینـەت دروسـت دەبـێ بـۆ ئاسـمانی دونیـا، ئەگەرچـی ئەستێرەشـی تێـدا نەبێـت.

﴿وَجَعَلۡنَٰهَا﴾ واتـە: ئەسـتێرەکانمان کـرد بـە ﴿رُجُومٗا لِّلشَّيَٰطِينِ﴾ ڕەجمی شـەیتانەکان، ئەوانـەی دەیانـەوێ گـوێ هەڵخـەن بـۆ ئاسـمانەکان، جـا خـوا ئـەم ئەسـتێرانەی وەکـو پاسـەوانێک دانـاوە بـۆ ئاسـمانەکان، لـەوەی شـەیتانەکان هەواڵـی ئاسـمانەکان ببـەن، جا ئـەم گـرو ئاگرانـە کە دەوەشـێنرێ لـە ئەسـتێرەکانەوە، خوا لە دونیـادا ئامادەی کـردوە بۆ شـەیتانەکان، ﴿وَأَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ﴾ ئامادەمان کردوە بۆیان لە دواڕۆژدا ﴿عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ﴾ (واتە: سـزای ئاگـری هەڵگیرسـاو) چونکـە لـووت بەرزیان نوانـد لە ئاسـتی خـواداو بەندەکانیان گومـڕا کرد، ئـا لەبەر ئەمەیـە شـوێنکەوتووانیان لە بێبڕوایـان وەکـو ئـەوان وان، بێگومان خـوا ئامادەی کـردووە بۆیان ئاگـری هەڵگیرسـاو، بۆیە فەرموویەتـی: ﴿وَلِلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ﴾ (واتـە: وە بـۆ ئەوانەی کـە بێبڕوان بە پەروەردگاریان سـزای دۆزەخ ئامادەیـە کـە مەنزڵگایەکـی زۆر خراپـە) خەڵکەکـەی تیایـدا سەرزەنشـت دەکرێن بەوپەڕی سەرزەنشـت کـردن، ﴿إِذَآ أُلۡقُواْ فِيهَا﴾ (واتە: کاتـێ فڕێدرانە ناویەوە) بە شـێوەی ئیهانـەو زەلیلیـەوە، ﴿سَمِعُواْ لَهَا شَهِيقٗا﴾ (واتە: لـەو دۆزەخەوە) دەنگێکی بـەرزی ناڕەحەت دەبیستن).

﴿تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلۡغَيۡظِ﴾ واتـە: خەریکـە دۆزەخ لـە ڕقـی بێبڕوایانـدا پارچـە پارچە ببێ، گومانـت چۆنـە چیـان پێـدەکات ئەگـەر بخرێنـە ناویـەوە؟! پاشـان باسـی سەرزەنشـت

کردنـی دەرگاوانـی دۆزەخ دەکات لەوانـەی تیایـدان، جـا فەرموویەتـی: ﴿كُلَّمَآ أُلۡقِيَ فِيهَا فَوۡجٞ سَأَلَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَذِيرٞ﴾ (واتـە: هـەر کاتێـک دەسـتەیەک فـڕێ بدرێنـە ناویەوە دەرگاوانەکانـی دۆزەخ پرسـیاریان لێدەکـەن ئایـا پێغەمبەرێکی ترسـێنەرتان بـۆ هاتووە)؟ واتـە: ئـەم حاڵەتـانو شایسـتە بوونتـان بـە ئاگـر هەروەکو ئـەوە وایـە کـەس هەواڵی پێ نەدابـن دەربـارەیو ئاگادارتانـی نەکردبێتـەوە لێی.

﴿قَالُواْ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَنَا نَذِيرٞ فَكَذَّبۡنَا وَقُلۡنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ كَبِيرٖ﴾ جـا کۆیـان کـردوە لـە نێـوان بـە درۆدانانـی تایبـەتو بـە درۆدانانی گشـتی، بـە هەموو ئەوانـەی خوا دایبەزانـدووە (واتـە: هەرچـی خـوا ناردوویەتـی بە درۆیـان دانا).

بەوەشـەوە نەوەسـتان تا گومڕابوونی پێغەمبەرە ترسـێنەرەکانیان ڕاگەیاند، ئـەو پێغەمبەرانەی ڕێنمایـی کار بـوون، بەڵکـو بـەو گومـڕا کردنیشـەوە نەوەسـتان، گومڕابوونیانیـان گێڕا بە گومڕابوونێکـی گـەورە، جـا چ عینـادیو لووت بەرزیو سـتەمێک هەیـە وەک ئەمە؟!

﴿وَقَالُواْ﴾ واتـە: دان دەنێـن بـەوەی کە شـیاوی هیـداتو ڕێنیشـاندان نیـنو دەڵێن: ﴿لَوۡ كُنَّا نَسۡمَعُ أَوۡ نَعۡقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾ (واتـە: ئەگـەر قسـەی پێغەمبەرانمـان ببیسـتایە، یان تێبگەیشـتینایە ئەمـڕۆ لـە هاوڕێیانـی دۆزەخ نەدەبوویـن)، ڕێگاکانی هیدایەتیـان لە نەفسو دەروونـی خۆیـان ڕەتکـردەوە، ئەویش بیسـتنی فەرمایشـتەکانی خوایـە کـە دایبەزاندووە، وە پێغەمبـەران پێـی هاتـوون، وە ئـەو عەقڵـەی سـوودی بـۆ خاوەنەکـەی هەیە کە لەسـەر حەقیقەتی شـتەکان دەیوەسـتێنێو پەسـندکردنی چاکـەو دوورکەوتنەوە لە هەمـوو ئەوانەی کـە دەرەنجامی خراپە، بە ڕاسـتی ئەوان نە بیسـتنیان هەبـوو نە عەقڵ، ئەمەش بـە پێچەوانەی خاوەنانـی یەقیـنو دڵنیایـیو عیرفـان، وە شـوێنکەوتووانی ڕاسـتیو ئیمان، بێگومـان ئەوان پشـتیوانیان لـە بڕواکەیان کـردوە بە دەقە بیسـتراوەکان، ئەوانـەی لە لایەنی خـواوە هاتووە بیسـتوویانە، ئەوەیشـی پێغەمبەرەکـەی هێناویەتی، بە زانسـتو زانیارییو کـردەوە پێکردن. وە بـە بەڵگـە عەقڵیـەکان: ناسـین بـۆ هیدایـەت لـە گومڕایـیو پاکـی لە شـتی قیـزەونو پیـسو چاکردنـەوە خێر لە شـەڕ.

بێگومـان ئـەوان لـە بڕواهێنانـدا هـەر کەسـەو بەپێی ئـەوەی خـوا منەتی کردوە بەسـەریدا لـە پەیـڕەوی کـردن، بـە بەڵگـەی عەقڵـیو بە بەڵگـەی نەقڵـی، پاکـیو بێگـەردی بۆ ئەو زاتـەی کـە بـە فـەزڵو چاکـەی خـۆی هـەر کەسـێکی بـوێ تایبەتـی دەکات، وە منەت دەکات بـە سـەر هەر یەک لـە بەندەکانیدا کـە خۆی بیـەوێ، وە زەلیلو سەرشـۆڕ دەکات

ئەو کەسەی شیاوی خێر نیە، خوا ﷻ دەربارەی ئەوانەی چوونەتە نێو ئاگرەوە، ئەوانەی دانیان بە ستەمو کەللەرەقی خۆیاندا ناوە فەرموویەتی:

(١١): ﴿ فَٱعۡتَرَفُواْ بِذَنۢبِهِمۡ فَسُحۡقٗا لِّأَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ١١ ﴾:

واتە: (ئیتر پێیان نا لە گوناهەکانیان) دووریو زیانو بەدبەختی بۆ ئەوان، ئای چەندە گومڕاو لەناوچوون، کاتێ پاداشتی دونیایان لە دەست چوو، ئەوان پەیوەست بوون بە ئاگری هەڵگیرساوەوە، کە جەستەیان گڕ تێبەر ئەداتو دەچێتە ناو سنگیانەوە!

(١٢): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ١٢ ﴾:

کاتێ باسی حاڵی بەدبەختانو خراپەکارانی کرد، ئنجا باسی حاڵی بەختەوەرانو چاکەخوازانی کردوە، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ ﴾ واتە: (ئەوانەی لە پەنهانیا لە خوای خۆیان دەترسن) لە هەموو حاڵێکیاندا، تەنانەت لەو حاڵەتەی کە کەس ئاگادار نیە پێیان جگە لە خوا نەبێ، ئەوان هەرگیز پێش ناکەون لە سەرپێچی کردن، وە کەمتەرخەمی ناکەن لەوەی خوا فەرمانی پێکردوون.

﴿ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ ﴾ (واتە: لێخۆشبوونیان بۆ هەیە) لە گوناهەکانیان، ئەگەر خوا لێیان خۆش بوو، وە پاراستنی لە شەڕو خراپەی گوناهەکانیانو پاراستنیان لە سزای دۆزەخ.

﴿ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴾ بۆ ئەوان هەیە (پاداشتی گەورە) ئەویش ئەوەیە خوا بۆی ئامادە کردوون لە بەهەشتدا لە نازونیعمەتی بەردەوامو موڵکی گەورەو لەزەتو خۆشیو ئارەزووی نەبڕاوە، خانووی بەرزو ڕازاوەو حۆری چاوگەشو خزمەتکارو منداڵان، گەورەترو مەزنتر لە هەموو ئەوانە ڕەزامەندی خوای بەبەزەییە کە خوا حەڵاڵی دەکات بۆ خەڵکانی بەهەشت.

وَأَسِرُّوا۟ قَوْلَكُمْ أَوِ ٱجْهَرُوا۟ بِهِۦٓ ۖ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٣﴾ أَلَا
يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ
ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾
ءَأَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا هِىَ تَمُورُ ﴿١٦﴾
أَمْ أَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ۖ فَسَتَعْلَمُونَ
كَيْفَ نَذِيرِ ﴿١٧﴾ وَلَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿١٨﴾
أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَٰٓفَّٰتٍ وَيَقْبِضْنَ ۚ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا
ٱلرَّحْمَٰنُ ۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍۭ بَصِيرٌ ﴿١٩﴾ أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ جُندٌ لَّكُمْ
يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ۚ إِنِ ٱلْكَٰفِرُونَ إِلَّا فِى غُرُورٍ ﴿٢٠﴾ أَمَّنْ هَٰذَا
ٱلَّذِى يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُۥ ۚ بَل لَّجُّوا۟ فِى عُتُوٍّ وَنُفُورٍ ﴿٢١﴾ أَفَمَن
يَمْشِى مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ أَهْدَىٰٓ أَمَّن يَمْشِى سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٍ
مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢٢﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ
وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۖ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى
ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ
صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلْ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٦﴾

**(١٣-١٤):** ﴿ وَأَسِرُّوا۟ قَوْلَكُمْ أَوِ ٱجْهَرُوا۟ بِهِۦٓ ۖ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٣﴾ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾ ﴾

ئه‌مه‌ هه‌واڵێكه‌ له‌ لایه‌ن خواوه‌ به‌ فراوانی زانستی‌و گشتگیری به‌زه‌یی‌و نه‌رم‌و نیانی، ﴿ وَأَسِرُّوا۟ قَوْلَكُمْ أَوِ ٱجْهَرُوا۟ بِهِۦٓ ﴾ (واته‌: ئێوه‌ قسه‌ی په‌نهان بكه‌ن یان ئاشكرا) هه‌مووی یه‌كسانه‌ له‌ لای خوا، هیچ كرده‌وه‌یه‌كی په‌نهان به‌ نهێنی لای ئه‌و نامێنێ جا، ﴿ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾ واته‌: (ئه‌و خوا ئاگاداره‌ به‌ خودی نهێنی دڵه‌كان) به‌وه‌ی تیایاندایه‌ له‌ نیه‌ته‌كان‌و ئیراده‌و ویسته‌كان، جا ئیتر چۆن ئاگادار نیه‌ به‌ قسه‌و كرده‌وه‌كان كه‌ ده‌بیستری‌و ده‌بینرێ؟!

پاشان به‌ڵگه‌ی هێنایه‌وه‌ به‌ به‌ڵگه‌ی عه‌قڵی له‌سه‌ر زانستی، فه‌رمووی: ﴿ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ ﴾ ئه‌و خوایه‌ی به‌دیهێنراوه‌كانی دروست كردووه‌و ورده‌كاری تێدا كردوه‌ به‌ چاكترین شێوه‌ چۆن ئاگای لێیان نیه‌؟! ﴿ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴾ كه‌ وردبینه‌ له‌ زانست‌و هه‌واڵیدا، ته‌نانه‌ت ئاگاداره‌ به‌ شاراوه‌و نهێنی‌و په‌نهان‌و ئه‌وه‌ی له‌ ناو ناخدایه‌، ئه‌و زاته‌، ﴿ يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخْفَى ﴿٧﴾ ﴾ طه‌ (واته‌: ئه‌وه‌ به‌راستی ئه‌و خوا نهێنی‌و له‌ نهێنی شاراوه‌تریش ده‌زانێ)، وه‌ له‌ ماناكانی (اللطيف) به‌ ڕاستی ئه‌و زاته‌ نه‌رم‌و نیانه‌ به‌رانبه‌ر به‌ به‌نده‌كه‌ی‌و پشتیوانێتی، له‌ شوێنێكه‌وه‌ چاكه‌ی بۆ ده‌نێرێ كه‌ هه‌ستی پێ ناكات، وه‌ ده‌یپارێزێ له‌ شه‌ڕو خراپه‌ له‌ ڕوویه‌كه‌وه‌ كه‌ گومانی بۆی نه‌بردووه‌، پله‌و پایه‌ی به‌رز ده‌كاته‌وه‌ به‌ چه‌ندین هۆكار كه‌ به‌نده‌ هه‌ر به‌ خه‌یاڵیدا نه‌هاتووه‌، ته‌نانه‌ت ناخۆشیه‌كانیشی پێ ده‌چێژێ تا به‌ هۆیانه‌وه‌ بگات به‌ خۆشویستراوه‌ مه‌زنه‌كان‌و پله‌و پایه‌ گه‌وره‌كان.

**(١٥):** ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾ ﴾

﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا ﴾ خوا ئه‌و زاته‌یه‌ زه‌وی بۆتان ڕامكردووه‌و زه‌لیل كردوه‌، بۆ ئه‌وه‌ی به‌ ده‌ستی بهێنن هه‌رچی ئه‌وه‌ی په‌یوه‌سته‌ به‌ پێویستیه‌كانتان، له‌ چاندن‌و خانوو

كێڵگـە، وە ئـەو ڕێگایانەی كە پێی دەگـەن بۆ وڵاتە دوورو فراوانـەكان،﴿ فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا ﴾ واتـە: بـۆ بەدەسـتهێنانی ڕزقو ڕۆزیو كارو كەسـابەت،﴿ وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ ﴾ واتـە: دوای ئـەوەی دەگوازرێنەوە لەم دونیایـە خوا كردوویەتی بە جێگای تاقیكردنەوەو توێشـوویەك كـە پێـی دەگەن بـۆماڵـی دوارۆژ، زیندوو دەكرێنـەوە دوای مردنتـانو، ئنجـا كۆدەكرێنەوە بۆ لای خـوا، بـۆ ئەوەی پاداشـتان بداتەوە بە كـردەوە چـاكو خراپەكانتان.

(١٦-١٨): ﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ١٦ أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗاۖ فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ ١٧ وَلَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ١٨ ﴾:

ئەمە هەڕەشـەكردنو ترسـاندنێكە بۆ ئەو كەسـەی كە بەردەوامە لەسـەر یاخیبوونیو دەستدرێژی كردنـیو سـەرپێچی كردنـی، كـە دەبێتـە مایـەی تۆڵـەو پێویسـت بوونی سـزا لە سـەری، جا فەرموویەتـی:﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾ ئەویـش خـوای بەرزو مەزنـە لەسـەر بەدیهێنراوەكانی، ﴿ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ﴾ واتـە: (كـە بتانباتـە خـوارەوە بـە ناخـی زەویـدا لـە كاتێكـدا كـە زەوی وەك دەریـا گێـژ بخـوات)و بتان لەرزێنـێ تا لەناوتـان بیات.

﴿ أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗا ﴾ واتە: سـزایەك لە ئاسـمانەوە بنێرێتە سەرتان بـە وورده زیخـەوەو تۆڵەتان لێ بكاتـەوە﴿ فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ ﴾ ئەو كات دەزانن هەڕەشـەی پێغەمبـەرانو كتێبەكانـی خـوا ترسـاندنی چـۆن بـوو، وا مەزانن ئاسایشـی ئێوە لە لایـەن خواوە ئەوەیـە سـزاتان بدات بە سـزادانێك لە زەویو لە ئاسـمانەوە سـوودی هەبێ بۆتان، لـە داهاتوودا دەرەنجامـی كارەكانـی خۆتـان دەبینـن، یەكسـانە ماوەیەكـی زۆر بخایەنـێ یان كـەم، بێگومان خەڵكانـی پێـش ئێـوە بێبـڕوا بـوونو بەدرۆیان زانـی وەك چۆن ئێـوە بەدرۆتان زانـی، خوا ﷻ لـە ناوی بردن، تەماشـا بكـەن چۆنە تۆڵەی خوا لەسـەریان سـزایانی پێشخسـت لە دونیـادا پێش سـزای دوارۆژ، جـا ئێـوەش ئاگـادار بن كە تووشـتان بێ وەك چـۆن ئەوان تووشـیان بوو.

(١٩): ﴿ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ فَوۡقَهُمۡ صَٰٓفَّٰتٖ وَيَقۡبِضۡنَۚ مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحۡمَٰنُۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءِۭ بَصِيرٌ ١٩ ﴾:

﴿ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ فَوۡقَهُمۡ صَٰٓفَّٰتٖ وَيَقۡبِضۡنَ ﴾ ئەمـە سەرزەنشـتو هاندانـە لەسـەر تێڕوانیـنو سـەرنجدان لـە بارودۆخی باڵنـدە كە خوا ڕامیهێنـاوە، وە كەشو هـەوای بۆ ڕامهێناوە بە ویسـتی خـۆی بـە باڵەكانی بە ئاسـمانداو دەفـڕێو دەیهێنێتەوە یەك، لە ئاسـماندا بۆ خۆی دەفـڕێو تێیدا دەگـەڕێ، بـە پێی ویسـتو پێویسـتی خـۆی﴿ مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴾ (واتـە: ڕاینەگرتووە

بـەو ئاسـمانەوە خـوا نەبـێ) بێگومان تەنها ئـەو زاتە کـەش‌و هەوای بـۆ ڕامکردوون، جەسـتەو شـێوەیانی بە جۆرێ دروسـتکردوە بتوانـن بفڕن.

جا هەر کەسـێ سـەرنجی حاڵـی باڵندە بـدات‌و تیایدا ڕابمێنێ، تواناو دەسـەڵاتی خـوای گەورەی بـۆ دەردە کـەوێ، بێگومـان ئەو زاتـە تـاک‌و تەنهایە، نابـێ بەندایەتی بکـرێ تەنها بۆ ئـەو زاتە نەبـێ، ﴿ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءِۭ بَصِيرٌ ﴾، ئـەو زاتە ڕێکخـەری کاروباری بەندە کانێتی بەوەی شـیاویانە بە پێـی حیکمەتی خۆی.

(٢٠-٢١): ﴿ أَمَّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ جُندٞ لَّكُمۡ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِۚ إِنِ ٱلۡكَٰفِرُونَ إِلَّا فِي غُرُورٍ ٢٠ أَمَّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي يَرۡزُقُكُمۡ إِنۡ أَمۡسَكَ رِزۡقَهُۥۚ بَل لَّجُّواْ فِي عُتُوّٖ وَنُفُورٍ ٢١ ﴾:

خـوا ﷻ بـە سەرکەشـانو ئەوانـەی لـە فەرمانـی دەرچـوونو پشـتیان لـە حـەق کـردوە، فەرموویەتـی: ﴿ أَمَّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ جُندٞ لَّكُمۡ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِۚ ﴾ واتـە: سـەرتان دەخات ئەگەر خـوای میهرەبـان بیەوێ زیانێکتـان لێ بدات، ئـەو بەرگـری زیانە کەتان لـێ دە کات؟ واتە: کێ یارمەتیتـان دەدات لـە سـەر دوژمنانتـان جگـە لە خـوای میهرەبـان، بە ڕاسـتی ئەو زاتـە بەرزو مەزنە تەنها خۆی سـەرخەرو دەسـەڵات پێـدەرو زەلیلکەرە، جگـە لەو لە بەدیهێنـراوە کان ئەگەر هەموویـان کۆببنەوە لەسـەر یارمەتیدانـی بەندەیەک، ئەوە بە قەد مسـقاڵە زەرەیەک سـوودی پێ ناگەیەنـن، لە سـەر هـەر دوژمنێـک بێت.

جـا بـەردەوام بوونـی بێبڕوایان لەسـەر بێبڕوایی کردنیـان، دوای ئەوەی زانیویانـە هیچ کەس نیە یارمەتیـان بـدات لە جیاتـی خوای میهرەبـان، یاخی بـوونو گەمژەییـە، ﴿ أَمَّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي يَرۡزُقُكُمۡ إِنۡ أَمۡسَكَ رِزۡقَهُۥۚ ﴾ واتـە: (ئایـا ئـەوە کێیـە ئەو کەسـەی کە ڕۆزیتـان دەدات ئەگەر خـوا ڕۆزی خۆیتـان لـێ بگرێتـەوە)، ڕزق‌و ڕۆزی هەمـووی لـە لایـەن خواوەیە، جـا ئەگـەر ڕزق‌و ڕۆزی خـۆی بگرێتەوە لێتـان، کێ هەیـە ڕزق‌و ڕۆزیتان بۆ بنێـرێ؟ بێگومان بەدیهێنـراوە کان توانایان نیـە لەسـەر ڕزق‌و ڕۆزیدانـی خۆیان، ئیتر چـۆن دەتوانـن ڕزق‌و ڕۆزی غەیری خۆیـان بدەن، جا ڕۆزیـدەرو بەخشـەری بەندە کان هیـچ نیعمەتێکیان دەسـتنا کەوێ تەنهـا لە لایـەن ئەوەوەیە، ئەو زاتە شایسـتەیە بە تـاک‌و تەنهایی بپەرسـترێ، بەڵام بێبڕوایـان ﴿ لَّجُّواْ ﴾ واتە: بـەردەوام بوون، ﴿ فِي عُتُوّٖ ﴾ واتـە: لـە دڵڕەقـی‌و نـەرم نەبوون بـۆ حـەق‌و ڕاسـتی، ﴿ وَنُفُورٍ ﴾ دوور کەوتنەوە لە ڕێگای ڕاسـت.

(٢٢): ﴿ أَفَمَن يَمۡشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجۡهِهِۦٓ أَهۡدَىٰٓ أَمَّن يَمۡشِي سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٢٢ ﴾:

واتـە: کام لـەو دوو پیـاوە ڕێنمایـی کـراوە؟ کەسـێک وێـڵ بـێ لـە گومڕاییـدا، نقـوم بێ لە

بێبڕواییــداو دڵــی داپۆشــیبێ، وە حــەقو ڕاســتی لەلای ئــەو پووچ بــێ، وە ناحەقیش حــەق بێ؟ وە کەسـێک کـە زانایێ بــە حەقو کاریگەری لەســەر کردبــێو کاری پێکاتو لەســەر ڕێگای ڕاســت بێ، لە قســەو کردەوەکانــیو هەموو بارودۆخەکانــی؟ ئنجا تەنها بە ســەرنجدانی حاڵی ئەو دوو کەســە جیــاوازی نێوانیان دەزانــرێ، ڕێنمایی کراو لــە گومــڕا، بارودۆخەکانیش گەورەترین شــایەتین لە قســەو گوفتارەکان.

(٢٣-٢٦): ﴿ قُلْ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۖ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَـٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلْ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٦﴾ ﴾:

خــوا ﷻ ڕوونــی دەکاتــەوە کە بە تەنها ئــەو پەرســتراوە، وە بەندەکانی بانگ دەکات بۆ ســتایش کردنــیو بــە تــاک دانانــی لــە پەرستشــدا، دەفەرمــوێ: ﴿ قُلْ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُمْ ﴾ واتە: ئێــوەی لە نەبوونــەوە هێناوەتــە بــوون بەبێ یارمەتیــدەرو هــاوکارێ، کاتێک دروســتی کــردوونو کامڵی کــردوون بــە گــوێو چــاوو دڵ، کە چاکترینــی ئەندامانــی جەســتەو تەواوترینیانن، بــەڵام ئێوە لەگــەڵ پێدانــی ئــەم نازونیعمەتانــەدا﴿ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴾ کەمتان شــوکرانە بژێــرن، وە کەمتان سوپاســگوزاری ئــەو زاتە دەکــەن، ﴿ قُلْ هُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: (هــەر خوایە کە ئێوەی) بــڵاو کردۆتەوە لە ســەر زەویداو نیشــتەجێی کردوون لــە دەورووبەری، وە فەرمانــی پێکردونو قەدەغــەی لێکــردون، نازو نیعمەتیشــی دابارانده بە ســەرتاندا، کــە بە هۆیەوە ســوود وەردەگرن، پاشــان دوای ئــەوە کۆتــان دەکاتەوە لــە ڕۆژی دواییدا.

بــەڵام ئــەم بەڵێنــی پاداشــتە عینــادو یاخیبــووەکان نکوڵــی لێدەکــەن، ﴿ وَيَقُولُونَ ﴾ بــە درۆی دادەنێــنو دەڵێــن: ﴿ مَتَىٰ هَـٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴾ (واتــە: ئــەم بەڵێنە بە هاتنــی ڕۆژی دوایی کــەی دەبێــت ئەگەر ڕاســت دەکەن) نیشــانەی ڕاســتگۆیی پێغەمبەرانیــان بەوە بەســتوەتەوە کە هەواڵیــان پــێ بدەن بــە کاتی هاتنی، ئەمەش ســتەمو عینادیە، بێگومــان زانینی ئــەو ڕۆژە تەنها لە لای خوایــەو لای هیــچ یەکێک لــە بەدیهێنــراوەکان نیە، هیــچ پەیوەندیەک نیە لە نێوان ڕاســتی ئــەم هەواڵــەو ڕاســتی هەواڵدان بــە کاتی هاتنــی ڕۆژی دوایــی، بێگومان ڕاســتی بــە بەڵگەکانی دەناســرێتەوە، خــوا ﷻ بەڵگەو ســەلماندنێکی زۆری هێناوەتەوە لەســەر ڕاســتی ڕۆژی دوایی، کە هیــچ گومانێــک ناهێڵێتــەوە، بۆ کەسـێک گوێ بگــرێ بۆ قورئانو بیریشــی لــەلای بێ.

فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيٓـَٔتْ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقِيلَ هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم
بِهِۦ تَدَّعُونَ ﴿٢٧﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِيَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِيَ أَوْ رَحِمَنَا
فَمَن يُجِيرُ ٱلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ قُلْ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ
ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ
﴿٢٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍ ﴿٣٠﴾

(٢٧-٣٠): ﴿ فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيٓـَٔتْ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقِيلَ هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ ﴿٢٧﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِيَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِيَ أَوْ رَحِمَنَا فَمَن يُجِيرُ ٱلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ قُلْ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍ ﴿٣٠﴾ ﴾

﴿ فَلَمَّا رَأَوْهُ ﴾ مانای ئەوەیە بەڕاستی جێگای بە درۆدانانی بێبڕوایان و یاخیبوونیان بەڕۆژی دوایی، کاتێک بوو لە ژیانی دونیادا بوون، جا کاتێ ڕۆژی دوایی دێتو سزا بە دیدە کەن، ﴿ زُلْفَةً ﴾ واتە: نزیکە لێیانەوە، پێیان ناخۆش دەبێو دەتۆقێنو دڵیان شپرزە دەبێت، ئا لەبەر ئەوە ڕووخساریان دەگۆڕێ، سەرزەنشت دەکرێن لەسەر بێبڕوایی‌و بەدرۆدانانیان، وە پێیان دەوترێ: ئەمەیە ئەو ڕۆژەی بەدرۆتان دەزانی، ئا ئەمرۆ بە چاوی خۆتان بینیوتانو ڕاستیە کەتان بۆ ڕوون بوویەوە، هەموو هۆکارە کانیش پچڕان، هیچتان بۆ نەمایەوە بێجگە لە چەشتنی سزا.
کاتێک بەدرۆدانەرانی پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی بانگەوازە کەیان ڕەت دەکردەوەو چاوەڕوانی لەناوچوونیان دەکرد، خوا فەرمانی پێکرد کە پێیان بڵێ: ئێوە ئەگەر ئاواتە کانیشتان بێتە جێ، وە خوا منو ئەوانەی لەگەڵمدان لەناو بەرێت، ئێوە هیچ سوودێکتان پێ ناگات، چونکە بێبڕوا بوون بە ئایەتو نیشانە کانی خوا، وە شایستەی سزا بوون، دەی کێ پەناتان دەدات لە سزای بە ئێش، بەڕاستی هەر دەبێ تووشتان ببێ؟ کەواتە ماندوو بوونو سوور بوونتان لەسەر لەناو چوونی من هیچ سودێکتان پێ ناگەیەنێ.
وە لە قسەکانیان بێگومان ئەوان لەسەر هیدایەتو ڕێنماییین، پێغەمبەریش لەسەر گومراییە، لەو پێناوەدا دژایەتیان کردو دەمە دەمەو کوشتاریشیان لە دژدا کرد، خوا ﷻ فەرمانی کرد بە پێغەمبەرە کەی هەواڵ بدات دەربارەی بارودۆخی، وە بارودۆخی

شـوێنکەوتووانی، کـە بـە هۆیـەوە روون دەبێتـەوە بۆ هەمـوو کەسـێ ڕێنمایـی کردنیانو خۆپارێزیـان، ئەویـش ئەوەیە کـە دەڵێـن: ﴿ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيۡهِ تَوَكَّلۡنَا ﴾ (واتـە: بڕوامان بە خوا هێنـاوە، وە هـەر بـەو پشـتمان بەسـتووە) بڕواهێنان بەڕاسـتدانانی نـاوەوە لەخـۆ دەگرێت، هەروەهـا کـردەوە پێکردنـی بە نـاخو بە ئاشـکراش.

وە کاتێـک کـە کـردەوەکان، بوونیـانو تەواوێتیان لەسـەر پشـت بەسـتن وەسـتاوە، خوا پشـت بەسـتنی تایبـەت کـردوە لە نـاو سـەرجەم کردەوەکانـدا، ئەگەرنا پشـت بەسـتنیش لەناو پێناسـەی ئیمانـدا جێی کراوەتـەوە، وەک خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٢٣ ﴾ المائدة، (واتـە: وە پشـت هـەر بـە خـوا ببەسـتن ئەگـەر ئێـوە بـڕوادارن) جـا ئەگـەر ئەمـە حاڵـی پێغەمبـەرو حاڵی شـوێنکەوتووانی بـێ، کـە بریتیە لەو حاڵەی سـەرکەوتنی لەسـەر دیاری کراوەو خۆشـیو بەختەوەری لەسـەر وەسـتاوە، وە حاڵی دوژمنانـی بـە پێچەوانەیەتـی، ئەوان نـە بڕوایان هەیەو نە پشـت بەسـتن، بەمـەش زانرا کێ ڕێنمایـی کـراوەو کێ لـە گومڕاییەکـی ڕووندایە.

پاشـان هەواڵیـداوە بـەوەی تـاکو تەنهایـە لـە بەخشـینی نازونیعمەتەکاندا، بـە تایبەت بەو ئـاوەی کـە بە هۆیـەوە هەموو شـتێکی بە زینـدوو گێـڕاوە، جا فەرموویەتـی: ﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَصۡبَحَ مَآؤُكُمۡ غَوۡرٗا فَمَن يَأۡتِيكُم بِمَآءٖ مَّعِينِۭ ﴾ (واتـە: بڵـێ: پێـم بڵێـن ئەگەر ئـاوی خواردنەوەتان ڕۆ بچـێ بـە ناخـی زەویـدادەی کـێ بێجگە لە خـوا ئـاوی زوڵاڵتان بـۆ دەردەهێنـێ)، لێی بخۆنـەوەو ئاژەڵەکانتانـی پـێ تێـر ئـاو بکـەن، وە دارودرەخـتو کشـتوکاڵەکانتان؟! ئەمە ئیسـتیفهامە بـە واتـای نەفـیو نـەرێ دێت. واتـە: کەس توانـای لەسـەر ئەوە نیـە، جگە لە خوا.

تەفسیری سوورەتی (الملک) تەواو بوو.


سورة القلم
بسم الله الرحمن الرحيم
ن والقلم وما يسطرون ① ما أنت بنعمة ربك بمجنون ② وإن
لك لأجرا غير ممنون ③ وإنك لعلى خلق عظيم ④ فستبصر
ويبصرون ⑤ بأييكم المفتون ⑥ إن ربك هو أعلم بمن ضل
عن سبيله وهو أعلم بالمهتدين ⑦ فلا تطع المكذبين
⑧ ودوا لو تدهن فيدهنون ⑨ ولا تطع كل حلاف مهين
⑩ هماز مشاء بنميم ⑪ مناع للخير معتد أثيم ⑫
عتل بعد ذلك زنيم ⑬ أن كان ذا مال وبنين ⑭ إذا تتلى عليه
ءايتنا قال أساطير الأولين ⑮ سنسمه على الخرطوم ⑯

## تەفسیری سووڕەتی (القلم)
## مەککییە (٥٢) ئایەتە
## بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە

(١-٧): ﴿ نٓ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ (١) مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ (٢) وَإِنَّ لَكَ لَأَجۡرًا غَيۡرَ مَمۡنُونٖ (٣) وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ (٤) فَسَتُبۡصِرُ وَيُبۡصِرُونَ (٥) بِأَييِّكُمُ ٱلۡمَفۡتُونُ (٦) إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ (٧) ﴾:

﴿ نٓ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ (١) مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ (٢) ﴾ خوا ﷻ سوێند دەخوات بە پێنووس، ناوی ڕەگەزە هەموو پێنووسەکان دەگرێتەوە، هەموو جۆرە زانستەکانی پێ دەنوسرێ، وە هەموو ئەو پەخشانو هۆنراوەو هەڵبەستانە، ئەویش ئەوەیە بێگومان پێنووسو ئەو دێرانەی پێی دەنووسن لەهەموو جۆرەکانی قسەکردن، لە ئایەتو نیشانە مەزنەکانی خوایە، کە شایستەی ئەوەیە سوێندی پێ بخورێ، لەسەر بەریبوونی پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ، لەوەی دوژمنانی داویانەتە پاڵی کە دەڵێن شێتە، خوا ﷻ شێتی لە پێغەمبەرەکەی ڕەت کردۆتەوە بە بەخششی خۆی لەسەری، وە چاکەکانی لەسەری بە جۆرێکە منەتی کردوە بەسەریدا بە عەقڵ تەواوی‌و بۆچوونی پەسندو قسەی یەکلاکەرەوە، ئەوە چاکترین شتە کە پێنووس خەتی بەسەردا هێنابێ‌و مرۆڤەکان نووسیبێتیان، ئا ئەمەیە بەختەوەری لە دونیادا، پاشان باسی بەختەوەری پێغەمبەرەکەی کردوە لە دوارۆژدا فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّ لَكَ لَأَجۡرًا ﴾ واتە: پاداشتێکی مەزن، هەروەک نەناسراو ئەوە دەگەیەنێ، ﴿ غَيۡرَ مَمۡنُونٖ ﴾ واتە: نەبڕاوە، بەڵکو ئەو پاداشتە بەردەوامە.

ئەویش بە هۆی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کردەوەی چاکو ڕەوشتی تەواوی پێشخستووە، بۆیە خوا ﷻ دەربارەی فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ﴾ واتە: (بە ڕاستی تۆ لە سەر ڕەوشتو خوویەکی) زۆر بەرزیت، بەرزو بڵندی بە هۆی ئەو خووڕەوشتەی کە خوا منەتی

پێکردوە بە سەرتدا.
پوختەی خوڕەوشتی مەزنی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە دایکی ئیمانداران عائیشە شیکردۆتەوە، لە وەڵامی پرسیاری کەسێک، فەرموویەتی: {كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ} (أخرجه أحمد برقم: (٢٤٦٤)، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح) واتە: خوڕەوشتی پێغەمبەر قورئان بوو، ئەویش وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ ﴾الأعراف، (واتە: دەست بگرە بە لێبوردەییەوە، چاوپۆشی بکە فەرمانیش بدە بە چاکەو چاکەکردن وە ڕوو وەرگێڕە لە نەفامانو نەزانان (وازیان لێ بێنە)).
﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ﴿١٥٩﴾ ﴾آل عمران، (واتە: بە هۆی بەزەیی خواوەیە بۆ ئەوان نەرمو نیان بووی)، ﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾التوبة، (واتە: سوێند بە خوا بەڕاستی بۆتان هاتووە پێغەمبەرێک لە خۆتان قورسو گرانە بەلایەوە نارەحەتیو ناخۆشی ئێوە زۆر سوورە لەسەر ئیمان هێنانتان بۆ بڕواداران دڵسۆزو میهرەبانە).
وێنەی ئەوانەش لەو بەڵگەو نیشانانەی لەسەر وەسف کردنی پێغەمبەر ﷺ بە ڕەوشتی بەرز، وە ئەو بەڵگەو نیشانانەی کە هاندەرن لە سەر خووڕەوشتی جوانو مەزن، پێغەمبەر ﷺ خاوەنی تەواوترینو گەورەترینیان بوو، لە هەر بەشێک لەو ڕەوشتانەدا لە لوتکەو چڵە پۆپەدا بوو.
پێغەمبەر پیاوێکی ئاسانو نەرمو نیان بوو، نزیک بوو لە خەڵکەوە، هەر کەسێک بانگی بکردایە وەڵامی دەدایەوە، هەر کەسێک داوای دادوەری بکردایە دادوەری بۆ دەکرد، دڵی ئەو کەسەی ڕازی دەکرد کە داوای لێدەکرد، بێبەشی نەدەکردو بەدەستی بەتاڵ نەیدەگەڕاندەوە. ئەگەر هاوەڵانی شتێکیان لێ بویستایە لەگەڵیاندا ڕێک دەهات، وە شوێنیان دەکەوت ئەگەر جێگای مەترسی نەبووایە، ئەگەر سور ببوایە لەسەر کارێ تەنها بە بۆچوونی خۆی کارەکەی نەدەکرد، بەڵکو ڕاوێژی پێیان دەکرد، ﴿ فَسَتُبْصِرُ وَيُبْصِرُونَ ﴿٥﴾ بِأَييِّكُمُ ٱلْمَفْتُونُ ﴾ (واتە: جا بەم زووانە تۆشو ئەوانیش دەبینن * کە کامتان شێتن)، بەڕاستی ڕوون بوویەوە پێغەمبەر ﷺ ڕێنماییکارترین کەسە، وە تەواوترینیانە بۆ خۆیو جگە لە خۆی، دوژمنانیشی گومڕاترین کەسن، خراپترینی ناو خەڵکن، وە بێگومان ئەوان بەندەکانی خوایان تووشی فیتنە کردو گومڕایان کردن لە ڕێگا ڕاست، زانستی خوا بەسە بەوە، بەڕاستی ئەو پاداشتدەرەی بێ سنوورە.
﴿ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴾ (واتە: خوا زاناترە بەو کەسەی

ڕاستی خوای وون کردبێ، وە ئەو زاناترە بەو کەسانەی کە ڕێی ڕاستیان گرتووە) ئەمەش هەڕەشەیەکی توندی تێدایە بۆ گومڕاکانو پەیمانیشە بۆ ڕێنماییکاران، ڕوونکردنەوەشە بۆ حیکمەتی خوا، کاتێ ڕێنمایی کەسێک دەکات بێگومان گونجاوە بۆ ڕێنمایی جگە لە کەسێکی تر.

(٨-١٦): ﴿ فَلَا تُطِعِ الْمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ وَدُّوا لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴿٩﴾ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّاءٍ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ عُتُلٍّ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ ﴿١٤﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ آيَاتُنَا قَالَ أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿١٥﴾ سَنَسِمُهُ عَلَى الْخُرْطُومِ ﴿١٦﴾ ﴾:

خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تُطِعِ الْمُكَذِّبِينَ ﴾ (واتە: گوێڕایەڵی ئەوانە مەکە) کە بە درۆت دەزانن‌و عینادی حەق دەکەن، بەڕاستی ئەوانە شیاوی ئەوە نین گوێڕایەڵی بکرێن، چونکە فەرمان ناکەن بەوە نەبێ گونجاوە لەگەڵ هەواو ئارەزووەکانیان، ئەوان هیچیان ناوێ جگە لە باتڵ نەبێ، جا ئەوەی گوێڕایەڵیان دەکات تووشی ئەوە دەبێ کە زیانی هەیە بۆی، ئەمەش گشتگیرە بۆ هەموو بەدرۆدانەرێ، وە بۆ هەموو گوێڕایەڵێک کە لە بەدرۆدانانەوە سەرچاوەی گرتبێ، ئەگەرچی مانای دەقەکە دەربارەی شتێکی تایبەتیە، ئەویش ئەوەیە هاوبەشدانەران داوایان کرد لە پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بێت لە باسکردنی ناتەواویو کەم‌و کوڕی پەرستراوەکانیان، ئەوانیش لە بەرانبەردا بێدەنگ دەبن لە ئاستی ئەو، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَدُّوا ﴾ واتە: هاوبەشدانەران (حەزیان دەکرد)، ﴿ لَوْ تُدْهِنُ ﴾ واتە: نەرمی نیشان بدەیت لەسەر هەندێ لەوەی ئەوان لەسەری دەڕۆن، یان بە قسەکردن یان بە کردەوە، یاخود بە بێدەنگ بوون لەوەی پێویستە قسەی تێدا بکرێ، ﴿ فَيُدْهِنُونَ ﴾ (واتە: ئەوسا ئەوانیش نەرمی بەرانبەرت دەنوێنن)، بەڵام فەرمانی خوا بڵاوبکەوەو ئاینی ئیسلام ئاشکرا بکە، چونکە بەڕاستی ئاشکرا کردنی بە تەواوەتی، دژەکەی هەڵدەوەشێنێتەوە. ﴿ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ ﴾ واتە: (گوێڕایەڵ مەبە بۆ هیچ) کەسێکی زۆر سوێند خۆر، بێگومان هیچ کەس وا نابێت مەگەر کەسی درۆزن، وە نابێ بە درۆزن مەگەر ئەو کەسە، ﴿ مَّهِينٍ ﴾ واتە: ڕیسواو نەفس نەزم، کەم عەقڵ، هیچ حەزێکی بۆ خێر ناجوڵێ، بەڵکو ویست‌و ئیرادەی بۆ ئارەزووەکانی نەفسە سووک‌و ڕیسواکەی دەجوڵێ.

﴿ هَمَّازٍ ﴾ واتە: پیتک زۆر لە خەڵک دەردەکات‌و تانەیان لێ دەدات، بە باسکردنی پاشەملەو گاڵتەپێکردن‌و جگە لەوانیش.

﴿ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٖ ﴾ واتە: قسە لە نێوان خەڵكدا دەهێنێ‌و دەبات بە نەمیمە كردن، ئەویش بریتیە لە گواستنەوەی قسەی هەندێ بۆ هەندێكی دیكە بە مەبەستی تێكدانی نێوانیان، وە دروستكردنی شەڕو ئاشووب‌و ڕق‌و كینە.
﴿ مَّنَّاعٖ لِّلۡخَيۡرِ ﴾ (واتە: زۆر ڕێگریكەر لە چاكە) پێویستە لەسەری پێی هەستێت لەو بەخشین‌و نەفەقانەی كە پێویستن، وە ئەو كەفارەت‌و زەكاتانەش‌و جگە لەوانیش، ﴿ مُعۡتَدٍ ﴾ ستەم لە خەڵكی دەكات لە خوێن‌و ماڵ‌و سامان‌و نامووسەكان ﴿ أَثِيمٍ ﴾ واتە: خاوەن گوناهی زۆرە كە پەیوەستن بە مافەكانی خواوە ﴿ عُتُلِّۭ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ﴾ واتە: دڵ ڕەق‌و درندەو نارەسەن، هەرگیز مل نادات بۆ حەق ﴿ زَنِيمٍ ﴾ واتە: باوك نادیاری بێ بنچینە، شتێكی تێدانیە خێری لێ بەرهەم بێت، بەڵكو ڕەوشتی خراپترین ڕەوشتە، ئومێدی چاكەی لێناكرێ، نیشانەی شەڕو خراپەی پێوەیەو بە هۆیەوە دەناسرێ.
پوختەی ئەمە ئەوەیە، خوا ﷻ گوێڕایەڵی هەموو سوێند خۆرێكی درۆزنی قەدەغەكردوە، نەفس نزمی ڕەوشت ناشرین، بە تایبەت ئەو ڕەوشتانەی سەرسام بوون بە نەفس‌و لووت بەرزی لەسەر حەق‌و لەسەر خەڵكی‌و بە كەم دانانیان بە غەیبەت‌و قسەهێنان‌و بردن‌و تانەدان لێیان‌و ئەنجامدانی گوناهی زۆر لە خۆ دەگرێ.
ئەم دەقانە ئەگەرچی دەربارەی هەندێ لە هاوبەشدانەران دابەزی، وەكو وەلیدی كوڕی موغیرە، یان غەیری ئەو، وەك دەربارەی دەفەرموێ: ﴿ أَن كَانَ ذَا مَالٖ وَبَنِينَ ١٤ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾، واتە: بە هۆی زۆری ماڵ‌و سامان‌و منداڵی، یاخی بوو، خۆی بە گەورە زانی لە ئاستی حەقدا، كاتێ حەق هات ڕەتی كردەوەو بە ئەفسانەی پێشین تەماشای كرد، دیارە ئەفسانەش دەگونجێ بەڕاست دابنرێ یان بە درۆ، بێگومان ئەم قورئانە گشتگیرە بۆ هەركەسێ بەم شێوەیە وەسف كرابێت، چونكە قورئان دابەزیوە بۆ هیدایەتی هەموو خەڵكی، هەموو ئۆممەت دەچنە ناویەوە یەكەمین تا كۆتایی، لەوەیە هەندێ لەو دەقانە دابەزیبن دەربارەی هۆكارێك، یان كەسێك لە كەسەكان، بۆ ئەوەی یاسا گشتیەكەی پێ ڕوون ببێتەوە، وە ئەو پەندو بەشانەی پێ بناسرێتەوە كە لە ناو بابەتە گشتیەكاندان.
پاشان خوا هەڕەشەی كردوە لەو كەسەی ئەوەی لێ ڕوو دەدات كە خوا وەسفی كردوە، بەوەی خوا سەر لووتی داخ دەكات لە سزادا، بۆ ئەوەی سزای بدات بە سزایەكی ئاشكرا، تا ببێتە نیشانە لە خراپترین‌و بەدبەخترین شتەكاندا لەسەری، ئەویش ڕوخساریەتی.

إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا۟ لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ ﴿١٧﴾ وَلَا
يَسْتَثْنُونَ ﴿١٨﴾ فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿١٩﴾ فَأَصْبَحَتْ
كَٱلصَّرِيمِ ﴿٢٠﴾ فَتَنَادَوْا۟ مُصْبِحِينَ ﴿٢١﴾ أَنِ ٱغْدُوا۟ عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ
صَٰرِمِينَ ﴿٢٢﴾ فَٱنطَلَقُوا۟ وَهُمْ يَتَخَٰفَتُونَ ﴿٢٣﴾ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا ٱلْيَوْمَ عَلَيْكُم
مِّسْكِينٌ ﴿٢٤﴾ وَغَدَوْا۟ عَلَىٰ حَرْدٍ قَٰدِرِينَ ﴿٢٥﴾ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓا۟ إِنَّا لَضَآلُّونَ
﴿٢٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٢٧﴾ قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ
﴿٢٨﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ
يَتَلَٰوَمُونَ ﴿٣٠﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ ﴿٣١﴾ عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا
خَيْرًا مِّنْهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ
أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٣٤﴾
أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ لَكُمْ
كِتَٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ ﴿٣٧﴾ إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَكُمْ أَيْمَٰنٌ عَلَيْنَا
بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۙ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ ﴿٣٩﴾ سَلْهُمْ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ
زَعِيمٌ ﴿٤٠﴾ أَمْ لَهُمْ شُرَكَآءُ فَلْيَأْتُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٤١﴾ يَوْمَ
يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾

**(١٧-٣٣):** ﴿ إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا۟ لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ ﴿١٧﴾ وَلَا يَسْتَثْنُونَ ﴿١٨﴾ فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿١٩﴾ فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ ﴿٢٠﴾ فَتَنَادَوْا۟ مُصْبِحِينَ ﴿٢١﴾ أَنِ ٱغْدُوا۟ عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰرِمِينَ ﴿٢٢﴾ فَٱنطَلَقُوا۟ وَهُمْ يَتَخَٰفَتُونَ ﴿٢٣﴾ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا ٱلْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ ﴿٢٤﴾ وَغَدَوْا۟ عَلَىٰ حَرْدٍ قَٰدِرِينَ ﴿٢٥﴾ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓا۟ إِنَّا لَضَآلُّونَ ﴿٢٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٢٧﴾ قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ ﴿٢٨﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَلَٰوَمُونَ ﴿٣٠﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ ﴿٣١﴾ عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا۟ لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ ﴿١٧﴾ وَلَا يَسْتَثْنُونَ ﴾ واتـە: ئێمـە ئەو بێبـڕوا بەدرۆدانەرانەمان تاقیکـردەوە بـە خێـر، وە مۆڵەتمـان پێدانو بە ویسـتی خۆمـان زیاد لە ویشـمان پێبەخشـین، لـە مـاڵو منـداڵو تەمەن درێـژیو وێنـەی ئەوانە، کە لەگـەڵ هـەواو ئارەزوویانـدا دەگونجا، نـەک بـە هـۆی ڕێزیـان لەلامـان، بەڵکو هەنـدێ جار ئـەوە قۆناغ بـە قۆناغە، لـەو ڕووەی کە پێـی نازانـن، جا هەڵخەڵەتاویـان بە ماڵو منداڵ، هـەر وەک هەڵخەڵەتـاوی خاوەنی دوو باخەکە وایـە، ئەوانەی لـەو باخەکەدا بەشـدار بوون کاتێـک بەرهەمەکەی پێگەیشـتو وەختی چنینی هـات، وە دڵنیـا بـوون لـەوەی ئـەو باخـە لـە دەسـتی ئەواندایەو لـە ژێـر فەرمانیاندایـە، هیچ ڕێگریـەک لـە بەردەمیانـدا نیـە ڕێیان لـێ بگرێت.

ئـا لەبـەر ئەمـە لەو کاتـەدا سـوێندیان خـوارد بەبـێ جیاکردنـەوە، کـە بـە دڵنیایـی ئـەوان باخەکەیـان لـە بـەرە بەیانـدا دەچننەوە، بـەڵام نەیانزانی خوا لە بۆسـەدایە بۆیـان، وە لە جێگای ئـەوە خوا سـزا دەهێنـێ بەسـەر باخەکەیانـدا، ﴿ فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ ﴾ واتە: سـزایەک لە شـەودا دابـەزی بەسـەر باخەکـەدا، ﴿ وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴾ (لە کاتێکدا ئـەوان خەوتبـوون) خوا تەفرو تونـای کـردو لـە نـاوی بـرد، ﴿ فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ ﴾ واتـە: وەک شـەوێکی تاریکـی لێهات،

درەختەکان بەرهەمەکەیان نەما، ئەمەش لە کاتێکدا بوو ئەوان نەیاندەزانی ئەم رووداوە روویداوە، بۆیە بە پەلە لە بەرەبەیاندا یەکتریان بانگ کرد: ﴿ أَنِ اغْدُوا عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَارِمِينَ ﴿٢٢﴾ فَانطَلَقُوا ﴾ (واتە: هەستن بچن بۆ سەر باخەکەتان) ئەگەر مەبەستانە بیچنن (ئنجا کەوتنە رێ)، ﴿ وَهُمْ يَتَخَافَتُونَ ﴾ (واتە: ئەوان بە چرپە) لەناو یەکتریدا بە یەکیان دەوت بە رێگری کردنی مافی خوا: ﴿ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا الْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ ﴾ واتە: بەیانیان کردەوە پێش بڵاوبوونەوەی خەڵکی، یەکتریان ئاگادار کردەوە بە رێگری کردنی هەژارو نەدارەکان لەو باخە، وە لە سەختی سووربوونو رەزیلیان ئەوان لەناو یەکتردا بە چپە چپ قسەیان دەکرد، بۆ ئەوەی هیچ کەس دەنگیان نەبیستێو هەژاران ئاگادار بکاتەوە.

﴿ وَغَدَوْا ﴾ بەیانیان کردەوە بەم حاڵەتە ناشرینو دڵرەقیو بێ رەحمیە، ﴿ عَلَىٰ حَرْدٍ قَادِرِينَ ﴾ واتە: (پێیان وابوو) دەتوانن رێگری لە مافی خوا بکەن بۆ هەژاران، جەختیان کردەوە بە تواناو دەسەڵاتی خۆیان لەسەری، ﴿ فَلَمَّا رَأَوْهَا ﴾ (کە باخەکەیان دی) لە سەر ئەو وەسفەی خوا باسی کردبوو، وەک باخێکی چنراو، ﴿ قَالُوا ﴾ بە سەرسامیو بێزاریەوە وتیان: ﴿ إِنَّا لَضَالُّونَ ﴾ واتە: ئێمە وونمان کردوە لەوەیە ئەمە باخی ئێمە نەبێ، بەڵام کاتێ لێیان کۆڵیەوەو عەقڵیان هاتە جێگای خۆیان، ﴿ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴾ (نەخێر بەڵکو بەش براو کراوین) لێی، ئەو کات زانیان ئەمە سزاو تۆڵەیە.

﴿ قَالَ أَوْسَطُهُمْ ﴾ واتە: دادپەروەرترینو ژیرترینیان وتی: ﴿ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ ﴾ (واتە: مەگەر پێم نەووتن بۆچی) یادو سوپاسی خوا ناکەن بەوەی شیاویەتی، لەوانەش گومانتان وابوو کە توانای ئێوە سەربەخۆیە، جا ئەگەر هەژارانتان لێی بێبەش نەکردایەو بتان وتبایە: (إن شاء الله) وە ویستو ئیرادەی خۆتانتان شوێنی ویستی خوا خستبایە، ئەوەی کە روویدا روووینەدەدا.

﴿ قَالُوا سُبْحَانَ رَبِّنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ ﴾ واتە: (هەموویان وتیان پاکو بێگەردی بۆ پەروەردگارمان بێگومان ئێمە خۆمان ستەمکارین) دوای ئەوە هەستیان کرد، بەڵام دوای ئەوەی سزای خوا هات بەسەر باخەکەیاندا کە بەرز نابێتەوە.

بەڵام دەگونجێ ئەم یادکردنەوەیانو دانپێدانانیان لە سەر نەفسی خۆیان بە ستەم، سوودی هەبێ، بۆیان بۆ سووککردنەوەی گوناهو تەوبەی راستەقینە، ئا لەبەر ئەمە پەشیمان بوونەوە بە پەشیمان بوونەوەیەکی مەزن.

﴿ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَلَاوَمُونَ ﴾ (واتە: ئنجا روویان کردە یەکتری بە سەرزەنشت

كـردن) لـه‌وه‌ی كـه ئه‌نجامیـان داو كردیـان، ﴿ قَالُواْ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ ﴾ واتـه: ئێمـه زێده‌ڕۆ بوویـن لـه مافی خـواو مافـی به‌نـده‌كان، ﴿ عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ ﴾ ئه‌وان ئومێدیـان بـه خـوا هه‌بـوو، خوا ﷻ لـه جیاتی ئه‌و باخـه باشـتریان بداتـێ، وه به‌ڵێنیانـدا ئه‌وان ته‌نهـا ڕووده‌كه‌نـه خوا لـه دونیادا.

جـا ئه‌گـه‌ر ئـه‌وان به‌و شـێوه بووبن كه وتیـان به ڕواڵـه‌ت خوا ﷻ لـه دونیادا بـۆی گۆڕیوون لـه‌و باخـه بـه چاكتر، چونكه هه‌ر كه‌سـێ به‌ڕاسـتی داوا لـه خوا بـكات‌و ئومێدی پێـی هه‌بێ، خوا داواكاریه‌كـه‌ی جێبه‌جێ ده‌كات.

خـوا ﷻ ئـه‌وه‌ی ڕوویـدا ڕوونـی كـردوه‌وه فه‌رمـووی: ﴿ كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ ﴾ واتـه: ئه‌وه سـزای خوایـه لـه دونیـادا بـۆ كه‌سـێ هۆكاره‌كانـی بهێنێ، خـوا ئه‌و شـته‌ی لـێ وه‌رده‌گـرێ كه به هۆیـه‌وه یاخیبـوه‌و له سـنوور ده‌رچووه، وه ژیانـی دونیای هه‌ڵبـژارد، خوا لێـی داده‌ڕنێ ئه‌وه‌ی زۆر پێویسـتی پێیه‌تی.

﴿ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ﴾ (واتـه: وه سـزای ڕۆژی دوایـی گه‌وره‌تـره) لـه سـزای دونیا، ﴿ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴾ (ئه‌گـه‌ر ده‌یانزانـی) بێگومـان هـه‌ر كه‌سـێک ئه‌مـه بزانێ پێویسـت ده‌بێ له‌سـه‌ری دوور بكه‌وێتـه‌وه لـه هه‌مـوو هۆكارێـک كـه ده‌بێته مایـه‌ی پێویسـت بوونی سـزاو تۆڵه.

(٣٤-٤١): ﴿ إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٣٤﴾ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ لَكُمْ كِتَٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ ﴿٣٧﴾ إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَكُمْ أَيْمَٰنٌ عَلَيْنَا بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ ﴿٣٩﴾ سَلْهُمْ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ ﴿٤٠﴾ أَمْ لَهُمْ شُرَكَآءُ فَلْيَأْتُواْ بِشُرَكَآئِهِمْ إِن كَانُواْ صَٰدِقِينَ ﴿٤١﴾ ﴾:

واتـه: خـوا ﷻ هـه‌واڵ ده‌دات بـه‌وه‌ی ئامـاده‌ی كـردوه بـۆ پارێـزكاران، ئه‌وانـه‌ی خۆیـان ده‌پارێـزن لـه كوفـرو سـه‌رپێچی، لـه جۆره‌هـا نازونیعمـه‌ت‌و ژیانـی خـۆش له دراوسـێیه‌تی به‌خشـنده‌ترینی به‌خشـنده‌كان، حیكمه‌تـی خوا ﷻ ئـه‌وه ناخوازێ كه‌سـانی خۆپارێـزو ملكه‌چ بـه فه‌رمانه‌كانـی، شـوێنكه‌وتووی ڕه‌زامه‌ندیه‌كانـی، وه‌كو بـه‌دكاران بن، ئه‌وانـه‌ی ڕۆچوون له سـه‌رپێچی كردنیـداو بێبڕواییـان به ئایه‌ته‌كانـی كردوه، نكوولێشـیان لـه پێغه‌مبه‌رانی كردوه‌و دژی دۆسته‌كانی وه‌ستانه‌ته‌وه.

هه‌ر كه‌سـێک وا گومان ببات خوا یه‌كسـانیان ده‌كات له پاداشـتدا، به‌ڕاسـتی ئـه‌وه حوكمێكی خراپـی داوه بێگومان حوكمه‌كه‌ی حوكمێكی پووچه‌و بۆچوونه‌كه‌شـی ناپه‌سـندو خراپه.

بـه ڕاسـتی تاوانبـاران ئه‌گه‌ر بانگه‌شـه‌ی ئه‌وه بكـه‌ن، ئه‌وه هیچ پشـتیوانێكیان نیه، نـه كتێبێک تیایـدا بخوێننـه‌وه، و نه دڵنیابن كه خه‌ڵكی به‌هه‌شـتن، وه ئه‌وه‌ی داوایان كـردوه‌و هه‌ڵیانبژاردوه

بۆیان هەبێ.

وە پەیمـانو بەڵێنـی بەهێزیـان نیـە لە لای خوا تـا ڕۆژی دوایی کـە هەرچی بیانـەوێ بڕیاری لەسـەر بـدەن، وە هاوبیرو هاوبەشو پشـتیوانیان نیە لەسـەر بەدەسـتهێنانی ئـەوەی دەیانەوێت، جـا ئەگـەر هاوبـەشو پشـتیوانیان هەیە دەبـا بیانهێنن ئەگـەر ڕاسـت دەکەن، ئـەوەی زانراوە هەمـوو ئەوانـە ڕەتکراونەتەوە، ئەوان نە هیچ کتێبێکی ئاسـمانیان هەیە، وە نـە هیچ پەیمانێکیان هەیـە لەلای خـوا ڕزگاریان بـکات، وە نەهاوبەشو هاوبیریـان هەیە پشـتیوانیان لێبکات، بۆیە زانرا بێگومـان بانگەوازەکەیان پـووچو بەتاڵە.

خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ سَلْهُمْ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ ﴾ واتـە: (بپرسـە لێیان بزانـە) کامیان زامنی ئـەم بانگـەوازە خراپـەن، بێگومـان هیـچ کـەس ناتوانێ قسـەی لـەو جـۆرە بـکات، وە ببێتە زامنـکار تیایدا.

(٤٢-٤٣): ﴿ يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾ خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ وَقَدْ كَانُوا۟ يُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمْ سَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾

واتـە: ئەگـەر ڕۆژی دوایـی هـات تـرسو ناخۆشـیو نارەحەتیـەکان دەرکەوتن، کـە ناچێتە چوارچێـوەی خەیاڵەوە، وە خـوا ﷻ هات بۆ یەکلاکردنـەوەی بەندەکانیو پاداشـت دانەوەیان، لـەو ڕۆژەدا لاقـی پیـرۆزی دەرخسـت، کە هیچ شـتێک لـەو ناچێـت، وە بەدیهێنـراوەکان لە مەزنـی خـوا شـتانێکیان بینـی کە مـرۆڤ ناتوانێ دەریببـڕێ، جا ئـەو کاتە بانـگ دەکرێن بۆ سـوژدە بردن.

جـا بڕواداران سـوژدە دەبـەن ئەوانەی کە لـە دونیادا بە ویسـتو ئارەزووی خۆیان سـوژدەیان بـردووە، تاوانبـارانو دوو ڕووەکان دەچـن بـۆ سـوژدە بـردن، ناتوانن سـوژدە ببەن، پشـتیان وەکو پشـتی مانگـای لێدێت بـە هیچ شـێوەیەک ناتوانـن بچەمێننەوە.

ئـەم پاداشـتە بەپێـی کردەوەکانیانە، ئەوان لـە دونیادا بانگ دەکران بۆ سـوژدە بـردن بۆ خواو یەکتاپەرسـتیو بەندایەتـی کردنـی، کاتێک کە لەش سـاغ بـوون، هیچ نەخۆشـیەکیان نەبوو، بـەڵام لـووت بەرزیـان دەکرد لە ئاسـتیداو پشـت گوێیان دەخسـت، ئەمـڕۆ پرسـیار مەکە لە حاڵیـان، وە دەرەنجامـی خراپیـان، چونکە بەڕاسـتی خـوا لێیان تووڕە بووەو سـزای لەسـەریان پێویسـت کـردوە، وە هەمـوو هۆکارەکانیان پچـڕاوە، پەشـیمانیو بیانوو هێنانەوە لـەو ڕۆژەدا هیـچ سـوودێکیان پێ ناگەیەنـێ، ئا ئەمە دڵـەکان بێـزار دەکات بە هۆی سـەرپێچیەکانەوە، وە ئامـادە بوون پێویسـت دەکات بە پێـی توانا.

خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ وَقَدۡ كَانُواْ يُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمۡ
سَٰلِمُونَ ٤٣ فَذَرۡنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِۖ سَنَسۡتَدۡرِجُهُم
مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ ٤٤ وَأُمۡلِي لَهُمۡۚ إِنَّ كَيۡدِي مَتِينٌ ٤٥ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ
أَجۡرٗا فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ ٤٦ أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ
٤٧ فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ
وَهُوَ مَكۡظُومٞ ٤٨ لَّوۡلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعۡمَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ لَنُبِذَ بِٱلۡعَرَآءِ
وَهُوَ مَذۡمُومٞ ٤٩ فَٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ
٥٠ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَيُزۡلِقُونَكَ بِأَبۡصَٰرِهِمۡ لَمَّا سَمِعُواْ
ٱلذِّكۡرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجۡنُونٞ ٥١ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ٥٢

(٤٤-٤٥): ﴿ فَذَرۡنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِۖ سَنَسۡتَدۡرِجُهُم مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ ٤٤ وَأُمۡلِي لَهُمۡۚ إِنَّ كَيۡدِي مَتِينٌ ٤٥ ﴾:

﴿ فَذَرۡنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ ﴾ واتــە: (خــوا دەفەرمــوێ:) وازم لێبێنــە بــۆ ئەوانــەی قورئانــی پیــرۆز بــەدرۆ دادەنێــن، بێگومــان لــەلای منــە ســزای ئــەوان، تــۆ هیــچ پەلەیەکیــان لــێ مەکــە، ﴿ سَنَسۡتَدۡرِجُهُم مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ (واتــە: بەرەبــەرە کێشــیان دەکــەم بــە جــۆرێ کــە پێــی نەزانــن) جــا پێیــان دەبەخشــین بــە مــاڵو منــداڵ، وە بۆیــان زیــاد دەکەیــن ڕزقو ڕۆزی بــۆ ئــەوەی پێــی هەڵبخەڵەتێــنو بــەردەوام بــن لەســەر ئــەوەی زیانــی هەیــە بۆیــان، ئەمــە لــە پیلانــی خوایــە بــۆ ئــەوان، پیلانــی خــواش بــۆ دوژمنانــی تۆکمــەو بەهێــزە، ســزایان دەدات بــە ســزادانێکی ســەختو بــە ئێــش.

﴿ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ أَجۡرٗا فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ ﴾ واتــە: ڕاکردنــی ئــەوان لــە تــۆو بــە ڕاســت دانەنانــی ئــەو پەیامــەی کــە هێناوتــە لەبــەر ئــەوە نیــە تــۆ داوای کرێیــان لێدەکەیــت، بێگومــان تــۆ فێریــان دەکەیــتو بانگیــان دەکەیــت بــۆ لای خــوا، تەنهــا لەبــەر بەرژەوەندیەکانیــان، بەبــێ ئــەوەی داوای مــاڵو ســامانەکانیان بکەیــت، ئــەوان پێــی قەرزاربــار بــنو گــران بێــت بەســەریانەوە.

﴿ أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ ﴾ (واتــە: یــان ڕووپــەڕەی غەیبیــان لەلایــە ئــەوان لەبــەری دەنووســنەوە) هیــچ غەیــبو پەنهانێکیــان لــەلا نیــە، تــا ببینــن لەســەر حەقــنو پاداشــتیان بــۆ هەیــە لــەلای خــوا؟! بەڵکــو حاڵیــان حاڵــی کەســێکی عینــادو ســتەمکارە، هیــچ نەماوەتــەوە جگــە لــە ئارامگرتــن لەســەر ئەزیەتدانیــانو ئۆقــرە گرتــن لەســەر ئەوانــەی لێیانــەوە دەردەچــێ، وە بــەردەوام بوونیــان لەســەر بانگەوازەکەیــان، لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ ﴾ واتــە: لــەوەی پەروەردگــارت بڕیــاری پــێ دەدات بــە

شەرع‌و بە قەدەر، جا بڕیاری قەدەری کەسی ئەزیەتدراو ئارام دەگرێ لەسەری، وە خۆی تووشی تووڕەیی‌و شپرزەیی‌و پەستی ناکات، وە بڕیاری شەرعی ڕوو بەڕووی دەبێتەوە بە قبووڵ کردن‌و تەسلیم بوونی، وە ملکەچی تەواو بۆ فەرمانەکانی.

دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلْحُوتِ ﴾ (واتە: وەکو هاوڕێی نەهەنگەکە مەبە) ئەویش یونسی کوڕی مەتا بوو ﵇ واتە: خۆت مەشوبهێنە بەو لەو حاڵەتەی کە گەیاندی بەوەو وای لێکرد بە بەندکراوی لە زگی نەهەنگەکەدا بمێنێتەوە، ئەویش ئارام نەگرتنی بوو لەسەر گەلەکەی، ئەو ئارامگرتنەی داواکرابوو لێی، وە ڕۆیشت‌و جێی هێشتن بە هۆی تووڕەبوونی لەبەر پەروەردگاری، تا سواری کەشتیەک بوو، خاوەنانی کەشتیەکەش بە هۆی بارگرانی کەشتیەکەیانەوە، قورعەیان کرد بۆ ئەوەی دانەیەکیان فڕێ بدەنە ناو دەریاکەوەو باری کەشتیەکەیان سووک بێت، جا لە قورعەکەدا ناوی یونس ﵇ دەرچوو، ﴿ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾ ﴾ الصافات، (واتە: خرایە دەریاکەو ئینجا نەهەنگێک قووتیدا ئەویش شایەنی سەرزەنشت بوو).

دەفەرموێ: ﴿ إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ ﴾ واتە: یونس ﵇ لە سکی نەهەنگەکەدا بوو نەهەنگەکە پیشی لێ خواردبووەوە، یان بانگی کرد گرنگی پێدراو بوو بەوەی کە وتی: ﴿ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ الأنبیاء، (واتە: ئەی خوایە! بە ڕاستی هیچ پەرستراوێک نیە بە هەق جگە لە تۆ، پاکی‌و بێگەردی بۆ تۆ، وە من لە ستەمکاران بووم).

خوا دووعاکەی لێوەرگرت، پاشان نەهەنگەکە لە ناو سکیەوە فڕێی دایە سەر زەویەکی ڕووتەوە لە کاتێکدا ئەو نەخۆش بوو، وە خوا ﷻ ڕووەکێکی کولەکەی بەسەریدا ڕوواند لەبەر ئەمەیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ لَّوْلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعْمَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ لَنُبِذَ بِٱلْعَرَآءِ ﴾ واتە: (ئەگەر میهرەبانیەک لە لایەن پەروەردگاریەوە فریای نەکەوتایە) فڕێ دەدرایە زەویەکی ڕووت‌و چۆڵەوە، ﴿ وَهُوَ مَذْمُومٌ ﴾ (وە ئەو بەد ناو دەبوو)، بەڵام خوا ﷻ بە میهرەبانی خۆی دایپۆشی، فڕێیدا ئەو ستایشکراو بوو، وە حاڵی چاکتر بوو لە جاری یەکەم، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ فَٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ ﴾ واتە: هەڵیبژاردووەو پاڵفتەی کردووەو پاکی کردوەتەوە لە هەموو کەم‌و کوڕیەک.

﴿ فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ واتـە: (کـردی بـە) یەکێـک لەوانـەی کـردەوەو قسـەو نیـەتو بارودۆخیـان چـاک بـووە، پێغەمبەرمـان موحەممـەد ﷺ فەرمانبـەرداری پەروەردگـاری بـوو، ئارامـی گـرت لەسـەر بڕیـاری پەروەردگـاری بـە ئارامگرتنێـک هیـچ کـەس لـە جیهانـدا پێـی ناگـات.

خـوا ﷻ دەرەنجامـی پێبەخشـی، ﴿ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ ﴾الأعـراف (واتـە: دەرەنجـام تەنهـا بـۆ خۆپارێزانـە) دوژمنەکانـی نەیتوانـی پێـی بگـەن تەنهـا خۆیـان زیانبـار دەبـوون.

تەنانـەت ئـەوان سـوور بـوون لەسـەر ئـەوەی هەڵیبخلیسـکێنن، واتـە: بـە هـۆی حەسـوودیو ڕقو کینـەی دڵیانـەوە چـاوی لێـدەن، ئەمـە ئەوپـەڕی توانایـان بـوو لـە ئازاردانـی پێغەمبـەر ﷺ بـە کـردار، بێگومـان خـوا پارێـزەرو سـەرخەریەتی، هەرچـی ئازاردانـی گوفتاریشـە، بـە ویسـتی خۆیـان هەرچـی بهاتایـە بـە دڵیانـدا درێغیـان نەدەکـرد، جـارێ دەیانـوت شـێتە، جارێکـی تـر جادووگـەرە، جارێکـی تـر شـاعیرە.

خـوا ﷻ فەرمـووی: ﴿ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾ واتـە: ئـەم قورئانـەو یـادە مەزنـە تەنهـا ئامۆژگاریـە بـۆ هەمـوو جیهـان، ئامۆژگـاری یەکتـری پێدەکـەن هەرچـی پەیوەنـدی هەیـە بـە بەرژەوەندیەکانـی دیـنو دونیایـان.

تەفسیری سوورەتی (القلم) تەواو بوو.


سورة الحاقة
بسم الله الرحمن الرحيم
الحاقة ① ما الحاقة ② وما أدراك ما الحاقة ③ كذبت ثمود وعاد بالقارعة ④ فأما ثمود فأهلكوا بالطاغية ⑤ وأما عاد فأهلكوا بريح صرصر عاتية ⑥ سخرها عليهم سبع ليال وثمنية أيام حسوما فترى القوم فيها صرعى كأنهم أعجاز نخل خاوية ⑦ فهل ترى لهم من باقية ⑧

## تەفسیری سوورەتی (الحاقة)

## مەککییە (٥٢) ئایەتە

## بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە

(١-٨): ﴿ ٱلۡحَآقَّةُ ۝١ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ۝٢ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ۝٣ كَذَّبَتۡ ثَمُودُ وَعَادُۢ بِٱلۡقَارِعَةِ ۝٤ فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهۡلِكُواْ بِٱلطَّاغِيَةِ ۝٥ وَأَمَّا عَادٞ فَأُهۡلِكُواْ بِرِيحٖ صَرۡصَرٍ عَاتِيَةٖ ۝٦ سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗاۖ فَتَرَى ٱلۡقَوۡمَ فِيهَا صَرۡعَىٰ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ ۝٧ فَهَلۡ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٖ ۝٨ ﴾:

﴿ ٱلۡحَآقَّةُ ﴾ یەکێکە لە ناوەکانی ڕۆژی دوایی، چونکە حەقو ڕاستەو بەسەر خەڵکیدا دێت، حەقیقەتی شتەکان تیایدا دەردەکەوێ، وە ئەوانەیشی لە ناو سنگەکاندا شاراونەتەوە. خوا ﷻ پلەو پایەی بە مەزن داناوەو بە گەورە ڕایگرتووە بەوەی دووبارەی کردۆتەوە، وەک فەرموویەتی: ﴿ ٱلۡحَآقَّةُ ۝١ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ۝٢ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ﴾ بە ڕاستی پلەو پایەیەکی مەزنو مەترسیەکی گەورەی هەیە، لە مەزنیەکانی ئەوەیە خوا گەلە بێبڕواو بەدرۆدانەرەکانی پێشووی لەناو بردوە بە سزای پێشخراو، پاشان باسی نموونەی ڕۆژی دوایی کردوە کە لە دونیادا دەبینرێ، ئەویش ئەو سزا بە ئێشەیە کە حەڵاڵی کردوە بۆ ئەو گەلە لە سنوور دەرچووانە، جا فەرموویەتی: ﴿ كَذَّبَتۡ ثَمُودُ ﴾ ئەوانیش گەلێک بوون ناسراو بە دانیشتووانی حیجر، ئەوانەی خوا پێغەمبەرەکەی خۆی بۆیان نارد بە ناو صالح ﷺ، ڕێگری لێدەکردن لەوەی لەسەری دەڕۆیشتن لە هاوبەشدانان، وە فەرمانی پێدەکردن بە یەکتاپەرستی، ئەوانیش بانگەوازەکەیان ڕەت کردەوەو بەدرۆیان زانی، وە ئەوەشیان بەدرۆزانی کە دەربارەی ڕۆژی دوایی باسی کردبوو، ئەویش ئەو دەنگە ترسناکەیە کە خەڵکی لەناو دەبات.

وە بەهەمـان شـێوە گەلـی عـادی یەکەمیـش دانیشـتوانی حضرموت، کاتێـک خـوا پێغەمبەرەکـەی هـوود ﷺ نـارد بـۆ ناویـان، بانگی دەکـردن بـۆ بەندایەتی خـوای تاکو تەنهـا، ئـەوان بەدرۆیـان زانـی، وە هەواڵی ڕۆژی دوایشـیان بـەدرۆ زانی، خـوا ﷻ ئەم دوو گەلـەی بـە سـزای پێشـخراو لەنـاو بـرد، ﴿ فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُواْ بِٱلطَّاغِيَةِ ﴾ (واتـە: ئنجـا گەلـی ثمود نەناوبـران بـە نەعرەتەیەکی زۆر گـەورە) ئەویـش دەنگێکی مەزنـی گەورەی ترسـێنەر، دڵەکانیانـی لەت کردوو ڕۆحەکانیشـیان چـوو، هەموویان مردن، جگـە لە خانوو لاشـەکانیان هیچـی تـر نەدەبینرا.

﴿ وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُواْ بِرِيحٍ صَرْصَرٍ ﴾ (واتـە: وە گەلـی عادیـش لەنـاو بران بـە بایەکی) زۆر سـەختی سـارد، دەنگێکـی هەبـوو تیژتر لە دەنگـی هەورە بروسـکە، ﴿ عَاتِيَةٍ ﴾ واتە: ئەوەنـدە بەتیـن بوو لە ژێـر فەرمانی فریشـتەکانیش دەرچـوو، یان توندی بەسـەر عادا هات زیـاد لە پێویسـت، کـە ئەمە بۆچوونـی تەواوە.

﴿ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا ﴾ واتـە: نەگبەتـیو نارەحەتـی ترسـێنەر لـە سـەریان، لەنـاوی بـردنو فەوتاندنـی ﴿ فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ ﴾ واتـە: بێگیـان بـە مردوویـی کەوتبوون، ﴿ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴾ وەک قەدی دارخورمایەک کە سـەری براییتـەوەو هەندێکی کەوتبێ بەسـەر هەندێکی دیکـەدا، ﴿ فَهَلْ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٍ ﴾ (واتە: ئایـا کـەس دەبینیـت کە لـەوان مابێتـەوە) ئەمەش ئیسـتیفهامە بـە مانای نەفـی دێت.

وَجَآءَ فِرْعَوْنُ وَمَن قَبْلَهُۥ وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتُ بِٱلْخَاطِئَةِ ﴿٩﴾ فَعَصَوْا۟ رَسُولَ
رَبِّهِمْ فَأَخَذَهُمْ أَخْذَةً رَّابِيَةً ﴿١٠﴾ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ حَمَلْنَٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ
﴿١١﴾ لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً وَتَعِيَهَآ أُذُنٌ وَٰعِيَةٌ ﴿١٢﴾ فَإِذَا نُفِخَ فِى ٱلصُّورِ
نَفْخَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ وَحُمِلَتِ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً ﴿١٤﴾
فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِىَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ
﴿١٦﴾ وَٱلْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَا ۚ وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ
﴿١٧﴾ يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ﴿١٨﴾ فَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ
بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقْرَءُوا۟ كِتَٰبِيَهْ ﴿١٩﴾ إِنِّى ظَنَنتُ أَنِّى مُلَٰقٍ حِسَابِيَهْ
﴿٢٠﴾ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٢١﴾ فِى جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿٢٢﴾ قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ ﴿٢٣﴾
كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔا بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِى ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ ﴿٢٤﴾ وَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ
كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُوتَ كِتَٰبِيَهْ ﴿٢٥﴾ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ
﴿٢٦﴾ يَٰلَيْتَهَا كَانَتِ ٱلْقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنِّى مَالِيَهْ ۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّى سُلْطَٰنِيَهْ
﴿٢٩﴾ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلْجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِى سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا
سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَٱسْلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٣٣﴾
وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣٤﴾ فَلَيْسَ لَهُ ٱلْيَوْمَ هَٰهُنَا حَمِيمٌ ﴿٣٥﴾

**(٩-١٢):** ﴿وَجَآءَ فِرۡعَوۡنُ وَمَن قَبۡلَهُۥ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتُ بِٱلۡخَاطِئَةِ ﴿٩﴾ فَعَصَوۡاْ رَسُولَ رَبِّهِمۡ فَأَخَذَهُمۡ أَخۡذَةٗ رَّابِيَةً ﴿١٠﴾ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلۡمَآءُ حَمَلۡنَٰكُمۡ فِي ٱلۡجَارِيَةِ ﴿١١﴾ لِنَجۡعَلَهَا لَكُمۡ تَذۡكِرَةٗ وَتَعِيَهَآ أُذُنٞ وَٰعِيَةٞ ﴿١٢﴾﴾:

﴿وَجَآءَ فِرۡعَوۡنُ وَمَن قَبۡلَهُۥ﴾ واتە: بەهەمان شێوە جگە لەم دوو ئوممەتە یاخیە: عادو ثموود، جگە لەوان خەڵكانێكی تریش هاتن لە یاخیو سەركەشەكان، وەكو فیرعەونی میسر، خوا بەندەو پێغەمبەرەكەی خۆی كە مووسای كوڕی عیمران ﷺ بوو نارد بۆ لایان، بەبەڵگەو نیشانەی زۆر ڕوونەوە، كە بە هۆیەوە حەقی پێ بناسن، بەڵام ئەوان نكووڵیان كردو بێبڕوا بوون، بە هۆی ئەوەی ستەمكارو خۆ بەزلزان بوون، هەر بەو جۆرە گەلانی پێش فیرعەونیش لە بەدرۆدانەران هاتن: ﴿وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتُ﴾ واتە: شاری لووط ﷺ هەموویان هاتن: ﴿بِٱلۡخَاطِئَةِ﴾ واتە: بە سەركەشیو یاخی بوون، ئەویش بێبڕواییو بەدرۆدانانو ستەمو نكووڵیە، وە ئەوەشی دراوەتە پاڵ ئەوانە لە هەموو جۆرەكانی گوناهو سەرپێچی، ﴿فَعَصَوۡاْ رَسُولَ رَبِّهِمۡ﴾ (واتە: بێ فەرمانی پێغەمبەری پەروەردگاریان كرد) ئەمەش ناوی ڕەگەزە، واتە: هەموو ئەوانە پێغەمبەرەكەیان بەدرۆ داناوە كە خوا ناردبووی بۆ ناویان.

ئنجا خوا هەموویانی گرت ﴿أَخۡذَةٗ رَّابِيَةً﴾ واتە: بە گرتنێكی لە ڕادە بەدەر، بە هۆیەوە لەناو چوونو تەفرو توونا بوون، لە كۆی ئەو لەناوچووانە گەلی نووح ﷺ بوو، خوا لە دەریادا نوقمی كردن كاتێ ئاوەكە بەرز بوویەوە لەسەر ڕووی زەویو سەركەوت بەسەر شوێنە بەرزەكاندا، خوا منەتی خۆی كرد بەسەر خەڵكانی دوای ئەواندا كە هەڵیگرتن لە ﴿فِي ٱلۡجَارِيَةِ﴾ ئەویش ئەو كەشتیە بوو، لە پشتی باپیرانیانو داپیرانیاندا هیشتنیەوە، ئەوانە خوا ڕزگاری كردن، دەی كەوابوو ستایشی خوا بكەن كە ڕزگاری كردن كاتێ یاخیبووەكانی لەناو برد، وە پەند لەو ئایەتو نیشانانە وەربگرن كە بەڵگەن لەسەر یەكتاپەرستی ئەو زاتە،

ئا لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ لِنَجۡعَلَهَا ﴾ واتە: کەشتی، مەبەست لە ڕەگەزیەتی، بۆ ئێوە ﴿ تَذۡكِرَةٗ ﴾(بیرهێنەرەوەیەک) دروستکردنی یەکەم کەشتیتان بیر بخاتەوە، وە چیرۆکەکەی چیە، وە چۆن خوا ئەوانەی ڕزگار کرد کە بڕوایان پێهێناو شوێنی پێغەمبەرەکەی کەوتن، وە هەموو خەڵکی سەر زەوی لەناو بردن بە گشتی.

دەفەرموێ: ﴿ وَتَعِيَهَآ أُذُنٞ وَٰعِيَةٞ ﴾ واتە: بۆ ئەوەی خاوەن دڵو ژیرەکان پەندی لێوەربگرن، وە لە مەبەستی کەشتیەکە تێبگەن، ئەمەش بە پێچەوانەی خەڵکانی بێئاگاو پشت تێکەر، وە خەڵکانی گەمژەو گێلو تەوەزەل، بەڕاستی ئەوانە پەند لە ئایەتو نیشانەکانی خوا وەرناگرن، ئەویش بە هۆی بێئاگاییو وشیاریان دەربارەی خوا، وە بیر کردنەوەیان لە ئایەتو نیشانەکانی خوا.

(١٣-١٨): ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ نَفۡخَةٞ وَٰحِدَةٞ ١٣ وَحُمِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةٗ وَٰحِدَةٗ ١٤ فَيَوۡمَئِذٖ وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ١٥ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِيَ يَوۡمَئِذٖ وَاهِيَةٞ ١٦ وَٱلۡمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرۡجَآئِهَاۚ وَيَحۡمِلُ عَرۡشَ رَبِّكَ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ ثَمَٰنِيَةٞ ١٧ يَوۡمَئِذٖ تُعۡرَضُونَ لَا تَخۡفَىٰ مِنكُمۡ خَافِيَةٞ ١٨ ﴾

﴿ فَإِذَا نُفِخَ ﴾ کاتێ خوا ﷻ باسی ئەوەی کرد کە چی بەسەر ئەوانەدا هێنا کە پێغەمبەرانیان بە درۆ دەزانی، وە چۆن تۆڵەی لێکردنەوە، هەر لە دونیادا سزای بۆ پێش خستن، وە پێغەمبەرانو شوێنکەوتوانیانی ڕزگار کرد، ئا ئەمە پێشەکیەک بوو بۆ باسکردنی پاداشتی دوارۆژ، وە وەرگرتنی مافی خۆیان لە ڕۆژی قیامەتدا.

ئنجا باسی کاروبارە ترسێنەرەکان دەکات کە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕوودەدەن، جاری یەکەم ئەوەیە کە ئیسرافیل فوو دەکات ﴿ فِي ٱلصُّورِ ﴾ (بە صووردا) کاتێ جەستەکان کامڵ دەبن ﴿ نَفۡخَةٞ وَٰحِدَةٞ ﴾ (واتە: بە تاقە فوو کردنێک) ڕووحەکان دەردەچن، هەموو ڕووحێک دەچێتەوە ناو جەستەیەوە، جا کتو پڕ خەڵکی هەموویان دەوستن لە خزمەتی پەروەردگاریان.

﴿ وَحُمِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةٗ وَٰحِدَةٗ ﴾ واتە: کێوەکان لەتو پەت بوونو پەرشو بڵاو بوونەوەو تێکەڵ بوون بەناو زەویدا، بڵاوەیان کرد لەسەر زەوی، هەموویان ڕێکو ساف بوون هیچ جۆرە بەرزیو نزمیەکیان تێدا نابینی، زەوی بەو جۆرەی لێدەکرێ، وە ئەوەشی لەسەریەتی.
ئنجا ئەوەی بەسەر ئاسماندا دێت، بێگومان دەشێوێو زۆر بە توندی دەکەوێتە لەقە لەقو لەت لەت دەبێو ڕەنگی دەگۆڕێ، دوای ئەو بەهێزیە مەزنەی هەیەتی سستو لاواز دەبێت، ئەوەش دیارە بە هۆی کارێکی مەزنەوەیە کە سەغڵەتی کردوە، وە ناخۆشیەکی پڕ لە مەترسی، لاوازی کردوە.

﴿ وَٱلْمَلَكُ ﴾ واتە: فریشتە بەڕێزەکان ﴿ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَا ﴾ واتە: لە تەنیشتی ئاسمانو پایەکانی، ملکەچی مەزنی پەروەردگاریانن.

﴿ وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ ﴾ (واتە: وە لەو ڕۆژەدا هەشت فریشتە تەختی پەروەردگاری تۆ هەڵ دەگرێ لە ژوور هەموو فریشتەکانی ترەوە)، کۆمەڵە فریشتەیەکن لەوپەڕی بەهێزدان، کاتێ خوا دێت بۆ جیاکردنەوە لە نێوان بەندەکانو دادوەری کردنیان، بە دادپەروەریو چاکەی خۆی.

بۆیە فەرموویەتی: ﴿ يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ ﴾ (واتە: لەو ڕۆژەدا هەمووتان نیشان دەدرێن) لەبەردەم خوادا، ﴿ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ﴾ (واتە: هیچ کردەوەیەکی پەنهانیتان بە نهێنی نامێنێتەوە) نە لە جەستەتاندا، نە لە خودی خۆتاندا، نە لە کردەوەکانتانو نە لە سیفەتەکانتان، چونکە بە ڕاستی خوا زانای پەنهانو ئاشکرایە، بەندەکان کۆدەکاتەوە بە ڕووتو پێی پەتیو خەتەنە نەکراوی لە زەویەکی ڕاستدا، بانگکەر دەیانبیستێو چاو دەیانبینێ، ئا ئەو کاتە پاداشتیان دەداتەوە بەوەی کردوویانە، لەبەر ئەمەیە باسی چۆنیەتی پاداشتی کردووەو فەرموویەتی:

(١٩-٢٤): ﴿ فَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقْرَءُوا۟ كِتَٰبِيَهْ ﴿١٩﴾ إِنِّى ظَنَنتُ أَنِّى مُلَٰقٍ حِسَابِيَهْ ﴿٢٠﴾ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٢١﴾ فِى جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿٢٢﴾ قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ ﴿٢٣﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِى ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ ﴿٢٤﴾ ﴾:

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ ﴾ ئەوانە خەڵکانی بەختەوەرن، کتێبەکانیان بە دەستی ڕاستیان پێ دەدرێت کە کردەوە چاکەکانیانی تێدایە، بۆ ئەوەی جیابکرێنەوەو ستایشی پلەو پایەیان بکرێو ڕێزیان لێ بگیرێ، کەسێکیان لەو کاتەدا بە هۆی ئەو خۆشیو شادیەوە حەز دەکات خەڵکی ئاگادار بێت بەو منەتو ڕێزەی خوا ﷻ کردوویەتی بەسەریدا، دەڵێ: ﴿ هَآؤُمُ ٱقْرَءُوا۟ كِتَٰبِيَهْ ﴾ واتە: ئا ئەمەیە کتێبەکەم بیخوێننەوە، بە ڕاستی مژدەی بەهەشتانێکی تێدایە، وە جۆرەها ڕێزو لێخۆشبوونی گوناهەکانو داپۆشینی کەمو کوڕیەکانمی تێدایە.

ئەوەیشی منی گەیاند بەم حاڵە فەزڵو منەتی خوا بوو بەسەرمەوە، لە بڕوا بوون بە زیندوو کردنەوەو لێپرسینەوەو خۆ ئامادە کردن بۆی، وە کردەوە بۆ کردنی بەپێی توانا، لە بەرئەمەیە دەڵێ: ﴿ إِنِّى ظَنَنتُ أَنِّى مُلَٰقٍ حِسَابِيَهْ ﴾ واتە: دڵنیابووم، جا (الظن) لێرەدا بە مانای: دڵنیایی دێت.

﴿ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴾ (واتە: ئەو کەسە لە ژیانێکی پەسنددا دەبێ)، واتە: کۆکەرەوەی هەموو ئەوانەیە کە نەفسو دەروون حەزی لێدەکەنو چاو لەزەتی لێدەبینێ، بێگومان پێی ڕازی

بوون، وە هیچی دیکەی بەسەردا هەڵنابژێرن، ﴿ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴾ (واتە: لە بەهەشتێکدا) خانوو باڵەخانەکانی زۆر بەرزن.

﴿ قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ ﴾ واتە: میوەکانی لە جۆرەها میوەن، زۆر نزیکن لە خاوەنەکانیانەوە، هەرچۆنێ بیانەوێ دەستیان پێدەگات، بە پێوەبێ، یان بە دانیشتن، یان بە پاڵدانەوە.

بە ڕێزگرتنەوە پێیان دەوترێ: ﴿ كُلُوا وَاشْرَبُوا ﴾ واتە: (بخۆن‌و بخۆنەوە) لە هەموو خواردمەنیەکی خۆش‌و بە لەزەت‌و خواردنەوەی بەتام ﴿ هَنِيئًا ﴾ واتە: بە تەواوەتی بەبێ نارەحەتی‌و ناخۆشی، ئەویش پاداشتێکە دەستەبەر بووە بۆیان، ﴿ بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَةِ ﴾ (واتە: بە هۆی ئەو چاکانەوە کە لە ڕۆژانی ڕابردوودا کردووتانە) لە کردەوە چاکەکان‌و وازهێنان لە کردەوە خراپەکان: لە نوێژو ڕۆژو زەکات‌و حەج‌و چاکە لەگەڵ بەدیهێنراوەکانداو یادکردنی خواو گەڕانەوە بۆ لای، جا خوا ﷻ کردەوەکانی کردۆتە هۆکارێک بۆ چوونە ناو بەهەشت‌و بنچینەیەک بۆ بەختەوەریەکانی.

(٢٥-٣٧): ﴿ وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيَهْ ﴿٢٥﴾ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ ﴿٢٦﴾ يَا لَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَا أَغْنَىٰ عَنِّي مَالِيَهْ ۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيَهْ ﴿٢٩﴾ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ إِنَّهُ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ ﴿٣٤﴾ فَلَيْسَ لَهُ الْيَوْمَ هَاهُنَا حَمِيمٌ ﴿٣٥﴾ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ ﴿٣٦﴾ لَا يَأْكُلُهُ إِلَّا الْخَاطِئُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾

دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ ﴾ ئەوانە خەڵکانی بەدبەخت‌و خراپەکارن، کتێبی کردەوە خراپەکانیان دەدرێت بەدەستی چەپیانەوە، بۆ ئەوەی جیابکرێنەوەو سەرشۆڕو ڕیسواو سەرکۆنە بکرێن، جا یەکێکیان بە هۆی خەم‌و پەژارەو بێزاریەوە دەڵێ: ﴿ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيَهْ ﴾ (واتە: خۆزگە هەر نامەم نەدرایەتێ)، چونکە مژدەی پێدراوە بە چوونە ناو ئاگرو زەرەرمەندی هەتا هەتایی، ﴿ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ ﴾ واتە: خۆزگە من هەر لەبیر نەبووایەم، وە زیندوو نەکرایەمەوەو لێپرسینەوەم لەگەڵ نەکرایە، وە لەبەر ئەمەیە دەڵێ: ﴿ يَا لَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ ﴾ واتە: خۆزگە مردنم مردنی یەکجارەکی بووایە، دوای ئەوە زیندوو نەکرامایەوە، پاشان لادەکاتەوە بە لای ماڵو سامانەکەیدا تەماشا دەکات بوون بە بەڵا بە سەریەوە، هیچیشی لەو ماڵە پێش نەخستووە بۆ دوارۆژی، ئەو ڕۆژە ئەگەر هەرچی هەیە بیبەخشێ لە پێناو ئەوەی ڕزگاری بێ لە سزا هیچ سوودێکی پێ ناگەیەنێ، جا دەڵێ: ﴿ مَا أَغْنَىٰ عَنِّي مَالِيَهْ ﴾ واتە: (سامانەکەم، ماڵەکەم) هیچ سوودێکی پێ نەگەیاندم، نە لە دونیادا شتێکم بۆ خۆم پێش خست،

نە لە دوارِۆژیشدا چونکە کاتی نەماوە.
﴿ هَلَكَ عَنِّى سُلْطَٰنِيَهْ ﴾ (واتە: لە دەستم چوو دەسەڵاتەکەم) رِۆیشتوو پەرش‌و بڵاو بوویەوە، نە سەربازی زۆرو، نە ژمارەو، نە ناوبانگی گەورە سوودی پێنەگەیاند، بەڵکو هەموو ئەوانە بە با چوو، وە بە هۆیەوە بازرگانی‌و قازانجەکان لە دەست چوون، لە بری ئەوانەدا خەم‌و خەفەت‌و پەژارە جێی گرتەوە.
جا ئەو کاتە فەرمان دەکرێ بە سزادانی، ئنجا بە (الزبانية) فریشتەی زەبر بە دەستی زۆر رەق‌و توورە دەوترێ: ﴿ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴾ واتە: زنجیر بکەن بە دەست‌و گەردنی، ﴿ ثُمَّ ٱلْجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴾ واتە: فرِێی بدەنە ناو دۆزەخەوەو بیسوتێنن، ﴿ ثُمَّ فِى سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا ﴾ (واتە: ئنجا بە زنجیرێکی حەفتا گەزی) لە زنجیرەکانی دۆزەخ کە لەوپەرِی گەرمیدان بیبەستنەوە، ﴿ فَٱسْلُكُوهُ ﴾ واتە: بیبەستنەوە تیایدا، بیخەنە کۆمیەوە لە دەمیەوە دەربچێ‌و بەو جۆرەش هەڵبواسرێ. بەردەوام بەم جۆرە ناشرینە سزا دەدرێ، ئای چی سزایەکی خراپە!! ئاخ هەڵکێشان بۆ ئەو کەسەی کە بەو جۆرە سەرکۆنە دەکرێت‌و سزا دەدرێت (چەندە قورسە؟!!) بێگومان ئەو هۆکارەی ئەوی گەیاندە ئەو جێگایە: ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ ٱلْعَظِيمِ ﴾ واتە: چونکە بێگومان ئەو برِوای بە خوای گەورە نەدەکرد، بەوەی بێبرِوا بوو بە پەروەردگاری‌و عینادی‌و نکوولی پێغەمبەرانی دەکرد، ئەوەی کە هێناویانە لە حەق‌و راستی رەتی دەکردەوە.
﴿ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴾ واتە: لە دڵیدا سۆزو میهرەبانی نەبوو کە رەحمی بجوڵێنێ بەرانبەر بە هەژاران‌و نەداران، لە ماڵ‌و سامانی خۆراکی پێ نەدەدان، وە هانی خەڵکیشی نەدەدا لە سەر هاوکاری‌و یارمەتیدانیان، چونکە ترسی خوا لە دڵیدا نەبوو.
ئەویش لە بەر ئەوەیە چەقی بەختەوەری‌و کرِۆکەکەی بریتین لە دوو شت: دڵسۆزی بۆ خوا ﷻ، کە بنچینەکەی برِواهێنانە بە خوا، وە چاکەکردنە لەگەڵ خەڵکیدا بە هەموو جۆرەکانی چاکە، کە لە مەزنترینیان پرِکردنەوەی کەم‌و کورِی هەژارانە، بە خۆراک پێدانیان، ئا ئەوانەش نە دڵسۆزیان هەیەو نە چاکە، ئا لەبەر ئەوەیە شایستەی ئەو سزایەن، ﴿ فَلَيْسَ لَهُ ٱلْيَوْمَ هَٰهُنَا ﴾ واتە: لە رِۆژی دوایی، ﴿ حَمِيمٌ ﴾ واتە: نزیک یان هاورِێ تکای بۆ بکات بۆ ئەوەی رزگاری بێت لە سزای خوا، یان پاداشتی خوا بەدەست بێنێ، ﴿ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ ﴿٢٣﴾ ﴾سبأ، (واتە: وە تکا کردن لای خوا سوودی نیە مەگەر بۆ کەسێ خوا رِێی پێ بدات)، ﴿ مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ ﴿١٨﴾ ﴾غافر، (واتە: ستەمکاران نە هیچ دۆستێکیان هەیە، وە نە تکاکارێک بە گوێی بکرێ).

وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ (٣٦) لَّا يَأْكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلْخَٰطِـُٔونَ (٣٧) فَلَآ أُقْسِمُ
بِمَا تُبْصِرُونَ (٣٨) وَمَا لَا تُبْصِرُونَ (٣٩) إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ (٤٠) وَمَا هُوَ
بِقَوْلِ شَاعِرٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ (٤١) وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ
(٤٢) تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ (٤٣) وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ (٤٤)
لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ (٤٥) ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ (٤٦) فَمَا مِنكُم
مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ (٤٧) وَإِنَّهُۥ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ (٤٨) وَإِنَّا
لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ (٤٩) وَإِنَّهُۥ لَحَسْرَةٌ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ
(٥٠) وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلْيَقِينِ (٥١) فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ (٥٢)

وه هیــچ خۆراکێکــی بــۆ نیــه، ﴿إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ﴾ ئەویش کێمو زوخــاوی خەڵکانی نــاو ئاگــرە لــە ئەوپــەڕی گەرمیدایــە، بۆنێکی زۆر ناخۆشــی هەیــە، زۆر ناخۆش‌و تاڵــە، کــەس ئــەم خواردنــە پیســە ناخوات مەگــەر ئەوانــە نەبــێ کــە ڕێگای ڕاســتیان هەڵەکــردووەو ڕێگاکانــی دۆزەخیان گرتۆتە بــەر، ئــا لەبــەر ئەوەیە شایســتەی ســزای بە ئێشن .

(٥٢-٣٨): ﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ (٣٨) وَمَا لَا تُبْصِرُونَ (٣٩) إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ (٤٠) وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ (٤١) وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ (٤٢) تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ (٤٣) وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ (٤٤) لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ (٤٥) ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ (٤٦) فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ (٤٧) وَإِنَّهُۥ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ (٤٨) وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ (٤٩) وَإِنَّهُۥ لَحَسْرَةٌ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ (٥٠) وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلْيَقِينِ (٥١) فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ (٥٢) ﴾:

﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ (٣٨) وَمَا لَا تُبْصِرُونَ (٣٩) إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ (٤٠) وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ (٤١) وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ (٤٢) تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ (٤٣) وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا ﴾ خــوا ﷻ ســوێندی خــواردوە بــەوەی بەدیهێنــراوەکان دەیبینــن لــە هەمــوو شــتەکان، ئەوەشــی کــە نایبینــن، هەمــوو بەدیهێنراوەکان دەچنــە ناو ئەمەوە، بەڵکو نەفســی پاکی خــوای گەورەش، لەســەر ڕاســتی پێغەمبەر ﷺ بــەوەی هێناویەتی لەم قورئانــە پیرۆزە، وە پێغەمبــەری بەڕێز ﷺ پەیامی خــوای بــەرزی گەیاندووە.

خــوا ﷻ پێغەمبەرەکــەی پــاک ڕاگرتــووە لــەوەی دوژمنانی داویانەتــە پاڵــی، گوایە ئەو ﷺ شــاعیرە یــان جادووگــەرە، ئــەوەی پاڵــی پێوەنــان لەســەر ئــەوە بڕوانەبــوون‌و ئامۆژگاری وەرنەگرتنیــان بــوو، خــۆ ئەگەر ئــەوان بڕوایــان بهێنایــەو ئامۆژگاریــان وەربگرتایــە، ئەوە دەیانزانــی چــی ســوودیان پێدەگەیەنێ‌و چــی زیانیــان لێدەدات.

وە لەوانــە: بــا تەماشــای حاڵــی موحەممــەد ﷺیــان بکردایــەو، ورد بوونایەتەوە لە وەســفــو ڕەوشــتەکانی، ئــەو کات شــتێکیان دەبینــی وەکــو خــۆر، ڕێنیشــاندەریان دەبــوو لەســەر ئــەوەی موحەممــەد ﷺ نێــردراوی ڕاســتەقینەیە، وە ئەوەیشــی هێناویەتــی نێــردراوە لەلایەن پەروەردگــاری جیهانیانــەوە، شــیاو نیــە قســەی مــرۆڤ بــێ، بەڵکو ئــەو قورئانە قســەیەکە بەڵگەیــە لەســەر مەزنی ئــەو زاتەی قســەی پێکــردوە، وە گەورەیــی وەســفەکانیو تەواوی بەڕێوەبردنــی بەندەکانــی، وە بــەرز بوونــەوەی لەســەرووی هەمــوو بەندەکانــی، هەروەهــا بێگومــان ئەمــە گومانێــک بــوو لــە لایــەن ئەوانەوە، شــیاو نیــە بە خــواو کار دروســتی ئەو زاتە.

بە ڕاســتی ئەگــەر موحەممــەد ﷺ بــە دەم ئێمەوە قســەیەک هەڵبەســتێ، ﴿ بَعۡضَ ٱلۡأَقَاوِيلِ ﴾ هەندێــک قســەی درۆ، ﴿ لَأَخَذۡنَا مِنۡهُ بِٱلۡيَمِينِ ۝٤٥ ثُمَّ لَقَطَعۡنَا مِنۡهُ ٱلۡوَتِينَ ﴾ ئەویش شــا دەمارێکە بەســتراوە بــە دڵــەوە، ئەگەر بپچــڕێ مرۆڤ بــە هۆیــەوە دەمرێ.

جــا ئەگــەر وادابنــرێ پێغەمبــەر ﷺ -خــوا نــەکاو شــتی وا هەرگیــز نابــێ- بــەدەم خــواوە قســەیەک هەڵبەســتێ، ئــەوە بێگومان خوا ســزای بــۆ پێش دەخــات، جا تۆڵەی لێ دەســێنێ بــە تۆڵەســەندنی کەســێکی زاڵــی بــە توانــا، چونکــە کاربەجێیە توانــای هەیە بەســەر هەموو شتێکدا.

حیکمــەتو کاردروســتیو دانایــی وادەخــوازێ مۆڵەتــی ئــەو کەســە نــەدات درۆ دەکات بەناویــەوە، ئــەوەی کــە پێی وایە خــوا ﷻ خوێنوماڵــی دوژمنانی بــۆی بــە ڕەوا بینیوە، وە ئــەوو شــوێنکەوتووانی لــە ڕزگــار بووانــن، هەر کەســێکیش پێچەوانــەی بکات ئــەوە لەناو دەچێت.

جــا ئەگــەر خــوا پشــتیوانی لــە پێغەمبەرەکەی کردوە بــە موعجیــزەو بەڵگەی ڕوون لەســەر ڕاســتی ئــەو پەیامــەی هێناویەتــی، وە سەرخســتنی بەســەر دوژمنانیــدا، ئــەوە گەورەتریــن شــایەتیە لەســەر ڕاســتی پەیامەکــەی، وە دەفەرمــوێ: ﴿ فَمَا مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ عَنۡهُ حَٰجِزِينَ ﴾ واتە: ئەگــەر خــوا لە نــاوی ببات نە خــۆی دەتوانێ بەرگــری لە نەفســی خۆی بــکات، وە نە هیچ کەســێ دەتوانــێ ڕێگــری ســزای خوای لــێ بکات.

﴿ وَإِنَّهُۥ ﴾ واتــە: قورئانــی پیــرۆز ﴿ لَتَذۡكِرَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴾ (ئامۆژگاریو پەندە بــۆ خۆپارێزان) ئامۆژگــاری پێوەردەگــرن بــە بەرژەوەندیەکانــی دیــنو دونیایان، جــا دەیناســنەوەو کاری پــێ دەکــەن، یادیــان دەخاتــەوە بیــرو بــڕواو ئاینیــەکانو ڕەوشــتە بــەرزەکانو حوکمــە

شـەرعیەکان، ئنجـا دەبـن بـە زانایانـی خوانـاس‌و بەنـدە عاریفـەکان‌و پێشـەوای ڕێنمایی کـراوان، ﴿ وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ ﴾ (واتـە: بێگومـان ئێمـە دەزانیـن کـە هەندێکتـان قورئـان بـەدرۆ دەزانـن)، ئەمـە هەڕەشـەکردنی تێدایـە بـۆ بـەدرۆ دانـەران، بێگومـان خوا سـزایان دەدات لەسـەر بە درۆ دانانیان، بە سـزادانێکی بە ئێش ﴿ وَإِنَّهُۥ لَحَسْرَةٌ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾ (واتـە: وە بێگومـان ئـەم قورئانـە هـۆی پەشـیمانی بێبڕوایانـە) ئـەوان کاتـێ بێبـڕوا بوون پێـی، وە بینیـان ئـەوەی خـوا پەیمانـی پێدابوون، پەشـیمان دەبنـەوەو ئاخ هەڵدەکێشـن کە ڕێنماییـان وەرنەگرتـوەو ملکەچـی فەرمانەکانـی نەبـوون، جـا پاداشـتیان لەدەسـت چوو، وە گەیشـتن بـە سـەخترین سـزاو هەمـوو هۆکارەکانیـان پچـڕا، ﴿ وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴾ واتە: بەرزتریـن پلەکانی زانسـت، بێگومـان بەرزترین پلەکانی زانسـت دڵنیاییە، ئەویش زانسـتی جێگیـرو چەسـپاوە، کـە نالەقـێ‌و ناکەوێتـە جوڵەو لاناچـێ. وە یەقیـن‌و دڵنیایی سـێ پلەو پایـەن، هـەر یەکەیان لـەوی پێشـوو بەرزترە.

یەکـەم: زانسـتی دڵنیـا بەخشـە، ئەویـش بریتیە لەو زانسـتەی لە هـەواڵو دەقەوە سـەرچاوە دەگرێ.

دووەم: چاوی ڕاستەقینە: ئەویش ئەو زانستەیە بە هەستەوەری چاو دەبینرێ.

سـێیەم: حەقـی دڵنیـا بەخـش: ئەویش ئەو زانسـتەیە بە هەسـتەوەری تام کردن‌و ڕاسـتەوخۆ هەسـتی پـێ دەکرێـت، ئەم قورئانـە مەزنە بەم وەسـفە بێگومـان تیایدایە لەو زانسـتانەی کە پشـت بەسـتن بـە بەڵگـەو سـەلماندنی یەکلاکـەرەوە، وە تیایدایە لـەو حەقیقـەت‌و زانیاریە ئیمانیانـە، هەر کەسـێک بگاتـە حەقی دڵنیابەخـش چێژی لـێ وەردەگرێت.

﴿ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴾ واتـە: خـۆت بـە پـاک ڕابگـرە لـەوەی شـیاو نیە بـە مەزنی ئەو زاتـە، وە بـە گـەورەی ڕابگرە بـە یادکردنی وەسـفە مـەزن‌و جـوان‌و تەواوەکانی.

تەفسیری سووڕەتی (الحاقة) تەواو بوو.


بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
سَأَلَ سَآئِلُۢ بِعَذَابٖ وَاقِعٖ ١ لِّلۡكَٰفِرِينَ لَيۡسَ لَهُۥ دَافِعٞ ٢
مِّنَ ٱللَّهِ ذِي ٱلۡمَعَارِجِ ٣ تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ
فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ ٤ فَٱصۡبِرۡ صَبۡرٗا جَمِيلًا
٥ إِنَّهُمۡ يَرَوۡنَهُۥ بَعِيدٗا ٦ وَنَرَىٰهُ قَرِيبٗا ٧ يَوۡمَ تَكُونُ ٱلسَّمَآءُ
كَٱلۡمُهۡلِ ٨ وَتَكُونُ ٱلۡجِبَالُ كَٱلۡعِهۡنِ ٩ وَلَا يَسۡـَٔلُ حَمِيمٌ حَمِيمٗا ١٠

## تەفسیری سوورەتی (المعارج)

## مەککییە (٤٤) ئایەتە

## بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە

(١-٧): ﴿ سَأَلَ سَآئِلُۢ بِعَذَابٖ وَاقِعٖ ١ لِّلۡكَٰفِرِينَ لَيۡسَ لَهُۥ دَافِعٞ ٢ مِّنَ ٱللَّهِ ذِي ٱلۡمَعَارِجِ ٣ تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ ٤ فَٱصۡبِرۡ صَبۡرٗا جَمِيلًا ٥ إِنَّهُمۡ يَرَوۡنَهُۥ بَعِيدٗا ٦ وَنَرَىٰهُ قَرِيبٗا ٧ ﴾

خـــوا ﷻ نەفامـــی کەللەڕەقـــان ڕوون دەکاتـــەوە، وە پەلەکردنیـــان بـــە هاتنـــی ســـزای خـــوا، بـــە گاڵتـــە کـــردنو سەرکەشـــیو دەستەوســـانی، جـــا دەفەرمـــوێ: ﴿ سَأَلَ سَآئِلُۢ ﴾ داواکارێـــک داوای کـــرد، ﴿ بِعَذَابٖ وَاقِعٖ ١ لِّلۡكَٰفِرِينَ ﴾ (واتـــە: بـــە ســـزایەکی خوایـــی کـــە ئـــەو ســـزایە هـــەر ڕوو دەدات * بـــۆ بێبروایـــان) چونکـــە شایســـتەی ئـــەوەن، بـــە هـــۆی بێبڕوایـــیو عینادیـــان، ﴿ لَيۡسَ لَهُۥ دَافِعٞ ٢ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾ واتـــە: بـــۆ ئـــەم ســـزایەی - کـــە ئـــەوان پەلـــەی لـــێ دەکـــەن لـــە هاوبەشـــدانەران- هیـــچ کەســـێک نیـــە ڕەتـــی بکاتـــەوە پێـــش دابەزینـــی، یـــان بـــەرزی بکاتـــەوە دوای دابەزینـــی.

ئەمـــەش کاتێـــک نـــضری کـــوڕی حـــارس (القرشـــی) یـــان جگـــە لـــەو لـــە هاوبەشـــدانەران، داوای کـــردو وتـــی: ﴿ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلۡحَقَّ مِنۡ عِندِكَ فَأَمۡطِرۡ عَلَيۡنَا حِجَارَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئۡتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ٣٢ ﴾الأنفال (واتـــە: ئـــەی پەروەردگـــار ئەگـــەر ئـــەم قورئانـــە ڕاســـتەو لـــە لایـــەن تـــۆوە هاتـــووە دەی بـــەرد بەســـەرماندا ببارێنـــە لـــە ئاســـمانەوە یـــان ســـزای ســـەختی پـــڕ ئازارمـــان بـــۆ بنێـــرە) تـــا کۆتایـــی دەقـــەکان، جـــا ســـزا هـــەر دەبـــێ لـــە لایـــەن خـــواوە پێیـــان بگـــات، جـــا یـــان لـــە دونیـــادا بۆیـــان پێـــش دەخـــرێ، یـــان دوادەخـــرێ بـــۆ ڕۆژی دوایـــی.

ئەگـەر ئـەوان خوایـان بناسـیایەو هەسـتیان بـە مەزنـی فراوانـی دەسـەڵاتیو تـەواوی نـاوو سـیفەتەکانیان بکردایـە، ئـەوە هەرگیـز پەلەیـان نەدەکـردو ملکەچـی دەبـوون، لـە بـەر ئەمەیـە خـوا هـەواڵ دەدات دەربـارەی مەزنـی خـۆی، کـە دژی قسەناشـرینەکانیانە، فەرموویەتـی: ﴿ذِي ٱلۡمَعَارِجِ ۝٣ تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ﴾ واتـە: خـاوەن بـەرزیو گەورەیـیو مەزنیـە، وە ڕێکخـەری هەمـوو بەدیهێنراوەکانـە، کـە فریشـتەکان سـەردەکەون بـۆ لای بـەوەی داینـاوە لەسـەر ڕێکخسـتنی، وە ڕۆحیـش سـەردەکەوێ بـۆ لای.

ڕۆح: نـاوی ڕەگـەزە، هەمـوو ڕۆحـەکان لـە خۆدەگـرێ چـاکو خراپیـان، ئەمـەش لـە کاتـی مردنـدا، جـا چاکەخـوازان ڕۆحیـان بـەرز دەبێتـەوە بـۆ لای خـوا، مۆڵەتیـان پـێ دەدرێـت لـە ئاسـمانێکەوە بـۆ ئاسـمانێکی دیکـە، تـا دەگاتـە ئـەو ئاسـمانەی کـە خـوای بـەرزو مەزنـی تێدایـە، سـڵاو لـە پەروەردگـاری دەکاتو لـەزەت لـە نزیکـی وەردەگرێـتو پێـی دەگەشـێتەوە، ئنجـا لـە لایـەن خـواوە سـتایشو ڕێـزو چاکـەی بـۆ دەسـتەبەر دەبـێ.

بـەڵام ڕۆحـی خراپـەکاران، سـەردەکەوێت، جـا کاتێـک گەیشـتە ئاسـمان داوای مۆڵـەت دەکات، مۆڵەتـی پێنـادرێو دەگەڕێنرێتـەوە بـۆ سـەر زەوی.

پاشـان باسـی ئـەو مەودایـەی کـردوە کـە فریشـتەو ڕۆحـەکان بـۆ لای خـوا بـەرز دەبنـەوە، وە ئەوانـە سـەردەکەون لـە ڕۆژێکـدا هۆکارەکانیـان بـۆ ئاسـان کـراوە، توانایـان هەیـە بەسـەریدا بـە نەرمـیو سـوکیو بـڕۆن یـان بـە پەلـە، لەگـەڵ ئـەوەدا ئـەو مەودایـە بـە شـێوەیەکی ئاسـایی ئەندازەکـەی پەنجـا هـەزار سـاڵە، لـە سـەرەتای ڕۆشـتنە سـەرەوە، تـا گەیشـتن بـەو سـنوورەی بـۆی دیاریکـراوە، وە تـا کۆتایـی.

جـا ئـەم موڵکـە مـەزنو جیهانـە گـەورە سـەروو خـواری هەموویـان دروسـتکردنو بەڕێوەبردنـی لـە لایـەن خـوای بـەرزو بڵندەوەیـە.

بـە بارودۆخیـان دەزانـێ ئـەوەی ئاشـکراو ئـەوەی نهێنیـە، وە دەزانـێ بـە شـوێنی مانـەوەیو شـوێنی لێدەرچوونـی، هەروەهـا ڕەحمـەتو چاکـەو ڕزقو ڕۆزی خـۆی پێیـان دەگەیەنـێ، وە بڕیـاری قـەدەریو بڕیـاری شـەرعیو بڕیـاری جەزائیـان بە سـەردا دەهێنـێ، بەدبەختـی بـۆ گەلانێـک مەزنـی ئـەو زاتـە نەفامـن، وە مافـی ڕاسـتەقینەی نـەدەن، داوای پێـش هاتنـی سـزا بکـەن، لـە ڕووی دەستەوسـانبوونو تاقیکردنـەوەوە.

پاکـی بـۆ ئـەو زاتـە لەسـەر خۆیـە کـە مۆڵەتیـان دەداتو پشـت گوێیـان ناخـات، وە ئـازاری دەدەن ئـارام دەگـرێ لەسـەریانو لێیـان دەبـورێو ڕزقو ڕۆزیـان پێ دەبەخشـێ، ئەمـە یەکێکـە لـە گریمانـەکان لـە تەفسـیری ئـەم دەقـە پیـرۆزەدا، ئـەم سـەرکەوتنو بـەرز بوونەوەیـە لـە دونیـادا، چونکـە سـیاقی یەکـەم بەڵگەیـە لەسـەر ئەمـە.
پێدەچـێ ئـەم حاڵەتـە لـە ڕۆژی دواییـدا بـێ، وە خـوا ﷻ دەری بخـات بـۆ بەندەکانـی لـە ڕۆژی دواییـدا لـە مەزنـیو گەورەیـیو دەسـەڵاتی خـۆی، کـە ئـەوە گەورەتریـن بەڵگەیـە لەسـەر ناسـینی ئـەو زاتـە، لـەوەی دەیبینـن لـە سـەرکەوتنی فریشـتەو ڕۆحـەکان، سـەردەکەونو دادەبـەزن بـە ویسـتو مەشـیئەتی خـوا.
لـەو ڕۆژەدا کـە ئەندازەکـەی پەنجـا هـەزار ساڵە، لـە درێـژیو سـەختیدا، بـەڵام خواﷻ ئاسـانی دەکات لەسـەر بـڕوادار، وە وتـەی خـوا ﷻ: ﴿ فَٱصۡبِرۡ صَبۡرٗا جَمِيلًا ﴾ واتـە: ئـارام بگـرە لەسـەر بانگـەوازی گەلەکـەت بـە ئارامگرتنێکـی جـوان، نـە بێـزاری تێدابـێو نـە بێتاقەتـی، بەڵکـو بـەردەوام بـە لەسـەر فەرمانـی خـوا، وە بانگـەوازی بەندەکانـی پـێ بکـە بـۆ لای یەکتاپەرسـتی ئـەو زاتـە، بـا ڕێگریـت لێنـەکات ئـەوەی دەیبینـی لـە ملکـەچ نەبوونیـانو حـەز نەکردنیـان، بەڕاسـتی ئارامگرتـن لەسـەر ئـەوە خێرێکـی زۆری تێدایـە.
﴿ إِنَّهُمۡ يَرَوۡنَهُۥ بَعِيدٗا ٦ وَنَرَىٰهُ قَرِيبٗا ﴾ (واتـە: بـە ڕاسـتی ئـەو بێبڕوایانـە ئـەو ڕۆژە بـە دوور دەزانـن * ئێمـەش بـە نزیکـی دەبینیـن) ڕاناوەکـە دەگەڕێتـەوە بـۆ زینـدوو کردنـەوە، سـزای تێدایـە بـۆ ئەوانـەی لـە دونیـادا داوای سـزایان دەکـرد، واتـە: حاڵیـان حاڵـی ئەوانەیـە کـە نکوولـی ڕۆژی دواییـان کـردوە، وە ئەوانـەی گومڕایـی زاڵ بـووە بەسـەریاندا، تـا هەمـوو ئەوانەیـان بـەدوور دانـاوە کـە لـە پێشـیانەوەیە لـە زینـدوو کردنـەوەو کۆکردنـەوە.
خـوا ڕۆژی قیامـەت بـە نزیـک دەبینـێ، چونکـە نـەرمو نیـانو لەسـەرخۆیەو پەلـە نـاکات، دەزانێـت ئـەو ڕۆژە هـەر دەبـێ ڕووبـدات، هـەر شـتێک کـە بێـت ئـەوە بێگومـان نزیکـە. پاشـان باسـی ناڕەحەتـیو مەترسـی ئـەو ڕۆژەی کـردو ئەوەشـی تیایدایـە، جـا فەرمـووی:
(٨-١٨): ﴿ يَوۡمَ تَكُونُ ٱلسَّمَآءُ كَٱلۡمُهۡلِ ٨ وَتَكُونُ ٱلۡجِبَالُ كَٱلۡعِهۡنِ ٩ وَلَا يَسۡـَٔلُ حَمِيمٌ حَمِيمٗا ١٠ يُبَصَّرُونَهُمۡۚ يَوَدُّ ٱلۡمُجۡرِمُ لَوۡ يَفۡتَدِي مِنۡ عَذَابِ يَوۡمِئِذِۭ بِبَنِيهِ ١١ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَأَخِيهِ ١٢ وَفَصِيلَتِهِ ٱلَّتِي

تُئْوِيهِ ﴿١٣﴾ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ ﴿١٤﴾ كَلَّآ إِنَّهَا لَظَىٰ ﴿١٥﴾ نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ ﴿١٦﴾ تَدْعُواْ مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٧﴾ وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰٓ ﴿١٨﴾ ﴾.

دەفەرمـوێ: ﴿ يَوْمَ ﴾ ڕۆژی دوایـی، ئـەو کارە مەزنانـەی تێـدا ڕوودەدات ﴿ تَكُونُ ٱلسَّمَآءُ كَٱلْمُهْلِ ﴾ (واتـە: ئاسـمان وەکـو (المهل)یـان لـێ دێـت) ئەویـش مسـی تواوەیـە، لـە لەتبوونـیو ئەوپـەڕی ترسـان.

﴿ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ﴾ (واتـە: کەژەکانیـش وەکـو (العهن)یـان لـێ دێـت) ئەویـش خـوری شـیکراوەیە، پاشـان دوای ئـەوە ئەبـن بـە تـەپو تـۆزی پـەرشو بـڵاو.

جـا ئەگـەر ئـەم دوودڵـیو بێزاریـە تووشـی ئـەو ئەسـتێرە سـەختانە بێـت، گومانـت چۆنـە بـە بەنـدەی لاواز، کـە بـاری سـەر پشـتی قـورس کـردوە بـە گوناهـو تـاوان؟ ئایـا حەقـی خـۆی نیـە دڵـی دابخورپـێو ناخـی بترسـێو سـەری سـوور بمێنـێ لـە هەمـوو کەسـێک؟ لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَلَا يَسْـَٔلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا ﴿١٠﴾ يُبَصَّرُونَهُمْ ﴾ واتــە: (هیــچ کەســێک ناپرســێتەوە لــە هیــچ کەســێکی خۆشەویســتی خــۆی) خۆشەویســت نیشــانی خۆشەویســتەکەی دەدرێــت، ئەوەنــدە فراوانــی لــە دڵیــدا نیــە پرسـیار دەربـارەی خۆشەویسـتەکەی بـکات، تەنانـەت ئـەوەش پەیوەسـتە بـە پێکـەو ژیانیـانو خۆشەویسـتیان، خەمـی کەسـی نیـە جگـە لـە خـۆی نەبـێ.


يُبَصَّرُونَهُمْ يَوَدُّ ٱلْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِى مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍۭ بِبَنِيهِ ﴿١١﴾
وَصَٰحِبَتِهِۦ وَأَخِيهِ ﴿١٢﴾ وَفَصِيلَتِهِ ٱلَّتِى تُـْٔوِيهِ ﴿١٣﴾ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا
ثُمَّ يُنجِيهِ ﴿١٤﴾ كَلَّآ إِنَّهَا لَظَىٰ ﴿١٥﴾ نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ ﴿١٦﴾ تَدْعُوا۟ مَنْ أَدْبَرَ
وَتَوَلَّىٰ ﴿١٧﴾ وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰٓ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ
جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٢٢﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ
عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَٱلَّذِينَ فِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ ﴿٢٤﴾ لِّلسَّآئِلِ
وَٱلْمَحْرُومِ ﴿٢٥﴾ وَٱلَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٢٦﴾ وَٱلَّذِينَ هُم مِّنْ عَذَابِ
رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴿٢٧﴾ إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ ﴿٢٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ
لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ ﴿٢٩﴾ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ
فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٣٠﴾ فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ ﴿٣١﴾
وَٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَٰنَٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِشَهَٰدَٰتِهِمْ قَآئِمُونَ
﴿٣٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٣٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى جَنَّٰتٍ مُّكْرَمُونَ ﴿٣٥﴾
فَمَالِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ ﴿٣٦﴾ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ
عِزِينَ ﴿٣٧﴾ أَيَطْمَعُ كُلُّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٍ ﴿٣٨﴾ كَلَّآ إِنَّا خَلَقْنَٰهُم
مِّمَّا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ فَلَآ أُقْسِمُ بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ﴿٤٠﴾

﴿ يَوَدُّ ٱلْمُجْرِمُ ﴾ (واتە: تاوانبار ئاوات دەخوازێ) ئەوەی کە سزای لەسەر پێویست بووە، ﴿ لَوْ يَفْتَدِى مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍۭ بِبَنِيهِ ﴿١١﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ ﴾ واتە: خێزانەکەی ﴿ وَأَخِيهِ ﴿١٢﴾ وَفَصِيلَتِهِ ﴾ واتە: نزیکەکەی ﴿ ٱلَّتِى تُـْٔوِيهِ ﴾ واتە: کە لە دونیادا پشتیوانی لێ دەکرد، هەندێکیان یارمەتی ئەوی دیکەیان دەدا، جا لە ڕۆژی دواییدا هیچ کەسێک سوود بە کەسێکی دیکە ناگەیەنێ، وە کەس تکاو شەفاعەت بۆ کەس ناکات مەگەر بە ویستی خوا، بەڵکو کەسی ستەمکار شایستە بە سزا، ئەگەر هەموو سەر زەوی لە جیاتی ڕزگار بوونی خۆی ببەخشێ، هیچ سوودێکی نیە بۆی.

﴿ كَلَّآ ﴾ واتە: نە هیچ چارەیەکیان هەیە، نە ڕزگاربوون، بێگومان بڕیاری پەروەردگارت هاتە دی لەسەر ئەوانەی بێبڕوا بوونو هەرگیز بڕواناهێنن، هەروەها سوودی هاوڕێو کەسە نزیکەکانیش نەما، ﴿ إِنَّهَا لَظَىٰ ﴿١٥﴾ نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ ﴾ (واتە: بەڕاستی ئاگری دۆزەخ بە بڵێسەیە * داماڵێنەری پێستی سەرە) واتە: بۆ ئەو ئەندامانەی دیارو نادیارن لە سەختی سزاکەی ﴿ تَدْعُوا۟ ﴾ بانگی کەسێک دەکات بۆ دۆزەخ، ﴿ مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٧﴾ وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰٓ ﴾ واتە: پشتی کردبێ لە شوێنکەوتنی حەقو ڕووی لێ وەرگێڕابێ، ئەو هیچ مەبەستێکی لە شوێنکەوتنی حەقدا نەبێت، وە ماڵی زۆری کۆکردبێتەوەو لەسەر یەک دایناببێت، وە هەڵیگرتبێو لێی نەبەخشیبێ، بەڕاستی ئاگر ئەوانە بانگ دەکات بۆ لای خۆی، وە ئامادەیە بۆ سووتاندنیان.

(١٩-٣٥): ﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٢٢﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَٱلَّذِينَ فِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ ﴿٢٤﴾ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿٢٥﴾ وَٱلَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٢٦﴾ وَٱلَّذِينَ هُم مِّنْ عَذَابِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴿٢٧﴾ إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ

غَيْرُ مَأْمُونٍ ﴿٢٨﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ﴿٢٩﴾ إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ
مَلُومِينَ ﴿٣٠﴾ فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ ﴿٣١﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ ﴿٣٢﴾ وَالَّذِينَ هُم
بِشَهَادَاتِهِمْ قَائِمُونَ ﴿٣٣﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٣٤﴾ أُولَئِكَ فِي جَنَّاتٍ مُكْرَمُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ الْإِنْسَانَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴾ئەمە وەسـفی ئادەمیـزادە لـەو ڕووەی كە هەیە، وەسـفی سروشـتی بنچینەیەتـی، بێگومان ئـەو چاوچنۆكە (هلوع)ە، وە وشـەی (الهلـوع) ڕاڤە كـراوە بـەوەی ﴿ إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعًا ﴾ناخۆشـیەكی تـووش بێ لـە هەژاری یان نەخۆشـی، یـان لەدەسـتدانی خۆشەویسـتێكی، لـە مـاڵ یـان خێـزان یـان منـداڵ، هـاوارو ناڵـە دەسـت پێـدەكات، لـەوەدا ئارامـیو ڕەزامەندی بـەكار ناهێنێـت بەوەی خـوا بڕیاری لەسـەر داوە.

﴿ وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعًا ﴾(واتـە: كـە سـامانیش ڕووی تێبـكات ئەیگرێتـەوە لـە خەڵكی) تابەخشـێ لـەوەی خـوا پێـداوە، سوپاسـی خـوا نـاكات لەسـەر نیعمـەتو چاكەكانـی، لـە نارەحەتیـدا هـاوار دەكات، وە لەخۆشـیدا دەیگرێتـەوە.

﴿ إِلَّا الْمُصَلِّينَ ﴾(مەگـەر نوێژكـەران) ئەوانەی وەسـف كـراون بەو وەسـفانە، ئەوانە ئەگەر خێرێكیـان تـووش بێ سوپاسـی خوا دەكەنو دەبەخشـن لـەو ماڵەی خوا پێیـداون، وە ئەگەر تووشـی شـەڕو ناخۆشـی ببن ئارام دەگـرنو خۆڕاگر دەبن، وە لە وەسـفیاندا خـوا دەفەرموێ:

﴿ الَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ ﴾واتـە: ئەوانـەی بەردەوامـن لەسـەر نوێژەكانیـان، لـە كاتی خۆیـدا بە هەموو مـەرجو تەواوكاریەكانـی، وەك ئەوانە نیـن نوێژەكانیان ئەنجـام نادەن، یان ماوەیـەك دەیكـەنو ماوەیەك وازی لێدێنن، یـان بە ناتەواوی ئەنجامـی دەدەن، ﴿ وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَعْلُومٌ ﴾لـە زەكاتو خێـرو خێـرات ﴿ لِلسَّائِلِ ﴾ئـەوەی كـە داوا دەكات ﴿ وَالْمَحْرُومِ ﴾ئـەو هەژارەیـە كـە داوا لە خەڵكی نـاكات پێی ببەخشـن، وە خەڵكیش نازانن تـا خێری پـێ بكەن.

﴿ وَالَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ ﴾واتـە: ئەوانـەی بڕوایـان بـەوە هەیـە كـە خـوا هەواڵـی پێداوە، هەروەهـا پێغەمبەرەكەیشـی ﷺ لـە پاداشـتو زینـدوو كردنەوە، دڵنیـان لەوە بۆیـە خۆیان بۆ دوارۆژ ئامـادە دەكـەنو كۆششـی بـۆ دەكـەن، وە بەڕاسـتدانانی ڕۆژی دوایی، بەڕاسـتدانانی پێغەمبەران پێویسـت دەكات، وە ئەوەیشـی هێناویانە لە كتێبـەكان، ﴿ وَالَّذِينَ هُمْ مِنْ عَذَابِ رَبِّهِمْ مُشْفِقُونَ ﴾واتـە: (ئەوانـەی كە لە سـزای پەروەردگاری خۆیان) دەترسـنو دڵیـان دەلەرزێ، واز لـە هەمـوو ئەوانـە دێنن كـە نزیكیان دەكاتـەوە لە سـزای خوا.

﴿ إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ ﴾واتـە: ئەویـش ئـەو سـزایەیە كـە لێـی دەترسـێو مەترسـی

لێدە کرێ، ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ﴾ (واتە: ئەوانەی کە ئاگاداری داوێنی خۆیان دەکەن) کاری قەدەغەکراو ناکەن لە زینا، یان نێربازی، یان ڕۆشتنە لاخێزانەکانیان لە دواوە، یان لە کاتی سووڕی مانگانەدا، وە وێنەی ئەوانەش، هەروەها دەیپارێزن لە تەماشاکردنی‌و دەستلێدانی، بۆ کەسێک دروست نەبێ بۆی، هەروەها واز لەو هۆکارە قەدەغەکراوانە دەهێنن کە پاڵنەرە بۆ کاری فاحیشەو داوێن پیسی، ﴿ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ ﴾ واتە: کەنیزەکانیان ﴿ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ﴾ (واتە: بێگومان ئەوانە لۆمە کراو نین) لە جیماع کردنیان، لەو شوێنەی کە شوێنی کێڵانە.

﴿ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ ﴾ واتە: (هەر کەسێک دوای شتی تر بکەوێت) بێجگە لە ژنەکەی‌و کەنیزەکەی ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ ﴾ واتە: ئەو کەسانە دەستدرێژی کەرن بەسەر ئەوەی خوا حەڵاڵی کردوە بۆ لای ئەوەی خوا قەدەغەی کردوە، ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر قەدەغەکردنی ژنهێنان لە ڕێگەی موتعەوە، چونکە نە ژنێتی‌و نە کەنیزە.

﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَٰنَٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ ﴾ واتە: چاودێری ڕاسپاردەکانیان دەکەن، پارێزەرن هەوڵدەدەن بیگەیەنن‌و بە چاکی جێبەجێی بکەن، ئەمەش گشتگیرە بۆ هەموو ڕاسپاردەکان کە لە نێوان بەندەو لە نێوان پەروەردگاریدایە، وەکو ئەرک پێ سپێردراوە نهێنیەکان کەس نایزانێ جگە لە خوا، وە ئەو ڕاسپاردانەی لە نێوان بەندەو لە نێوان خەڵکدایە لە ماڵو سامانەکانو نهێنیەکان، بە هەمان شێوە پەیمانی گشتگیر لەو پەیمانەی خوا لەسەری داینـاوە، وە ئەو پەیمانەشی لە نێوان بەندەکاندا هەیە، چونکە بەڕاستی بەندە لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێ لەسەر پەیمان، ئایا پێی هەستاوەو بە وەفا بووە، یان ڕەتیکردوەتەوەو خیانەتی لێکردوەو بەجێی نەهێناوە؟

﴿ وَٱلَّذِينَ هُم بِشَهَٰدَٰتِهِمۡ قَآئِمُونَ ﴾ واتە: شایەتی نادەن تەنها بەوە نەبێ کە دەیزانن بەبێ زیادەو ناتەواوی‌و شاردنەوە، گوێ نادەن بەوەی نزیکە یان هاوڕێیەو وێنەی ئەوانەش، مەبەستیان لە بەجێهێنانیدا تەنها ڕەزامەندی خوایە، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِ ۚ ﴿٢﴾ ﴾ الطلاق، (واتە: تەنها لەبەر خوا ئەو شایەتیە بدەن)، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلۡقِسۡطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ أَوِ ٱلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَ ﴿١٣٥﴾ ﴾ النساء، (واتە: ئەی کەسانێک کە بڕواتان هێناوە بەردەوام زۆر دادگەر بن لەبەر خوا شایەتی بدەن با شایەتیەکە دژ بە خۆشتان بێت یان دژی باوکو دایکو خزمە نزیکەکانتان بێت).

﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَاتِهِمۡ يُحَافِظُونَ ﴾ (واتە: ئەوانەی ئاگاداری نوێژیان دەکەن) بە بەردەوام

بوونیــان بــە تەواوترین شـێوە)، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ واتــە: ئەوانەی وەســف کـراون بەو ســیفەتانە، ﴿ فِي جَنَّٰتٖ مُّكۡرَمُونَ ﴾ واتــە: خـوا ڕێزیــان لـێ دەگـرێو نازونیعمەتـی هەمیشـەییان پـێ دەبەخشـێ، ئــەوەی نەفسو دەروون حــەزی لێدەکاتو چـاو چێژی لێ وەردەگـرێ، ئەوان بۆ هەتاهەتایـی تیایـدا دەمێننــەوە، پوختــەی ئەمە، خـوا وەسـفی بەختەوەرانی کردوە بەم وەسـفە تــەواوو ڕەوشــتە جوانانــە، لە پەرستشــە جەسـتەییەکان، وەک نوێژو بەردەوام بوون لەسـەری، وە کردەوەکانـی دڵ، وەک ترسـان لـە خـوا کـە پاڵنەرە بـۆ هەمـوو خێرێک، وە پەرستشـە ماڵیـەکانو بیـرو بـروا بە سـوودەکانو ڕەوشـتە چاکـەکان، وە مامەڵـە کردن لەگـەڵ خواو مامەڵــە کــردن لەگــەڵ بەدیهێنراوەکانـی بــە چاکتریــن مامەڵە، لــە دادپەروەریانو پاراسـتنی پەیمــانو نیهێنیەکانیــان، وە داوێــن پاکیان بــە پاراسـتنی عەورەتیان لەوەی خوا پێی ناخۆشــە.

(٣٦-٣٩): ﴿ فَمَالِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ قِبَلَكَ مُهۡطِعِينَ ٣٦ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ عِزِينَ ٣٧ أَيَطۡمَعُ كُلُّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ أَن يُدۡخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٖ ٣٨ كَلَّآۖ إِنَّا خَلَقۡنَٰهُم مِّمَّا يَعۡلَمُونَ ٣٩ ﴾

خــوا ﷻ فریوخواردنی بێبڕوایان ڕوون دەکاتــەوەو دەفەرموێ: ﴿ فَمَالِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ قِبَلَكَ مُهۡطِعِينَ ﴾ واتــە: (دەی چییانە ئــەو بێبڕوایانە دێن بۆ لات) بە پەلــە، ﴿ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ عِزِينَ ﴾ (واتە: بــەلای ڕاســتو چەپــدا) بــەش بەشو پــۆل پۆلی جیــاوازو کۆمەڵ بــە کۆمەڵی جـۆراو جۆر، هــەر یەکە لەوانە دڵخۆشــە بەوەی لە لایەتـی. ﴿ أَيَطۡمَعُ كُلُّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ أَن يُدۡخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٖ ﴾ (واتــە: ئایــا هەمــوو یەکێک لەوان ئومێـدی وایە بخرێتە بەهەشـتی پڕ لــە نازونیعمەتەوە) بە چ هـۆکارێ بە تەمـای ئەوەن، لــە کاتێکدا ئــەوان هیچیان پێش نەخسـتووە، جگە لــە بێبڕواییو نکوولـی بــە پەروەردگاری جیهانیــان، لەبــەر ئەمەیە فەموویەتـی: ﴿ كَلَّآۖ ﴾ واتــە: نەخێر، بەو شـێوە نیــە ئەوان ئاواتـی بۆ دەخـوازن، هەرچیان بـوێ بەهێزی خۆیان بەدەسـتی بێنن.

﴿ إِنَّا خَلَقۡنَٰهُم مِّمَّا يَعۡلَمُونَ ﴾ واتە: (بەڕاسـتی ئێمە دروسـتمان کردوون لــەوەی کە دەیزانن) لــە ئاوێکـی فرێدراو کــە دەردەچێ لە ناوەندی پشـتی پیاوو دانەی پەراسـووی سـنگی ژنەوە، هیـچ دەسـەڵاتێکیان نیــە کە سـوودو قازانـج بگەیەنن، یـان زیـان بگەیەنن، هەروەهـا مردنو ژیــانو زیندووبوونــەوەی خۆیان بە دەسـت نیە.

(٤٠-٤٤): ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِرَبِّ ٱلۡمَشَٰرِقِ وَٱلۡمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ٤٠ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَمَا نَحۡنُ بِمَسۡبُوقِينَ ٤١ فَذَرۡهُمۡ يَخُوضُواْ وَيَلۡعَبُواْ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي يُوعَدُونَ ٤٢ يَوۡمَ يَخۡرُجُونَ مِنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ سِرَاعٗا كَأَنَّهُمۡ إِلَىٰ نُصُبٖ يُوفِضُونَ ٤٣ خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۚ ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمُ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ ٤٤ ﴾

عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٤١﴾ فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا۟ وَيَلْعَبُوا۟ حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٤٢﴾ يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَىٰ نُصُبٍ يُوفِضُونَ ﴿٤٣﴾ خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿٤٤﴾

خـــوا دەفەرمـــوێ: ﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ﴿٤٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيْرًا مِّنْهُمْ ﴾ ئەمــە ســوێند پــێ خواردنــە لــە خـــوای پەروەردگـــارەوە بـــە ڕۆژهەڵاتـــەکانو ڕۆژئـــاواکان، بـــۆ خـــۆرو مانـــگو ئەســـتێرەکان، لـــەوەی تیایاندایـــە لـــە بەڵگـــەو نیشـــانە ئاشـــکراکان لەســـەر زیندووکردنـــەوە، وە توانـــای ئـــەو زاتـــە لەســـەر گۆڕینـــی وێنـــەی ئەوانـــەو خـــودی ئەوانیـــش، وەک فەرموویەتی: ﴿ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ الواقعـة، (واتـــە: وە دروســتان بکەینــەوە بــە شــێوەیەک کــە هیچــی لــێ نازانــن). ﴿ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴾ واتـــە: ئەگـــەر بمانـــەوێ بیانگێڕینـــەوە کــەس لــە دەســتمان دەرناچــێو دەستەوســانمان نــاکات، جــا ئەگــەر زیندووکردنــەوەو پاداشــت جێگیــر کــرا، ئەوانیــش بــەردەوام بــوون لەســـەر بەدرۆدانانیـــانو ملکـــەچ نەبوونیــان بــە ئایــاتو نیشــانەکانی خــوا: ﴿ فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا۟ وَيَلْعَبُوا۟ ﴾ (واتــە: ئنجــا وازیــان لــێ بێنــە) بــا ڕۆبچــن لــە قســەی پڕوپــووچو بیــرو بــڕوای خراپــدا، وە یــاری بــە ئاینەکەیــان بکــەنو بخــۆنو بخۆنــەوەو چێــژو لــەزەت وەربگــرن، ﴿ حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴾ (واتــە: تــا دووچــاری ئــەو ڕۆژەی خۆیــان دەبــن کــە بەڵێنیــان پێــدراوە) بێگومــان خــوا ﷻ تۆڵــەو ســزای بــۆ ئامــادە کــردوون، کــە دەرەنجامــی ڕۆچــوونو گاڵتەکردنیانـــە.

پاشــان باســی حاڵــی خەڵکــی دەکات کاتێــک دووچــاری ئــەو ڕۆژەیــان دەبــن کــە بەڵێنیــان پێــدراوە، جــا فەرموویەتــی: ﴿ يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ ﴾ واتــە: (ئــەو ڕۆژەی کــە دێنــە دەرەوە) لــە گۆڕەکانیــان ﴿ سِرَاعًا ﴾ بــە پەلــە بــە دەم بانگــەوازی بانگکەرەکــەوە دێــن.

﴿ كَأَنَّهُمْ إِلَىٰ نُصُبٍ يُوفِضُونَ ﴾ واتـــە: دەڵێـــی بـــۆ لای شـــتێکی دیاریکـــراو ڕادەکـــەنو پەلـــە

دەکەن، واتە: ناتوانن لە فەرمانی بانگکەرەکە یاخی بن‌و خوارو خێچی بکەن، بەڵکو بە زەلیلی‌و سەرشۆڕیەوە ملی ڕێگا دەگرن، بۆ وەستان لە خزمەتی پەروەردگاری جیهانیاندا، ﴿ خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۚ ﴾ (واتە: چاویان شۆڕو ڕیسوایی‌و شەرمەزاری دایان دەگرێ) بەو شێوەیە زەلیلی‌و دوو دڵی دڵیان دادەپۆشێ‌و زاڵ دەبێ بەسەر سنگیاندا، چاوەکانیان سەربەرەو ژێر دەبێت، لە جووڵە دەکەون‌و دەنگیان لێوە نایەت.

ئەمە حاڵ‌و دەرەنجامیانە، ئەمە ئەو ڕۆژەیە ﴿ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴾ (واتە: کە بەڵێنیان پێدرابوو) بەڵێنی خواش هەر دەبێ بێتە جێ.

تەفسیری سوورەتی (المعارج) تەواو بوو.


سورة نوح
بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
إِنَّا أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ
عَذَابٌ أَلِيمٌ ① قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ② أَنِ اعْبُدُوا
اللَّهَ وَاتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ③ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ
إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى إِنَّ أَجَلَ اللَّهِ إِذَا جَاءَ لَا يُؤَخَّرُ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ④
قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا ⑤ فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَاءِي إِلَّا
فِرَارًا ⑥ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوا أَصَٰبِعَهُمْ فِي
ءَاذَانِهِمْ وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا وَاسْتَكْبَرُوا اسْتِكْبَارًا
⑦ ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ⑧ ثُمَّ إِنِّي أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ
لَهُمْ إِسْرَارًا ⑨ فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا ⑩

## تەفسیری سوورەتی (نوح)

## مەککییە (٢٨) ئایەتە

## بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە

(١-٤): ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ① قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ② أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ③ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى إِنَّ أَجَلَ اللَّهِ إِذَا جَاءَ لَا يُؤَخَّرُ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ④﴾:

﴿إِنَّا أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ﴾ تا کۆتایی سوورەتەکە، خوا ﷻ لەم سوورەتەدا جگە لە چیرۆکی نووح ﷺ باسی هیچی دیکەی نەکردوە، بە هۆی زۆری مانەوەی لەنێو گەلەکەیدا، وە دووبارە بانگەواز کردنی بۆ یەکتاپەرستیو قەدەغە کردنی لە هاوبەشدانان. جا خوا ﷻ هەواڵیداوە کە بەڕاستی نووحی ناردوە بۆ لای گەلەکەی، وەکو ڕەحمەتێک بۆیانو بێدار کردنەوەیان لە سزای زۆر بە ئێش، لە مەترسی ئەوەی بەردەوام بن لەسەر بێبڕواییان، ئنجا خوا بەهەمیشەیی لەناویان باتو بە هەتا هەتایی سزایان بدات.

(٢) نووح ﷺ فەرمانبەرداری پەروەردگاری بوو، پەلەی کرد لە گەیاندنیدا، جا فەرمووی: ﴿يَٰقَوْمِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ واتە: (ئەی گەلەکەم بەڕاستی من پێغەمبەرێکی) ترسێنەرو ئاشکرام بۆ ئێوە، ئەویش بە هۆی ئەوەی ڕوونیکردۆتەوە بۆیان ئەوەی ترساندوونی پێی، وە بە چ شتێ ڕزگاربوونیان دەستەبەر دەبێ، هەموو ئەوانەی بۆ ڕوون کردوونەتەوە بە ڕوونکردنەوەیەکی ڕوونو ئاشکرا.

(٣-٤) جا هەواڵی پێداونو فەرمانی پێکردوون بە پوختەی ئەوەی فەرمانی پێ کردوون، فەرموویەتی: ﴿أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ﴾ ئەویش بە تاکو تەنها ڕاگرتنی

خـوا لـە یەکتاپەرسـتیو پەرستشـدا، وە دوورکەوتنـەوە لـە هاوبەشـدانانو ڕێگاکانـیو هۆکارەکانـی، بێگومـان ئـەوان ئەگـەر لـە خـوا بترسـایەن، لـە گوناهەکانیـان خـۆش دەبـوو، وە ئەگـەر لـە گوناهەکانیـان خـۆش بـێ ڕزگاریـان دەبـێ لـە سـزاو پاداشـتیان بـۆ دەسـتەبەر دەبێـت.

﴿ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ واتـە: لـەم ژیانـەدا بـە زیندوویـی دەتانهێڵێتـەوە، لەناوچوونتـان لەسـەر لادەبـات تـا کاتێکـی دیاریکـراو، واتـە: ئەنـدازەی مانەوەتـان لـە دونیـادا بـە قـەدەری خـوای بـەرزە، تـا کاتێکـی دیاریکـراو، نـەک بـۆ هەتـا هەتایـە، چونکـە مـردن هـەر دەبـێ ببـێ، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ (واتـە: بەڕاسـتی کاتێـک سـزای خـوا کـە هـات دوا ناکەوێـت ئەگـەر بتانزانیایـە) کاتـێ بێبڕواییتـان کـرد بـە خـواو نکوڵـی حـەقو ڕاسـتیتان کـرد، وەڵامـی بانگەوازەکـەی نووحتـان نەدایـەوەو ملکەچـی فەرمانەکانـی نەبـوون، ئەویـش سـکاڵای لـە لای پەروەردگـاری کـردوو فەرمـووی:

(٥-٦): ﴿ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا ۝٥ فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَآءِيٓ إِلَّا فِرَارًا ﴾ واتـە: هەڵدەهاتـن لـە حـەقو پشـتیان تـێ دەکـرد، لـەو بانگـەوازەدا هیـچ سـوودێک نەمـا، چونکـە سـوودی بانگـەواز ئەوەیـە هەمـووان یـان هەندێکیـان سـوود بەخـش ببـن لێـی.

﴿ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ ﴾ واتـە: (بێگومـان مـن هـەر کات بانگـم دەکـردن بـۆ بڕواهێنـان تـا لێیـان خـۆش ببیـت) بـۆ ئـەوەی بـەدەم بانگەوازەکـەوە بێـن، جـا ئەگـەر بەدەمیـەوە بهاتایـەن لێیـان خـۆش دەبـووی، ئـەوەش تـەواوی بەرژەوەنـدی ئـەوان بـوو، بـەڵام ئـەوان تەنهـا پووچـیو بەتاڵیـان هەڵبـژارد، وە هەروەهـا هەڵهاتـن لـە حـەقو ڕاسـتی.

﴿ جَعَلُوٓا۟ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ ﴾ (واتـە: ئـەوان پەنجەیـان دەکـرد بـە گوێچکەیانـدا) بـۆ ئـەوەی ئامۆژگـاری پێغەمبەرەکەیـان نـووح ﷺ نەبیسـتن ﴿ وَٱسْتَغْشَوْا۟ ثِيَابَهُمْ ﴾ واتـە: پۆشـاکەکانیان دەدا بـە سـەروو چاویانـدا، بـۆ ئـەوەی دوور بـن لـە حـەق، چونکـە ڕقیـان لێـی بـوو ﴿ وَأَصَرُّوا۟ ﴾ بـەردەوام بـوون لەسـەر کوفـرو خراپەکاریـان ﴿ وَٱسْتَكْبَرُوا۟ ﴾ لـووت بەرزیـان دەکـرد لـە ئاسـتی حەقـدا ﴿ ٱسْتِكْبَارًا ﴾ (بـە لـووت بـەرزی کردنێـک) شـەڕو خراپەیـان پێـی زیـادی کـردو دوورکەوتنـەوە لـە خێـرو چاکـە.

(٨): ﴿ ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ﴾ واتە: بە بیستنی هەموویان بە گشتی.
(٩): ﴿ ثُمَّ إِنِّيَ أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا ﴾ (واتە: ئنجا دەمێک بۆم ئاشکرا دەکردن دەمێک بۆم پەنهان دەکردن بە پەنهان کردنێکی تەواو) هەموو ئەمانە سوور بوونو ئامۆژگاریە، وە بانگەواز کردنیان بە هەموو شێوازیک گومانی ئەوەی لێ بکرێ مەبەستی پێ دەپێکێ.
(١٠): ﴿ فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ﴾ واتە: واز بێنن لەوەی لەسەری دەڕۆن لە گوناه، وە داوای لێخۆشبوونی گوناهەکانتان لە خوا بکەن.
﴿ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا ﴾ خاوەن لێبوردەیی زۆرە بۆ کەسێ داوای لێخۆشبوون بکات، جا هانیداون بە لێخۆشبوونی گوناه، وە ئەوەیشی لەسەری ڕێک دەخرێ لە بەدەستهێنانی پاداشتو دوور خستنەوەی سزا.

يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل
لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا ﴿١٢﴾ مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾
وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴿١٤﴾ أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ
طِبَاقًا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا ﴿١٦﴾
وَاللَّهُ أَنبَتَكُم مِّنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا ﴿١٧﴾ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ
إِخْرَاجًا ﴿١٨﴾ وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ بِسَاطًا ﴿١٩﴾ لِّتَسْلُكُوا مِنْهَا
سُبُلًا فِجَاجًا ﴿٢٠﴾ قَالَ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي وَاتَّبَعُوا مَن لَّمْ يَزِدْهُ
مَالُهُ وَوَلَدُهُ إِلَّا خَسَارًا ﴿٢١﴾ وَمَكَرُوا مَكْرًا كُبَّارًا ﴿٢٢﴾ وَقَالُوا
لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ
وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾ وَقَدْ أَضَلُّوا كَثِيرًا ۖ وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا ضَلَالًا ﴿٢٤﴾
مِّمَّا خَطِيئَاتِهِمْ أُغْرِقُوا فَأُدْخِلُوا نَارًا فَلَمْ يَجِدُوا لَهُم مِّن دُونِ
اللَّهِ أَنصَارًا ﴿٢٥﴾ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ
دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا
كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ رَّبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِنًا
وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا تَبَارًا ﴿٢٨﴾

(١١): هەروەها هانیداون لەسەر خێری پێشهاتووی دونیا، جا فەرموویەتی: ﴿ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴾ واتە: بارانی بە خوڕەم کە دۆڵو شیوەکانتان پڕ دەکاتو وڵاتو بەندەکان دەبوژێنێتەوە.

(١٢): ﴿ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ ﴾ واتە: ماڵو سامانتان زۆر دەکات، کە داواکاریەکانی دونیای پێ بەدەست دەهێنن، وە منداڵی زۆریشتان پێ دەبەخشێ، ﴿ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا ﴾ ئەمە ئەوپەڕی لەزەتو خۆشیەکانی دونیایە.

(١٣): ﴿ مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴾ واتە: ناترسن لە مەزنی خوا، خوا ﷻ هیچ شکۆیەکی لەلای ئێوە نیە.

(١٤): ﴿ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴾ واتە: دروستکردنێک لە دوای دروستکردن، لەناو سکی دایک، پاشان شیرەخۆری، پاشان تەمەنی منداڵی، پاشان جیاکردنەوە، پاشان گەنجێتی، تا کۆتایی ئەوەی بەدیهێنراو پێی دەگات، جا ئەو زاتەی تاکو تەنهایە لە دروستکردنو بەڕێوەبردنو ڕێکخستنی سەرسووڕهێنەر، هەر ئەو شیاوە بەتاکو تەنهایی پەرستشو یەکتاپەرستی بۆ بکرێ.

لە باسکردنی سەرەتای بەدیهێنانی مرۆڤەکان ئاگادار کردنەوەیەکە بۆیان، لەسەر دانپێدانان بە ڕۆژی دوایی، وە ئەو زاتەی بەدیهێناون لە نەبوونەوە بە توانایە جارێکی تر بیانهێنێتە بوون دوای مردنیان، هەروەها بەڵگەی هێناوەتەوە بۆیان بە دروستکردنی ئاسمانەکان، کە ئەوە مەزنترە لە دروست کردنی ئادەمیزاد، وەک فەرموویەتی:

(١٥): ﴿ أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا ﴾ واتە: هەر ئاسمانێک لەسەر ئەوی دیکە، نهۆم لەسەر نهۆم.

(١٦): ﴿ وَجَعَلَ ٱلۡقَمَرَ فِيهِنَّ نُورٗا ﴾ بـۆ خەڵکـی سـەر زەوی ﴿ وَجَعَلَ ٱلشَّمۡسَ سِرَاجٗا ﴾ (واتە: خۆریشـی گێـڕاوە بـە چـرا)، ئاگـادار کردنـەوەی تێدایـە لەسـەر مەزنـی دروسـتکردنی ئـەم شـتانە، وە زۆری سـوودو قازانـج لـە خـۆرو مانـگ کـە بەڵگـەن لەسـەر میهرەبانـی ئـەو زاتـەو فراوانـی چاکەکانـی، جـا خـوای مەزنـی بـە بەزەیـی شایسـتەیە بـە مـەزن دابنـرێو خـۆش بویسـترێو بپەرسـترێو لێـی بترسـرێو ئومێـدی پـێ ببـرێ.

(١٧): ﴿ وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ نَبَاتٗا ﴾ کاتێـک ئادەمـی باوکتانـی دروسـتکرد، ئێـوەش لـە پشـتی ئـەودا بـوون.

(١٨): ﴿ ثُمَّ يُعِيدُكُمۡ فِيهَا ﴾ لـە کاتـی مردنـدا ﴿ وَيُخۡرِجُكُمۡ إِخۡرَاجٗا ﴾ بـۆ زینـدوو کردنـەوەو کۆکردنـەوە، ژیـانو مـردنو زیندووبوونـەوە تەنهـا بـە دەسـتی ئـەو زاتەیـە.

(١٩): ﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ بِسَاطٗا ﴾ واتـە: (خـوا زەوی بـۆ) ڕاخسـتوون ئامادەیـە بـۆ ئـەوەی سـوودی لـێ وەربگیرێ.

(٢٠): ﴿ لِّتَسۡلُكُواْ مِنۡهَا سُبُلٗا فِجَاجٗا ﴾ (واتـە: تـا هاتـوو چـۆ بکـەن بـە ڕێگـە کراوەکانیدا) جـا ئەگـەر ئـەو زاتـە فراوانـی نەکردایـە، ئـەوەش نەدەبـوو، بەڵکـو نەیـان دەتوانـی بیکێڵـنو بیچێنـنو کشـتوکاڵی لەسـەر بکـەن، وەماڵـی لەسـەر دروسـت بکـەنو لەسـەر پشـتی بـە ئارامـی بژیـن.

(٢١): ﴿ قَالَ نُوحٞ ﴾ نـووح سـکاڵای لای پەروەردگـاری کـردو وتـی: ئـەم قسـەو ئامۆژگـاریو یادخسـتنەوەیە نـە سـوودی بـوو بۆیـان، نـە قازانـج، ﴿ إِنَّهُمۡ عَصَوۡنِي ﴾ (واتـە: ئـەوان سـەرپێچیان کـردم) لـەوەی فەرمانـم پێکـردن ﴿ وَٱتَّبَعُواْ مَن لَّمۡ يَزِدۡهُ مَالُهُۥ وَوَلَدُهُۥٓ إِلَّا خَسَارٗا ﴾ واتـە: سـەرپێچی ئـەو پێغەمبـەرە ئامۆژگاریـکارە ڕێنیشـاندەرەیان کرد کـە بانگـی دەکـرد بـۆ خێـرو چاکـە، وە شـوێنی دەسـەڵاتدارو پیاوماقوڵانـی خۆیـان کەوتـن، ئەوانـەی نـە مـاڵو نـە منداڵیـان سـوودیان پـێ گەیانـدن، کاتـێ تووشـی زیـانو لەناوچـوون بـوون، ئـەی چـی دەوتـرێ بـە کەسـێ ملکەچـیو گوێڕایەڵیـان بـکات؟!

(٢٢): ﴿ وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا كُبَّارٗا ﴾ واتـە: پیـلانو فڕوفێڵـی زۆر گەورەیـان کـرد، لـە ڕوو بـەڕوو بوونـەوەی حـەقو ڕاسـتیدا.

(٢٣): ﴿ وَقَالُواْ ﴾ بانگیـان کـردن بـۆ هاوبەشـدانانو لـە لایـان جوانیـان کـردوو پێیانیان وت: ﴿ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمۡ ﴾ (واتـە: دەسـت هەڵنەگـرن لـە پەرسـتراوەکانتان) بانگیـان

کـردن بـۆ دەمارگیـری لەسـەر ئـەوەی لەسـەری دەڕۆیشـتن لـە هاوبەشـدانان، وە واز نەهێنـن لـەوەی بـاوو باپیرانـی پێشـوویان لەسـەری دەڕۆیشـتن، پاشـان پەرسـتراوەکانیان دیـاری کـردو وتیـان: ﴿ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴾ (واتـە: دەسـت هەڵنەگـرن لـە پەرسـتنی وودو سـوواعو یەغـووثو یەعـووقو نەسـر).

ئەمانـە نـاوی پیـاو چاکانـێ بـوون، کاتێـک مـردن شـەیتان لـە پێـش چـاوی گەلەکەیانـی جـوان کـرد کـە وێنەیـان بکێشـن، بـۆ ئـەوەی بـە تەماشـا کردنیـان چووسـتو چـالاک ببـن لـە بەندایەتـی کردنـی خـوادا، پاشـان ماوەیەکـی زۆری بەسـەردا ڕۆیشـت، خەڵکانێکـی تـر هاتـن جگـە لـەوان، شـەیتان پێـی وتـن: بەڕاسـتی پێشـینانتان ئەوانەیـان دەپەرسـتو دەپاڕانـەوە لێیـانو ئەوانەیـان دەکـرد بـە هۆکارێـک بـۆ بارینـی بـاران، جـا پەرسـتنیان، ئـا لەبـەر ئەمەیـە دەسـەڵاتدارەکانیان ئامۆژگـاری شـوێنکەوتووەکانیان دەکـرد کـە واز لـە پەرسـتنی ئـەم بتانـە نەهێنـن.

(٢٤): ﴿ وَقَدْ أَضَلُّوا كَثِيرًا ﴾ واتـە: بەڕاسـتی دەسـەڵاتدارە گـەورەکان بـە بانگـەواز کردنیـان خەڵکێکـی زۆریـان گومـڕا کـرد، ﴿ وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا ضَلَالًا ﴾ واتـە: ئەگـەر گومڕاییـان لەبـەر بانگـەوازی ڕاسـتەقینەی منـە بۆیـان ئـەوە لـە بەرژەوەنـدی ئەواندایـە، بـەڵام هیـچ سـوودێک وەرناگـرن لـە بانگـەواز کردنـی دەسـەڵاتدارەکانیان تەنهـا گومڕایـی نەبـێ، واتـە: هیـچ جێگایـەک نەماوەتـەوە بـۆ ڕزگـار بـوونو چـاک بوونیـان، لەبـەر ئەمەیـە خـوا ﷻ باسـی سـزاو تۆڵـەی دونیـاو دوارۆژیانـی کـردوە:

(٢٥): ﴿ مِمَّا خَطِيئَاتِهِمْ أُغْرِقُوا ﴾ واتـە: لـەو دەریایـەی دەوری دان ﴿ فَأُدْخِلُوا نَارًا ﴾ جەسـتەیان بـە نقـووم بـوون ڕۆیـی، ڕۆحیشـیان بـە ئاگـرو سـووتان، هەمـوو ئەمانـە بەهـۆی گوناهەکانیانـەوە بـوو کـە پێغەمبەرەکەیـان نـووح ﷺ هـات بـۆ ناویـانو ترسـاندنی لێیـان، وە هەواڵـی پێـدان بـە شـوومیو خراپیـان، بەڵام ئـەوان فەرمایشـتەکەی نووحیـان ڕەت کـردوە، تـا سـزایان لەسـەر پێویسـت بـوو.

﴿ فَلَمْ يَجِدُوا لَهُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْصَارًا ﴾ (واتـە: جگـە لـە خـوا هیـچ یارمەتیدەرێکیـان دەسـت نەکـەوت) سـەریان بخـات کاتـێ سـزایان بـۆ دابـەزی، وە هیـچ کەسـێک ناتوانـێ ڕوو بـەڕووی قـەدەر ببێتـەوە.

(٢٦): ﴿ وَقَالَ نُوحٌ رَبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا ﴾ (واتـە: نـووح فەرمـووی: ئـەی پەروەردگـار مەهێڵـە لەسـەر زەوی هیـچ کەسـێک لـە بێبڕوایـان) بسـوڕێتەوە لەسـەر

ڕووی زەوی.

(٢٧): وە باسی هۆکاری ئەو دوعایەی کردوەو فەرموویەتی: ﴿ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴾ (واتە: چونکە بێگومان ئەگەر تۆ وازیان لێ بێنیت بەندەکانی تۆ گومڕا دەکەن، وە هەر منداڵی تاوانباری سوپاس نەکەر دەخەنەوە) واتە: مانەوەیان زیانێکی ڕووتو پەتیە بۆ خۆیانو بۆ غەیری خۆیان. بۆیە نووح ﷺ ئەم قسەیەی وت، چونکە ئەو لەگەڵ زۆر تێکەڵاویانو شارەزابوون لە خوڕەوشتیان بەو هۆیەوە دەرەنجامی کردەوەکانیانی زانی، لە بەر ئەمەیە خوا ﷻ دوعاکەی گیرا کرد، هەموویانی خنکاند، نووحو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لە بڕواداران ڕزگاری کردن.

(٢٨): ﴿ رَّبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِنًا ﴾ باسکراوانی تایبەت کرد بە هۆی جەخت کردنەوە لە مافەکانیانو پێشخستنی چاکەکانیان، پاشان پاڕانەوەکەی گشتگیر کردوو فەرمووی: ﴿ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا تَبَارًا ﴾ واتە: (وە لە هەموو پیاوانو ژنانی ئیماندار، وە بەشی ستەمکاران زیاد مەکە) تیاچوونو زەرەرمەندیو لە ناوچوون نەبێت.

تەفسیری سوورەتی (نوح) تەواو بوو.

سورة الجن

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا
عَجَبًا ١ يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا ٢
وَأَنَّهُ تَعَالَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا ٣ وَأَنَّهُ كَانَ
يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى اللَّهِ شَطَطًا ٤ وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن تَقُولَ الْإِنسُ
وَالْجِنُّ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ٥ وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ الْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ
مِّنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ٦ وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ
اللَّهُ أَحَدًا ٧ وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا
شَدِيدًا وَشُهُبًا ٨ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ ۖ فَمَن
يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَّصَدًا ٩ وَأَنَّا لَا نَدْرِي أَشَرٌّ أُرِيدَ
بِمَن فِي الْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ١٠ وَأَنَّا مِنَّا الصَّالِحُونَ
وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ ۖ كُنَّا طَرَائِقَ قِدَدًا ١١ وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن نُّعْجِزَ
اللَّهَ فِي الْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَهُ هَرَبًا ١٢ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا الْهُدَىٰ
آمَنَّا بِهِ ۖ فَمَن يُؤْمِن بِرَبِّهِ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا ١٣

**تەفسیری سوورەتی (الجن)**

**مەککییە (٢٨) ئایەتە**

**بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە**

(١): ﴿ قُلْ ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ بە خەڵکی بڵێ: ﴿ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ ﴾ (واتە: نیگام بۆ کرا کە بێگومان چەند کەسێک لە جنۆکە گوێیان گرت) خوا ناردنی بۆ لای پێغەمبەرەکەی بۆ بیستنی ئایەتەکانی قورئان، بۆ ئەوەی ببێتە حوججەو بەڵگە بەسەریانەوەو نیعمەتیان بەسەردا تەواو بێت، وە ببن بە وریاکەرەوەو ترسێنەر بۆ گەلەکەیان.

وە خوا ﷻ فەرمانی کرد بە پێغەمبەرەکەی هەواڵەکەیان بۆ خەڵکی بگێڕێتەوە، ئەویش ئەوە بوو ئەوان کاتێ ئامادەی بوون وتیان: گوێ بگرن، جا کاتێ گوێیان گرت لە ماناکانی تێگەیشتن‌و حەقیقەت‌و ڕاستیەکانی (قورئان) گەیشتە دڵەکانیان. ﴿ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ﴾ (وتیان: بە ڕاستی ئێمە قورئانێکی) سەرسووڕهێنەری بەرزمان بیستووە، پڕە لە داواکاری بەرزو جوان.

(٢): ﴿ يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ ﴾ (واتە: ڕێنمایی دەکات بۆ ڕێی ڕاست)، (الرشد): ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو ئەوانەی کە خەڵکی ڕێنمایی دەکات بۆ بەرژەوەندی دین‌و دونیایان. ﴿ فَآمَنَّا بِهِ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا ﴾ (واتە: ئێمەش بڕوامان پێکرد، وە هەرگیز کەس ناکەین بە هاوبەشی پەروەردگارمان)، جا کۆیان کردەوە لە نێوان ئەو بڕوایەی هەموو کارە خێرەکان دەچێتە ناویەوە، وە لە نێوان تەقواو خۆپارێزی، کە وازهێنان لە شەڕی لەخۆ گرتووە، وە هۆکاری پاڵنەری بڕواهێنانیان دانا بەوەی کە فێری بوونە لە ڕێنماییەکانی قورئان، وە ئەوەشی لەخۆی گرتووە لە بەرژەوەندی‌و سوودەکان‌و دوور کەوتنەوە لە زیانەکان، بەڕاستی ئا ئەوە ئایەت‌و نیشانەیەکی مەزن‌و بەڵگەیەکی

یەکلاکەرەوەیــە بــۆ کەســێ ڕووناکــی پێ وەربگــرێ، وە ڕێنمایــی وەربگرێ بــە هیدایەتی قورئان.

ئــا ئــەم بڕواهێنانــە بــە ســوودە، بــە بەرهەمــە بــۆ هەمــوو کارێکــی خێــر، بوونیــات نراوە لەســەر ڕێنمایــی قورئــان، بــە پێچەوانــەی بڕواهێنانــی کــوێرو مەجلیســی دەشــتەکی بێئاگا، وە خــوو پێــوە گرتــووو ڕاهاتوو لەســەری‌و، وێنــەی ئەوانــە، بەڕاســتی ئــەوە بڕواهێنانێکی لاســاییکەرەوەیە لــە ژێــر مەترســی گومــانو ڕووداوو کۆســپەکاندایە.

(٣): ﴿ وَأَنَّهُۥ تَعَٰلَىٰ جَدُّ رَبِّنَا ﴾ واتــە: بــەرزی بــۆ مەزنــی ئــەو زاتــەو پیــرۆزی بــۆ ناوەکانی، ﴿ مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةً وَلَا وَلَدًا ﴾ (واتــە: هیــچ هاوســەرو منداڵێکــی بــۆ خــۆی دانەنــاوە) جــا لــەوەوە مەزنــی خوایــان زانــی، کــە ڕێی نیشــاندان لەســەر پووچــی ئــەوەی پێی وایــە ئەو زاتــە هاوســەرو منداڵــی هەیە، چونکــە خاوەن مەزنــی تەواویە لــە هەموو ســیفەتێکدا، دانانی هاوســەرو منــداڵ ئــەوە ڕەتدەکاتــەوە، چونکــە دژی تــەواوی بێنیازی ئــەو زاتەیە.

(٤): ﴿ وَأَنَّهُۥ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى ٱللَّهِ شَطَطًا ﴾ (واتــە: بێگومــان گێــلو گەمژەکەمان کە ئیبلیســە) قســەی نالەبارو دوور لە ڕاســتی هەڵدەبەســت دەربارەی خوا، قســەکانی ســنووری تێپەڕاندبــوو، هیــچ پاڵــی نەنا بــۆ لای ئەوە تەنهــا گەمژەیــی‌و لاوازی عەقڵی نەبــێ، ئەگەرنا ئەگــەر ژیــرو دڵنیــا بووایە، دەیزانــی چی دەڵێ.

(٥): ﴿ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن تَقُولَ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴾ واتــە: ئێمــە پێــش هاتنــی ئــەو قورئانــە فریــو دراو بوویــن، ســەرکردەو دەســەڵاتدارەکان لــە جنۆکــەو ئادەمیــزاد ئێمەیان هەڵخەڵەتاندبــوو، گومانی باشــمان پــێ دەبردن، وامــان دەزانی جورئەت ناکــەن درۆ بە ناوی خــواوە بکــەن، ئا لەبــەر ئەوەیە ئێمــە پێش هاتنی ئــەم قورئانە لەســەر ڕێگای ئــەوان بووین. جــا ئەمڕۆ کە حەقو ڕاســتیمان بــۆ دەرکەوت، ئــەو ڕێگایەمان گرتەبــەرو ملکەچی بووین، وە گــوێ نادەین بە قسەی هیچ کەســێک دژ بــە هیدایەت بێ.

(٦): ﴿ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ﴾ واتــە: ئادەمیزاد جنۆکەیان دەپەرســتو پەنایــان بــۆ دەبــردن، لە کاتی ترس‌و ناخۆشــیدا، جــا مرۆڤەکان وایــان کرد لە جنۆکــەکان کــە زیاتــر یاخیبــن‌و خۆیــان بە گــەورە بزانــن، کاتێک کــە بینیــان ئادەمیزاد دەیانپەرســتن‌و پەنایان بــۆ دەبردن.

پێدەچــێ ڕانــاوی (الواو) لــە ﴿ فَزَادُوهُمْ ﴾ بگەڕێتەوە بــۆ جنۆکە، واتــە: جنۆکەکان ترس‌و دڵەڕاوکێــی زیاتریان خســتە دڵــی ئادەمیــزادەوە، کاتێ بینیــان پەنایان پێ دەبــەن، بۆ ئەوەی

زیاتـر پشـتیان پـێ ببەسـتن، ئادەمیـزاد ئەگـەر بچووبایە نێـو دۆڵو شـیوێکی ترسـناکەوە دەیـوت: پەنـا دەگرم بـە گەورەی ئەم شـیوە لـە گەمژەکانـی گەلەکەی.

(٧): ﴿ وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا۟ كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ ٱللَّهُ أَحَدًا ﴾ واتـە: کاتێ نکوولـی زیندوو بوونەوەیان کـرد، ڕوویـان کردە هاوبەشـدانانو یاخیبـوون ﴿ وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ ﴾ واتـە: دەگەڕاین بە شـوێن دەنگوباسـی ئاسـماندا تاقیمـان دەکردنـەوە، ﴿ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا ﴾ واتـە: (کەچـی دیمان پڕ کـراوە لە پاسـەوانی بەهێز) لە گەیشـتن بە دەورووبـەری‌و نزیک بوونـەوە لێـی، ﴿ وَشُهُبًا ﴾ واتە: فڕێـی دەدات بۆ ئەو کەسـەی گوێی هەڵخسـتووە، ئەمەش بـە پێچەوانـەی نەریتـی پێشـوومان بێگومـان ئێمـە ئەوسـا دەمانتوانـی بگەیـن بـە هەواڵی ئاسمان.

(٩): ﴿ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ ﴾ (واتـە: بێگومـان ئێمـە جـاران دادەنیشـتین لـە چەنـد شـوێنێک لە ئاسـمان بـۆ گوێ گرتـن)، هەواڵـی ئاسـمانمان وەردەگـرت ئەوەندەی خـوا ویسـتی لەسـەر بوو.

﴿ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ﴾ واتـە: (بەڵام هەر کەسـێک لە ئێسـتا کە بە دواوە گـوێ بگـرێ تیرێکی ئەسـتێرە دەبینـێ) لە بۆسـەدایە بـۆی‌و ئامادەکراوە بـۆ لەناوچوون‌و ترسـانی، واتـە: ئەمـە پلـەو پایەیەکـی مـەزن‌و هەواڵێکـی بـێ پایانـی هەیـە، وە جەختیان کـردەوە بەڕاسـتی خوا دەیـەوێ لەسـەر زەویـدا ڕووداوێکی گـەورە ڕووبـدات لەخێر یان لـە شـەڕ، لە بـەر ئەمەیـە وتیان:

(١٠): ﴿ وَأَنَّا لَا نَدْرِىٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴾ (واتـە: وە بەڕاسـتی نازانیـن ئایـا خراپـی ویسـتراوە بـۆ ئەوانـەی کـە لەسـەر زەویـن، یـان پەروەردگاریـان ڕێنمایـی ویسـتووە بۆیـان) بێگومـان یان دەبـێ ئەمە بێ، یان دەبـێ ئەوە بـێ، چونکە ئەوان کارەکەیـان بینـی گۆڕابـوو لەسـەریان، بـە گۆڕانێـک سەرسـام بـوون پێی، بـە زیرەکی‌و وورییـی خۆیـان زانیـان ئەمـە کارێکـە خـوا دەیـەوێ لەسـەر زەویـدا ڕووبـدات، لەمەدا ئـەدەب‌و ڕەوشـتیان دەردەکەوێـت، کاتـێ خێریـان داوەتـە پاڵ خـوا ﷻ‌و بکەری شـەڕو خراپەیـان بـاس نەکـردوە، ئەمیـش وەک ئـەدەب‌و ڕەوشـتێ لەگـەڵ خوادا.

(١١): ﴿ وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ ﴾ واتـە: خراپـەکارو تاوانبارو بێبڕوا، ﴿ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا ﴾ واتـە: دەسـتەی جـۆراو جـۆرو هـەواو ئـارەزووی جیاواز لـە یەکتر، هـەر حزب‌و دەسـتەیەک دڵخۆش بـوون بەوەی لـە لایانە.

(١٢): ﴿ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعْجِزَ ٱللَّهَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَهُۥ هَرَبًا ﴾ واتـە: ئێمـە لـەم کاتـەدا تـەواوی دەسـەڵاتی خوامـان بـۆ ڕوون بوەتەوە، وە تـەواوی بێ دەسـەڵاتی خۆیشـمان، بێ گومـان نێوچاوانمـان بەدەسـتی خوایـە، لە دەسـتی خوا دەرناچین لـە زەویـدا، وە هەرگیز لە دەسـتی دەرناچیـن ئەگەر هەڵبێین و هەوڵو کۆشـش بخەینـەکار بە هۆکارەکانـی ڕاکردنو دەرچـون لـە دەسـەڵاتی خوا، هیـچ پەنایـەک نیە جگە لـە پەنای ئـەو زاتـە نەبێت.

(١٣): ﴿ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا ٱلْهُدَىٰٓ ﴾ (واتـە: بە ڕاسـتی ئێمە کاتێ ڕێنماییمان بیسـت) ئەویش قورئانـی پیـرۆز بـوو، ڕێنماییکار بـۆ ڕێگـای ڕاسـت، وە ڕێنماییەکانمان زانـی کاریگەری کـرد لـە دڵەکانمان﴿ ءَامَنَّا بِهِۦ ﴾ (واتـە: بڕوامان پێـی هێنا).

پاشـان باسـی ئەوەیان کرد حـەزی بـڕوادار دەجوڵێنێ، جا فەرمـووی: ﴿ فَمَن يُؤْمِنۢ بِرَبِّهِۦ ﴾ (واتـە: هەرکەسـێ بـڕوا بـە پەروەردگـاری بێنـێ) بـە بڕواهێنانێکـی ڕاسـتگۆیانە، ﴿ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا ﴾ واتـە: (ئیتـر ناترسـێ) نـە لـە کەمـیو نە لـە یاخی بـوون، نە لە ئازارێـک تووشـی دەبـێ، وە ئەگەر سـەلامەت بوو لە شـەڕ، ئـەوە خێری دەسـت دەکەوێ، جـا بڕواهێنـان هۆکارێکـی پاڵنەرە بۆ بەدەسـت هێنانی هەمـوو خێرێـکو ڕەتکردنەوەی لە هەموو شـەڕێک.

وَأَنَّا مِنَّا ٱلْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا ٱلْقَٰسِطُونَ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ
تَحَرَّوْا۟ رَشَدًا ﴿١٤﴾ وَأَمَّا ٱلْقَٰسِطُونَ فَكَانُوا۟ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴿١٥﴾
وَأَلَّوِ ٱسْتَقَٰمُوا۟ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَٰهُم مَّآءً غَدَقًا ﴿١٦﴾ لِّنَفْتِنَهُمْ
فِيهِ ۚ وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِۦ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا ﴿١٧﴾ وَأَنَّ
ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾ وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ
يَدْعُوهُ كَادُوا۟ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ﴿١٩﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَدْعُوا۟ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ
بِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٠﴾ قُلْ إِنِّى لَآ أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا ﴿٢١﴾ قُلْ إِنِّى
لَن يُجِيرَنِى مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا ﴿٢٢﴾ إِلَّا بَلَٰغًا
مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَٰلَٰتِهِۦ ۚ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ
خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴿٢٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْا۟ مَا يُوعَدُونَ فَسَيَعْلَمُونَ
مَنْ أَضْعَفُ نَاصِرًا وَأَقَلُّ عَدَدًا ﴿٢٤﴾ قُلْ إِنْ أَدْرِىٓ أَقَرِيبٌ مَّا تُوعَدُونَ
أَمْ يَجْعَلُ لَهُۥ رَبِّىٓ أَمَدًا ﴿٢٥﴾ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ
أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ
يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا ﴿٢٧﴾ لِّيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا۟ رِسَٰلَٰتِ
رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَىْءٍ عَدَدًا ﴿٢٨﴾

(١٤): ﴿ وَأَنَّا مِنَّا ٱلْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا ٱلْقَٰسِطُونَ ﴾ واتـە: (بێگومـان ئێمـە هەندێكمـان مسـوڵمانین‌و هەندێكمـان) تاوانباریـن‌و لـە ڕێگـای ڕاسـت لامانداوە. ﴿ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ تَحَرَّوْا۟ رَشَدًا ﴾ واتـە: (هـەر كەسێک مسـوڵمان بێـت) ئـەوە ڕێگـای ڕاسـتی دۆزیوەتـەوە، کـە دەیگەیەنێـت بـە بەهەشـت‌و نـازو نیعمە تە كانـی.

(١٥): ﴿ وَأَمَّا ٱلْقَٰسِطُونَ فَكَانُوا۟ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴾(واتـە: بـەڵام ئەوانەی لـە ڕێگای ڕاسـت لایانداوە دەبنە سـووتەمەنی دۆزەخ) ئەویـش پاداشـتی كردەوەكانیانـە، نـەک سـتەمێک لـە لایـەن خـواوە لێیان.

(١٦): جـا بێگومـان ئـەوان ئەگـەر ﴿ ٱسْتَقَٰمُوا۟ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ ﴾(لەسـەر ڕێگـای) ڕاسـت (بووبـان)، ﴿ لَأَسْقَيْنَٰهُم مَّآءً غَدَقًا ﴾واتـە: (ئـەوە پێمـان دەنۆشـین) بـە خۆشـی‌و حەڵاڵی، هیـچ ڕێگـری ئـەوەی لێنەكـردن مەگـەر دژایەتیان.

(١٧): ﴿ لِّنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ﴾واتـە: تـا تاقیـان بكەینـەوە تیایـدا، بـۆ ئـەوەی دەربكـەوێ كـێ ڕاسـتگۆیەو كـێ درۆزنـە، ﴿ وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِۦ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا ﴾ واتـە: هـەر كەسـێ ڕوو وەرگێـڕێ لـە یـادی خـوا كـە كتێبەكەیەتی، وە شـوێنی نەكـەوێ‌و ملكەچی نەبێـت، بەڵكـو لێـی بێئاگـا بێ‌و شـوێنی هەواو هـەوەس بكەوێ، ئـەوە دەیخاتە ناو سـزای دژوارو سـەختەوە.

(١٨): ﴿ وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴾واتە: نەپاڕانەوەی پەرسـتش نە پاڕانەوەی داواكاری، چونكە بەڕاسـتی مزگەوتەكان مەزنترین شـوێنی پەرستشـن، بونیاد نراون لەسـەر دڵسـۆز بوون بـۆ خواو ملكـەچ بوون بـۆ مەزنی‌و عیزەتی ئـەو زاتە.

(١٩): ﴿ وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ ﴾(واتـە: وە بەنـدەی خـوا موحەممـەد ﷺ هەسـتا) لـە خـوا بپاڕێتـەوەو بیپەرسـتێ، جنۆكـەكان بە هـۆی زۆریان لـە دەورو بـەری خەریک بوو،

﴿ عَلَيۡهِ لِبَدٗا ﴾ واتــە: دابیارێــن‌و کەڵەکــە ببــن بەســەریدا، بــە هۆی ســوور بوونیان لەســەر ئــەوەی هێناویەتــی لــە ڕێنمایی.

(٢٠): ﴿ قُلۡ ﴾ ئــەی پێغەمبــەر ﷺ حەقیقەتــی بانگەوازەکەتیان بۆ ئاشــکرا بکــەو پێیان بڵێ: ﴿ أَدۡعُواْ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِهِۦٓ أَحَدٗا ﴾ واتــە: (دڵنیابــن) من بە تەنها خوا دەپەرســتم‌و هاوبەشــی بۆ بڕیــار نــادەم، وە دەســتبەرداری هەموو بتەکان دەبــن‌و هەموو ئەوانەش کــە هاوبەش دانەران دەیپەرســتن جگە لــەو زاتە.

(٢١): ﴿ قُلۡ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا رَشَدٗا ﴾ (واتــە: بەڕاســتی مــن نــە زیــان نــە ڕێنمایــی ئێــوەم بەدەســت نیە) من بەنــدەم هیچم بە دەســت نیە لــە کاروبارەکانــداو لــە بەڕێوەبردندا.

(٢٢): ﴿ قُلۡ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٞ ﴾ واتــە: هیــچ کەســێک نیــە پەنــای بۆ ببــەم ڕزگارم بــکات لــە ســزای خوا، جا ئەگــەر پێغەمبــەر ﷺ، تــەواو ترینی نــاو خەڵکی هیچی بەدەســت نەبــێ نــە زیان‌و نــە ســوود، وە نەتوانی بەرگری لە نەفســی خۆی بــکات ئەگەر خــوا بیەوێ زیانــی لێبــدات، جگــە لــە ئــەو لە خەڵکــی لــە پێشــترن نەتوانن بەرگــری لە خۆیــان بکەن، ﴿ وَلَنۡ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدًا ﴾ واتــە: (وە بێجگــە لــە خــوا شــک نابــەم) پەناگــەو یارمەتی دەرێک.

(٢٣): ﴿ إِلَّا بَلَٰغٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَٰلَٰتِهِۦ ﴾ واتــە: مــن هیــچ تایبەتمەندیەکــم نیە بەســەر خەڵکەوە، مەگــەر ئــەوە نەبێ خــوا تایبەتــی کردووم بــە گەیاندنــی پەیامەکانــی‌و بانگەشــەی خەڵکی بــۆ لای خــوا، بــەم شــێوەیە بەڵگــەو حوججــە بەجــێ دێ لەســەر خەڵکــی ﴿ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴾ (واتــە: وە هەرکەســێ بــێ فەرمانــی خــواو پێغەمبەرەکــەی بــکات ئەوە بێگومــان ئاگری دۆزەخ بۆ ئــەوە تیا دەمێنێتەوە بە هەمیشــەیی). مەبەســت لەمــەدا ســەرپێچی کردنــی بێبڕواییــە، وەک چــۆن دەقــە موحکەمەکانــی تــر بەســتوویانەتەوە، بــەڵام تەنهــا ســەرپێچی کــردن نابێتــە هــۆی مانــەوەی لــە ناو ئاگــردا بە هەمیشــەیی، وەک چــۆن دەقەکانی قورئــان‌و فەرموودەکانــی پێغەمبەرو یەکدەنگی پێشــینی ئــەم ئوممەتــەو زانایانــی بەڵگەن لەســەری.

(٢٤): ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوۡاْ مَا يُوعَدُونَ ﴾ واتــە: تــا بەچــاوی خۆیــان (ئــەو ســزایانە دەبینــن) وە دڵنیــان لەســەر ئــەوەی ئــەو ســزایە دەبــێ تووشــیان ببــێ ﴿ فَسَيَعۡلَمُونَ ﴾ لــەو کاتەدا حەقیقەتــی کاروبارەکــە بە چاکــی دەزانــن ﴿ مَنۡ أَضۡعَفُ نَاصِرٗا وَأَقَلُّ عَدَدٗا ﴾ (واتە: کێ یارمەتیــدەری کەمتــرەو ژمــارەی کەمــە) کاتــێ دەبینــن کەســێک نیــە یارمەتیــان بدات‌و

خۆشـیان توانای سـەرکەوتنیان نیـە، وە کاتێ کە بە تەنها لێپرسـینەوەیان لەگـەڵ دەکرێت، وەک چـۆن یەکـەم جـار دروسـت کران.

(٢٥): ﴿ قُلْ ﴾ پێیـان بڵـێ ئەگـەر پرسـیاریان لێکـردیو وتیـان: ﴿ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ ﴾ یونـس.(واتـە: ئـەو بەڵێنو هەڕەشـەیە کـەی دێتـە دی)؟ ﴿ إِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ مَا تُوعَدُونَ أَمْ يَجْعَلُ لَهُ رَبِّي أَمَدًا ﴾ واتـە: (مـن نازانـم ئاخـۆ نزیکـە ئـەو ڕۆژی دواییەی کە بەڵێنتـان پێـدراوە یـان پەروەردگارم) ماوەیەکـی دوورو درێـژی بۆ داناوە، زانسـتی ڕۆژی دوایـی تەنهـا لـەلای خوایە.

(٢٦): ﴿ عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِ أَحَدًا ﴾ (واتـە: هـەر خوایـە زانا بـە نهێنیەکان ئاگـادار نـاکات بەسـەر نهێنی خۆیـدا) هیـچ یەکێـک لـە بەدیهێنراوەکانـی، بەڵکو تاکو تەنهایـە بە زانسـتو زانیـاری دەربارەی نهێنـیو شـاراوەو پەنهانەکان.

(٢٧): ﴿ إِلَّا مَنِ ارْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ ﴾ واتـە: (مەگـەر پێغەمبەرێکـی کـە لێـی ڕازی بێـت) ئـەوە بێگومـان هەواڵی دەداتـێ بەپێی ئـەوەی حیکمەتی دەیخـوازی کە هەواڵـی پێ بدات، چونکـە بێگومـان پێغەمبـەران وەکـو غەیری خۆیـان نین، خوا ﷻ پشـتیوانی لێکـردوون بە پشـتیوانی کردنێـک بـەو جۆرە پشـتیوانی لە هیـچ بەدیهێنـراوێ نەکردوە، وە ئەوەیشـی بە وەحـی ناردوویەتی پاراسـتوویەتی، تاوەکـو خۆی بیگەیەنـن، بەبێ ئەوەی شـەیتانەکان لێی نزیـک بینەوە بـە زیاد کـردن یان کەمکردنـی، لەبـەر ئەمەیە فەرموویەتـی: ﴿ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَدًا ﴾ واتـە: بێگومـان فریشـتەکان بـە فەرمانی خـوا دەیپارێزن.

(٢٨): ﴿ لِّيَعْلَمَ ﴾ تـا بزانـێ بـەوە، ﴿ أَن قَدْ أَبْلَغُوا رِسَالَاتِ رَبِّهِمْ ﴾ (واتـە: کـە سروشـی خـوای خۆیـان گەیاندووە) بـەوەی بـۆی داناون لـە هـۆکارەکان، ﴿ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ ﴾ (واتـە: خـوا ﷻ ئاگـادارە) بەوەی لـە لایانە، وە ئەوەیشـی دەیشـارنەوەو ئاشـکرای دەکەن، ﴿ وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَيْءٍ عَدَدًا ﴾ (واتـە: وە هەمـوو شـتێکی هەژمـار کـردوە بە هەژمـار کردن).

## لەم سوورەتەدا سوودو وەدەستهاتوویەکی زۆر هەن:

یەکـەم: بوونـی جنۆکە، بێگومـان ئەوان ئـەرک پێسـپێردراونو فەرمان پێکـراونو قەدەغە لێکـراون، پاداشـت دەدرێنـەوە بەپێـی کردەوەکانیـان، هەروەکو چـۆن لەم سـوورەتەدا بە ڕوونـی هاتووە.

دووەم: بەڕاسـتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ نێـردراو بوو بـۆ لای جنۆکە، هەروەک چـۆن نێردرا

بــوو بــۆ لای ئادەمیــزاد، خــوا ﷻ چەنــد جنۆکەیەکــی نــارد بــۆ لای، تــا گــوێ لــە قورئان بگــرنو گەلەکەیــان ئاگــادار بکەنەوە.

سێیەم: زیرەکــیو زرنگــی جنۆکــە، وە زانیاریــان دەربــارەی حــەقو ڕاســتی، ئــەوەی کە پەلکێشــی کــردن بــۆ بڕواهێنان دڵنیــا بوونیان بــوو لە هیدایەتــی قورئانو جوانی ڕەوشــتیان بــوو لــە گفتوگۆکردندا.

چــوارەم: گرنگــی دانی خــوا بــە پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە پاراســتنی ئــەو پەیامــەی هێناویەتی. کاتــێ مــژدەی پێغەمبەرایەتی دەســتی پێکــرد، خوا ﷻ ئاســمانەکانی تەنی بوو بە پاســەوانی ئەســتێرەکان، شــەیتانەکانیش پەیتــا پەیتــا شــوێنەکانیان بەجــێ دەهێشــتو بێــزار بــوون لــە بۆســە دانانــی ئەســتێرەکان، بەڕاســتی خــوا بــەو قورئانــە ڕەحمی کــرد بە ســەر زەویو ئەوەیشــی تیایدایــە، بــە ڕەحــم کردنــێ کە ئەنــدازە ناکــرێ، خوا ویســتی ڕێیان پێ نیشــان بــدات، ویســتی ئایــنو شــەریعەتەکەی ئاشــکرا بــکات لەســەر زەویــدا، کــە دڵــەکان پێی بگەشــێنەوەو ژیــرەکان پێــی خۆشــحاڵ بن، وە دروشــمەکانی ئیســلامی پێ ئاشــکرا بکات، بتپەرســتانو هاوبەشــدانەرانی پــێ لەنــاو ببات.

پێنجەم: سووربوونی جنۆکەکان بۆ گوێ گرتنی پێغەمبەر ﷺ وە کۆبوونەوەیان لەسەری.

شەشــەم: بەڕاســتی ئــەم ســوورەتە فەرمــان کــردن بــە یەکتاپەرســتیو قەدەغەکــردن لــە هاوبەشــدانانی لەخــۆ گرتــووە، وە بارودۆخــی خەڵکــی ڕوون کردۆتەوە، کــە بێگومان هەر یەکێــک لە ئــەوان شایســتەی بەندایەتی بۆ کــردن نیە بە قــەد مســقاڵە زەڕەیەکیش، چونکە پێغەمبــەر موحەممــەد ﷺ ئەگــەر ئەو هیچ ســوودو زیانێکی بەدەســت نەبێ بۆ کــەس، بەڵکو تەنانــەت بــۆ نەفســی خۆیشــی، زانــراوە بێگومــان هەموو خەڵکــی بەو شــێوەیەن، لــە هەڵەو ســتەمە کەســێک ئەمە وەســفی پــێ بکــرێ بە پەرســتراو لەگــەڵ خوادا.

حەوتــەم: بەڕاســتی زانســتەکانی غەیــبو پەنهــان تەنیــا خــوا دەیانزانــێ، هیــچ یەکێک لە بەدیهێنــراوەکان نایانزانــێ، مەگەر کەســێ خــوا پێی ڕازی بــێو تایبەتی کردبێ بە زانســتی شــتێ لــە پەنهان.

تەفسیری سوورەتی (الجن) تەواو بوو.


سُورَةُ المُزَّمِّل

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ (١) قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا (٢) نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا
(٣) أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا (٤) إِنَّا سَنُلۡقِي عَلَيۡكَ قَوۡلٗا
ثَقِيلًا (٥) إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـٔٗا وَأَقۡوَمُ قِيلًا (٦) إِنَّ لَكَ فِي
ٱلنَّهَارِ سَبۡحٗا طَوِيلٗا (٧) وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا (٨)
رَّبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذۡهُ وَكِيلٗا (٩) وَٱصۡبِرۡ
عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهۡجُرۡهُمۡ هَجۡرٗا جَمِيلٗا (١٠) وَذَرۡنِي وَٱلۡمُكَذِّبِينَ
أُوْلِي ٱلنَّعۡمَةِ وَمَهِّلۡهُمۡ قَلِيلًا (١١) إِنَّ لَدَيۡنَآ أَنكَالٗا وَجَحِيمٗا (١٢)
وَطَعَامٗا ذَا غُصَّةٖ وَعَذَابًا أَلِيمٗا (١٣) يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ
وَكَانَتِ ٱلۡجِبَالُ كَثِيبٗا مَّهِيلًا (١٤) إِنَّآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ رَسُولٗا شَٰهِدًا
عَلَيۡكُمۡ كَمَآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ رَسُولٗا (١٥) فَعَصَىٰ فِرۡعَوۡنُ ٱلرَّسُولَ
فَأَخَذۡنَٰهُ أَخۡذٗا وَبِيلٗا (١٦) فَكَيۡفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرۡتُمۡ يَوۡمٗا
يَجۡعَلُ ٱلۡوِلۡدَٰنَ شِيبًا (١٧) ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرُۢ بِهِۦۚ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَفۡعُولًا
(١٨) إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٞۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا (١٩)

## تەفسیری سوورەتی (المزمل)
## مەککییە (٢٠) ئایەتە
## بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە

(١-١١): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ﴾ (المزمل): ئـەو کەسـەیە خۆی داپۆشـیوە بە جلەکەی وەک (المدثر) ئەمە وەسـفێکە لـە پێغەمبەری خوادا بـووە، کاتـێ خـوا رێـزداری کـردوە بـە پەیامەکـەی، وە دەسـتی پێکـردوە لەگەڵیدا بـە دابەزینی وەحی خـۆی بۆی، لـە رێگای جبریل ، جا شـتێکی بینی پێشـتر شـتی لـەو جـۆرەی نەبینیبـوو، وە کـەس ناتوانێ جێگیـریو چەسـپاو بـێ لەسـەری جگـە لـە پێغەمبـەران، سـەرەتا تووشـی جـۆرێ لـە تـرسو خەمۆکـی بوو کاتـێ جبریلـی بینی، رۆیشـت بۆماڵەوە فەرمووی: {زمِّلوني زمِّلوني} واتە: دامپۆشـن دامپۆشـن. ماسـولکەی نێوان شـانو سـنگی دەلەرزین لە ترسـا.

پاشـان جبریـل هـات بـۆ لای فەرمووی: (إقرأ) واتـە: بخوێنە، وتـی: (ما أنـا بقـاريء) واتە: مـن خوێندەواریـم نیـە، جبریـل  گوشـی بـە خۆیەوە تـا مانـدوو بـوو، ئـەو راپدەهێنا لەسـەر خوێندنـەوە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ دەسـتی کرد بە خوێندنەوە، پاشـان خوا ﷻ چەسـپاوی کـردو وەحـیو نیگـای بـە دوای یەکـدا بۆ نـارد، تا گەیشـت بـە قۆناغـێ هیـچ یەکێک لـە پێغەمبـەران پێـی نەگەیشـتبوو، پاکـی بۆ خـوا ئای چەنـدە جیاوازە لـە نێوان سـەرەتای پێغەمبەرایەتـیو کۆتاییەکـەی، ئـا لەبـەر ئەمەیـە خـوا بـەم وەسـفە دواندوویەتـی، کـە لە سـەرەتای وەحیـدا بوونی هەبـوو تیایدا.

جـا خـوا ﷻ لێـرەدا فەرمانی پێکـردوە بەو پەرستشـانەی پەیوەسـتن پێیەوە، پاشـان فەرمانی پێکـردوە بە خۆڕاگرتن لەسـەر ئازاردانـی گەلەکەی، پاشـان فەرمانی پێکرد بـە راگەیاندنی بـە ئاشـکراو بانگەواز کردنـی گەلەکەی بـۆ لای خوا ﷻ.

لێرەدا فەرمانی پێکردوە بە بەرێزترینو چاکترین پەرستشەکان، ئەویش بریتیە لە نوێژ، وە بە چاکترینی کاتەکان ئەویش شەونوێژە، لە بەزەییو میهرەبانی ئەو زاتە فەرمانی پێنەکرد بە شەو نوێژ بە درێژایی شەو، بەڵکو فەرمووی: ﴿ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾ (واتە: شەو هەستە شەونوێژ بکە مەگەر کەمێک نەبێت) پاشان ئەندازەی ئەوەی کردوەو فەرموویەتی: ﴿ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ ﴾ واتە: (نیوەی یان کەمێ) لە نیوەی ﴿ قَلِيلًا ﴾ بەوەی سێیەکی شەو بێت، ﴿ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ ﴾ (واتە: یان کەمێ لێی زیاد بکە) لە سەرووی نیوە، ئەو کات دەبێتە سێ یەکو وێنەی ئەوە، ﴿ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ﴾ (واتە: وە دەوری قورئان بکەرەوە بە لەسەرخۆیی) چونکە دەورکردنەوەی قورئان بە لەسەرخۆیی بیرکردنەوەو تێڕامانی تێدا بە دەست دێت، دڵیش پێی دەجوڵێو پەرستش دەکرێ بە ئایەتەکانی، وە تەواو بۆی ئامادە دەبێت.

بە ڕاستی خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا سَنُلۡقِي عَلَيۡكَ قَوۡلٗا ثَقِيلًا ﴾ واتە: ئەم قورئانە قورسو سەنگینەت پێ ڕادەگەیەنین، واتە: ماناکانی مەزنەو وەسفەکانی گەورەیە، ئەوەشی بەم وەسفە بێت، حەقی خۆیەتی ئامادەکاری بۆ بکرێو بخوێنرێو بیر بکرێتەوە لەوەی لەخۆی گرتووە.

پاشان باسی حیکمەتی کردوە لە فەرمانەکەیدا بە شەو نوێژ کردن، جا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ ﴾ واتە: نوێژ کردن تیایدا دوای خەو، ﴿ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـٔٗا وَأَقۡوَمُ قِيلًا ﴾ واتە: نزیکترە بۆ بەدەستهێنانی مەبەستەکانی قورئان، دڵو زمان گرێ دەدرێن بە قورئانەوە، سەرقاڵی کەم دەبێتەوە، تێدەگا لەوەی دەیخوێنێو کارەکانی بۆ ڕێک دەبن.

ئەمە بە پێچەوانەی ڕۆژ، ئەو مەبەستە بەجێ نایەت تیایدا، لەبەر ئەمەیە فەموویەتی: ﴿ إِنَّ لَكَ فِي ٱلنَّهَارِ سَبۡحٗا طَوِيلٗا ﴾ واتە: (بەڕاستی تۆ لە ڕۆژدا) بەدوای بەرژەوەندیو بژێوی ژیانتدا دەگەڕێی، ئەوەش دڵ سەرقاڵ دەکات، بە تەواوەتی یەکلا نابێتەوە بۆی. ﴿ وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ﴾ گشتگیرە بۆ هەموو جۆرەکانی یادکردنەوە بە گشتی، ﴿ وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا ﴾ واتە: یەکلا ببەوە بۆ خواو بگەڕێرەوە بۆ لای، ئەویش دابڕانە بە دڵ لە دروستکراوەکان، وە ناساندنێتی بە خۆشەویستی خوا، وە هەموو ئەوانەی نزیکی دەکاتەوە لێی، ﴿ رَّبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ ﴾ ئەمە ناوی ڕەگەزە هەموو ڕۆژهەڵاتەکانو ڕۆژئاواکان دەگرێتەوە، ئەو زاتە بەرزە خوای ڕۆژهەڵاتەکانو ڕۆژ ئاواکانە، ئەوەشی تیایاندایە لە ڕووناکیەکان، وە ئەوەشی کە بەرژەوەندیە، ئەو زاتە پەروەردگاری هەموو شتێکە، وە

دروستکەرو بەڕێوەبەرێتی.

﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ هیچ پەرستراوێک نیە جگە لە خوای بەرز، ئەو زاتە شایستەیە تایبەت بکرێت بە خۆشەویستیو بە مەزنداناو بە گەورەداناو ڕێزگرتن، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا ﴾ واتە: پارێزەرو ڕێکخەری هەموو کاروبارەکانتە بە گشتی، کاتێ خوا فەرمانی پێکرد بە نوێژ کردن بە تایبەتیو بە یادکردنەوە بە گشتی، ئەوەش توانایەکی بەهێز بۆ بەندە دروست دەکات لە خۆڕاگرتن لەسەر نارەحەتیەکانو کاروبارە قورسەکان، ئنجا فەرمانی پێکرد دان بەخۆدا بگرێ لەوەی نکوولیکاران دەربارەی دەیڵێنو جنێوی پێ دەدەن، وە جنێو بەوەش دەدەن کە هێناویەتی، وە فەرمانی پێکردوە بە شوێنی فەرمانی ئەودا بڕواو هیچ بەربەستێک ڕێگری لێنەکات، وازیان لێ بێنێ بە وازلێهێنانێکی جوان، ئەویش ئەو وازلێهێنانەیە کە بەرژەوەندی وادەخوازێت، ئەو وازلێهێنانەی ئازاردانی تێدانیە، بەڵکو وازیان لێبهێنێو ڕوویان لێوەربگێڕێ، وە لەو قسانەشی کە ئازاری دەدەن، وە فەرمانی کردوە بە گفتوو گۆ لەگەڵیاندا بەو جۆرەی کە زۆر چاکە، ﴿ وَذَرْنِى وَٱلْمُكَذِّبِينَ ﴾ واتە: وازم لێبێنە بۆ ئەو بەدرۆدانەرانە، ئەگەرچی مۆڵەتم پێداون پشتگوێیان ناخەم.

کە دەفەرموێ: ﴿ أُو۟لِى ٱلنَّعْمَةِ ﴾ واتە: ئەو خاوەن نازو نیعمەتو دەوڵەمەندانەی یاخیو سەرکەش بوون کاتێ خوا ڕزقو ڕۆزی بۆیان فراوان کردو لە فەزڵو چاکەی خۆی بۆی زیاد کردن، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ٦ أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ ٧ ﴾العلق، (واتە: بەڕاستی مرۆڤ یاخی دەبێ * کە خۆی بینی دەوڵەمەند بووە)، پاشان هەڕەشەی لێکردن بەوەی کە تۆڵەی لەلایە، جا فەرموویەتی:

(١٢-١٤): ﴿ إِنَّ لَدَيْنَآ ﴾ واتە: بە ڕاستی لە لای ئێمە هەیە ﴿ أَنكَالًا ﴾ واتە: سزایەکی سەختو توند، کردوومانە بە کۆتو زنجیری قورسو گران بۆ ئەو کەسەی بەردەوامە لەسەر گوناح، ﴿ وَجَحِيمًا ﴾ واتە: ئاگرێکی هەڵگیرساو، ﴿ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ ﴾ (واتە: وە خواردنێک لە گەروو دەگیرێت)، ئەویش بە هۆی تاڵیو قیزەونیو ناخۆشی تامیو بۆنە پیسو بۆگەنەکەی.

﴿ وَعَذَابًا أَلِيمًا ﴾ واتە: بە ئێشو تۆقێنەر، ئەویش ﴿ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ ﴾ (واتە: لە ڕۆژێکدا کە زەویو چیاکان دێنە لەرزە) لە ترسو نارەحەتی مەزن، ﴿ وَكَانَتِ ٱلْجِبَالُ ﴾ وە کێوە دامەزراوەکان، ئەوانەی کەڕو پتەون، ﴿ كَثِيبًا مَّهِيلًا ﴾ واتە: بە جۆرێ

ورد دەبـن) وەکـو تەپۆڵکـەی لـم پـەرش‌و بڵاویان لـێ دێت، پاشـان دوای ئـەوە هەپرون دەبـن، تا دەبنـە تـەپ‌و تۆزێکی پـەرش‌و بڵاو.

(١٥-١٦): ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَٰهِدًا عَلَيْكُمْ كَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ ٱلرَّسُولَ فَأَخَذْنَٰهُ أَخْذًا وَبِيلًا ﴾، واتـە: خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ستایشـی پەروەردگارتان بکـەن لە سـەر ناردنی ئـەم پێغەمبـەرە نەخوێنـدەوارە عەرەبیە مژدەدەرو ترسـێنەرە، شـایەتە لەسـەر ئۆممەتەکـەی بە کردەوەکانیان، بۆیە سوپاسـگوزاری بکەن‌و هەسـتن بـە بەجێهێنانی ئـەم نیعمەتـە گەورەیە.

دەخیلـە بێبـڕوای نەکەن سـەرپێچی پێغەمبەرەکەتان بکـەن، دەرەنجام وەکـو فیرعەونتان لێ بێـت، کاتـێ خوا مووسـای نارد بـۆ لای، بانگی کـرد بۆ لای خـواو فەرمانی یەکتاپەرسـتی پێکـرد، بـەڵام ئەو بەڕاسـتی نەزانی، بەڵکو سـەرپێچی کـرد، بۆیە خوا ﷻ تۆڵـەی لێکردەوە بە تۆڵە سـەندنێکی زۆر سـەخت.

(١٧-١٨): ﴿ فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا ﴿١٧﴾ ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرٌۢ بِهِۦ ﴾ واتـە: جـا چـۆن ڕزگارتـان دەبێ لـە ڕۆژی دواییـدا، ئـەو ڕۆژە ترسـناکەی بە ترس‌و سـامناکی خـۆی منـداڵ پیـر دەکات، وە بـێ گیانە مەزنـەکان دەتوێنەوە، ئاسـمان لەت‌و پـەت دەبێ‌و ئەسـتێرەکانیش پـەرش‌و بڵاو، ﴿ كَانَ وَعْدُهُۥ مَفْعُولًا ﴾ واتـە: هەر دەبێ بەڵێنی خـوا بێتە دی، هیـچ بەربەسـتێک لە بەردەمیـدا نیە.

(١٩): ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴾ واتـە: بێگومـان ئـەم ئامۆژگاریـەی خـوا ﷻ هەواڵـی پێـداوە، دەربـارەی دۆخـی ڕۆژی دوایی‌و مەترسـیەکانی، ئامۆژگاریەکـە بـڕواداران‌و خۆپارێـزان پەنـدی لێوەردەگـرن، ﴿ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴾ واتـە: (هەر کەسـێ بیـەوێ) ڕێگایەک دەگرێ کـە بیگەیەنێتـە پەروەردگاری، ئەویش بە شـوێنکەوتنی شـەریعەتەکەی، بە ڕاسـتی خـوا ﷻ ڕوونی کردۆتـەوە بە ئەوپەڕی ڕوون کردنـەوە، وە دەری خسـتووە بـە ئەوپەڕی دەرخسـتن.

لـەم دەقـەدا بەڵگە هەیە لەسـەر ئـەوەی بێگومان خـوا ﷻ توانـای داوە بە بەندەکانی لەسـەر کردەوەکانیـان، وە دەسـەڵاتی پێـداون، نـە وەک ئـەوەی جبریـەکان، وتوویانە: بە ڕاسـتی کردەوەکانیـان ڕوو دەدات بەبـێ ویسـتی خۆیان، ئەمـە پێچەوانەی عەقـڵ‌و نەقڵە.

﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيْلِ وَنِصْفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِى ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقْرِضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ٢٠﴾

(٢٠): ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيْلِ وَنِصْفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَ﴾ خـوا ﷻ لـە سـەرەتای ئـەم سـووڕەتەدا باسـی کردوە، کـە بێگومـان ئـەو فەرمانی کـردوە بـە پێغەمبەرەکـەی بە هەسـتان بۆ شـەو نوێژ لـە نیوەی شـەودا، یان سـێیەکی یـان دوو بەش لە سـێ بەشـی، بنەمـا لەمەدا ئەوەیـە ئۆممەتەکـەی پێشـەنگن لـەوەدا لە حوکمو بڕیـارەکان.

وە لـەم شـوێنەدا باسـی کـردوە پێغەمبەری خـوا ئـەوەی جێبەجـێ کـردوە، لەگـەڵ دەسـتەیەک لەوانـەی لەگەڵیـدا بـوون لـە بـڕواداران، کاتـێ دیاریکردنی ئـەو کاتەی فەرمانـی پێکـراوە قـورس‌و گرانـە لەسـەر خەڵکـی، خـوا ﷻ هەواڵیـداوە کە ئاسـانی کـردوە لە سـەریان بە ئەوپـەڕی ئاسـان کردن، جـا فەرموویەتـی: ﴿وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ﴾ واتـە: دەزانـێ بـە ئەندازەی شـەوو ڕۆژ، وە ئـەوەی رابـردوەو ئەوەیشـی رانەبـردووە.

﴿عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ﴾ واتـە: بێگومـان خـوا دەزانـێ کـە ئێوە نازانـن ئەندازەی کاتی شـەو نوێـژ بکـەن، بەبـێ زیـادەو کـەم، چونکە ئـەوە بـە ئاگابـوون‌و مانـدوو بوونێکـی زیاد لە پێویسـت دەخـوازێ، واتـە: بۆی ئاسـان کـردوون، وە فەرمانی پـێ کردوون بەوەی ئاسـانە لەسـەرتان، یەکسـانە زیـاد بـێ لـەو ئەندازەیـە یـان کەمتـر بێـت، ﴿فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ﴾ (واتـە: دەی ئەوەنـدە بۆتان ئاسـانە لە قورئـان دەوری بکەنەوە) لـەوەی دەیزانن‌و لەوەشـی نابێتـە ئەرک بەسـەرتانەوە، ئـا لەبـەر ئەمەیە ئەو کەسـەی نوێژ دەکات لە شـەودا فەرمانـی پێکـراوە بـە نوێـژ کردن مـادام چوسـت‌و چالاکە، جا ئەگەر سـارد بوویـەوە یان نەیتوانـی، یـان خـەوی هـات، با پشـوو بدات بـۆ ئـەوەی نوێژەکەی بـە دڵنیاییـەوە ئەنجام بـدات، پاشـان باسـی هەندێ هـۆکاری گونجـاوی کردوە بـۆ ئاسـان کـردن فەرموویەتی: ﴿عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ﴾ (واتـە: خـوا دەزانـێ کـە لەمـەولا کەسـانێکتان نەخـۆش

دەبێـت)، گـران دەبـێ بـە لایانـەوە نوێـژ کـردن لە دوو بەش لە سـێ بەشـی شـەو، یان لە نیـوەی، یـان لە سـێیەکی، دەی با کەسـی نەخۆش چۆن ئاسـانە لەسـەری بەو شـێوەیە نوێژ بـکات، هەروەهـا فەرمانـی پـێ نەکـراوە بـە پێوە نوێـژ بـکات کاتێ کە لـە توانایـدا نیە، بەڵکـو نوێژی سـوننەت گـران بوو لەسـەری دەتوانێ وازی لــێ بهێنێ، وە پاداشـتی ئەوەی بۆ هەیـە لە کاتـی لـەش سـاغیدا ئەنجامیداوە.

﴿ وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: خـوا زانیویەتی کەسـانێک لە ئێـوە گەشـتیارن دەگەڕێـن بەسـەر زەویدا بـۆ بازرگانـی، بۆ ئەوەی پێویسـتیان بـە خەڵک نەبـێو دەسـت لـە خەڵکـی پـان نەکەنـەوە، واتـە: گەشـتیار حاڵـی وایـە نوێـژی لەسـەر سـووک بکـرێ، لەبـەر ئەمەیـە نوێژی فەرزی لەسـەر سـووک کـراوە، بـۆی ڕەوا بینراوە کۆکردنـەوەی دوو نوێـژ لە یەک کاتـدا، وە کورتکردنـەوەی ئەو نوێژانەی چـوار ڕکاتن، بـە هەمـان شـێوە: ﴿ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَٱقْرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ ﴾ (واتـە: وە کەسـی دیکـەی واتـان دەبـن کـە دەجەنگـن لەڕێـی خوادا ئنجـا بخوێنـەوە لـە قورئـان ئەوەندەی بۆتـان ئاسـانە)، خوا ﷻ باسـی دوو ئاسـانکاری کـردوە، ئاسـانکاریەک بۆ کەسـێکی لەش سـاغی نیشـتەجێ، لـەش سـاغی لەبەرچـاو گرتووە بەبـێ ئـەوەی کات لەسـەرخۆی دیاری بـکات، بەڵکـو هەرچی لـە توانایدا بێ نوێـژە چاکەکان دەکات ئەویش سـێیەکی شـەوە لە دوای نیـوەی یەکەم.

وە ئاسـانکاریەک بـۆ نەخـۆش یـان گەشـتیار، یەکسـانە گەشـتەکەی بـۆ بازرگانـی بێت، یـان بـۆ عیبـادەت، لە کوشـتار، یـان جیهاد، یـان حەج، یـان عەمـرە، وە وێنـەی ئەوانەش، هەروەهـا چاوپۆشـی ئـەوە دەکـرێ کە لـە توانایـدا نیە.

سـوپاسو سـتایش بـۆ خـوا کە لەسـەر ئـەم ئۆممەتـە نارەحەتـیو گرانـی دانەنـاوە، بەڵکو شـەریعەتەکەی ئاسـان کـردوەو دۆخی بەنـدەکانو بەرژەوەنـدی ئاینو جەسـتەو دونیایانی لەبەرچـاو گرتووە.

پاشـان فەرمانـی کردوە بـە بەندەکان بە دوو پەرسـتش، ئـەو دووانەش: دایـکو کۆڵەکەی پەرستشـەکانن. بەجێهێنانـی نوێـژ، کـە ئاینی ئادەمیـزاد دانامـەزرێ بەوە نەبـێ، وە زەکات دان کـە ڕووناکـی بڕواهێنانـە، بـە زەکات دان دەسـتگیرۆیی هـەژارانو نەداران دەسـتەبەر دەبـێ، لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتی: ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ بـە پایەو مـەرجو تەواوکاریەکانی، ﴿ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقْرِضُواْ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ﴾ واتـە: تەنهـاو تەنهـا لـە پێنـاو خـوادا، لـە نیـازو

نیەتێکـی ڕاسـتگۆیانەوەو جێگیربوونـی نەفـسو دەروون، بـەماڵێکـی پـاک، دەچێتـە ناو ئەمـەوە خێر کردنی پێویسـتو پەسـند.

پاشـان هانیـداون لەسـەر خێـرو کردەوەکانـی دیکە بە گشـتی، فەرموویەتـی: ﴿ وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا ﴾ (واتـە: هـەر چاکەیـەک پێـش بخـەن بـۆ خۆتـان لای خوا دەسـتان دەکەوێت ئەوە لای خـوا چاکترو گەورەترە لەڕووی پاداشـتەوە)، چاکەیـەک بەرانبـەرە بـە دە ئەوەنـدەی وێنەی خـۆی، بۆ حەوت سـەد ئەوەندە، تـا چەندین ئەوەنـدەی زیاتر.

وە بـا بزانـێ بەڕاسـتی تۆزقاڵـە زەڕەیەک لـە خێرو چاکـە لەم ماڵـەدا بەرانبەرە بـە چەندین ئەوەنـدەی دونیـا، وە ئەوەیشـی لەسـەریەتی لـە ماڵـی پـڕ لـە نـازو نیعمـەت لـە حـەزوو ئـارەزووەکان، خێـرو چاکـە لـەم دونیایـەدا پێکهاتـەی خێـرو چاکەیە لـە ماڵـی مانەوەی هەمیشـەییدا، وە تـۆو بنچینـەو بنەمایەتـی، بەداخـەوە بۆ ئـەو کاتەی کـە لە بـێ ئاگاییدا لە دەسـت چـوو، وە حەسـرەت بۆ ئەو سـەردەمانەی بەسـەر چوون بەبـێ کـردەوە چاکەکان، ئـای بـۆ دڵانـێ ئامۆژگـاری بەدیهێنەرەکەیان هیـچ کاریگەریەکـی نیە بۆیـان، وە هاندانی ئـەو کەسـەی لەخـۆی بەڕەحمتـرە سـوودو کەڵکی نەبـوو بۆی.

سـوپاسو سـتایش بـۆ تۆ ئـەی خوایە، سـکاڵا هـەر بۆ لای تـۆ دەکـرێ، وە تەنهـا داوا لە تـۆ دەکـرێ، هیچ پشـتو پەناگەیەک نیە جگـە لە تـۆ ﴿ وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ وە لـە فەرمان کردن بـە داوای لێخۆشـبوون دوای هاندان لەسـەر گوێڕایەڵـیو چاکەکردن، سـوودێکی گەورەی تێدایە.

ئەویـش ئەوەیـە کە بەڕاسـتی بەنـدە خاڵی نابێ لـە کەمتەرخەمی لـەوەی فەرمانـی پێکراوە، یـان ئەوەیـە هـەر ئەنجامی نـادات، یان ئەنجامـی دەدات بە شـێوەیەکی ناتـەواو، جا خوا ﷻ فەرمانـی کـردوە بە پینەکردنی ئـەو کەمتەرخەمیانە بە داوای لێخۆشـبوون، چونکە بەڕاسـتی بەنـدە گونـاە دەکات بـە درێژایی شـەوو ڕۆژ، جا هەر کاتێ خـوا بەمیهرەبانـیو لێبوردەیی خۆی داینەپۆشـێ، ئەوە بەڕاسـتی تیاچووە.

تەفسیری سوورەتی (المزمل) تەواو بوو.


سورة المدثر
بسم الله الرحمن الرحيم
يا أيها المدثر ١ قم فأنذر ٢ وربك فكبر ٣ وثيابك فطهر ٤
والرجز فاهجر ٥ ولا تمنن تستكثر ٦ ولربك فاصبر ٧ فإذا نقر
في الناقور ٨ فذلك يومئذ يوم عسير ٩ على الكافرين غير يسير ١٠
ذرني ومن خلقت وحيدا ١١ وجعلت له مالا ممدودا ١٢ وبنين
شهودا ١٣ ومهدت له تمهيدا ١٤ ثم يطمع أن أزيد ١٥ كلا إنه
كان لآياتنا عنيدا ١٦ سأرهقه صعودا ١٧ إنه فكر وقدر ١٨

## تەفسیری سوورەتی (المدثر)
## مەککییە (٥٦) ئایەتە
## بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە

(١-٧): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ١ قُمْ فَأَنذِرْ ٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ٤ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ٥ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ٦ وَلِرَبِّكَ فَٱصْبِرْ ٧ ﴾:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴾ واتـە:لە پێشـەوە باسـکرا کـە (المُزَّمّـل والمُدَّثـر) بـە یەک مانـا هاتوە، خـوا ﷻ فەرمانی کردوە بـە پێغەمبەرەکەی بـە کۆشـش کـردن لـە پەرستشـیدا، ئـەو پەرستشـانەی کورتهەڵهێنراونو تێپەڕن، جا لە پێشـەوە فەرمـان بە پێغەمبـەر کراوە بە پەرستشـە تێپـەڕەکانو کورتهەڵهێنـراوەکان، وە ئارامگرتـن لەسـەر ئازاردانـی گەلەکەی.

وە لێـرەدا فەرمانـی پێکـراوە بـە بانگـەوازو بڵاوکردنـەوەو ترسـاندن، جـا فەرموویەتـی: ﴿ قُمْ ﴾ واتـە: بە چووسـتو چالاکـەوە هەسـتە ﴿ فَأَنذِرْ ﴾ خەڵکی بێدار بکەرەوە بە قسـەو کـردارەکان، کـە مەبەسـتی پـێ بەدەسـت دێـت، وە ڕوونکردنـەوەی حاڵـی ترسـێنراو، تا ئـەوە ببێتـە مایـەی وازهێنانـی. ﴿ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴾ واتـە: پەروەردگـارت بـە مـەزن بزانـە بە یەکتاپەرسـتی، بـا مەبەسـتت لـە بێدارکردنـەوەدا تەنها لە پێناو خـوا بـێ، وە بەندەکانیش بە مەزنـی بزانـنو پەرستشـی بەجێبهێنن.

﴿ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴾ (واتـە: جلەکانـت، پۆشـاکت پـاک ڕابگـرە) دەگونجـێ مەبەسـت لـە پۆشـاک کردەوەکانـی بێ بە گشـتی، بە پـاک کردنەوەیـانو پاڵفتەکردنیـانو ئامۆژگاری پێکردنیـان، وە ئەنجامدانیـان بـە تەواوتریـن شـێوەو بـژار کردنیـان لەوانـەی کـە پووچو خراپـنو لەوانـەش کەمو کـوڕی دەخەنە نـاو ئاینـەوە لـە هاوبەشـدانانو ڕووپاماییو دوو ڕوویـیو سەرسـام بـوون بەخـۆو لـووت بـەرزیو بێ ئاگایـی، وە جگـە لەوانـەش لەوەی

فەرمـان کـراوە بـە بەندە بـە دوورکەوتنـەوە لە پەرستشـی.
هەروەهـا دەچێتـە نـاو ئـەوەوە پاکڕاگرتنی پۆشـاکەکان لە پیسـی، چونکە ئەمە لـە تەواوی پاکڕاگرتنـی کردەوەکانـە، بـە تایبـەت لـە نوێـژدا، زۆرێ لـە زانایـان وتوویانـە: لابردنی پیسـی لەسـەر پۆشـاکەکان مەرجێکە لـە مەرجەکانـی نوێژ.
وە دەگونجـێ مەبەسـت لـە پۆشـاکەکەی: پۆشـاکی ئاسـایی بـێ، بێگومـان ئـەو فەرمانـی پێکـراوە بـە پاکردنەوەیان لـە هەموو پیسـیەکان لە هەمـوو کاتەکاندا، بە تایبـەت لە کاتی چوونـە نـاو نوێـژەکان، جـا ئەگـەر فەرمانـی پێکرابوو بـە پاکڕاگرتنـی ڕووکـەش، ئەوە بێگومـان پاکڕاگرتنـی ڕووکـەش بەڵگەیە لەسـەر تـەواوی پاکـی ناوەوە.
﴿ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ﴾ (واتـە: بەردەوامبـە لە وازهێنان لە بتپەرسـتیو گوناه) دەگونجێ مەبەسـت لـە (الرجـز) بتـەکان بێ، کـە لەگەڵ خـوادا دەپەرسـترێن، بۆیە خـوا ﷻ فەرمانـی کردووە بـە وازهێنـانو خۆبـەری کـردن لێیان، وە ئەوەیشـی دەدرێتە پاڵیان لە قسـە یـان کردەوە.
دەگونجـێ مەبەسـت لـە (الرجـز) کـردەوە خراپـەکان بـێ بە گشـتی، وە قسـەکانیش، جا ئەوکاتـە دەبێتـە فەرمانێـک بۆی بـە وازهێنان لـە گوناهە بچـووکو گەورەکان، ئاشـکراو نهێنیـان، جـا دەچێتە نـاو ئەوەوە هاوبەشـدانانو ئەوەیشـی لە خـواری ئەوەوەیە، ﴿ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴾ واتـە: منـەت مەکـە بەسـەر خەڵکیـدا بەوەی پێـت بەخشـیوون، لـە نازونیعمەتە دینـیو دونیاییـەکان، ئـەو منەت کردنـە بـە زۆر بزانیتو وا ببینـی بە هـۆی چاکەکانتەوە فەزڵـت هەیە بەسـەریاندا.
بەڵکـو چاک بـە لەگەڵ خەڵکیـدا ئەوەندەی لـە توانا تدایـە، وە چاکەکانی خـۆت لەگەڵیاندا لەبیـر خۆت ببـەرەوە، داوای کـرێو پاداشـت مەکە جگە لە خـوا نەبێ، وە ئەو کەسەیشـی چاکـەی لەگـەڵا دەکەیتو جگە لەویـش وەک یەک تەماشـایان بکە.
بێگومـان وتـراوە: مانـای ئەمە شـتێ مەدە بـە خەڵکی چاوەڕوانـی ئەوەی لێ بکـەی ئەویش زیـاد لـەوەی پێـت بەخشـیوە کۆمەکیـت بـکات، ئـەوکات ئەمـەش تایبـەت دەبـێ بـە پێغەمبەر ﷺ.
جـا پێغەمبـەر ﷺ فەرمـان بـەرداری پەروەردگـاری بـوو پەلـەی تێدا کـرد، خەڵکـی بێدار کـردەوە، وە ڕوونـی کـردەوە بۆیان بە بەڵگە ڕوونـەکان هەمـوو داواکاریەکانی خوا، خوای بـە مـەزن دانـاو خەڵکـی بانگ کـرد بۆ بـە مـەزن دانانـی، کـردەوە ئاشـکراو نهێنیەکانی پـاک کـردەوە لە هەمـوو خراپەیـەک، وە وازی هێنا لە هەمـوو ئەوانـەی دووری دەخەنەوە

لـە خوا، لە بتـەکانو شـوێنکەوتووانیان، هەروەها شـەڕو خراپـەو شوێنکەوتووانیشــیان. وە منــەتو چاکــەی هەیــە بەســەر خەڵکیــەوە -دوای منەتــی خــوا- بەبــێ ئــەوەی داوای پاداشــتو سوپاســگوزاری لێ کردبن لەســەر ئــەو منەتە، لــە پێناوی خوادا ئارامــی گرت، بە تەواوتریــن ئارامگرتــن، ئارامــی گرت لەســەر گوێڕایەڵی خــوا، وە لە ســەرپێچی کردنی، وە لەســەر قەزاو قەدەرە بە ئێشــەکان، تا پێشــکەوت بەســەر خــاوەن عەزمەکان لــە پێغەمبەران، صەڵاتو ســەلامی خوا لەســەر هەموویــان بێت.

(٨-١٠): ﴿ فَإِذَا نُقِرَ فِي ٱلنَّاقُورِ ﴿٨﴾ فَذَٰلِكَ يَوۡمَئِذٖ يَوۡمٌ عَسِيرٌ ﴿٩﴾ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ غَيۡرُ يَسِيرٖ ﴿١٠﴾ ﴾

﴿ فَإِذَا نُقِرَ فِي ٱلنَّاقُورِ ﴾ واتــە: هــەر کاتێــک فووکــرا بە صوردا بۆ هەســتانەوە لە گــۆڕەکانو کۆکردنــەوەی بەدیهێنــراوەکان، بۆ زیندووکردنــەوەو گەڕانەوە.

﴿ فَذَٰلِكَ يَوۡمَئِذٖ يَوۡمٌ عَسِيرٌ ﴾ (واتــە: ئــەو ڕۆژە ڕۆژێکــی ســەختو گرانــە) لەبــەر زۆری مەترســیو نارەحەتــیو ســەختیەکانی، ﴿ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ غَيۡرُ يَسِيرٖ ﴾ (واتــە: بەســەر بێبڕوایــان ئاســان نیــە) چونکــە بــێ ئومێد بوون لــە هەمــوو خێرێــک، وە دڵنیا بــوون بــە لەناوچوون، بــە تێگەیشــتن لە دەقەکە ئەوە دەبەخشــێ بە ڕاســتی ئەو ڕۆژە بەســەر بڕواداراندا ســووکو ئاســانە، هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ يَقُولُ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوۡمٌ عَسِرٞ ﴿٨﴾ ﴾القمر، (واتە: بێبڕوایــان دەڵێــن ئەمــە ڕۆژێکی ســەختو گرانە).

(١١-٣١): ﴿ ذَرۡنِي وَمَنۡ خَلَقۡتُ وَحِيدٗا ﴿١١﴾ وَجَعَلۡتُ لَهُۥ مَالٗا مَّمۡدُودٗا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودٗا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمۡهِيدٗا ﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطۡمَعُ أَنۡ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّآۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِأٓيَٰتِنَا عَنِيدٗا ﴿١٦﴾ سَأُرۡهِقُهُۥ صَعُودًا ﴿١٧﴾ إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدۡبَرَ وَٱسۡتَكۡبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ يُؤۡثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا قَوۡلُ ٱلۡبَشَرِ ﴿٢٥﴾ سَأُصۡلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبۡقِي وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٞ لِّلۡبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيۡهَا تِسۡعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ وَمَا جَعَلۡنَآ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةٗۖ وَمَا جَعَلۡنَا عِدَّتَهُمۡ إِلَّا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيَسۡتَيۡقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَيَزۡدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَٰنٗا وَلَا يَرۡتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَمَا يَعۡلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَۚ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡبَشَرِ ﴿٣١﴾ ﴾

ئــەم ئایەتانــە دەربارەی وەلیــدی کوڕی موغیــرە هاتنە خــوار، نکوولیکاری حــەق، دەجەنگا لــە دژی خــواو پێغەمبەرەکــەی بە هەموو جــۆرێ، خوا ﷻ سەرزەنشــتو ســەرکۆنەی کرد بەســەرکۆنە کردنــێ ســەرکۆنەی هیــچ کەســێکی دیکــەی نەکــردوە وەکــو ئــەو، ئەمەش پاداشــتی هــەر یــەک لەوانەیــە نکووڵی حەق دەکەنو پشــت گوێــی دەخەن، کە لــە دونیادا

ڕیسـواو سەرشـۆڕ دەکرێـن، وە بێگومان سـزای دواڕۆژ ڕیسـواکەرترە ﴿ ذَرۡنِي وَمَنۡ خَلَقۡتُ وَحِيدٗا ﴾ واتـە: (واز لـە مـن و ئەو کەسـە بێنە) کە خـۆم بە تەنها دروسـتم کـردوە، بەبێ مـاڵو منـداڵو جگـە لەوانیش، بە بـەردەوام پێی دەبەخشـمو بۆی زیـاد دەکەم، ﴿ وَجَعَلۡتُ لَهُۥ مَالٗا مَّمۡدُودٗا ﴾ واتـە: (وە پێـم داوە داراییەکـی) زۆر ﴿ وَبَنِينَ ﴾ واتـە: وە کوڕانم پێداوە، ﴿ شُهُودٗا ﴾ واتـە: بـەردەوام ئامادەن لە بەردەسـتیدا، لەزەتیان لێ وەردەگرێو پێویسـتیەکانی بـۆ جێبەجێ دەکەنو یارمەتی دەدەن، ﴿ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمۡهِيدٗا ﴾ واتە: دەسـەڵاتم پێ بەخشـیوە لـە ژیانـی دونیـاو هۆکارەکانی، تـا داواکاریەکانـی بۆ ملکەچ بـووە، وە گەیشـتووە بەوەی حـەزی لێـدەکاتو دەیـەوێ، ﴿ ثُمَّ ﴾ دوای ئـەم هەمـوو نیعمـەتو کۆمەکیانە، ﴿ يَطۡمَعُ أَنۡ أَزِيدَ ﴾ واتـە: بە تەمـای نازونیعمەتی دواڕۆژە، وەک چۆن نازونیعمەتی دونیای پێبەخشـراوە، ﴿ كَلَّآ ﴾ واتـە: کارەکـە بـەو جـۆرە نیە ئەو بـە تەمایەتی، بەڵکـو بە پێچەوانەی مەبەسـتو داواکاریەکەیەتی.

ئەویـش بە هـۆی ئـەوەی ﴿ كَانَ لِأٓيَٰتِنَا عَنِيدٗا ﴾ واتە: (بەڕاسـتی ئـەو دەربـارەی ئایەتەکانی ئێمـە کەسـێکی بێبڕوای) کەللەڕەقە، ناسـویەتی، پاشـان نکوڵی کـردوەو بانگی کردوە بۆ حـەقو ڕاسـتی، ملکەچی نەبـووە، بەوەوە نەوەسـتا کـە ڕووی وەرگێڕاوەو پشـتی تێکردوە، بەڵکـو دژایەتیشـی دەکـرد، هەوڵیشـی دەدا بـۆ پـووچ کردنـەوەی، لەبـەر ئەمەیـە خوا ﷻ دەربـارەی فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّهُۥ فَكَّرَ ﴾ واتـە: (بیـری کـردەوە) لە ناخـی خۆیدا، ﴿ وَقَدَّرَ ﴾ (وە هەڵیسـەنگاند) ئـەوەی بیـری لێکردبوویـەوە، بـۆ ئەوەی قسـەیەک بـکات قورئانی پێ پـووچ بکاتەوە،

فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ
﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَا
إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ ﴿٢٥﴾ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾
لَا تُبْقِي وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ وَمَا جَعَلْنَا
أَصْحَابَ النَّارِ إِلَّا مَلَائِكَةً وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا
لِيَسْتَيْقِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَانًا وَلَا يَرْتَابَ
الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَالْمُؤْمِنُونَ وَلِيَقُولَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ
وَالْكَافِرُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا كَذَٰلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ مَن يَشَاءُ
وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَىٰ
لِلْبَشَرِ ﴿٣١﴾ كَلَّا وَالْقَمَرِ ﴿٣٢﴾ وَاللَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ ﴿٣٣﴾ وَالصُّبْحِ إِذَا أَسْفَرَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهَا
لَإِحْدَى الْكُبَرِ ﴿٣٥﴾ نَذِيرًا لِّلْبَشَرِ ﴿٣٦﴾ لِمَن شَاءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ
﴿٣٧﴾ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّا أَصْحَابَ الْيَمِينِ ﴿٣٩﴾ فِي جَنَّاتٍ
يَتَسَاءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ الْمُجْرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا لَمْ نَكُ
مِنَ الْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ
الْخَائِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰ أَتَانَا الْيَقِينُ ﴿٤٧﴾

﴿ فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴾ (واتە: دەک بە کوشت چێ چۆنی هەڵسەنگاند * دووبارە بە کوشت چێ چۆنی لێکدایەوە)، چونکە کارێکی هەڵسەنگاند لە سنووری ئەودا نەبوو، سەرکەوت بەسەر شتێکدا پێی نەگەیشت، نە ئەوو نە وێنەی ئەویش. ﴿ ثُمَّ نَظَرَ ﴾ (واتە: پاشان تەماشای ئەوەی کرد) کە دەیڵێت، ﴿ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴾ (واتە: ئەوسا) ناوچاوانی کرژو ڕووی ترش کرد، بە ڕواڵەتیش دوور کەوتەوە لە حەقو ڕقی لێ بوو.

﴿ ثُمَّ أَدْبَرَ ﴾ واتە: ئنجا پشتی هەڵکرد، ﴿ وَاسْتَكْبَرَ ﴾ (بە فیزەوە) دەرەنجامی هەوڵو کۆششی بیرکردنەوەیو کرداریو گوفتاری، وتی: ﴿ فَقَالَ إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ ﴾ واتە: ئەم قسەیە چیە، بەڵکو قسەی ئادەمیزادە، ئەمە قسەی مرۆڤی ژیر نیە، بەڵکو قسەی خراپەکارانە لە هەموو درۆزنو جادووگەرێ، تورەیی بۆ ئەو، ئای چەندە دوورە لە ڕاستی، ئای چەندە شایستەی زیانو زەرەرمەندیو لەناوچوونە! چۆن بەبیری ویژدانی ئادەمیزاددا دێت کە بەرزترینی قسەکانو مەزنترینیان، فەرمایشتی پەروەردگاری مەزن بچوێنێ بە قسەی دروستکراوە هەژارو ناتەواوەکان؟! یان چۆن دەوێرێ ئەم درۆزنە عینادو کەللەڕەقە لەسەر وەسف کردنی قسەی خوا بەم وەسفە؟ هیچ شایستەی ئەو کەسە نیە، جگە لە سزای توندو بە ئێش، بۆیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبْقِي وَلَا تَذَرُ ﴾ واتە: ئاگرێکە لە سەختیدا هیچ ناهێڵێتەوە لەسەر سزادراو، مەگەر پێی دەگات ﴿ لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ ﴾ واتە: پێستیان ڕەش دەکاتەوەو دەیانبرژێنێ لە سزایدا، وە بێزاریان دەکات بە سەختی گەرماییەکەی، ﴿ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴾ (واتە: نۆزدە فریشتە ئەوەتان بە سەریەوە) لەو فریشتانەی دەرگاوانن، زۆر ڕەقو وشکو توورەن، سەرپێچی خوا ناکەن لەوەی فەرمانیان پێدەکات، وە هەر فەرمانێکیشیان پێ بکرێ جێبەجێی دەکەن، ﴿ وَمَا جَعَلْنَآ

أَصْحَـٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَـٰٓئِكَةً ﴾(واتە: تەنها فریشتەمان کردوە بە کاربەدەستی دۆزەخ) ئەویش بە هۆی توندیو هێزو تواناییان.

﴿ وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾ دەگونجێ مەبەست ئەوەبێ: ژمارەی ئەو فریشتانەمان نەگێڕاوە مەگەر بۆ سزادانیان لە ڕۆژی دواییدا. وشەی (العذاب) ناونراوە بە (فتنة) هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ يَوْمَ هُمْ عَلَى ٱلنَّارِ يُفْتَنُونَ ١٣ ﴾الذاريات، (واتە: ڕۆژێک کە ئەوان بە ئاگری دۆزەخ دەسوتێنرێن).

وە دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ: ئێمە هەواڵمان پێنەداون بە ژماردنیان مەگەر بۆ ئەوەی بزانین کێ بەڕاستی دادەنێتو کێش بە درۆی دەزانێت، ئەوەی لەم دەقەشدا هاتووە بەڵگەیە لەسەر ئەم باسە وەک خوا فەرموویەتی: ﴿ لِيَسْتَيْقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَـٰنًا ﴾(واتە: تا ئەوانەی کتێبیان پێدراوە دڵنیابن، وە بڕوادارەکان بڕواکەیان زیاد بکات). بێگومان خاوەنانی کتێب ئەگەر ڕێک بێ لەگەڵ ئەوەی خۆیاندا پڕاوپڕ بێ دڵنیاییان بە حەق زیاد دەکات، بڕوادارانیش هەرکاتێ خوا ئایەتێکی دابەزاندایە بڕوایان پێ دەهێناو بەڕاستیان دادەنا، ئیمانیان پێی زیادی دەکرد، ﴿ وَلَا يَرْتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾(واتە: هیچیان دوو دڵ نەبن ئەوانەی کتێبیان پێدراوە) واتە: بۆ ئەوەی گومانو دوودڵیان نەمێنێ.

ئەم مەبەستانە گەورەو مەزنن، خاوەن دڵو ژیرەکان گرنگیان پێ دەدەن، ئەویش بریتیە لە کۆشش کردن لە دڵنیایی بوون، وە زیادبوونی بڕوا لە هەموو کاتێکداو لە هەموو بابەتێک لە بابەتەکانی ئاین، وە ڕەتکردنەوەی گومانو خەیاڵەکان کە لە بەرانبەر حەقدا دەخرێنە ڕوو، جا ئەوەی خوا دایبەزاندوە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی کردوویەتی بە هۆکارێک بۆ دەستخستنی ئەم مەبەستە گەورانە، وە جیاکردنەوەی درۆزنان لە ڕاستگۆیان.

لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴾ واتە: (تا بڵێن ئەوانەی کە نەخۆشی) گومانو دوو دڵیو ناپاکیو دوو ڕوویان تێدایە، ﴿ وَٱلْكَـٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَـٰذَا مَثَلًا ﴾(واتە: وە بێبڕواکانیش: خوا چی مەبەستە بەم ژمارەیە کە لە غەریبیدا وەک مەسەل وایە) ئەمە لە ڕووی سەرسام بوونو گومانو بێبڕواییان بە ئایاتو نیشانەکانی خوا. ئا ئەوە لە ڕێنمایی خوایە بۆ ئەو کەسەی ڕێنمایی دەکات، وە گومڕاکردنێتی بۆ ئەو کەسەی کە گومڕایە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴾ جا هەر کەسێ خوا ڕێنمایی کردبێت، ئەوەی دایبەزاندوە بۆ پێغەمبەرەکەی دەیکاتە ڕەحمەتو میهرەبانی بۆی، وە زیادبوون لە ئیمانو ئاینەکەی، وە هەرکەسێ خوا گومڕای کردبێ،

ئەوەی کە دایبەزاندوە بۆ پێغەمبەرەکەی دەبێتە مایەی بەدبەخت بوونو چەواشە کردنی، وە تاریکی بۆی، ئەوەی پێویستە هەواڵی خواو پێغەمبەرەکەی وەربگرێو ملکەچیان بێ. بە ڕاستی کەس ژمارەی لەشکرانی پەروەردگاری تۆ لە فریشتەکانو جگە لەوانیش نازانێ، ﴿إِلَّا هُوَ﴾ (مەگەر هەر خۆی) جا ئەگەر ئێوە نەفامن بە لەشکرەکانی، خوای زانای وردبین هەواڵی پێدان دەربارەیان، ئەوە پێویستە لەسەرتان هەواڵەکە بەڕاست دابنێن بەبێ گومانو دوو دڵی، ﴿وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ﴾ واتە: ئەم ئامۆژگاریو یادخستنەوانە مەبەست پێی گاڵتەو گەپ نیە، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە ببێتە ئامۆژگاریو پەند بۆ ئادەمیزاد، ئەوەی سوودی هەیە بۆیان ئەنجامی دەدەنو ئەوەیشی زیانی هەیە وازی لێدێنن.

(٣٢-٥٦): ﴿كَلَّا وَالْقَمَرِ ﴿٣٢﴾ وَاللَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ ﴿٣٣﴾ وَالصُّبْحِ إِذَا أَسْفَرَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهَا لَإِحْدَى الْكُبَرِ ﴿٣٥﴾ نَذِيرًا لِلْبَشَرِ ﴿٣٦﴾ لِمَنْ شَاءَ مِنْكُمْ أَنْ يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ ﴿٣٧﴾ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّا أَصْحَابَ الْيَمِينِ ﴿٣٩﴾ فِي جَنَّاتٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ الْمُجْرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰ أَتَانَا الْيَقِينُ ﴿٤٧﴾ فَمَا تَنْفَعُهُمْ شَفَاعَةُ الشَّافِعِينَ ﴿٤٨﴾ فَمَا لَهُمْ عَنِ التَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ ﴿٤٩﴾ كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُسْتَنْفِرَةٌ ﴿٥٠﴾ فَرَّتْ مِنْ قَسْوَرَةٍ ﴿٥١﴾ بَلْ يُرِيدُ كُلُّ امْرِئٍ مِنْهُمْ أَنْ يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُنَشَّرَةً ﴿٥٢﴾ كَلَّا بَلْ لَا يَخَافُونَ الْآخِرَةَ ﴿٥٣﴾ كَلَّا إِنَّهُ تَذْكِرَةٌ ﴿٥٤﴾ فَمَنْ شَاءَ ذَكَرَهُ ﴿٥٥﴾ وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ هُوَ أَهْلُ التَّقْوَىٰ وَأَهْلُ الْمَغْفِرَةِ ﴿٥٦﴾﴾:

خوا کە دەفەرموێ: ﴿كَلَّا﴾ لێرەدا بە مانای: بە حەقیقەت، یان بە مانای (ألا) دەستپێکرن دێ (الإستفتاحية)، دیارە خوای بەرزو مەزن سوێندی بە مانگ خواردوە، وە بە شەو کە پشت هەڵدەکات لە کاتی ڕۆیشتنیدا، وە بە بەرەبەیان کاتێ کە ڕوون دەبێتەوە، چونکە ئەوانەی باسکران ئایەتو نیشانە مەزنەکانی خوا لەخۆ دەگرن، کە بەڵگەن لەسەر تەواوی تواناو حیکمەتی خوای بەرز، وە فراوانی دەسەڵاتیو گشتگیری میهرەبانیو دەوردانی زانستی (بە هەموو شتێک).

وە سوێند لەسەر خوراو، فەرمایشتی خوایە: ﴿إِنَّهَا لَإِحْدَى الْكُبَرِ﴾ واتە: (دۆزەخ) یەکێکە لە شتە مەزنە گەورەو سامناکەکان، وە کارە گرنگو بایەخدارەکان، جا ئەگەر ئاگادارمان کردنەوە لێی، ئێوەش لەسەر بەرچاوو ڕوونی بوون دەربارەی ئەم دۆزەخە، هەر کەسێکتان دەیەوێت پێش بکەوێت، با کار بکات بەوەی لە ڕەزامەندی پەروەردگاریو لە ماڵی ڕێزداری نزیکی دەکاتەوە، هەر کەس دەیەوێ لە چاکەو خۆشویستنو ڕەزامەندی

خوا دوور بکەوێتەوە، ئەوە با سەرپێچی بکات، وە نزیک بکەوێتەوە لە ئاگری دۆزەخ، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾ ﴾الكهف، (واتە: وە حەق بڵێ، ئەم قورئانە لە لایەن پەروەردگاتانەوە هاتووە جا هەر کەس دەیەوێت با ئیمان بێنێ، وە هەرکەسیش دەیەوێت با بێبڕوا بێت). ﴿ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ﴾ (واتە: هەموو کەسێک ئەوەی بەدەستی هێناوە) لە کردەوەی ناشرین خراپ، ﴿ رَهِينَةٌ ﴾ (بارمتەی کردەوەکانیەتی) پەیوەستە پێیانەوە، لە گەردنی ئالاونو بە هۆیەوە سزای بۆ پێویست بووە.

﴿ إِلَّآ أَصْحَٰبَ ٱلْيَمِينِ ﴾ (واتە: جگە لە هاوەڵانی دەستی ڕاست، ئەوانە بارمتە نین، بەڵکو ئازادو دڵخۆشن ﴿ فِى جَنَّٰتٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤١﴾ ﴾واتە: لە بەهەشتانێکدان هەموو داواکاریەکانیان هاتووەتە جێ، لە ئەوپەڕی حەوانەوەو ئارامیو دڵنیایی دان، گفتوگۆ لە نێوان یەکتردا دەکەن، پرسیار دەکەن لە حاڵی تاوانباران: واتە: کاتێ دەگەنە بەهەشت، ئایا ستەمکاران ئەوەیان بینی کە خوا بەڵێنی پێدابوون؟

هەندێکیان بە هەندێکی دیکە دەڵێن: ئایا ئێوە تەماشای دۆزەخ ناکەن، تەماشا دەکەن لە ناوەڕاستی دۆزەخدا سزا دەدرێن، پێیان وتن: ﴿ مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ ﴾ واتە: چ شتێک ئێوەی خستووەتە ناو دۆزەخەوە؟ بە هۆی چ شتێ شیاوی بوون ﴿ قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ ﴾ (واتە: ئێمە لە نوێژ کەران نەبووین * وە خۆراکمان نەدەدا بە هەژاران) نە دڵسۆزیان بۆ پەرستراو هەبوو، نە چاکە بۆ هەژارانو نەداران، ﴿ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ ﴾واتە: ڕۆچوو بووین لە پووچو بەتاڵداو دەمە دەمێی حەقمان پێدەکرد. ﴿ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾ (واتە: وە بڕوامان بە ڕۆژی دوایی نەبوو) ئەمە شوێنەواری ڕۆچوونە لە بەتاڵو پووچدا، ئەویش بە درۆدانانی حەقە، لە حەقترینی حەقەکان ڕۆژی دواییە، کە جێگای پاداشتی کردەوەکانە، وە دەرکەوتنی موڵکی خواو بڕیاری دادپەروەری بۆ هەموو بەدیهێنراوەکان.

بەردەوام بووین لەسەر ئەم ڕێگا خراپو پووچە ﴿ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ ﴾واتە: (تا یەخەی پێ گرتین) مردن. کاتێک مردن لەسەر بێبڕوایی ئەو کاتە بیانوو فڕوفێڵیان دەبڕێ، دەرگای هیواو ئومێدیان بەڕوودا دادەخرێ،

فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴿٤٨﴾ فَمَا لَهُمْ عَنِ ٱلتَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ
﴿٤٩﴾ كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ﴿٥٠﴾ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍۭ ﴿٥١﴾ بَلْ يُرِيدُ
كُلُّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً ﴿٥٢﴾ كَلَّا ۖ بَل لَّا يَخَافُونَ
ٱلْءَاخِرَةَ ﴿٥٣﴾ كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذْكِرَةٌ ﴿٥٤﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿٥٥﴾ وَمَا يَذْكُرُونَ
إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ﴿٥٦﴾

﴿ فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴾ (واتە: ئیتر تـكای تـكاكاران هیـچ قازانجێكیـان پـێ ناگەیەنـێ) چونكە ئـەوان تكاو شـەفاعەت ناكـەن تەنها بۆ كەسـی نەبێ خـوا ڕازی بێ تـكای بـۆ بكـرێ، ئا ئەوانـە خـوا ڕازی نیە لـە كاروكردەوەكانیان.

كاتـێ خـوا ﷻ دەرەنجامی سـەرپێچیكارانی ڕوون كـردەوە، وە ترسـاندنی لـەوەی چیان لێ دەكات، دوا بە دوای ئەوە سەرزەنشـتو لۆمـەی ئامادەبووانـی كـردو فەرمـووی: ﴿ فَمَا لَهُمْ عَنِ ٱلتَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ ﴾ واتـە: (ئەوە چیانە) بەرهەڵسـتی دەكـەنو پێشاگان لـە ئامۆژگاریەكانـی (قورئان)، ﴿ كَأَنَّهُمْ ﴾ (وەكـو ئـەوە وان) لـە سـڵ كردنـەوەی سـەختیاندا لـە قورئـان، ﴿ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ﴾ واتـە: وەكـو كـەرە كێویـن دەسـڵمێنەوە، هەندێكیـان بـە هەندێكیـان ڕادەكـەن، ﴿ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍۭ ﴾ واتـە: (هەڵهاتوون لە ترسـی) ڕاوچـی یـان شـێرو وێنـەی ئەوانە.

ئەمـە لـە مەزنتریـن هەڵهاتنە لە حـەق، لەگەڵ ئـەم ڕوو وەرگێـرانو هەڵهاتنەدا، بانگەشـەی گـەورەش دەكەن، جـا ﴿ يُرِيدُ كُلُّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً ﴾ (واتـە: هەر یەكێك لـەوان دەیەوێـت چەندەها نامەی كراوەی) لە ئاسـمانەوە بـۆی دابەزێ، پێـی وایە ملكەچی حـەق نابـێ بـەو جـۆرە نەبـێ، بێگومـان درۆیـان كرد، بـە ڕاسـتی ئـەوان ئەگـەر هەموو بەڵگـەو نیشـانەیەكیان بـۆ بێت بـڕوا ناهێنن هەتـا بە چاوی خۆیان سـزای سـەخت نەبینن، ئـەوان ئایـەتو بەڵگـەی ڕوونیـان بۆ هات كـە حـەق ڕوون دەكاتەوەو ئاشـكرای دەكات، ئەگـەر خێریان تێـدا بووایە بڕوایـان دەهێنا.

لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ كَلَّا ﴾ واتـە: (نەخێـر) ئـەوەی داوای دەكەن پێیـان نادەین، ئـەوان تەنهـا مەبەسـتیان لـەوەدا دەستەوسـانیە، ﴿ بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلْءَاخِرَةَ ﴾ (واتـە: هـەر ناترسـن لـە ڕۆژی دوایی) ئەگەر بترسـانایە، ئـەوەی ڕوویدا لێیـان ڕووی نەدەدا، ﴿ كَلَّآ

﴿ إِنَّهُۥ تَذْكِرَةٌ ﴾ لێرەدا ڕاناوی ﴿ إِنَّهُۥ ﴾ یان دەگەڕێتەوە بۆ ئەم سووڕەتە، یان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەم ئامۆژگاریە لە خۆی دەگری، ﴿ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴾ (واتە: با پەشیمان بینەوە بەڕاستی قورئان پەندو ئامۆژگاریە) چونکە ڕێگای بۆ ڕوون کردوەتەوەو بەڵگەی بۆ داناوە، ﴿ وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾ (واتە: ئامۆژگاری قورئان وەرناگرن) بەڕاستی ویستی خوا جێبەجێ کراوو گشتگیرە، هیچ ڕووداوێکی لێدەرناچێ کەم بێ یاخود زۆر، ئەمە بەرپەرچدانەوەی قەدەریەکانە، ئەوانەی کردەوەی بەندەکان لە چوارچێوەی ویستو مەشیئەتی خوا دانانێن، وە جەبریەکان: ئەوانەن کە پێیان وایە بەندە نە هیچ ویستو مەشیئەتێکی هەیە، نە کردەوە، بەڵکو ئەو مەجبورە لەسەر کارەکانی، جا خوا بۆ بەندەکانی ویستو مەشیئەتو کردەوەی چەسپاند، ئەوەیشی کرد بە شوێنکەوتووی ویستو مەشیئەتی خۆی.

﴿ هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ﴾ واتە: خوا شیاوی ئەوەیە ترسی لێ بکرێو پەرستشی بۆ بکرێ، چونکە ئەو پەرستراوەیە کە نابێ بەندایەتی بکرێ تەنها بۆ ئەو نەبێ، وە شیاوی ئەوەیە ببوورێ لەو کەسەی لێی دەترسێو شوێنی ڕەزامەندی ئەو دەکەوێ.

تەفسیری سووڕەتی (المدثر) تەواو بوو.


سورة القيامة
بسم الله الرحمن الرحيم
لا أقسم بيوم القيامة ١ ولا أقسم بالنفس اللوامة ٢ أيحسب
الإنسان ألن نجمع عظامه ٣ بلى قادرين على أن نسوي بنانه ٤ بل
يريد الإنسان ليفجر أمامه ٥ يسأل أيان يوم القيامة ٦ فإذا برق
البصر ٧ وخسف القمر ٨ وجمع الشمس والقمر ٩ يقول الإنسان
يومئذ أين المفر ١٠ كلا لا وزر ١١ إلى ربك يومئذ المستقر ١٢ ينبؤا
الإنسان يومئذ بما قدم وأخر ١٣ بل الإنسان على نفسه بصيرة ١٤
ولو ألقى معاذيره ١٥ لا تحرك به لسانك لتعجل به ١٦ إن علينا
جمعه وقرآنه ١٧ فإذا قرأناه فاتبع قرآنه ١٨ ثم إن علينا بيانه ١٩

## تەفسیری سوورەتی (القیامة)

## مەککییە (٤٠) ئایەتە

## بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە

(١-٦): ﴿ لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ١ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ٢ أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجۡمَعَ عِظَامَهُۥ ٣ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ٤ بَلۡ يُرِيدُ ٱلۡإِنسَٰنُ لِيَفۡجُرَ أَمَامَهُۥ ٥ يَسۡـَٔلُ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلۡقِيَٰمَةِ ٦ ﴾:

خوا دەفەرمووێ: ﴿ لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾ لێرەدا (لا) بۆ نەفی نەهاتووە، هەروەها زیادەش نیە، بەڵکو بۆ دەستپێکردنو گرنگیدان بە دوای خۆی هاتووە، لەبەر زۆری هاتنی لەگەڵ سوێندا جێگای سەرسوورمان نیە دەستی پێ بکرێ، ئەگەرچی لە بنچینەدا بۆ دەست پێکردن دانەنراوە، جا لەم جێگایەدا سوێند پێخوراو سوێند لەسەر خوراوە، ئەویش زیندووبوونەوەیە دوای مردن، وە هەڵسانەوەی خەڵکە لەناو گۆڕەکانیان، پاش راوەستانیان چاوەڕێ دەکەن پەروەردگار چی بڕیارێ بدات بەسەریاندا، ﴿ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴾ ئەویش هەموو نەفسو دەروونە چاکو خراپەکانە، ناونراوە بە (لوامة) لەبەر زۆری دووبارە بوونەوەو لۆمەکردنی، وە جێگیر نەبوونی لەسەر دۆخێ لە دۆخەکان، وە لەبەر ئەوەی لە کاتی مردندا لۆمەی خاوەنەکەی دەکات لەسەر ئەو کارەی ئەنجامیداوە، بەڵکو نەفسی بڕوادار سەرزەنشتی خاوەنەکەی دەکات لە دونیادا لەسەر زێدەڕۆیی یان کەمتەرخەمی کردنی لە هەقێک لە هەقەکان، یان بێ ئاگا بوونی لە مافی (خواو خەڵک بە گشتی).

جا کۆی کردۆتەوە لەنێوان سوێند خواردن بە پاداشتو لەسەر پاداشت، وە ڕوونی کردۆتەوە کێ شایستەی پاداشتە، پاشان لەگەڵ ئەمەدا هەواڵیداوە بێگومان هەندێ لە نکوڵیکارانو کەللەڕەقان ڕۆژی دوایی بەدرۆدادەنێن، جا فەرموویەتی: ﴿ أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ

﴿ أَلَّن نَّجۡمَعَ عِظَامَهُۥ ﴾ دوای مـردن، هـەروەک خـوا ﷻ لەدەقێکـی دیکـەدا فەرموویەتی: ﴿ قَالَ مَن يُحۡيِ ٱلۡعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٞ ۝٧٨ ﴾یس، (واتـە: ئـەو بێبڕوایـە دەڵـێ: کـێ ئێسـکەکان زیندووەکاتـەوە لـە کاتێکدا کـە ڕزیون)؟ جـا بە هۆی نەفامـیو دژایەتی کردنـی توانای خـوای بە دوورزانی لەسـەر بەدیهێنانی ئێسـکەکانی، کـە ئەوانە کۆڵەکەی جەسـتەن، خواﷻ بەرپەرچـی دایەوە بـە وتەی خـۆیو فەرمـووی: ﴿ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ﴾ واتە: (بەڵێ بـە توانایـن لەسـەر ڕێکخسـتنەوەی) لێـواری پەنجـەو ئێسـکەکانی، ئـەوە پێویسـتکەری دروسـتکردنی هەمـوو بەشـەکانی جەسـتەیە، چونکە ئەگەر سـەر پەنجـەو لێوارەکانی بوونی هەبـوو، ئـەوە دروسـتکردنەوەی جەسـتە تەواو بـووە، نکوولـی کردنی بە هۆی کـەم بوونی بەڵگـە نیە لەسـەر ئـەوە، بەڵکو ئەوەی لە ئەوەوە دەرچوە مەبەسـتو ویسـتی ئـەوە بووە کە زیندووکردنـەوە بـەدرۆ بزانـێ، وە هەروەها مەبەسـتی خراپەکاریو درۆ بووە بە ئەنقەسـت، پاشـان باسـی بارودۆخـی ڕۆژی دوایی کـردووەو دەفەرموێ:

(٧-١٥): ﴿ فَإِذَا بَرِقَ ٱلۡبَصَرُ ۝٧ وَخَسَفَ ٱلۡقَمَرُ ۝٨ وَجُمِعَ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ ۝٩ يَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذٍ أَيۡنَ ٱلۡمَفَرُّ ۝١٠ كَلَّا لَا وَزَرَ ۝١١ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمُسۡتَقَرُّ ۝١٢ يُنَبَّؤُاْ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذِۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ۝١٣ بَلِ ٱلۡإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ بَصِيرَةٞ ۝١٤ وَلَوۡ أَلۡقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ۝١٥ ﴾:

دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِذَا بَرِقَ ٱلۡبَصَرُ ﴾ جـا ئەگـەر ڕۆژی دوایـی هـات چـاوەکان ئەبڵـەق دەبـن بە هـۆی مەترسـییەکی گـەورەوە، بـە جـۆرێ ئەبڵـەق دەبـن لـە ترسـدا نانوقێـن، وەک خوا فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمۡ لِيَوۡمٖ تَشۡخَصُ فِيهِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ۝٤٢ مُهۡطِعِينَ مُقۡنِعِي رُءُوسِهِمۡ لَا يَرۡتَدُّ إِلَيۡهِمۡ طَرۡفُهُمۡۖ وَأَفۡـِٔدَتُهُمۡ هَوَآءٞ ۝٤٣ ﴾إبراهيم، (واتـە: بێگومـان ئـەو دوایـان دەخـات بـۆ ڕۆژێـک کـە چـاوەکان تیایـدا ئەبڵـەق دەبـن * بـە چەسـپانی دەڕۆن سـەریان بـەرز کردۆتـەوە بۆ ئاسـمان پێڵوی چاویـان ناتروکێنن، وە دڵیان خاڵیە لە تێگەیشـتن)، ﴿ وَخَسَفَ ٱلۡقَمَرُ ﴾ واتـە: ڕووناکی دەسـەڵاتەکەی ڕۆیـی، ﴿ وَجُمِعَ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ ﴾ (واتـە: خۆرو مانگ کۆکراونـەوە) ئـەو دووانە کـۆ نەکراونەتەوە لـەو ڕۆژەی خوا دروسـتیانی کـردوە، خوا لە ڕۆژی دواییـدا کۆیـان دەکاتـەوەو مانـگ تاریـک دەکاتو خـۆر دەپێچێتـەوەو ڕووناکی ناهێڵێـت، پاشـان فـڕێ دەدرێنە نـاو دۆزەخەوە، تا بەنـدەکان ببینن ئەو دووانـە، دوو بەندەی ڕامکـراون، وە بـۆ ئـەوەی بیانبینـێ ئەوەی دەیانپەرسـتێ، بەڕاسـتی ئەوانـە درۆزن بوون.

﴿ يَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ ﴾ (واتـە: مرۆڤ) کاتێ ئەو ڕووداوە بێزارکەرانـە دەبینێ (دەڵێ) ﴿ أَيۡنَ ٱلۡمَفَرُّ ﴾ (واتـە: ڕاکـردنو خۆ دەرباز کـردن لە کوێوەیە)، لەوەی تووشـمان بـووە؟ ﴿ كَلَّا لَا وَزَرَ ﴾

واتــە: هیچ پەناگەیــەک نیە جگــە لە خوا.
﴿ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ ﴾ (واتــە: لــەو ڕۆژەدا ئارامگــا تەنهــا لــە لای پەروەردگــاری تۆیــە) بــۆ هەمــوو بەنــدەکان، لــە توانــای هیچ کەســدا نیــە خــۆی بشــارێتەوە، یــان لــەو جێگایە هەڵبێــت، بەڵکــو هــەر دەبــێ بوەســتێنرێ، بۆ ئەوەی پاداشــتی کــردەوەی خــۆی وەربگرێ، لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ﴾ واتە: (لــەو ڕۆژەدا ئادەمیزاد هەواڵــی پێدەدرێ) بــە کۆکردنەوەی کردەوە چــاکو خراپەکانی، لە ســەرەتای کاتەکەیو کۆتایەکــەی، وە هەواڵــی پــێ دەدرێ بە شــتانێک نکووڵی لێنــاکات، ﴿ بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴾ واتــە: (بەڵکــو مــرۆڤ) شــایەتو ئاگادارە بــە حاڵی خــۆی، ﴿ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴾ (واتــە: بــا بروبیانــووی زۆریش بێنێتــەوە) بێگومــان ئــەو بروبیانووانە وەرناگیرێــن، بەراورد ناکرێــن بــەوەی بەنــدە دانی پێــدا نــاوە، بەڵکو خــۆی دان بــە کردەوەکانیــدا دەنێت، وەک خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ ﴾الإسراء (واتــە: پێــی دەوتــرێ نامەکــەت بخوێنەرەوە ئەمڕۆ خۆت بەســە بە حیســاب کەر بەســەر خۆتەوە). جــا بەنــدە ئەگــەر نکووڵــی بــکات، یــان بــڕو بیانــوو بێنێتــەوە لــەوەی ئەنجامیــداوە، ئەوە نکووڵــی کــردنو بیانــوو هێنانەوەی هیچ ســوودێکی نیــە، چونکە بیســتنو بینینی شــایەتی لەســەر دەدەن، ســەرجەم ئەندامانــی جەستەیشــی بــەوەی کردوویەتــی، لەبەر ئــەوە بۆ داوای لێخۆشــبوون کاتو ســوودی نەمــاوە، ﴿ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾الروم (واتــە: جا لەو ڕۆژەدا کەســانێک کە ســتەمیان کــردوە بەهانە هێنانــەوە ســوودیان پــێ ناگەیەنــێ، وە ئــەوان داوایــان لــێ ناکــرێ خــوا لە خۆیــان ڕازی بکەن).

(١٦-١٩): ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾ ﴾:

ئەگــەر جبریــل ﷺ بهاتایــە بــۆ لای پێغەمبــەر بــە وەحــیو نیگــا، وە دەســتی بکردایــە بە خوێندنــەوە بــە ســەریدا، پێغەمبــەر ﷺ بــە هــۆی ســوور بوونی پەلــەی دەکرد پێــش ئەوەی جبریــل لــێ ببێتەوە، لەگــەڵ خوێندنــەوەی جبریلــدا دەیخوێنــدەوە، خوا ﷻ ئــەوەی قەدەغە کرد لێــی، فەرمــووی: ﴿ وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ ﴿١١٤﴾ ﴾طه، (واتــە: پەلــە مەکــە لــە خوێندنــی قورئاندا لە پێــش ئەوەی ســروش کردنەکەی بــۆت تەواو بێت).

لێــرەدا فەرموویەتــی: ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴾ (واتــە: زمانــت مەجوڵێنــە بــە خوێندنــەوەی ســروش تــا پەلــەی تیا بکەیت)، پاشــان خــوا ﷻ گرنتــی ئەوەی پێــداوە هەر دەبــێ بیپارێــزێو بیخوێنێتەوە، وە خوا لە ســنگیدا کــۆی بکاتــەوە، فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴾ ئــەو ســوور بوونــەی لــە دڵتدایــە پاڵنەرەکــەی بــۆ مەترســی لەناوچوونو لەبیرچوونــەوە دەگەڕێتــەوە، جــا ئەگــەر خــوا ﷻ گرنتی پێتدا ئەوە پێویســت بــەوە ناکات، ﴿ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴾ واتــە: ئەگــەر جبریــل ﷺ بــە تەواوەتــی وەحــی خــوای بــۆت خوێنــدەوە، ئــەو کات شــوێنی خوێندنــەوەی ئــەو بکــەوەو بیخوێنەرەوە.

﴿ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴾ واتــە: ڕوونکردنــەوەی ماناکانــی، خوا ﷻ پەیمانی بــە پێغەمبەرەکەی داوە بــە پاراســتنی فەرمایشــتەکەیو پاراســتنی ماناکانــی، ئەمــەش بەرزتریــن شــتێکە کــە ببــێ، پێغەمبــەری خــوا ڕێنمایی پەروەردگــاری جێبەجێ کــرد، کاتێ جبریــل ﷺ قورئانی بخوێندایــە بەســەریدا، لــە دوای ئەمــە بێدەنــگ دەبــوو، ئەگــەر لــێ بوایەتــەوە، ئنجــا ئــەو دەیخوێند.

لــەم ئایەتــەدا ئــەدەبو ڕەوشــتی وەرگرتنی زانســت بەدیدەکرێ، کــە نابێ فێرخواز پێشــی مامۆســتا بکــەوێ، پێــش ئــەوەی لــەو بابەتــە ببێتەوە کە قســەی لەســەر دەکەن، جــا ئەگەر لــێ بــوەوە پرســیاری دەکات ئەوەی لــە پێش چــاوی ئاڵۆزە.

بە هەمان شــێوە ئەگەر ســەرەتای قســەکە پێویســتی بــە بەرپەرچدانــەوە یان پەســەند کردن بــوو، بــا پەلــە نەکات لــە بەرپەرچدانــەوەی یــان وەرگرتنــی، تا لە قســەکەی دەبێتــەوە، بۆ ئــەوەی حــەقو ناحەقی بــۆ دەربکەوێ، وە بۆ ئــەوەی تێبگات بە تێگەیشــتنێ بتوانێ قســەی لەســەر بــکات، وە تیایدایــە: بێگومــان پێغەمبــەر ﷺ هەروەک چــۆن فەرمایشــتەکانی خوای بــۆ ئۆممەتەکــەی ڕوون کردۆتــەوە، بە هەمان شــێوە ماناکانیشــی بــۆ ڕوون کردوونەتەوە.

كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ ٢٠ وَتَذَرُونَ ٱلْءَاخِرَةَ ٢١ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ
٢٢ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ٢٣ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ ٢٤ تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا
فَاقِرَةٌ ٢٥ كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ ٢٦ وَقِيلَ مَنْ رَاقٍ ٢٧ وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلْفِرَاقُ
٢٨ وَٱلْتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ ٢٩ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمَسَاقُ ٣٠ فَلَا
صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ٣١ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ٣٢ ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ يَتَمَطَّىٰٓ
٣٣ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ٣٤ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰٓ ٣٥ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ
أَن يُتْرَكَ سُدًى ٣٦ أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ ٣٧ ثُمَّ كَانَ
عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ٣٨ فَجَعَلَ مِنْهُ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ
وَٱلْأُنثَىٰٓ ٣٩ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ٤٠

(٢٠-٢٥): ﴿كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ ﴿٢٠﴾ وَتَذَرُونَ ٱلْءَاخِرَةَ ﴿٢١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ ﴿٢٤﴾ تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ ﴿٢٥﴾﴾:

﴿كَلَّا بَلْ﴾ واتە: ئا ئەمە بێ ئاگایی‌و ڕوو وەرگێران لە ئامۆژگاری خواو بیركردنەوەی پێویست كردوە بۆتان، كە ئێوە، ﴿تُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ﴾ (هەر دوونیاتان خۆش دەوێ‌و) كۆششی بۆ دەكەن، لەبەر حەزو لەزەتەكانی، باوی دەدەن‌و پێشی دەخەن بەسەر دوارۆژدا، گوێ نادەن بەوەی كردەوەی بۆ بكەن، چونكە دنیاو نازونیعمەت‌و لەزەتەكانی بەپەلەن، مرۆڤیش ڕاهاتووە بە خۆشەویستی شتی بە پەلە، نازونیعمەتە بەردەوامەكانی دوارۆژیش لە داهاتوودایە، لەبەر ئەوەیە بێئاگابوون لێی‌و وازتان لێ هێنا، هەروەک ئەوەی بۆ دوارۆژ دروست نەكرابن، وە وەک ئەوەی ئەمماڵە ماڵی مانەوەی هەمیشەیی بێت، تەمەنە زێڕینەكانی پێ دەبەخشێ، بە درێژایی شەوڕۆژ هەوڵی بۆ دەدات، بەمە ڕاستیەكانتان بەسەردا هەڵگێڕایەوە، زەرەرمەندی بە دەست هات لەوەی كە بە دەست هات، جا ئەگەر باوی دوارۆژتان بدایە بەسەر دونیادا، وە تەماشای دەرەنجامەكانتان بكردایە بە تەماشاكردنی كەسی بەرچاو ڕوون‌و عاقڵ، ئەوە سەركەوتوو دەبوون‌و قازانجتان دەكرد، بە قازانجێكی بێ زیان، وە سەرفراز دەبوون بە سەرفراز بوونێک هەرگیز بەدبەختی بەدوادا نەدەهات.

پاشان باسی ئەوە دەكات كە پاڵنەرە بۆ باودانی دوارۆژ، بە ڕوونكردنەوەی بارودۆخی خەڵكەكەی‌و جیاوازیان تیایدا، جا لە پاداشتی باودەرانی دوارۆژ بەسەر دونیادا فەرموویەتی: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ﴾ واتە: گەشاوەو ڕوونا‌ک‌و جوانە لەوەی تیایدایە لە نازونیعمەتی دڵەكان‌و خۆشی نەفس‌و دەروونەكان‌و لەزەتی ڕۆحەكان ﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ تەماشای پەروەردگاریان دەكەن بە پێی پلەو پایەكانیان: هەندێكیان هەموو بەیانی‌و

ئێوارەیـەک دەیبینـن، وە هەندێکیـان لـە هەینیەکـدا یەکجـار دەیبینـن، چێـژوو لـەزەت وەردەگـرن لـە تەماشـاکردنی ڕوخسـاری خوای بەخشـندەو جوانـی درەوشـاوەی، کە هیچ شـتێک وێنـەی ئەو نیـە، جا کاتێک بینیـان هەمـوو نازونیعمەتەکانی دیکەیـان بیر دەچێت، لـەزەتو خۆشـیەکیان بۆ دروسـت دەبێت بـە هیچ جۆرێک کـەس ناتوانـێ دەریببڕێت، وە ڕوویـان دەگەشـێتەوە، خۆیـان چەندە جوانـن ئەوەندەی تر جـوان دەبنـەوە، داوا دەکەین لە خـوای بەخشـندە بمانگێـڕێ بـە یەکێک لە ئـەوان. (اللهـم آمين).

وە دەربـارەی ئەوانـەی بـاوی دونیـا دەدەن بەسـەر دوارۆژدا فەرموویەتـی: ﴿ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ بَاسِرَةٌ ﴾ (واتـە: لەو ڕۆژەدا ڕوخسـارانێ) گـرژو تاڵن، سـەرکزو زەلیلن ﴿ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ ﴾ واتـە: (دەزانن) کە سـزای سـەختو سـزای بەئێـش دەدرێن، ئا لەبـەر ئەوەیە ڕوخسـاریان دەگـۆڕێو ناشـرین دەبێ.

(٢٦-٤٠): ﴿ كَلَّا إِذَا بَلَغَتِ التَّرَاقِيَ ﴿٢٦﴾ وَقِيلَ مَنْ رَاقٍ ﴿٢٧﴾ وَظَنَّ أَنَّهُ الْفِرَاقُ ﴿٢٨﴾ وَالْتَفَّتِ السَّاقُ بِالسَّاقِ ﴿٢٩﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمَسَاقُ ﴿٣٠﴾ فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٣٢﴾ ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰ أَهْلِهِ يَتَمَطَّىٰ ﴿٣٣﴾ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ﴿٣٥﴾ أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾ أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ﴿٣٩﴾ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ ﴿٤٠﴾ ﴾:

خـوا ﷻ ئامۆژگـاری بەندەکانـی دەکات بـە بـاس کردنـی حاڵـی ئـەو کەسـەی ئامـادەی مـردن دەبێـت، ئـەو کەسـە کاتێـک ڕوحـی دەگاتە گـەروو ئەویـش بریتیە لەو ئێسـکەی لـە تەنیشـت کونـی گەردنەوەیـە، جا ئـەو کاتـە نارەحەتیـەکان سـەخترو ناخۆشـتر دەبن، هەمـوو هۆکارێـک دەگرێتـە بەر بۆ ڕزگـار بوون لە بەدبەختـی، لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتی: ﴿ وَقِيلَ مَنْ رَاقٍ ﴾ واتـە: کـێ چـارەی دەکات لـەو ناخۆشـیە، چونکـە ئومێدیـان بـڕاوە لـەو هـۆکارە ئاسـاییانە، هیـچ هۆکارێـک نەمـاوە جگـە لـە هۆکارەکانـی خوایی، بـەڵام قەزاو قـەدەر ئەگـەر یەکلابوویەوەو هـات، هیـچ گەڕانەوەیەکی بۆ نیـە، ﴿ وَظَنَّ أَنَّهُ الْفِرَاقُ ﴾ (واتە: وە نەخۆشـەکە دڵنیایـە کـە ئەوەی تووشـی بووە مـردنو جیابوونەوەیە) لـە دونیا، ﴿ وَالْتَفَّتِ السَّاقُ بِالسَّاقِ ﴾ واتـە: نارەحەتیـەکان کۆدەبنـەوەو قاچـەکان بەیەکـدا دەئاڵێـن، کارەکـە مـەزنو قـورسو ناخۆش دەبـێ، داوا دەکـرێ ئـەو ڕۆحە لە جەسـتە دەربچێ، کـە هۆگرو یـاوەری بـووە، بـەردەوام لەگەڵیدایـە، دەبـرێ بـۆ لای خـوا ﷻ تا پاداشـتی بداتـەوە بەپێی کردەوەکانـیو دایبمەزرێنێ.

جـا ئـەم سەرزەنشـتەی کـە خـوا ﷻ باسـی کـردوە، دڵ بـۆ لای ئـەوە ڕادەکێشـێ کـە ڕزگاربوونـی تێدایـە، وە سەرزەنشـتی دەکات لـەوەی دەبێتـە مایـەی لەناوچوونـی، بـەڵام نکووڵیـکاری کەللەڕەق، ئەو کەسـەی ئایەتو نیشـانەکان سـوودی پێ ناگەیەنـێ بەردەوامە لەسـەر سەرکەشـیو بێبڕوایـیو کەللەڕەقـی خـۆی، ﴿ فَلَا صَدَّقَ ﴾ واتە: نە بـڕوای بە خواو فریشـتەکانو کتێبـەکانو پێغەمبـەرانو ڕۆژی دوایـیو قـەزاو قـەدەرو خێرو شـەڕی هێنا. ﴿ وَلَا صَلَّىٰ ۝٣١ وَلَٰكِن كَذَّبَ ﴾ (واتـە: نـە نوێـژی کرد * بەڵکـو درۆی کرد) بەحەقو ڕاسـتی لـە بەرانبـەر بـە ڕاسـت دانانـدا، ﴿ وَتَوَلَّىٰ ﴾، وە ڕووی وەرگێڕا لـە فەرمـانو قەدەغەکردن، ئەمـە دڵنیایـەو لـە پەروەردگـاری ناترسـێ، بەڵکـو گەڕایـەوە ﴿ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ يَتَمَطَّىٰٓ ﴾ (واتـە: بـۆ لای مـاڵو منداڵـی بەفیـزو کەشـخەوە) هیچ بـە خەیاڵیدا نەدەهـات، خوا ﷻ هەڕەشـەی لێکـردوە بە وتـەی خـۆیو فەرموویەتـی: ﴿ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰ ۝٣٤ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰٓ ﴾ (واتە: وای بـۆ تـۆ ئنجـا وای بـۆ تۆ * دووبـارە وای بۆ تۆ ئنجـا وای بۆ تۆ) ئەم وشـانە هەڕەشـەن، خوا دووبـارەی کردۆتـەوە بـۆ دووبارە هەڕەشـە کردنی.

پاشـان باسـی ئادەمیزادی کردوە بە دروسـتکردنی یەکەمـی، ﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴾ (واتـە: ئایـا مـرۆڤ وادادەنێـت) کە هـەروا بـەرەڵا دەکرێت، نـە فەرمانـی پێدەکرێتو نە قەدەغـەی لێدەکرێـت، وە نەپاداشـت دەدرێتەوەو نە سـزا؟! ئەمە وازانینێکـی پووچە، گومان بردنێکـە بە خوا کە شـیاو نیـە بە حیکمەتو دانایـی ئەو زاتـە، ﴿ أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِىٍّ يُمْنَىٰ ۝٣٧ ثُمَّ كَانَ ﴾ دوای تـۆو ﴿ عَلَقَةً ﴾ خوێـن ﴿ فَخَلَقَ ﴾ خـوا گیانلەبـەری لـێ دروسـت کردوەو ڕێکیخسـتووە، واتـە: بـە ووردیو توونـدو تۆڵـی، ﴿ فَجَعَلَ مِنْهُ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ۝٣٩ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ ﴾، واتـە: ئـەو زاتـەی ئادەمیـزادی دروسـتکردوەو قۆناغ بـە قۆنـاغ گەیاندوویەتی بەم ئاسـتە جیـاوازە، ﴿ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾ (واتـە: بـە توانایـە بەسـەر ئەوەدا کـە مردووان زینـدوو بکاتـەوە)، بەڵکـو ئەو زاتە بەسـەر هەموو شـتێکدا بە دەسـەڵاتە.

تەفسیری سوورەتی (القیامة) تەواو بوو.




## تەفسیری سووڕەتی (الإنسان)

## مەککییە (٣١) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ١ إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ٢ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ٣ ﴾:

﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ١ إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ ﴾ خوا ﷻ لەم سووڕەتە پیرۆزەدا باسی یەکەمین حاڵەتی ئادەمیزادی کردوە، سەرەتای دەستپێکیو ناوەڕاستو کۆتاییەکەی، جا باسی کردوە کە ماوەیەکی زۆر لە ڕۆژگار تێپەڕی بەسەریدا ئەو بوونی نەبوو، بەڵکو ناو نەهێنرا بوو. پاشان کاتێک خوا ﷻ ویستی دروستی بکات، باوکی ئادەمی دروست کرد لە خۆڵ، پاشان نەوەکانی بە زنجیرە دانا بە دوای یەکتردا ﴿ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ ﴾ (واتە: لە دڵۆپێک ئاوی تێکەڵ) ئاوێکی سەرزەنشت کراوی قیزەون، ﴿ نَّبْتَلِيهِ ﴾ (واتە: تاقی بکەینەوە) بەوە، بۆ ئەوەی بزانین ئایا حاڵی یەکەمی دەبێنیٚو بیری لێ دەکاتەوە، یان بیری دەچێو نەفسو دەروونی فریوی دەدات؟

جا خوا ﷻ بەدیهێناوەو هێزی ناوەکیو دەرەکی پێ بەخشیوە وەک بیستنو بینینو سەرجەم ئەندامانی جەستە، هەمووی بۆ تەواو کردوەو سەلامەتی کردوە بۆی، بۆ ئەوەی بتوانێ بە هۆیانەوە مەبەستەکانی بەدەست بهێنێت.

پاشان پێغەمبەرانی بۆ ناردوە، وە کتێبی بەسەریدا دابەزاندوە، وە ڕێنمایی کردوە بۆ ئەو ڕاستە ڕێگایەی دەیگەیەنێت بە پەروەردگاری، ڕوونیکردۆتەوەو هانیداوە لەسەر گرتنەبەری ئەو ڕێگایە، هەواڵیشی پێداوە کە پاداشتی بۆ هەیە کاتێک

دەگاتـە لای پەروەردگـاری.
پاشـان هەواڵـی پێـداوە بـەو ڕێگایـەی دەیگەیەنـێ بـە لەناو چـوون، وە ترسـاندوویەتی لێـی، وە هەواڵـی پێـداوە بـەوەی ئەگـەر بیگرێتـە بـەر دەرەنجامێکـی خراپـی دەبێـت، وە بـەوەش تاقـی کردۆتەوە.
خەڵکـی دابـەش بـوون بـۆ سوپاسـگوزاری کردنـی نازونیعمەتـی خـوا، هەڵگـری ئـەو مافانەیـە خـوا داویەتـی بەسـەریدا، وە بـۆ بێبڕوایـی بـە نازونیعمەتەکانـی خـوا لەسـەری، خـوا ﷻ نازونیعمەتـی دینـیو دونیایـی دابارانـدوە بەسـەریدا، ئەویـش بەرپەرچـی داوەتـەوەو بێبڕوایـی کـردوە بـە پەروەردگـاری، ڕێگـای لەناوچوونـی گرتۆتـە بـەر. پاشـان باسـی حاڵـی ئـەو دوو دەسـتەیەی کـردوە لـە کاتـی پاداشـتدا، جـا فەرموویەتـی:
(٤-٥): ﴿ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَا۟ وَأَغْلَٰلًا وَسَعِيرًا ﴿٤﴾ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴿٥﴾ ﴾
﴿ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ ﴾ واتـە: ئێمـە ئامادەمـان کـردوە بـۆ ئـەو کەسـەی بێبڕوایـی کـردوە بـە خـوا، وە پێغەمبەرانـی بـەدرۆ زانیـوەو بوێـری کـردوە لەسـەر سـەرپێچیەکانی ﴿ سَلَٰسِلَا۟ ﴾ زنجیـر لـە نـاو ئاگـری دۆزەخـدا، وەک خـوا فەرموویەتـی: ﴿ ثُمَّ فِى سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَٱسْلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ ﴾الحاقـة، (واتـە: ئنجـا بـە زنجیرێکـی حەفتـا گـەزی بیبەسـتنەوە)، ﴿ وَأَغْلَٰلًا ﴾ واتـە: تەوقێـک دەخرێتـە دەسـتو گەردنیـانو پێـی دەبەسـترێنەوە ﴿ وَسَعِيرًا ﴾ واتـە: ئاگرێـک جەسـتەیانی پـێ هەڵدەگیرسـێو دەسـوتێنرێ، هەرکاتێـک کـە پێسـتیان سـوتاو بـرژا، پێسـتێکی تریـان بـۆ دەگۆڕیـن، بـۆ ئـەوەی سـزا بچێـژن، ئـەم سـزایە بەردەوامـە بۆیـان بـە هەمیشـەییو بـۆ هەتـا هەتایـی تیایـدا دەمێننـەوە، بـەڵام ﴿ ٱلْأَبْرَارَ ﴾ (چـاکان) ئـەو کەسـانەن دڵەکانیـان چاکـە، بـەوەی خۆشەویسـتی خـواو ناسـینی ئـەو زاتـەو خورەوشـتی جوانـی تێدایـە، کردەوەکانیشـیان چـاک بـوو، لـە کاری چاکـدا بەکاریان هێنـا.
هەواڵـی داوە بەڕاسـتی ئـەوان ﴿ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ ﴾ واتـە: (لـە جامـی پـڕ لـە) شـەرابی خـۆشو بەلـەزەت دەخۆنـەوە کـە تێکـەڵ کـراوە بـە کافـوور (کافـوور ماددەیەکـی زۆر خـۆشو بەتامـە لـە دارێکـە لـە وڵاتـی هیندسـتان)، واتـە: تێکەڵـە

بــە کافــوور، بــۆ ئــەوەی ســاردی بکاتــەوە تیژیەکــەی بشــکێنێ، ئــەم کافــوورە لــە ئەوپــەڕی خۆشــیدایە، پارێــزراوە لــە هــەر لێڵــیو تێکچوونکێــک کــە لــە کافــووری دونیــادا هەیــە، بەڕاســتی ئــەو نەخۆشــیانەی بوونیــان هەیــە لــە دونیــادا، لــەو ناوانــەدا بوونیــان نیــە کــە خــوا لــە بەهەشــتدا باســی کــردوە.

وەک خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ فِى سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ ﴾الواقعــة، (واتــە: لــە ژێــر ســیبەری داری ســیدری بــێ دڕکو * داری مــۆزی هۆنــراو بــە هێشــووە مــۆز)، ﴿ وَأَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ ﴿١٥﴾ ﴾آل عمــران، (واتــە: وە ژنانــی پاکیزەیــان بــۆ هەیــە)، ﴿ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ ﴿٧١﴾ ﴾الزخــرف، (واتــە: وە لــەو بەهەشــتەدا هەیــە ئــەوەی دڵ حــەزی لــێ بــکاتو چــاوو لەززەتــی لــێ بــکات).


عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا ﴿٦﴾ يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ
يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا ﴿٧﴾ وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا
وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا
﴿٩﴾ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا ﴿١٠﴾ فَوَقَاهُمُ اللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ
الْيَوْمِ وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴿١١﴾ وَجَزَاهُم بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيرًا ﴿١٢﴾
مُّتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الْأَرَائِكِ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴿١٣﴾
وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَالُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا ﴿١٤﴾ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِآنِيَةٍ
مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴿١٦﴾
وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا
﴿١٨﴾ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا
﴿١٩﴾ وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴿٢٠﴾ عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ
خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوا أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَاهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا
طَهُورًا ﴿٢١﴾ إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَاءً وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا ﴿٢٢﴾ إِنَّا
نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ تَنزِيلًا ﴿٢٣﴾ فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعْ
مِنْهُمْ آثِمًا أَوْ كَفُورًا ﴿٢٤﴾ وَاذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٢٥﴾

(٦): ﴿ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا ﴿٦﴾ ﴾:

﴿ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ ﴾ واتە: ئەم جامە بە لەزەتەی کە لێی دەخۆنەوە، ناترسن لە لەناوچوونی، بەڵکو ماددەیەکی تێدایە نابڕێتەوە، ئەویش کانی هەڵقوڵاوی ڕۆیشتووی بەردەوامە، بە هەر شوێنێکو چۆن بیانەوێ بەری دەدەنەوە، ئەگەر ویستیان بەری دەدەنەوە بۆ ناو باخە گەشاوەکان، یان باخچە درەوشاوەکان، یان لە تەنیشتی کۆشکو تەلارو خانووە ڕازاوەکان، یان بۆ هەر جێگایەک بیانەوێ لە جێگا جوانەکان.

(٧): ﴿ يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا ﴿٧﴾ ﴾:

پاشان باسی کۆمەڵێ لە کردەوەی بەهەشتیانی کردوە لە سەرەتای ئەم سوورەتەداو فەرموویەتی: ﴿ يُوفُونَ بِالنَّذْرِ ﴾ (واتە: وەفا بە نەزر دەکەن) بەوەی خۆیانیان پەیوەست کردوە پێیەوە لە پێناو خوادا، لەو نەزرو پەیمانانە. وە ئەگەر بە وەفا بن بەرانبەر بە نەزرەکانیان کە پێویست نیە لە سەریان مەگەر خۆیان پێویستی بکەن لەسەر خۆیان، ئەوە ئەنجامدانیانو هەستانیان بە فەرزە بنچینەییەکان لە پێشترە.

﴿ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا ﴾ واتە: (وە لەرۆژێک دەترسن کە سەختی ئەو ڕۆژە) بڵاوەو هەمووان دەگرێتەوە، جا دەترسن لەوەی تووشی خراپیو بەدی ئەو ڕۆژە ببن، بۆیە وازیان هێناوە لە هەر هۆکارێک ببێتە مایەی پێویست بوونی ئەو ڕۆژە سەختە.

(٨): ﴿ وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ ﴾:

﴿ وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ ﴾ واتە: ئەوان لە حاڵێکدان تیایدا حەزیان لە ماڵو خواردەمەنیە، بەڵام خۆشەویستی خوایان پێشخستووە بەسەر خۆشەویستی نەفسو دەروونیان، هەرچی هەوڵو کۆششیان هەیە بەکاری دێنن لە پێدانی خواردنەکانیان بۆ لە پێشترینی خەڵکیو

نەدارترینیان ﴿ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴾(واتە: هەژارانو هەتیوانو بەندکراوان).

(٩-١٠): ﴿ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا ﴿١٠﴾ ﴾

لە بەخشینو پێدانی خواردەمەنیدا تەنها مەبەستیان خوایە، بە زمانی حاڵ دەڵێن: ﴿ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ﴾(واتە: بە ڕاستی ئێمە خواردەمەنیتان دەدەینێ لەبەر خوا چاوەڕوانی ناکەین لە ئێوە) نە پاداشتی ماڵیو نە ستایشی قسە کردن، ﴿ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا ﴾واتە: (بە ڕاستی ئێمە لە سزای پەروەردگارمان دەترسین لە ڕۆژێکی) زۆر سەختو ناخۆش، ﴿ قَمْطَرِيرًا ﴾واتە: تەنگو دژوار.

(١١): ﴿ فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمِ وَلَقَّىٰهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴿١١﴾ ﴾

﴿ فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمِ ﴾(واتە: جا خوا پاراستنی لە بەدیو خراپی ئەو ڕۆژە) خەمباریان ناکات لە ترسی هەرە گەورە کە قیامەتە، وە فریشتەکانیش پێشوازیان لێدەکەن لە بەر دەرگاکانی بەهەشتدا، پێیان دەڵێن ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە بەڵێنتان پێدرابوو، ﴿ وَلَقَّىٰهُمْ ﴾واتە: ڕێزی لێنانو پێی بەخشین، ﴿ نَضْرَةً ﴾ڕۆشنایی لە ڕوخساریاندا، ﴿ وَسُرُورًا ﴾وە خۆشی لە دڵەکانیان، جا کۆی کردەوە بۆیان لە ئێوانی نیعمەتی ئاشکراو نهێنی.

(١٢): ﴿ وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُوا۟ جَنَّةً وَحَرِيرًا ﴿١٢﴾ ﴾

﴿ وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُوا۟ ﴾ئارامیان دەگرت لەسەر گوێڕایەڵی خوا، ئەوەی لە توانایاندا بوو دریغیان نەدەکرد، وە ئارامیان دەگرت لەسەرپێچی خواو وازیان لێدەهێنا، خۆڕاگر بوون لەسەر قەدەرە بە ئێشەکانی خوای کاربەجێ، هەرگیز تووڕەیان نەدەبوون (بە تاقیکردنەوەی خوا)، (خوا پاداشتی دانەوە) ﴿ جَنَّةً ﴾بە بەهەشت، کە هەموو نازونیعمەتەکانی تێدا کۆکردۆتەوە، پارێزراوە لە هەموو لێڵیو لەناوچوونێک، ﴿ وَحَرِيرًا ﴾هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٢٣﴾ ﴾الحج (واتە: پۆشاکیان لە بەهەشتدا ئاوریشمە). پێدەچێ خوا ﷻ ئەو ئاوریشمەی تایبەت کردبێ، چونکە جلو بەرگی ڕواڵەتیانە، کە بەڵگەیە لەسەر حاڵی خاوەنەکەی.

(١٣): ﴿ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴿١٣﴾ ﴾

﴿ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ﴾(الإتكاء): واتە: پاڵدانەوە لەسەر لاتەنیشت بە جۆرێکی پڕ لە خۆشیو دڵنیاییو ئارامیو حەوانەوە ﴿ ٱلْأَرَآئِكِ ﴾بریتیە لەو قەنەفانەی بە جلو بەرگی جوان ڕازێنراوەتەوە. ﴿ لَا يَرَوْنَ فِيهَا ﴾لە بەهەشتدا (نابینن) ﴿ شَمْسًا ﴾خۆرێک گەرمیەکەی زیانی هەبێ بۆیان ﴿ وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴾واتە: نە سەرمایەکی زۆر سەخت، بەڵکو هەموو کاتەکانیان

لــە ژێر ســێبەرێکی زۆر خۆشـدایە نە گەرمەو، نە ســاردە، بە جــۆرێ جەســتەکان زۆر لەزەتی لێ وەردەگــرن، وە ئــازار ناچێــژن نە بەســەرماو، نە بــە گەرما.

(١٤): ﴿ وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَالُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا ﴿١٤﴾ ﴾:

واتــە: میوەکانــی نزیــک کراونەتەوە لــەو کەســەی دەیــەوێ، دەتوانێ بە دەســتی بێنێ بــە پێوە، یان بە دانیشــتن، یــان بــە پاڵدانەوە.

(١٥-١٦): ﴿ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِآنِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَا مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴿١٦﴾ ﴾:

دەگەڕێن بەســەر خەڵکانی بەهەشــتدا خزمەتــکارو منــداڵان،﴿ بِآنِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا ﴾ (واتە: بە قاپی زیوییــنو پەرداخی شووشــە)،﴿ قَوَارِيرَا مِن فِضَّةٍ ﴾ (واتە: شووشــەکە) پێکهاتەکەی لــە زیــوە، ئەویش هەر لەســەر ڕوونی شوشــەیە، ئەمەشــە لە سەرســووڕهێنەرترینی شــتەکانە، کە زیــوی خەســت لە ڕوونــی ناوەڕۆکیو پاکــی کانزای، لەســەر ڕوونی شوشــەکان بێت،﴿ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴾ واتــە: قاپــە باســکراوەکانیان ئەندازە کردوە لەســەر ئەنــدازەی خواردنیان، نــە زیاترەو نە کەمتــر، چونکــە ئەگــەر زیاتــر بــێ لەزەتی ناتــەواو دەبــێ، وە ئەگەر کەمیــش بێ ئەوە بەشــیان ناکات.

وە دەگونجێ مەبەســت: خەڵکانی بەهەشــت خۆیــان ئەندازەیان کردوە بــەو ئەندازەیەی دەگونجێ لەگــەڵ لەزەتیاندا، جا بۆیــان دێ بەو ئەندازەیەی لەنــاو دڵیاندایە.

(١٧): ﴿ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ ﴾:

﴿ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا ﴾ واتــە: لە بەهەشــتدا لــە پەرداخێ (دەخۆنــەوە)، ئەویش پەرداخێکــی پڕ کراوە لە شــەراب،﴿ كَانَ مِزَاجُهَا ﴾ واتــە: تێکەڵــە لەگەڵ﴿ زَنجَبِيلًا ﴾ بۆ ئــەوەی تامو بۆنــی خۆش بێت.

(١٨): ﴿ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا ﴿١٨﴾ ﴾:

﴿ عَيْنًا فِيهَا ﴾ واتــە: لــە بەهەشــتدا،﴿ تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا ﴾ ناونــراوە بــە (سلســبیل) بــە هــۆی نەرمو نیانــیو لــەزەتو جوانیەوە.

(١٩-٢٠): ﴿ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا ﴿١٩﴾ وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴿٢٠﴾ ﴾:

﴿ وَيَطُوفُ ﴾ دەگەڕێــن بەســەر خەڵکانی بەهەشــتدا، لــە خواردەمەنیو شــەرابو خزمەتکردنیان ﴿ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ ﴾ (واتە: منداڵانێ) دروســتکراون لە بەهەشــتدا بۆ هەمیشــەیی، نــە دەگۆڕێنو نە گــەورە دەبــن، ئەوان لەوپــەڕی جوانیــدان،﴿ إِذَا رَأَيْتَهُمْ ﴾ بڵاو بوونەتــەوەو دەگەڕێن بەســەریاندا بــە خزمــەت کــردن،﴿ حَسِبْتَهُمْ ﴾ وا دەزانــی لــە جوانیانــدا،﴿ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا ﴾ (واتــە: مــرواری

پـه‌رش‌و بـڵاون) ئه‌مــه‌ش له تــه‌واوی له‌زه‌تی ئه‌هلی به‌هه‌شــته‌، كـه خزمه‌تكاره‌كانیــان منداڵانی هه‌میشــه‌یی بــن، ئه‌وانــه‌ی بینینیــان دڵ خــۆش ده‌كات، ده‌چنه نێــو ماڵه‌كانیانه‌وه ئه‌وانیــش دڵنیان لێیــان، هه‌رچــی داوابكه‌ن‌و نه‌فسـیان بیه‌وێ پێشكه‌شـیان ده‌كـه‌ن، ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ ﴾ (وه‌ كاتێك بروانیتــه‌) ئه‌و به‌هه‌شــته‌و چـاوت بریه ئه‌وه‌ی ئــه‌وان تیایدان له‌و نازونیعمه‌تــدا، ﴿ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴾ (واتــه‌: نازونیعمه‌ت‌و ده‌ســه‌ڵاتێكی گــه‌وره‌ ده‌بینیت) جا ده‌بینیت یه‌كێــك له‌وان خاوه‌نی تــه‌لارو باڵه‌خانــه‌و خانــووی نهــۆم نهــۆم‌و ڕازاوه‌و جوانه‌، كه به هیــچ جۆرێ وه‌ســف ناكرێ.

وه خاوه‌نــی چه‌ندیــن بــاخ‌و باخچــه‌و میوه‌هاتــی نزیــك ده‌ســت‌و به‌تــام‌و به‌له‌زه‌تــه‌، وه خاوه‌ن چه‌ندیــن ده‌ریــای هه‌ڵقــوڵاو باخچه‌ی سه‌رســوورهێنه‌ره‌، كه باڵنــده به ده‌نگه خۆشــه‌كانی تیایاندا ده‌خوێنــێ، خه‌ریكــه دڵه‌كان ده‌بــات‌و نه‌فس‌و ده‌روونــه‌كان ته‌واو ده‌كه‌ونه خۆشــی، وه له‌لایه‌تی: لــه‌و خێزانانــه‌ی كه له‌وپه‌ڕی جوانیــدان، جوانــی ده‌ره‌وه‌و ناوه‌وه‌یان له خۆیانــدا كۆكردۆته‌وه‌، وه خــاوه‌ن ئــاكاری چــاك‌و ڕواڵه‌تــی جوانن، كــه دڵ پڕ ده‌كــه‌ن له خۆشــی‌و له‌زه‌ت.

وه لــه ده‌وروبه‌ریانــدا منداڵانــی هه‌میشــه زینــدوو خزمه‌تــكاری هه‌تــا هه‌تایــی هه‌یــه كــه ده‌بنه مایــه‌ی حه‌وانــه‌وه‌و ئارامــی، وه له‌زه‌تــی ژیان تــه‌واو ده‌كه‌ن‌و هیــچ خۆزگه‌یه‌ك نامێنێ، پاشــان لــه ســه‌رووی هه‌موو ئه‌وانه‌وه ســه‌ركه‌وتن‌و ســه‌رفرازی به بینینــی په‌روه‌ردگاری به‌ســۆزو گوێ گرتــن له دواندنی‌و لــه‌زه‌ت وه‌رگرتن له نزیكی، وه گه‌شــانه‌وه به ڕه‌زامه‌ندی ئــه‌و زاته‌و مانه‌وه‌ی هه‌میشــه‌یی، زیادكــردن له ســه‌رووی ئــه‌و نازونیعمه‌تانه‌ی كه تیایــدان له هه‌مــوو كاتێكدا، پاكی بــۆ خــوای باڵاده‌ســتی به ده‌ســه‌ڵاتی حه‌قــی ڕوونكــه‌ره‌وه‌، ئــه‌و زاتــه‌ی گه‌نجینه‌كانــی هه‌رگیز تــه‌واو نابــن، خێــرو چاكــه‌ی هه‌رگیز كه‌م ناكــه‌ن، هه‌روه‌كــو چۆن وه‌ســفه‌كانی كۆتایــان نیه‌، به‌هه‌مان شــێوه چاكه‌كانیشــی به كۆتــا نایه‌ن.

(٢١): ﴿ عَٰلِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوٓا۟ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا ﴿٢١﴾ ﴾:

﴿ عَٰلِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ ﴾ واتــه‌: له به‌ریاندایه پۆشــاكی (السـندس) و (الإسـتبرق)ی ســه‌وز، كــه گه‌وره‌تریــن جۆری ئاوریشــمن، جا (الســندس): ئاوریشــمێكی ئه‌ســتووره‌، وه (الإســتبرق) ئاوریشــمێكی نه‌رم‌و ناســكتره‌.

﴿ وَحُلُّوٓا۟ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ ﴾ واتــه‌: ده‌ســته‌كانیان ڕازێنراوه‌تــه‌وه بــه بازنــی زیو، نێرو مێیــان، ئه‌مه په‌یمانێكــه خــوا پێــی داون، بێگومــان په‌یمانــی خــوا به‌دیهێنــراوه‌، چونكــه هیــچ كــه‌س له خوا ڕاســتگۆتر نیه له قســه‌و فه‌رمایشــتیدا.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَسَقَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ شَرَابٗا طَهُورًا ﴾ واتـە: (پەروەردگاریـان شـەرابی پـاکو تەمیزیـان پێـدەدات)، لێڵـی تێدانیـە بـە جۆرێ لـە جۆرەکان، ئـەوەی لەنـاو سـکیاندایە پاکە لە هەمـوو پیسـیو قیزەونیەک.

(٢٢): ﴿ إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمۡ جَزَآءٗ وَكَانَ سَعۡيُكُم مَّشۡكُورًا ٢٢ ﴾:

﴿ إِنَّ هَٰذَا ﴾ واتـە: پاداشـتی بـێ پایانو بەخشـینی جـوان، ﴿ كَانَ لَكُمۡ جَزَآءٗ ﴾ (واتە: بـۆ ئێوەیە وەکـو پاداشـت) لەسـەر ئـەوەی پێشـتان خسـتووە بـۆ خۆتان لـە کـردەوەکان ﴿ وَكَانَ سَعۡيُكُم مَّشۡكُورًا ﴾ واتـە: لـە بەرانبـەری کەمترینـی کۆششـەکانتان خـوا پێتـان دەبەخشـێ نازونیعمەتی هەمیشـەیی، کـە هەرگیـز کـورت هەڵناهێنرێ.

(٢٣): ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ تَنزِيلٗا ٢٣ ﴾:

وە وتەی خوا ﷻ کاتێ باسـی نیعمەتەکانی بەهەشـتی کرد: ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ تَنزِيلٗا ﴾ (واتـە: بێگومـان ئێمە قورئانمان بـۆ دابەزاندیتە خـوارەوە بە دابەزانـدن)، بەڵێنو هەڕەشـەکردنی تێدایـە، وە ڕوونکردنـەوەی هەمـوو ئەوانـەی بەنـدە پێویسـتی پێیەتـی. وە فەرمانـی تێدایـە بـە بەجێهێنانـی فەرمانەکانـیو شـەریعەتەکانی بە تەواوترین شـێوە، وە کۆشـش کردن لـە جێبەجێ کردنیـانو ئارام گرتن لەسـەری، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتی:

(٢٤): ﴿ فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعۡ مِنۡهُمۡ ءَاثِمًا أَوۡ كَفُورٗا ٢٤ ﴾:

واتـە: ئـارام بگرە لەسـەر بڕیـارە قەدەریەکانی خواو تـووڕەی مەکە، وە لەسـەر حوکـمو بڕیارە ئاینیەکانـی، بـە شـوێنیدا بـڕۆ باهیچ بەربەسـتێک لـە بەردەمتـدا نەبێتە کۆسـپ، ﴿ وَلَا تُطِعۡ ﴾ (فەرمـان بـەرداری کەللەڕەقـان مەبـە) ئەوانـەی دەیانەوێ ڕووبـەڕووت بوەسـتنەوە ﴿ ءَاثِمًا ﴾ واتـە: تاوانبارو سـەرپێچیکار، وە نـە ﴿ كَفُورٗا ﴾ چونکە بەڕاسـتی گوێڕایەڵی بێبڕوایانو فاسـقو خراپـەکاران هـەر دەبێ سـەرپێچی بێـت، فەرمان ناکـەن مەگەر بـەوەی هەواو نەفسـیان حەزی پێیەتی.

(٢٥): ﴿ وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا ٢٥ ﴾:

کاتێـک کە ئـارام گرتن یارمەتـی دەدات بە هەسـتان بەبەندایەتی کردنی خـواو زۆر یادکردنی، خـوا ﷻ فەرمانـی کـردوە بـەوە، جـا فەرموویەتـی: ﴿ وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا ﴾ واتـە: سـەرەتای ڕۆژو کۆتاییەکـەی، جـا دەچێتـە نێو ئەمـەوە هەموو نوێـژە فەرزەکانو ئەوەیشـی بە شـوێنیاندا دێـت لـە سـوننەتەکان، وە هەموو جـۆرە زیکرەکان لـەم کاتانەدا.

وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَٱسۡجُدۡ لَهُۥ وَسَبِّحۡهُ لَيۡلٗا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ
يُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمۡ يَوۡمٗا ثَقِيلٗا ﴿٢٧﴾ نَّحۡنُ خَلَقۡنَٰهُمۡ
وَشَدَدۡنَآ أَسۡرَهُمۡۖ وَإِذَا شِئۡنَا بَدَّلۡنَآ أَمۡثَٰلَهُمۡ تَبۡدِيلًا ﴿٢٨﴾ إِنَّ
هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٞۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا ﴿٢٩﴾ وَمَا تَشَآءُونَ
إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿٣٠﴾ يُدۡخِلُ
مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمَۢا ﴿٣١﴾

(٢٦): ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَٱسۡجُدۡ لَهُۥ وَسَبِّحۡهُ لَيۡلٗا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ ﴾

﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَٱسۡجُدۡ لَهُۥ ﴾ واتە: سوژدەی زۆر بـۆ خوا ببـە، ئـەوەش نوێژ کردنی زۆر لەخۆ دەگـرێ، ﴿ وَسَبِّحۡهُ لَيۡلٗا طَوِيلًا ﴾ (واتـە: ستایشـی خوا بکـە لە بەشـێکی زۆر لەشـەودا) بێگومـان لـە پێشـەوە ئـەم دەقە رەهایـە بەندکـراوە بـە ئایەتەکانی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٢﴾ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا ﴿٣﴾ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ ﴿٤﴾ ﴾المزمل، (واتـە: ئـەی ئەو کەسـەی خۆت داپۆشـیوە * شـەو هەسـتە نوێژ بکە مەگـەر کەمێکی نەبێـت * نیـوەی یان کەمێ لـە نیوەی کەم بکـەرەوە * یـان کەمـێ لێی زیـاد بکە).

(٢٧): ﴿ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمۡ يَوۡمٗا ثَقِيلٗا ﴿٢٧﴾ ﴾

﴿ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾ واتـە: ئەوانـەی بـە درۆت دادەنێـن ئـەی پێغەمبـەر ﷺ دوای ئـەوەی دەقەکانـت بۆیـان روون کـردەوە، وە هانـدرانو ترسـێنران، لەگـەڵ ئەمەشـدا ئـەوە هیـچ سـوودێکی نەبـوو بۆیـان، بەڵکو بـە بـەردەوام فەزڵـی ﴿ ٱلۡعَاجِلَةَ ﴾ (دونیایان دەدا بەسـەر دوارۆژ)، وە دڵنیـاو ئـارام بوون پێـی، ﴿ وَيَذَرُونَ ﴾ واتە: واز لە کردەوە دێنو فەرامۆشـی دەکـەن، ﴿ وَرَآءَهُمۡ ﴾ پشـت گوێـی دەخـەن ﴿ يَوۡمٗا ثَقِيلٗا ﴾ ئەویـش رۆژی دواییـە، کە ئەندازەکـەی پەنجـا هـەزار سـاڵە لـەوەی ئێـوە دەیژمێـرن، خـوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ يَقُولُ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوۡمٌ عَسِرٞ ﴿٨﴾ ﴾القمر، (واتـە: بێبڕوایـان دەڵێـن: ئەمڕۆ رۆژێکـی زۆر دژوارو سـەختە) وەک ئـەوە وایـە دروسـت نەکرابێتـن تەنها بـۆ دونیـاو مانەوەیان نەبـێ تیایدا.

(٢٨): ﴿ نَّحۡنُ خَلَقۡنَٰهُمۡ وَشَدَدۡنَآ أَسۡرَهُمۡۖ وَإِذَا شِئۡنَا بَدَّلۡنَآ أَمۡثَٰلَهُمۡ تَبۡدِيلًا ﴿٢٨﴾ ﴾

پاشـان بەڵگـەی عەقڵـی هێناوەتـەوە لەسـەر زیندوبوونەوەیـان، ئەویـش بەڵگەی سـەرەتای بەدیهێنانیانـە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ نَّحۡنُ خَلَقۡنَٰهُمۡ ﴾ واتـە: ئێمـە لـە نەبوونـەوە بەدیمـان هێنـاون، ﴿ وَشَدَدۡنَآ أَسۡرَهُمۡ ﴾ واتـە: دروسـت کردنیانمـان قایـمو پتـەو کـردوە، بـە

دەمــارو خوێنبــەرو ئێســکەکان، وە هێزی ئاشــکراو نهێنی، تا جەســتە تەواو کامــڵ بووە، وە دەســەڵاتی هەیــە بەســەر هەمــوو ئەوانــەی دەیەوێت.

ئــەو زاتــەی بەدیهێناون لەســەر ئەم حاڵەتە، بــە توانایە لەســەر بەدیهێنانیــان دوای مردنیان بۆ پاداشــت دانەوەیــان، ئــەو زاتەی گواســتوونێتیەوە لــەم ماڵەوە بۆ ئــەو بارودۆخانە، شــیاو نیە بــۆی هــەر ئاوهــا بە هاوەنتــە وازیان لــێ بهێنێ، نــە فەرمانیان پێ بــکاتو نــە قەدەغەیان لێ بــکاتو نە پاداشــتیان بداتــەوەو نە ســزایان بدات، لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَآ أَمْثَٰلَهُمْ تَبْدِيلًا﴾ واتە: دروســتیان دەکەین بۆ زیندووکردنەوە بە دروســتکردنەوەیەکی دیکــە، خودی خۆیانمــان گەڕانــدەوە، وە خودی خۆیان وێنــەی خۆیانن.

(٢٩): ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿٢٩﴾﴾:

﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ﴾ واتــە: کەســی بــڕوادار پەندی پــێ وەردەگرێ، جا ســوود وەردەگرێ بــەوەی تێیدایــە لــە ترســاندنو هانــدان، ﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا﴾ (واتــە: ئنجــا هــەر کەســێک بیەوێــت) ڕێگایەک دەگرێتــە بەر بــۆ لای پەروەردگاری، خــوا ﷻ حەقو ڕێنمایــی ڕوون دەکاتــەوە، پاشــان خەڵکی ئاگادار دەکاتــەوە لە نێوان هیدایــەت وەرگرتنو ڕوو وەرگێــڕان لێــی، لەگەڵ بەجێهێنانــی بەڵگەو حوججە لەســەریان.

(٣٠): ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٣٠﴾﴾:

﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ (واتــە: وە ئێــوە حــەز ناکــەن مەگــەر کاتێــک کــە خــوا بیــەوێ) بەڕاســتی ویســتی خــوا جێبەجێکــراوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ خاوەنــی حیکمــەتو داناییــە لە هیدایــەتو ڕێنمایــی هیدایەتــدراو، وە گومراکردنی کەســی گومرا.

(٣١): ﴿يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًۢا ﴿٣١﴾﴾:

﴿يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ﴾ (واتــە: خــوا بیــەوێ دەیخاتــە نــاو میهرەبانــی خۆیــەوە) جا تایبەتی دەکات بە پشــتیوانی خۆی، وە ســەرکەوتووی دەکات بە هۆکارەکانی بەختەوەریو ڕێنمایشــی دەکات بۆ ڕێگاکانی، ﴿وَٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئەو ســتەمکارانەی بەدبەختیان هەڵبژاردوە لەســەر هیدایــەت ﴿أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًۢا﴾ (واتــە: ســزای زۆر ســەختی ئامادە کــردوە بۆیان) بە هــۆی ســتەمو دژایەتی کردنیــان (بۆ دینــی خوا).

تەفسیری سوورەتی (الإنسان) تەواو بوو.


سُورَةُ المُرسَلات
بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا ﴿١﴾ فَالْعَاصِفَاتِ عَصْفًا ﴿٢﴾ وَالنَّاشِرَاتِ نَشْرًا ﴿٣﴾
فَالْفَارِقَاتِ فَرْقًا ﴿٤﴾ فَالْمُلْقِيَاتِ ذِكْرًا ﴿٥﴾ عُذْرًا أَوْ نُذْرًا ﴿٦﴾ إِنَّمَا
تُوعَدُونَ لَوَاقِعٌ ﴿٧﴾ فَإِذَا النُّجُومُ طُمِسَتْ ﴿٨﴾ وَإِذَا السَّمَاءُ فُرِجَتْ
﴿٩﴾ وَإِذَا الْجِبَالُ نُسِفَتْ ﴿١٠﴾ وَإِذَا الرُّسُلُ أُقِّتَتْ ﴿١١﴾ لِأَيِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ
﴿١٢﴾ لِيَوْمِ الْفَصْلِ ﴿١٣﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الْفَصْلِ ﴿١٤﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ
لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٥﴾ أَلَمْ نُهْلِكِ الْأَوَّلِينَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ نُتْبِعُهُمُ الْآخِرِينَ
﴿١٧﴾ كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِالْمُجْرِمِينَ ﴿١٨﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٩﴾

## تەفسیری سووڕەتی (المرسلات)

## مەككییە (٥٠) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-١٥): ﴿ وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا ﴿١﴾ فَالْعَاصِفَاتِ عَصْفًا ﴿٢﴾ وَالنَّاشِرَاتِ نَشْرًا ﴿٣﴾ فَالْفَارِقَاتِ فَرْقًا ﴿٤﴾ فَالْمُلْقِيَاتِ ذِكْرًا ﴿٥﴾ عُذْرًا أَوْ نُذْرًا ﴿٦﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَاقِعٌ ﴿٧﴾ فَإِذَا النُّجُومُ طُمِسَتْ ﴿٨﴾ وَإِذَا السَّمَاءُ فُرِجَتْ ﴿٩﴾ وَإِذَا الْجِبَالُ نُسِفَتْ ﴿١٠﴾ وَإِذَا الرُّسُلُ أُقِّتَتْ ﴿١١﴾ لِأَيِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ ﴿١٢﴾ لِيَوْمِ الْفَصْلِ ﴿١٣﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الْفَصْلِ ﴿١٤﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٥﴾ ﴾:

﴿ وَالْمُرْسَلَاتِ ﴾ خوا ﷻ سوێند دەخوات لەسەر زیندوو كردنەوەو پاداشت لەسەر كردەوەكان، بە (المرسلات عُرفا) ئەویش ئەو فریشتانەیە كە خوا دەیانێرێت بە كاروبارە قەدەرییەكانو ڕێكخستنی جیهان، وە كاروبارە شەرعیەكانو وەحیو پەیامی بۆ لای پێغەمبەرانی ﴿ عُرْفًا ﴾ حاڵە بۆ (المرسلات) واتە: نێردراوە بە عورفو حیكمەتو بەرژەوەندی، نەك بە زۆرو بە گاڵتەو هاوەنتە ﴿ فَالْعَاصِفَاتِ عَصْفًا ﴾ هەروەها ئەویش ئەو فریشتانەیە كە خوا دەیانێرێت، وەسفی كردوون بە دەستپێشخەری لە فەرمانەكانیداو جێبەجێ كردنیان بە پەلە، وەك ئەو با تووندانەی هەڵ دەكەن. یان: مەبەست لە (العاصفات) بای سەختە، كە زۆر بە پەلە هەڵ دەكات.

﴿ وَالنَّاشِرَاتِ نَشْرًا ﴾ دەگونجێ ئەوەش فریشتەكان بێت، بڵاوی دەكەنەوە ئەوەی كە پێویستە بڵاو بكرێتەوە، یان مەبەست پێی هەورەكانە كە خوا ﷻ بڵاوەیان پێ دەكات بە ئاسمانی زەویدا، جا زیندووی دەكاتەوە دوای مردنی.

﴿ فَالْمُلْقِيَاتِ ذِكْرًا ﴾ ئەویش ئەو فریشتانەن كە پیرۆزترین فەرمانەكان دەگەیەنن، ئەو زیكرەیە خوا بە هۆیەوە ڕەحمی بە بەندەكانی كردوە، تیایدا باسی سوودو

بەرژەوەندیەکانیــان دەکات، دەیگەیەنــێ بــە پێغەمبــەران، ﴿ عُذۡرًا أَوۡ نُذۡرًا ﴾ واتــە: بیانــوو بڕیــنو ترســاندنی خەڵکــی، خەڵکــی دەترســێنێ لــەوەی لــە پێشــیانە لــە مەترســیەکان، وە بیانوویــان دەبــڕێ تــا هیــچ بەڵگــەو حوجەجەیەکیــان نەمێنــێ لەســەر خــوا.

﴿ إِنَّمَا تُوعَدُونَ ﴾ (واتــە: بەڕاســتی ئــەوەی کــە بەڵێنتــان پێــدراوە) لــە زیندووبوونــەوەو پاداشــت لەســەر کــردەوەکان ﴿ لَوَٰقِعٞ ﴾ واتــە: هــەر دێتە دی، بەبــێ گومــانو دوودڵی، جا ئەگــەر ڕوویــدا، گۆڕانــێ لــە جیهاندا ڕوودەدات لەگەڵ مەترســیەکی ســەخت، کــە دڵەکان شــپرزە دەکات، جــا ئەســتێرەکان دەکوژێنەوە، واتــە: دەکەونە خوارەوەو لــە جێگای خۆیان نامێنــن، کێوەکانیــش شــی دەبنــەوە، وایــان لێدێــت وەکــو تــەپو تۆزێکی بەباچــوو، ئنجا کێــوەکانو زەوی ڕێــکو ســافو بــێ گژووگیــا دەمێننەوە، هیــچ جــۆرە لاریو بەرزیو نزمیەکــی تێــدا نابینی.

ئــەو ڕۆژە ئــا ئەو ڕۆژەیــە کە وادەی تێــدا دانراوە بۆ پێغەمبــەران، وە دواخراوە بــۆ بڕیاردان لــە نێــوان ئــەوانو ئوممەتەکانیان، لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ لِأَيِّ يَوۡمٍ أُجِّلَتۡ ﴾ (واتە: بۆ چ ڕۆژێ دواخــراوە)؟ ئیســتیفهامێکە بــۆ بە مەزن دانــانو بە گەورە دانانو ترســاندن.

پاشــان وەڵامــی داوەتــەوە بــە فەرمایشــتی خــۆی: ﴿ لِيَوۡمِ ٱلۡفَصۡلِ ﴾ واتــە: (بــۆ ڕۆژی جیاکردنــەوە) لە نێوان دروســتکراوەکاندا، هەندێکیــان بۆ هەندێکیان، وە لێپرســینەوەی هەر یەکەیــان بــە تەنهایی.

پاشــان هەڕەشــەی کــردوە لــەو کەســەی کــە بەدرۆدانــەری ڕۆژی دواییــە، فەرموویەتــی: ﴿ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴾ واتــە: ئــای حەســرەتو ئاخ بۆ ئەوان، لە ســەختی ســزایانو خراپی دەرەنجامیــان. خــوا ﷻ هەواڵــی پێداونو ســوێندی بــۆ خواردوون، بــەڵام ئەوان بــە درۆیان دانــاوە، ئا لەبــەر ئەوەیە شایســتەی ســزایەکی زۆر بە ئێشــن.

(١٦-١٩): ﴿ أَلَمۡ نُهۡلِكِ ٱلۡأَوَّلِينَ ١٦ ثُمَّ نُتۡبِعُهُمُ ٱلۡأٓخِرِينَ ١٧ كَذَٰلِكَ نَفۡعَلُ بِٱلۡمُجۡرِمِينَ ١٨ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ١٩ ﴾

واتــە: ئایــا بەدرۆدانەرانــی پێشــینمان لەنــاو نەبرد، پاشــان بــەدوای ئەواندا ئەوانەشــمان لەناو بــرد لــە بەدرۆدانەران، ئەمە ســوننەتی خوایــە لەوانەی پێشــینو دوایین کە هــەر دەبێ هەموو تاوانبارێــک ســزا بــدات، ئیتــر بۆچی پەنــد وەرناگرن بــەوەی دەیبینن و دەیبیســتن؟ ﴿ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴾ (واتــە: وای بــۆ بێبڕوایــان لــەو ڕۆژەدا) دوای ئــەوەی بەڵگــە ڕوونــانو تۆڵــەو ســزاکانیان بینی.

أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٢٠﴾ فَجَعَلْنَـٰهُ فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿٢١﴾ إِلَىٰ قَدَرٍ
مَّعْلُومٍ ﴿٢٢﴾ فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ ٱلْقَـٰدِرُونَ ﴿٢٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٤﴾
أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ كِفَاتًا ﴿٢٥﴾ أَحْيَآءً وَأَمْوَٰتًا ﴿٢٦﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ
شَـٰمِخَـٰتٍ وَأَسْقَيْنَـٰكُم مَّآءً فُرَاتًا ﴿٢٧﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٨﴾
ٱنطَلِقُوٓا۟ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٩﴾ ٱنطَلِقُوٓا۟ إِلَىٰ ظِلٍّ ذِى ثَلَـٰثِ
شُعَبٍ ﴿٣٠﴾ لَّا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِى مِنَ ٱللَّهَبِ ﴿٣١﴾ إِنَّهَا تَرْمِى بِشَرَرٍ
كَٱلْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُۥ جِمَـٰلَتٌ صُفْرٌ ﴿٣٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٤﴾
هَـٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴿٣٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ
لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٧﴾ هَـٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ۖ جَمَعْنَـٰكُمْ وَٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ فَإِن كَانَ
لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ ﴿٣٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ
فِى ظِلَـٰلٍ وَعُيُونٍ ﴿٤١﴾ وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٤٢﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا
بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٤٤﴾ وَيْلٌ
يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٥﴾ كُلُوا۟ وَتَمَتَّعُوا۟ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَيْلٌ
يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرْكَعُوا۟ لَا يَرْكَعُونَ ﴿٤٨﴾
وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٠﴾

(٢٠-٢٤): ﴿ أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٢٠﴾ فَجَعَلْنَـٰهُ فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿٢١﴾ إِلَىٰ قَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢٢﴾ فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ ٱلْقَـٰدِرُونَ ﴿٢٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾:

﴿ أَلَمْ نَخْلُقكُّم ﴾ واتە: ئایا ئێوەمان دروست نەکردوە ئەی ئادەمیزاد ﴿ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴾ (واتە: ئاوێک) لە ئەوپەڕی بێ نرخیدایە، لە نێوان پشتی پیاوو سنگی ئافرەتەوە دەرچووە، تا خوا دایناوە ﴿ فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴾ (جێگایەکی پتەو) ئەویش منداڵدانە، هەر لەوێدا جێگیر دەبێتو زیاد دەکات، ﴿ إِلَىٰ قَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴾ واتە: تا ماوەیەکی دیاریکراو ﴿ فَقَدَرْنَا ﴾ واتە: ماوەمان بۆ داناو ئەو منداڵەمان ڕێکخست لەو تاریکاییانە، وە گواستمانەوە لە نوتفەیەکەوە بۆ خوێنێکی مەیوو، دواتر پارچە گۆشتێک، تا خوا ﷻ کردوویەتی بە جەستەیەک پاشان ڕۆحی کردوە بەبەریدا، وە هەندێکیان پێش ئەوە دەمرن، ﴿ فَنِعْمَ ٱلْقَـٰدِرُونَ ﴾ (واتە: ئای چ دەسەڵاتدارێکی چاکی) مەبەست پێی زاتی بەرزو پیرۆزێتی، چونکە قودرەتی ئەو زاتە شوێنی حیکمەتو دانایی کەوتووەو گونجاوە لەگەڵ ستایش کردندا، ﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴾ دوای ئەوەی خوا ئایەتەکانی بۆ ڕوون کردنەوە، وە پەندو بەڵگە ڕوونەکانی پێ نیشاندان.

(٢٥-٢٨): ﴿ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ كِفَاتًا ﴿٢٥﴾ أَحْيَآءً وَأَمْوَٰتًا ﴿٢٦﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ شَـٰمِخَـٰتٍ وَأَسْقَيْنَـٰكُم مَّآءً فُرَاتًا ﴿٢٧﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٨﴾ ﴾:

﴿ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ ﴾ واتە: ئایا منەتمان نەکردوە بەسەرتانداو نیعمەتمان پێ نەبەخشیون، بە ڕامکردنی زەوی بۆ بەرژەوەندیەکانتان، جا کردوومانە، ﴿ كِفَاتًا ﴾ بە هۆکاری کۆکردنەوەتان، ﴿ أَحْيَآءً ﴾ لە ماڵەکاندا ﴿ وَأَمْوَٰتًا ﴾ لە گۆڕەکان، جا هەروەک چۆن ماڵو باڵەخانەکان لە نیعمەتەکانی خوان بەسەر بەندەکانیەوە،

بەهەمـان شـێوەش گـۆڕەکان، ڕەحمـەتو میهرەبانیەکـن بۆیـان، وە داپۆشـەریانن لـەوەی جەسـتەکانیان لــە دەشــتدا درنــدە بیانخــوات.

﴿ وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ ﴾ واتـە: چەنـد کێوێکـی دامەزراومـان دانـاوە بـۆ ئـەوەی تاسـەو لەنگەرتـان پێنـەکات، خـوا زەوی جێگیر کـردوە بـە کێـوە داکوتـراوە چەسـپیوە بـەرزو پانـەکان، ﴿ وَأَسْقَيْنَاكُم مَّاءً فُرَاتًا ﴾ واتـە: ئاوێکـی شـیرینو زولاڵ ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَاءُ جَعَلْنَاهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾الواقعـة، (واتـە: جـا پێـم بڵێـن ئـەو ئـاوەی کـە دەیخۆنـەوە * ئایـا ئێـوە لـە هـەورەوە دەیبارێنـن یـان ئێمـە دەیبارێنیـن * ئەگـەر بمـان ویسـتایە دەمانکـرد بـە ئاوێکـی زۆر سـوێری تـاڵ ئیتـر بـۆ سوپاسـی خـوا ناکـەن).

﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴾ لەگـەڵ ئـەوەی خـوا ئـەو نازونیعمەتانـەی پـێ تایبـەت کـردوونو پێـی نیشـان داون، بـەڵام ئـەوان دژی وەسـتاونو بـە درۆیـان دانـاوە.

(٢٩-٣٤): ﴿ انطَلِقُوا إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٩﴾ انطَلِقُوا إِلَىٰ ظِلٍّ ذِي ثَلَاثِ شُعَبٍ ﴿٣٠﴾ لَّا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِي مِنَ اللَّهَبِ ﴿٣١﴾ إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَالْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُ جِمَالَتٌ صُفْرٌ ﴿٣٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾

ئەمـە وەیـلو سـزایە خـوا ﷻ ئامـادەی کـردوە بـۆ بێبـڕوا بەدرۆدانـەرەکان، کـە لـە ڕۆژی قیامەتـدا پێیـان دەوتـرێ: ﴿ انطَلِقُوا إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ ﴾ (واتـە: بـڕۆن بـۆ لای ئـەو دۆزەخـەی کـە بەدرۆتـان دەزانـی)، پاشـان ئـەوەی شـیکردوەتەوە دەفەرمـوێ: ﴿ انطَلِقُوا إِلَىٰ ظِلٍّ ذِي ثَلَاثِ شُعَبٍ ﴾ واتـە: (بـڕۆن) بـۆ لای سـێبەری ئاگـری دۆزەخ، کـە بـەرز دەبێتـەوە جیادەبێتـەوە بـۆ سـێ پارچـە ئاگـر.

﴿ لَّا ظَلِيلٍ ﴾ (سـێبەری نیـە) ئـەو سـێبەرە، واتـە: نـە حەوانـەوەی تێدایـە نـە ئارامـیو دڵنیایـی، ﴿ وَلَا يُغْنِي ﴾ بێنیـاز نابـێ ئـەوەی تیایدایـە ﴿ مِنَ اللَّهَبِ ﴾ (واتـە: لـە گـڕی ئاگـر) بەڵکـو گـڕی دۆزەخ لـە هەمـوو لایەکـەوە دەوری دەدات، لای ڕاسـتو چـەپ (و سـەرو خـوار)، هەروەکـو خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ النَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ﴿١٦﴾ ﴾الزمـر. (واتـە: بـۆ ئەوانـە هەیـە لـەلای سـەریانەوە چەنـد تەبەقـێ وەک هـەوری ڕەش لـە ئاگـرو لـە ژێریشـیانەوە چەنـد تەبەقـێ هەیـە)، ﴿ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ ﴿٤١﴾ ﴾الأعـراف، (واتـە: ئەوانەی لـە دۆزەخدا فـەرشو ڕاخەریـان لـە ئاگـرە، وە لـەلای سەرووشـیانەوە لێفـەو داپۆشـەریان لـە ئاگرە).

پاشـان باسـی مەزنـی پرشـی دۆزەخ دەکات کـە بەڵگەیـە لەسـەر مەزنـیو مەترسـیو دیمەنـی ناشـرینی، جـا فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَالْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُ جِمَالَتٌ صُفْرٌ ﴾ (واتـە: بەڕاسـتی دۆزەخ پرشـی وەک کۆشـک دەهاوێـژێ * بـەرەو دوا دەڕۆن ئەڵێـی کاروانـی حوشـتری زەردن) ئـەو ئاگـرە خـۆی ڕەشـە دەگـۆڕێ بـۆ ڕەنگێـک زەردی تێدایـە، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی بەڕاسـتی ئاگـری دۆزەخ گـڕو پـرشو ئەسـکڵەکانی تاریکـن، چونکـە ئـەو ئاگـرە ڕەشـە، دیمەنێکـی ناشـرینو گەرمیەکـی سـەختی هەیـە، داوادەکەیـن خـوا بمانپارێـزێ لێـی، وە لـەو کردەوانـەش کـە نزیـک کەرەوەیەتـی (اللهـم آمـین)، ﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ ﴾.

(٣٥-٤٠): ﴿ هَذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴿٣٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٧﴾ هَذَا يَوْمُ الْفَصْلِ جَمَعْنَاكُمْ وَالْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ فَإِن كَانَ لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ ﴿٣٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾:

﴿ هَذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴾ واتـە: ئەمـە ڕۆژێکـی مـەزنو سـەختە لەسـەر بەدرۆدانـەران، ناتوانـن قسـەی تێـدا بکـەن بـە هـۆی ترسـێکی سـەختەوە ﴿ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴾ واتـە: بیانوویـان وەرناگیـرێ، ئەگەرچـی بیانـوو بێنـنـەوە، ﴿ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ الَّذِينَ ظَلَمُوا مَعْذِرَتُهُمْ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾الـروم، (واتـە: جـا لـەو ڕۆژەدا کەسـانێ کـە سـتەمیان کـردوە بەهانـە هێنانـەوە سـوودیان پـێ ناگەیەنـێ، وە داوایـان لێناکـرێ خـوا لـە خۆیـان ڕازی بکـەن)، ﴿ هَذَا يَوْمُ الْفَصْلِ جَمَعْنَاكُمْ وَالْأَوَّلِينَ ﴾ واتـە: بـۆ ئـەوەی جیاتـان بکەینـەوە کـە بڕیـار بـدەن لـە نێـو بەدیهێنراوەکانـدا، ﴿ فَإِن كَانَ لَكُمْ كَيْدٌ ﴾ (واتـە: جـا ئەگـەر فێـڵو پیلانێکتـان هەیـە ئەنجامـی بـدەن) لـە موڵکـی مـن دەربچـنو ڕزگاربـن پێـی لـە سـزای مـن، ﴿ فَكِيدُونِ ﴾ واتـە: هیـچ توانـاو دەسـەڵاتێکتان نیـە، وەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانفُذُوا لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ ﴿٣٣﴾ ﴾الرحمـن، (واتـە: ئـەی کۆمەڵـی جنۆکـەو ئادەمیـزاد ئەگـەر توانیتـان دەرچـن لـە بەشـەکانی ئاسـمانەکانو زەوی ئـەوە بـڕۆن دەرچـن ناشـتوانن مەگـەر بـە دەسـەڵاتێک).

لـەو ڕۆژەدا فێڵـی سـتەمکاران دەپچـڕێو پـەرشو بـڵاو دەبێـتو ملکەچـی سـزای خـوا دەبـن، وە درۆکانیـان بـۆ ڕوون دەکاتـەوە لـە بەدرۆدانانیـان ﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ ﴾.

(٤١-٤٥): ﴿ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي ظِلَالٍ وَعُيُونٍ ﴿٤١﴾ وَفَوَاكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٤٢﴾ كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿٤٤﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾:

کاتـێ باســی ســزای بــە درۆدانەرانــی کــرد، باســی پاداشــتی چاکەکارانیشــی دەکات، دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ واتـە: (بەڕاسـتی ئەوانـە خۆیـان پاراسـتووە) لـە بەدرۆدانـان، ئەوانــەی وەســف کــراون بــە بەڕاســتدانان لــە قســەو کردەوەکانیــان، بەوشـێوەیە نابــن، مەگــەر بــە جێبەجێکردنــی ئەرکــەکانو وازهێنــان لــە قەدەغەکــراوەکان ﴿ فِى ظِلَٰلٍ ﴾ واتــە: لــە ســێبەری بــاخو باخاتــی چــرو پــرو ڕەنگــاو ڕەنگــی جوانــدان ﴿ وَعُيُونٍ ﴾ (وە کانیــاوی) ڕۆیشــتوو لــە سەلســەبیلو گــولاوو جگــە لەوانیــش.

﴿ وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ ﴾ واتــە: (لەنــاو میوەهاتێکــدان کــە حــەزی لێدەکــەن) لــە چاکترینــی میــوەکانو بەلەزەتترینیــان، پێیــان دەوتــرێ: ﴿ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ ﴾ لــەو خــواردنو خواردنــەوە بــە لــەزەتو بەتامانــە ﴿ هَنِيٓـًٔا ﴾ واتــە: بەبــێ لەناوچــوونو وەرس بــوون. خۆشــیەکەی تــەواو نابــێ، تــا خــواردنو خواردنەوەکــە پارێــزراو نەبــێ لــە هەمــوو نەخۆشــیو کــەمو کورپــەک، وە تــا دڵنیــا دەبــن ئــەو خواردنــە نابڕێتــەوەو لەنــاو ناچــێ.

﴿ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ جــا کردەوەکانتــان هــۆکاری گەیشــتنتانە بــەم نازونیعمەتــە بەردەوامــە، بــەو شـێوەیە هــەر کەسـێک بــە چاکــی خــوا بپەرسـتێو چــاک بێــت بــۆ بەندەکانــی خــوا، لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ (واتــە: ئێمــە بــەو شـێوەیە پاداشــتی چــاکان دەدەینــەوە)، ﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴾ ئەگــەر ئــەوان ئــەم هەڕەشــەیان بــۆ نەبــێ جگــە لــە لەدەســتدانی ئــەم نیعمەتانــە، ئــەوە بــەس دەبــوو بێبــەش بــوونو زەرەرمەندیــان.

(٤٦-٥٠): ﴿ كُلُوا۟ وَتَمَتَّعُوا۟ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرْكَعُوا۟ لَا يَرْكَعُونَ ﴿٤٨﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾:

واتــە: ﴿ كُلُوا۟ وَتَمَتَّعُوا۟ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ﴾ ئەمــە هەڕەشــەیە بــۆ بەدرۆدانــەران، ئــەوان ئەگــەر لــە دونیــادا بخــۆنو بخۆنــەوەو چێــژو لــەزەت وەربگــرن، وە بێئاگــا بــن لەوانــەی نزیکیــان دەکاتــەوە لــە خــوا، ئــەوە بەڕاســتی ئەوانــە تاوانبــارن، شایســتەی ئــەوەن کــە تاوانبــاران شایســتەیین، لــە ماوەیەکــی نزیکــدا لەزەتەکانیــان لــێ دەپچــڕێ، تەنهــا شــوێنەوارەکانی دەمێنێتــەوە کــە چــی بــە دوای خۆیــدا هێنــاوە بۆیــان.

یەکێــک لــە تاوانەکانیــان ئــەوان ئەگــەر فەرمانیــان پــێ بکــرێ بــە نوێــژ کــردن کــە چاکتریــنو گەورەترینــی پەرستشــەکانە، وە پێیــان بوتــرێ: ﴿ ٱرْكَعُوا۟ ﴾ (واتــە:

کڕنــووش بیــەن) ڕێگــری دەکــەن لێــی.

چ تاوانێــک لــە ســەرووی ئەمەوەیــە؟ وە چ بێبڕوایــیو بەدرۆدانانێــک لــە ســەرووی ئەمەوەیـــە؟! ﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴾، لـــە هەڕەشـــەکردن لەســـەریان دەرگاکانـــی ســەرکەوتنو کامەرانیـــان بەســـەردا دادەخـــرێو بێبـــەش دەبـــن لـــە هەمـــوو خێرێـــک، بێگومــان ئــەوان ئەگــەر بــڕوا بــەم قورئانــە پیــرۆزە نەکــەن، کــە بەرزترینــی پلــەو پایەی ڕاســتیو دڵنیاییــە بــە ڕەهایــی، ﴿ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ ﴾ (واتــە: ئیتــر بــە چ فەرموودەیەکــی تــر بــڕوا دەهێنـــن دوای قورئــان)، ئایــا بــە پــووچ بــڕوا دەهێنـــن کــە وەکــو ناوەکــەی پووچــەو هیــچ گومانێکــی تێدانیــە، ســەرەڕای بەڵگــە هێنانــەوەی بــۆی؟ یــان بــە قســەی هەمــوو هاوبــەش دانەرێکــی درۆزن؟

لــە دوای نــوورو ڕووناکــی هیچــی تــر نیــە جگــە لــە تاریکســتانی، لــە دوای ڕاســتیش کــە بەڵگــەی یەکلاکــەرەوەی لەســەر هێنراوەتــەوە، هیچــی تــر نیــە جگــە لــە درۆ هەڵبەســتنی ئاشــکرا نەبــێ، کــە شــیاو نیــە مەگــەر بــەوەی لەگەڵیــدا دەگونجــێ. تووڕەیی بــۆ ئــەوان، چ کوێــری کــردوون! هــاوارو داد بــۆ ئــەوان چــۆن تووشــی خەســارەتو بەدبەختــی بــوون! داوای ســەلامەتی لــە خــوا ﷻ دەکەیــن.

تەفسیری سووڕەتی (المرسلات) تەواو بوو


سورة النبأ
بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ (١) عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلۡعَظِيمِ (٢) ٱلَّذِي هُمۡ فِيهِ مُخۡتَلِفُونَ (٣)
كَلَّا سَيَعۡلَمُونَ (٤) ثُمَّ كَلَّا سَيَعۡلَمُونَ (٥) أَلَمۡ نَجۡعَلِ ٱلۡأَرۡضَ مِهَٰدٗا (٦)
وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا (٧) وَخَلَقۡنَٰكُمۡ أَزۡوَٰجٗا (٨) وَجَعَلۡنَا نَوۡمَكُمۡ سُبَاتٗا
(٩) وَجَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ لِبَاسٗا (١٠) وَجَعَلۡنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشٗا (١١) وَبَنَيۡنَا
فَوۡقَكُمۡ سَبۡعٗا شِدَادٗا (١٢) وَجَعَلۡنَا سِرَاجٗا وَهَّاجٗا (١٣) وَأَنزَلۡنَا مِنَ
ٱلۡمُعۡصِرَٰتِ مَآءٗ ثَجَّاجٗا (١٤) لِّنُخۡرِجَ بِهِۦ حَبّٗا وَنَبَاتٗا (١٥) وَجَنَّٰتٍ
أَلۡفَافًا (١٦) إِنَّ يَوۡمَ ٱلۡفَصۡلِ كَانَ مِيقَٰتٗا (١٧) يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ
فَتَأۡتُونَ أَفۡوَاجٗا (١٨) وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ أَبۡوَٰبٗا (١٩) وَسُيِّرَتِ
ٱلۡجِبَالُ فَكَانَتۡ سَرَابًا (٢٠) إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتۡ مِرۡصَادٗا (٢١) لِّلطَّٰغِينَ
مَـَٔابٗا (٢٢) لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحۡقَابٗا (٢٣) لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرۡدٗا وَلَا شَرَابًا
(٢٤) إِلَّا حَمِيمٗا وَغَسَّاقٗا (٢٥) جَزَآءٗ وِفَاقًا (٢٦) إِنَّهُمۡ كَانُواْ
لَا يَرۡجُونَ حِسَابٗا (٢٧) وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كِذَّابٗا (٢٨) وَكُلَّ شَيۡءٍ
أَحۡصَيۡنَٰهُ كِتَٰبٗا (٢٩) فَذُوقُواْ فَلَن نَّزِيدَكُمۡ إِلَّا عَذَابًا (٣٠)

## تەفسیری سووڕەتی (النبأ)
## مەککییە (٤٠) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٥): ﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ (١) عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلۡعَظِيمِ (٢) ٱلَّذِي هُمۡ فِيهِ مُخۡتَلِفُونَ (٣) كَلَّا سَيَعۡلَمُونَ (٤) ثُمَّ كَلَّا سَيَعۡلَمُونَ (٥)﴾:

﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ﴾ واتــە: ئەوانــەی ئایەتەکانــی خــوا بــەدرۆ دادەنێــن دەربــارەی چ شــتێک پرســیار دەکــەن؟ پاشــان ڕوونــی کردۆتــەوە ئــەوەی ئــەوان پرســیاری لــێ دەکــەن چیــە؟ فەرموویەتــی: ﴿عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلۡعَظِيمِ (٢) ٱلَّذِي هُمۡ فِيهِ مُخۡتَلِفُونَ﴾ واتــە: لــەو دەنگوباســە مەزنــە، کــە ماوەیەکــی زۆرە تیایــدا ڕاجیــاوازن، جیاوازیــان بــڵاوەی کــردوە لــە ڕووی بەدرۆزانیــنو بەدرۆدانانــی، ئەویــش ئــەو هەواڵەیە کــە گومــانو دوودڵــی تێدانیــە، بــەڵام ئەوانــەی دیــداری پەروەردگاریــان بــەدرۆ دادەنێــن، هەرگیــز بڕواناهێنــن، ئەگەرچــی هەمــوو بەڵگــەو نیشــانەیەکیان بــۆ بێــت، تــا ســزای ســەخت (و بــە ئێــشو ئــازار) بــە چــاوی خۆیــان نەبینــن.

لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿كَلَّا سَيَعۡلَمُونَ (٤) ثُمَّ كَلَّا سَيَعۡلَمُونَ﴾ واتــە: کاتێــک کــە ســزایان بــۆ دابــەزی تێدەگــەن لــەوەی کــە بەدرۆیــان زانیــوە، کاتــێ پەلکێــش دەکرێــن بــۆ نــاو ئاگــری دۆزەخ چــۆن پەلکێــش کردنێــک، پێیــان دەوتــرێ: ﴿هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ (١٤)﴾الطور، (واتــە: ئەمــە ئــەو ئاگرەیــە کــە ئێــوە بەدرۆتــان دەزانــی). پاشــان خــوا باســی ئــەو نیعمــەتو بەڵگانــەی کــردوە کــە بەڵگــەن لەســەر ڕاســتی ئــەو پەیامــەی پێغەمبــەران هێناویانــە، جــا فەرموویەتــی:

(٦-١٦): ﴿أَلَمۡ نَجۡعَلِ ٱلۡأَرۡضَ مِهَٰدٗا (٦) وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا (٧) وَخَلَقۡنَٰكُمۡ أَزۡوَٰجٗا (٨) وَجَعَلۡنَا نَوۡمَكُمۡ سُبَاتٗا (٩) وَجَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ لِبَاسٗا (١٠) وَجَعَلۡنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشٗا (١١) وَبَنَيۡنَا فَوۡقَكُمۡ سَبۡعٗا شِدَادٗا (١٢)

وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ وَأَنزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجًا ﴿١٤﴾ لِّنُخْرِجَ بِهِ حَبًّا وَنَبَاتًا ﴿١٥﴾ وَجَنَّاتٍ أَلْفَافًا ﴿١٦﴾ ﴾.

﴿ أَلَمْ نَجْعَلِ ﴾ ئایا پێمان نەبەخشیون نیعمەتی گەورەو مەزن، دامان ناوە بۆتان ﴿ الْأَرْضَ مِهَادًا ﴾ واتە: راخراوو زەلیلکراو بۆتانو بۆ بەرژەوەندیەکانتان لە کێڵگەو نیشتەجێبوونو رێگەو بانەکان ﴿ وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴾ واتە: زەوی رادەگرێ بۆ ئەوەی تاسەو لەنگەرتان پێ نەکات، ﴿ وَخَلَقْنَاكُمْ أَزْوَاجًا ﴾ واتە: نێرو مێ، لە یەک رەگەز بۆ ئەوەی هەریەکەیان لە پاڵ ئەوی دیکە بحەسێتەوەو بەزەیی‌و خۆشەویستی دروست ببێت، وەچە بخەنەوە، وە لە چوارچێوەی ئەم منەتەدا لەزەت وەرگرتن لە یەکتر.

﴿ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴾ واتە: حەسانەوە بۆتان، وە برینەوەی سەرقاڵ بوونتان کە هەر کاتێک درێژەتان پێ بکێشێ، زیان دەگەیەنێ بە جەستەکانتان، جا خوا شەوو خەوتنی کردوە بە مایەی داپۆشینی خەڵکی بۆ ئەوەی لە جوڵەی زیاناوی بکەون، وە حەوانەوەی بە سوودیان دەست بکەوێ، ﴿ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴾ واتە: کە حەوت ئاسمانە لە ئەوپەڕی هێزو تواناو رەقی‌و پتەویدان.

بێگومان خوا ﷻ بە تواناو قودرەتی خۆی گرتوونی، وە کردوونی بە ئاسمانێک بۆ زەوی، چەندین سوودی هەیە بۆیان، لەبەر ئەمەیە باسی سوودەکانی کردوە وەکو خۆر، فەرموویەتی: ﴿ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴾ (واتە: وە دروستمان کردوە چرایەکی درەوشاوە) هەواڵیداوە بە (السراج) وەک نیعمەتێک بە رووناکیەکەی، کە زۆر گرنگە بۆ بەدیهێنراو، وە بە (الوهاج) کە گەرمی تێدایە، وە چەندین بەرژەوەندی دیکە.

﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ ﴾ واتە: هەور، ﴿ مَاءً ثَجَّاجًا ﴾ واتە: زۆر زۆرە، ﴿ لِّنُخْرِجَ بِهِ حَبًّا ﴾ (واتە: تا پێی بروێنین) لە گەنم‌و جۆو دانەوێڵەو برنج‌و جگە لەوانەش کە ئادەمیزاد دەیخوات، ﴿ وَنَبَاتًا ﴾ سەرجەم گژوو گیاکان دەگرێتەوە کە خوا کردوویەتی بە بژێوی بۆ ئاژەڵەکانیان، ﴿ وَجَنَّاتٍ أَلْفَافًا ﴾ واتە: باخاتێکی چڕو پڕ لە هەموو جۆرە میوە بە لەزەتەکانی تێدایە.

جا ئەو زاتەی نازونیعمەتی ڕشتووە بەسەرتاندا بەم نیعمەتە مەزنانە، کە بە هیچ کەس ئەندازە ناکرێ‌و ناژمێردرێ، چۆن ئێوە بێبڕوایی پێ دەکەن‌و بەدرۆی

دادەنێـن لـەوەی کـە هەواڵـی پێـداون دەربـارەی زیندوو کردنـەوەو گەڕانـەوە؟! یـان چـۆن پشـت بەسـت بـە نیعمەتەکانـی سـەرپێچی دەکـەن‌و نکووڵـی لێدەکـەن؟!

(١٧-٣٠)﴿ إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ كَانَ مِيقَـٰتًا ﴿١٧﴾ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ﴿١٨﴾ وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ أَبْوَٰبًا ﴿١٩﴾ وَسُيِّرَتِ ٱلْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا ﴿٢٠﴾ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا ﴿٢١﴾ لِّلطَّـٰغِينَ مَـَٔابًا ﴿٢٢﴾ لَّـٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا ﴿٢٣﴾ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾ جَزَآءً وِفَاقًا ﴿٢٦﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴿٢٧﴾ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا كِذَّابًا ﴿٢٨﴾ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَـٰهُ كِتَـٰبًا ﴿٢٩﴾ فَذُوقُوا۟ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴿٣٠﴾ ﴾:

﴿ إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ كَانَ ﴾ خـوا باسـی ئـەوە دەکات کـە ڕوودەدات لـە ڕۆژی دواییـدا، بەدرۆدانـەران پرسـیار لـە یەکتـری دەکـەن دەربـارەی، کەللەڕەقانیـش نکووڵـی لێدەکـەن، بـە ڕاسـتی ئـەو ڕۆژە ڕۆژێکـی مەزنـە، خـوا ﷻ کردوویەتی بـە:﴿ مِيقَـٰتًا ﴾ (ماوەیەکـی دیاریکـراو) بـۆ خەڵکـی،﴿ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ﴾ (واتـە: ئـەو ڕۆژەی کـە فـوو دەکـرێ بـە صـوردا ئنجـا پـۆڵ پـۆل دێـن) لـەو ڕۆژەدا تـرس‌و شـپرزەییەک ڕوودەدات کـە منـداڵ پیـر دەبێـت‌و دڵەکانیـش بێـزار دەبـن.

جـا کێـوەکان دەکەونـە ڕێ تـا وەکـو تـەپ‌و تـۆزی پـەرش‌و بڵاودەبنـەوە، ئاسـمانیش دەکرێتـەوەو دەبێتـە چەنـد دەرگایـەک، خـواش دادوەری لـە نێـوان بەدیهێنراوەکانـدا دەکات، بـەو بڕیـارەی کـە هیـچ سـتەمێکی تێدانیـە، وە ئاگـری دۆزەخ هەڵدەگیرسـێ کە خـوا ئامـادەی کـردوە بـۆ یاخیبـووان‌و کردوویەتـی بەجێـی مانەوەیـان، ئـەوان تیایـدا دەمێننـەوە بـۆ ماوەیەکـی زۆر، (الحقـب) لـە سـەر بۆچوونـی زۆربـەی ڕاڤەزانانـی قورئـان هەشـتا سـاڵە، جا ئەگـەر چوونـە نـاو ئاگـری دۆزەخـەوە،﴿ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴾ واتـە: (تێیـدا ناچێـژن) نـە ئـەوەی پێسـتیان سـارد بکاتـەوە، نـە تینوێتیـان لاببـات،﴿ إِلَّا حَمِيمًا ﴾ واتـە: (مەگـەر) ئاوێکـی گـەرم، دەم‌و چاوویـان ببرژێنـێ‌و هەناویـان دەربهێنـێ.

﴿ وَغَسَّاقًا ﴾ ئەویـش کێـم‌و زوخـاوی دۆزەخیانـە لـە ئەوپـەڕی پیسـی‌و بۆنێکـی ناخۆش دایـە، شایسـتەی ئـەم تۆڵـە دژوارە پـڕ مەترسـیە بـوون، وەک پاداشـت بۆیـان بەپێـی ئـەو کردەوانەیـان گەیاندنـی بـەو سـزایە، خـوا سـتەمی لـێ نەکـردوون، بەڵکـو خۆیـان سـتەمیان لـە خۆیـان کـردوە، لەبـەر ئەمەیـە باسـی کردەوەکانیانـی کـردوە کـە بـە هۆیانـەوە شایسـتەی ئـەم سـزایەن، جـا فەرموویەتـی:﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴾

واتـە: (بێگومـان ئـەوان) نـە بڕوایـان بـە زینـدوو کردنـەوە هەبـوو، نـە بڕوایـان بـەوە بـوو خـوا پاداشـتی خەڵکـی بداتـەوە بـە خێـرو چاکـە، لەبـەر ئەوەیـە کردەوەیـان بـۆ دوارۆژ پشـت گـوێ خسـت، ﴿ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كِذَّابٗا ﴾واتـە: ئایەتەکانـی ئێمەیـان بـەدرۆ دادەنـا، بـە بەدرۆدانانێکـی روونو رەوان، بەڵگـەو نیشـانەکانمان هـات بۆیـان نکووڵـیو عینادیـان لێکـرد، ﴿ وَكُلَّ شَيۡءٍ ﴾(هەمـوو شـتێ) لـە کـەمو زۆرو خێـرو شـەڕ ﴿ أَحۡصَيۡنَٰهُ كِتَٰبٗا ﴾واتـە: نوسـیوومانە لـە (اللـوح المحفـوظ) بـا تاوانبـاران نەترسـن لـەوەی ئێمـە سـزامان داون بـە هـۆی ئـەو گوناهانـەی ئەنجامیـان داوە، بـا وانەزانـن ئـەو زاتـە شـتێ لـە کردەوەکانـی ئـەوان ون دەکات، یـان بیـری دەچێـت، بـە قـەد تۆزقاڵـە زەرەیـەک، هەروەکـو خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلۡمُجۡرِمِينَ مُشۡفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيۡلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحۡصَىٰهَاۚ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرٗاۗ وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدٗا ٤٩ ﴾الکهـف (واتـە: نامـەی کـردەوەکان دابـەش دەکـرێ دەدرێتـە دەسـتی ڕاسـتی چـاکانو دەسـتی چەپـی تاوانبـاران، ئنجـا تاوانبـاران دەبینـی زۆر دەترسـن لـەو هەمـوو تـاوانو خراپـەی کـە تێیدایـە، وە دەڵێـن ئـای هـاوار بـۆ ئێمـە ئـەم نامـەو دەفتـەرە چیـە؟ هیـچ کردەوەیەکـی بچـووکو گـەورەی بەجـێ نەهێشـتووەو تۆمـاری کـردووە هـەر کردەوەیەکیـان کردبـێ تیایـدا ئامادەیـە وە پەروەردگـارت سـتەم لـە کـەس نـاکات).

﴿ فَذُوقُواْ ﴾واتـە: بچێـژن ئـەی بەدرۆدانـەران! ئـەم سـزا بـە ئێـشو ڕیسـواکەرە بەردەوامـە، ﴿ فَلَن نَّزِيدَكُمۡ إِلَّا عَذَابًا ﴾(واتـە: هیچتـان بـۆ زیـاد ناکەیـن سـزا نەبێـت) لـە هەمـوو کاتو سـاتێکدا سـزایان بـۆ زیـاد دەبێـت، ئـەم دەقـە توندترینـی دەقەکانـە لـە سـەختی سـزای دۆزەخیـان، خـوا پەنامـان بـدات.

إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعْنَٰبًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا
دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴿٣٥﴾ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً
حِسَابًا ﴿٣٦﴾ رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلرَّحْمَٰنِ لَا يَمْلِكُونَ
مِنْهُ خِطَابًا ﴿٣٧﴾ يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ صَفًّا لَّا يَتَكَلَّمُونَ
إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا ﴿٣٨﴾ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ فَمَن
شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴿٣٩﴾ إِنَّآ أَنذَرْنَٰكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ يَنظُرُ
ٱلْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا ﴿٤٠﴾

**(٣١-٣٦):** ﴿ إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعْنَٰبًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴿٣٥﴾ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابًا ﴿٣٦﴾ ﴾:

كاتێ باسی حاڵی تاوانبارانی كرد، باسی سەرەنجامی خۆپارێزانی كردو فەرمووی: ﴿ إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴾ واتە: ئەوانەی خۆیان دەپارێزن لە تووڕەیی پەروەردگاریان، بە پەیوەست بوون بە گوێڕایەڵی كردنی، وە دەست هەڵگرتن لە سەرپێچی كردنی، ئەوانە سەركەوتنو ڕزگار بوونو دووریان بۆ هەیە لە ئاگر، جا لەو سەركەوتنانەیان، ﴿ حَدَآئِقَ ﴾ ئەویش باخو باخاتی گشتگیرو كۆكەرەوەیە بۆ هەموو جۆرە داروردەختە جۆراو جۆرەكان كە بەرهەمیان ڕەنگاو ڕەنگە، لە نێوانیاندا ناو هەڵدەقوڵێ، وە ترێی تایبەت كردوە لە نێوانیاندا، ئەویش بە هۆی ڕێزداریو زۆری بوونی ئەو درەختە لە ناو باخچەكاندا. بۆ بەهەشتیەكان هەیە لە ناو ئەو بەهەشتانەدا ئافرەتانێك لەسەر داواكاری نەفسو دەروونیان،﴿ وَكَوَاعِبَ ﴾ واتە: كچانی تازە پێگەیشتوو كە مەمكیان نەشكاوەتەوە، لە گەنجێتیو هێزو جوانیاندا.

(الأتراب): ئەو ئافرەتانەن لە یەك تەمەندانو نزیكن لە یەكەوە.

لە عادەتی ئەو هاوتەمەنانە هەموویان پێكەوە گونجاونو بەیەكەوە دەژین، ئەو تەمەنەی كە تیایدان تەمەنی سیو سێ ساڵە، ئەویش تەواوترینی تەمەنی گەنجێتیە،﴿ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴾ واتە: پڕە لە گوڵاو، نۆشەرانی لەزەتی لێوەردەگرن، ﴿ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا ﴾ (واتە: نابیستن تیایدا) قسەی بێهودە،﴿ وَلَا كِذَّٰبًا ﴾ واتە: نە تاوانو نە درۆ، هەروەك خوا ﷻ فەرموویەتی:﴿ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا ﴿٢٦﴾ ﴾ الواقعة، (واتە: نابیستن لەو بەهەشتانەدا نە قسەی بێهودەو نە

تاوانبـار کـردن * جگـه لـه وتـهی سـڵاو سـەلام کـردن لـه یەکتـری) لەبـەر ئەوەیـە خـوا ﷻ ئـەم پاداشـتە بـێ پایانـەی پـێ بەخشـیون لـە فـەزڵو چاکـەی خـۆی، ﴿ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ ﴾(واتـە: وەک پاداشـتێکە لەلایـەن پەروەردگارتـەوە) بۆیـان ﴿ عَطَآءً حِسَابًا ﴾ واتـە: بـە هـۆی ئـەو کردەوانـەی خـوا تێیـدا سـەرکەوتووی کـردن، کردوویەتـی بـە هۆکارێـک بـۆ گەیشـتن بـە بەهەشـتەکەی.

(٣٧-٤٠): ﴿ رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلرَّحْمَٰنِ لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا ﴿٣٧﴾ يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ
وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ صَفًّا لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا ﴿٣٨﴾ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ فَمَن شَآءَ
ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴿٣٩﴾ إِنَّآ أَنذَرْنَٰكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ يَنظُرُ ٱلْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ
يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا ﴿٤٠﴾ ﴾

ئـەوەی ئـەم پاداشـتو نازونیعمەتـەی پـێ بەخشـیوون ئـەوە پەروەردگاریانـە، ﴿ رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾(واتـە: پەروەردگـاری ئاسـمانەکانو زەوی) ئـەو زاتـەی دروسـتی کـردوونو بەرێـوەی بـردوون، ﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ﴾ئـەو زاتـەی میهرەبانـی هەمـوو شـتێکی گرتۆتـەوە، جـا پـەروەردەی کـردوونو ڕەحمـی پێکـردوونو بەزەیـی پێیانـدا هاتۆتەوە، تـا ئـەوەی بەدەسـتیان هێنـاوە کـە بەدەسـتیان هێنـاوە.

پاشـان باسـی مەزنـی موڵـکو دەسـەڵاتی گـەورەی خـۆی کـردوە لـە ڕۆژی دواییـدا، بێگومـان هەمـوو دروسـتکراوەکان لـەو ڕۆژەدا بێدەنگـنو هیـچ قسـە ناکـەن، ﴿ لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا ﴾(واتـە: کـەس توانـای تکاکردنیشـی نیـە)، ﴿ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا ﴾هیـچ کەسـێک ناتوانـێ قسـە بـکات بـەم دوو مەرجـە نەبێـت: خـوا ﷻ مۆڵەتـی پـێ بـدات بـە قسـە کـردن، وە ئـەوەی کـە قسـەی کـە دەیـکات قسـەکەی بەجـێ بـێ.

چونکـە ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ﴾ئـەو ڕۆژە ﴿ ٱلْحَقُّ ﴾(ڕۆژی ڕاسـتیەکانە) کە پـووچو باتڵ هیچ نرخێکـی نیـە، درۆش هیـچ سـوودێک ناگەیەنـێ، لـەو ڕۆژەدا ﴿ يَقُومُ ٱلرُّوحُ ﴾ئەویـش جبریلـە ﷺ کـە بەڕێزترینـی نـاو فریشـتەکانە ﴿ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ﴾هەروەهـا فریشـتەکانیش ﴿ صَفًّا ﴾بەڕیـز دەوەسـتن بـە ملکـەچ بوونیـان بـۆ خـوا ﴿ لَّا يَتَكَلَّمُونَ ﴾(کەسـیان قسـە ناکـەن) مەگـەر ئـەوەی خـوا مۆڵەتـی پێدابێـت بـە قسـەکردن.

جـا کاتـێ هانیـداو ترسـاندیو مـژدەی دا فەرمـووی: ﴿ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴾ (واتـە: ئنجـا هـەر کەسـێک ویسـتی ڕێگـای گەڕانـەوە دەگـرێ بـۆ لای پەروەردگاری)

واتـە: کـردەوەو پلـەو پایـەی بـەرز دەگرێتـەوە بـۆی لـە ڕۆژی دوایـیـدا، ﴿ إِنَّآ أَنذَرۡنَٰكُمۡ عَذَابٗا قَرِيبٗا ﴾ (واتـە: بێگومـان ئێمـە ئێوەمـان ئاگـادار کـرد لـە سـزایەکی نزیـک) چونکـە نزیـک بووەتـەوە، هـەر شـتێک بڕیـار بـێ بێـت ئـەوە نزیکـە.

﴿ يَوۡمَ يَنظُرُ ٱلۡمَرۡءُ مَا قَدَّمَتۡ يَدَاهُ ﴾ واتـە: ئـەوەی بەلایـەوە گرنگـەو ڕاچەڵەکیـوەو تۆقیـوە لێـی بـا تەماشـای ئـەم دونیایـە بـکات کـە چـی پێشخسـتووە بـۆ دواڕۆژی، وەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٨ ﴾ الحشر، (واتـە: ئـەی ئەوانـەی کـە بڕواتـان هێنـاوە لـە خـوا بترسـن، وە هەمـوو کەسـێک بـا سـەرنج بـدات بزانـێ چـی پێـش خـۆی نـاردوە بـۆ پاشـەڕۆژی، وە لـە خـوا بترسـن بەڕاسـتی خـوا شـارەزایە بـەوەی کـە دەیکـەن).

﴿ وَيَقُولُ ٱلۡكَافِرُ يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ تُرَٰبَۢا ﴾ جـا ئەگـەر خێـرو چاکەیەکـی بینـی بـا ستایشـی خـوا بـکات، وە ئەگـەر جگـە لـەوەی بینـی بـا لۆمـەو سەرزەنشـتی کـەس نـەکات جگـە لـە نەفسـی خـۆی نەبێـت، ئـا لەبـەر ئەمـە بێبڕوایـان ئاواتـی مردنیـان دەخواسـت لـە سـەختی حەسـرەتو پەشـیمانیان، داوا دەکەیـن لـە خـوا بمانپارێـزێ لـە بێبڕوایـیو خراپـە بـە گشـتی، بێگومـان ئـەو زاتـە بەخشـندەو ڕێـزدارە.

تەفسیری سوورەتی (النبأ) تەواو بوو.


سُورَةُ النَّازِعَاتِ
بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
وَالنَّازِعَاتِ غَرْقًا ① وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطًا ② وَالسَّابِحَاتِ سَبْحًا ③
فَالسَّابِقَاتِ سَبْقًا ④ فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْرًا ⑤ يَوْمَ تَرْجُفُ الرَّاجِفَةُ ⑥
تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ ⑦ قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ ⑧ أَبْصَارُهَا خَاشِعَةٌ ⑨
يَقُولُونَ أَإِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِي الْحَافِرَةِ ⑩ أَإِذَا كُنَّا عِظَامًا نَخِرَةً ⑪ قَالُوا
تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ ⑫ فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ ⑬ فَإِذَا هُمْ بِالسَّاهِرَةِ
⑭ هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ مُوسَىٰ ⑮ إِذْ نَادَاهُ رَبُّهُ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى ⑯

## تەفسیری سووڕەتی (النازعات)

## مەککییە (٤٦) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-١٤): ﴿ وَالنَّازِعَاتِ غَرْقًا (١) وَالنَّاشِطَاتِ
نَشْطًا (٢) وَالسَّابِحَاتِ سَبْحًا (٣) فَالسَّابِقَاتِ
سَبْقًا (٤) فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْرًا (٥) يَوْمَ تَرْجُفُ الرَّاجِفَةُ
(٦) تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ (٧) قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ
(٨) أَبْصَارُهَا خَاشِعَةٌ (٩) يَقُولُونَ أَإِنَّا
لَمَرْدُودُونَ فِي الْحَافِرَةِ (١٠) أَإِذَا كُنَّا عِظَامًا نَخِرَةً
(١١) قَالُوا تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ (١٢) فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ
وَاحِدَةٌ (١٣) فَإِذَا هُمْ بِالسَّاهِرَةِ (١٤) ﴾

ئەم سوێندانە بە فریشتە بەڕێزەکانو ئەو کردەوانەیان بەڵگەن لەسەر تەواوی ملکەچیان بۆ فەرمانی خواو پەلەکردنیان لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانیدا. دەگونجێ سوێند لەسەر خوراو: پاداشتو زیندووکردنەوە بێت، بە بەڵگەی باسکردنی حاڵی ڕۆژی دوایی لە دوای ئەوە.

وە دەگونجێ سوێند لەسەر خوراو سوێند پێخوراو یەک بێت، کە بەڕاستی ئەو زاتە سوێندی لەسەر فریشتەکان خواردوە، چونکە بڕواهێنان بە ئەوان یەکێکە لە شەش پایەکانی ئیمان.

وە لەبەر ئەوەی باسکردنی کارەکانیان لێرەدا ئەو پاداشتە لەخۆ دەگرێت کە فریشتەکان خستوویانەتە ئەستۆیان، لە کاتی مردنو پێش مردنو دوای مردنیشدا، جا فەرموویەتی: ﴿ وَالنَّازِعَاتِ غَرْقًا ﴾ ئەوانیش ئەو فریشتانەن کە ڕۆحەکان بەبەهێزی دەکێشن، وە ڕۆدەچن لە دەرهێنانیدا، تا ڕوحەکە دەردەچێت، ئنجا (ئەو کەسە) پاداشت و سزا وەردەگرێت بە پێی کردەوەکەی ﴿ وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطًا ﴾، هەروەها ئەوانیش ئەو فریشتانەن کە ڕۆحەکان بەهێزو بە ئاسانی دەردێنن، یان دەرهێنانی ڕۆحەکان بە ئاسانی بۆ بڕوادارانە، وە دەرهێنانیان بە سەختی بۆ بێبڕوایانە، ﴿ وَالسَّابِحَاتِ ﴾ واتە: بەردەوام لە ئاسماندا دێنو دەچن، بە بەرز بوونەوەو دابەزین، ﴿ سَبْحًا ﴾ (بە خێرایی).

﴿ فَالسَّابِقَاتِ ﴾ پێشبڕکێ دەکەن لەگەڵ غەیری خۆیاندا، ﴿ سَبْقًا ﴾ پەلە دەکەن لە جێبەجێ کردنی

فەرمانی خوادا، وە پێشی شەیتانەکان دەکەون لە گەیاندنی وەحی بۆ پێغەمبەرانی خوا، تا گوێ هەڵنەخەن، ﴿ فَٱلۡمُدَبِّرَٰتِ أَمۡرٗا ﴾ ئەو فریشتانەن کە خوا کردوونی بە بریکار، کە کاروبارێکی زۆر بەرێوە ببەن لە کاروبارەکانی جیهانی سەرەوەو خوارەوە، لە بارانو گژوگیاو دارودرەختو باو دەریاو کۆرپەلەو گیانلەبەرەکانو بەهەشتو دۆزەخو جگە لەوانەش، ﴿ يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ﴾ (واتە: لە رۆژێکدا بوومەلەرزە زەوی دەلەرزێنێ) ئەویش هاتنی رۆژی دواییە، ﴿ تَتۡبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ﴾ (واتە: بومەلەرزەیەکی تریش بەدوایدا دێت) واتە: لەرزاندنو راوەشاندنێکی دیکە کە بەدوایدا دێت ﴿ قُلُوبٞ يَوۡمَئِذٖ وَاجِفَةٌ ﴾ واتە: (زۆر دڵ لەو رۆژەدا) دەترسێو بێزارە لە سەختی ئەوەی دەیبینێو دەیبیستێ. ﴿ أَبۡصَٰرُهَا خَٰشِعَةٞ ﴾ واتە: (چاویان) زەلیلو نزم دەبێ، ترس دڵیانی داگرتووەو حەپەساون، ئاخو ئەسەف زاڵ بووە بەسەریاندا، حەسرەتو پەشیمانیش باڵی بەسەردا کێشاون.

واتە: بێبڕوایان لە دونیادا، لە رووی بە درۆدانان دەیانوت: ﴿ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا نَّخِرَةٗ ﴾ واتە: (ئایا کە بووین بە) ئێسقانی رزیوی پەرت پەرت بوو، ﴿ قَالُواْ تِلۡكَ إِذٗا كَرَّةٌ خَاسِرَةٞ ﴾ واتە: بە دووریان زانی خوا زیندوویان بکاتەوەو دووبارە بیانهێنێتە بوون دوای ئەوەی بوون بە ئێسکێکی رزیو، بە هۆی نەفامیان بەرانبەر بە توانای خواو بوێریان لەسەری.

خوا ﷻ ئاسانی زیندوو بوونەوەیانی روون کردەوەو فەرمووی: ﴿ فَإِنَّمَا هِيَ زَجۡرَةٞ وَٰحِدَةٞ ﴾ (واتە: بێگومان ئەو زیندوو بوونەوەیە تەنها یەک شریخەیە) یەک جا فوو ئەکرێ بە صووردا، ئیتر بەدیهێنراوەکان هەموویان کتوپڕ، ﴿ بِٱلسَّاهِرَةِ ﴾ واتە: لەسەر رووی زەوی، هەموویان وەستاونو تەماشا دەکەن، جا خوا ﷻ هەموویان کۆدەکاتەوەو دادوەری دەکات لە نێوانیاندا، بڕیار دەدات لە نێوانیاندا بە بڕیاری پڕ لە دادوەری خۆیو پاداشتیان دەداتەوە.

(١٥-٢٦): ﴿ هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ١٥ إِذۡ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوًى ١٦ ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ١٧ فَقُلۡ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ ١٨ وَأَهۡدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخۡشَىٰ ١٩ فَأَرَىٰهُ ٱلۡأٓيَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰ ٢٠ فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ٢١ ثُمَّ أَدۡبَرَ يَسۡعَىٰ ٢٢ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ٢٣ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ٢٤ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلۡأٓخِرَةِ وَٱلۡأُولَىٰٓ ٢٥ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّمَن يَخۡشَىٰٓ ٢٦ ﴾:

خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ دەفەرموێ: ﴿ هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴾ ئەمە ئیستیفهامو پرسیارە دەربارەی کارێکی مەزن، کە هەر دەبێت روویدات، واتە: ئایا داستانی مووسات پێگەیشتووە؟ ﴿ إِذۡ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوًى ﴾ (واتە: کاتێک کە پەروەردگاری بانگی کرد لە شیوی پیرۆزی (طووا) ئەویش ئەو جێگایەیە کە خوا ﷻ گفتوگۆی لەگەڵدا کرد، وە بە پەیامەکەی منەتی کرد بەسەریداو تایبەتی کرد بە وەحیو هەڵیبژارد،


اذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَىٰ ﴿١٧﴾ فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَىٰ أَن تَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَأَهْدِيَكَ
إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخْشَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَرَاهُ الْآيَةَ الْكُبْرَىٰ ﴿٢٠﴾ فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ﴿٢١﴾ ثُمَّ
أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴿٢٢﴾ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ فَأَخَذَهُ
اللَّهُ نَكَالَ الْآخِرَةِ وَالْأُولَىٰ ﴿٢٥﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ﴿٢٦﴾
أَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاءُ بَنَاهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا ﴿٢٨﴾
وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا ﴿٢٩﴾ وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَاهَا ﴿٣٠﴾
أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا وَمَرْعَاهَا ﴿٣١﴾ وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا ﴿٣٢﴾ مَتَاعًا لَّكُمْ
وَلِأَنْعَامِكُمْ ﴿٣٣﴾ فَإِذَا جَاءَتِ الطَّامَّةُ الْكُبْرَىٰ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يَتَذَكَّرُ الْإِنسَانُ
مَا سَعَىٰ ﴿٣٥﴾ وَبُرِّزَتِ الْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴿٣٦﴾ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَآثَرَ
الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَمَّا مَنْ خَافَ
مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَىٰ
﴿٤١﴾ يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن
ذِكْرَاهَا ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَاهَا ﴿٤٤﴾ إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَاهَا
﴿٤٥﴾ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا ﴿٤٦﴾

ئنجا پێی فەرموو: ﴿ اذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَىٰ ﴾ (واتە: برۆ بۆ لای فیرعەون)، چونکە ئەو لە یاخیبوونو شیرکو سەرپێچی کردنی دایە، بە وتەیەکی نەرمو نیانو دواندنێکی جوانو ڕێکو پێک، بەڵکو ﴿ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ ﴾طه (واتە: بیر بکاتەوە یان بترسێ لە خوا).

﴿ فَقُلْ ﴾ پێی بڵێ: ﴿ هَل لَّكَ إِلَىٰ أَن تَزَكَّىٰ ﴾ ئایا سیفەتێکی تایبەتمەندو ستایشکراوو جوانت دەوێ، خاوەن ژیرەکان کێبڕکێی تێدا بکەن، ئەویش ئەوەیە نەفسو دەروونت پاک بکەیتەوە لە پیسی کوفرو یاخی بوون، بۆ لای ئیمانو کردەوەی چاک ﴿ وَأَهْدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ ﴾ واتە: ڕێت پێ نیشان بدەمو بۆت ڕوون بکەمەوە جێگای ڕەزامەندی پەروەردگارو جێگای تووڕە بوونی، ﴿ فَتَخْشَىٰ ﴾ تا لە خوا بترسی ئەگەر ڕێگای ڕاستت ناسی، فیرعەون ڕێگری کرد لەوەی مووسا بانگی کرد بۆی.

﴿ فَأَرَاهُ الْآيَةَ الْكُبْرَىٰ ﴾ واتە: ڕەگەزی نیشانە هەرە گەورەکە، هەژمار کردنی ڕەت ناکاتەوە، وەک لە شوێنی دی فەرموویەتی: ﴿ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿١٠٧﴾ وَنَزَعَ يَدَهُ فَإِذَا هِيَ بَيْضَاءُ لِلنَّاظِرِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾الأعراف (واتە: ئنجا مووسا گۆچانەکەی فڕێدا یەکسەر گۆچانەکە بوو بە مارێکی گەورەی ئاشکرا * دەستی دەرهێنا لە پڕ ئەو دەستە سپیو پرشنگدار بوو بۆ بینەران) ﴿ فَكَذَّبَ ﴾ (کەچی) ڕاستی (بە درۆ زانی)، ﴿ وَعَصَىٰ ﴾ (سەرپێچی) فەرمانی کرد، ﴿ ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴾ واتە: بیری کردەوەو کۆششی کرد لە ڕووبەڕوو بوونەوەی حەقو دژایەتی کردنی ڕاستی.

﴿ فَحَشَرَ ﴾ واتە: سەربازەکانی هەموو کۆکردەوە، ﴿ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ ﴾ (واتە: بانگی کردن * جا وتی) پێیان: ﴿ أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَىٰ ﴾ (واتە: من پەروەردگاری هەرە گەورەتانم) ئەوانیش ملکەچی بوونو دانیان بە پووچەکەیدا هێنا کاتێ ترساندنی، ﴿ فَأَخَذَهُ اللَّهُ نَكَالَ الْآخِرَةِ وَالْأُولَىٰ ﴾ واتە: سزاکەی بوو بە بەڵگەو سەرزەنشت کردنێکی ڕوون بۆ سزای دونیاو دواڕۆژ، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن

يَخۡشَىٰٓ ﴾ (واتە: بەڕاستی لەم داستانەدا پەند هەیە بۆ کەسێک کە لە خواترس بێ)، بێگومان هەر کەسێک لەخواترس بێت تەنها ئەو سوودو پەند لە نیشانەو ئایەتەکان وەردەگرێت.

جا ئەگەر سزای فیرعەونی بینی، دەزانێ کە بێگومان هەر کەسێک لووت بەرزیو سەرپێچیو دژایەتی خوا بکات، سزای دەدات لە دونیاو دواڕۆژدا، بەڵام هەر کەسێک ترسی خوا لە دڵیدا نەمابێ ئەگەر هەر ئایەتو نیشانەیەکی بۆ بێت بڕوای پێ ناکات.

(٢٧-٣٣): ﴿ ءَأَنتُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُۚ بَنَىٰهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمۡكَهَا فَسَوَّىٰهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغۡطَشَ لَيۡلَهَا وَأَخۡرَجَ ضُحَىٰهَا ﴿٢٩﴾ وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ أَخۡرَجَ مِنۡهَا مَآءَهَا وَمَرۡعَىٰهَا ﴿٣١﴾ وَٱلۡجِبَالَ أَرۡسَىٰهَا ﴿٣٢﴾ مَتَٰعًا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ ﴿٣٣﴾ ﴾:

خوا ﷻ -بە ڕوونکردنەوەی بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرا بۆ ئەوانەی نکووڵی زیندوو بوونەوە دەکەنو دووبارە دروستکردنەوەی جەستەکان بە دوور دەزانن- دەفەرموێ: ﴿ ءَأَنتُمۡ ﴾ ئەی مرۆڤ! ﴿ أَشَدُّ خَلۡقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُۚ ﴾ (واتە: ئایا دروستکردنی ئێوە گرانترە یان ئاسمانی) خاوەن قەبارەی مەزنو دروستکردنی بەهێزو بەرزو بڵند؟ ﴿ بَنَىٰهَا ﴾ (کە) خوا ﷻ دروستی کرد، ﴿ رَفَعَ سَمۡكَهَا ﴾ واتە: بەرزی کردەوە قەبارەو وێنەی ﴿ فَسَوَّىٰهَا ﴾ ڕێکی خست بە تووندو تۆڵیو وردەکاری، عەقڵەکان سەرسام دەکاتو دڵەکانیش دەحەپەسێنێ.

﴿ وَأَغۡطَشَ لَيۡلَهَا ﴾ واتە: شەوی تاریک کردوە، تاریکی هەموو دەورووبەری ئاسمانەکان دادەپۆشێ، ئنجا سەرزەویش هەمووی تاریک دەبێ، ﴿ وَأَخۡرَجَ ضُحَىٰهَا ﴾ واتە: ڕووناکی مەزنی تێدا دەرخستووە، کاتێک خۆر هەڵدێت، خەڵک بڵاوە دەکەن بۆ بەرژەوەندی دینو دونیایان، ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ﴾ واتە: وە دوای دروست کردنی ئاسمان زەوی ﴿ دَحَىٰهَآ ﴾ واتە: (ڕاخست)وەو سوودەکانی تێدا داناوە.

ئەویشی ڕاڤەکردوە بە فەرمایشتی خۆی کە دەفەرموێ: ﴿ أَخۡرَجَ مِنۡهَا مَآءَهَا وَمَرۡعَىٰهَا ﴾ (واتە: لێی دەرهێنا ئاویو لەوەڕی)، ﴿ وَٱلۡجِبَالَ أَرۡسَىٰهَا ﴾ واتە: (چیایەکانی) جێگیر کردوە لە ناو زەویدا. ئنجا زەوی بە شێوەیەکی هێلکەیی ڕاخست، ئەو دەقە، وەک ئەم دەقە پیرۆزانەی دیکەیە، بەڵام دروستکردنی خودی زەوی پێشخستوە بەسەر دروستکردنی ئاسماندا، هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ قُلۡ أَئِنَّكُمۡ لَتَكۡفُرُونَ بِٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ فِي يَوۡمَيۡنِ ﴿٩﴾ ﴾فصلت (واتە: بڵێ: ئاخۆ بە ڕاستی ئێوە بڕواتان بەو زاتە نیە کە زەوی لە دوو ڕۆژدا دروست کردوە)، تا ئەو شوێنەی کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ ﴾فصلت (واتە: لە پاشان ڕووی کردە ئاسمان لە کاتێکدا کە دووکەڵ بوو، ئنجا

به‌ ئاسمانو زه‌وی فه‌رموو: وه‌رن به‌ویستی خۆتان یان به‌ ناچاری، هه‌ردووكیان وتیان: به‌ ویستی خۆمان هاتین).

(٣٤-٤١): ﴿ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ ﴿٣٥﴾ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴿٣٦﴾ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾ ﴾:

﴿ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلْكُبْرَىٰ ﴾ واته‌: ئه‌گه‌ر قیامه‌تی گه‌وره‌و ناڕه‌حه‌تی مه‌زن ڕوویدا، كه‌ هه‌موو ناخۆشیه‌كان له‌ چاوی ئه‌و ناڕه‌حه‌تیه‌دا سووك ده‌بن، جا ئه‌و كاته‌ باوك له‌ كوڕه‌كه‌ی ڕاده‌كات، وه‌ پیاو له‌ ژنه‌كه‌یو هه‌موو خۆشه‌ویستێ له‌ خۆشه‌ویسته‌كه‌ی.

﴿ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ ﴾ (واته‌: مرۆڤ كرده‌وه‌ی خۆی تێدا بیر ده‌كه‌وێته‌وه‌) كه‌ له‌ دونیادا كردوویه‌تی له‌ چاكه‌و خراپه‌، جا ئاوات ده‌خوازێ به‌ زیادكردنی تۆزقاڵه‌ زه‌ڕه‌یه‌ك له‌ چاكه‌كانی، وه‌ غه‌مو په‌ژاره‌ دایده‌گرێ به‌ زیاد كردنی تۆزقاڵه‌ زه‌ڕه‌یه‌ك له‌ گوناهه‌كانی، ئه‌و كات ده‌زانێ بنه‌مای قازانجو زیانی ئه‌وه‌ بووه‌ كه‌ له‌ دونیادا كۆششی بۆ كردوه‌، هه‌موو هۆكارو گه‌یاندنێك ده‌پچڕێ كه‌ له‌ دونیادا هه‌بووه‌ جگه‌ له‌ كرده‌وه‌كان، (پاشان ده‌فه‌رموێ:) ﴿ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴾ واته‌: دۆزه‌خ پیشان درا به‌ ئاشكرا بۆ هه‌موو كه‌سێك (كه‌ بڕوانێ) ده‌ركه‌وتووه‌ بۆ خه‌ڵكه‌كه‌یو ئاماده‌یه‌ بۆ سزادانیان، له‌ چاوه‌ڕوانی فه‌رمانی په‌روه‌ردگاری وه‌ستاوه‌، ﴿ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴾ واته‌: زێده‌ڕۆیی كردبێ به‌وه‌ی به‌ چاو قایمیو بوێریه‌وه‌ گوناهه‌ گه‌وره‌كانی ئه‌نجام دابێت، وه‌ نه‌وه‌ستابێ له‌وه‌ی خوا سنووری بۆ داناوه‌، ﴿ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴾ (واته‌: ژیانی دونیای هه‌ڵبژاردبێ) به‌سه‌ر دواڕۆژدا، جا كۆششه‌كانی ته‌نها بۆ ئه‌و بووبێو كاته‌كانی له‌ حه‌زوو ئاره‌زوودا به‌كار هێنابێت، وه‌ دواڕۆژی بیر چووبێتو كاری هیچ بۆ نه‌كردبێ، ﴿ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴾ واته‌: (ئه‌وه‌ بێگومان دۆزه‌خ باره‌گاو جێگای ئه‌و كه‌سه‌یه‌ كه‌ ئه‌مه‌ حاڵیه‌تی)، ﴿ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ ﴾ واته‌: ترسابێ له‌ هه‌ڵوێستگه‌ی به‌رده‌م په‌روه‌ردگاریو پاداشت دانه‌وه‌ی به‌ دادپه‌روه‌ری، ئه‌م ترسه‌ كاریگه‌ری له‌ دڵیدا دروست كردبێو ڕێگری نه‌فسی خۆی كردبێت له‌و هه‌واو ئاره‌زووانه‌ی كه‌ ڕێگری لێده‌كات له‌ گوێڕایه‌ڵی خوا، وه‌ هه‌واو ئاره‌زووی شوێنی په‌یامی پێغه‌مبه‌ر ﷺ كه‌وتبێو جیهادی هه‌واو ئاره‌زووی خۆی كردبێت، ئه‌و هه‌واو هه‌وه‌سانه‌ی ڕێگرن له‌ خێرو چاكه‌، ﴿ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ ﴾ كه‌ گشتگیره‌ له‌سه‌ر هه‌موو خێرو خۆشیو نازو نیعمه‌تێ، ﴿ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴾ جێگای ئه‌و كه‌سه‌یه‌ ئه‌مه‌ وه‌سفی بێت.

(٤٢-٤٦): ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَآ

أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا ﴿٤٥﴾ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا ﴿٤٦﴾ ﴾:

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ ﴾ واتە: کەللەڕەقانو بە درۆدانەرانی زیندوو کردنەوە پرسیارت لێدەکەن: ﴿ عَنِ ٱلسَّاعَةِ ﴾ (واتە: دەربارەی ڕۆژی دوایی) کەی ڕوو دەداتو ﴿ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴾ (کەی دەبێت)؟ خوا ﷻ وەڵامیانی داوەتەوە بە فەرمایشتی خۆی: ﴿ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴾ واتە: باسکردنی چ سوودێکی هەیە بۆ تۆو بۆ ئەوان، وە زانینی کاتی هاتنی؟ لەوەدا هیچ ئەنجامێک بە دی ناکرێ، بۆیە کاتی زانینی بەندەکان دەربارەی ڕۆژی دوایی هیچ بەرژەوەندیەکی دینیو دونیایی تێدانیە بۆیان، بەڵکو بەرژەوەندی لە شاردنەوەی دایە لێیان، زانینی ئەو ڕۆژەی شاردوەتەوە لە هەموو بەندەکان، تەنها خوا خۆی دەیزانی، وەک فەرموویەتی: ﴿ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴾ واتە: زانینی ئەو ڕۆژە تەنها لە لای پەروەردگارتە.

وەک لە ئایەتێکی دیکەدا فەموویەتی: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِىٌّ عَنْهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٧﴾ ﴾ الأعراف، (واتە: ئەی موحەممەد ﷺ پرسیارت لێدەکەن لەبارەی ڕۆژی دواییەوە کەی دەبێت؟ بڵێ: زانینی ئەوە تەنها لای پەروەردگارمە، هیچ کەس ناتوانێ کاتەکەی ئاشکرا بکات جگە لە پەروەردگار، هاتنی قیامەت بۆ ئاسمانەکانو زەویش قورسو گرانە لە ناوکادا دێت بەسەریاندا، لە تۆ دەپرسن وەک ئەوەی تۆ لە هاتنی ڕۆژی دوایی ئاگادار بیت، بڵێ: بێگومان زانینی ئەو ڕۆژە تەنها لای خوایە، بەڵام زۆرێک لە خەڵکی نایزانن).

﴿ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا ﴾ واتە: بێگومان ترساندنی تۆ بۆ کەسێکە کە بترسێ لە هاتنی ڕۆژی دوایی، وە بترسێ لە وەستان لەبەر دەستی پەروەردگاری، ئەوانە هیچ خەمێکیان نیە جگە لە خۆ ئامادە کردن نەبێت بۆی، وە کارکردن لە پێناویدا.

بەڵام ئەو کەسەی برِوای پێی نیە، هەر بەخەیاڵیشیدا نایەت، چونکە سەرکەشیو کەللەڕەقیەکە لە عینادیو بە درۆدانانەوە سەرچاوەی گرتووە، جا ئەگەر ئەو کەسە گەیشتە ئەم حاڵە، ئەوە وەڵامدانەوەی هیچ مانایەک نادات‌و سوودی بۆی نابێت، خوای کاربەجێ خۆی دەپارێزێ لە وەڵامدانەوە.

تەفسیری سوورەتی (النازعات) تەواو بوو.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾
أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ﴿٤﴾ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ
﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾
فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾ كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿١٢﴾ فِى صُحُفٍ
مُّكَرَّمَةٍ ﴿١٣﴾ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍۭ ﴿١٤﴾ بِأَيْدِى سَفَرَةٍ ﴿١٥﴾ كِرَامٍۭ بَرَرَةٍ ﴿١٦﴾
قُتِلَ ٱلْإِنسَٰنُ مَآ أَكْفَرَهُۥ ﴿١٧﴾ مِنْ أَىِّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ﴿١٨﴾ مِن نُّطْفَةٍ
خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ﴿١٩﴾ ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقْبَرَهُۥ ﴿٢١﴾ ثُمَّ إِذَا
شَآءَ أَنشَرَهُۥ ﴿٢٢﴾ كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَآ أَمَرَهُۥ ﴿٢٣﴾ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ
﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا
حَبًّا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴿٢٨﴾ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلْبًا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةً
وَأَبًّا ﴿٣١﴾ مَّتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ ﴿٣٢﴾ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ ﴿٣٣﴾ يَوْمَ يَفِرُّ
ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ
ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴿٣٧﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ
﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ ﴿٣٩﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ﴿٤٠﴾

## تەفسیری سوورەتی (عبس)

## مەککییە (٤٢) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-١٠): ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ﴿٤﴾ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾ ﴾:

هۆی دابەزینی ئەم دەقە پیرۆزانە ئەوەبوو پیاوێکی کوێر لە بڕواداران، پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی لێیەوە فێر ببێ، وە پیاوێکی دەوڵەمەندیش هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ سوور بوو لەسەر هیدایەتدانی خەڵکی، ڕووی کردە لای پیاوە دەوڵەمەندەکەو گوێی بۆ گرت، پشتی لە پیاوی هەژارەکە کرد، بە ئومێدی هیدایەت وەرگرتنی ئەو دەوڵەمەندەو بە تەمای پاک بوونەوەی، جا خوا ﷻ سەرزەنشتی کرد بەم سەرزەنشتە ناسکە، فەرمووی: ﴿ عَبَسَ ﴾ واتە: ڕووی گرژ کرد، ﴿ وَتَوَلَّىٰٓ ﴾ واتە: بە جەستەی پشتی تێکرد، لەبەر هاتنی کابرای کوێر بۆ لای، پاشان خوا ﷻ باسی سوودی ڕووتێکردنەکەی کردووە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ ﴾ (واتە: تۆ چوزانیت؟ بەڵکو) ئەو کوێرە ﴿ يَزَّكَّىٰٓ ﴾ واتە: پاک ببێتەوە لە خورەوشتی ناشرین و قیزەون، وە خۆی بڕازێنێتەوە بە ڕەوشتی جوان ﴿ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ﴾ واتە: بیر بکاتەوە لەوەی سوودی هەیە بۆی، ئنجا کار بکات بەو بیرکردنەوەیە.

ئەمە سوودێکی گەورەی تێدایە، ئەمەش مەبەستە لە ناردنی پێغەمبەران و ئامۆژگاری ئامۆژریکاران و یادخستنەوەی یادخەرەوان، جا ڕووتێکردنت بەرووی ئەو کەسەی خۆی دێت بۆ لات و پێویستی پێیەتی، ئەوە گرنگترە لەوەی تۆ بچیت بەدەمیەوە.

بەڵام ڕوو تێکردنت لە کەسی دەوڵەمەند کە بێنیازەو پرسیار ناکات و داوا ناکات،

چونکە حەزو ڕەغبەتی نیە بۆ خێر، لەگەڵ وازهێنانت لەوەی لە ئەو گرنگترە، بەڕاستی ئەوە دروست نیە بۆ تۆ، بێگومان لەسەر تۆ نیە کە ئەو بێبڕواییە خۆی پاک نەکاتەوە، جا ئەگەر خۆی پاک نەکاتەوە، ئەوە تۆ بەرپرسیار نیت لەسەر کردەوەی خراپی.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر یاسایەکی بەناوبانگ: ((وازناهێنرێ لە کارێکی زانراو بۆ کارێکی گومانـاوی، وە نە بۆ بەرژەوەندیەکی بەدیهاتوو بۆ بەرژەوەندیەکی خەیاڵی)).

وە پێویستە ڕوو بکرێتە ئەو فێرخوازەی بەدوای زانستدا دەگەڕێتو پێویستی پێیەتیو سووره لەسەری زیاتر لەو کەسەی کە سوور نیە لەسەر وەرگرتنی زانست.

(١١-٣٢): ﴿ كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿١٢﴾ فِى صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ﴿١٣﴾ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍۭ ﴿١٤﴾ بِأَيْدِى سَفَرَةٍ ﴿١٥﴾ كِرَامٍۭ بَرَرَةٍ ﴿١٦﴾ قُتِلَ ٱلْإِنسَٰنُ مَآ أَكْفَرَهُۥ ﴿١٧﴾ مِنْ أَىِّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ﴿١٨﴾ مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ﴿١٩﴾ ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقْبَرَهُۥ ﴿٢١﴾ ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ ﴿٢٢﴾ كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَآ أَمَرَهُۥ ﴿٢٣﴾ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴿٢٨﴾ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلْبًا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ مَّتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ ﴿٣٢﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴾ واتە: بە حەقیقەت ئەم ڕێنماییەی ئامۆژگاریەکە کە لە لایەن خواوە یادی بەندەکانی پێ دەخاتەوە، وە لە کتێبەکەیدا ڕوونی دەکاتەوە بۆیان ئەوەی ئەوان پێویستیان پێیەتیو ڕێنماییو گومراییان بۆ جیادەکاتەوە لە یەکتر، جا ئەگەر ئەوە ڕوون بوویەوە، ﴿ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴾ (واتە: ئنجا ئەو کەسەی بیەوێ کاری پێدەکات) وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾ ﴾الكهف، (واتە: حەق بڵێ: کە ئەم قورئانەیە لەلایەن پەروەردگارتەوە هاتووە جا هەر کەس دەیەوێ با بڕوا بێنێ، وە هەرکەسیش دەیەوێ با بێبڕوا بێت).

پاشان باسی شوێنو مەزنیو بەرزی ڕێزی ئەم ڕێنماییەی کردووە، فەرموویەتی: ﴿ فِى صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ﴿١٣﴾ مَّرْفُوعَةٍ ﴾ (واتە: لە چەند پەڕاوێکی هێژای * بەرزی) پڕ لە ڕێزو پلەو پایەدایە، ﴿ مُّطَهَّرَةٍۭ ﴾ پاکە لە هەموو بەڵاو کەمو کورتیەکان، وە لەوەی دەستی شەیتانەکان پێی بگات، یان بیدزن، بەڵکو ئەو قورئانە ﴿ بِأَيْدِى سَفَرَةٍ ﴾ (بە دەست نوێنەرانی) ئەوانیش ئەو فریشتانەن کە نوێنەرن لە نێوان خواو نێوان بەندەکانی، ﴿ كِرَامٍۭ ﴾ بەڕێزو پڕ لە خێرو بەرەکەتن، ﴿ بَرَرَةٍ ﴾ دڵو کردەوەکانیان.

هەموو ئەوانە پاراستنێکە لەلایەن خواوە بۆ کتێبەکەی، خوا ﷻ نوێنەرانی داناوە بۆ لای پێغەمبەران، کە بریتین لە فریشتە بەڕێزو خۆپارێزەکان، هەرگیز خوا شەیتانەکان زاڵ

نــاکات بەســەر قورئاندا، ئەمەش پێویســتە بــڕوای پێ بهێنــرێو وەربگیرێ.
بــەلام لەگــەڵ ئەمــەدا ئادەمیــزاد یاخی بــووەو تەنهــا بێبڕوایــی هەڵبــژاردوە، لەبــەر ئەمەیە خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ قُتِلَ ٱلۡإِنسَٰنُ مَآ أَكۡفَرَهُۥ ﴾ (واتــە: بــە کوشــت بچێــت ئادەمیــزاد چەند پــێ نەزانــە) بەرانبــەر بــە نیعمەتەکانی خــوا، وە چەنــد دوژمنێتــی دوای ئەوەی بــۆی ڕوون بووەتــەوە، وە ئــەو چیــە؟ ئــەو لــە لاوازترینــی شــتەکانە، خــوا ﷻ لــە ئاوێکــی بــێ نــرخ دروســتی کــردوە، پاشــان دروســتکردنی ئەندازە کێشــاوەو ڕێکــی خســتوەو کردوویەتی بە مرۆڤێکــی تــەواو، وە هێــزی دەرەوەو نــاوەوەی پتــەو کــردوە، ﴿ ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ ﴾ واتــە: هــۆکارە دینــیو دونیاییەکانی بۆ ئاســان کــردوە، وە ڕێگەی ڕاســتی پێ نیشــانداوەو ڕوونی کردۆتــەوە، تاقیکردۆتــەوە بــە فەرمــانو قەدەغەکردن.
﴿ ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقۡبَرَهُۥ ﴾ واتــە: ڕێــزی لێگرتووە بە شــاردنەوەی، وەک ســەرجەم گیــان لەبەرانی تــری لــێ نەکردوە، کە لاشــەیان بۆگــەن دەکات لەســەر ڕووی زەوی، ﴿ ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ ﴾ واتــە: (پاشــان کاتێ کە ویســتی) زینــدووی دەکاتــەوە دوای مردنی بۆ پاداشــتدانەوە.
خــوا تــاکو تەنهایە بە بەڕێوەبردنی مرۆڤو هەڵســوڕاندنی بەم هەڵســوڕاندنانە، هیچ بەشــدار بوویــەک لەگەڵیــدا بەشــدار نیــە، ئادەمیزادیــش لەگــەڵ ئەمــەدا ئــەوەی فەرمانــی پێکراوە جێبەجێــی نــاکات، بەڵکو بــە بــەردەوام کەمتەرخەمە لــە ئاســتی داواکاریەکان.
پاشــان خــوا ﷻ ڕێنمایــی دەکات بۆ تەماشــا کــردنو ســەرنجدان لــە خواردەمەنیەکەی، وە چــۆن پێی گەیشــتووەو ئاســانی کردوە بــۆی، جــا فەرموویەتــی: ﴿ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبۡنَا ٱلۡمَآءَ صَبّٗا ﴾ واتــە: بارانمــان دابەزانــدووە بــۆ ســەر زەوی بــە زۆری ﴿ ثُمَّ شَقَقۡنَا ٱلۡأَرۡضَ ﴾ (واتــە: پاشــان زەویمــان لــەت کــرد) بــۆ گــژوو گیــاکان، ﴿ شَقّٗا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا ﴾ (واتــە: ئنجــا ڕواندمــان لــە ناویــا) بەش بــەش لــە جۆرەهــا خواردەمەنی بــە لەزەتو بژێــوی بەتــام، ﴿ حَبّٗا ﴾ (دانەوێڵــە) ئەمــەش هەمــوو دانەوێڵــەکان دەگرێتەوە بــە جیاوازی بەشــەکانیان، ﴿ وَعِنَبٗا وَقَضۡبٗا ﴾ (واتــە: جۆرەهــا تــرێو) ســەوزە، ﴿ وَزَيۡتُونٗا وَنَخۡلٗا ﴾ (واتــە: زەیتــونو دار خورمــا) ئــەم چوارەی تایبــەت کردوە بە هــۆی زۆری ســوودو قازانجەکانیان، ﴿ وَحَدَآئِقَ غُلۡبٗا ﴾ واتــە: باخاتــێ دارەکانــی زۆرو چــڕو پڕە.
﴿ وَفَٰكِهَةٗ وَأَبّٗا ﴾ (الفاكهة): ئەوەیــە مــرۆڤ دەیخــوات لــە هەنجیــرو ترێو قــۆخو هەنار، جگــە لەوانیش، (والأبّ) ئەوەیە کــە ئاژەڵەکان دەیخۆن، لەبــەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ مَّتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ ﴾، (واتــە: بــۆ ژیانــی خۆتــانو ئاژەڵەکانتــان) خــوا دروســتی کــردوەو ڕامی

هێنــاوە بۆتان. هەر کەســێ تەماشــای ئــەم نیعمەتانە بکات ســوپاس گــوزاری پەروەردگاری لەســەری پێویســت دەبێــت، وە تواناکانــی دەخاتە کار لــە ملکەچی کردنــی، وە رووده کاتە گوێڕایەڵــی ئــەوو هەواڵەکانی بەراســت دادەنێ.

(٣٣-٤٢): ﴿ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ ﴿٣٣﴾ يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴿٣٧﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ ﴿٣٩﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ﴿٤٠﴾ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴿٤١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَفَرَةُ ٱلْفَجَرَةُ ﴿٤٢﴾ ﴾

﴿ يَوْمَ ﴾ واتــە: ئەگــەر شــریخەی قیامەت هــات کە گوێیــەکان بە هۆی مەترســیەوە کەڕو کــپ دەبن، دڵو ســنگەکانیش لــەو ڕۆژەدا بێزارو شــپرزە دەبن، لەوەی خەڵکــی دەیبینن لە مەترســیەکان، وە پێویســتی زۆریان دەبێت بەو کردەوانەی پێشــیان خســتووە، ﴿ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ ﴾ (واتــە: مــرۆڤ ڕادەکات) لــە خۆشەویســترین‌و بە ســۆزترین کەســی، ﴿ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ ﴾ واتە: ژنەکــەی ﴿ وَبَنِيهِ ﴾ (کوڕانی).

ئەویــش لەبــەر ئــەوەی: ﴿ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴾ واتە: نەفس‌و دەروونی ســەرقاڵی کــردوە، وە گرنگــی دەدات بــە ڕزگــار بوونــی، ناپەرژێتە ســەر ئەوەی لا بکاتــەوە بۆ لای هیــچ کەســێک، جا لــەو کاتــەدا خەڵکی دەبن بــەدوو دەســتەوە: خۆشــبەختان‌و بەدبەختان.

جا خۆشــبەختان: لەو ڕۆژەدا ڕوخســاریان ﴿ مُّسْفِرَةٌ ﴾ شــوێنەواری خۆشــی‌و درەوشاوەیی بە ڕووخســاریانەوە دیــارە، چونکــە زانیویانە بــە ڕزگار بوون‌و ســەرکەوتنیان بە بەدەســتهێنانی بــە نازونیعمەتــەکان ﴿ ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ ﴾ (واتــە: دەم بە پێکەنین‌و شــادمانن) ﴿ وَوُجُوهٌ ﴾ ڕووخســاری بەدبەختــان، ﴿ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ﴾ (واتە: لەو ڕۆژەدا تــەپ‌و تۆزاوییە)،

تَرۡهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴿٤١﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَفَرَةُ ٱلۡفَجَرَةُ ﴿٤٢﴾

﴿ تَرۡهَقُهَا ﴾ واتە: دایپۆشیوە ﴿ قَتَرَةٌ ﴾ ڕووخساری ڕەش‌و تاریک دادەگیرسێ، بێ ئومێدە لە هەموو خێرێک، چونکە دەزانێ بە بەدبەخت بوون‌و لەناو چوونی، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ ئەوانەی کە بەم شێوەیە وەسف کراون، ﴿ هُمُ ٱلۡكَفَرَةُ ٱلۡفَجَرَةُ ﴾ واتە: ئەوانەن بێبڕواییان کردوە بە نیعمەتەکانی خواو ئایەت‌و نیشانەکانیان بەدرۆ زانیوە، وە بوێریان کردوە لەسەر قەدەغەکراوەکانی، داوای لێبووردن‌و سەلامەتی لە خوا دەکەین، بە ڕاستی ئەو زاتە بەخشندەو میهرەبانە.

تەفسیری سوورەتی (عبس) تەواو بوو.


سورة التكوير
بسم الله الرحمن الرحيم
إذا الشمس كورت ① وإذا النجوم انكدرت ② وإذا الجبال سيرت ③ وإذا العشار عطلت ④ وإذا الوحوش حشرت ⑤ وإذا البحار سجرت ⑥ وإذا النفوس زوجت ⑦ وإذا الموءدة سئلت ⑧ بأي ذنب قتلت ⑨ وإذا الصحف نشرت ⑩ وإذا السماء كشطت ⑪ وإذا الجحيم سعرت ⑫ وإذا الجنة أزلفت ⑬ علمت نفس ما أحضرت ⑭ فلا أقسم بالخنس ⑮ الجوار الكنس ⑯ والليل إذا عسعس ⑰ والصبح إذا تنفس ⑱ إنه لقول رسول كريم ⑲ ذي قوة عند ذي العرش مكين ⑳ مطاع ثم أمين ㉑ وما صاحبكم بمجنون ㉒ ولقد رءاه بالأفق المبين ㉓ وما هو على الغيب بضنين ㉔ وما هو بقول شيطان رجيم ㉕ فأين تذهبون ㉖ إن هو إلا ذكر للعالمين ㉗ لمن شاء منكم أن يستقيم ㉘ وما تشاءون إلا أن يشاء الله رب العالمين ㉙

## تەفسیری سوورەتی (التكوير)
## مەککییە (١٩) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-١٤): ﴿ إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ سُيِّرَتۡ ﴿٣﴾ وَإِذَا ٱلۡعِشَارُ عُطِّلَتۡ ﴿٤﴾ وَإِذَا ٱلۡوُحُوشُ حُشِرَتۡ ﴿٥﴾ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ سُجِّرَتۡ ﴿٦﴾ وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتۡ ﴿٧﴾ وَإِذَا ٱلۡمَوۡءُۥدَةُ سُئِلَتۡ ﴿٨﴾ بِأَيِّ ذَنۢبٖ قُتِلَتۡ ﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتۡ ﴿١٠﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتۡ ﴿١١﴾ وَإِذَا ٱلۡجَحِيمُ سُعِّرَتۡ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ٱلۡجَنَّةُ أُزۡلِفَتۡ ﴿١٣﴾ عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّآ أَحۡضَرَتۡ ﴿١٤﴾ ﴾:

﴿ إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ﴾ کاتێک ئەم کارە سامناکانە ڕوو دەدەن، بەدیهێنراوەکان جیادەبنەوە، هەریەکە دەزانێ چی پێشخستووە بۆ دواڕۆژی خۆیو چی ئامادە کردووە لە چاکەو خراپە، ئەویش کاتێک کە ڕۆژی دوایی دێت خۆر دەپێچرێتەوەو تاریک دەبێ، مانگیش دەگیرێتو تاریک دەبێت، وە هەردووکیان فڕێ دەدرێنە ناو دۆزەخەوە.

﴿ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ ﴾ واتە: گۆڕانو کەوتنە خوارەوە لە شوێنی خۆیان، ﴿ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ سُيِّرَتۡ ﴾ واتە: دەبن بە گردۆڵکەی لمی هەڵڕژاو، پاشان وەکو خوری شیکراوەیان لێدێت، پاشان دەگۆڕێ وەکو تەپو تۆزی پەرشو بڵاوی لێدێتو لە شوێنی خۆی دەخزێ.

﴿ وَإِذَا ٱلۡعِشَارُ عُطِّلَتۡ ﴾ واتە: خەڵکی وازیان لە ماڵە بە نرخەکانیان هێنا کە گرنگیان پێدەداو لەبەرچاویان دەگرت لە هەموو کاتەکاندا، شتێکیان تووش دەبێ پێی دەحەپەسێن، جا خوا ﷻ سەرنجی ڕاکێشان بە (العشار) ئەویش -بریتیە لەو حوشترەی بێچووەکانی بە دوای یەکدا دێن، ئەویش چاکترینو بەڕێزترینی ماڵی

عــەرەب بــووە ئەوكاتــە- كــە خــۆی لــە خۆیــدا لــە هەمــوو شــتەكان چاكتــر بــووە.

﴿ وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ ﴾واتــە: (كاتــێ جانــەوەران) لــە ڕۆژی دوایــدا كۆكرانــەوە، بــۆ ئــەوەی خــوا تۆڵــەی هەندێكیــان لــە هەندێكــی دیكــە بكاتــەوەو بەندەكانیــش تــەواوی دادپــەروەری خــوا ببینــن، تەنانــەت خــوا تۆڵــە لــە شــاخدارەكان دەكاتــەوە كــە ئــازاری بێشــاخەكانیان داوە لــە دونیــادا، پاشــان پێیــان دەڵێ: ببــن بــە خــۆڵ.

﴿ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ ﴾واتــە: (دەمێــك كــە دەریــاكان) داگیرســان، بــەو مەزنــی خۆیانــەوە بــوون بــە ئاگرێكــی داگیرســاو، ﴿ وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتْ ﴾واتــە: كاتــێ هەمــوو خــاوەن كارێــك جــووت كــرا لەگــەڵ هاوشــانەكەیدا، چاكانــی لەگــەڵ چاكانــدا كۆكــردەوە، خراپەكارانیــش لەگــەڵ خراپەكارانــدا، وە حــۆری چاوگەشــی بەخشــی بــە بــڕواداران، شەیتانیشــی بــە بێبــڕواكان، ئەمــەش وەكــو ئــەو وتــەی خــوا وایــە كــە فەرموویەتــی: ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا ۝٧١ ﴾الزمر، (واتــە: ئەوســا ئەوانــەی بێبــڕوا بــوون ڕاپێــچ دەكرێــن بــۆ دۆزەخ كۆمــەڵ بــە كۆمــەڵ)، ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا ۝٧٣ ﴾الزمــر، (واتــە: وە كەســانێ كــە لــە پەروەردگاریــان دەترســن دەبرێــن بــۆ بەهەشــت پــۆل پــۆل)، ﴿ ٱحْشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزْوَٰجَهُمْ وَمَا كَانُواْ يَعْبُدُونَ ۝٢٢ ﴾الصافــات، (واتــە: خــوا بــە فریشــتەكان دەفەرمــوێ: ئەوانــەی ســتەمیان كــردوە كۆیــان بكەنــەوە لەگــەڵ هاوڕێكانیــان).

﴿ وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ﴾(واتــە: وە كاتێــك پرســیاركرا لــە كچانــی زینــدە بــە چــاڵ) ئەویــش ئەوەیــە خەڵكانــی جاهیــلو نەفــام دەیانكــرد لــە زینــدە بــە چــاڵ كردنــی ئافرەتــان بــە زیندوویــی بەبــێ هیــچ هۆكارێــك، مەگــەر لــە ترســی هــەژاری، جــا پرســیار دەكــرێ: ﴿ بِأَيِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ﴾(واتــە: بــە چ گوناهێــك كــوژراون)؟ بێگومــان ئــەوەی زانــراوە هیــچ تاوانێكــی نەبــووە، جــا لەمــەدا سەرزەنشــتو ســەركۆنەكردن هەیــە بــۆ بكوژانــی.

﴿ وَإِذَا ٱلصُّحُفُ ﴾(كاتــێ ئــەو نامەیــەی) كردەوەكانیانــی لــە خۆگرتــووە لــە خێــرو شــەڕ، ﴿ نُشِرَتْ ﴾(بڵاوكرایــەوەو) دابەشــكرا بەســەر خاوەنەكانیانــدا، هەنــدێ دەدرێ بــە دەســتی ڕاســتیو هەنــدێ بــە دەســتی چەپــی یــان لــە پشــتیەوە، ﴿ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتْ ﴾واتــە: (وە دەمێــك كــە ئاســمان) داماڵێنــرا، وەك خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ وَيَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلْغَمَٰمِ ۝٢٥ ﴾الفرقــان، (واتــە: وە ڕۆژێ ئاســمان لــەت دەبــێ

لەگـەڵ هەورێکـی سـپی هەمـوو ئاسـمان دەگرێتـەوە)، ﴿ يَوْمَ نَطْوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ﴿١٠٤﴾ ﴾ الأنبياء، (واتـە: بێنـەوە بیریـان ئـەو ڕۆژەی کـە ئاسـمانەکان دەپێچینـەوە وەک پێچانـەوەو لولکردنـی پـەڕە بـۆ ئـەوەی کـە تێیـدا نووسـراوە)، (وە هەروەهـا فەرموویەتـی:) ﴿ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ ﴿٦٧﴾ ﴾ الزمر، (واتـە: لـە ڕۆژی دوایـی دا هەمـوو زەوی لـە چنگـی ئـەو دایـە بـە دەسـت خوایـە، وە ئاسـمانەکانیش بە دەسـتی ڕاسـتی ئـەو پێچراونەتـەوە).

﴿ وَإِذَا ٱلْجَحِيمُ سُعِّرَتْ ﴾ واتـە: داگیرسـێنراو گـڕی گـرت، بـە جـۆرێ کـە پێشـتر وانەبـووە، ﴿ وَإِذَا ٱلْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ ﴾ (واتـە: وە سـاتێک کـە بەهەشـت) نزیـک کرایـەوە بـۆ خۆپارێـزان، ﴿ عَلِمَتْ نَفْسٌ ﴾ واتـە: هەمـوو نەفسـێک (دەزانـێ) چونکـە لـە میانـەی (الـشرط)دا هاتـوە، ﴿ مَّآ أَحْضَرَتْ ﴾ واتـە: چـی ئامـادە کـردوە بـۆ خـۆی لـەو کردەوانـەی کـە پێشـی خسـتووە، هـەروەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ﴿٤٩﴾ ﴾ الكهف، (واتـە: هـەر کردەوەیەکیـان کردبـێ تیایـدا ئامادەیـە).

ئـەم وەسـفانەی کـە خـوا ﷻ وەسـفی قیامەتـی پـێ کـردوە لـەو وەسـفانەیە کـە دڵـەکان شـپرزە دەکات، وە بـە هۆیـەوە تووشـی تـرس و خەمۆکـی دەبـن، ماسـولکەی لای شـانو سـنگیان گـرژ دەبـێ، ترسـیش دایـان دەپۆشـێ، وە هانـی خـاوەن دڵـەکان دەدات خۆیـان ئامـادە بکـەن بـۆ ئـەو ڕۆژە، وە سەرزەنشـتیان دەکات لـە هـەر شـتێک کـە ببێتـە مایـەی لۆمـە کـردن، بۆیـە هەنـدێ لـە زانایانـی پێشـین وتوویانـە: هـەر کەسـێک دەیەوێـت تەماشـای ڕۆژی دوایـی بـکات، وەک ئـەوەی بەچـاو ببینێـت، بابیر لـەم سـوورەتە بکاتـەوە ﴿ إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴿١﴾ ﴾.

(١٥-٢٩): ﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلْخُنَّسِ ﴿١٥﴾ ٱلْجَوَارِ ٱلْكُنَّسِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ ﴿١٧﴾ وَٱلصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿١٩﴾ ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ ﴿٢٠﴾ مُّطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ ﴿٢١﴾ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢٣﴾ وَمَا هُوَ عَلَى ٱلْغَيْبِ بِضَنِينٍ ﴿٢٤﴾ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿٢٥﴾ فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ ﴿٢٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾:

﴿ فَلَآ أُقْسِمُ ﴾ خـوا ﷻ سـوێندی خـواردوە بـە ﴿ بِٱلْخُنَّسِ ﴾ ئەویـش ئـەو ئەسـتێرانەیە کـە دوادەکـەون لـە ڕۆیشـتنی ئەسـتێرە دیـارەکان لـە ڕووی ڕۆژئـاواوە، ئەوانیـش ئـەو حـەوت ئەسـتێرەن کـە ڕێ دەکـەن: خـۆر، مانـگ، زوهـرە، موشـتەری، مەریـخ، زوحەل،

عەتارد، ئا ئەم حەوت ئەستێرەیە دوو ڕۆیشتنیان بۆ هەیە: ڕۆیشتنێک بە تەنیشتی ڕۆژئاوا، لەگەڵ هەموو ئەستێرەکانو گەردوون، وە ڕۆیشتنێک پێچەوانەی ئەمە، لە تەنیشتی ڕۆژهەڵات، ئەم حەوت ئەستێرەیە بە تەنها تایبەت دەبن بەم ڕۆیشتنە. جا خوا سوێندی پێیان خواردوە لە کاتی دواکەوتنیان، وە لە کاتی ڕێکردنیان، وە لە کاتی دیار نەمانیان بە ڕۆژ.

وە دەگونجێ مەبەست پێی هەموو ئەستێرەکان بێ: ئەو ئەستێرانەی ڕێ دەکەنو جگە لەوانیش، ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ﴾ واتە: (وە بە شەو کاتێ) پشت هەڵدەکات، وە وتراوە: کاتێ کە تاریک دەبێ، ﴿ وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴾ واتە: (وە بە بەیانی) کە نیشانەکانی دەردەکەوێتو ڕووناکی دەردەچێت قۆناغ بە قۆناغ، تا تەواو دەبێتو خۆر دەردەچێت.

ئەم دەقانە مەزنن، خوا سوێندی پێ خواردوون لەسەر مەزنیو بەهێزیو تۆکمەیی قورئان، وە پارێزراوی لە هەموو شەیتانێکی نەفرین لێکراو، جا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ﴾ (واتە: بێگومان ئەو قورئانە گوفتاری ڕەوانەکراوێکی پایە بەرزە) ئەویش جبریلە عليه السلام، لە لایەن خواوە دایبەزاندوە، هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٩٢ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ ١٩٣ عَلَىٰ قَلۡبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ ١٩٤ ﴾ الشعراء (واتە: بەڕاستی ئەم قورئانە دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانیانە * جوبرەئیلی ئەمین هێنایە خوارەوە * بۆ سەر دڵی تۆ بۆ ئەوەی لە ترسێنەران بیت).

خوا ﷻ جبریلی وەسف کردوە بە بەخشندە، بە هۆی بەرزیو بەڕێزی خوڕەوشتیو زۆری وەسفە ستایشکراوەکانی، بەڕاستی ئەو چاکترینی ناو فریشتەکانەو مەزنترینیانە، خاوەن بەرزترین پلەو پایەیە لەلای پەروەردگاری ﴿ ذِي قُوَّةٍ ﴾ خاوەن هێزە لەسەر ئەوەی خوا فەرمانی پێکردوە، وە لەهێزو توانای ئەوەیە وڵاتی گەلی لووط عليه السلام سەروو ژێر کردو لە ناوی بردن، ﴿ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ ﴾ واتە: (لە لای خاوەن عەرش) جبریل عليه السلام لە خواوە نزیکە خاوەن پلەیەکی بەرزو تایبەتمەندیەکی تەواوە لە لای خوا ﷻ، ﴿ مَكِينٖ ﴾ واتە: خاوەن پلەو پایەیە لەسەرووی سەرجەم فریشتەکانە.

﴿ مُّطَاعٖ ﴾ جبریل عليه السلام قسەی ڕەوایە لەناو فریشتەکاندا، کۆمەڵێک لە فریشتە

نزیکەکانــی لــەلان وەکــو ســەرباز، فەرمانــی خــۆی بەســەریاندا دەســەپێنیٚو فەرمانــی جێبەجــیٚ دەکــریٚ، ﴿ أَمِينٍ ﴾ خــاوەن ئەمانــەتو دەســت پاکیــە، هــەر فەرمانێکــی پــیٚ بکــریٚ جێبەجێــی دەکات بەبــیٚ زیــادو کــەم، ئەوەیشــی بــۆی دانــراوە تێناپەڕێنــیٚو ســنوور نابەزێنــیٚ، هەمــوو ئەمانــە بەڵگــەن لەســەر شــەرەفو حورمەتــی قورئــان لــەلای خــوای بــەرز، ئــەو زاتــە ئــەم قورئانــەی نــاردووە بــەم فریشــتە بەڕێــزە، کــە وەســف کــراوە بــەو ســیفەتە تەواوانــە.

نەریــت وایــە پاشــاو دەســەڵاتدارەکان کەســە بەڕێــزو بــە حورمەتــەکان نانێــرن، مەگــەر بــە هــۆکاری نامەیەکــی زۆر گرنــگو بەڕێــز، کاتــیٚ باســی فەزڵی نێــردراوی فریشــتەی کــرد کــە قورئانــی هێنــاوە، ئنجــا باســی فــەزڵو چاکــەی نێــردراوی ئادەمــی کــرد کــە قورئانــی بەســەردا دابەزێنــراوە، وە خەڵکیشــی بــۆ لای بانــگ کــردوە، فەرموویەتــی: ﴿ وَمَا صَاحِبُكُم ﴾ ئەویــش موحەممــەد ﷺ ﴿ بِمَجْنُونٍ ﴾ (شــێت نیــە) هەروەکــو چــۆن دوژمنەکانــی دەڵێــن، ئەوانــەی پەیامەکەیــان بــە درۆ دانــاوە، قســەی لەســەر هەڵدەبەســتن لــەو قســانەی مەبەســتیان پێــی کوژاندنــەوەی ڕووناکــی ئــەو پەیامەیــە کــە هێناویەتــی، ئــەوەی لــە توانایانــدا هەیــەو دەســەڵاتیان بەســەریدا دەشــکیٚ.

بەڵکــو موحەممــەد ﷺ تەواوترینــی نــاو ئادەمیــزادە لــە ڕووی عەقــڵو بۆچوونــەوە، وە ڕاســتگۆترینیانە، ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ ﴾ واتــە: موحەممــەد ﷺ جبریلــی بینــی لــە ئاســۆی ڕوونــدا، ئــەو بەرزتــرە لــەوەی کــە چــاو بریــکات، ﴿ وَمَا هُوَ عَلَى ٱلْغَيْبِ بِضَنِينٍ ﴾ واتــە: پێغەمبــەر ﷺ بێبــاک نیــە لــەوەی خــوا وەحــی بــۆ کــردوە، لێــی زیــاد بــکات، یان کــەم، یــان هەندێکــی بشــارێتەوە، بەڵکــو ئــەو دەســتپاکی نــاو خەڵکــی ئاســمانەکانو زەویــە، پەیامەکانــی پەروەردگــاری بــەڕوونو ڕەوانــی گەیانــدوە، چرووکــی لــە هیــچ شــتێکیدا نەکــردوە، نــە دەوڵەمەنــدو نــە هــەژار، نــە دەســەڵاتدارو نــە بــیٚ دەســەڵات، نــە نێــرو نــە مــیٚ، نــە شارســتانیو نــە دەشــتەکی، لەبــەر ئەوەیــە خــوا ﷻ نــاردی بــۆ نــاو ئوممەتێکــی نەخوێنــدەواری نەفامــی جاهیــل، نەمــرد تــا هەموویــان بــوون بــە زانــای خوانــاس، لــە زانســتدا گەیشــتنە ئەوپــەڕی، وە لــە دەرهێنانــی وردەکاریو تێگەیشتنەکانیشــدا، ئــەوان پێشــەواو مامۆســتا بــوون، جگــە لەوانیــش خوارتــر بــوون لــەوەی بــە خوێندکاریــان بژمێردرێــن، ﴿ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ﴾ (واتــە: ئــەو قورئانــە قســەی شــەیتانی دەرکــراو لــە بەزەیــی خــوا نیــە وەک ئێــوە دەیڵێــن) کاتــیٚ باســی

گەورەیـی كتێبەكـەی‌و فـەزڵ‌و چاكـەی كـرد، بـە بـاس كردنـی دوو نێـردراوی بەڕێـز كـە لەسـەر دەسـتی ئـەوان گەیشـت بـە خەڵكـی، خـوا ستایشـی كـردن بـەوەی كـە كـردی، دیـارە خـوا هەمـوو بـەلاو ناتـەواوی‌و نەخۆشـیەكی لـە كتێبەكـەی بـەدوور گرتـوە، كـە ببێتـە هـۆی لەكەداركردنـی، دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ﴾ واتـە: ئـەو قورئانـە دووری نیـە لـە خـوا (ی پەروەردگـار)، وە لـە نزیكـی ئـەو زاتەیـە. ﴿ فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ ﴾ (واتـە: ئـەوە بـۆ كـوێ دەڕۆن) چـۆن ئەمـە دێ بـە خەیاڵتانـدا، بیـرو هۆشـتان لـە كوێیـە؟ تـا ئـەو حەقـەی لـە ئـەو پـەڕی ڕاسـتگۆییدایە هێناتانـە ئاسـتی درۆ، ئـەوە نزمتریـن شـتە كـە دەیكـەن‌و، لـە خـواری پووچیشـەوەیە؟! ئایـا ئەمـە هەڵگێرانـەوەی ڕاسـتیەكان نیـە؟! ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾ (واتـە: ئـەو قورئانـە تەنهـا یادخەرەوەیـە بـۆ هەمـوو جیهانیـان)، یـادی پەروەردگاریانـی پـێ دەكەنـەوە، وە ئەوەیشـی هەیەتـی لـە سـیفەتە تـەواوەكان‌و ئەوەیشـی پارێـزراوە لێـی لـە ناتـەواوی‌و كـەم‌و كوڕیـەكان، یـادی پێدەكەنـەوە بـە فەرمـان‌و قەدەغەكـراوەكان‌و بڕیارەكانـی، وە یـادی پێدەكەنـەوە بـە بڕیـارە قـەدەری‌و شـەرعیەكان، وە پاداشـت (لەسـەر چاكـەو سـزا لەسـەر خراپـە)، وە بـە گشـتی یـادی بەرژەوەندیەكانـی هـەردوو دونیـای پێدەكەنـەوە، وە بەكارپێكردنـی خۆشـبەختی هـەردوو دونیـا بـە دەسـت دێنـن، ﴿ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴾ (واتـە: بـۆ ئـەو كەسـانەی كـە بیانـەوێ بەڕێـی ڕاسـتدا بـڕۆن لـە ئێـوە) دوای ئـەوەی لـە یـەك جیابوویـەوە ڕێنمایـی‌و شـارەزایی، لـە گومڕایـی‌و سەرلێشـێواوی، ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ واتـە: جـا ویسـتی خـوا ﷻ جێبەجێـكارە، ناكـرێ هیـچ شـتێك ڕوو بـەڕووی ببێتـەوە یـان ببێتـە بەربەسـت بـۆی. لـەم دەقـەو وێنـەی ئـەم دەقـە بەرپەرچدانـەوەی ئـەو دوو كۆمەڵـەو دەسـتەیە، ئـەو قەدەریانـەی كـە ڕەتـی دەكەنـەوە، وە ئـەو قەدەریانـەی كـە ناچـاری دەكـەن، وەك چـۆن لـە پێشـەوە وێنـەی ئـەو ئایـەت باسـكرا، خـوا زاناتـرەو سـتایش بـۆ خـوا.

تەفسیری سوورەتی (التكوير) تەواو بوو.


سورة الانفطار
بسم الله الرحمن الرحيم
إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ ① وَإِذَا ٱلْكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتْ ② وَإِذَا ٱلْبِحَارُ
فُجِّرَتْ ③ وَإِذَا ٱلْقُبُورُ بُعْثِرَتْ ④ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ
وَأَخَّرَتْ ⑤ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلْكَرِيمِ ⑥ ٱلَّذِى
خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ⑦ فِىٓ أَىِّ صُورَةٍ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ⑧
كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّينِ ⑨ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَٰفِظِينَ ⑩ كِرَامًا
كَٰتِبِينَ ⑪ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ⑫ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ⑬ وَإِنَّ
ٱلْفُجَّارَ لَفِى جَحِيمٍ ⑭ يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ ٱلدِّينِ ⑮ وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَآئِبِينَ
⑯ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلدِّينِ ⑰ ثُمَّ مَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلدِّينِ
⑱ يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْـًٔا وَٱلْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ ⑲

## تەفسیری سوورەتی (الإنفطار)

## مەککییە (٣٦) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٥): ﴿ إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ ۝١ وَإِذَا ٱلْكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتْ ۝٢ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ فُجِّرَتْ ۝٣ وَإِذَا ٱلْقُبُورُ بُعْثِرَتْ ۝٤ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ ۝٥ ﴾:

واتە: کاتێک ئاسمان لەت بوو، وە ئەستێرەکانی کەوتنە خوارەوەو پەرش‌و بڵاو بوونەوەو جوانیان نەما، وە دەریاکانیش تێکەڵ کران تا بوون بە یەک دەریا، وە ساتێک کە گۆڕەکان ژێرو ژوور کران، بەوەی مردووەکانی لێ هاتە دەرەوەو کۆکرانەوە بۆ هەڵوێستەگەیەک لە بەردەستی خوا، بۆ پاداشتدانەوەیان لەسەر کردەوەکانیان. جا ئەوکاتە پەردە لەسەر هەموو شتێ هەڵدەماڵرێ‌و ئەوەی شاراوەیە نامێنێ، وە هەموو نەفسێک دەزانێ چی پێشخستووە لە چاکەو خراپە.

ئا ئەو کاتە کەسی ستەمکار دەستەکانی خۆی دەگەزێ، کاتێ کردەوە پووچەکانی دەبینێ، وە تەرازووی کە نزمە، حەق‌و مافەکان دەوریان گرتوەو خراپەکانیش لە پێشیدا ئامادە بوون، دڵنیایە بە بەدبەخت بوونی هەتا هەتایی‌و سزای یەکجارەکی. ئا لەوێدا پارێزکاران سەرفرازو سەرکەوتوو دەبن، ئەوانەی کردەوەی چاکیان پێشخستووە بە سەرکەوتنێکی مەزن‌و نازونیعمەتی هەمیشەیی، وە پارێزراوی لە سزای دۆزەخ.

(٦-١٢): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلْكَرِيمِ ۝٦ ٱلَّذِى خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ۝٧ فِىٓ أَىِّ صُورَةٍ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ۝٨ كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّينِ ۝٩ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَٰفِظِينَ ۝١٠ كِرَامًا كَٰتِبِينَ ۝١١ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ۝١٢ ﴾:

خـوا ﷻ بـە سەرزەنشـت کردنـی ئادەمیـزادی کەمتەرخەم لـە مافـی پەروەردگـاری، بوێر لەسـەر سـەرپێچی کردنـی دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ﴾ (واتـە: ئـەی ئینسـان چـی تـۆی هەڵخەڵەتانـدوە بـە پەروەردگـاری گـەورەو بەخشـندەت) ئایـا کەمتەرخەمیـت بەرانبـەر مافەکانـی ئـەو زاتـە؟ یـان سـزای ئـەوت بـە کـەم زانیـوە؟ یـان بـڕوات نەبـووە بـەوەی پاداشـتت بداتـەوە؟

ئایـا ئـەو زاتـە ﴿ ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ ﴾ (واتـە: دروسـتی نەکردوویـت) بـە چاکتریـن شـێوە؟ ﴿ فَعَدَلَكَ ﴾ وە ڕێکـی خسـتووی بـە چاکتریـن‌و جوانتریـن شـێوە.

ئایـا شـیاوە بـۆ تـۆ بێبڕوایـی بکـەی بـە نیعمەتـی نیعمـەت پێـدراو، یـان نکوڵـی بکەی بەرانبـەر بـە چاکـەی چاکـەکار؟ ئەمـە تەنهـا لـە نەفامـی‌و سـتەم‌و کەللەڕەقیەتـی، دەی ستایشـی خـوا بکـە کـە خـوا وێنـەی تـۆی نەکردوەتـە وێنـەی سـەگ یـان کـەر یـان وێنـەی یەکێـک لـەو گیانلەبەرانـە، لەبـەر ئەمەیـە خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴾ (واتـە: لـە هـەر وێنەیەکـدا کـە خـۆی ویسـتبێتی ڕێکـی خسـتوویت).

﴿ كَلَّا بَلۡ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّينِ ﴾ واتـە: لەگـەڵ ئـەم ئامۆژگـاریو یادکردنەوەیـەدا بەردەوامـن لەسـەر بەدرۆدانانـی ڕۆژی دوایـی، ئێـوە هـەر دەبـێ لێپرسـینەوەتان لەگەڵ بکرێ لەسـەر ئـەوەی کردووتانـە، بێگومـان خـوا چەنـد فریشـتەیەکی بەڕێـزی بەسـەرتانەوە دانـاوە، قسـەو کردەوەکانتـان دەنووسـن‌و بـە کارەکانتـان دەزانـن، کـە ئەمـە کردەوەکانـی دڵ‌و جەسـتەکانیش دەگرێتـەوە، ئـەوە شـیاوە بـۆ ئێـوە ڕێزیـان بگـرن‌و بـە گەورەیـان بزانـن.

(١٣-١٩): ﴿ إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ ١٣ وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٖ ١٤ يَصۡلَوۡنَهَا يَوۡمَ ٱلدِّينِ ١٥ وَمَا هُمۡ عَنۡهَا بِغَآئِبِينَ ١٦ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ١٧ ثُمَّ مَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ١٨ يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗاۖ وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ ١٩ ﴾:

﴿ إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ ﴾ مەبەسـت لـە (الأبـرار): زۆر چاکەکارانـە، ئەوانـەی هەسـتاون بـە جێبەجـێ کردنـی مافەکانـی خـواو بەندەکانـی، پەیوەسـتن بـە چاکـە لـە کردەوەکانـی دڵ‌و جەسـتەکان، ئـا ئەوانـە پاداشـتیان نـازو نیعمەتـە لـە نـاو دڵ‌و ڕۆح‌و جەسـتەیان لـە ماڵـی دونیـاو لـە ماڵـی بـەرزەخ‌و لـە ماڵـی مانـەوەی هەمیشـەیی.

﴿ وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ ﴾ (واتـە: بێگومـان بـەدکاران) ئەوانـەن کەمتەرخەمیـان کـردوە لـە مافەکانـی خـواو بەندەکانـی، ئەوانـەی دڵ‌و کردەوەکانیـان خـراپ‌و بـەدکارە، ﴿ لَفِي

﴿ جَحِيمٍ ﴾ واتــە: سـزای بـە ئێـش لەماڵـی دونیـاو لـە ماڵـی بـەرزەخو لـە ماڵـی مانـەوەی هەمیشـەیی.

﴿ يَصۡلَوۡنَهَا ﴾ سـزا دەدرێـن تیایـدا بـە سـەخترین سـزا، ﴿ يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴾ واتـە: لـە ڕۆژی پاداشـتدانەوەو سـزادان لەسـەر کـردەوەکان، ﴿ وَمَا هُمۡ عَنۡهَا بِغَآئِبِينَ ﴾ واتـە: ئـەوان لێـی دەرناچـن بەڵکـو پەیوەسـتن پێیـەوە، ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ١٧ ثُمَّ مَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴾ لەمـەدا ترسـاندنێک هەیـە بـۆ ئـەو ڕۆژە سـەختە، کـە بیـرو هۆشـەکان پەشـۆکاوو سەرسـام دەکات، ﴿ يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗا ﴾ (واتـە: ڕۆژێـک کـە هیـچ کـەس هیچـی بەدەسـت نیـە بـۆ کـەس) ئەگەرچـی نزیکێکـی هەبێـت، یـان خۆشەویسـتێکی پـاک، هەمـوو سـەرقاڵە بـە نەفسـی خۆیـەوە، کـەس داوای ئازادکردنـی غەیـری خـۆی نـاکات، ﴿ وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ ﴾ (واتـە: وە فەرمـان هـەر بـۆ خوایـە) تەنهـا ئـەو زاتـە بڕیـار لـە نێـوان بەندەکانـدا دەدات، مافـی سـتەم لێکـراو لـە ستەمکار وەردەگرێتـەوە.

تەفسیری سوورەتی (الأنفطار) تەواو بوو.



## تەفسیری سوورەتی (المطففین)
## مەككییە (٣٦) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٦): ﴿ وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكْتَالُوا۟ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ﴿٢﴾ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ﴿٣﴾ أَلَا يَظُنُّ أُو۟لَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ ﴿٤﴾ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥﴾ يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾ ﴾:

﴿ وَيْلٌ ﴾ وشەی سزاو هەڕەشە کردنە، ﴿ لِّلْمُطَفِّفِينَ ﴾ خوا ﷻ تەرازوو بازانی شیکردۆتەوە بە فەرمایشتی خۆیو فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكْتَالُوا۟ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾ (واتە: ئەوانەی کە پێوانە بکەن) بەشی خۆیان بە تەواوی وەردەگرن بەبێ کەمو کوڕی، ﴿ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ ﴾ واتە: ئەگەر مافی خەڵکی بدەنەوە پێیان، بە پێوانە یان بە تەرازوو، ﴿ يُخْسِرُونَ ﴾ واتە: کەمیان دەدەنێ، یان بە پێوانەو تەرازوو ناتەواوی تێدا دەکەن، یان وێنەی ئەوە، ئەمە دزی کردنە لە ماڵی خەڵکیو بێ وێژدانیە کە بەرانبەریان، جا ئەگەر ئەم هەڕەشەیە بۆ ئەو کەسانەیە کەمتەرخەمی دەکەن لە پێوانەو تەرازوودا، بێگومان ئەو کەسەی ماڵی خەڵک دەبات بە زۆر دەستی بەسەر دادەگرێ، یان لێیان دەدزێ، ئەوە لە پێشترە بەم هەڕەشەیە.

ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بێگومان ئادەمیزاد هەروەکو چۆن ماڵی خۆی لە خەڵکی وەردەگرێتەوە، پێویستە لەسەری هەموو ئەو ماڵانەیان پێ بداتەوە کە هی خۆیانە لەلایەتی. بەڵکو دەچێتە نێو ئەمەوە بەڵگەهێنانەوەو گفتوگۆکان، بێگومان هەروەک چۆن مشتومڕ کاران، سروشت وایە هەریەکەیان سوورە لەسەر ئەو بۆچوونەی کە لە لایەتی، وە بەڵگەشی بۆ دێنێتەوە، بەهەمان شێوە

پێویستە لەسەری بەڵگەکانی ڕوونی بکاتەوە بۆ دژەکەی، ئەو بەڵگانەی کە نایزانێ، وە با تەماشای بەڵگەی دژەکەی بکات، وەک چۆن کەسی بەرانبەری تەماشای بەڵگەی ئەو دەکات، ئا لەم جێگەیەدا ویژدانی مرۆڤ دەردەکەوێت لە دەمارگیریو نارەوایی، وە خۆ بە کەم زانینی لە لووت بەرزی، وە عەقڵو ژیری لە گەمژەییو غەشیمی، داوای خێرو چاکە تەنها لە خوا دەکەین.

پاشان خوا ﷻ هەڕەشەی کردوە لە تەرازووبازان، سەر سوورمانی دەربڕیوە لە حاڵی بەردەوام بوونیان لەسەر ئەو حاڵەی لەسەرین، وەک فەرموویەتی: ﴿ أَلَا يَظُنُّ أُولَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبۡعُوثُونَ ﴿٤﴾ لِيَوۡمٍ عَظِيمٍ ﴿٥﴾ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ (واتە: ئایا ئەوانە نازانن کە بێگومان زیندوو دەکرێنەوە * لە ڕۆژێکی گەورەدا * ڕۆژێک کە خەڵک لە بارەگای پەروەردگاری جیهانیاندا دەوەستن) جا ئەوەی بوێری کردوون لەسەر تەرازو بازی بڕوا نەبوونیانە بە ڕۆژی دوایی، ئەگەرنا ئەگەر بڕوایان بەڕۆژی دوایی هەبێ، وە بزانن لەبەر دەستی خوادا دەوەستنو لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت لە کەمو زۆر، ئەوە خۆیان دادەڕنی لەو ڕەفتارەو تەوبەیان لێ دەکرد.

لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ۝ يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ
ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ۝ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ۝ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ۝
وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ۝ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ۝ وَمَا يُكَذِّبُ
بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ۝ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ
۝ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ۝ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ
يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ۝ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ ۝ ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا
ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ۝ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ ۝
وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ۝ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ۝ يَشْهَدُهُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ۝
إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ۝ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ۝ تَعْرِفُ فِى
وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ ۝ يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ۝ خِتَٰمُهُۥ
مِسْكٌ ۚ وَفِى ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ ۝ وَمِزَاجُهُۥ مِن
تَسْنِيمٍ ۝ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا ٱلْمُقَرَّبُونَ ۝ إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ كَانُوا۟
مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَضْحَكُونَ ۝ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ ۝
وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمُ ٱنقَلَبُوا۟ فَكِهِينَ ۝ وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوٓا۟
إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ ۝ وَمَآ أُرْسِلُوا۟ عَلَيْهِمْ حَٰفِظِينَ ۝

(٧-١٧): ﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ﴿٨﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿١١﴾ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿١٧﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ ﴾ (واتە: نەخێر بە ڕاستی نامەی تاوانباران) ئەمەش هەموو تاوانبارێک دەگرێتەوە، لە جۆرەكانی بێبڕوایانو دوو ڕووانو لە سنوور دەرچووان ﴿ لَفِى سِجِّينٍ ﴾ (واتە: لەناو دەفتەرێكی پەستی ڕەش دایە)، پاشان ئەوەی ڕاڤە كردوە بە فەرمایشتی خۆیو فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ﴿٨﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴾ واتە: (تۆ چووزانیت ئەو دەفتەرە چیە؟!) دەفتەرێکە هەموو كردەوە خراپەكانیانی تێدایە، وە (السِّجِّين): جێگایەكی تەسکو تەنگە، وە (السجِّين) پێچەوانەی (عِلّيّين)ە كە ئەویش جێگای كتێبی چاكەكارانە، وەک چۆن دواتر باسی لێوە دەكرێ.

وتراوە: بێگومان (سجِّين) لە خواری حەوت چینی زەویەوەیە، جێگای بەدكارانەو شوێنی مانەوەیانە، ﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴾ (واتە: هاوار لەو ڕۆژەدا بۆ بەدرۆدانەران)، پاشان بەدرۆدانەرانی ڕوون كردۆتەوە بەوەی كە ئەوان: ﴿ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾ (واتە: ئەوانەی كە بڕواناكەن) بە ڕۆژی پاداشتو سزا، ڕۆژێ كە خوا پاداشتی خەڵكی تێدا دەداتەوە بە پێی كردەوەكانیان، ﴿ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ ﴾ (واتە: كەس ئەو ڕۆژە بە درۆ نازانێ مەگەر هەموو ستەمكارێک) لەسەر قەدەغەكراوەكانی خوا، زێدەڕۆ لە قەدەغەكراوەكاندا ﴿ أَثِيمٍ ﴾ واتە: زۆر گوناهبار، ئا ئەمە دژایەتی كردنی هانی دەدات لەسەر بێبڕوایی، وە لووت بەرزی بەرپەرچدانەوەی حەقی لەسەر پێویست دەكات، لەبەر ئەمەیە:

﴿ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا ﴾ کـە بەڵگەن لەسـەر ڕاسـتی، وە لەسـەر ڕاسـتی پەیامـی پێغەمبەران، بە درۆیـان دەزانـێو نکووڵیـان لێـدەکات، ﴿ قَالَ ﴾ دەڵێ ئەمانـە: ﴿ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ واتە: لە ئەفسـانەو هەواڵـی پێشـینەکانە، لە لایەن خـواوە نەهاتـووە، ئەمیش بە هۆی لـووت بەرزیو عینادیەوە.

بـەڵام ئـەو کەسـەی ویژدانی هەیـەو مەبەسـتی حەقـی ڕوونکراوەیـە، بێگومان ئەو کەسـە ڕۆژی دوایـی بـەدرۆ دانانێـت، چونکە خـوا ﷻ بەڵگـەی ڕوونو ئاشـکراو یەکلاکەرەوەی لەسـەر پێویسـت کردوە، کـە وای لێـدەکات ببێتە ڕاسـتیەکی دڵنیاکـەرەوە، وە دڵیان وەکو خـۆری لـێ دیێت بۆ چـاوەکان، بـە پێچەوانەی ئەو کەسـەی ژەنـگ دڵی گرتـووە، ژەنگی گوناهـو سـەرپێچیەکانی، بەڕاسـتی ئـەو کەسـە بێ بەشـە لـە حەقو ڕاسـتی، لەبـەر ئەمەیە ڕێگـە دراوە بـەوەی بـێ بـەش بێت لـە بینینی خـوای پەروەردگـار، وەک چۆن لـە دونیادا دڵـی بێبـەش بـووە لـە ئایەتەکانـی خـوا، ﴿ ثُمَّ إِنَّهُمْ ﴾ (پاشـان ئـەوان) لەگەڵ ئەم سـزا بە ئێشـە ﴿ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ ﴾ (واتـە: دەچنە دۆزەخەوە) پاشـان بە سەرزەنشـتو توانجـەوە پێیان دەوتـرێ: ﴿ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴾ (واتـە: ئەمـە ئەوەیـە کـە بڕواتـان پـێ نەدەکـرد)، جا باسـی سـێ جۆر سـزای بۆ کـردوون: سـزای دۆزەخ، سـزای سەرزەنشـتو لۆمەکردن، وە سـزای بێبـەش بوون لـە بینینـی پەروەردگـاری جیهانیان، کـە تووڕەیی‌و خەشـمو قینی دەگرێتـەوە لەسـەریان، ئـەوە مەزنترە لەسـەریان لە سـزای دۆزەخ، مەفهومی دەقەکـە دەبێتە بەڵگـە لەسـەر ئـەوەی بێگومان بـڕواداران لـە ڕۆژی دوایی‌و لـە بەهەشـتدا پەروەردگاریان دەبینـن، چێـژو لـەزەت لە بینینـی وەردەگـرن، مەزنتر لـە هەمـوو لەزەتـەکان، وە دڵخۆش دەبـن بـە دواندنـی‌و نزیـک بـوون لێی، وەک چـۆن خوا باسـی کـردوە لە چەندیـن دەقی قورئانـدا، وە بـە تەواتـور بەڵگە هاتـووە لـە پێغەمبەری خواوە لەسـەر ئەو ڕاستیە.

لـەم دەقانـەدا ترسـاندنی تێدایە لـە گوناح، چونکـە بێگومان بەسـەر دڵدا دیێتو دایدەپۆشـێ وردە وردە تـا نـورو ڕووناکـی تێـدا ناهێڵـێ، ئنجـا بەرچـاو ڕوونـی دەمـرێ حەقیقـەتو ڕاسـتیەکانی لـە پێش چـاو پێچەوانـە دەبێتەوە، پـووچو ناحەق بـە حەق دەبینێـت، حەقیش بـە پـووچ، ئەمـەش هەندێکـە لە سـزاکانی گونـاح کردن.

(١٨-٢٦): ﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ﴿١٩﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٢٠﴾ يَشْهَدُهُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿٢١﴾ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿٢٢﴾ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٢٣﴾ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ ﴿٢٤﴾ يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ﴿٢٥﴾ خِتَٰمُهُۥ مِسْكٌ ۚ وَفِى ذَٰلِكَ

فَلۡيَتَنَافَسِ ٱلۡمُتَنَٰفِسُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾:

دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡأَبۡرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ﴿١٩﴾ كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ ﴾ کاتێ باسی کتێبی بەدکارانی کرد کە لە خوارترین شوێنو تەنگترینیانەوەیە، ئنجا باسی کتێبی چاکەکارانی کردوە کە لە سەرەوەیە، بێگومان کتێبە نوسراوەکانیان ﴿ يَشۡهَدُهُ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴾ (واتە: نزیکانی خوا دەیبینن) لە فریشتە بەڕێزەکانو ڕۆحی پێغەمبەرانو ڕاستگۆیانو شەهیدان، ناویان بەرز ڕادەگیرێ لە ناو فریشتە بەڕێزەکاندا.

وە (عِلّیّون) ناوێکە بۆ بەرزترین شوێنی بەهەشت.

جا کاتێ باسی کتێبەکانیانی کردوە، باسی ئەوە دەکات کە چاکەکاران لە نازونیعمەت دان، ئەویش ناوێکی گشتگیرە بۆ نیعمەتەکانی دڵو رووحو جەستە، ﴿ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ ﴾ واتە: لەسەر تەختو قەنەفەی ڕازاوە بە فەرشی جوان، ﴿ يَنظُرُونَ ﴾ (تەماشای) ئەو نازونیعمەتانە دەکەن کە خوا پێیانی بەخشیوە، وە تەماشای ڕوخساری پەروەردگاری بەخشندەیان دەکەن.

﴿ تَعۡرِفُ ﴾ دەیانبینیت ئەی بینەرو تەماشاکەر ﴿ فِي وُجُوهِهِمۡ نَضۡرَةَ ٱلنَّعِيمِ ﴾ واتە: (لە ڕوخساریاندا) جوانیو گەشاوەییو خۆشگوزەرانی. بێگومان یەک لە دوای یەک هاتنی لەزەتو خۆشیەکان، ڕووناکیو جوانیو گەشاوەیی دەدات بە رووخسار.

﴿ يُسۡقَوۡنَ مِن رَّحِيقٖ ﴾ (واتە: پێیان دەنۆشرێ لە گوڵاو) ئەویش لە پاکترینو خۆشترینو بەتامترینی خواردنەوەکانو بەلەزەت ترینیانە ﴿ مَّخۡتُومٍ ﴾، (سەر مۆرە) ﴿ خِتَٰمُهُۥ مِسۡكٞ ﴾ (واتە: دوا قومی بۆنی میسکە)، دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ سەرمۆر کراوە، لەوەی شتێک بچێتە ناویو تامی بگۆڕێ، یان ناخۆشی بکات، وە ئەو دوا قومەش کۆتایی پێ دەهێنن میسکە، دەگونجێ مەبەست ئەوەش بێت لە کۆتایی پەرداخەکەیە کە تێیدا دەخۆنەوە جۆرێ خڵتەی تێدایە، ئەویش میسکی (الأذفر)ە.

جا ئەو خڵتەو لێڵیە نەریت وایە لە دونیادا دەڕژێنرێ، بەڵام لە بەهەشتدا بەو شێوەی دونیا نیە.

﴿ وَفِي ذَٰلِكَ ﴾ بۆ ئەو نازونیعمەتە بەردەوامە کە (هیچ کەس) ئەندازەو جوانیەکەی نازانێ جگە لە خوا، ﴿ فَلۡيَتَنَافَسِ ٱلۡمُتَنَٰفِسُونَ ﴾ واتە: با پێشبڕکێ بکەن لە گەیشتنیان پێی، ئەمە لە پێشترو شایستەترە کە ماڵە بەڕێزەکانی لە پێناودا خەرج بکرێ، وە شیاوترە پیاوە گەورەکان زەحمەتی لە پێناودا بکێشن.

(٢٧-٢٨): ﴿ وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسۡنِيمٍ ﴿٢٧﴾ عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾:

﴿ وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسۡنِيمٍ ٢٧ عَيۡنًا ﴾ واتـە: تێکەڵە کـراوی ئـەم شـەرابە لـە تەسـنیمە، ئەویـش کانیە کـە ﴿ يَشۡرَبُ بِهَا ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴾ (واتـە: نزیککـراوان (لـە خـوا) لێـی دەخۆنـەوە) ئـەوەش بەرزتریـن خواردنەوەی بەهەشـتە بە ڕەهایی، لەبـەر ئەوەیە پاڵفتە کـراوە بۆ نزیکان، ئەوانـەی خـاوەن بەرزتریـن پلەو پایـەی ناو خەڵکیـن، وە تێکـەڵ کراوە بە گـوڵاوو جگە لەویـش لـە خواردنـە بەلەزەتەکان.

(٢٩-٣٦): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ كَانُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضۡحَكُونَ ٢٩ وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمۡ يَتَغَامَزُونَ ٣٠ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمُ ٱنقَلَبُواْ فَكِهِينَ ٣١ وَإِذَا رَأَوۡهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ ٣٢ وَمَآ أُرۡسِلُواْ عَلَيۡهِمۡ حَٰفِظِينَ ٣٣ فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ ٣٤ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ٣٥ هَلۡ ثُوِّبَ ٱلۡكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ٣٦ ﴾

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ كَانُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضۡحَكُونَ ٢٩ وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمۡ يَتَغَامَزُونَ ﴾ کاتـێ باسـی سـزای تاوانبـارانو پاداشـتی بڕوادارانی کردوە، وە باسـی جیاوازی مەزنـەی کرد کە لـە نێوانیانـدا هەیـە، هەواڵیـدا بەڕاسـتی تاوانبـاران لە دونیـادا گاڵتە بـە بـڕواداران دەکەنو پێیـان پـێ دەکەنـن، وە کاتـێ تێپەڕن بە لایاندا سـرتە سـرت دەکـەنو چاویان لـە یەکتر دادەگـرن، بـە مەبەسـتی ئازاردانی دڵی بـڕواداران، چونکە بـە کەمیان دەزانن، لەگـەڵ ئەمەدا دەیانبینـی دڵنیـانو هیچ ترسـێ بە خەیاڵیانـدا نایەت.

﴿ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمُ ﴾ (واتـە: وە کاتـێ کـە بگەڕانایەتـەوە بـۆ لای مـاڵو منداڵیان) بەیانـی یـان ئێـوارە، ﴿ ٱنقَلَبُواْ فَكِهِينَ ﴾ واتـە: بەدڵخۆشـیو گاڵتە کردنـەوە دەگەڕانـەوە، ئەمـە ئـەو پـەڕی خۆهەڵخەڵەتاندنـە، ئەوان کۆیـان کردۆتەوە لـە نێوان خراپەو ئاسـایش لە دونیـادا، تەنانـەت وەک ئـەوە وایـە کتێـبو بەڵێنیـان لەلایـەن خواوە بـۆ هاتبێ ئـەوان لە خۆشـبەختانن، بڕیاریـان بۆ خۆیانـدا کە ئەوان لـە خەڵکانـی ڕێنمایی کـراون، بڕوادارانیش گومڕاو سەرلێشـێواون، درۆیان بەدەم خواوە هەڵبەسـت، وە بوێریان کرد لەسـەر قسـە کردن لەسـەری بەبێ زانسـت.

خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَمَآ أُرۡسِلُواْ عَلَيۡهِمۡ حَٰفِظِينَ ﴾ واتـە: ئـەوان بە چاودێـر نەنێردراون بـۆ سـەر بـڕواداران پەیوەسـت بـن بـە پاراسـتنی کردەوەکانیـان، تـا سـوور بـن لەسـەر تۆمەتبارکردنیـان بـە گومڕایـی، بێگومـان ئەمـەش لەوانـەوە تەنهـا یاخی بـوونو عینادیو گاڵتە کـردن بـوو، هیـچ بەڵگەو سـەلماندنێکیان بە دەسـتەوە نەبـوو، لەبەر ئەمەیە پاداشـتیان لـە دواڕۆژدا بەپێـی کردەوەکانیانە.

فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ ٣٤ عَلَى
ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ٣٥ هَلۡ ثُوِّبَ ٱلۡكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ٣٦

خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ فَٱلۡيَوۡمَ ﴾ واتـە: ڕۆژی دوایـی، ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ ﴾ (واتـە: ئەوانـەی کە بـڕوادار بـوون بـە بێبـڕواکان پێدەکەنـن)، کاتـێ دەیانبینــن نقوومـی سـزا بوونـەو پێـچ دەخـۆن، بێگومـان ئـەو درۆیانـەی هەڵیان دەبەسـت کۆتایـی پـێ هـاتو نەمـا.

وە بڕوادارانیـش لەوپـەڕی حەوانـەوەو ئارامـیو دڵنیاییـدان، ﴿ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ ﴾ ئەویـش کورسـیو قەنەفـەی ڕازاوەیـە، ﴿ يَنظُرُونَ ﴾ تەماشـای ئـەو نازونیعمەتانـە دەکـەن کـە خـوا ئامـادەی کـردوە بۆیان، وە تەماشـای ڕووخسـاری پەروەردگـاری بەخشـندەیان دەکـەن، ﴿ هَلۡ ثُوِّبَ ٱلۡكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴾ واتـە: ئایـا (بێبڕوایان) پاداشـتە کردەوەکانیـان وەرگرتـەوە؟ وەک چۆن لە دونیـادا بـە بـڕواداران پێدەکەنیـنو تۆمەتباریـان دەکـردن بـە گومڕایـی، بڕوادارانیـش لە دوارۆژدا پێیـان پێدەکەنـن، کاتـێ دەیانبینــن لە نـاو دۆزەخدا، کە ئەوە سـزای یاخی بوونو گومڕاییانـە.

بەڵـی، پاداشـت درانـەوە لەسـەر ئـەو کارو کردەوانـەی دەیانکـرد، بـە دادپـەروەریو حیکمـەتو دانایـی خـوا، وە خـوا زانـاو کاربەجێیـە.

تەفسیری سووڕەتی (المطففين) تەواو بوو.


سُورَةُ الانشِقَاقِ
بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ١ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ٢ وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ
٣ وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتۡ ٤ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ٥ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ٦ فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ
كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ٧ فَسَوۡفَ يُحَاسَبُ حِسَابٗا يَسِيرٗا ٨ وَيَنقَلِبُ
إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورٗا ٩ وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهۡرِهِۦ ١٠ فَسَوۡفَ
يَدۡعُواْ ثُبُورٗا ١١ وَيَصۡلَىٰ سَعِيرًا ١٢ إِنَّهُۥ كَانَ فِيٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورًا ١٣
إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ١٤ بَلَىٰٓۚ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرٗا ١٥ فَلَآ أُقۡسِمُ
بِٱلشَّفَقِ ١٦ وَٱلَّيۡلِ وَمَا وَسَقَ ١٧ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ١٨
لَتَرۡكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٖ ١٩ فَمَا لَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٢٠ وَإِذَا قُرِئَ
عَلَيۡهِمُ ٱلۡقُرۡءَانُ لَا يَسۡجُدُونَ ۩ ٢١ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُكَذِّبُونَ
٢٢ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُوعُونَ ٢٣ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ٢٤

## تەفسیری سوورەتی (الإنشقاق)
## مەککییە (٢٥) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-١٥): ﴿ إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ١ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا
وَحُقَّتۡ ٢ وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ ٣ وَأَلۡقَتۡ مَا
فِيهَا وَتَخَلَّتۡ ٤ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ٥ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ٦
فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ٧ فَسَوۡفَ
يُحَاسَبُ حِسَابٗا يَسِيرٗا ٨ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ
مَسۡرُورٗا ٩ وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهۡرِهِۦ ١٠
فَسَوۡفَ يَدۡعُواْ ثُبُورٗا ١١ وَيَصۡلَىٰ سَعِيرًا ١٢ إِنَّهُۥ
كَانَ فِيٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورًا ١٣ إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ١٤
بَلَىٰٓۚ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرٗا ١٥ ﴾:

خوا ﷻ ئەمە روون دەکاتەوە کە لە ڕۆژی دوایی دا ڕوو دەدات، لە گۆڕانی ئەستێرە مەزنەکان، دەفەرموێ: ﴿ إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ﴾ واتە: کاتێ کە ئاسمان لەت بوو، وە هەندێکی لە هەندێکی دیکەی جیابوویەوە، ئەستێرەکانیشی کەوتنە خوارەوەو خۆرو مانگ گیرانو کوژانەوە، ﴿ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا ﴾ گوێڕایەڵی فەرمانی پەروەردگاری بوو، وە گوێی بۆ ڕاخستو گوێبیستی دواندنەکانی بوو. بێگومان هەر دەبێ بەو شێوەیە بێت، چونکە ئاسمان ڕامکراوو بەڕێوەبراوە، لە ژێر فەرمانبەرداری پاشای مەزنە، سەرپێچی فەرمانی ناکاتو بە پێچەوانەی حیکمەتی خوا ناجوڵێتەوە.

﴿ وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ ﴾ واتە: (کاتێک زەوی) لەرزیو تەکانیدا، کێوەکانیش بەسەریدا دارووخان، هەرچی لەسەریەتی دای بەیەکدا، لە خانوو باڵەخانەو شتەکانی دیکە، ئنجا ڕێک بوویەوە، وە خوا ڕایکێشا وەک چۆن پێستەی خۆشکراو ڕادەکێشرێ، تا تەواو بەرفراوان بوو، جێگای هەموو خەڵکی تێدا دەبێتەوە، ئنجا ڕێکو ساف دەبێ بێ گژووگیا، نابینی تێیدا هیچ جۆرە لاریو بەرزیو نزمیەک، ﴿ وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا ﴾ (واتە: وەچی تیابوو تووڕیدا) لە ماڵو سامانو گەنجینەکان، ﴿ وَتَخَلَّتۡ ﴾ (خاڵی بوو لێیان) بێگومان فوو دەکرێ بە صووردا، مردووەکان لە گۆڕەکانیان دێنە

دەرەوە بۆ سەر ڕووی زەوی، وە زەوی گەنجینەکانی دەردەکات تاکو وەک لولەیەکی مەزنی لێ دێت، خەڵکی دەیبینن‌و ئاخ‌و حەسرەت هەڵدەکێشن لەسەر ئەوەی کێبڕکێیان لە پێناو ئەوەدا دەکرد!

﴿ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ٥ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ﴾ واتە: تۆ تێکۆشەرییت بەرەو لای پەروەردگارت، کار دەکەیت بە فەرمان‌و قەدەغەکراوەکانی‌و نزیک دەبیتەوە لێی بە چاکە کردن یان خراپەکردن، پاشان لە ڕۆژی دواییدا پێی دەگەیت، بێ بایەخ مەبە لە پاداشتی خوا، ئەگەر بەختەوەر بیت لە چاکەی خواوەیە، ئەگەر بەدبەختیش بیت لە دادپەروەری خواوەیە. وە لەبەر ئەمەیە باسی پاداشتی کردوە بە دورو درێژی‌و فەرموویەتی: ﴿ فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴾(واتە: ئنجا ئەو کەسەی نامەی کردەوەی بە دەستی ڕاستیەوە بێت) ئەوانیش بەختەوەرانن، ﴿ فَسَوۡفَ يُحَاسَبُ حِسَابٗا يَسِيرٗا ﴾(واتە: ئەوسا لێپرسینەوەیەکی سووک‌و ئاسانی لەگەڵ دەکرێ)، ئەویش خستنە ڕوویەکی ئاسانە لە لای خوا، خوا دان بەو کەسەدا دەنێت بە گوناهەکانی، تەنانەت وا گومان دەبات ئەو لەناو چووە، خوا پێی دەفەرموێ: ((إِنِّي قَدْ سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِي الدُّنيَا، فَأَنَا أَسترهَا لَكَ اليَوْم)) واتە: بە ڕاستی من لە دونیادا گوناهەکانتم داپۆشی، ئەمڕۆش بۆت دادەپۆشم.

﴿ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ ﴾لە بەهەشتدا (کە دەگەڕێتەوە لای خزم‌و کەسەکانی) ﴿ مَسۡرُورٗا ﴾(زۆر دڵخۆش‌و شادمانە) چونکە ڕزگاری بووە لە سزاو، سەرفراز بووە بە پاداشت.

﴿ وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهۡرِهِۦ ﴾واتە: (وە ئەو کەسەی کتێبەکەی) لە پشتەوە درایە دەستی چەپی، ﴿ فَسَوۡفَ يَدۡعُواْ ثُبُورٗا ﴾(واتە: ئەو زۆر زوو داوای مردنی خۆی دەکات) لە ڕیسوا بوون‌و سەرشۆڕی، وە ئەوەیشی دەبینێ لە کتێبەکەیدا لە کردەوەکانی کە پێشی خستووەو تەوبەی لێ نەکردوە.

﴿ وَيَصۡلَىٰ سَعِيرًا ﴾واتە: ئاگری دۆزەخ دەوری دەدات لە هەموو لایەکەوەو پێچ دەخوات پێیەوە، ئەویش بە هۆی ئەوەی لە دونیادا، ﴿ كَانَ فِيٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورًا ﴾(واتە: لە ناو کەس‌و کاریدا دڵخۆش بوو) زیندوو بوونەوە هەر بە خەیاڵیدا نەدەهات، گوناهی کردو گومانی نەدەبرد دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاری‌و لەبەر دەستیدا دەوەستێنرێ، ﴿ بَلَىٰٓۚ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرٗا ﴾(واتە: نەخێر وانیە چونکە بە ڕاستی پەروەردگاری ئەو ئاگادار بوو بەو)، جوان نیە هەروا بە هاوەڵتە وازی لێ بهێنێ، نە فەرمانی پێ بکات‌و نە قەدەغەی لێ بکات، نە پاداشتی بداتەوەو نە سزای بدات.

(١٦-٢٥): ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلشَّفَقِ ١٦ وَٱلَّيۡلِ وَمَا وَسَقَ ١٧ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ١٨ لَتَرۡكَبُنَّ طَبَقًا

عَن طَبَقٍ ﴿١٩﴾ فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْءَانُ لَا يَسْجُدُونَ ۩ ﴿٢١﴾ بَلِ الَّذِينَ
كَفَرُوا يُكَذِّبُونَ ﴿٢٢﴾ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُوعُونَ ﴿٢٣﴾ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٤﴾ إِلَّا الَّذِينَ ءَامَنُوا
وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٢٥﴾ ﴾:

﴿ فَلَا أُقْسِمُ بِالشَّفَقِ ﴾ خوا ﷻ لەم جێگایەدا سوێندی خواردوە بە نیشانەکانی شەو، سوێندی خواردوە بە سورایی کەناری ئاسمان کە پاشماوەی ڕووناکی خۆرەو سەرەتای هاتنی شەوە.

﴿ وَالَّيْلِ وَمَا وَسَقَ ﴾ واتە: (وە سوێند بە شەو)و ئەو شتانەیشی کۆیان دەکاتەوە لە گیانداران‌و جگە لەوانیش، ﴿ وَالْقَمَرِ إِذَا اتَّسَقَ ﴾ واتە: (وە بە مانگ کاتێک) ڕووناکی پڕ دەبێ‌و دەدرەوشێتەوە، ئەو کاتە چاکترین سوودی هەیە، وە سوێند لەسەر خوراو وتەی خوایە کە فەرموویەتی: ﴿ لَتَرْكَبُنَّ ﴾ واتە: ئەی ئادەمیزاد! ﴿ طَبَقًا عَن طَبَقٍ ﴾ واتە: قۆناغی یەک لە دوای یەک‌و دۆخی جیا جیا، لە نوتفەیەکەوە بۆ خوێنی مەیو، بۆ پارچە گۆشتێک، بۆ فووکردن بە ڕووحدا.

پاشان بوون بە منداڵ، پاشان نەوجەوانی، پاشان قۆناغی سپاردنی ئەرک بەسەریدا لە فەرمان‌و قەدەغەکردن، پاشان دوای ئەوە دەمرێ، زیندوو دەکرێتەوەو پاداشت دەدرێتەوە بە پێی کردەوەکانی.

ئەم قۆناغە جیاوازانە کە بەسەر بەندەدا دێن بەڵگەن لەسەر ئەوەی خوای تاک‌و تەنها پەرستراوی ڕاستەقینەیە، کاری بەندەکانی بەڕێوە دەبات بە حیکمەت‌و میهرەبانی خۆی، بەندەش هەژارو دەستەوسانە، ژێر باری بەڕێوەبردنی خوای بە دەسەڵاتی میهرەبانە.

لەگەڵ ئەمەدا زۆرێ لە خەڵکی بڕواناهێنن،﴿ وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْءَانُ لَا يَسْجُدُونَ ﴾ واتە: ملکەچی قورئان نابن‌و گەردنکەچی فەرمان‌و قەدەغەکراوەکانیش نابن، ﴿ بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا يُكَذِّبُونَ ﴾ واتە: نکووڵی لە حەق دەکەن دوای ئەوەی بۆیان ڕوون بوەتەوە، با مرۆڤ سەری سوور نەمێنێ بە بڕوا نەهێنانیان‌و ملکەچ نەبوونیان بۆ قورئان، چونکە بە درۆدانەری حەق بە هۆی عینادی‌و کەللەڕەقیەوە ناتوانێ هیچ فرت‌و فێڵێک بکات، ﴿ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُوعُونَ ﴾ (واتە: وە خوا چاک ئاگادارو زانایە) بەوەی ئەنجامی دەدەن‌و بەو نهێنیەی لە دڵدا دەیهێڵنەوە، بێگومان خوا زانایە بە نهێنی‌و ئاشکرایان، پاداشتیان دەداتەوە بە پێی کردەوەکانیان، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ (واتە: کەواتە مژدەیان بدەرێ بە سزایەکی سەخت) لەبەر ئەوە ناونراوە بە مژدەو بەشارەت، چونکە لە ڕووخساردا خۆشی یان ناخۆشی دەردەکەوێت، ئەمەش حاڵی زۆربەی خەڵکیە کە قورئان بەدرۆ دادەنێن‌و بڕوایان پێی نیە.

إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍۭ ﴿٢٥﴾

وه لە ناو خەڵکیدا دەستە هەیە خوا ﷻ ڕێنمایی کردوون، بڕوایان بە خوا هێناوەو پەیامی پێغەمبەرانیان وەرگرتووە، جا بڕوایان هێناوەو کردەوەی چاکیان ئەنجام داوە، ئا ئەوانە: ﴿لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ (واتە: بۆ ئەوان هەیە پاداشتی) نەبڕاوە، بەڵکو ئەوە پاداشتی بەردەوامە لەوەی چاو نەیبینیوەو گوێ نەیبیستووەو بە خەتەرەش بەسەر دڵی مرۆڤدا نەهاتووە.

تەفسیری سووڕەتی (الإنشقاق) تەواو بوو.


سُورَةُ البُرُوجِ
بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ ① وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ ② وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ③ قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ④ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلْوَقُودِ ⑤ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ ⑥ وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ⑦ وَمَا نَقَمُوا۟ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ⑧ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ⑨ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُوا۟ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا۟ فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ ⑩ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْكَبِيرُ ⑪ إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ⑫ إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ ⑬ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلْوَدُودُ ⑭ ذُو ٱلْعَرْشِ ٱلْمَجِيدُ ⑮ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ⑯ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْجُنُودِ ⑰ فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ ⑱ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى تَكْذِيبٍ ⑲ وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطٌۢ ⑳ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ㉑ فِى لَوْحٍ مَّحْفُوظٍۭ ㉒

## تەفسیری سوورەتی (البروج)
## مەككییە (٢٢) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١): ﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ ﴾ واتە: (سوێند بە ئاسمانی خاوەن پلەوپایە گشتگیرەكان) لە خۆرو مانگو ئەستێرەكان، كە ڕێكخراون لە ڕۆیشتنیاندا بە تەواوترین ڕێكخستنو یاسا، بەڵگەن لەسەر تەواوی دەسەڵاتی خواو میهرەبانیو فراوانی زانستو حیكمەتی (بێ سنووری).

(٢): ﴿ وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ ﴾ واتە: ئەویش ڕۆژی دواییە، خوا بەڵێنی داوە بە خەڵكی كۆیان بكاتەوە تیایدا یەكەمینو دواییینو نزیكو دووریان، ئەو بەڵێنەی هەرگیز گۆڕانی بەسەردا نایەت، خوا ﷻ بەڵێنی خۆی ناشكێنێ.

(٣): ﴿ وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ﴾ ئەمە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە كە ناسراون بەم وەسفە، واتە: بینەرو بینراو، شایەتو شایەت لەسەر دراو، ئامادەو ئامادە بوو، وە لە سوێند لەسەر خوراو ئەوەیە ئەم سوێندە لە خۆی دەگرێ، لە ئایەتە درەوشاوەكانی خواو حیكمەتە ئاشكراكانیو میهرەبانیە فراوانەكانی.

(٤): وتراوە: سوێند لەسەر خوراو فەرمایشتی خوایە كە فەرموویەتی: ﴿ قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ﴾ ئەمە دوعاكردن بوو لێیان بە لەناوچوون (الأخدود): ئەو چاڵەیە كە لە زەویدا هەڵدەكەنرێت.

خاوەن چاڵەكان گەلێكی بێبڕوا بوون لە ناویاندا خەڵكانێكی موسڵمان هەبوو، زۆر بیانوویان پێ دەگرتن بۆ ئەوەی بچنە نێو ئاینەكەیانەوە، بەڵام بڕواداران ڕێگری ئەوەیان كرد، ئنجا بێبڕواكان چاڵێكیان هەڵكەند لەناو زەویدا بڕوادارانیان تێ فڕێ دەدا، لە دەورووبەری چاڵەكە دادەنیشتنو بڕوادارانیان تووشی فیتنە دەكردو ئاگرەكەیان

دەخستە ڕوو بۆیـان، جـا هەر کەسێک بچوایـە بە دەمیانـەوە، وازی لـە ئاینەکـەی بهێنایە ئازادیـان دەکـرد، وە هــەر کەسـێ بـەردەوام بووایـە لەسـەر بڕواهێنـان فڕێیـان دەدایە ناو ئاگرەکـە، ئەمـەش ئەوپەڕی دژایەتـی کردنی خـواو حیزبەکەیەتی کە بڕوادارانـن، ئا لەبەر ئەمەیـە خـوا ﷻ نەفرینی لێکـردنو لە ناوی بردنو هەڕەشـەی لێکـردنو فەرمووی: ﴿ قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ﴾ (واتـە: بە کوشـت چـوون خاوەن چاڵـەکان).

(٥-٨): پاشـان تەفسـیری (الأخـدود)ی کردوە بە فەرمایشـتی خـۆیو فەرموویەتی: ﴿ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلْوَقُودِ ۝٥ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ ۝٦ وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ﴾ ئەمـە ئەوپـەڕی دڵڕەقـیو بـێ بەزەییو لـووت بەرزیانە، چونکە دوو شـتیان پێکەوە کۆکـردەوە، بێبڕوابوون بـە ئایەتەکانـی خـواو دژایەتی کردنیـان، وە دژایەتـی کردنـی خەڵکەکەی، وە سـزادانیان بـەم سـزایە کـە دڵەکانی پـێ لەت لـەت دەبـێ، وە ئامـادە کردنیان لـە کاتـی فڕێدانیان بۆ نـاوی، ئـەو ڕقو داخەیـان بەرانبـەر بـە ئیمانـداران تەنها لەبـەر ئـەو تایبەتمەندیـە بوو کە سـتایش کرابـوون پێـیو بەختەوەریـان پێیـەوە بەند بـوو، ئەویش ئـەوە بوو ئـەوان بڕوای بەتینیـان هێنابـوو، بـە خوای باڵادەسـتی شایسـتەی سوپاسـگوزاری، ئەو زاتەی خـاوەن ئەو دەسـەڵاتەیە کـە پێیـەوە زاڵـە بەسـەر هەمـوو شـتێکدا، وە ستایشـکراوە لە وتەو وەسـفو کارەکانیدا.

(٩): ﴿ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ (واتـە: ئـەو زاتەی کە خاوەنی ئاسـمانەکانو زەویـە) بە سـەرجەم بەدیهێنـراوەکانو بەندەکانیشـی، هەرچۆن بیـەوێ هەڵیان دەسـوڕێنێ، ﴿ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾ (واتـە: خـوا ئاگـادارە بەسـەر هەمـوو شـتێکدا) بـە زانسـتو بیسـتنو بینیـن، ئایـا ئـەو یاخیبووانـە نەترسـان لـەوەی خـوا تۆڵەیـان لێبکاتـەوە، بـە تۆڵەکردنەوەیەکـی بـە دەسـەڵاتی بـە توانـا، ئایـا نەیانزانی هەموویـان موڵکی خـوان، هیچ کەسـێک دەسـەڵاتی بەسـەر ئـەوی دیکـەدا نیـە بەبـێ مۆڵەتی خـوا نەبێت؟

یـان شـاراوەیە لـە لایـان بەڕاسـتی خـوا دەوری کردەوەکانیانـی داوە، پاداشـتیان دەداتەوە لەسـەر کردەوەکانیـان، نەخێر، بەڕاسـتی بێبڕوا لە سەرکەشـیدایە، سـتەمکاریش لـە نەفامیو کوێریدایـە لـە دۆزینەوەی ڕێگای ڕاسـت، پاشـان بەڵێنی پێـداونو هەڕەشـەی لێکردوونو تەوبـەی خسـتۆتە ڕوو بۆیـانو فەرموویەتی:

(١٠): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُوا۟ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا۟ فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ ﴾ واتـە: سـزایەکە سـەختی سـووتێنەر، حەسـەنی بەصـری ڕەحمەتـی خـوای لێبێ

فەرموویەتـی: برواننە ئەو بەخشـندەیی‌و میهرەبانیە ئەوان دۆسـت‌و خۆشەویسـتان‌و خەڵکانی گوێڕایەڵـی ئـەو زاتەیان کوشـتتوە، ئەویـش بانگیان دەکات بـۆ تەوبە کردن، کاتێ باسـی سـزای سـتەمکارانی کـردوە، باسـی پاداشـتی بروادارانـی دەکات‌و دەفەرموێ:

(١١): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ بـە دڵەکانیـان ﴿ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ بـە ئەندامەکانـی جەسـتەیان، ﴿ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْكَبِيرُ ﴾ (واتـە: بـۆ ئـەوان هەیـە بەهەشـتانێک جۆگـەو ئـاوی زۆر دەڕوات بەژێریانـدا ئـا ئەوەیە سـەرکەوتنی گـەورە) کە سـەرکەوتنی پـێ بەدەسـت هاتـووە بـە ڕەزامەنـدی خـواوماڵی پـڕ لـە ڕێزی.

(١٢): ﴿ إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴾ واتـە: بـە دڵنیایـی سـزای پەروەردگاری تۆ بـۆ تاوانباران‌و خـاوەن گوناهــە گەورەکان زۆر سـەخت‌و توونـدە، ئەو لە بۆسـەدایە بۆ سـتەمکاران، وەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾ ﴾ هـود، (واتـە: ئا بەو شـێوەیە سـزادانی پەروەردگارت کاتێ خەڵکی شـارەکان سـزا دەدات لـە کاتێکـدا سـتەمکار بوون بە ڕاسـتی تۆڵەسـەندنی ئەو ئـازاردەرو بـە تینە).

(١٣): ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ ﴾ واتـە: ئـەو زاتە تاک‌و تەنهایە بە سـەرەتای دروسـت کردنی بەدیهێنـراوو دووبـارە زیندووکردنـەوەی، هیـچ هاوبەشـێکی نیـە لـەوە کارەو غەیـری ئەم کارەدا.

(١٤) ﴿ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ﴾ ئـەو زاتـەی لـە هەموو تاوانـەکان خۆش دەبێت بۆ کەسـێک تەوبەیان لـێ بـکات، وە لـە گوناهەکانیش خـۆش دەبێت، بـۆ کەسـێک داوای لێخۆشـبوون بکات‌و بگەڕێتـەوە، ﴿ ٱلْوَدُودُ ﴾ واتە: ئەو زاتەی خۆشەویسـتانی خۆشـیان دەوێ، خۆشویسـتنێک بە هیچ شـتێ ناچوێنرێ.

هـەروەک چـۆن هیـچ شـتێک بـەو زاتـە ناچوێنـرێ، لـە سـیفەتە بـەرزو جـوان‌و پڕماناو کردەوەکانیـدا، خۆشەویستیشـی لـە دڵـی دروسـتکراوە تایبەتمەندەکانیـدا لـە هیچ شـتێک ناچـێ، لـە جۆرەکانی خۆشەویسـتی.

لەبـەر ئەمـە خۆشەویسـتی ئـەو زاتە بنچینـەی بەندایەتیـە، ئەویش ئـەو خۆشەویسـتیەیە کە پێـش دەکەوێـت بەسـەر هەمـوو خۆشەویسـتیەکانداو زاڵ دەبـێ بەسـەریاندا، وە ئەگـەر خۆشەویسـتی جگـە لـەو زاتـە شـوێنی خۆشەویسـتی ئـەو زاتـە نەکەوێـت، ئـەوە دەبێتـە سـزا بـۆ خاوەنەکانیـان، ئەو زاتـە (الودود)ە خۆشەویسـتە بـە لای خۆشەویسـتانیەوە، وەک فەرموویەتـی: ﴿ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ ﴿٥٤﴾ ﴾ المائـدة، (واتـە: خـوا ئەوانـی خـۆش دەوێ، ئەوانیش

خوایــان خــۆش دەوێ)، (المودة): بریتیــە لــە خۆشەویســتیەکی پاک.
لەمــەدا نهێنیەکــی جــوان هەیــە، کاتــێ خوا (الــودود)ی بەســتاوەتەوە بــە (الغفور) تــا ببێتە بەڵگــە لەســەر ئەوەی کــە بە ڕاســتی گوناهبــاران ئەگەر داوای لێخۆشــبوون بکــەن لە خواو بگەڕێنــەوە بــۆ لای، لــە گوناهەکانیــان دەبورێو خۆشــیانی دەوێ، بــا نەوتــرێ: بەڵکو تەنها لــە گوناهەکانیــان دەبــورێ، خۆشەویســتی ئــەو زاتــە ناگەڕێتەوە بۆیــان، وەکو هەنــدێ لە هەڵــەکاران ئەو قســەیان کردوە.
بەڵکــو خــوا پێی خۆشــە بەندەکەی تەوبــە بکات، کاتــێ تەوبــە دەکاتو دەگەڕێتەوە، وەکو ئــەو کەســە پێی خۆشــە کە حوشــترێکی پــێ بێــتو خــواردنو خواردنەوەکانو ئەوەیشــی پێویســتە لەســەری داینابــێ، لە دەشــتێکی چۆڵو کاکــی بە کاکیــدا لێی وون ببێــت، وە بێ ئومێــد بــێ لــە گەڕانــەوەی، بچێتە ژێــر ســێبەری درەختێکــەوەو پــاڵ بکــەوێ، چاوەڕوانی مــردن بــکات، لــە کاتێکدا ئــەو بــەو حاڵەوەیە، تەماشــا بکاتو ببینێ حوشــترەکەی لەســەر ســەری وەســتاوە، ئەویــش ڕەشــمەکەی بگرێــت، خــوا زۆرتــر پێی خۆشــە لــە گەڕانەوەی بەندەکــەی بەم کەســەی کــە حوشــترەکەی دۆزیوەتــەوە، ئەمــەش مەزنترین خۆشەویســتیە کــە ئەنــدازە بکرێت. ســوپاسو ســتایشو خۆشەویســتی پــاکو پاڵفتــە تەنها بۆ خــوا، ئای چەنــدە مەزنــە چاکەکانی، چەنــدە زۆرە خێرو بەخششــەکانی، وە چەندە فراوانــە منەتەکانی!!
(١٥): ﴿ ذُو الْعَرْشِ الْمَجِيدُ ﴾ واتــە: خاوەنی عەرشــی مــەزنو پایەدارە لــە گەورەییو مەزنیدا، دەوری ئاســمانەکانو زەویو کورســی داوە، ئەوانــە لە چاو عەرشــدا وەکــو ئەڵقەیەک وان لە بیابانــی هەمــوو زەویــدا فــرێ بدرێ، خــوا عەرشــی تایبەت کــردوە بە باس کــردن بە هۆی مەزنیــەوە، چونکــە تایبەترینــی بەدیهێنراوەکانــە بــە نزیــک بوونــەوە لێــی، ئەمەش لەســەر خوێندنــەوەی (المجیــد) بــە (الجــر) ئــەوکات (المجیــد) دەبێتــە ســیفەت بۆ عــەرش. بەڵام لەســەر خوێندنــەوە بــە (الرفــع)، بێگومــان (المجیــد) دەبێتە ســیفەت بــۆ خــوا، (المجد)یش فراوانی ســیفەتەکانو مەزنترینیــان دەگرێتەوە.
(١٦): ﴿ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴾ واتــە: خوا ﷻ هەر شــتیکی بوێ دەیکات، ئەگەر ویســتو ئیرادەی شــتێ بــکات پێــی بڵێ: ببــە ئەویش دەســتبەجێ دەبــێ، هیچ کەســێک نیە هەرشــتێکی بوێ بیــکات جگە لــە خوا.
چونکــە بەڕاســتی بەدیهێنــراوەکان ئەگــەر شــتێکیان بــوێ ئــەوە پێویســتە بــۆ ئەنجامدانــی ویســتو ئیرادەیــان پشــتیوانو یارمەتیدەرێکیــان هەبــێ، بــەڵام خــوا نــە هیچ پشــتیوانێکی

هەیـە، نـە هیـچ یارمەتیدەرێـک بـۆ ویسـتو ئیـرادەی، وە هیـچ بەربەسـتێکی نیـە بۆ ئەو مەبەستە.

پاشـان باسـی هەنـدێ لـە کارەکانـی کـردوە کـە بەڵگـەن لەسـەر ڕاسـتی ئـەو پەیامـەی پێغەمبەرانـی پێـی هاتـوون، فەرموویەتـی:

(١٧-١٨): ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡجُنُودِ ١٧ فِرۡعَوۡنَ وَثَمُودَ﴾ (واتـە: ئایـا پێت گەیشـتووە باسـی بەسـەرهاتی لەشـکرەکانی * فیرعـەونو ثمـوود) کـە چـۆن پێغەمبەرانیان بـەدرۆ زانی، خوا گێرانـی بە لـە لەناوچووان.

(١٩): ﴿بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي تَكۡذِيبٍ﴾ بەردەوامـن لەسـەر بەدرۆزانینو عینـادی، نە ئایەتەکان سـوودی هەیـە بۆیان، نـە ئامۆژگاریـەکان کەڵکی هەیە.

(٢٠): ﴿وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطُۢ﴾ واتـە: خـوا بـە زانسـتو توانای خـۆی دەوری داون، وەک فەرموویەتـی: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ ١٤﴾ الفجـر، (واتـە: بـە ڕاسـتی پەروەردگـاری تۆ لە بۆسـەدایە بۆیان).

ئەمـە هەڕەشـەی تونـدی تێدایە بۆ بێبـڕواو کافران لە سـزای ئەوانەی لەبەر دەسـتی ئەودانو لە ژێـر بەڕێوەبردنیدان.

(٢١): ﴿بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٞ مَّجِيدٞ﴾ واتـە: (بەڵکـو ئـەو قورئانـە) ماناکانی بەرفـراوانو مەزنە، پڕە لە خێرو زانسـتی زۆر.

(٢٢): ﴿فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ﴾ (واتـە: لـە تابلۆیەکی پیـرۆزو پارێزراو دایە) لە گـۆڕانو زیادەو ناتـەواوی، پارێـزراوە لـە شـەیتانەکان، ئەویش (اللـوح المحفوظ)ە کـە هەموو شـتێکی تێدا جێگیـر کـردوە، ئەمـەش بەڵگەیە لەسـەر مەزنـی قورئانو بـەرزی پلەو ڕێزی لـە لای خوا، خـوا زاناترە.

تەفسیری سوورەتی (البروج) تەواو بوو.


سورة الطارق

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ (١) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ (٢) النَّجْمُ الثَّاقِبُ
(٣) إِن كُلُّ نَفْسٍ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ (٤) فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ (٥)
خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ (٦) يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ (٧) إِنَّهُ عَلَىٰ
رَجْعِهِ لَقَادِرٌ (٨) يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ (٩) فَمَا لَهُ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ
(١٠) وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ (١١) وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ (١٢) إِنَّهُ
لَقَوْلٌ فَصْلٌ (١٣) وَمَا هُوَ بِالْهَزْلِ (١٤) إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا (١٥)
وَأَكِيدُ كَيْدًا (١٦) فَمَهِّلِ الْكَافِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًا (١٧)

## تەفسیری سوورەتی (الطارق)

## مەككییە (١٧) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٣): خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ﴾ (واتە: سوێند بە ئاسمانو ئەوەی لە شەودا دەردەكەوێ)، پاشان دەركەوتنی ڕوون كردوەتەوەو بە فەرمایشتی خۆی: ﴿ ٱلنَّجۡمُ ٱلثَّاقِبُ ﴾ واتە: (ئەستێرەی) ڕووناككەرەوە كە ڕووناكیە كەی ئاسمانەكان دەبڕێ تا لە زەویەوە دەبینرێ، بۆچوونی ڕاست ئەوەیە ئەوە ناوی ڕەگەزە هەموو ئەستێرەكان دەگرێتەوە، وە وتراوە: ئەوە ئەستێرەی زوحەلە كە ئاسمانەكانی بڕیوەو دەبینرێ، وە ناونراوە بە دەركەوتوو (طارق) چونكە لە شەودا دەردەكەوێ.

(٤): سوێند لەسەر خوراو فەرمایشتی خوایە، كە فەرموویەتی: ﴿ إِن كُلُّ نَفۡسٖ لَّمَّا عَلَيۡهَا حَافِظٞ ﴾ (واتە: سوێند بە خوا هەموو كەسێك چاودێرێكی بەسەرەوەیە)، كردەوە چاكو خراپەكانی دەپارێزێ، وە لە داهاتوودا پاداشت دەدرێتەوە بە پێی ئەو كردەوەی بۆی پارێزراوە.

(٥-٨): ﴿ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴾ واتە: (كەواتە با ئادەمیزاد) سەرنجی دروستكردنی بدات، چونكە بێگومان ئەو دروستكراوە، ﴿ مِن مَّآءٖ دَافِقٖ ﴾ (واتە: لە ئاوێكی هەڵقوڵاو) ئەویش ئەو مەنیەیە كە، ﴿ يَخۡرُجُ مِنۢ بَيۡنِ ٱلصُّلۡبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴾ دەگونجێ ئەو مەنییە دەربچێ لە ناوەندی پشتی پیاوو دانە پەراسووی سنگی ژنەوە، وە دەگونجێ مەبەست: لە مەنی هەڵقوڵاو: مەنی پیاو بێ، ئەو جێگایەی كە لێی دەردەچێ ناوەندی پشتو سنگی بێت، پێدەچێ ئەمە لە پێشتر بێت، چونكە بێگومان خوا ﷻ وەسفی پێكردوە بە ناوی هەڵقوڵاو، ئەوەیشی هەستی پێدە كرێو دەبینرێ،

کـە هەڵبقـوڵاو کتوپـڕ دەربچـێ مەنـی پیـاوە، بـە هەمـان شـێوە، وشـەی (الترائـب) بێگومـان ئـەوە بەکاردەهێنـرێ بـۆ پیـاو، چونکـە بێگومـان (الترائـب) بـۆ پیـاو بـە مانـای هـەردوو مەمکـی مێینـە دێـت، ئەگـەر مەبەسـت پێـی مێینـە بووایـە، دەیفەرمـوو: (مـن بـین الصلـب والثدیـین) واتـە: لـە نێـوان پشـتو هـەردوو مەمکـی. وە وێنـەی ئـەوە، خـوا زاناتـرە. جـا ئـەو زاتـەی ئینسـانی هێناوەتـە بـوون لـە ئاوێکـی هەڵقـوڵاو، کـە لـەو شـوێنە سـەختو قورسـەوە دەردەچێـت، بـە دەسـەڵاتە لەسـەر زیندووکردنـەوەی لـە ڕۆژی دواییـدا بـۆ پاداشـت دانـەوە، وتـراوە: بێگومـان خـوا بـە دەسـەڵاتە لەسـەر گەڕانـەوەی ئـەو ئـاوە هەڵقـوڵاوە لـە پشـتی ئینسـاندا، ئەمـەش -ئەگەرچـی ماناکەیشـی ڕاسـتە- بـەڵام مەبەسـتەکە ئەمـە نیـە لـە دەقەکـەدا، بۆیـە لـە دوای ئـەوە فەرموویەتـی:

(٩): ﴿ يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ ﴾ (واتـە: لـە ڕۆژێکـدا) تاقـی دەکرێتـەوە نهێنـی نـاو سـینەکان، ئاشـکرا دەکـرێ ئـەوەی لـە دڵەکاندایـە لـە خێـرو شـەڕ لەسـەر ڕووی ڕووخسـارەکان، خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ يَوۡمَ تَبۡيَضُّ وُجُوهٞ وَتَسۡوَدُّ وُجُوهٞ ﴿١٠٦﴾ ﴾ آل عمـران (واتـە: ڕۆژێـک دێـت کـە چەنـد ڕوویـەک سـپی دەبـن، وە چەنـد ڕوویـەک ڕەش دەبـن).

جـا لـە دونیـادا زۆرێ لـە کاروبـارەکان دەشـاردرێنەوە، خەڵکـی بـە چـاو نایانبینـێ، بـەڵام لـە ڕۆژی دواییـدا چاکـەی چاکـەکارانو خراپـەی بـەدکاران دەردەکـەوێ، هەمـوو کارەکانیـش ئاشـکرا دەبـن.

(١٠): ﴿ فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٖ ﴾ (واتـە: ئـەو نەهێزێـک شـک دەبـات) ڕێگـری پـێ بـکات لـە نەفسـی خـۆی، ﴿ وَلَا نَاصِرٖ ﴾ (وە نـە پشـتیوانێکی) دەرەکـی یارمەتـی لێوەربگـرێ، ئـەم سـوێند خواردنـە لەسـەر حاڵـی کرێکارانـە لـە کاتـی کارکردنیـانو کاتـی پاداشـتیان.

(١١-١٢): لە پاشـان سـوێندی خوارد، سـوێندی دووەم لەسـەر ڕاسـتی قورئانە، جا فەرمووی: ﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجۡعِ ﴿١١﴾ وَٱلۡأَرۡضِ ذَاتِ ٱلصَّدۡعِ ﴾ (واتـە: سـوێند بـە ئاسـمانی خـاوەن گەڕانەوە) بە فەرمانـی خـوا هەمـوو سـاڵێک ئاسـمان بـاران دەگەڕێنێتـەوە، وە زەویش قڵیـش دەبات بۆ ڕووەکو گژوگیـاکان، بـەو شـێوەیە ئادەمیـزادو ئاژەڵـەکان پێـی دەژیـن، هەروەهـا بـە فەرمانـی خـوا ئاسـمان دەگەڕێتەوە بە قـەدەرو کاروبـارە خواییەکان لە هەمـوو کاتێکدا، وە زەوی قڵیـش دەکاتو درزی تێـدەکات لـە مردووەکان.

(١٣): ﴿ إِنَّهُۥ ﴾ واتـە: قورئـان، ﴿ لَقَوۡلٞ فَصۡلٞ ﴾ واتـە: وتـەی حـەقو ڕاسـتو ڕوونو ڕەوانـە.

(١٤): ﴿ وَمَا هُوَ بِٱلْهَزْلِ ﴾ واتــە: قورئــان ڕاســتە، بەبــێ هــودە نەنێــردراوە، ئــەوە قســەیەکە نێوانــی هەمــوو دەســتەکانو دژیەکــەکان جیادەکاتــەوە.

(١٥): ﴿ إِنَّهُمْ ﴾ واتــە: بەدرۆدانەرانــی پێغەمبــەرو قورئــان، ﴿ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴾ (واتــە: فێــڵ دەکــەن چــۆن فێــڵ کردنێــک) بــۆ ئــەوەی حەقــی پــێ ڕەت بکەنــەوەو پشــتیوانی پووچــی پــێ بکــەن.

(١٦): ﴿ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴾ (واتــە: منیــش نەخشــە دەکێشــم بــۆ هەڵوەشــاندنەوەی فێڵەکانیــان چــۆن نەخشەکێشــانێک) بــۆ دەرکەوتنــی حــەق، ئەگــەر چــی بێبڕوایانیش پێیــان ناخۆش بێــت، وە بــۆ ڕەت کردنــەوەی ئــەوەی ئــەوان هێناویانــە لــە پــووچ، تــا دەربکــەوێ کــێ زاڵــە، بێگومــان ئادەمــی لاوازتــرو بــێ نرختــرە لــەوەی زاڵ بــێ بەســەر خــوای بەهێــزی زانــا لــە نەخشــەو پلانــدا.

(١٧): ﴿ فَمَهِّلِ ٱلْكَٰفِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًۢا ﴾ واتــە: (ئنجــا مۆڵەتــی بێبــڕواکان بــدە لێیــان بوەســتە) کەمێــک، لــە داهاتــوودا ســەرەنجامی کارەکانیــان دەزانــن کاتــێ ســزایان بــۆ دادەبــەزێ.

تەفسیری سوورەتی (الطارق) تەواو بوو.


سُورَةُ الأَعْلَى
بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ① ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ② وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ
③ وَٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلْمَرْعَىٰ ④ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحْوَىٰ ⑤ سَنُقْرِئُكَ
فَلَا تَنسَىٰٓ ⑥ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ إِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلْجَهْرَ وَمَا يَخْفَىٰ ⑦ وَنُيَسِّرُكَ
لِلْيُسْرَىٰ ⑧ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ ⑨ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ ⑩

## تەفسیری سوورەتی (الأعلى)
## مەككییە (١٩) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-١٩): ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴿١﴾ ٱلَّذِى
خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِىٓ
أَخْرَجَ ٱلْمَرْعَىٰ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحْوَىٰ ﴿٥﴾
سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ﴿٦﴾ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ إِنَّهُۥ يَعْلَمُ
ٱلْجَهْرَ وَمَا يَخْفَىٰ ﴿٧﴾ وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٨﴾ فَذَكِّرْ
إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكْرَىٰ ﴿٩﴾ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ ﴿١٠﴾
وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلْأَشْقَى ﴿١١﴾ ٱلَّذِى يَصْلَى ٱلنَّارَ ٱلْكُبْرَىٰ
﴿١٢﴾ ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿١٣﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن
تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ بَلْ تُؤْثِرُونَ
ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٧﴾ إِنَّ هَٰذَا لَفِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ
وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾﴾:

﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴿١﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ﴾ خـوا ﷻ فەرمـان دەكات بـە تەسـبیح كردنـی كـە زیكـرو یادو پەرسـتش‌و ملكەچ بـوون بۆ مەزنـی لەخۆ دەگرێ، تەسـبیح‌و ستایشـێك بـێ شـیاو بـێ بـە مەزنی خـوا، بەوەی یـادی نـاوە جوانـە بەرزەكانی بكـەن بۆ هـەر ناوێ، بـە مانـای جـوان‌و مەزنـی خـۆی، وە یـادی كارەكانـی بكـەن، لەوانـە: ئـەو زاتـە هەموو بەدیهێنراوەكانـی دروسـت كـردوەو ڕێكـی خسـتوون، واتـە: بـە وردەكاری‌و پتـەوی‌و چاكتریـن شـێوە دروسـتی كـردوون، ﴿وَٱلَّذِى قَدَّرَ﴾ (واتـە: وە ئـەو زاتـەی ئەنـدازەی كێشـاوە) بـە ئەندازەكێشـانێك هەمـوو ئەنـدازە كراوەكان شـوێنی دەكـەون، ﴿فَهَدَىٰ﴾ (ئنجـا ڕێنمایـی) هەمـوو بەدیهێنراوەكانـی كرد.

ئـەم ڕێنمایـی‌و هیدایەتـە گشـتگیرە، ناوەڕۆكەكـەی ئـەوە دەگەیەنـێ ئـەو زاتـە ڕێنمایی هەمـوو بەدیهێنراوەكانـی كردوە بـۆ بەرژەوەندیەكانیان، وە تێیدا باسـی نیعمەتـە ئاینیەكانی كـردوە، وە لەبەر ئەمەیە دەربـارەی فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلْمَرْعَىٰ﴾ واتە: لە ئاسـمانەوە

بارانـی بارانـد، جۆرەهـا گژوگیاو ڕووەکی سـەوز کـرد، خەڵکی سـوودیان لـێ وەرگرت بۆ بژێـوی خۆیـانو ئاژەڵەکانیـان، وە سـەرجەم گیانلەبەرەکانی دیکە.

پاشـان دوای ئـەوەی تـەواوی کرد ئەوەی کـە ئەندازەی کردبـوو لە لاوێتـی، گژوگیاکەی وشـک کـردەوەو لـەتو پەتـی کـردن، ﴿ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحۡوَىٰ ﴾ (واتـە: ئنجـا کـردی بـە پووشـێکی) ڕەش، واتـە: لەت لەتو پەرشو بـڵاوی کرد، وە باسـی نازونیعمەتە ئاینیەکانی کـردوە تیایـدا، ئا لەبـەر ئەمەیە خـوا ﷻ منەتی کـردوە بە بنچینـەو شـوێنی دەرهێنانی، کە ئەویـش قورئانە، فەرموویەتـی: ﴿ سَنُقۡرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ﴾ واتە: ئەوەی سروشـمان بۆت کردوە لـە قورئـان دەیپارێزیـن، دڵتـی پێ ئـاوەدان دەکەینـەوە، هەرگیز بیـرت ناچێتـەوە، ئەمەش مژدەیەکـی گەورەیـە بۆ بەنـدەو پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ، کە بەڕاسـتی خوا زانسـتێکی فێـر دەکات بیـری ناچێتـەوە، ﴿ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ ﴾ (واتـە: مەگەر ئـەوەی کە خـوا بیەوێت) لـەوەی حیکمەتـی خواسـتبێتی لەبیـرت بباتـەوە لـە بـەر بەرژەوەندیەکـی گەورەتر ﴿ إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ وَمَا يَخۡفَىٰ ﴾ (واتـە: بێگومـان ئـەو بـە هەموو شـتێکی ئاشـکراو پەنهان ئاگـادارە)، لەوانـەش: ئـەو زاتـە دەزانێ چ شـتێ بـۆ بەندەکانی گونجـاوە، ئا لەبـەر ئەوەیە شـەریعەتیان بـۆ دادەنێـت بەو جـۆرەی کە بیـەوێ، وە بڕیاریـش دەدات بەوەی کـە دەیەوێ، ﴿ وَنُيَسِّرُكَ لِلۡيُسۡرَىٰ ﴾ هەروەهـا ئەمـەش مژدەیەکـی گەورەیـە، کـە خـوا ﷻ یارمەتـی پێغەمبەرەکەی دەدات بـۆ ڕێگـای ئاسـان لـە هەمـوو کاروبارەکانـی، وە ئایـنو شـەریعەتەکەی ئاسـان کـردوە، ﴿ فَذَكِّرۡ ﴾ ئامۆژگـاری بکە بە شـەریعەتی خواو ئایەتو نیشـانەکانی، ﴿ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكۡرَىٰ ﴾ مـادام یادخسـتنەوەو ئامۆژگـاری وەرگیـراوەو گـوێ لێگیراوە، یەکسـانە ئەگەر هەمـوو ئامۆژگـاریو یادخسـتنەوەکان بەدەسـت بێن، یـان هەندێکیان.

مەفهومـی ئایەتەکـە ئەوەیـە: بێگومـان ئەگـەر ئامۆژگـاریو یادخسـتنەوە هیچ سـوودێکی نەگەیانـد، بـەوەی کـە ئامۆژگاریەکـە شـەڕو خراپـە زیـاد بکات، یـان خێـرو چاکە کەم بـکات، ئەوە ئـەو ئامۆژگاریو یادخسـتنەوەیە فەرمانی پێنەکراوە، بەڵکـو قەدەغەی لێکراوە.

جـا ئامۆژگـاریو یادخسـتنەوە خەڵکـی تیایـدا دەبـن بـە دوو بەشـەوە: ئەوانەی سـوودیان وەرگرتـووە خـوا باسـی کـردوونو فەرموویەتـی: ﴿ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخۡشَىٰ ﴾ (واتـە: بێگومـان ئـەوەی لـە خـوا بترسـێ پەنـدی لێوەردەگـرێ)، بێگومان ترسـان لە خـواو زانینـی ئەوەی خـوا پاداشـتی دەداتـەوە لەسـەر کردەوەکانی، ئەوە پێویسـت دەکات لەسـەر بەندە دەسـت هەڵبگـرێ لە سـەرپێچیو کۆشـش بـکات بـۆ چاکەکان.

وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلْأَشْقَى ﴿١١﴾ ٱلَّذِى يَصْلَى ٱلنَّارَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿١٢﴾ ثُمَّ لَا يَمُوتُ
فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿١٣﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾
بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٧﴾ إِنَّ
هَٰذَا لَفِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾

بەڵام ئەوانەی سوودیان لێ وەرنەگرتووە، خوا باسی کردوونو فەرموویەتی: ﴿ وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلْأَشْقَى ﴿١١﴾ ٱلَّذِى يَصْلَى ٱلنَّارَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴾ (واتە: ئەوەی زۆر خراپیش بێت خۆی لێی دوور دەخاتەوە * ئەوەی دەچێتە ناو ئاگری هەرە گەورە) ئەویش ئاگرێکی هەڵگیرساوی خواییە کە ڕوویان لێدەکاتو دەیانسووتێنێ.

﴿ ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴾ واتە: بەردەوام سزا دەدرێ تیایدا بەبێ حەوانەوەو پشوو، تەنانەت ئەوان ئاواتی مردن دەخوازن مردنیشیان بۆ دەست نادات، وەکو خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا۟ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا ﴿٣٦﴾ ﴾فاطر، (واتە: بڕیاری مردن نادرێ بەسەریاندا تا بمرن، هەروەها هەندێ لە سزای دۆزەخیان لێ سووک ناکرێ)، ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴾ واتە: بە ڕاستی سەرکەوتوو سەرفراز بوو ئەو کەسەی نەفسی خۆی پاک ڕاگرتووە لە هاوبەشدانانو ستەم کردنو خوڕەوشتی خراپ، ﴿ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴾ واتە: وەسف کراوە بە زیکری خوا دڵیشی بەو زیکرە ڕەنگ کردوە، ئەو زیکر کردنە پێویستی کردوە لەسەری کارێک بکات بە پێی ڕەزامەندی خوا بێت، بە تایبەت نوێژ کە تەرازووی ئیمانە، ئەمە مانای دەقە پیرۆزەکەیە.

بەڵام ئەو کەسەی فەرمایشتی خوا ﷻ ﴿ تَزَكَّىٰ ﴾ شیکردوەتەوە بە مانای زەکاتی سەرفترە، وە ﴿ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴾ بە مانای نوێژی جەژن، بێگومان ئەگەرچی لەناو ئەم فەرمایشتە هەندێ وردەکاری تری تێدایە، ئەوە تەنها ئەو مانایە ناگەیەنێ.

﴿ بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴾ واتە: (بەڵکو ئێوە ژیانی دونیا) پێش دەخەن بەسەر

دواڕۆژدا، وە نازونیعمەتـی لـە نـاو چـوو فەوتـای پـڕ لـە مانـدوو بـوون هەڵدەبژێـرن بەسـەر دواڕۆژدا.

﴿ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ ﴾ کەچـی ژیانـی دواڕۆژ چاکتـرە لـە دونیـا، لـە هەمـوو وەسـفێکی خـوازراو، ﴿ وَأَبۡقَىٰٓ ﴾ (پایەدارتـرە) چونکـە ماڵـی مانـەوەی هەمیشـەیی‌و پاکـە، دونیاش ماڵـی فەوتـان‌و لـە ناوچوونـە.

بـڕواداری ژێـر خـراپ‌و بێنـرخ هەڵنابژێـری بەسـەر چـاک‌و بە نرخـدا، لەزەتی سـاتێک ناگۆڕێتـەوە بـە خۆشـی هەمیشـەیی، بـە ڕاسـتی خۆشویسـتنی دونیـاو پێشخسـتنی بەسـەر دواڕۆژدا سـەرچاوەی هەمـوو گونـاەو هەڵەیەکـە، ﴿ إِنَّ هَٰذَا ﴾ (بـە ڕاسـتی ئەمـەی) باسـکراوە بۆتـان لـەم سـووڕەتە پیـرۆزەدا لـە فەرمـان‌و هەواڵـە چاکـەکان، ﴿ لَفِي ٱلصُّحُفِ ٱلۡأُولَىٰ ١٨ صُحُفِ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴾ (واتـە: لـە نامـە پێشـووەکاندایە* نامەکانـی ئیبراهیـم‌و مووسـا) کـە ئەوانـە بەڕێزترینـی پێغەمبـەران بـوون، جگـە لـە پێغەمبـەر موحەممـەد ﷺ.

ئـا ئەمانـە کۆمەڵـە فەرمانێکـن لـە هەمـوو شـەریعەتێکدا هـەن، چونکـە دەگەڕێتـەوە بـۆ بەرژەوەنـدی هـەردوو دونیـا، هەروەهـا بەرژەوەندیـە لـە هەمـوو سـەردەم‌و شـوێنێکدا.

تەفسیری سووڕەتی (الأعلی) تەواو بوو.


بسم الله الرحمن الرحيم
هل أتاك حديث الغاشية ١ وجوه يومئذ خاشعة ٢ عاملة
ناصبة ٣ تصلى نارا حامية ٤ تسقى من عين آنية ٥ ليس
لهم طعام إلا من ضريع ٦ لا يسمن ولا يغني من جوع ٧ وجوه
يومئذ ناعمة ٨ لسعيها راضية ٩ في جنة عالية ١٠ لا تسمع
فيها لاغية ١١ فيها عين جارية ١٢ فيها سرر مرفوعة ١٣ وأكواب
موضوعة ١٤ ونمارق مصفوفة ١٥ وزرابي مبثوثة ١٦ أفلا ينظرون
إلى الإبل كيف خلقت ١٧ وإلى السماء كيف رفعت ١٨ وإلى
الجبال كيف نصبت ١٩ وإلى الأرض كيف سطحت ٢٠
فذكر إنما أنت مذكر ٢١ لست عليهم بمصيطر ٢٢

## تەفسیری سوورەتی (الغاشیة)

## مەككییە (٢٦) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-١٦): ﴿ هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَٰشِيَةِ ١
وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ ٢ عَامِلَةٞ نَّاصِبَةٞ ٣
تَصۡلَىٰ نَارًا حَامِيَةٗ ٤ تُسۡقَىٰ مِنۡ عَيۡنٍ ءَانِيَةٖ ٥
لَّيۡسَ لَهُمۡ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٖ ٦ لَّا يُسۡمِنُ
وَلَا يُغۡنِي مِن جُوعٖ ٧ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاعِمَةٞ ٨
لِّسَعۡيِهَا رَاضِيَةٞ ٩ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٖ ١٠ لَّا
تَسۡمَعُ فِيهَا لَٰغِيَةٗ ١١ فِيهَا عَيۡنٞ جَارِيَةٞ ١٢ فِيهَا
سُرُرٞ مَّرۡفُوعَةٞ ١٣ وَأَكۡوَابٞ مَّوۡضُوعَةٞ ١٤ وَنَمَارِقُ
مَصۡفُوفَةٞ ١٥ وَزَرَابِيُّ مَبۡثُوثَةٌ ١٦ ﴾:

﴿ هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَٰشِيَةِ ﴾ واتــە: خــوا ﷻ باســی بارودۆخــی ڕۆژی دوایــی دەكات، وە ئەوەشــی تیایدایــە لــە ناخۆشــیە مەزنــەكان، ئــەو ڕۆژە بەدیهێنــراوەكان دادەپۆشــێ بەســەختیەكانی، جــا پاداشــت دەدرێنــەوە بــە كردەوەكانیــانو دەبــن بــە دوو دەســتەوە: دەســتەیەك لــە بەهەشــتو دەســتەیەكی دیكــە لــە دۆزەخ.

جا هەواڵیداوە دەربارەی وەســف كردنی هەریەك لەو دوو دەســتەیە، لە وەســفی دۆزەخیاندا فەرموویەتــی: ﴿ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ ﴾ واتــە: (زۆر ڕووخســار) لــە ڕۆژی دواییدا، ﴿ خَٰشِعَةٌ ﴾ ترســناكو زەلیلو ڕیســواو شــەرمەزارە، ﴿ عَامِلَةٞ نَّاصِبَةٞ ﴾ واتە: ماندووە لە ســزادا، بەســەر ڕووخســاری ڕادەكێشــرێ، وە ئاگــر دەمو چاویــان دادەپۆشــێ. وە دەگونجــێ مەبەســت لــە فەرمایشــتی خــوا: ﴿ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ ٢ عَامِلَةٞ نَّاصِبَةٞ ﴾ لــە دونیــادا بێــت، چونكە لە دونیــادا ئەهلــی پەرســتشو كاركــردن بــوون، بــەڵام بە هــۆی نەبوونــی مەرجەكــەی -كە ئەویــش بڕواهێنانــە- لــە ڕۆژی دواییدا پــەرشو بڵاوبووەتەوە.

ئــەم گریمانەیــە ئەگەرچــی لــەڕووی واتــاوە ڕاســتیش بێــت، میانــەی دەقەكــە ئامــاژە نیە بــۆ ئــەوە، بەڵكــو ڕاســتو بــڕاوە گریمانــەی یەكەمە، چونكــە بەســتویەتیەوە بــە (الظرف)

ئەویش ڕۆژی قیامەتە، وە لەبەر ئەوە مەبەست لێرەدا ڕوونکردنەوەی وەسفی دۆزەخیانە بە گشتی، ئەو گریمانەش بەشێکی کەمە لە دۆزەخیان لە چاو هەموو دۆزەخیەکاندا، وە لەبەر ئەوە ڕستەکە لە میانەی ئاشکرا کردنی حاڵی خەڵکیدا هاتووە، کاتێ ئەو ڕۆژە سەختە دایان دەپۆشێت، هیچ ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی تێدانیە دەربارەی حاڵیان لە دونیادا.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿تَصۡلَىٰ نَارًا حَامِيَةٗ﴾واتە: گەرمیەکەی زۆر سەختە لە هەموو لایەکەوە دەوریان دەدات، ﴿تُسۡقَىٰ مِنۡ عَيۡنٍ ءَانِيَةٖ﴾(واتە: ئاو دەدرێن لەسەرچاوەی) زۆر گەرمو بە کوڵ، ﴿وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٖ كَٱلۡمُهۡلِ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَ ٢٩﴾الكهف، (واتە: وە ئەگەر لە تینوانا هاواری ئاو بکەن ئاوێکیان بۆ دەهێنرێ وەک مسی تواوە وایە ڕوو دەمو چاوەکان دەبرژێنێ) ئەمە خواردنەوەکانیانە.

بەلاّم خواردنەکانیان: ﴿لَّيۡسَ لَهُمۡ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٖ ٦ لَّا يُسۡمِنُ وَلَا يُغۡنِي مِن جُوعٖ﴾ (واتە: خۆراکیان هەر دڕکی وشکو تاڵو تفتە * نە قەڵەویان دەکاتو نە برسێتیان لادەبات) جا مەبەست لە خواردن یەکێکە لەم دووانە:

یان ئەوەیە ڕێگری لە برسێتی خاوەنەکەی دەکاتو ئازاری ناهێڵا، یان ئەوەیە جەستەی بەهێز دەکات لە لاوازی، ئەم خواردنەش شتێکی تێدانیە لەم دووانە، بەڵکو خواردنێکە لەوپەڕی تاڵیو تفتیو ناخۆشیدایە، داوای سەلامەتی لە خوا ﷻ دەکەین.

بەلاّم چاکەکاران ڕووخساریان لە ڕۆژی دواییدا، ﴿نَّاعِمَةٞ﴾واتە: جوانی نازونیعمەتیان پێوە دیارە، بۆیە جەستەیان گەشاوەتەوەو ڕووخساریان ڕووناکەو لە ئەوپەڕی خۆشیدایە، ﴿لِّسَعۡيِهَا﴾ئەو کۆششەی لە دونیادا پێشی خستووە، لە کردەوە چاکەکانو چاک بوون لەگەڵ بەندەکانی خوادا، ﴿رَاضِيَةٞ﴾واتە: کاتێ کە دەبینێ پاداشتەکەی بە چەند قات بۆی هەڵگیراوە، ئنجا ستایشی دەرەنجامی خۆی دەکات، ئەوەیشی ئاواتی پێ دەخوازێ بۆی دەستەبەر دەبێت، چونکە ئەو کەسە ﴿فِي جَنَّةٍ﴾واتە: لە بەهەشتێکدایە هەموو نازونیعمەتەکانی تێدا کۆکراوەتەوە ﴿عَالِيَةٖ﴾جێگاو پلەو پایەی بەرزە لەوپەڕی بەرزیدایە، تەلارو کۆشکەکانی بەرزن، نهۆم لەسەر نهۆم بەسەر ئەوی دیکەدا دەڕوانێ، لەوەی خوا بۆی ئامادە کردوون لە ڕێزو حورمەت، ﴿قُطُوفُهَا دَانِيَةٞ ٢٣﴾الحاقة، (واتە: میوەی نزیکە دەستە) واتە: پڕە لە میوەی بەتامو خۆش، بەرهەم هێنراوە بەو بەرهەمە چاکانەی کە بە ئاسانی لێ دەکرێتەوە، بە هەر جۆرێ بیانەوێ دەستیان پێی

دەگـات، نـە پێویسـت دەکات سـەر بکەونە سـەر دار، یـان بەرهەمێکیان لـێ گیر ببێ.
﴿ لَّا تَسۡمَعُ فِيهَا ﴾ واتە: (نابیسـتی) بەهەشـت، ﴿ لَٰغِيَةٗ ﴾ واتە: قسـەی پڕوپووچ، سـەرەڕای قسـەی قەدەغەکـراو، بەڵکـو قسـەکانیان قسـەی چـاکو بە سـوودن، گشـتگیرن لەسـەر یـادی خـواو یـادی نازونیعمەتـە یـەک لـە دوایەکەکانـی، وە لەسـەر ئـەدەبو ڕەوشـتی جـوان لـە نێـوان یەکتـردا، ئەو زاتـە دڵەکانـی فـراوان کـردوە، ﴿ فِيهَا عَيۡنٞ جَارِيَةٞ ﴾ ئەمەش نـاوی ڕەگـەزە، واتـە: سـەرچاوەی کانیـاوی ڕەوانـی تێدایـە، کـە بە هـەر جۆرو بـە هەر شـێوەیەک بیانـەوێ ئـەو ئـاوە دەگێـڕن، ﴿ فِيهَا سُرُرٞ مَّرۡفُوعَةٞ ﴾ وە (السـرر) کۆی (سـریر)ە ئەویـش تەختـو قەنەفەی بـەرز لە خۆدەگـرێ لە خودی خۆیدا، وە ئەوەیشـی لەسـەریەتی لـە ڕاخەری نـەرمو نیانو ناسـک، ﴿ وَأَكۡوَابٞ مَّوۡضُوعَةٞ ﴾ واتـە: پەرداخی پڕکـراو لە جۆرەها خواردنـەوەی بە لـەزەت، کە دانراوە لەبەردەسـتیانداو ئامـادە کراوە بۆیان، لە ژێر ویسـتو فەرمانـی ئەواندایـە، منداڵانـی هەمیشـە زیندوو بەسـەریاندا دەیگێـڕێ، ﴿ وَنَمَارِقُ مَصۡفُوفَةٞ ﴾ پشـتی لـە ئاوریشـمی تەنـکو ئەسـتوورو جگـە لەوانیـش، کـەس نایزانـێ جگە لـە خوا، ڕیـز کـراون بـۆ دانیشـتنو پاڵدانـەوە، وە پشـوویان پێدراوە لـەوەی کە خۆیـان دای بنێنو ڕیـزی بکـەن، ﴿ وَزَرَابِيُّ مَبۡثُوثَةٌ ﴾ (الزرابي) بریتیە لـە ڕاخەری زۆر جوانو سـەرنجڕاکێش، (مبثوثـة) واتـە: کۆڕو مەجلیسـەکانی پـێ ڕازێنراوەتـەوە لە هەمـوو لایەکەوە.

(١٧-٢٦): ﴿ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلۡإِبِلِ كَيۡفَ خُلِقَتۡ ١٧ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيۡفَ رُفِعَتۡ ١٨ وَإِلَى ٱلۡجِبَالِ كَيۡفَ نُصِبَتۡ ١٩ وَإِلَى ٱلۡأَرۡضِ كَيۡفَ سُطِحَتۡ ٢٠ فَذَكِّرۡ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٞ ٢١ لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ ٢٢ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ٢٣ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَكۡبَرَ ٢٤ إِنَّ إِلَيۡنَآ إِيَابَهُمۡ ٢٥ ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا حِسَابَهُم ٢٦ ﴾:

خـوا ﷻ هانـی ئەوانـە دەدات کـە پێغەمبـەر ﷺ بـە ڕاسـت نازانـن، وە جگـە لەوانیـش لـە خەڵکـی، بیـر بکەنەوە لـە بەدیهێنراوەکانی، کە بەڵگەن لەسـەر یەکتاپەرسـتی ئـەو زاتە، جا دەفەرمـوێ: ﴿ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلۡإِبِلِ كَيۡفَ خُلِقَتۡ ﴾ واتە: ئایا بۆ سـەرنجی دروسـتکردنی حوشـتر نـادەن، چـۆن خـوا ڕامـی کـردوە بـۆ بەنـدەکانو زەلیلـی کـردوە بـۆ سـوودە زۆرەکانیـان کـە پێویسـتیان پێیەتی.

﴿ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيۡفَ رُفِعَتۡ ﴾ (واتە: وە لە ئاسمان کە چۆن بەرز کراوەتەوە).

﴿ وَإِلَى ٱلۡجِبَالِ كَيۡفَ نُصِبَتۡ ﴾ (واتـە: وە لـە شـاخەکان کە چـۆن داکوتراون) بـە جوانترین شـێواز، زەوییـان پـێ جێگیر بووەو چەسـپاوە لـە لەرزین، خـوا ﷻ چەندین سـوودو مەزنی

تیایانـدا داناوە، ﴿ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴾ واتە: ڕایخســتووە بە ڕاخســتنێکی بەرفراوانو ئاســانی کــردوە بە ئەوپەڕی ئاســان کــردن، تا بەدیهێنراوەکان لەســەر پشــتی بحەســێنەوەو جێگیــر بــن، وە بتوانن شــتی تێــدا بکێڵنو بچێنو خانووی لەســەر دروســت بکــەن، وە ئەو ڕێگایانــە بگرنــە بەر کــە دەیانگەیەنێ بــە مەبەســتەکانیان، بزانــە بێگومان ڕاخــراوی زەوی پێچەوانــەی ئــەوە نیــە کــە خــڕو بازنەییــە، گــەردوون لــە هەمــوو لایەکــەوە دەوری داوە، وەک چــۆن نەقــڵو عەقــڵو هەســتەوەریو بینیــن بەڵگــەن لەســەر ئــەوە، هــەروەک چۆن باســکراوەو ناســراوە لــە لای زۆرێ لە خەڵکی، بە تایبەت لەم ســەردەمەی خەڵکی وەســتاون لەســەر زۆرێ لــە تەنیشــتەکانی، بەوەی خــوا ﷻ پێیداون لــەو هۆکارانەی کــە دوور نزیک دەکەنەوە.

جــا بێگومــان ڕاخراوی لــە کاتێکدا پێچەوانەی خــڕو بازنەییە ئەگەر زۆر بچــووک بێت، کە ئەگــەر ڕابخــرێ ئەوە خــڕیو بازنەیی لە دەســت دەدات، بەڵام جەســتەی زەوی لە ئەوپەڕی گەورەیــیو فراوانیدایــە هەم خــڕو بازنەییە هــەم ڕاخراوە، ئــەم دووانــەش پێچەوانەی یەکتر نیــن، وەک چۆن زانراوە لــە لای خەڵکانی خاوەن ئەزمــوون، ﴿ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴾ واتــە: کەوابــوو بیری خەڵــک بهێنــەوەو ئامۆژگاریــان بکەو بیانترســێنەو مژدەیــان بدەرێ، چونکــە بەڕاســتی تــۆ نێــردراوی بــۆ بانگەواز کردنــی خەڵک بــۆ لای خــوا، وە ئامۆژگاری کردنیــان، تــۆ نەنێردراوی بــە زاڵ بوون بەســەریاندا، وەکیلــی کردەوەکانیان بیت.

ئەگــەر هەســتایت بەوەی لە ئەســتۆتە ئــەوە دوای ئەوە سەرزەنشــت ناکرێــی، وەک خوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ ۖ فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾ ﴾ق، (واتە: تۆ دەســەڵاتت بەســەریاندا نیــە، کەواتــە: تــۆ بــەم قورئانــە ئامۆژگاری ئەو کەســە بکــە کە لە هەڕەشــەی من دەترسێ)،

إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ٢٣ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ ٢٤
إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ٢٥ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ٢٦

﴿ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴾ واتــە: بــەڵام ئــەو کەســەی کــە پشــت هەڵــدەکات لــە گوێڕایەڵــیو بێبــڕوا بــوون بــە خــوا ﴿ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ ﴾ (واتــە: ئــەوە خــوا ســزای دەدات بــە ســزایەکی) ســەختی بــەردەوام، ﴿ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴾ واتــە: (بــە ڕاســتی هــەر بــۆ لای ئێمەیــە) گەڕانــەوەی دروســتکراوەکان، وە کۆکردنەوەیــان لــە ڕۆژی قیامەتــدا، ﴿ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴾ (واتــە: پاشــان بــە ڕاســتی لێپرســینەوەیان لەســەر ئێمەیــە) جا لێپرســینەوەیان لــێ دەکەین لەســەر ئەوەی کردوویانــە لــە چاکــەو خراپــە.

تەفسیری سوورەتی (الغاشية) تەواو بوو.



سُورَةُ الفَجْرِ
بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
وَالْفَجْرِ (١) وَلَيَالٍ عَشْرٍ (٢) وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ (٣) وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ (٤)
هَلْ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِي حِجْرٍ (٥) أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ (٦)
إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ (٧) الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ (٨) وَثَمُودَ الَّذِينَ
جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ (٩) وَفِرْعَوْنَ ذِي الْأَوْتَادِ (١٠) الَّذِينَ طَغَوْا فِي
الْبِلَادِ (١١) فَأَكْثَرُوا فِيهَا الْفَسَادَ (١٢) فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ
عَذَابٍ (١٣) إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ (١٤) فَأَمَّا الْإِنسَانُ إِذَا مَا ابْتَلَاهُ
رَبُّهُ فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ (١٥) وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلَاهُ
فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَهَانَنِ (١٦) كَلَّا بَل لَّا تُكْرِمُونَ
الْيَتِيمَ (١٧) وَلَا تَحَاضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ (١٨) وَتَأْكُلُونَ
التُّرَاثَ أَكْلًا لَّمًّا (١٩) وَتُحِبُّونَ الْمَالَ حُبًّا جَمًّا (٢٠) كَلَّا إِذَا
دُكَّتِ الْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا (٢١) وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا (٢٢)

## تەفسیری سوورەتی (الفجر)

## مەککییە (٣٠) ئایەتە

### بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٥): ﴿ وَالْفَجْرِ (١) وَلَيَالٍ عَشْرٍ (٢) وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ (٣) وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ (٤) هَلْ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِي حِجْرٍ (٥) ﴾

﴿ وَالْفَجْرِ (١) وَلَيَالٍ عَشْرٍ (٢) وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ ﴾ بە ڕواڵەت سوێند پێخوراو سوێند لەسەر خوراوە، ئەویش دروستەو بەکارهاتوە ئەگەر کارێکی ئاشکراو گرنگ بێت، ئەویش بەو شێوەیە لەم جێگایەدا.

خوا ﷻ سوێندی خواردووە بە بەرەبەیان کە کۆتایی شەوو سەرەتای ڕۆژە، لەوەی لە پشت هەڵکردنی شەوو هاتنی ڕۆژ چەندین بەڵگەی تێدایە لەسەر تەواوی دەسەڵاتی خوا، ئەو زاتە بەتاکو تەنها هەر خۆی بەڕێوەبەری هەموو کاروبارەکانە، ڕەوا نیە پەرستش بکرێ مەگەر بۆ ئەو.

وە لە بەرەبەیاندا نوێژێکی مەزنی تێدەکەوێن، شیاوی ئەوەیە سوێندی پێ بخورێ، لەبەر ئەمەیە بەدوایدا سوێندی بە دە شەوەکە خواردوە، ئەویش لەسەر بۆچوونی تەواو: دە شەوی ڕەمەزانە، یان دە شەوی (ذي الحجة)یە، بەڕاستی ئەوانە شەوانێکی گشتگیرن لەسەر ڕۆژانێکی چاک، چونکە پەرستش‌و نزیک بوونەوەیان تێدا ئەنجام دەدرێ کە لە ڕۆژوو شەوەکانی دیکە بەو جۆرە نیە.

وە لە دە شەوی ڕەمەزاندا شەوی قەدری تێدایە کە چاکترە لە هەزار مانگ، لە ڕۆژەکانیدا بە ڕۆژوو بوونی کۆتایی ڕەمەزانە، کە پایەیەکە لە پایەکانی ئیسلام.

وە لە دە ڕۆژەکانی (ذي الحجة)دا وەستان لە عەرەفەی تێدایە، کە خوا ئەوەندە لە بەندەکانی خۆش دەبێ شەیتانی پێ خەمبار دەبێ، هەرگیز شەیتان نەبینراوە بە بێ نرخی‌و

سەرشـۆڕی ئەوەنـدەی ڕۆژی عەرەفە، کاتێک کـە دەبینێ لە دابەزینی فریشـتەکانو میهرەبانی خـوا بـۆ سـەر بەندەکانـی، وە زۆرێ لـە کارەکانی حـەجو عەمـرە دەکەوێتە ناویـەوە، ئا ئەم شـتانە مەزنـن، شـیاوی ئـەوەن سـوێندیان پـێ بخـورێ ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَسۡرِ﴾، (واتە: سـوێند بە شـەو) کاتێ ڕۆیشـتنو خاوبونـەوەی تاریکیەکانی لەسـەر بەنـدەکان، دەحەوێنەوەو پشـوو دەدەنو دڵنیـا دەبن، ئەمـەش میهرەبانـیو حیکمەتێکە لەلایەن خـواوە، ﴿هَلۡ فِي ذَٰلِكَ﴾ واتە: ئایا ئەوانەی باسـکران ﴿قَسَمٞ لِّذِي حِجۡرٍ﴾ (واتە: شـیاوی سـوێند خواردن نین) لەلای کەسـی عاقـڵ؟ بەڵـێ، هەنـدێ لەوە بەسـە بۆ کەسـێ کـە دڵی هەبـێ، یان گـوێ ڕابخاتو شـایەت بێت.

(٦-١٤): ﴿أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ٦ إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ ٧ ٱلَّتِي لَمۡ يُخۡلَقۡ مِثۡلُهَا فِي ٱلۡبِلَٰدِ ٨ وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُواْ ٱلصَّخۡرَ بِٱلۡوَادِ ٩ وَفِرۡعَوۡنَ ذِي ٱلۡأَوۡتَادِ ١٠ ٱلَّذِينَ طَغَوۡاْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ١١ فَأَكۡثَرُواْ فِيهَا ٱلۡفَسَادَ ١٢ فَصَبَّ عَلَيۡهِمۡ رَبُّكَ سَوۡطَ عَذَابٍ ١٣ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ ١٤﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ﴾ (واتـە: ئایا نابینی) بـە دڵو بەرچاو ڕوونیـت، پەروەردگاری تـۆ چی کـرد بـەم ئوممەتە یاخـیو سەرکێشـە، ئەویـش ﴿إِرَمَ﴾ ئەو هـۆزە ناسـراوەیە لە یەمـەن ﴿ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ﴾ واتـە: خاوەنی دەسـەڵاتێکی بەهێـزو یاخیو خۆبەزلـزان بوون.

﴿ٱلَّتِي لَمۡ يُخۡلَقۡ مِثۡلُهَا﴾ (واتـە: کـە وێنەیان دروسـت نەکرابوو) وێنـەی عاد، ﴿فِي ٱلۡبِلَٰدِ﴾ واتـە: لـە هەموو وڵاتـدا لە ڕووی هێـزو توونديـەوە، هەروەکـو پێغەمبەرەکەیـان هوود ﷺ فەرموویەتـی: ﴿وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ جَعَلَكُمۡ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعۡدِ قَوۡمِ نُوحٖ وَزَادَكُمۡ فِي ٱلۡخَلۡقِ بَصۜۡطَةٗۖ فَٱذۡكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٦٩﴾ الأعـراف، (واتـە: وە بیـری چاکەکانـی خـوا بکەنـەوە کاتـێ ئێـوەی کرد بە جێنشـین لـە پاش گەلـی نووح، وە لـەشو قەڵافەتـی ئێوەی لـەوان گەورەتـر دروسـت کرد، کەواتـە: بیری چاکـەو بەهرەکانی خـوا بکەنەوە بـۆ ئەوەی ڕزگارتـان ببێ).

﴿وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُواْ ٱلصَّخۡرَ بِٱلۡوَادِ﴾ واتـە: (چـی کـرد بـە گەلی ثمود) ئەوانەی کـە بەهێزی خۆیـان شـاخی بەردینیـان دەتاشـیو دەیانکـرد بـە جێگای نیشـتەجێ بـوون، ﴿وَفِرۡعَوۡنَ ذِي ٱلۡأَوۡتَادِ﴾، واتـە: فیرعەونی خاوەن سـوپا، کـە موڵکەکەیـان جێگیر کردبـوو، هەروەکو چۆن مێخـەکان دادەکوترێـن بۆ هەر شـتێ بیـەوێ پێی ببەسـتێتەوە.

﴿ٱلَّذِينَ طَغَوۡاْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ﴾ (واتـە: ئەوانـەی لـە وڵاتـی خۆیانـدا یاخـی بـوون) ئـەم وەسـفە دەگەڕێتـەوە بۆ گەلی عـادو ثمـوودو فیرعەونو ئەوانەی شـوێنیان کەوتـوون، بێگومان ئەوان

ستەمیان بەرپا کرد لە وڵاتی خوادا، وە بەندەکانی خوایان ئازاردا لە دینو دونیایان، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ فَأَكْثَرُواْ فِيهَا ٱلْفَسَادَ ﴾ (واتە: جا خراپەو گوناهی زۆریان ئەنجامدا) ئەویش بێبڕوایی‌و بەشەکانێتی لە هەموو ڕەگەزەکانی سەرپێچی، وە کۆششیان کرد لە بەرپەرچدانەوەی پێغەمبەرانو ڕێگری خەڵکیان کرد لە ڕێگای خوا، جا کاتێ گەیشتنە ئەوپەڕی یاخیبوون کەوا پێویست بوو لەناو ببرێن، خوا سزاو خەشمو قینی خۆی بۆیان ناردو تەفروو تونای کردن ﴿ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلْمِرْصَادِ ﴾ (واتە: بە ڕاستی پەروەردگاری تۆ لەکەمیندایە) بۆ کەسێ سەرپێچی بکات، مۆڵەتی دەدات بۆ ماوەیەکی کەم، پاشان تۆڵەی لێ دەسەنێ بە تۆڵەسەندنی کەسێکی بەهێزی بە توانا.

(١٥-٢٠): ﴿ فَأَمَّا ٱلْإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَٰنَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّا ۖ بَل لَّا تُكْرِمُونَ ٱلْيَتِيمَ ﴿١٧﴾ وَلَا تَحَٰٓضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿١٨﴾ وَتَأْكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكْلًا لَّمًّا ﴿١٩﴾ وَتُحِبُّونَ ٱلْمَالَ حُبًّا جَمًّا ﴿٢٠﴾ ﴾

دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلْإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی سروشتی ئادەمیزاد لەو ڕووەی کە هەیە، بێگومان ئەو نەفامو ستەمکارە، هیچ زانستێکی نیە بە دەرەنجامەکان، ئەو دۆخەی بەسەریدا دێ وا دەزانێ بەردەوامەو لاناچێت، وا گومان دەبات کە ڕێزگرتنی خوا لە دونیاداو پێدانی نازونیعمەتەکانی بەسەریەوە، بەڵگەیە لەسەر ڕێزداری‌و نزیکی ئەو لە خواوە.

بێگومان ئەو ئەگەر ﴿ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ ﴾ واتە: (ڕزقو ڕۆزی) تەنگ کردەوە، بە ئەندازەی بژێوی بوو لێی زیاد نەدەبوو (ئەوسا دەڵێ) بە ڕاستی ئەمە سەرزەنشتو لۆمەکردنە لەلایەن خواوە، خوا ﷻ ئەم گومانەی ڕەت کردۆتەوە بە سەریدا، بە وتەی خۆی: ﴿ كَلَّا ﴾ واتە: مەرج نیە هەر کەسێ کە نازونیعمەتم پێدابێ بەڕێز بێ لەلام، وە هەرکەسێکیش ڕزقو ڕۆزیم لەبەر تەنگ کردبێ ئەوە سەرزەنشت کراوێ لەلام، بەڵکو دەوڵەمەندی‌و هەژاری، خۆشی‌و بەرتەنگی‌و بەڵاو تاقیکردنەوەیە کە لەلایەن خواوە، بەندەکانی پێ تاقی دەکاتەوە، تا ببینێ کێ سوپاسگوزاری دەکاتو کێ خۆڕاگر دەبێ، پاداشتی بداتەوە لە سەری بە پاداشت دانەوەیەکی بێ پایان، لەوەی بەو شێوەیە نیە، دەیگوازێتەوە بۆ سزای سەخت.

هەروەها ئەگەر ورەو هیممەتی بەندە بە تەنها وەستابێ لەسەر داواکاری نەفسو دەروونی، ئەوە لە لاوازی هیممەتو ورەیە، لەبەر ئەمەیە خوا سەرزەنشتی کردوون لەسەر گرنگی نەدانیان بە دۆخی ئەو کەسانەی کە هەژارو نەدارن، فەرموویەتی: ﴿ كَلَّا ۖ بَل لَّا تُكْرِمُونَ

ٱلْيَتِيمَ ﴾ (واتــە: نەخێــر بەڵکــو ئێــوە ڕێــز ناگــرن لــە هەتیــوو) ئــەو کەســەی کــە باوکــو کاســبکارەکەی لە دەســتداوە، پێویســتی بە دڵڕاگرتنو چاکەکردنــە لەگەڵیدا، جــا ئێوە ڕێزی لــێ ناگــرن، بەڵکــو سەرزەنشــتو ســەرکۆنەی دەکــەن، ئەمــەش بەڵگەیــە لەســەر نەبوونــی ڕەحمــەتو میهرەبانــی لەنــاو دڵیــان، وە حەزنەکــردن لە خێــرو چاکە.

﴿ وَلَا تَحَٰٓضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴾ واتە: هەندێکتان هانی هەندێکی دیکە نادەن لەســەر بەخشــینو خواردەمەنیــدان بە هــەژارانو نەداران، ئەویش بــە هۆی چروکیو ڕەزیلــی لە ماڵی دونیــاو زۆر خۆشویســتنی زاڵە بەســەر دڵەکاندا، لەبەر ئەمەیــە فەرموویەتی: ﴿ وَتَأْكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ ﴾ واتــە: ماڵــی میرات ئەوەی کــە ماوەتــەوە (دەیخــۆن)، ﴿ أَكْلًا لَّمًّا ﴾ واتە: بە پەلــەو هیچی لــێ ناهێڵنــەوە ﴿ وَتُحِبُّونَ ٱلْمَالَ حُبًّا جَمًّا ﴾ (واتــە: وە ماڵو ســامانتان خۆش دەوێــت بە خۆشویســتنێکی) زۆر ســەخت، ئەمــەش وەک وتەی خــوا وایە کــە فەرموویەتی: ﴿ بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٧﴾ ﴾الأعلى، (واتــە: بەڵکــو ئێوە ژیانی دونیــا هەڵدەبژێــرن * کەچــی ژیانــی دواڕۆژ باشــترو پایەدارتــرە)، ﴿ كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ ﴿٢٠﴾ وَتَذَرُونَ ٱلْـَٔاخِرَةَ ﴿٢١﴾ ﴾القیامـة، (واتــە: زینــدوو کردنــەوە هەر دەبــێ بەڵکو ئێوە ژیانــی دونیاتان خــۆش دەوێ * گــوێ بە ڕۆژی دوایــی نادەن).

(٢١-٣٠): ﴿ كَلَّآ إِذَا دُكَّتِ ٱلْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا ﴿٢١﴾ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴿٢٢﴾ وَجِا۟ىٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ ۚ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ ﴿٢٣﴾ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِى قَدَّمْتُ لِحَيَاتِى ﴿٢٤﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى ﴿٢٩﴾ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ﴿٣٠﴾ ﴾

﴿ كَلَّآ ﴾ واتــە: هەمــوو ئەوانــەی کــە خۆشــتان دەوێ، لــە مــاڵو ســامانەکانو کێبرکێی لە پێنــاودا دەکەن لە خۆشــیو لەزەتــەکان، بۆتــان نامێنێتەوەو بــەردەوام نابێت، بەڵکــو ڕۆژێکی مــەزنو مەترســیەکی گەورە لە پێشــتانە، لەو ڕۆژەدا کێــوو زەویو ئەوەی لەســەریەتی دەدەن بــە یەکــدا، تــا دەبێ بە زەویەکی ســافی بــێ گژووگیا، هیــچ خــوارو نارێکیەکی تێــدا نامێنێ. وە خــوا ﷻ دێــت بــۆ یــەکلای کردنــەوەی دادوەری کردن لە نێــوان بەندەکانیدا لــە ناو چەند پارچــە هەورێکی ســپیدا، وە فریشــتە بەڕێزەکانیــش دێن، هەمــوو ئەوانەی لە ئاســمانەکاندان بــە گشــتی، ﴿ صَفًّا صَفًّا ﴾ واتــە: ڕیز لــە دوای ڕیز، هەر ئاســمانێ فریشــتەکانی دێــن بەڕیز دەوری بەدیهێنــراوەکان دەدەن، ئــەم ڕیــز بەســتنانە ڕیــز بەنــدی ملکەچیو زەلیلیە بۆ پاشــای بە دەســەڵاتی بەهێز،

وَجِاْىٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَۚ يَوْمَئِذٖ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ
لَهُ ٱلذِّكۡرَىٰ ﴿٢٣﴾ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي ﴿٢٤﴾ فَيَوۡمَئِذٖ
لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيَّتُهَا
ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾
فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ﴿٢٩﴾ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾

﴿ وَجِاْىٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ ﴾ (واتە: وە لەو رۆژەدا دۆزەخ دەهێنرێ) فریشتەکان دۆزەخ دەهێنن بە زنجیرەکان.

جا کاتێ ئەمانە روویاندا: ﴿ يَوْمَئِذٖ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ ﴾ (واتە: لەو رۆژەدا ئادەمیزاد کردەوەی خۆی بیر دەکەوێتەوە) لەوەی پێشی خستووە لە خێرو شەڕ، ﴿ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكۡرَىٰ ﴾ (واتە: بەڵام ئەو بیرهێنانەوە چ سوودێک بەو دەگەیەنێ) بێگومان کاتو سەردەمی رۆیشتووەو نەماوە، ﴿ يَقُولُ ﴾ بە داخو حەسرەتەوە دەڵێ کەمتەرخەمیم کرد بۆ گەیشتن بە نزیکی خوا: ﴿ يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي ﴾ (واتە: خۆزگە لە دونیادا پێشم بخستایە بۆ ئەم ژیانە) بەردەوامو هەمیشەییە کاری چاک، وەک خوا فەرموویەتی: ﴿ يَٰقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيۡلَتَىٰ لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ فُلَانًا خَلِيلٗا ﴿٢٨﴾ ﴾ الفرقان، (واتە: وە دەڵێ خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا رێگای راستم بگرتایەتە بەر* ئای تیاچوون بۆ من خۆزگە فلان کەسم نەکردایە بە هاوەڵو خۆشەویستی خۆم).

هەروەها دەقەکە دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی بە راستی ئەو ژیانەی کە پێویستە کۆشش بکرێ بۆ بنچینەو تەواوێتی، وە لە تەواو کردنی لەزەتەکانی، ئەویش ژیانە لە ماڵی مانەوە کە ماڵی هەتاهەتاییو هەمیشەییە، ﴿ فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ ﴾ (واتە: ئنجا لەو رۆژەدا کەس سزای کەس نادات وەکو سزای خوا) بۆ کەسێ ئەو رۆژەی پشتگوێ خستبێو بیری چوو بێ کاری بۆ بکات.

﴿ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ ﴾ (واتە: وە کەس کەلەپچەی کەس ناکات وەک کەلپچە کردنی خوا)، بە راستی ئەوان کەلەپچە دەکرێن بە زنجیری ئاگرینو لەسەر روخساریان رادەکێشرێن لە ناو ئاوی زۆر گەرمو کوڵاودا، پاشان لە ناو ئاگردا

دەســوتێنرێن، ئەمــەش ســزای تاوانبارانــە.
بــەڵام ئــەو کەســەی کــە دڵنیایــە لــە خــواو بــڕوای پێهێنــاوەو پێغەمبەرەکانیشــی بەڕاســت دانــاوە، پێــی دەوتــرێ: ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴾ (واتــە: ئــەی نەفســی بــە ئــارام) بــۆ لای یــادی خــوا، لەگــەڵ خۆشەویســتی ئــەودا دەژی، کــە چــاوی بــەوە ئۆقــرەی گرتــووە، ﴿ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ ﴾ (واتــە: بگەڕێــرەوە بــۆ لای پەروەردگــاری خۆت) کــە بــە نیعمەتەکانــی پــەروەردەی کــردووی، وە چاکــەی خــۆی داباران‌ــدووە بەســەرتدا کــە بــە هۆیانــەوە بــووی بــە یەکێــک لــە دۆســـتو خۆشەویســتانی، ﴿ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴾ واتــە: ڕازیــە لــە خــوا، لەوەشــی ڕێــزداری کــردوە پێــی لــە پاداشــت، خــوای بەرزیــش لــەو ڕازی بــووە.
﴿ فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى ﴿٢٩﴾ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ﴾ (واتــە: ئنجــا بچــۆرە نــاو بەنــدە چاکەکانــی مــن * وە بچــۆرە بەهەشــتی منــەوە) ئەمــەش دواندنــە لەگــەڵ ڕۆحــدا لــە ڕۆژی دوایــی، وە دواندنیشــە لــە کاتــی مردنــدا.

تەفسیری سوورەتی (الفجر) تەواو بوو.


سورة البلد
بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ١ وَأَنتَ حِلُّۢ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٢ وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ
٣ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِى كَبَدٍ ٤ أَيَحْسَبُ أَن لَّن يَقْدِرَ عَلَيْهِ
أَحَدٌ ٥ يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالًا لُّبَدًا ٦ أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ
٧ أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ ٨ وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ ٩ وَهَدَيْنَٰهُ
ٱلنَّجْدَيْنِ ١٠ فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ ١١ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ ١٢
فَكُّ رَقَبَةٍ ١٣ أَوْ إِطْعَٰمٌ فِى يَوْمٍ ذِى مَسْغَبَةٍ ١٤ يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ
١٥ أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ ١٦ ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَوَاصَوْا۟
بِٱلصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْمَرْحَمَةِ ١٧ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ١٨

## تەفسیری سوورەتی (البلد)

## مەککییە (٢٠) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٢٠): ﴿ لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ (١) وَأَنتَ
حِلُّۢ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ (٢) وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ (٣) لَقَدْ
خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِى كَبَدٍ (٤) أَيَحْسَبُ أَن لَّن يَقْدِرَ
عَلَيْهِ أَحَدٌ (٥) يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالًا لُّبَدًا (٦)
أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ (٧) أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ
(٨) وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ (٩) وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ
(١٠) فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ (١١) وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ
(١٢) فَكُّ رَقَبَةٍ (١٣) أَوْ إِطْعَٰمٌ فِى يَوْمٍ ذِى مَسْغَبَةٍ
(١٤) يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ (١٥) أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ
(١٦) ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْمَرْحَمَةِ (١٧) أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ (١٨) وَٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ (١٩) عَلَيْهِمْ نَارٌ مُّؤْصَدَةٌۢ (٢٠) ﴾:

(١): ﴿ لَآ أُقْسِمُ ﴾ خوا ﷻ سوێند دەخوات، ﴿ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ﴾ (واتە: بەم شارە) پڕ لە ئاسایشە کە ئەویش مەککەیە، چاکترینی شارەکانە بە ڕەهایی، بە تایبەتی ئەو کاتەی کە پێغەمبەر ﷺ نیشتەجێ بوو تیایدا.

(٣): ﴿ وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ ﴾ واتە: بە ئادەمو نەوەکانی.

(٤): سوێند لەسەر خوراو فەرمایشتی خوایە کە فەرموویەتی: ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِى كَبَدٍ ﴾ (واتە: بەڕاستی ئادەمیزادمان دروست کردوە) (الكبد): دەگونجێ مەبەست لەمەدا ئەوە بێ کە تووشی نارەحەتیو سەغڵەتیو ناخۆشی دەکات لە سەختیەکانی ژیانی دونیا، وە لە بەرزەخیش، وە لە ڕۆژی قیامەت کاتێ شایەتەکان هەڵدەسنەوە.

بێگومان پێویستە لەسەری کۆشش بکات لە کاری چاکەدا تا پشووی پێبدات لەم نارەحەتیانە، وە خۆشیو شادی هەمیشەیی بۆ پێویست بکات، ئەگەر ئەمە نەکات، ئەوە بەردەوام لە نارەحەتیو سەغڵەتیو سزای سەختدا دەبێت بۆ هەمیشەیی.

دەگونجێ ماناکـەی ئەوە بێت: بەڕاسـتی ئادەمیزادمان دروسـت کـردوە بە جوانترین شـێوەو ڕاسـترین خولقانـدن، توانای هەیە بەسـەر بەڕێوەبردنی کارە سـەختەکان.
لەگـەڵ ئـەوەدا ئادەمیـزاد سوپاسـگوزاری خوای نەکردوە لەسـەر ئـەو نیعمەتە مەزنـە، بەڵکو لـووت بـەرزی کـردوە بە لەش سـاغیو خـۆی بـە گـەورە زانیـوە بەسـەر بەدیهێنەرەکەیدا، بـە هـۆی نەفامـیو سـتەمیەوە وای زانیوە ئـەم حاڵە هـەر بـەردەوام دەبێ بۆی، وە دەسـەڵاتی بەڕێوەبردنـی هەرگیـز لاناچـێ، لەبـەر ئەمەیە خـوا ﷻ فەرموویەتی:
(٥-٦): ﴿ أَيَحْسَبُ أَن لَّن يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٌ ﴾ (واتـە: ئایا وادەزانێ کە کەس دەسـەڵاتی بەسـەریدا نیـە) یاخی بێو شـانازی بـکات بەوەی بەخشـیویەتی لە ماڵو سـامان بۆ هەواو هەوەسـەکانی خـۆی، جـا ﴿ يَقُولُ أَهْلَكْتُ مَالًا لُّبَدًا ﴾ (واتە: بـە فیزەوە بڵـێ زۆرم لە ناو داوەو بەخشـیوە) واتە: مـاڵو سـامانێکی زۆر هەندێکی لەسـەر هەندێکی دیکە.
خـوا ﷻ ماڵ بەخشـینی لە پێناو هـەواو هەوەسو سـەرپێچیدا بە لەناوچوو باسـکردوە، چونکە ئەو کەسـەی دەیبەخشـێ سـوود لە بەخشـینەکە وەرناگرێ، وە ئەو بەخشـینەی بۆ ناگەڕێتەوە مەگـەر پەشـیمانیو زەرەرمەنـدیو مانـدوو بـوونو کەمی نەبێـت، نەک وەکو کەسـێ ماڵو سـامانی بەخشـیبێ لـە پێنـاو ڕەزامەندی خواو ڕێگـای چاکە، بەڕاسـتی ئەمـە بازرگانی لەگەڵ خـوادا کـردوە، وە قازانجی کـردوە بە چەندین ئەوەندە، لـە بەرانبەر ئەوەی بەخشـیویەتی، خوا هەڕەشـەی کردوە لەم کەسـەی شـانازی دەکات بـەوەی ماڵی بەخشـیوە لە هەواو ئـارەزوودا، فەرموویەتی:
(٧): ﴿ أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ ﴾ واتـە: وا دەزانـێ لـەم کارەیدا کە خوا نایبینێو لێپرسـینەوەی لەسـەر نـاکات لەسـەر بچـووکو گـەورە؟ بەڵکـو بەڕاسـتی خـوا بینیویەتـیو سـەرجەم کردەوەکانـی پاراسـتووە، وە فریشـتە بەڕێـزە نووسەرەکانیشـی بـە وەکالـەت دانـاوە، بـۆ تۆمارکردنـی هەمـوو ئەوانـەی کردوویەتـی لـە چاکـەو خراپە.
(٨-٩): پاشـان دانـی پێداناوە بـە نیعمەتەکانیو فەرموویەتـی: ﴿ أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ ۝٨ وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ ﴾ (واتـە: ئایـا دوو چاومان نەداوەتـێ * وە زمانێکو دوو لێـو) بۆ جوانیو بینینو دەربڕیـن، وە جگـە لەوانەش لە سـوودە گرنگـەکان تیایاندا، ئـا ئەمانە نازونیعمەتـی دونیان.
(١٠): پاشـان دەربـارەی نیعمەتـی دیـن فەرموویەتـی: ﴿ وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ ﴾ (واتـە: وە ڕێنماییمـان کـردوە بـۆ) هـەردوو ڕێگـای چاکەو خراپـە، هیدایـەتو گومڕایـیو ژیریو یاخیبوونمـان بـۆ ڕوون کردۆتـەوە، جا ئەم منەتە بێ پایانانە وا پێویسـت دەکات لەسـەر بەندە

کـە بـە مافەکانی خوا هەسـتێتو سوپاسـگوزاری بـکات لەسـەر نیعمەتەکانی، وە پشـتی پێ نەبەسـتێو بـەکاری نەهێنـی بـۆ سـەرپێچی کردنی، بـەڵام ئەم مرۆڤـە ئەمـەی نەکردوە.

(١١-١٣): ﴿ فَلَا ٱقۡتَحَمَ ٱلۡعَقَبَةَ ﴾ واتـە: (کەچـی زۆربـەی ئـەو خەڵکـە) نەیتوانیـوە بەسـەر کۆسـپو لەمپەرەکاندا زاڵ ببێو بەسـەریاندا تێ بپەڕێ، چونکە شـوێنی هـەواو ئارەزووەکانی کەوتـووە، ئـا ئـەم کۆسـپە زۆر سـەختە لەسـەری، پاشـان ڕاڤـەی ئەم کۆسـپەی کـردوە بە فەرمایشـتی خـۆیو فەرموویەتـی: ﴿ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴾ واتـە: ئازادکردنی کۆیلە لـە کۆیلایەتی، یان یارمەتیـدانو هـاوکاری کردنی لەسـەر جێبەجـێ کردنی گرێبەسـتەکەی، ئەوەی لە پێشـترە ئازادکردنـی مسـوڵمانێکی دیلە لـەلای بێبڕوایان.

(١٤-١٦): ﴿ أَوۡ إِطۡعَٰمٞ فِي يَوۡمٖ ذِي مَسۡغَبَةٖ ﴾ (واتە: ناندان لە ڕۆژی) برسـێتی سـەختو گرانیدا، بـەوەی خـواردن بدات بە کەسـانێک کـە زۆر پێویسـتیان پێیەتـی، ﴿ يَتِيمٗا ذَا مَقۡرَبَةٍ ﴾ واتە: کـۆی کردۆتەوە لە نێـوان ئەوەی هەتیوێکی هـەژارو خزمـە، ﴿ أَوۡ مِسۡكِينٗا ذَا مَتۡرَبَةٖ ﴾ (واتە: یـان هەژارێـک کە لە هەژاریدا) لەسـەر خۆڵ دانیشـتبێ بە هـۆی پێویسـتیو ناچاریەوە.

(١٧): ﴿ ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ واتـە: بڕوایـان هێنـاوە بە دڵیان، بەوەی پێویسـتە بڕوای پێ بهێنـرێ، وە بە ئەندامانی جەسـتەیان کـردەوەی چاکیان کردوە، بە هەموو قسـەو کردەوەیەکی پێویسـت یان پەسـند، ﴿ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ﴾ لەسـەر گوێڕایەڵی خواو لەسـەر پێچـی کردنی، وە لەسـەر قەزاو قـەدەرە بە ئێشـەکان، بـەوەی هەندێکیان هانـی هەندێکی دیکەیان دابێ لەسـەر ملکـەچ بـوون بـەوە، وە هێنانـی بـە تەواوەتیو بـە سـینگێکی فـراوانو نەفسـێکی ئارامەوە، ﴿ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡمَرۡحَمَةِ ﴾ (واتـە: ئامۆژگـاری یەکتریـان کردبـێ بە بەزەیـی) بـۆ بەدیهێنراو لە پێدانـی پێویسـتیەکانیانو فێرکردنـی نەفامەکانیان، وە هەسـتان بـەوەی پێویسـتیان پێیەتی لە هەمـوو ڕووەکانەوەو هـاوکاری کردنیان لەسـەر بەرژەوەندیە دینیو دونیاییـەکان، وە ئەوەی بـۆ خـۆی پێـی خۆشـە بـۆ ئەوانیـش پێـی خۆش بـێ، ئەوەیشـی بـۆ خـۆی پێی ناخۆشـە بۆ ئەوانیـش پێی ناخـۆش بێ.

(١٨): ئەوانـەی کـە هەسـتاون بەم وەسـفانە، ئەوانەن کە خوا سـەرکەوتووی کـردوون بە زاڵ بوونیان بەسـەر ئەم کۆسـپو بەربەسـتەدا ﴿ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴾ (واتە: هاوەڵانی دەسـتی ڕاسـتن) چونکـە هەرچـی خـوا فەرمانی پێکـردوە لـە مافەکانی خـۆیو مافـی بەندەکانـی جێبەجێیان کـردوە، وە وازیـان هێنـاوە لـەوەی قەدەغەیـان لێکـراوە، ئەمـەش ناونیشـانی خۆشـبەختیو نیشانەیەتی.

وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا هُمْ أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ ﴿١٩﴾ عَلَيْهِمْ نَارٌ مُؤْصَدَةٌ ﴿٢٠﴾

(١٩-٢٠): ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا﴾ (واتـە: وە ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون بـە موعجیـزەو نیشـانەکانی ئێمـە) بەوەی هەمـوو ئەمانەیان پشـت گوێ خسـتبێ، نـە خوایان بەڕاسـت نەزانیبـێ، نەبڕوایـان پێـی هێنابـێو نـە کـردەوەی چاکیـان کردبـێو نـە بەزەییان بـە بەندەکانـی خـوادا هاتبێتـەوە ﴿هُمْ أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ ﴿١٩﴾ عَلَيْهِمْ نَارٌ مُؤْصَدَةٌ﴾ (واتـە: ئەوانـە هاوەڵانـی دەسـتی چەپـن * دایگرتـوون ئاگرێکـی) دەرگـا لەسـەر داخـراو لە نـاو چەنـد کۆتێکی ڕاکشـاودا، لـە پشـتەوە دەرگاکەیان لەسـەر بەسـتراوە بۆ ئـەوەی نەکرێتـەوە، تا لـە تەنگەوەریو خـەمو پـەژارەو سـەختیدا بن.

**تەفسیری سوورەتی (البلد) تەواو بوو.**


بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا ١ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ٢ وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا
٣ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا ٤ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ٥ وَٱلۡأَرۡضِ
وَمَا طَحَىٰهَا ٦ وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ٧ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا
وَتَقۡوَىٰهَا ٨ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ٩ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا
١٠ كَذَّبَتۡ ثَمُودُ بِطَغۡوَىٰهَآ ١١ إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشۡقَىٰهَا ١٢ فَقَالَ لَهُمۡ
رَسُولُ ٱللَّهِ نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقۡيَٰهَا ١٣ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمۡدَمَ
عَلَيۡهِمۡ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمۡ فَسَوَّىٰهَا ١٤ وَلَا يَخَافُ عُقۡبَٰهَا ١٥

## تەفسیری سوورەتی (الشمس)

## مەككییە (١٥) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-١٥): ﴿ وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا ١ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ٢ وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا ٣ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا ٤ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ٥ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا طَحَىٰهَا ٦ وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ٧ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ٨ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ٩ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ١٠ كَذَّبَتۡ ثَمُودُ بِطَغۡوَىٰهَآ ١١ إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشۡقَىٰهَا ١٢ فَقَالَ لَهُمۡ رَسُولُ ٱللَّهِ نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقۡيَٰهَا ١٣ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمۡدَمَ عَلَيۡهِمۡ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمۡ فَسَوَّىٰهَا ١٤ وَلَا يَخَافُ عُقۡبَٰهَا ١٥ ﴾:

(١): خوا ﷻ سوێندی بەم ئایەتو نیشانە مەزنانە خواردووە لەسەر نەفسو دەروونی کەسانی رزگار بوو، وە جگە لەوانیش لە نەفسو دەروونە خراپەکان، جا فەرموویەتی: ﴿ وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا ﴾ (واتە: سوێند بە خۆرو) ڕووناکیەکەی، وە ئەو سوودانەی لێیەوە دەردەچن.

(٢): ﴿ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ﴾ (واتە: سوێند بە مانگ کاتێک) شوێنی خۆر دەکەوێت لە پلەو پایەکانو ڕووناکیدا، ﴿ وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا ﴾ (واتە: سوێند بە ڕۆژ کاتێک) هەموو سەرزەوی ڕووناک دەکاتەوە.

(٤): ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا ﴾ (واتە: سوێند بە شەوی) کە سەر زەوی دادەپۆشێ، ئەوەی لەسەر زەوی دەمێنێتەوە تاریک دەبێ.

جا یەک لە دوای یەک هاتنی تاریکیو ڕووناکیو خۆرو مانگ لەسەر ئەم جیهانەدا، بە یاساو ڕێساو وردبینی، وە ڕێکخستنی بۆ بەرژەوەندی بەندەکان، گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بەڕاستی خوا بە هەموو شتێک زانایە، وە بە دەسەڵاتە بەسەر هەموو

شـتێکدا، بەڕاسـتی تەنها ئـەو پەرسـتراوە، هەموو پەرسـتراوەکان جگە لەو زاتـە پووچن.
(٥): ﴿ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ﴾ دەگونجـێ کـە (مـا) (موصولـة) بێـت، ئـەو کات سـوێندەکە بـە ئاسـمانو دروسـتکەرەکەی دەبێـت، ئەویـش خوای بـەرزو مەزنـە، وە دەگونجـێ (ما) (مصدريـة) بێـت، جا ئەو کات سـوێندەکە بە ئاسـمانو دروسـت کردنێتی، کە لـە ئەوپەڕی پتـەوی‌و قایمـی‌و وردبینـی‌و چاکیدایە.
(٦): وە وێنـەی ئەوەش، فەرمایشـتی خوایە کە دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلْأَرْضِ وَمَا طَحَىٰهَا ﴾ واتە: (وە سـوێند بـە زەوی)و ئەوەی ڕایخسـتووە، ئـەوکات خەڵکـی دەتوانن سـوودی لێوەربگرن لە هەمـوو ڕووەکانی سـوود وەرگرتنەوە.
(٧): ﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴾ واتـە: (وە سـوێند بـە نەفس‌و ئـەوەی ڕێکـو پێـک بەدیهێناوە) پێدەچـێ مەبەسـت لـە نەفسـی هەمـوو بەدیهێنـراوە گیـان لەبـەرەکان بێـت، وەک ئـەم گشـتگیریە پشـتگیری لێـدەکات. وە هەروەهـا پێدەچێ مەبەسـت سـوێند خـواردن بێت بە نەفسـی ئادەمیـزادی ئـەرک پێسـپێردراو، بەبەڵگـەی ئـەو ڕسـتەی لە دوای خـۆی دێت.
هـەر چۆنێـک بێت، نەفـس نیشـانەیەکی گەورەیە لـە نیشـانەکانی خوا کە حەقـی خۆیەتی سـوێندی پـێ بخورێـت، بەڕاسـتی لـە ئەوپـەڕی نـەرمو نیانـی‌و بزێویـە، لە گواسـتنەوەو جوڵـەو گۆڕانو کاریگـەری بە پەلەدایـە، وە هەروەهـا هەڵچوونە دەروونیـەکان لە خەیاڵو ئیـرادەو مەبەسـتو خۆشەویسـتی‌و ڕق لێبوونـەوە، بەڕاسـتی ئەگـەر ئـەو نەفسـە لـە نـاو جەسـتەدا نەبووایـە، ئەوە جەسـتە دەبوو بـە پەیکەرێکی بێ سـوود، ڕێکخستنیشـی بەم جۆرە نیشـانەیەکە لە نیشـانە مـەزنو گەورەکانـی خـوای پەروەردگار.
((٨): ﴿ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴾ واتـە: ئنجـا بـە سـروش‌و وەحـی ئاگـاداری کـرد بـە بـەدکاری‌و پارێـزکاری خـۆی).
(٩): وە خـوای بەرز کـە دەفەرموێ: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴾ واتە: نەفسـی پاک کردوەتەوە لـە گونـاەو، پاڵفتـەی کـردوە لە کـەمو کـوڕی، بـەرزی کردوەتەوە بـە گوێڕایەڵـی خوا، بڵندیشـی کردوەتـەوە بە زانسـتی بە سـوودو کـردەوەی چاک.
(١٠): ﴿ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴾ واتـە: (ئادەمیـزاد) نەفسـی بەرێـزی شـاردەوە کـە حەق نیـە دایمرکێنێتـەوەو بیشـارێتەوە بـە پیـس کـردنو سـووک کردنـی، وە نزیککردنەوەی لـە ناتەواویـەکانو ئەنجامدانـی گوناهـەکانو، وازهێنان لـەوەی تەواوی دەکاتو گەشـەی پێـدەکات، وە بەکارهێنانـی ئەوەی ناشـرینو ڕیسـوای دەکات.

(١١): ﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَىٰهَآ ﴾واتــە: (بـڕوای نەهێنـا هـۆزی ثموود) بـە هـۆی یاخـی بوونیـانو خـۆ بـە بـەرز زانینیان لـە ئاسـتی حەقداو یاخـی بوونیـان لـە پێغەمبەرانـی خوا.

(١٢): ﴿ إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشْقَىٰهَا ﴾واتــە: (كاتـێ) كـە خراپترینـی هۆزەكـە بـە نـاوی: (قدار) كوڕی (سـالف) هەسـتایەوە بـۆ سـەربڕینی (حوشـترەكە)، وە هەموویـان یەكدەنگ بوون لەسـەر ئـەم (كارە خـراپ)ە، فەرمانیـان پێكـرد ئەویـش فەرمانەكەیانـی جێبەجـێ كرد (و سـەری بڕی).

(١٣): ﴿ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ ﴾(واتـە: ئنجـا) پێغەمبـەر صالح ﷺ ترسـاندنیو پێی گوتن: ﴿ نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقْيَٰهَا ﴾واتـە: بترسـن لە سـەربڕینی حوشـتری خوا، (ئەو حوشـترەی) كە خـوا كردوویەتـی بە نیشـانەیەكی مەزن، وە ڕووبـەڕووی نیعمەتی خوا مەبنەوە بەسـەرتانەوە بە شـیر وەرگرتن لێـی، نەك سـەری ببڕن.

(١٤-١٥): كەچـی بڕوایان بـە پێغەمبەر صاڵـح ﷺ نەكرد ﴿ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمْ ﴾(واتـە: جـا سـەریان بڕی) خوا لـە ناوی بردنو گشـتاندنی بە سـزاكەی، لـە سـەرروویانەوە دەنگێكی بۆ نـاردن، لە ژێریانیشـەوە بومەلـەرزەی بەتین، ئیتـر هەموویان لـە ماڵەكانیاندا لەسـەر ئەژنۆ كەوتـن، نـە هاوار كەرێكت دەبینی نـە وەڵامدەرێك.

﴿ فَسَوَّىٰهَا ﴾واتـە: (تەختـی كرد) بەسـەریاندا، یەكسـانی كـردن لە سـزادا، ﴿ وَلَا يَخَافُ عُقْبَٰهَا ﴾ واتــە: دەرئەنجامی.

وە چـۆن تـرس نابـێ لـە زاتێـك كـە زاڵ بێـت، لـە كاتێكـدا هیـچ بوونەوەرێك لـە ژێر دەسـەڵاتو بەڕێوەبردنـی ئـەو دەرناچێـت، كاربەجێیـە لە هەمـوو ئەوانەی بڕیاری لەسـەر داوەو كردوویەتـیو گێڕاویەتـی بـە شـەریعەت (بـۆ خەڵك).

تەفسیری سوورەتی (الشمس) تەواو بوو




## تەفسیری سوورەتی (اللیل)

## مەککییە (٢١) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١): ئەمە سوێند خواردنێکە لەلایەن خواوە بە کات، ئەو کاتەی کە کردەوەی بەندەکانی تێدەکەوێ لەسەر جیاوازی بارودۆخیان، جا فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ﴾ واتە: (سوێند بە شەو کاتێک خەڵکی دادەپۆشێ بە تاریکاییەکەی، هەر یەکە بۆ جێگای مانەوەو شوێنی پشوودانی دەڕوات، بەندەکانیش دەحەوێنەوە لە شەکەتی‌و ماندوو بوون.

(٢): ﴿ وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ﴾ (واتە: وە بە ڕۆژ کاتێک کە ڕووناک دەبێتەوە) بۆ خەڵکی، جا ڕووناکی لێوەردەگرن‌و بڵاودەبنەوە بە دوای بەرژەوەندیەکانیاندا.

(٣): ﴿ وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ ﴾ ئەگەر ئەم (ما)یە (موصوله) بێت ئەوە سوێند خواردنە بە نەفسی پیرۆزی وەسفکراوی (خوای پەروەردگار)، کە بەدیهێنەری نێرو مێیەکانە، وە ئەگەر (ما)ی (مصدريه) بێت ئەوە سوێند خواردنە بە دروستکردنی نێرو مێ.

تەواوی حیکمەت‌و کاربەجێی لەوەدا ئەوەیە هەموو جۆرێ لە گیانلەبەرانی دروستکردوە، کە مەبەستێتی نێرو مێ بمێنن، بۆ ئەوەی جۆرەکەی بمێنێ‌و فەوتانی بەسەر نەیێ، هەر یەکەیانی بۆ ئەوی دیکە بەڕێوەبردوە بە زنجیرەیەک ئارەزوو، وە هەر یەکەیانی گونجاو کردوە بۆ ئەوی دیکە، بەرزی‌و بڵندی بۆ ئەو خوایە کە چاکترینی بەدیهێنراوەکانە.

(٤): ﴿ إِنَّ سَعۡيَكُمۡ لَشَتَّىٰ ﴾ ئەمە سوێند لەسەر خوراوە، واتە: بە ڕاستی هەوڵ‌و کۆششی ئێوە ئەی ئەرک پێسپێردراوەکان جیاوازە بە جیاوازیەکی زۆر، ئەویش بە پێی جیاوازی خودی کردەوەکان‌و ئەندازەیان‌و چالاکی تیایاندا، بە پێی ئامانج‌و مەبەست بەو کردەوانە، ئایا لە پێناوی خوای بەرزدا بووە؟ ئەو کات کۆششەکەی بۆ دەمێنێتەوە،

خاوەنەکەیشی سوودی لێ وەردەگرێ، یان ئەوە ئامانجێکی فەوتاوی پەرش‌و بڵاوە کۆششەکەیش بەتاڵ دەبێتەوە بە بەتاڵ بوونەوەی (نیەتەکەی)، وە پەرش‌و بڵاو دەبێتەوە بە بڵاوبوونەوەی، ئەمەش (ئەنجامی) هەر کردەوەیەکە کە مەبەست تێیدا ڕەزامەندی خوا نەبێت.

(٥): لەبەر ئەمەیە خوا ﷻ وەسفی ئەوانەی کردوە کردەوە چاک دەکەن، هەروەها وەسفی کردەوەکانیانیشی کردوەو، فەرموویەتی: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ ﴾ واتە: ئەوەی فەرمانی پێکراوە لە پەرستشە ماڵیەکان، وەک زەکات‌و کەفارەت‌و خەرجی‌و خێرو بەخشینەکان لەو ڕووانەی کە چاکن، وە پەرستشە جەستەییەکان وەک نوێژو ڕۆژو وێنەی ئەوانە، وە ئەوەیشی پێکهاتووە لەو دووانە وەک حەج‌و عومرەو وێنەی ئەوانە، ﴿ وَٱتَّقَىٰ ﴾ لەوەی قەدەغەکراوە لێی، لە قەدەغەکراوەکان‌و سەرپێچیەکان لەسەر جیاوازی ڕەگەزیان.

(٦): ﴿ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴾ واتە: بڕوای هەبێ بە (لا إِلَهَ إلاَّ اللـه)، وە ئەوەیشی بەڵگەیە لەسەری لە هەموو بیروبڕوا دینیەکان، وە ئەوەیشی ڕێکخراوەو دانراوە لەسەریان لە پاداشت‌و سزای دوارۆژ.

(٧): ﴿ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ﴾ واتە: کارو فەرمانی بۆ ئاسان دەکەین، وە ئەنجامدانی هەموو خێرێک‌و وازهێنانیش لە هەموو خراپەیەکی بۆ ئاسان دەکەین، چونکە هۆکارەکانی ئاسان کردنی بەدەست هێناوە بۆیە خواش ئەوەی بۆ ئاسان کردوە.

(٨): ﴿ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ ﴾ (واتە: وە ئەو کەسەی چرووکی بکات) بەوەی خوا فەرمانی پێکردوە، واز لە بەخشینی پێویست‌و پەسند بهێنێ، وە ڕێگە نەدات بە نەفسی خۆی بە بەجێهێنانی ئەوەی پێویستە لەسەری، ﴿ وَٱسْتَغْنَىٰ ﴾ (بێنیاز بێ) لە خوا، وە بەندایەتی خوای وەلا خستبێ‌و وانەبینێ کە نەفس‌و دەروونی هەژارە بە ئەوپەڕی هەژار بوون بۆ لای پەروەردگاری، کە نە ڕزگاری دەبێ‌و نە سەرفرازو سەرکەوتوو دەبێ، مەگەر بەو جۆرەی کە خوا بکات بە خۆشەویست‌و پەرستراوی، وە ڕووی تێبکات‌و مەبەستی بێ.

(٩): ﴿ وَكَذَّبَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴾ (واتە: وە بڕوای نەبێ بە چاکە) بەوەی خوا پێویستی کردوە لەسەر بەندەکان دانی پێدا بنێن لە بیرو بڕوا چاکەکان.

فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡعُسۡرَىٰ ١٠ وَمَا يُغۡنِي عَنۡهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ ١١ إِنَّ عَلَيۡنَا
لَلۡهُدَىٰ ١٢ وَإِنَّ لَنَا لَلۡأٓخِرَةَ وَٱلۡأُولَىٰ ١٣ فَأَنذَرۡتُكُمۡ نَارٗا تَلَظَّىٰ ١٤
لَا يَصۡلَىٰهَآ إِلَّا ٱلۡأَشۡقَى ١٥ ٱلَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ١٦ وَسَيُجَنَّبُهَا
ٱلۡأَتۡقَى ١٧ ٱلَّذِي يُؤۡتِي مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ١٨ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعۡمَةٖ
تُجۡزَىٰٓ ١٩ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ٢٠ وَلَسَوۡفَ يَرۡضَىٰ ٢١

(١٠): ﴿ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡعُسۡرَىٰ ﴾ واتـە: حاڵەتـی سـەختو خوڕەوشـتی ناشـرینی بـۆ ئاسـان دەکەیـن لە هـەر کوێ بـێ، وە کـردەوەی خراپیـش دەکەیـن بە هاوڕێـی، (پەنا بە خوا دەگریـنو) داوای سـەلامەتی هـەر لـە خوا ﷻ دەکەیـن.

(١١): ﴿ وَمَا يُغۡنِي عَنۡهُ مَالُهُۥٓ ﴾ (واتـە: سـەروەتو سـامانەکەی سـوودی پـێ نەگەیانـد) ئـەو سـەروەتو سـامانەی کـە یاخیو بێنیـازی کردو ڕەزیلـی تێدا دەکرد، کاتـێ کـە لەناوچـوو مرد بـە ڕاسـتی هیچ شـتێک لەگەڵیـدا نایـەت جگە لـە کردەوە چاکەکانـی نەبێـت.
بەڵام ئەوماڵەی مافی پێویستی لێدەر نەکردوە ئەوە دەبێتە بەڵا بەسەریەوە لە ڕۆژی دواییدا، ئەگەر شتێکی بۆ خۆی پێش نەخستبێ.

(١٢): ﴿ إِنَّ عَلَيۡنَا لَلۡهُدَىٰ ﴾ واتـە: بەدڵنیایـی ڕێنماییو ڕێگەی ڕاسـت (خاوەنەکەی) دەگەیەنێ بـە خـواو نزیکی دەکاتـەوە لە ڕەزامەندی خـوا، بەڵام گومڕایـیو ڕێگاکانی بـەرەو لای خوا داخـراوە، خاوەنەکەی تەنها بە سـزایەکی سـەخت دەگەیەنێ.

(١٣): ﴿ وَإِنَّ لَنَا لَلۡأٓخِرَةَ وَٱلۡأُولَىٰ ﴾ (واتـە: هـەردوو جیهـان هـی ئێمەیـە) بـە موڵـکو هەڵسـوڕاندنەوە، هیـچ هاوبەشـێکی نیـە لـەو دوو جیهانـەدا، دەی بـا حەزکـەران سـوور بن لەسـەر داواکـردن لـەو زاتـە، وە بـا ئومێدیـان لـە بەدیهێنـراوەکان بپچڕێنـن.

(١٤): ﴿ فَأَنذَرۡتُكُمۡ نَارٗا تَلَظَّىٰ ﴾ واتـە: (مـن ئێـوەم ترسـاند بـە ئاگرێـک) بڵێسـە دەداتو گڕ دەگرێت.

(١٥-١٦): ﴿ لَا يَصۡلَىٰهَآ إِلَّا ٱلۡأَشۡقَى ١٥ ٱلَّذِي كَذَّبَ ﴾ بە هەواڵ، ﴿ وَتَوَلَّىٰ ﴾ لە فەرمان.

(١٧-١٨): ﴿ وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلۡأَتۡقَى ١٧ ٱلَّذِي يُؤۡتِي مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ﴾ (واتـە: وە لێی دوور دەکەوێتەوە کەسـی زۆر پارێـزکار * ئـەوەی ماڵـی خۆی دەبەخشـێ تا پـاک ببێتەوە) بەوەی مەبەسـت لـەم بەخشـینە پاککردنـەوەی نەفـسو دەروونـی بێـت، وە پاکردنـەوەی بێـت لـە گوناهو

کـەم‌و کوڕیـەکان، تەنها مەبەسـتی پێـی ڕەزامەندی خـوا بێت.

ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی بێگومـان ئەگـەر بەخشـینی پەسـند وازهێنـان لـە واجبێکـی لەخـۆ گرتبـوو، وەک قـەرزو نەفەقـەو خەرجـی‌و وێنـەی ئەوانە، ئەوە دروسـت نیـە، بەڵکو بەخشـینەکەی ڕەتکراوەتـەوە لەلای زۆرێک لە زانایـان، چونکە پاک نابێتـەوە بە ئەنجامدانی سـوننەت کە واجـب‌و پێویسـتی لە دەسـت بچێت.

(١٩): ﴿ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعۡمَةٖ تُجۡزَىٰٓ ﴾واتـە: هیـچ کـەس لـە بەدیهێنـراوەکان چاکەی نیە بەسـەر ئەم کەسـە پارێزکارەوە کە پاداشـت بدرێتەوە، مەگـەر پێی بەخشـیوەتەوە، وە ڕەنگە بـۆی مابێتـەوە هەنـدێ لە فـەزڵ‌و منەت بەسـەر خەڵکەوە، جا ئـەو کات بووە بـە بەندەیەکی پـاک‌و پاڵفتـە بـۆ خوا، چونکە کەسـێکی خـاوەن چاکـەو دڵ نەرم‌و هەسـت ناسـک بووە، بەڵام ئەو کەسـەی مافی خەڵکی بەسـەریەوە ماوەو پاداشـتی نەداوەتەوە، ئەوە پێویسـتە وازی لـێ بهێنـرێ بۆ خەڵکـی، وە کاریان بۆ بـکات لەوەی دڵسـۆزی پێی کـەم دەکات.

ئـەم دەقـە ئەگەرچـی ئەبوبەکـر صیددیـق دەگرێتـەوە، بەڵکـو وتـراوە: بـە هـۆی ئـەوەوە دابەزیـوە، چونکـە ئەبوبەکـر خـوا لێـی ڕازی بـێ هیچ کەسـێک چاکـەی بەسـەرەوە نەبوو پاداشـت بدرێتـەوە، تەنانـەت پێغەمبەریـش ﷺ، مەگـەر نیعمەتـی پێغەمبەرایەتی کـە بە هیچ شـێوەیەک پاداشـت نادرێتـەوە، ئەویش نیعمەتی بانگـەوازە بۆ لای ئاینی ئیسـلام‌و فێرکردنی ڕێنمایـی‌و دینی حـەق، بێگومان خواو پێغەمبەرەکـەی منەتیان هەیە بەسـەر هەموو خەڵکەوە، منەتێـک بە هیچ شـێوەیەک نـە پاداشـت دەدرێتەوەو نـە بەرانبـەری دەبێت، بێگومـان ئەوە هەمـوو کەسـێک دەگرێتـەوە وەسـف کرابێـت بـەم وەسـفە جوانـە، جـا هیـچ یەکێک لە بەدیهێنـراوەکان چاکەیەکـی بەسـەرەوە نەبوو پاداشـت بدرێتەوە، بۆیـە کردەوەکانی پاک‌و پاڵفتـە بـە تەنهـا بۆ خـوا بووە.

(٢٠-٢١): لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ٢٠ وَلَسَوۡفَ يَرۡضَىٰ ﴾ (واتـە: تەنهـا مەبەسـتی ڕەزامەنـدی پەروەردگـاری بـەرزو بڵنـدە * سـوێند بـە خوا لەمـەولا ڕازی دەبـێ بە پاداشـتی دواڕۆژ) ئەم کەسـە پارێـزکارە (ڕازی دەبێ) بەوەی خوا پێی دەبەخشـێت لـە جۆرەها ڕێـزو حورمەت‌و پاداشـت.

تەفسیری سووڕەتی (اللیل) تەواو بوو.




## تەفسیری سوورەتی (الضحی)

## مەککییە (١١) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿ وَالضُّحَىٰ ۝١ وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ﴾ خـوا ﷻ سـوێند دەخـوات بـە ڕۆژ، کاتـێ ڕووناکیەکـەی بڵاودەبێتـەوە لـە چێشـتەنگاو، وە (سـوێند دەخـوات) بـە شـەو کاتـێ کـە ئـارام دەگـرێو تاریکاییەکـەی ڕەش دەبـێ، لەسـەر گرنگیدانـی خـوا بـە پێغەمبەرەکـەی، فەرمـووی: ﴿ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ ﴾ واتـە: پەروەردگـاری تـۆ وازی لـێ نەهێنـاوی لـەو کاتـەی کـە گرنگـی پێـداوی، وە پشـت گوێـی نەخسـتووی کاتـێ پـەروەردەی کردوویـتو چاودێـری کـردووی، بەڵکـو بـەردەوام پـەروەردەی کـردووی بـە چاکتریـن شـێوەی پـەروەردە کـردن، وە بـەرزی کردوویتـەوە پلـە بـە پلـە، ﴿ وَمَا قَلَىٰ ﴾ واتـە: ڕقـی لـێ هەڵنەگرتـووی لـەو کاتـەی کـە خۆشـی ویسـتووی، بێگومـان نەفـی کردنـی دژ بەڵگەیـە لەسـەر چەسـپاندنی دژەکـەی، وە نەفـی کردنـی ڕووت نابێتـە سـتایش کـردن تەنهـا ئەگـەر چەسـپاندنی تـەواوی لەخـۆ گرتبـێ، ئەمـە حاڵـی پێغەمبـەرﷺ بـوو لـە ڕابـردوو لـە ئێسـتادا، کـە تەواترینـی حاڵەکانـە، بـەردەوام بوونـی خۆشویسـتنی خـوا بـۆ ئـەو، وە بەرزکردنـەوەی لـە پلەکانـی تـەواوی، وە بـەردەوام بوونـی چاودێـری کردنـی خـوا بـۆی.

(٤): بـەڵام حاڵـی داهاتـووی، خـوا ﷻ دەربـارەی فەرموویەتـی: ﴿ وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الْأُولَىٰ ﴾ واتـە: هەمـوو دۆخێکـی دواتـرت لـە دۆخـەکان بـۆ تـۆ چاکتـرە لـە دۆخـی ڕابـردوو.

بـەردەوام پێغەمبـەر ﷺ سـەردەکەوت بـە پلەکانـی بـەرز بوونـەوەدا، خـوا ﷻ دینەکـەی

بـۆ دەچەسـپاندو سـەری دەخسـت بەسـەر دوژمنانیـدا تـا مـرد، بێگومـان گەیشـت بـە دۆخـێ کـە پێشـینو دوایـن پێـی نەگەیشـتوون، لـە فـەزڵو چاکـەو نازونیعمەتـەکانو بیلبیلـەی چـاوو خۆشـیەکانی دڵ. پاشـان دوای ئەمـە ئیتـر پرسـیار مەکـە لـە چۆنیەتـی حاڵـی دوارۆژی، لـە ڕێزگرتـنو جۆرەهـا نـازو نیعمـەت، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی:

(٥): ﴿ وَلَسَوۡفَ يُعۡطِيكَ رَبُّكَ فَتَرۡضَىٰٓ ﴾ (واتـە: سـوێند بـە خـوا لەمـەودوا پەروەردگارت ئەوەنـدەت پـێ دەبەخشـێ کـە ڕازی ببیـت) ئەمـە کارێکـە ناتوانـرێ دەربـبـردرێ بـە غەیـری ئـەم دەربڕینـە کۆکـەرەوەو گشـتگیرە، پاشـان منەتـی کـردوە بەسـەریدا بەوەی زانیویەتـی لـە بارودۆخـە تایبەتەکانـی، جـا فەرموویەتـی:

(٦): ﴿ أَلَمۡ يَجِدۡكَ يَتِيمٗا فَـَٔاوَىٰ ﴾ واتـە: (ئـەی موحەممـەد خـوا) تـۆی بینـی کـە نـە دایکـت هەیـە، نـە بـاوک، بەڵکـو دایـکو باوکـی مـرد بـوو، ئـەو نەیدەتوانـی کاروبـاری خـۆی بەڕێوەببـات، جـا خـوا ﷻ پەنایـداو خسـتیە ئەسـتۆی باپیـری عەبـدول موتەلیـب، پاشـان کاتـێ باپیـری مـرد، خـوا خسـتیە ئەسـتۆی مامـی ئەبـو تالیـب، هەتـا خـوا ﷻ سەریخسـت بـە سـەرکەوتنی خـۆیو بـە بـڕواداران.

(٧): ﴿ وَوَجَدَكَ ضَآلّٗا فَهَدَىٰ ﴾ واتـە: تـۆی بینـی نـەت دەزانـی نـە کتێـب چیـەو نـە ئیمـان، جـا فێـری کـردی لـەوەی کـە نایزانـی، وە سـەرکەوتووی کـردی بـۆ چاکترینـی کـردەوەو ڕەوشـتە بـەرزکان.

(٨): ﴿ وَوَجَدَكَ عَآئِلٗا ﴾ واتـە: (تـۆی بینـی بـە) هـەژاری، ﴿ فَأَغۡنَىٰ ﴾ (دەوڵەمەنـدی کردیـت) بـەوەی خـوا سەریخسـتی بەسـەر وڵاتانـدا، کـە بـەو هۆیـەوە مـاڵو سـامانو بـاجو سـەرانەیەکی زۆرت کەوتـە دەسـت، ئـەو زاتـەی ئـەم ناتەواویانـەی لەسـەر تـۆ لابـرد، بێگومـان هەمـوو کـەمو کوڕیەکـت لەسـەر لادەبـات، وە پشـتیوانیت لێـدەکاتو سـەرت دەخـاتو ڕێنماییـت دەکات، دەی تـۆش بەرانبـەر نیعمەتەکانـی ئـەو سوپاسـگوزار بـە؟

(٩): لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ فَأَمَّا ٱلۡيَتِيمَ فَلَا تَقۡهَرۡ ﴾ واتـە: بـە خراپـە مامەڵـە لەگەڵ هەتیـودا مەکـە، وە بـا دڵـت تەنـگ نەبـێ بـە بینینـیو هەڵمەشـاخێ پیایـدا، بەڵکـو ڕێـزی بگـرەو پێـی ببەخشـە هەرچـی لـە تواناتـدا هەیـە، مامەڵـەی لەگەڵـدا بکـە وەک چـۆن پێـت خۆشـە لـە دوای مردنـت مامەڵـە لەگـەڵ منداڵەکەتـدا بکـرێ.

(١٠): ﴿ وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنۡهَرۡ ﴾ واتـە: بـا قسـەیەک لـە تۆوە دەرنەچـێ بەرانبـەر داواکار،

وا بخـوازێ داواکاریەکـەی ڕەت دەکەیتـەوە، بـەوەی ڕووبـەڕووی ببیتـەوەو هەڵبشـاخێی پیایـدا بـە ڕەوشـتێکی ناشـرین، بەڵکـو پێـی ببەخشـە هەرچـی لـە تواناتدایـە، یـان بـە شـێوەیەکی جـوانو چـاک وەڵامـی بـدەوە.

کـە ئەمـە داواکردنـی مـاڵو زانسـتو زانیـاری دەگرێتـەوە، لەبـەر ئەمەیـە مامۆسـتا فەرمانـی پێکـراوە بـە خوڕەوشـتی جـوان لەگـەڵ فێرخـوازدا، وە ڕووبەڕووبوونـەوەی بەڕێزگرتـنو پەرۆشـیەوە، بێگومـان لـەوەدا پشـتیوانیەک بـەدی دەکـرێ بـۆ بەدەسـتهێنانی مەبەسـتەکەی، وە ڕێزگرتنێکـە بـۆ ئـەو کەسـەی کۆشـش دەکات، لـە سـوود گەیانـدن بـە خەڵـکو وڵاتـدا.

(١١): ﴿ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ ﴾ (واتـە: وە بـە نیعمـەتو بەخششـی پەروەردگـارت) ئەمـەش نیعمەتـی دینـیو دونیایـی دەگرێتـەوە ﴿ فَحَدِّثْ ﴾ واتـە: ستایشـی خـوا بکـە بـەو نازونیعمەتانـە، وە یـادی بکـەوەو باسـی بکـە (لای خەڵـک) ئەگـەر لـەو بـاس کردنـەدا بەرژەوەندیـەک هەبـوو.

ئەگەرنـا باسـی نیعمەتەکانـی خـوا بکـە بەڕەهایـی، چونکـە باسـکردنی نیعمەتەکانـی خـوا پاڵنـەرە بـۆ سوپاسـگوزاری کردنـی، پێویسـتکەرە بـۆ خۆشویسـتنی دڵـەکان، بـۆ لای ئـەو زاتـەی نازونیعمەتـی پـێ بەخشـیوە، چونکـە بـە ڕاسـتی دڵـەکان پـەروەردە کـراون لەسـەر خۆشویسـتنی چاکـەکار.

تەفسیری سوورەتی (الضحی) تەواو بوو.

## تەفسیری سوورەتی (الشرح)
## مەککییە (٨) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١): خـوا ﷻ منـەت دەکات بەسـەر پێغەمبەرەکەیـداو دەفەرمـوێ: ﴿أَلَمۡ نَشۡرَحۡ لَكَ صَدۡرَكَ﴾ واتـە: فراوانـی دەکەیـن بۆت شـەریعەتو یاسـاو ڕێسـاکانی ئایـن، بـە بانگـەواز کردن بۆ لای خـواو خۆڕازاندنەوە بـە ڕەوشـتە جوانـەکانو، ڕوو کردنـە دواڕۆژو ئاسـان کردنـی خێـرو چاکەکان، بە جـۆرێ هەرگیز دڵت تەنـگو نارەحەت ناکەیـن حـەزی لـە خێـرو چاکـە نەبێت.


سورة الشرح
بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
أَلَمۡ نَشۡرَحۡ لَكَ صَدۡرَكَ ١ وَوَضَعۡنَا عَنكَ وِزۡرَكَ ٢

(٢-٣): ﴿وَوَضَعۡنَا عَنكَ وِزۡرَكَ﴾ (واتـە: وە دامـان گـرت لێـت ئـەو بارە گرانـەی) واتە: گوناهەکانت،

ٱلَّذِىٓ أَنقَضَ ظَهْرَكَ ٣ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ٤ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ٥
إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ٦ فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ٧ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب ٨

﴿ ٱلَّذِىٓ أَنقَضَ ﴾ واتە: کە قورسی کردبوو، ﴿ ظَهْرَكَ ﴾ (پشتت)، وەک خواﷻ فەرموویەتی: ﴿ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ﴿٢﴾ ﴾الفتح، (واتە: تا خوا لە تاوانەکانی ڕابوردوو داهاتووت خۆش ببێت).

(٤): ﴿ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴾ واتە: پلەو پایەمان بەرز ڕاگرتی، وە ستایشی چاکو بەرزمان بۆ دانای کە هیچ کەس لە بەدیهێنراوەکان پێی نەگەیشتبوو، یادی خوا ناکرێ بەبێ یادی پێغەمبەرەکەیﷺ، وەک چوونە ناو ئیسلامو شایەتومان هێنان، وە لە کاتی بانگدانو قامەت کردنو، وتار خوێندنو غەیری ئەوانیش لەو کاروبارانەی کە پێی یادی پێغەمبەرەکەی موحەممەدی ﷺ بەرز ڕاگرتووە، وە لە دڵی ئۆممەتەکەیدا خۆشەویستو گەورەو بە مەزن دانراوە، ئەم پلەو پایە لە دوای خوا بۆ هیچ کەسێکی دیکە دانەنراوە، خوا پاداشتی دایەوە لە ئۆممەتەکەی چاکتر لەوەی پاداشتی پێغەمبەرێکی دابێتەوە لە ئۆممەتەکەی.

(٥-٦): ﴿ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٥﴾ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴾ (واتە: بە دڵنیایی لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشیو ئاسانی دێ * بێگومان لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشیو ئاسانی دێت) ئەمە مژدەیەکی مەزنە، بێگومان تەنگانەو گرانی ببینرێ، ئەوە ئاسانیو ئاسوودەیی هاوشانو هاوتایەتی، تەنانەت ئەگەر تەنگانە بچێنە ناو کونی بزنە مژەوە، ئەوە ئاسانیو خۆشی بەدوایدا دەچێو دەریدێنێ، وەک خوا فەرموویەتی: ﴿ سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ﴿٧﴾ ﴾الطلاق، (واتە: بێگومان خوا دوای تەنگانە ئاسانی دێنێت)، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {وَأَنَّ الفَرَجَ مَعَ الكَرْبِ، وَأَنَّ مَعَ العُسْرِ يُسْراً} (أخرجه أحمد برقم: (٢٨٠٤)، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح)، واتە: بێگومان خۆشی لەگەڵ نارەحەتیدایە، وە بێگومان لەگەڵ تەنگانەدا خۆشیو ئاسانی دێت.

پێناسەی (العُسْر) لەم دوو دەقەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە یەکە، (يُسـر)یش کە بەناسراو بەڵگەیە لەسەر دووبارە بوونەوەی، هەرگیز تەنگایەک زاڵ نابێت بەسەر دوو خۆشیو شادیدا.
لە پێناسەکردنی (العسر) بە (الألف واللام) کە بەڵگەیە لەسەر گشتاندن (الاستغراق والعموم)، بەڵگەشە لەسەر ئەوەی هەموو تەنگانەیەک -ئەگەر چی لە قورسیو گرانیدا بگاتە ئەوپەڕی- ئەوە لە کۆتاییدا ئاسانکاری پەیوەست دەبێ پێیەوە.
پاشان خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، وەک بنچینەو بڕوادارانیش وەک شوێنکەوتووی ئەو، بەوە سوپاسگوزاری خوا بکەنو هەستن بە پێویستی نازونیعمەتەکانی، جا فەرموویەتی:
(٧): ﴿ فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ﴾ واتە: ئەگەر لە کارەکانت بوویتەوەو تەواوت کردن، هیچ لە دڵتدا نەما کە ببێتە بەربەست، ئەوە کۆشش بکە لە پەرستشو پاڕانەوەی (پەروەردگارت).
(٨): ﴿ وَإِلَىٰ رَبِّكَ ﴾ (واتە: وە هەر لە پەروەردگارت) بە تاکو تەنها ﴿ فَٱرْغَب ﴾ واتە: حەزوو ئومێدت زیاد بکە لە وەرگرتنی پاڕانەوەکانتو قبوولکردنی پەرستشەکانت.
وەکو ئەوانە مەبە کاتێ کە لێدەبنەوەو ئیشو کار تەواو، گاڵتەو گەپ دەکەنو ڕوو وەردەگێڕن لە پەروەردگاریان، وە لە زیکرو یادکردنیان، ئەگینا لە زەرەرمەندان دەبیت.
وە وتراوە: مانای فەرموودەی خوا ﷻ: ﴿ فَإِذَا فَرَغْتَ ﴾ واتە: ئەگەر لە نوێژ بویتەوەو تەواوت کرد، ﴿ فَٱنصَبْ ﴾ واتە: خۆت ماندوو بکە لە پاڕانەوە، تەنها لە پەروەردگارت بپاڕێوە بۆ داواکردنی داواکاریەکانت.
ئەوەی ئەم بۆچوونەی هەیە ئەم دەقەی کردۆتە بەڵگە لەسەر شەرعیەتی پاڕانەوەو زیکر کردن لە دوای نوێژە فەڕزەکان، خوا زاناترە بەوە.

تەفسیری سووڕەتی (الشرح) تەواو بوو.


سُورَةُ التِّين
بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ ① وَطُورِ سِينِينَ ② وَهَٰذَا الْبَلَدِ الْأَمِينِ ③
لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ④ ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ ⑤
إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ⑥
فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِالدِّينِ ⑦ أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ ⑧

## تەفسیری سوورەتی (التين)

## مەككییە (٨) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١) ﴿ وَٱلتِّينِ ﴾ ئەویش هەنجیری ناسراوە، بەهەمان شێوە، ﴿ وَٱلزَّيْتُونِ ﴾ (وە زەیتوون)، خوا ﷻ سوێندی خواردوە بەم دوو درەختە، بە هۆی زۆری سوودو بەرهەمەكانیان، لەبەر ئەوەی سەرچاوەیان لە زەوی شام دایە، جێگای پێغەمبەر عیسا ؈.

(٢): ﴿ وَطُورِ سِينِينَ ﴾ واتە: طووری سینا جێگای پێغەمبەر موسا ؈

(٣): ﴿ وَهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ ﴾ واتە: ئەویش مەككەی پیرۆزو رێز لێگیراوە، جێگای پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ.

خوا ﷻ سوێندی خواردوە بەم شوێنە رێزلێگیراوو گەورانە، كە هەڵبژاردوەو چاكترینی پێغەمبەرانو بەرێزترینیانی لەوێ داناوە.

(٤-٦): وە سوێند لەسەر خوراو فەرمایشتی خوایە كە دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴾ (واتە: سوێند بێ بە راستی ئینسانمان دروستكرد لە جوانترین شێوەدا) بە تەواوترین شێوەی دروستكردن، هەموو ئەندامانی جەستەی لە جێگای خۆیەتی، باڵاو قیافەی رێكە، شتێكی لە دەست نەداوە لەوەی پێویستی پێیەتی بە رواڵەت یان لە ناوەوە، لەگەڵ ئەم نیعمەتە مەزنەدا كە پێویستە لەسەری هەستێت بە سوپاسگوزاری كردنی، جا زۆرینەی خەڵكی لایانداوە لە ستایش كردنی ئەو زاتەی نازونیعمەتی پێ بەخشیوون، سەرقاڵن بە هەواو هەوەسو گاڵتەو گەپ، رازی بوون بە نەفسو دەروونی خۆیان بە نزمترینو بێ نرخترینی شتەكانو خراپترین خورەوشتەكان، سەرەنجام خوا ﷻ ئەوانی خستە نزمترینی شوێنە نزمەكان كە دۆزەخە، جێگای سەرپێچی كارانی یاخیبوو

لـە پەروەردگاریـان، جگـە لـەو کەسـە نەبێ کـە خوا منەتـی ئیمـانو کـردەوەی چاکو خورەوشـتی بـەرزی کردبـێ بەسـەریدا، ﴿ فَلَهُمۡ ﴾ (بۆ ئەوان هەیـە) ئەو پلەو پایـە بەرزە، ﴿ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونٖ ﴾ (واتـە: پاداشـتێکی) نەبڕاوە، بەڵکو لەزەتێکی بەردەسـتو خۆشـی یەک لـە دوای یـەکو نازونیعمەتێکـی زۆر بـۆ هەمیشـەیی کـە هەرگیـز لاناچێـت، وە نیعمەتێ گۆڕانـی بەسـەردا نایەت، خواردنو سـێبەری هـەردەمو هەمیشـە بەردەوامە.

(٧): ﴿ فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعۡدُ بِٱلدِّينِ ﴾ واتـە: چ شـتێک وات لـێ دەکات ئەی ئینسـان کە بڕوات بـە ڕۆژی پاداشـتدانەوە لەسـەر کـردەوەکان نەبێـت، خـۆ بێگومـان تـۆ چەندیـن ئایەتو نیشـانەو بەڵگـەی زۆرت بینـی، کـە بە هۆیانـەوە یەقیـنو دڵنیاییت بـۆ بە دەسـت دێنێ لە نازونیعمەتەکانـی، ئەوە پێویسـت دەکات لەسـەر تۆ کـە بێبڕوایی نەکەی بە شـتێک لەوەی هەواڵـی پێداوی.

(٩): ﴿ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَحۡكَمِ ٱلۡحَٰكِمِينَ ﴾ (واتـە: ئایا خوا فەرمانڕەواترینی هەموو فەرمانڕەوایانێک نیـە)؟ ئایـا حیکمەتـی خـوا وادەخـوازێ کـە واز لـە دروسـتکراوەکان بهێنـێ هـەروا بـە هاوەنتـە، نـە فەرمانیـان پـێ بکـرێو نـە قەدەغەیـان لـێ بکـرێو نـە پاداشـت بدرێنەوەو نـە تۆڵەیـان لـێ بسـەنرێتەوە؟ یـان ئەو زاتەی کـە ئادەمیـزادی بەدیهێنـاوە قۆنـاغ لە دوای قۆنـاغ، وە نازونیعمـەتو خێـرو چاکـەی پێگەیاندوون، کـە ناتوانن هەژماری بکـەن، وە بە چاکتریـن شـێوە پـەروەردەی کردوون هـەر دەبـێ بیانگێڕێتەوە بـۆ ماڵی هەمیشـەییان، کە ئـەو ماڵـە مەبەسـتیانەو تەنها ڕوو لـەوێ دەکەن.

تەفسیری سوورەتی (التین) تەواو بوو.




## تەفسیری سوورەتی (العلق)
## مەککییە (١٩) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١): ئـەم سـوورەتە یەکـەم سـوورەتە دابـەزی بـۆ سـەر پێغەمبـەر ﷺ، کـە لـە سـەرەتای پێغەمبەرایەتـی بۆی هاتـە خوار، کاتـێ کـە نەیدەزانـی کتێب چیـەو؟ ئیمان چیـە؟ جـا جبیریـل ؈ هـات بـۆ لای بە پەیامــەوە، وە فەرمانی پێکــرد بخوێنێ، بەڵام ئــەو نەیتوانــیو وتــی: (مـا أنـا بقـارئ) واتە مــن خوێندەوار نیــم، بەردەوام بــوو لەگەڵیدا تــا خوێندی، جــا خــوا دایبەزاند بەســەریدا: ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴾ (واتــە: بخوێنــە بــە نــاوی پەروەردگارتەوە کە) هەموو شــتێکی دروســت کردوە.

(٢): پاشــان ئادەمیــزادی تایبــەت کردوەو باســی ســەرەتای بەدیهێنانی کــردوە، دەفەرموێ: ﴿ مِنْ عَلَقٍ ﴾ (واتــە: لــە خوێنێکــی بەســتوو) جـا ئـەو زاتەی ئینسـانی دروسـت کـردوەو گرنگـی داوە بـە ڕێکخسـتنی، هـەر دەبـێ بەڕێـوەی ببـات بـە فەرمـانو قەدەغـە کردن، ئەویــش بــە ناردنــی پێغەمبــەران بــۆ ناویــانو دابەزاندنــی کتێب بۆ ســەریان.

لەبەر ئەمەیە دوای فەرمان کردن بە خوێندن، باسی دروستکردنی ئادەمی کردوە.

(٣-٥): پاشــان فەرموویەتــی: ﴿ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ﴾ (واتــە: بخوێنــە پەروەردگــاری تــۆ خــاوەن) کۆمەڵــە ســیفەتێکی زۆری بەرفراوانــە، وە خاوەن بەخشــندەییو چاکەیــە، لە ڕێزو بەخشــندەییەکانی ئەوەیــە ئادەمی فێرکردوە بە قەڵــەم، ﴿ عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ۝٤ عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴾ جـا بەڕاسـتی خوا ﷻ لە زگـی دایکـی دەریهێناوە هیـچ شـتێکی نەزانیوەو بیسـتنو بینینو دڵـی بۆ دانـاوە، هۆکارەکانـی زانستیشـی بۆ ئاسـان کردوە.

فێـری قورئـانو فێـری کاربەجێـی کـردوە، فێـری کـردوە بـە قەڵـەم، کـە بـە هۆیـەوە

زانستەکان دەپارێزرێن‌و مافەکان ڕێک دەخرێن، وە دەبێتە پەیامێ بۆ خەڵکی لە جێگای وتارەکان.

ستایش‌و منەت هەر بۆ خوایە، کە نازونیعمەتی بەخشیوە بە بەندەکانی بەم نازونیعمەتە، هەرگیز ناتوانن پاداشتی بدەنەوەو سوپاسگوزاری بکەن، پاشان منەتی کردوە بەسەریاندا بە دەوڵەمەندی‌و ڕزق‌و ڕۆزی بەرفراوان.

(٦-٨): بەلأم ئادەمیزاد بە هۆی نەفامی‌و ستەم کردنیەوە کاتێ کە ببینێ دەوڵەمەندو بێنیازە، یاخی دەبێ‌و لە ڕێ دەردەچێ‌و لووت بەرزی دەکات لە ئاستی هیدایەتدا، بیری دەچێ کە بەڕاستی گەڕانەوە هەر بۆ لای پەروەردگارێتی، لە سزا ناترسێ بەڵکو هەندێ جار حاڵی دەگاتە ئەوەی کە بەخودی خۆی واز لە ڕێنمایی هیدایەت دێنێت، جگە لە خۆیشی بانگ دەکات بۆ وازهێنان لە هیدایەت، جا ڕێگری دەکات لە چاکترینی کردەوەکانی ئیمان کە بریتیە لە نوێژ، خوا ﷻ بەم یاخیبووە سەرکەشە دەفەرموێ:

(٩-١٢): ﴿ أَرَءَيْتَ ﴾ ئەی ئەو کەسەی ڕێگری لە بەندەی خوا دەکەی کاتێ نوێژ دەکات، ﴿ إِن كَانَ ﴾ بەندەی نوێژکەر، ﴿ عَلَى ٱلْهُدَىٰٓ ﴾ زانست بە حەق‌و کردەوە پێکردنی ﴿ أَوْ أَمَرَ ﴾ یان فەرمان بە غەیری خۆی بکات ﴿ بِٱلتَّقْوَىٰٓ ﴾ (واتە: بە خۆپارێزی).

ئایا ڕەوایە ڕێگری لە کەسێ بکرێ کە ئەمە وەسفی بێت؟ ئایا ڕێگری کردنی لە مەزنترینی دژایەتی کردن نیە بەرانبەر بە خواو بەرانبەر بە حەق؟ بێگومان قەدەغەکردن تەنها ڕوودەکاتە ئەو کەسەی لەسەر ڕێنمایی‌و هیدایەت نەبێ، یان فەرمان بە غەیری خۆی بکات بە پێچەوانەی خۆپارێزی.

أَرَءَيْتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ۞ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ۞ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ
لَنَسْفَعًۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ۞ نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ۞ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ ۞
سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ۞ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب ۩ ۞

(١٣-١٤): ﴿ أَرَءَيْتَ إِن كَذَّبَ ﴾ (واتــە: ئایــا بینیــت ئەگــەر بــڕوای بــە ئاینــی ڕاســت نەبــێ) ئــەو کەســەی ڕێگــری لەحــەق دەکات ﴿ وَتَوَلَّىٰٓ ﴾ وە پشـــت هەڵـــدەکات لــە فەرمــان، ئایــا لەتۆڵــەو ســزای خــوا ناترســـێ؟ ﴿ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ﴾ (واتـــە: ئایــا نەیزانیــوە کــە خــوا دەیبینــێ) ئــەوەی دەیــکاتو ئەنجامـــی دەدات.

(١٥-١٦): پاشـــان هەڕەشـــەی کـــردوە ئەگـــەر بـــەردەوام بـــێ لەســـەر ئـــەو حاڵـــەیو فەرموویەتـــی: ﴿ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ ﴾ (واتـــە: وانیـــە، بەڕاســـتی ئەگـــەر وازنەهێنــێ) لــەوەی کــە دەیــڵاو ئەنجامی دەدات، ﴿ لَنَسْفَعًۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ﴾ واتــە: زۆر بــە توونــدی لەســەر پێشەســەری ڕایدەکێشــین، ئەویــش حەقیقــەتو ڕاســتیە، چونکــە ئــەو پێشــە ســەرە، ﴿ نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴾ واتــە: پێشەســـەرێکی درۆزنـــە لـــە گوفتاریـــداو هەڵەیــە لــە کــرداری.

(١٧): ﴿ فَلْيَدْعُ ﴾ (واتــە: ئنجــا بــا بانــگ بــکات) ئەمــەی کــە ســزای لەســەر پێویســت بــووە، ﴿ نَادِيَهُۥ ﴾ واتــە: خەڵکــی کــۆڕو مەجلیــسو هاوڕێکانــی (بانــگ بــکات)، وە ئەوانەیشــی لــە دەورووبەریــن بــۆ ئــەوەی پشــتیوانی لــێ بکــەن لەســەر ئــەوەی بــۆی دادەبــەزێ.

(١٨): ﴿ سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴾ واتـــە: (ئێمـــەش بانگـــی) دەرگاوانـــی دۆزەخ دەکەیـــن، بـــۆ گرتـــنو ســـزادانی، بـــا تەماشـــا بـــکات بزانـــێ کام لـــەو دوو دەســـتەیە بـــە تواناتـــرو زاڵتـــرن؟ ئەمـــەش حاڵـــی قەدەغـــەکارو ڕێگـــرکارە، وە ئەوەیشـــی هەڕەشـــەی لێکـــراوە لـــە ســـزا، بـــەڵام حاڵـــی قەدەغەکـــراوە خـــوا ﷻ فەرمانـــی پێکـــردوە گـــوێ نەگـــرێ لـــەم قەدەغـــەکارەو ملکەچـــی قەدەغەکردنـــی نەبـــێ، جـــا فەرموویەتـــی:

(١٩): ﴿ كَلَّا لَا تُطِعْهُ ﴾ (واتـــە: نەخێـــر بـــە گوێـــی ئـــەو کەســـە مەکـــە) چونکـــە بـــە

ڕاستی ئەو فەرمان ناکات مەگەر بەوەی خەسارەتی هەردوو دونیای تێدابێ، ﴿ وَٱسْجُدْ ﴾ بۆ پەروەردگارت، ﴿ وَٱقْتَرِب ﴾ نزیک ببەرەوە لێی، لە سوژدە بردنو جگە لەویش، لە جۆرەها گوێڕایەڵیو نزیک بوونەوەکان، چونکە بێگومان هەموو ئەوانە نزیکی دەکاتەوە لە ڕەزامەندی خواو نزیک بوونەوە لێی، ئەمەش گشتگیرە هەموو قەدەغەکارێک لە خێرو قەدەغە لێکراوێک لە خۆدەگرێ، ئەگەرچی دەربارەی (أبو جهل) دابەزیوە، کاتێ کە ڕێگری کرد لە پێغەمبەرﷺ لە نوێژ کردن، وە سزاو ئازاریدا.

تەفسیری سووڕەتی (العلق) تەواو بوو.


سُورَةُ القَدْرِ
بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ① وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ ② لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ ③ تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ④ سَلَٰمٌ هِىَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ ⑤

## تەفسیری سوورەتی (القدر)
## مەككییە (٥) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١): خـوا ﷻ ـبـۆ ڕوونکردنـەوەی فەزڵو بـەرزیو ڕێزی قورئـان دەفەرموێ:- ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ﴾ (واتـە: بەڕاسـتی ئێمـە قورئانمـان ناردۆتـە خـوارەوە لـە شـەوی بەڕێـزدا) هـەروەک خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ ﴿٣﴾ ﴾ الدخان، (واتـە: بەڕاسـتی ئێمـە ئـەم قورئانەمـان لە شـەوێکی پیرۆزدا ناردۆتـە خـوارەوە)، ئەویـش بێگومان خوا سـەرەتا قورئانـی دابەزانـد لە مانگـی ڕەمەزان لە شـەوی (ليلـة القـدر)دا، وە ڕەحمـی پێکرد بـە بەندەکان بە ڕەحمکردنێکی گشـتگیر، هەرگیـز بەندەکان ناتوانن سوپاسـگوزاری بکەن. وە ناونـراوە بـە (ليلـة القـدر) بـە هۆی مەزنـیو ڕێـزو فەزڵی لەلای خـوا، لەبەر ئـەوە تیایدا ئەنـدازە دەکـرێ ئـەوەی لـەو سـاڵەدا (ڕوودەدات)و دەبێـت، لـە چارەنووسـەکانو ڕزقو ڕۆزیو ئەنـدازە قەدەریەکان.

(٣): پاشـان پلـەو پایـەو ئەنـدازەی بە مـەزن ڕاگرتـووە فەرموویەتـی: ﴿ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ ﴾ (واتـە: تـۆ چووزانیـت شـەوی ڕێـز چیە) واتە: بەڕاسـتی پلـەو پایـەی گەورەیەو مەترسـیەکەی مەزنـە، ﴿ لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ ﴾ واتـە: (شـەوی ڕێـز چاکـە)و کـردەوە کـردن تیایـدا چاکتـرە لە کـردەوەی هـەزار مانگی بەتـاڵ لـە (ليلة القدر).

بـە ڕاسـتی ئەمـە مرۆڤی ژێـر سەرسـام دەکات، کاتێ خـوای بـەرزو مەزن منەتـی کردوە بەسـەر ئـەم ئۆممەتـە لاوازەدا، بە شـەوێک کردەوە کردن تیایـدا بەرانبەرو زیاتـرە لە هەزار مانـگ، تەمەنـی پیاوێکی بە سـاڵاچوو بـە تەمەنێکی درێژ، هەشـتاو ئەوەندە سـاڵ.

(٤-٥): ﴿ تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا ﴾ واتە: (لەو شـەوەدا فریشـتەو جبریلیـش لە ناویاندا

دێنــە خــوارەوە) دابەزینیــان زۆر دەبێ تیایــدا ﴿مِّن كُلِّ أَمْرٍ ٤ سَلَٰمٌ هِيَ﴾ واتە: (ئەو شــەوە شــەوێکە) ســەلامەتە لــە هەموو بەڵاو شــەڕێک، ئەویش بــە هۆی زۆری خێــر تێیدا، ﴿حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ﴾ واتە: (تا هەڵاتنی شــەبەق) ســەرەتایی ئەو شــەوە لــە خۆرئاوابوونی خۆرەوەیە، کۆتایەکەشــی هەڵهاتنی بەرەبەیانە.

فەرمــوودەکان بــە یــەک لــە دوای یــەکو تەواتور هاتوون لەســەر فــەزڵو چاکــەی (لیلة القــدر)، وە ئــەو شــەوە دەکەوێتــە دەیەمــی کۆتایی ڕەمەزان، بــە تایبەت لــە تاکەکانیدا، ئەو (لیلــة القــدر)ە هەمــوو ســاڵێک دەمێنــێ تــا هاتنــی ڕۆژی دوایــی، لەبــەر ئــەوە پێغەمبەر ﷺ لــە دەیەمــی کۆتایــی ڕەمەزان ئیعتیــکافو پەرستشــی زۆری تێــدا دەکرد، بە ئومێــدی (لیلة القــدر)، خــوا زاناترە.

تەفسیری سوورەتی (القدر) تەواو بوو.




## تەفسیری سوورەتی (البینة)
## مەدەنییە (٨) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١): خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ ﴾ واتـە: (ئەوانـەی کـە بێبـڕوا بـوون لـە خـاوەن نامـە) لـە جوولەکـەو گـاورەکان ﴿ وَٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ (و هاوبەشـدانەران) لـە سـەرجەم بەشـی ئوممەتـەکان، ﴿ مُنفَكِّينَ ﴾ (دەسـتیان هەڵنەگـرت) لـەو بێبڕوایـیو گومڕاییەیان کـە لەسـەری دەڕۆیشـتن، واتـە: بـەردەوام بـوون لـە سەرکەشـیو گومڕاییـان، تێپـەڕ بوونـی سـاڵەکان هیچ سـوودی پێنەگەیاندن جگە لە بێبڕوایـی، ﴿ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ﴾ (واتە: تـا نیشـانەی) ڕوونو بەڵگـەی یەکلاکەرەوەیان بۆ نەهات، پاشـان ئەو ڕوونکردنەوەی شـی کـردەوەو فەرمـووی:

(٢): ﴿ رَسُولٌ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: (پێغەمبەرێکـە) خـوا ناردوویەتـی بانگـەوازی خەڵکی بکات بـۆ ڕێگـای ڕاسـت، کتێبـی بـۆ دابەزانـدووە بەسـەریاندا بیخوێنێتـەوە، بۆ ئـەوەی خەڵکی فێـری حیکمـەت بـکاتو پاکیـان بکاتـەوە، بەڵکو دەریـان بێنێ لـە تاریکسـتانی بێبڕوایی بـۆ نوورو ڕووناکی ئیمـان، لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ يَتْلُوا۟ صُحُفًا مُّطَهَّرَةً ﴾ واتە: (چەند پەڕەیەکـی پاکیان بەسـەردا دەخوێنێتەوە) پارێـزراوە لە نزیکبوونەوەی شـەیتانەکان، کەس دەسـتی پێـوە نادات جگـە لە پاککـراوەکان، چونکە ئـەو فەرمایشـتە لەوپـەڕی بەرزیدایە.

(٣): لەبـەر ئەمەیە دەربـارەی فەرموویەتی: ﴿ فِيهَا ﴾ واتە: لـەو پەڕاوانەدا ﴿ كُتُبٌ قَيِّمَةٌ ﴾ واتـە: هەواڵـی ڕاسـتو فەرمانـی دادپەروەرانـە، ڕێنمایـی دەکـەن بـۆ حـەقو بـۆ ڕێگای ڕاست.

جـا ئەگـەر ئـەم نیشـانە ڕوونەیان بۆ هـات، ئەو کاتـە شـوێنکەوتووی حـەق دەردەکەوێ،

لــەوەی هیــچ مەبەســتێکی نیــە لــە شــوێنکەوتنیدا، جــا لەنــاو دەچــێ ئــەو کەســەی بە لای خــواوە لەنــاو چــووە لــە ڕووی بەڵگــەوە، بۆ ئــەوەی بژی ئــەوەی بــەلای خــواوە دەژی لە ڕووی بەڵگــەوە.

(٤) ئەگــەر خاوەنانــی کتێــب بڕوایان بەم پێغەمبــەرە نەهێناو ملکەچی نەبوون، ئەوە شــتێکی تــازەو داهێنــراو نیە لە گومڕایــیو عینادیان، چونکــە بێگومان ئەوان جیــا نەبوونەوەو نەبوون بە دەســتە دەســتەو حیزب حیــزب ﴿ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَةُ ﴾(واتە: مەگــەر دوای ئەوە نەبــێ کــە نیشــانە ڕوونەکەیان بــۆ هات) ئەویــش هاتنی پێغەمبەری ئیســلامە، کە پێویســت بــوو لەســەر خەڵکەکــە کــۆک بــنو یەکدەنــگ بن، بــەلام بــە هۆی پیســیو نەگلیســیان هیچیــان بــۆ زیــاد نەکــرا جگە لــە گومڕایــی، وە بەرچــاو ڕوون نەبــوون جگە لــە کوێری، لەگــەڵ ئــەوەی هەمــوو کتێبەکان بە گشــتی لە یــەک ســەرچاوەو یەک ئاینــەوە هاتوون.

(٥): جــا فەرمانیــان پێنەدرابــوو لــە هەمــوو شــەریعەتەکاندا مەگەر بــەوەی پەرستشــی خوا بکــەن، ﴿ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾واتە: لە هەموو پەرستشــە ئاشــکراو نهێنیەکان نیازو مەبەســتیان تەنهــا خــوا بێــت، نزیک بوونــەوە لــەو زاتــە ﴿ حُنَفَآءَ ﴾واتــە: ڕوو وەربگێڕن لــە هەموو ئــەو ئاینانەی کــە پێچەوانــەی ئاینی یەکتاپەرســتین.

وە نوێــژو زەکاتــی تایبــەت کــردوە بــە باســکردن، لەگەڵ ئــەوەدا جێیــان دەبێتــەوە لە ناو فەرمایشــتی خــوا: ﴿ لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ ﴾ ئەمیــش بــە هــۆی چاکــەو شــەرەفیانەوە، لەبەر ئــەوەی ئــەو دوو پەرستشــە هەرکەســێ پێیان هەســتێت، ئەوە بە هەموو شــەریعەتی ئیســلام هەستاوە.

﴿ وَذَٰلِكَ ﴾واتــە: یەکتاپەرســتیو دڵســۆزی بــۆ ئایــن، بریتیە لــە: ﴿ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ﴾واتە: ئاینــی ڕاســت کــە دەیگەیەنێ بە بە هەشــتە پــڕ لــە نازونیعمەتــەکان، جگە لــەوەش هەموو ڕچــە ڕێــکان دەیگەیەنێ بە دۆزەخ، پاشــان باســی پاداشــتی بێبڕوایــان دەکات، دوای ئەوەی نیشــانەی ڕوونیان بــۆ هاتــووە، فەرموویەتی:

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ
خَٰلِدِينَ فِيهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ شَرُّ ٱلۡبَرِيَّةِ ٦ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ خَيۡرُ ٱلۡبَرِيَّةِ ٧ جَزَآؤُهُمۡ
عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ
فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ رَبَّهُۥ ٨

(٦): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ ﴾ بێگومـان سـزای دۆزەخ دەوری داون، سـزاکە لەسـەریان سـەختر بـوو ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَآۚ ﴾ سـزایان لەسـەر سـووک ناکرێـتو ئـەوان لـە ناو ئـەو سـزایەدا بـێ ئومێـدن، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ شَرُّ ٱلۡبَرِيَّةِ ﴾ (واتـە: ئـا ئەوانـە خراپترینی هەمـوو دروسـتکراوێکن) چونکـە حـەقو ڕاسـتیان ناسـیوەو وازیـان لێهێنـاوە، بۆیـە زەرەرمەنـدی دونیـاو دوارۆژ بـوون.

(٧): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ خَيۡرُ ٱلۡبَرِيَّةِ ﴾ واتـە: بێگومـان ئەوانـەی کـە بڕوایـان هێنـاو کـردەوە چاکەکانیـان کـرد ئـا ئەوانـە چاکترینـی هەمـوو دروسـتکراوێکن، چونکـە پەرستشـی خوایان کردوەو ناسـیویانە، سـەرفراز بوون بە نیعمەتـی دونیـاو دوارۆژ.

(٨): ﴿ جَزَآؤُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ ﴾ (واتـە: پاداشـتی ئـەوان لای پەروەردگاریـان) بەهەشـتانێکی هەمیشـەییە نـە کـۆچ کردنـی تێدایـە نـە بارکـردن، وە نەداواکردنـی شـتێ لەسـەرووی ئەوەوە.

﴿ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ﴾ (واتـە: ڕووبـارەکان بە ژێریانـدا دەڕوات دەمێننـەوە تیایـدا بـە ئێجگـاری) خـوا لێیـان ڕازی بوو، بـەوەی ئەرکی سەرشـانیان خۆیـان بەجوانـی بەجێهێنـاوە، ئەوانیش لە خـوا ڕازی بوون، بەوەی بـۆی ئامادە کـردوون لـە جۆرەها ڕێزو حورمەتو پاداشـتی بـێ پایانی نەبڕاوە، ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئەو پاداشـتە چاکـە ﴿ لِمَنۡ خَشِيَ رَبَّهُۥ ﴾ واتـە: بـۆ ئـەو کەسـەیە لـە خـوا بترسـێو خـۆی پاراسـتبێ لە سـەرپێچیەکانیو ئـەرکو واجبەکانی بەجـێ هێنابێ.

تەفسیری سوورەتی (البينة) تەواو بوو.


سورة الزلزلة
بسم الله الرحمن الرحيم
إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ﴿٢﴾ وَقَالَ الْإِنسَانُ مَا لَهَا ﴿٣﴾ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ ﴿٦﴾ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ ﴿٨﴾

## تەفسیری سوورەتی (الزلزلة)
## مەدەنییە (٨) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١): ﴿ إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی ئـەوەی لـە ڕۆژی قیامەتـدا ڕوودەدات، بێگومـان زەوی دەکەوێتـە لـەرزەو جووڵـە، تـا ئـەوەی لەسـەریەتی لە خانـوو باڵەخانەو نیشـانەکان بەردەبنـە خـوارەوە، کێوەکانـی دەدەن بـە یەکـداو تەپۆڵکەکانـی ڕێـک دەبنـەوە، وە دەبێ بـە زەویەکـی ڕێکی بـێ گژووگیای سـافی بـێ خـواروو خێچ.

(٢): ﴿ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ﴾ واتـە: زەوی هەرچـی لـە ناویدایـە لـە مـردووانو گەنجینـەکان (هەمـووی فـڕێ دەداتـە دەرەوە).

(٣): ﴿ وَقَالَ ٱلْإِنسَـٰنُ ﴾ (واتـە: وە ئادەمیـزاد لـەو ڕۆژەدا دەڵێ) ئـەوەی بەسـەریدا هاتووە لـەو کارە مەزنـە: ﴿ مَا لَهَا ﴾ واتـە: ئـەوە زەوی چی بەسـەر هاتووە؟!

(٤): ﴿ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ ﴾ زەوی ﴿ أَخْبَارَهَا ﴾ واتـە: شـایەتی لەسـەر جیهانیـان دەدات، بـەوەی کردوویانە لەسـەر پشـتی لـە چاکەو خراپـە، چونکە بێگومـان زەوی لـە کۆی ئەو شـایەتانەیە کە شـایەتی دەدەن لەسـەر بەنـدەکان بـە کردەوەکانیان.

(٥): ئەویـش ﴿ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴾ واتـە: پەروەردگـاری تـۆ فەرمانـی پێکـردوە، هەواڵبـدات بـەوەی لەسـەر پشـتی کـراوە، زەویـش سـەرپێچی فەرمانـی ئەو زاتـە ناکات.

(٦): ﴿ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ ﴾ (واتـە: ئـەو ڕۆژە خەڵکـی دەردەچن لە هەڵوێسـتگەی ڕۆژی دوایـی، کاتـێ خـوا ﷻ دادوەری لـە نێوانیانـدا دەکات، ﴿ أَشْتَاتًا ﴾ واتـە: دەسـتە دەسـتەی جیـاواز لـە یەکتـر، ﴿ لِّيُرَوْا۟ أَعْمَـٰلَهُمْ ﴾ واتـە: تـا خوا نیشـانیان بـدات ئەوەی کردوویانـە لـە کردەوەی چـاکو خراپ، وە پاداشـتو سـزای تەواویان پێ نیشـان بدات.

(٧-٨): ﴿ فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ﴾ (واتــە: ئنجـا هــەر کەسـێک بــە ئەنـدازەی هــەرە وردیلەیــەک چاکــەی کردبــێ دەیبینێتــەوە * وە هەر کەسـێک بــە ئەندازەی هــەرە وردیلەیەک خراپــەی کردبێ دەیبینێتــەوە) ئەمــە گشــتگیرە بــۆ هەمــوو چاکــەو خراپەیــەک، چونکــە ئەگــەر تۆزقاڵــە زەڕەیــەک ببینــێ، کــە بــێ نرخترینــی هەمــوو شــتەکانە، وە پاداشــتی لەســەر بدرێتــەوە، دیــارە لەســەرووی ئــەوەوە لــە پێشــترە بــە پاداشــت دانــەوە، وەک خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ يَوۡمَ تَجِدُ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ مِنۡ خَيۡرٖ مُّحۡضَرٗا وَمَا عَمِلَتۡ مِن سُوٓءٖ تَوَدُّ لَوۡ أَنَّ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَهُۥٓ أَمَدَۢا بَعِيدٗا ۝٣٠ ﴾آل عمـران، (واتــە: بترســن لــەو ڕۆژەی هەمــوو کەسـێک ئەبینێــت هەر کارێکــی باشــی کردبێــت ئامادەیــە، وە هــەر کارێکــی خراپــی کردبێت ئــاوات دەخوازێ کــە لە نێــوان ئــەوو کارە خراپەکەیدا ماوەیەکــی زۆر دوور ببوایــە)، ﴿ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرٗا ۝٤٩ ﴾الكهـف، (واتــە: هــەر کردەوەیەکیــان کردبێــت تیایــدا ئامادەیــە).

ئــەم دەقــە ئەوپــەڕی هاندانــی تێدایە بــۆ ئەنجامدانــی کاری چاکــە ئەگەرچی کــەم بێت، وە ترســان لــە کاری خراپــە ئەگــەر چی بچــووکو بێ نــرخ بێ.

تەفسیری سوورەتی (الزلزلة) تەواو بوو.




## تەفسیری سوورەتی (العادیات)
## مەككییە (١٩) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١): خـوای بـەرزو مـەزن سـوێندی خـواردوە بـە ئەسـپ لـەوەی تیایدایـە لـە بەڵگـەو نیشـانە درەوشـاوەکانی خـوا، وە بەخششـە دیارەکانـی کـە زانراوە لـە پێش چـاوی خەڵکی، وە سـوێندی پێخـواردوە لە کاتێکـدا هیچ جـۆرە گیانلەبەرێکی بەشـدار نەکـردوە لـەو سـوێند خواردنـەدا، جـا فەرموویەتـی: ﴿وَٱلْعَٰدِيَٰتِ ضَبْحًا﴾ واتـە: (سـوێند بـەو ئەسـپانەی) کە زۆر بـە پەلەو بەهێـزەوە غـار دەدەن، پرمەیەکیـان لێـوە دێت، ئەویـش بریتیە لە دەنگێک لە ناو سـنگیەوە دەردەچێـت لـە کاتـی زۆربوونـی خێراییەکـەی.

(٢): ﴿فَٱلْمُورِيَٰتِ﴾ (ئنجـا سـوێند بـەو ئەسـپانەی) لە کاتـی جەنگدا بە ژێـر پێیان دەدەن لـە بـەردەکان، ﴿قَدْحًا﴾ واتـە: ئاگـر هەڵدەگیرسـێنن لـە ڕەقـیو پتـەوی ژێـر پێکانیان کاتێـک کـە تـاوو دەدەن بۆ جەنـگ کردن.

(٣): ﴿فَٱلْمُغِيرَٰتِ﴾ (واتە: سـوێند بە ئەسـپانی هێرشـبەر) بۆ سـەر دوژمن، ﴿صُبْحًا﴾ (لە بەیانیانـدا) ئەمـەش بە زۆریـە، بێگومان هێرش بـردن لە بەرەبەیانـدا دەبردرێ.

(٤): ﴿فَأَثَرْنَ بِهِۦ﴾ واتـە: بـە هێـرش بردنیـان بـە غـاردان، ﴿نَقْعًا﴾ واتـە: تـەپو تۆز (دروسـت دەکەن).

(٥): ﴿فَوَسَطْنَ بِهِۦ﴾ واتـە: بـە سـواریان ﴿جَمْعًا﴾ واتـە: خۆیـان دەخەنـە ناوەڕاسـتی دوژمنانـەوە، ئەوانـەی کـە هێـرش براوەتـە سـەریان.

إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٌ ﴿٦﴾ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ ﴿٧﴾ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ ﴿٨﴾ ۞ أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِى ٱلْقُبُورِ ﴿٩﴾ وَحُصِّلَ مَا فِى ٱلصُّدُورِ ﴿١٠﴾ إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌۢ ﴿١١﴾

(٦): وە سـوێند لەسـەر خـوراو فەرمایشـتی خوایـە کـە فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٌ ﴾ واتە: (بە ڕاسـتی ئادەمیزاد) ڕێگـری لـەو چاکـەی خـوا دەکات کـە وا بەسـەریەوە. جـا سروشـتی ئادەمیـزاد ئەوەیـە کـە نەفـسو دەروونـی ڕێگـەی پێنـادات بـەوەی لەسـەریەتی لـە مافەکان، تـا بـە تەواوەتـیو بـە شـێوەیەکی چـاک ئەنجامـی بـدات، بەڵکـو سروشـتی تەمبەڵو تەوەزەلـەو ڕێگری دەکات لـەو مافە ماڵیو جەسـتەییانەی کـە بەسـەریەوەن، مەگـەر کەسـێ خـوا ڕێنمایـی کردبێو لەم وەسـفە دەرچوویێـت، بۆ لای وەسـفی ڕێگـە پێدان بـە بەجێهێنانـی مافەکان.

(٧): ﴿ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ ﴾ واتـە: بێگومـان ئادەمیزاد لەوەی لە نەفسـی خۆی دەیزانێ، لـە ڕێگری کردنو ناسوپاسـیو سـپڵەیی شـایەتە بەوە، نـە نکووڵی لێدەکاتو نـە ئینکاری، چونکـە ئـەوە شـتێکی ڕوونو دیـارە، دەگونجێـت ڕانـاوی (إنە) بگەڕێتەوە بۆ خـوا، واتە: بەڕاسـتی بەنـدە بەرانبـەر بـە پەروەردگاری سـپڵەو ناسوپاسـە، خواش شـایەتە لەسـەر ئەوە، ئەمـە هەڕەشـەیەکی سـەختی تێدایە بۆ ئەو کەسـەی ناسوپاسـە بەرانبەر بە خـوا، بەوەی خوا شـایەتە لەسەری.

(٨): ﴿ وَإِنَّهُۥ ﴾ واتـە: ئادەمیـزاد ﴿ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ ﴾ واتـە: بـۆ مـاڵو سـامانی دونیـا ﴿ لَشَدِيدٌ ﴾ (زۆر توونـدە) واتـە: زۆر حەزی لێیەتی، وە خۆشەویسـتی بۆ ئەو ماڵو سـامانە ئەوەیـە وای لێکـردوە واز لـەو ئەرکانـە بهێنـێ کە پێویسـتن لەسـەری، هەواو ئـارەزووی پێشخسـتووە بەسـەر مافـی پەروەردگاریـدا، هەمـوو ئەمانـەش بە هـۆی کەم تێگەیشـتنێتی بەرانبـەر بـە ژیانـی دونیاو بێئاگـا بوونی لـە دواڕۆژ، لەبـەر ئەمەیە خوا هانی دەدات لەسـەر ترسـان لـە ڕۆژی دوایـیو فەرموویەتی:

(٩): ﴿ أَفَلَا يَعْلَمُ ﴾ واتـە: ئایـا ئـەم یاخیبـووە نازانـێ، ﴿ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِى ٱلْقُبُورِ ﴾ واتـە:

کاتێ کە خوا مردووەکان دەردێنێ لە گۆڕەکانیان، بۆ کۆکردنەوەو لێپرسینەوەیان.
(١٠): ﴿ وَحُصِّلَ مَا فِي ٱلصُّدُورِ ﴾ واتە: ئاشکرا بوو دەرکەوت ئەوەی لەناو دڵەکاندایەو شاردراوەتەوە لە خێرو چاکە، ئنجا نهێنی ئاشکرا بوو، نادیاریش دەرکەوت لە پێش چاوی هەموو خەڵکی دەرەنجامی کردەوەکانیان ئاشکرابوو.
(١١): ﴿ إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌ ﴾ (واتە: بێگومان پەروەردگاریان لەو رۆژەدا) ئاگادارە لەسەر کردەوە ئاشکراو نهێنیو شاراوەو دیارەکانیان، وە پاداشتیان دەداتەوە لەسەری، وە تایبەتی کردوە ئاگادار بوونی بەو رۆژە، لەگەڵ ئەوەدا ئەو ئاگادارە پێیان لە هەموو کاتێکدا، چونکە مەبەست لەوەدا پاداشت دانەوەیە لەسەر ئەو کردەوانەی کە لە زانستی خواو ئاگادار بوونی سەرچاوەی گرتووە.

تەفسیری سوورەتی (العادیات) تەواو بوو.


سورة القارعة
بسم الله الرحمن الرحيم
ٱلْقَارِعَةُ ① مَا ٱلْقَارِعَةُ ② وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْقَارِعَةُ ③ يَوْمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلْفَرَاشِ ٱلْمَبْثُوثِ ④ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ ⑤ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ⑥ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ⑦ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ⑧ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ⑨ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا هِيَهْ ⑩ نَارٌ حَامِيَةٌ ⑪

## تەفسیری سوورەتی (القارعة)
## مەککییە (١١) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٤): ﴿ ٱلْقَارِعَةُ ﴾ یەکێکە لە ناوەکانی ڕۆژی دوایی، ناونراوە بەوە، چونکە خەڵکی دادەچڵەکێنێ‌و بێزاریان دەکات بە مەترسیەکانی.

لەبەر ئەمەیە خوا بە مەزن‌و گەورەی داناوە، وەک فەرموویەتی: ﴿ ٱلْقَارِعَةُ ۝١ مَا ٱلْقَارِعَةُ ۝٢ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْقَارِعَةُ ۝٣ يَوْمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ ﴾ (واتە: ڕۆژێ کە خەڵکی) لە سەختی تۆقین‌و مەترسیدا ﴿ كَٱلْفَرَاشِ ٱلْمَبْثُوثِ ﴾ واتە: وەکو کوللەی پەرش‌و بڵاویان لێ دێت هەندێکیان شەپۆل دەدەن بە ناو ئەوی دیکەدا، و(الفراش) ئەو گیانلەبەرانەیە کە لە شەودا شەپۆل دەدەن بەناو یەکتردا، نازانن ڕووبکەنە کوێ، ئەگەر ئاگرێکیان بۆ بکرێتەوە بەهۆی لاوازی هەستکردنیان خۆیان تێی فڕێ دەدەن، ئەمەش حاڵی خەڵکی خاوەن عەقڵە.

(٥): بەڵام کێوە کەڕو سەخت‌و قایمەکان، ئەوانیش ﴿ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ ﴾ واتە: وەکو خوری شیکراوەیان لێ دێ، کە زۆر لاوازە، کزەبایەک هەڵیدەگرێ‌و دەیبات. خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ ۝٨٨ ﴾ النمل، (واتە: وە ئەو کێوانە دەبینی وادەزانی دامەزراون لە شوێنی خۆیاندا کاتێ فوو کرا بە صوردا چیاکان وەکو ڕۆشتنی هەور دەڕۆن).

پاشان دوای ئەوە دەبن بە تەپ‌و تۆزو پەرش‌و بڵاو دەبنەوە، هیچ شتێکیان نامێنێ کە ببینرێ، ئا لەو کاتەدا تەرازووەکان دادەنرێن‌و خەڵکی دەبن بە دوو بەشەوە: بەختەوەران‌و بەدبەختان:

(٦-٧): ﴿ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴾ واتــە: چاکەکانــی قــورس‌و گــران بوون لەســەر خراپەکانــی، ﴿ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴾ واتــە: لــە بەهەشــتێکی پــڕ لــە نازونیعمەت.
(٨-٩): ﴿ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴾ (واتــە: وە ئــەوەی کێشــی چاکەکانی ســووک بێ بــەوەی) چاکەکانــی بەرگری خراپەکانــی نەدەگــرت ﴿ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ﴾ واتە: جێگاو شــوێنی ئــەو ئاگرە، کــە (الهاویــة) یەکێکــە لە ناوەکانــی ئاگر، وەکــو دایکی لــێ دێت بۆ ئــەو ئەوەندە پەیوەســت دەبــێ پێیەوە، وەک خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ ﴾الفرقان. (واتە: بەڕاســتی ســزای ئــەو دۆزەخە لانە چــووی بەردەوامە). وتراوە: مانــای ئەوەیــە دایکــی دەماغی لــە ئاگردایە، واتە: لەســەر ســەر دەخرێتە نــاو دۆزەخەوە.
(١٠-١١): ﴿ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا هِيَهْ ﴾ (واتــە: تــۆ چووزانیــت هاویــە چیــە) ئەمیــش بــە مەزندانانــی ڕووداوەکەیەتــی، پاشــان تەفســیری کــردوە بە فەرمایشــتی خــۆی، دەفەرموێ: ﴿ نَارٌ حَامِيَةٌۢ ﴾ (واتــە: ئاگرێکــی هەڵگیرســاوە) زۆر ســەخت‌و گــەرم‌و دژوارە، گەرمیەکــەی ئەوەنــدە زۆرە بە قــەد حەفتا ئەوەنــدەی ئاگــری دونیایە، پەنا بە خــوا دەگرین لــەو ئاگــرە (اللهم آمین).

تەفسیری سووڕەتی (القارعة) تەواو بوو.


سُورَةُ التَّكَاثُرِ
بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ ① حَتَّىٰ زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ ② كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ③ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ④ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ الْيَقِينِ ⑤ لَتَرَوُنَّ الْجَحِيمَ ⑥ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ الْيَقِينِ ⑦ ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ ⑧

## تەفسیری سووڕەتی (التكاثر)
## مەککییە (٨) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١): خـوا ﷻ سەرزەنشـتی بەندەکانـی دەکات کـە خۆیـان سـەرقاڵو بێئاگا بکەن لـەوەی بـۆی دروسـتکراون کـە بریتیـە: لـە پەرستشـی ئـەو زاتە بـە تـاک‌و تەنهاو بـێ هاوبـەش دانـان، وە ناسـینی‌و گەڕانەوە بـۆ لای‌و پێشخسـتنی خۆشەویسـتی ئـەو بەسـەر هەمـوو شـتێکدا، ﴿ أَلْهَىٰكُمُ ﴾ (واتـە: ئێوەی سـەرقاڵ کـردوە) لەوەی کە باسـکرا، ﴿ ٱلتَّكَاثُرُ ﴾ (زۆری سـەروەت‌و سـامان) باسـی ئـەوەی نەکردوە کـە پێی زیـاد دەکات، بۆ ئـەوەی هەموو ئەوانـە بگرێتەوە کـە پێـی زیـاد دەکەن، شـانازی کەرانیش شـانازی پێـوە دەکەن، لـە زۆری ماڵ‌و سـامان‌و منـداڵ‌و پشـتیوان‌و سـەربازو خزمەتـکارو ناوبانـگ‌و جگـە لەوانیش، کـە مەبەسـت تێیدا زیادکردنـی کۆمەڵێکـە بەسـەر کۆمەڵێکـی دیکـەوەو بـە هیـچ شـێوەیەک مەبەسـتی پێی دڵسـۆزی نیـە بـۆ خوا.

(٢): بێئاگایـی‌و سـەرقاڵی‌و کۆکردنەوەتـان بەردەوامـە ﴿ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ ﴾ (واتـە: تـا دەمـرن‌و دەچـن بـۆ گۆڕسـتان) ئـەو کاتـە ڕاسـتیتان بـۆ دەردەکـەوێ، بـەڵام دوای ئەوە بیانـووی دەسـت پێکردنـەوەی ژیانتـان نامێنـێ، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ ﴾ دەبێتـە بەڵگە لەسـەر ئـەوەی بێگومان ژیانی بـەرزەخ ماڵێکە مەبەسـت تیایـدا تێپەڕبوونە بۆ ماڵـی هەمیشـەیی، چونکە خـوا ﷻ بە زیارەتـکار ناوی بـردوون، نەک بە هەمیشـەیی، ئەوە دەبێتـە بەڵگـە لەسـەر زیندوو کردنەوەو پاداشـت بە کـردەوەکان، لە ماڵی هەمیشـەیی نەک ماڵـی کاتـی (کـە دونیایە)، ئـا لەبەر ئەمەیـە هەرەشـەی لێکـردوون‌و فەرموویەتی:

(٣-٥): ﴿ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ۝٣ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ۝٤ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ

ﭐلۡيَقِينِ ﴾ واتــە: ئەگــەر دەتانزانــی چ شــتێ لــە پێشــتانە، ئــەوە هەرگیــز کۆکردنــەوەی ســەروەتو ســامان ســەرقاڵی نەدەکــردن، بەڵکو پەلەتــان دەکرد لــە بەدەســتهێنانی کردەوە چاکــەکان، بــەڵام نەبوونــی زانســتی ڕاســتەقینە ئێــوەی گەیانــدە ئــەوەی کــە دەیبینــن.

(٦) ﴿ لَتَرَوُنَّ ٱلۡجَحِيمَ ﴾ واتــە: بێگومــان دەبرێــن بــۆ ڕۆژی دواییو بەڕاســتیش ئەو دۆزەخــە دەبینــن کە خــوا ئامادەی کــردوە بــۆ بێبڕوایان.

(٧): ﴿ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيۡنَ ٱلۡيَقِينِ ﴾ واتــە: (دووبــارە ســوێند بــە خــوا دۆزەخ) بــە چاوی ســەر دەبینن، وەک خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ وَرَءَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمۡ يَجِدُواْ عَنۡهَا مَصۡرِفٗا ﴿٥٣﴾ ﴾ الکهف، (واتــە: وە تاوانبــاران ئاگــری دۆزەخ دەبینــن، وە هەمــوو دەزانــنو دڵنیان کــە دەچنــە نــاویو تێیدەکــەون، وە ڕێگایەکیان دەســت ناکەوێ بــۆ گەڕانــەوە لــەو ئاگرە).

(٨): ﴿ ثُمَّ لَتُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴾ (واتــە: لــە پاشــان ســوێند بــە خــوا لــەو ڕۆژەدا پرســیاری هەمــوو بەهرەیەکتــان لێدەکــرێ)، کە لــە دونیــادا لەزەتتــان لێوەرگرتــووە، ئایا هەســتاون بــە سوپاســگوزاری کردنی خــوا، مافی خواتــان تیایــدا بەجێهێنــاوە، وە بەکارتان نەهێنــاوە بۆ ســەرپێچی کردنی؟ جــا ڕێگریتان لێ بکات لــە نازوونیعمەتــێ بەرزترو چاکتر بــێ لەوە.

یــان فریووتــان خــوارد پێــیو شــوکرانە بژێری خواتان لەســەر نەکــرد، بەڵکو هەنــدێ جار بەکارتــان هێنــا بــۆ ســەرپێچی کردنــی خوا؟ جــا خوا ســزاتان دەدات لەســەر ئــەوە، وەک فەرموویەتــی: ﴿ وَيَوۡمَ يُعۡرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَلَى ٱلنَّارِ أَذۡهَبۡتُمۡ طَيِّبَٰتِكُمۡ فِي حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنۡيَا وَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهَا فَٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ ﴿٢٠﴾ ﴾ الأحقــاف، (واتــە: وە بیریان بخەرەوە ئــەو ڕۆژەی ئەوانەی کــە بێبــڕوان بەرانبــەر دۆزەخ ڕادەگیرێن، پێیان دەوترێت هەرچی خۆشــیتان بوو بەســەرتان بــرد لــە ژیانی دونیاتانــدا، بەهرەو لەزەتتان لــێ وەرگرت بۆیــە ئەمڕۆ تۆڵەتان لێ دەســەنرێ بە ســزایەکی ڕیسواکەر).

تەفسیری سووڕەتی (التکاثر) تەواو بوو.


سورة العصر
بسم الله الرحمن الرحيم
وَالْعَصْرِ ۝١ إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ ۝٢ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ ۝٣

## تەفسیری سوورەتی (العصر)
## مەککییە (٣) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿وَالْعَصْرِ ۝١ إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ ۝٢ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ ۝٣﴾:

خوا ﷻ سوێند بە (العصر) دەخوات کە ئەویش بریتییە لە شەوو ڕۆژ، جێگای کارو کردەوەی بەندەکان، بە ڕاستی هەموو ئادەمیزاد لە زیانو خەسارەتمەندی دایە، خەسارەتمەندیش دژی قازانجو دەستکەوتە. زیانو خەسارەتیش چەندین پلەو پایەی جیاوازیان هەیە:

هەندێ جار ئادەمیزاد خەسارەتمەندە بە ڕەهایی وەکو حاڵی ئەو کەسەی دونیاو دوارۆژی لە دەست داوە، وە نازو نیعمەتی لە کیس چووە شیاوی ئاگری دۆزەخە، هەندێ جار خەسارەتمەندە لە هەندێ ڕووەوە جگە لە هەندێکی دیکە، لەبەر ئەمەیە خوا خەسارەتمەندی گشتگیر کردوە بۆ هەموو ئادەمیەک، مەگەر کەسێ وەسفکرا بێت بە چوار سیفەت: بڕوابوون بەوەی خوا فەرمانی پێکردوە، بڕواش بەبێ زانست نابێت، زانستیش لقە بۆ بڕواهێنان، ئیمان تەواو نابێت بە زانست نەبێ، وە کردەوەی چاک ئەمەش گشتگیرە بۆ کارە چاکەکان بە گشتی: ئاشکراو نهێنی کە پەیوەستە بە مافی خواو مافی بەندەکانی، ئەوەی پێویستو پەسندە.

وە ئامۆژگاری یەکتریان کردبێ بە حەق، کە ئەویش بڕواهێنانو کردەوەی چاکە، هەندێکیان ئامۆژگاری هەندێکیان دەکەن بەوە، هانی یەکتر دەدەن

لەسـەری، وە ئامۆژگـاری یەکتـر دەکـەن بـە ئارامگرتـن لەسـەر گوێڕایەڵـی کردنـی خـواو سـەرپێچی کردنـی، وە لەسـەر قـەزاو قـەدەرە بـە ئێشـەکان.
جـا کاری یەکـەمو دووەم ئادەمیـزاد نەفسـی کامـڵ دەبـێ، وە بـە تـەواو کردنـی دووانەکـەی تـر جگـە لـە خـۆی تـەواو دەکات، وە بـە تەواوکردنـی ئـەو چـوار دانەیـە ئادەمیـزاد ڕزگـاری دەبێـت لـە خەسـارەتمەندیو سـەرفراز دەبـێ بـە قازانجێکـی مـەزن.

تەفسیری سووڕەتی (العصر) تەواو بوو.


سورة الهمزة
بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ﴿١﴾ الَّذِي جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُ ﴿٢﴾
يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ ﴿٣﴾ كَلَّا لَيُنبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ ﴿٤﴾
وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ ﴿٥﴾ نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ ﴿٦﴾ الَّتِي تَطَّلِعُ
عَلَى الْأَفْئِدَةِ ﴿٧﴾ إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ﴿٨﴾ فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ ﴿٩﴾

## تەفسیری سوورەتی (الهمزة)
## مەککییە (٩) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٢): ﴿ وَيْلٌ ﴾ واتــە: هەرەشــەو زیــانو سـزای سـەخت ﴿ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ﴾ (واتــە: بۆ هەمـوو عەیب گرێکـی تانەدەر) بـە ڕەفتـاری عەیـب لـە خەڵکـی دەگرێو بـە گوفتـاری تانەیـان لـێ دەدات، جـا (الهمـاز) ئەو کەسـەیە کە عەیـبو نەنگی لە خەڵـک دەگرێو تانەیان لــێ دەدات بە ئامـاژەو کـردەوەو (اللمـاز): ئەو کەسـەیە کە عەیبو کـەمو کوڕیان لـێ دەردەکات بـە گوفتـاری، وە لـە سـیفەتی ئەم عەیب گـری تانـەدەرە، ئەو هیـچ خەمێکی نیـە، جگە لە کۆکردنـەوەی سـەروەتو سـامانو ژماردنیو حـەز لێکردنـی، وە هیچ حەزێکـی تێدانیە لە بەخشـین لـە ڕێگاکانـی چاکـەو پەیوەنـدی خزمایەتیو جگـە لەویش.

(٣): ﴿ يَحْسَبُ ﴾ بـە نەفامـی خـۆی وادەزانـێ، ﴿ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ ﴾ (واتــە: ماڵەکـەی دەیهێڵێتــەوە) لـە دونیــادا، لەبـەر ئەوەیە هــەوڵو کۆششــی هەمووی لــە زیادکردنــی ماڵو سـامانەکەیدایە، کــە پێــی وایە ئەو ماڵو ســامانە تەمەنی درێــژ دەکـەن. وە نەیدەزانی کە بە ڕاسـتی ڕەزیلـیو چرووکی تەمەنـەکان دەشـکێنێو وڵات کاول دەکات، بێگومان چاکەش تەمەن درێــژ دەکات.

(٤-٥): ﴿ كَلَّا لَيُنبَذَنَّ ﴾ (واتــە: نەخێـر وانیــە) بێگومان فـڕێ دەدرێتە ﴿ فِي الْحُطَمَةِ ﴿٤﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ ﴾ (واتــە: نـاو ئاگرێکـی تێکشـکێنەر * تـۆ چووزانیـت ئـەو ئاگرە چیــە؟) بــە مەزندانانــی ئەو ئاگرەیەو تــرسو تۆقینی تێدایە لە پلەو پایەی، پاشــان تەفســیری کــردوە بە فەرمایشــتی خـۆیو فەرموویەتی:

(٦-٧): ﴿ نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ ﴾ (واتــە: ئاگرێکـی تـاودراوی خواییــە) کـە سـوتەمەنیەکەی

خەڵکـیو بـەردە، ﴿ ٱلَّتِى ﴾ لـە سـەختی ئـەو ئاگـرە ﴿ تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ ﴾ واتـە: بەسـەر جەسـتەدا ورووژم دەباتـە سـەر دڵان، لەگـەڵ ئـەم گەرمیـە زۆرەدا ئـەوان زیندانـی کراون تیایـدا، بـێ ئومێد بـوون لـە دەرچوونیـان لێی.

(٨-٩): لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ﴾ واتـە: (بێگومـان ئـەو ئاگرە) داخراوە لەسـەریان، ﴿ فِى عَمَدٍ ﴾ (واتە: زنجیر کراون) لە پشـتی دەرگاکانەوە، ﴿ مُّمَدَّدَةٍ ﴾ (واتـە: بـەرزوو بڵندە) بۆ ئـەوەی لێیەوە دەرنەچـن، ﴿ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَآ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَقِيلَ ﴿٢٠﴾ ﴾ السـجدة، (واتە: هـەر کاتێ بیانەوێ لـە دۆزەخ دەربچن دووبـارە دەیانگێڕنەوە نێـو دۆزەخ)، پەنـا دەگریـن بە خوا لـەو حاڵـە، وە داوای لێبوردنو سـەلامەتی لـێ دەکەین (اللهم آمین).

تەفسیری سووڕەتی (الهمزة) تەواو بوو.


سورة الفيل
بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ ① أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ ② وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ③ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ④ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ ⑤

## تەفسیری سوورەتی (الفیل)

**مەککییە (٥) ئایەتە**

**بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە**

(١-٥) ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ (١) أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ (٢) وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ (٣) تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ (٤) فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ (٥) ﴾:

واتە: ئایا نەتبینی لە تواناو دەسەلاتی خواو مەزنی پلەو پایەیو میهرەبانی بەرانبەر بەندەکانی، وە بەڵگەی یەکتاپەرستیو ڕاستی پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ کە چی کرد بە خاوەن فیلەکان، ئەوانەی ویستیان ماڵی پیرۆزی بروخێنن، بۆیە لەو پێناوەدا خۆیان ئامادە کردو سەر لە بەیانی فیلەکانیان لەگەڵ خۆیاندا برد بۆ ڕووخاندنی، هێزێکیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، لە حەبەشەو یەمەنەوە لە توانای عەرەبدا نەبوو ڕوو بەڕوویان ببێتەوە، کاتێ نزیک بوونەوە لە شاری مەککە عەرەبیش بە هیچ شێوەیەک نەیدەتوانی بەرگری بکات، خەڵکی مەککە شارەکەیان بەجێهێشت، بەهۆی ترسانیان لە نەفسی خۆیان، خوا ﷻ ناردیە سەریان باڵندەی (أبابیل) واتە: پۆل پۆلو جیا جیا، لەگەڵ خۆیاندا وورده بەردی گەرمی لە زیخی گڵینیان هەڵگرتبوو، ئنجا پێی بەرد بارانیان کردن، ئەو بەردباران کردنە شوێنی دوورو نزیکیان کەوت، لە هۆش خۆیان چوونو تیاچوون، سەرەنجام وەکو کای خوراویان لێهات، خوا شەڕو خراپەی وەستاندن، وە پیلانەکانیانی گەڕاندەوە بۆ سەر خۆیان، چیرۆکەکەیشیان چیرۆکێکی بەناوبانگو بڵاوە، ئەو ساڵە بوو کە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ تێیدا لە دایک بوو، یەکێک بوو لەو ڕووداوانەی پێش هاتنی دەرکەوت، وەکو بەڵگەیەکی سەرەتایی بۆ هاتنی پەیامەکەی، سوپاسو ستایش بۆ خوا.

تەفسیری سوورەتی (الفیل) تەواو بوو.


سورة قريش
بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ ① إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ ② فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَٰذَا الْبَيْتِ ③ الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ ④

## تەفسیری سووڕەتی (قریش)
## مەککییە (٤) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٤) ﴿لِإِيلَٰفِ قُرَيْشٍ ۝١ إِۦلَٰفِهِمْ رِحْلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيْفِ﴾ زۆرێک لە ڕاڤەزانانی قورئان وتوویانە: کە (جارو مجرور)ی (لإيلاف) پەیوەستە بە سووڕەتەکەی پێش خۆی، واتە: ئەوەی هێنامان بەسەر خاوەنانی فیلدا، لەبەر قورەیش‌و ئاسایشی ئەوان‌و بەردەوامی بەرژەوەندیان‌و ڕێکخستنی کاروانیان بوو لە زستاندا، بۆ یەمەن‌و لە هاوینیشدا بۆ شام، بۆ بازرگانی‌و دابین کردنی بژێوی ژیانیان.

جا خوا ﷻ ئەوانەی لەناوبرد کە مەبەستیان زیان گەیاندن بوو بە خەڵکی ئەو شارە، وە ماڵی پیرۆزی خۆی‌و خەڵکەکەی لە دڵی عەرەبدا بە مەزن دانا، تا ڕێزیان لێ بگرن، وە ڕووبەڕوویان نەبنەوە، لە هەر گەشتێکدا بیانەوێ، ئا لەبەر ئەمەیە خوا فەرمانی پێکردوون بە سوپاسگوزاری، فەرموویەتی: ﴿فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ﴾ (واتە: پەروەردگاری خاوەنی ئەم ماڵە پیرۆزە کەعبە بپەرستن) بۆ ئەوەی بەتاک‌و تەنها بیپەرستن‌و بەدڵسۆزیەوە بەندایەتی بۆ بکەن، ﴿ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ﴾ واتە: ئەو زاتەی کە لە برسێتی ڕزگاری کردن‌و خواردەمەنی بۆ ناردن، وە لە ترس‌و بیم پاراستنی‌و دڵنیای کردن، جا خۆشگوزەرانی‌و ئەمن‌و ئاسایش لە ترس، لە گەورەترینی نیعمەتە دونیاییەکانە، کە سوپاسگوزاری کردنی خوا پێویست دەکات.

خوایە ستایش‌و سوپاسگوزاری تەنها بۆ تۆیە لەسەر نیعمەتە ئاشکراو نهێنیەکانت. وە خوا پەروەردگارێتی تایبەت کردووە بەو ماڵە پیرۆزە، بە هۆی شەرەف‌و ڕێزیەوە، ئەگەرنا ئەو زاتە پەروەردگاری هەموو شتێکە.

تەفسیری سووڕەتی (قریش) تەواو بوو.


سورة الماعون
بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ① فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ② وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ③ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ④ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ⑤ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ⑥ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ⑦

## تەفسیری سوورەتی (الماعون)
## مەككییە (٧) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١): خوا ﷻ سەرزەنشتی ئەو کەسە دەکات کە واز لە مافەکانی خواو مافی بەندەکانی دێنێ، دەفەرموێ: ﴿ أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴾ (واتە: ئاخۆ دیتت ئەو کەسەی کە بڕوای) بە زیندووکردنەوەو پاداشتو سزا نیە، وە بڕواشی بەوە نیە کە پێغەمبەران هێناویانە.

(٢): ﴿ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ﴾ (واتە: ئەوە کەسێکە) کە بە توندیو سەختیەوە پاڵ بە هەتیوەوە دەنێتو بەزەیی پێدا نایەتەوە، ئەویش بە هۆی دڵڕەقیەوە، لەبەر ئەوەی نە ئومێدی پاداشتی هەیە نە لە سزا دەترسێت.

(٣): ﴿ وَلَا يَحُضُّ ﴾ (هانی) غەیری خۆی نادات، ﴿ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴾، (واتە: خواردەمەنیدان بە هەژاران)، وە خۆی لە پێشترە کە خواردەمەنی بە هەژار نەدات.

(٤-٥): ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴾ واتە: (جا هاوارو واوەیلا بۆ نوێژکەران) ئەوانەی پابەندن بە بەجێهێنانی نوێژ، بەڵام ئەوان ﴿ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴾ واتە: نوێژەکانیان دەفەوتێننو لە کاتی خۆیدا ئەنجامی نادەنو پایەکانی لە دەست دەدەن.

ئەمیش بە هۆی گرنگی نەدانیان بە فەرمانی خوا، نوێژەکانیان وون کردو فەوتاندیان، کە ئەوانە گرنگترینی گوێڕایەڵیەکانو چاکترینی نزیک بوونەوەکانن، بێئاگا بوون لە نوێژدا خاوەنەکەی شیاوی سەرزەنشتو لۆمە دەکات، بەڵام بێئاگا بوون لە ناو نوێژدا ئەمە لە هەموو کەسێکدا ڕوو دەدات، تەنانەت لە پێغەمبەریش ﷺ.

لەبەر ئەمەیە خوا ﷻ وەسفی ئەوانەی کردوە بە ڕیایی کردنو دڵڕەقیو نەبوونی سۆزو بەزەیی، جا فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ﴾ واتە: کارەکان ئەنجام دەدەن لە پێناو

ڕووپامایــی کردنــی خەڵکیدا، ﴿ وَيَمۡنَعُونَ ٱلۡمَاعُونَ ﴾ واتــە: ڕێگری لە پێدانو بەخشــینی شــتێک دەکــەن، کــە ئــەو بەخشــینە هیــچ زیانێکی نیــە بە شــێوەی پێــدانو بەخشــین، یان دیــاری، وەکــو قــاپو ســەتڵو تەور پــاچو قازمــە، وە وێنــەی ئەوانــە، بەوەی کــە نەریت وادەخــوازێ ببەخشــرێو چاوپۆشــی لــێ بکرێــت. جا ئەوانــە -بە هــۆی ســووربوونیانەوە- قەدەغــەی چاکــەو کۆمەکــی دەکــەن، جا چۆن لــەوە زیاتر دەبەخشــن.

لــەم ســوورەتەدا هاندانــی تێدایــە لەســەر ڕێزگرتنــی هەتیــوو هــەژاران، وە هاندان لەســەر ئەوانــە، وە ڕەچاوکردنــی نوێژو پارێزگاری لێکردنی، وە لەســەر دڵســۆزی تیایــدا لە هەموو کاروکردەوەکانیش، وە هاندان لەســەر کاری چاکو بەخشــینی ئەو شــتانەی کە ســووکو ئاســانن، وەک پێــدانو بەخشــینی قــاپو قاچاخو ســەتڵو کتێــبو وێنەی ئەوانــە، چونکە خــوا ﷻ سەرزەنشــتی ئەو کەســەی کــردوە کە ئــەم کارە ئەنجام نــادات، خــوای گەورەش زاناتــرە بە حەقیقەتو ڕاســتی، وە ســوپاسو ســتایش بــۆ پەروەردگــاری جیهانییان.

تەفسیری سوورەتی (الماعون) تەواو بوو.




## تەفسیری سوورەتی (الكوثر)
## مەككییە (٣) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٣): خوا ﷻ منەت دەکات بەسەر پێغەمبەرەکەیداو دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ﴾ واتە: خێرێکی زۆرو بەخششێکی بێ پایان، لە کۆی ئەوانەدا ئەوەیە کە خوا لە ڕۆژی دواییدا دەیبەخشێ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، لەو ڕووبارەی کە پێی دەوترێ (الكوثر) وە لەو حەوزەی درێژیەکەی مانگە ڕێیەکە، وە پانیەکەیشی مانگە ڕێیەکە، ئاوەکەی سپیترە لە شیرو خۆشترو شیرنترە لە هەنگوین، پەرداخەکانی وەکو ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمانن لە زۆریو ڕووناکیدا، هەر کەسێک لێی بخواتەوە بە یەک خواردنەوە هەرگیز دوای ئەوە تینووی نابێت.

کاتێ باسی منەتی خۆی کرد بەسەریەوە، فەرمانی پێکرد بە سوپاس گوزاری کردنی، جا فەرمووی: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنۡحَرۡ﴾ (واتە: دەی کەواتە نوێژ بکە بۆ پەروەردگارت وە قوربانی سەرببڕە) ئەم دوو پەرستشەی تایبەت کردوە بە ناوهێنان، چونکە چاکترینی پەرستشەکانو گەورەترینی نزیک کەرەوەکانن، لەبەر ئەوەی نوێژ ملکەچی دڵو ئەندامانی جەستە لەخۆ دەگرێ بۆ خوا، وە دەیگوازێتەوە بۆ جۆرەها پەرستش.

لە قوربانیدا نزیکبوونەوەی تێدایە لە خوا بە چاکترین قوربانی لەلای بەندە، وە دەرهێنانی ئەوماڵەیە کە نەفسو دەروون ڕاهاتووە لەسەر خۆشەویستیو ڕەزیلی کردنی، ﴿إِنَّ شَانِئَكَ﴾ واتە: بێگومان ئەوەی کە ڕقی لێتەو سەرزەنشتت دەکاتو بە کەمت دەزانێ، ﴿هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ﴾ واتە: ئەو دوو بڕاوەیە لە هەموو خێرێک، بێ کردەوەو بێ زیکرو یادکردنەوەیە.

بەڵام موحەممەد ﷺ بە حەقیقەت ئەو کامڵو تەواوە، کە ماڵی پێویستی وەرگرتووە لە ئاستی بەدیهێنراوەکاندا، لە بەرزکردنەوەی ناوهێنانیو زۆری پشتیوانو شوێنکەوتوو.

تەفسیری سوورەتی (الكوثر) تەواو بوو.


سُورَةُ الكَافِرُونَ
بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢
وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ۝٤
وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٥ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ۝٦

## تەفسیری سوورەتی (الكافرون)

## مەككییە (٦) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٦): ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ۝٤ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٥ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ۝٦ ﴾:

﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾ واتــە: بــە ئاشــکراو بــە راشــکاوی بــە بێبڕوایــان بڵێ: ﴿ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴾ واتــە: خــۆت بــەری بکــە لــەوەی ئــەوان دەیپەرســتن لە غەیــری خــوا بــە ئاشــکراو بــە نهێنی.

﴿ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴾ (واتــە: ئێــوەش ئــەو خوا پەرســتیە ناکەن کە مــن دەیکەم) بــە هــۆی دڵســۆزی نەبوونتــان لــە پەرستشــیدا، جــا پەرستشــتان بــۆ ئەو کــە پەیوەســتە بە هاوبەشــدانان پێــی ناوترێ پەرســتش.

پاشــان ئــەوەی دووبــارە کردوەتەوە تــا ببێتــە بەڵگە لەســەر نەبوونــی بوونی هاوبەشــدانان، وە دووەمیشــی دووبــارە کردوەتــەوە تــا ببێتە وەســفێکی پێویســت. لەبەر ئەمەیــە جیاوازی کــردوە لە نێوان ئەو دوو دەســتەداو درێــژەی داوە بەو دوو دەســتەیەو فەرموویەتی: ﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ﴾ (واتــە: ئاینــی خۆتــان بــۆ خۆتانو ئاینی خــۆم بۆ خۆم)، هــەر وەک خوا فەرموویەتــی: ﴿ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَىٰ سَبِيلًا ۝٨٤ ﴾الإسراء، (واتــە: ئــەی موحەممەد ﷺ هەموو کەس کار دەکات لەســەر سروشــتو رێبــازی خۆی، جا پەروەردگارتــان زاناتــرە بەو کەســەی کە رێبازەکەی راســترە).

تەفسیری سوورەتی (الكافرون) تەواو بوو.


سُورَةُ النَّصۡرِ
بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ① وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ② فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ③

## تەفسیری سوورەتی (النصر)

## مەدەنییە (٣) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿ إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ
(١) وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي
دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا (٢) فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ
وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا (٣) ﴾:

لەم سوورەتە پیرۆزەدا مژدەو فەرمان هەیە بۆ پێغەمبەرەکەی لە کاتی بەدەستهێنانی، وە ئاماژەو وریاکردنەوە هەیە لەسەر ئەوەی ڕێک دەخرێت لەسەر ئەو مژدەو فەرمانە.

جا مژدە: بریتییە لە مژدەی سەرکەوتنی خوا بۆ پێغەمبەرەکەی‌و ئازاد کردنی شاری مەککە، هاتنی خەڵکی بۆ ناو ڕیزەکانی ئیسلام پۆل پۆل، بە جۆرێ زۆرێک لەوان لە شوێنکەوتوو پشتیوانانی بوون، دوای ئەوەی لە ڕیزی دوژمنانی بوون، بێگومان ئەم مژدە پێدراوە هاتە جێ.

بەڵام فەرمان کردن لە دوای بەدەستهێنانی سەرکەوتن‌و ئازاد کردن دێت، خوا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کرد کە سوپاس گوزاری پەروەردگاری بکات لەسەر ئەو سەرکەوتنە، وە پەروەردگاری بە پاک ڕابگرێ‌و ستایشی بکات‌و داوای لێخۆشبوونی لێ بکات، بێگومان لەوەدا دوو ئاماژە هەیە:

ئاماژەیەک هەیە بۆ بەردەوام بوونی سەرکەوتن بۆ ئەم ئاینە، وە زیاد دەکات لە کاتی بەپاک ڕاگرتنی خوا بە ستایشکردنی‌و داوای لێخۆشبوون لە پێغەمبەرەکەی، بێگومان ئەمە لە سوپاسگوزارییەوەیە، خواش دەفەرموێ: ﴿ لَئِن شَكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُمۡ (٧) ﴾ إبراهيم، (واتە: سوێند بێ بێگومان سوپاسی چاکەی من بکەن بۆتان زیاد دەکەم)، بێگومان ئەوە بینرا لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدین‌و دوای ئەوانیش لەم ئوممەتە، سەرکەوتنی

خـوا بـەردەوام بـوو، تـا ئاینـی ئیسـلام گەیشـتە ئـەو شـوێنو جێگایانـەی کـە ئاینەکانی دیکـە پێـی نەگەیشـتبوون، وە چـووە نێـو ئـەو ئاینەوە کـە غەیری ئـەو ئاینە نەچـوو بووە ناویـەوە، تـا سـەرپێچی کردنـی فەرمانـی خـوا لـەم ئوممەتـەدا ڕوویـدا، ئنجا خوا تووشـی بـەڵای جیـاوازی فەرمانو بڕیـاری کـردن، ئنجا ئـەوەی ڕوویدا کـە ڕوویدا.

لەگـەڵ ئەمـەدا ئـەم ئوممەتە خوا سـۆزو بەزەییو نـەرمو نیانی خـۆی بەسـەریدا داباراندوە، کە بـە خەیاڵی هیـچ کەسـێکدا نایەت.

بـەڵام ئامـاژەی دووەم: ئەوەیـە کـە ئەجەلـی پێغەمبەری خـوا ﷺ زۆر نزیـک بووەتەوە، وە ڕووی ئەمـەش بێگومـان تەمەنەکـەی تەمەنێکـی پیـرۆزو چـاک بـووە، خوا سـوێندی پێ خـواردوە، وە بـە دڵنیاییـەوە پەیمانیـداوە کـە ئەم کاروبـارە چاکانـە بە داوای لێخۆشـبوون کۆتاییـان پـێ دێ، وەک نوێـژو حـەجو جگـە لەوانیش.

جـا فەرمانـی خوا بـۆ پێغەمبەرەکەی بە سـتایشو داوای لێخۆشـبون لـەم حاڵەتـەدا، ئاماژەیە کـە ئەجەلـی نزیـک بووەتـەوە کۆتایـی پێ بێـت، بە چاکترین شـتێ کـە ئەنجامـی بدات، درودو سـەلامی خـوا بۆ سـەر ئەو پێغەمبـەرە، جا پێغەمبەر ﷺ تەفسـیری قورئانـی دەکرد، بە زۆری لـە کڕنـووشو سـوژدە بردندا دەیفەرمـوو: (سبحانك اللهم وبحمدك اللهـم اغفر لي) واتـە: پاکـیو بێگـەردیو سـتایش بۆ تۆ، ئـەی خوایە لێم خۆشـبە.

تەفسیری سوورەتی (النصر) تەواو بوو.


سورة المسد
بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ① مَا أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ ② سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ③ وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ ④ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ ⑤

## تەفسیری سووڕەتی (المسد)

## مەککییە (٥) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٥): ﴿ تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ ۝١ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ۝٢ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ۝٣ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ۝٤ فِى جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍۭ ۝٥ ﴾

ئەبو لەهەب مامی پێغەمبەر ﷺ بوو، کەسێک بوو زۆر بە سەختی دژایەتی پێغەمبەری دەکردو ئازاری دەدا، نە ئاینێکی هەبوو نە دەمارگیری خزمایەتی، خوا ڕووی ڕەش بکات.

خوا سەرزەنشتی کرد بەم سەرزەنشتە مەزنەی کە بریتی بوو لە ڕیسوایی‌و سەرشۆڕ بوونی تا ڕۆژی دوایی، جا فەرمووی: ﴿ تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ ﴾ واتە: هەردوو دەستی ئەو لەناوبچێ، ﴿ وَتَبَّ ﴾ بێگومان نەیبردەوەو (لە ناوچوو)، ﴿ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ ﴾ (واتە: سوودی پێ نەگەیاند داراییەکەی) ئەو ماڵ‌و سامانەی لەلای بوو، بوو بە مایەی یاخیبوونی، وە نە ئەوەشی بەدەستی هێنابوو، هیچ شتێک لەوانە سزای خوای ڕەت نەکردەوە کاتێ کە (سزای خوا) دابەزی بۆ سەری، ﴿ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴾ واتە: بێگومان لەمەولا ئاگر دەوری دەدات لە هەموو لایەکەوە، خۆی‌و، ﴿ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴾ (واتە: لەگەڵ ژنەکەیدا کە هەڵگری دارو چیلکە بوو) بۆ نانەوەی ئاژاوە.

هەروەها ئەو ئافرەتە زۆر ئازاردەری پێغەمبەر بووە، لەگەڵ خێزانەکەیدا هاوکاری یەکتر بوون لەسەر گوناهو دژایەتی کردن‌و نانەوەی شەڕ، وە هەوڵ‌و کۆششێکی لە ئەندازە بەدەریدا لە ئازاردانی پێغەمبەر ﷺ، لەسەر پشتی کۆمەڵێ گوناهی هەڵگرتبوو، وەکو کەسێک کە داری دابێ بە کۆڵیداو گوریسەکەی لە ملی گیر کردبێ، ﴿ مِّن مَّسَدٍۭ ﴾ واتە: لە ڕیشاڵی خورما، یان ئەوەیە ئەو هەڵگری کۆڵەدارێکی ئاگر بووبێ بەسەر

مێردەکەیەوە، بەستبێتی بە گەردنی خۆیەوە گورێسێک لە ڕیشاڵی خورما.

بە هەر حاڵ لەم سوورەتەدا نیشانەو بەڵگەیەکی درەوشاوە هەیە لە بەڵگەکانی خوا، بێگومان خوا ئەم سوورەتەی دابەزاند ئەبو لەهەبو ژنەکەی لەناو نەچووبوون، هەواڵیدا کە بێگومان ئەوان سزا دەدرێن لەناو ئاگرداو هەر دەبێ ببێ، ئەوەشی ئەو سزا پێویست دەکات ئەوەیە کە ئەوان بێگومان موسڵمان نابن، جا هەر وەک زانای پەنهانو ئاشکرا هەواڵیدا ئەمە ڕوویدا.

تەفسیری سوورەتی (المسد) تەواو بوو.


بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ٣
وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ٤

## تەفسیری سوورەتی (الإخلاص)

## مەککییە (٤) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٤): ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ٣ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ٤﴾:

﴿قُلۡ﴾ قسەیەک بڵێ: بروات پێی هەبێ‌و ماناکەی بزانی، ﴿هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ واتە: تاک‌و تەنهایی تایبەتە بەو، ئەو زاتە تاک‌و تەنهایە بە کەماڵی خاوەن ناوە جوانەکان‌و سیفەتە تەواوو بەرزەکانەو کارە پیرۆزەکانە، هیچ هاوتاو هاوشانێکی نیە.

﴿ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ﴾ واتە: (ئەو خوایەی بێنیازو جێی نیازو ئومێدە) مەبەست پێی هەموو ناتەواویەکانە، کە خەڵکی جیهانی سەرەوەو خوارەوە پێویستیان پێیەتی بە ئەوپەڕی پێویستی پێ بوون، داوای لێدەکەن لە ناتەواویەکانیان‌و، وە ئارەزوو دەکەن لێی خولیاکان بە دەست بێنن، چونکە ئەو زاتە تەواوە لە وەسفەکانیدا، زانایەو تەواوو کامڵە لە زانستیدا، لەسەرخۆیە بێگومان کامڵ‌و تەواوە لە لەسەرخۆیدا، میهرەبانەو کامڵە لە بەزەیی‌و میهرەبانیەکەیدا، ئەو زاتە میهرەبانیەکەی دەوری هەموو شتێکی داوە، وە سەرجەم وەسفەکانی بەو شێوەیە.

وە لە تەواوێتیدا ئەو زاتە: ﴿لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ﴾ (واتە: کەسی لێ نەبووەو لە کەس نەبووە)، لەبەر تەواوی بێنیازی، ﴿وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ﴾ (واتە: وە هەرگیز هیچ کەس هاوشێوەو هاوتای نیە) نە لە ناوەکانی‌و نە لە وەسفەکانی‌و نە لە کارەکانی بەرزی‌و مەزنی بۆ ئەو خوایە، ئەم سوورەتە گشتگیرە لەسەر یەکتاپەرستی ناوو سیفەتەکان.

تەفسیری سوورەتی (الإخلاص) تەواو بوو.


سورة الفلق

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ① مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ② وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ③ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِي ٱلۡعُقَدِ ④ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ⑤

## تەفسیری سوورەتی (الفلق)

## مەککییە (٥) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٥): ﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ۝١ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ۝٢ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ۝٣ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِي ٱلۡعُقَدِ ۝٤ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ۝٥ ﴾:

﴿ قُلۡ ﴾ (بڵێ) بە پەناگرتن: ﴿ أَعُوذُ ﴾ واتە: پەنا دەگرم، ﴿ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ﴾ واتە: خوا لەتکەری دانەوێڵەی‌و ناوکە تۆوە، بەدیهێنەری شەبەق‌و ڕووناکی ڕۆژ بوونەوەیە.

﴿ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴾ (واتە: لە شەڕو خراپەی هەرچی کە دروستی کردوە) ئەمیش هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە خوا دروستی کردوون لە ئادەمیزادو جنۆکەو گیانلەبەران، جا پەنا دەگرێ بە بەدیهێنەرەکەی، لەو شەڕو خراپانەی کە تیایاندایە.

دوای ئەوەی بە گشتگیری باسی کردوە، ئنجا تایبەتی دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴾ واتە: لەو شەڕو خراپەی کە لە شەودا هەیە کاتێ ئادەمی دادەپۆشێ، وە زۆرێ لە ڕووحە خراپەکارەکان‌و گیانداره زیانبەخشەکان بڵاو دەبنەوە.

﴿ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِي ٱلۡعُقَدِ ﴾ واتە: لە شەڕو خراپەی ئەو جادووگەرانەی کە لەسەر جادووەکانیان پشت دەبەستن بە فووکردن بەو پەت‌و دەزووانەی کە گرێی دەدەن لەسەر جادوو کردن، ﴿ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴾ (واتە: وە لە شەڕو خراپەی حەسوودو بەخیل کاتێ حەسوودی‌و بەخیلی دەبات) حەسوود:

ئـەو کەسـەیە کـە پێـی خۆشـە نازونیعمەتـی ئـەو کەسـە نەمێنـێ کـە حەسـوودی پـێ بـردوە، جـا هـەوڵ دەدات بـۆ نەهێشـتنی بـەوەی لـە توانایدایـە لـە هـۆکارەکان.
بۆیـە وا پێویسـتە پەنـا ببـردرێ بـە خـوا لـە شـەڕو خراپـەیو پـووچ کردنـەوەی فـرو فێڵـی، وە چـاو پیسـی دەچێتـە نـاو حەسـوودبەرەوە، چونکـە چاوپیسـی دەرناچـێ مەگـەر لـە کەسـێکی حەسـوودی خراپـەکاری نەفـس پیـس.
جـا ئـەم سـوورەتە پەنـا گرتنـی بـە خـوا لەخـۆ گرتـووە، لـە هەمـوو جـۆرە شـەڕو خراپـەکان بـە گشـتیو تایبەتـی، وە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی بێگومـان سـیحرو جـادوو حەقیقەتێکـی هەیـە مەترسـی زیانـی لـێ دەکـرێ، پەنـای پـێ دەبـردرێ بـە خـوا لـە ئـەو، وە لـە خەڵکەکـەی.

تەفسیری سوورەتی (الفلق) تەواو بوو.


سُورَةُ النَّاسِ
بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ١ مَلِكِ النَّاسِ ٢ إِلَٰهِ
النَّاسِ ٣ مِن شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ ٤ الَّذِي
يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ ٥
مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ ٦

**تەفسیری سووڕەتی (الناس)**
**مەدەنییە (٦) ئایەتە**
**بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە**

(١-٦): ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ١
مَلِكِ النَّاسِ ٢ إِلَٰهِ النَّاسِ ٣
مِن شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ ٤ الَّذِي
يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ ٥﴾

ئەم سووڕەتە گشتگیرە لەسەر پەنا گرتن بە پەروەردگاری خەڵکی، وە پاشاو پەرستراویان، لە شەیتان کە بنچینەو بنەڕەتی هەموو شەڕو خراپەکاریانە، لە فیتنەو شەڕی ئەو وەسوەسەی فڕێی دەداتە نێو دڵو دەروونی خەڵکیەوە، شەڕو خراپەیان لەلا جوان دەکاتو بە وێنایەکی جوان نیشانیان دەدات، وە ئیرادەیان چالاک دەکات بۆ ئەنجامدانی (ئەو خراپانە). خێرو چاکەیان لەلا ناشرین دەکاتو خاویان دەکاتەوە، وێنەیەکی جیا لە وێنەی ڕاستەقینەی (ئەو کارو کردەوە چاکەیان) پێ نیشان دەدات، ئەو بەردەوام لەسەر ئەم حاڵەیە، وەسوەسەو خەتەرە دەخاتە نێو دڵیانەوە، (الخنَّاس) واتە: خۆی پەنهان دەکات کاتێ کە بەندە یادی پەروەردگاری بکاتو پشتی پێ ببەستێ بۆ دوور خستنەوەی (شەیتان لە خۆی).

جا پێویستە لەسەری پشت ببەستێو پەنا بگرێ بە پەروەردگاریتی خوا لە هەموو خەڵکی، بێگومان هەموو بەدیهێنراوەکان لە چوارچێوەی پەروەردگاریتی خوادان، هەموو گیانلەبەرێک خوا دەسەڵاتدارە بەسەریداو، بگری مووی پێشە سەریتی، هەروەها لە چوارچێوەی پەرستراویتی ئەو زاتەدان، کە دروستی کردوون لەو پێناوەدا، ئەویش تەواو نابێت بۆیان مەگەر بە دوورخستنەوەی شەڕو خراپەی دوژمنەکەیان، ئەو دوژمنەی کە دەیەوێ دایان ببڕێ لێیو جیایان بکاتەوە، دەیەوێ بیانگێڕێ بە کۆمەڵو تاقمی خۆی

تـا بنـە هاوەڵـی دۆزەخ، وەسوەسـە پەیداکـەر وەک چـۆن لـە جنۆکـەدا هەیە، بـە هەمان شـێوە لە ئادەمیزادیشـدا هەن.

لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴾ (واتە: لە جنۆکەو ئادەمیزاد).

سـوپاسو سـتایش بۆ خـوای پەروەردگـاری جیهانیان، (لە) سـەرەتاو کۆتایی، وە ئاشـکراو نهێنـی، داوا دەکەیـن لـە خـوا ﷻ نازونیعمەتـی تـەواو بـکات، لێمـان خـۆش بێـت لـەو گوناهانـەی کەوتۆتـە نێوانـی ئێمەو نێوانـی زۆرێک لە فـەرو بەرەکەتەکانـی، هەڵەو هەواو هەوەسـێ دڵمانـی بردبـێ لـە بیر کردنەوەو سـەرنجدان لـە دەقەکانی.

وە هیوامـان هەیـەو ئومێـدی پـێ دەکەیـن بێبەشـمان نـەکات لـەو خێـرو چاکـەی کـە لەلایەتـی، بـە هـۆی ئەو شـەڕو خراپەیەی کـە لـە لای ئێمەیە، جـا بێگومان کـەس نائومێد نابـێ لـە ڕەحـمو میهرەبانی خـوا جگـە لەوانـەی بێبـڕواو گومڕان.

صـەڵاتو سـەلام لەسـەر پێغەمبەرەکـەی موحەممـەد ﷺ، وە لەسـەر ئـالو بەیـتو یـارو یاوەرانی بە گشـتی، صەڵاتو سـەلامێ بـەردەوام بێت بە هەمیشـەیی بە درێژایـی کاتەکان، سـتایش بۆ ئـەو خوایەی کـە بە نیعمـەتو بەخششـەکانی چاکـەکان تـەواو دەبن.

تەفسـیری کتێبـی خـوا بـە یارمەتی ئـەو زاتە تـەواو بوو، لەسـەر دەسـتی کۆکەرەوەکەیو نووسـەرەکەی (عبدالرحمـن)ی کـوڕی (ناصر)ی کوڕی (عبدالله) ناسـراو بە ئیبنو سـەعدی خـوا لێـی خۆش بێ، وە لە باوکـو دایکیو سـەرجەم مسـوڵمانان، ئەویش لە سـەرەتای (ربیع الأول) لـە سـاڵی هەزارو سـێ سـەدو چلو چـوار (١٣٤٤) لە کۆچ کردنـی موحەممەدﷺ.

تەفسیری سوورەتی (الناس) تەواو بوو.

## لە کۆتایی

وەرگێڕانی تەفسیری پێشەواو زانای پایە بەرز تەواو بوو، داواکارم لە خوا بە نیازێکی پاکو بێخەڵتە لێمی وەرگرتبێو لە کەمو کوڕیم بورابێ، بیکات بە دەروازەیەک بۆ ژیانێکی پڕ لە ئاسوودەیی لە دونیاو لە دوارۆژیش لەو کاتەی ئادەمی لە یەکتر هەڵدێن، بیکاتە چرایەک بۆ منو هەموو ئەو کەسانەی خوا ئەو شەرەفەی پێ بەخشیون بە قسەیەکی خێریش بێت کەمتەرخەمیان نەکردوە. ئەوەی هەڵەیە لە منەوەیە ئەوەشی راستو دروستە لە یارمەتی خواوەیە، تەواویو کەماڵی مرۆڤ لە هەڵەکانیدایە، تەواویو کەماڵی خوا لە پاکو بێگەردی دایە لە هەڵە کردن.

شەوی چوارشەممە، بەرواری: (٧/ ٢/ ٢٠١٨) کاتژمێر (١١:٣٠)ی شەو.

هەر بەڕێزێک سەرنجو تێبینیەکی هەبوو دەتوانێت پەیوەندی بکات بەم ژمارە تەلەفۆنە:
٠٧٧٠٢١٥٤١٢٤

# ناوەڕۆك